# دیوانی بێسارانی



مەولانا مەلا موستەفا (١١١٣-١٠٥٣ک.م)

کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە:

عەبدوڵڵا حەبیبی

وەرگێڕانی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە
و شەرحی شیعرەکان بە سۆرانی:

مەهدی فەللاحی ڕۆستەمان (سەرمەس)

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | حبیبی نۆتشەیی، عبدالله، ۱۳۵۲ -، گردآورنده |
| عنوان و نام پدیدآور | : | دیوانوو بیسارانی: مولانا مەلا موستەفا (۱۱۱۳-۱۰۵۳ ک.م.)/ کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە عەبدوڵڵا حەبیبی؛ وەرگێڕانی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان بە سۆرانی مەهدی فەللاحی رۆستەمان (سەرمەس). |
| مشخصات نشر | : | سنندج : کردستان ، ۱۳۹۹. |
| مشخصات ظاهری | : | ۷۶۸ ص. |
| شابک | : | ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-۳۹۱-۳ |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | بیسارانی، مصطفی‌بن قطب‌الدین، ۱۰۵۳ ؟- ۱۱۱۴ ؟ق. . دیوان -- نقد و تفسیر |
| موضوع | : | شعر کردی -- قرن ۱۱ق. |
| موضوع | : | ۱۷th century -- Kurdish poetry |
| موضوع | : | شعر کردی -- قرن ۱۱ق. -- تاریخ و نقد |
| موضوع | : | ۱۷th century -- History and criticism -- Kurdish poetry |
| شناسه افزوده | : | فلاحی رستمان، مهدی، ۱۳۷۱ - |
| رده بندی کنگره | : | PIR۳۲۵۶ |
| رده بندی دیویی | : | ۹فا۸/۲۱ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۷۲۷۸۹۱۵ |
| وضعیت رکورد | : | فیپا |

# دیوانی بێسارانی

**مەولانا مەلا موستەفا (١١١٣ ـ ١٠٥٣ ک . م)**

کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە:

**عەبدوڵڵا حەبیبی**

وەرگێڕانی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و شەرحی شیعرەکان بە سۆرانی:

**مەهدی فەللاحی ڕۆستەمان (سەرمەس)**

انتشارات کردستان

سـنـه

# دیوانی بێسارانی



| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | دیوانی بێسارانی |
| ✓ خاوەن بەرهەم (تألیف): | مەلا موستەفای بێسارانی |
| ✓ کۆکردنەوە و لێکۆڵینە و لێکدانەوە (گردآوری و تصحیح و شرح): | عەبدوڵڵا حەبیبی |
| ✓ وەرگێڕانی لە هەورامییەوە بۆ سۆرانی (ترجمه به سورانی): | مەهدی فەللاحی ڕۆستەمان |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ۱۳۹۹ ـ ۲۰۲۰ |
| ✓ بەرگەژمێر (تیراژ): | ۱۰۰۰ جلد |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە (تعداد صفحات و قطع): | ۷٦۸ صفحەی وزیری |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |
| ✓ شابك: | ۳ - ۳۹۱ - ۹۸۰ - ۹٦٤ - ۹۷۸ |

✓ قیمت: ۱۵۰,۰۰۰ تومان ـ ۱۰,۰۰۰ دینار

سنندج ـ چهارراه شهدا ـ پاساژ عزتی ـ انتشارات کُردستان ـ تلفن: ۰۸۷۳۳۱٦۵۳۸۲

سنە ـ پاساژی عیززەتی ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان ـ تەلەفوون: ۳۳۱٦۵۳۸۲ ۸۷ ۹۸+

# پێڕست

## پێشەکی وەرگێڕ

دڵــە بەشــق حــەق مەبــە ســەرگەردان مەشــۆ نــە جامــەی گــرۆی بــێ دەردان

لە عەقڵ و ئاوەزەوە دوورە کەسێک لافی ئەدیبی و ئـەدیب بـوون لـێ بـدات بـەڵام خۆی لە زەریای پڕ دوڕ و گەوهەری ئەدەبیاتی هەورامان بـە دوور بگرێـت و خـۆی تـێ نەهاوێ؛ زەریایەک کـە پـاش چەنـد سـەدە حـەزرەتی مەولـەوی، بێسـارانی و سـەیدی باشترین مەلەوانی ئەو زەریان و بە بیر و خەیاڵ و هەستی ناسک توانیویانە تا قـووڵایی ئەم زەریا بچن و جوانترین و بەنرخترین دوڕ و جەواهێراتی ئەم زەریا دەربێنن و لە سـەر لاپەڕەی کاغەز بیرازێننەوە و پێشکەشی دنیای ئەدەبی کوردی بکەن.

دیاری و دەست نیشان کردنی مێژووی ئەدەبی هەورامان و ئەوەی کە یەکەم شێعری هەورامی کامەیە و کێ نووسیویە کـارێکی ئەسـتەمە و کـاری هـەموو کـەس نییـە. کۆنترین شێعری هەورامی پارچە شێعرێکی چواربەیتییە کە باسی هێرشی عـەرەب بـۆ سەر کوردستانە و ئێستایشی لەگەڵ بێت نە شاعێرەکەی و نـە مێـژووی نووسـینەکـەی دیار نییە[1].

شرۆڤە لەسەر ئەم بابەتە کارێکی یەکجار ئەستەم و دژوارە کە لە توانای مندا نییە و بە شارەزایانی ئەم بوارەی دەسپێرم.

---

-١

هورمزگـــان رمـــان، ئـــاتران کـــوژان وێشـــان شـــاردەوە، گـــەورە گـــاوران

زۆرکـــاری ئـــارەب، کەردنـــە خـــاپوور گونـــای پاڵـــەیی هـــەتا شـــارەزوور

شـــەن و کـــەنیکان وە دیـــل بەشـــینا مێـــرد ئـــازا تلێـــی وە رووی هوونیـــا

ڕەوشـــت زەردەشـــترە، مـــانۆوە بێکـــەس بـــەزیکا نـــەیکا، هـــورمز وە هـــیچ کـــەس

ئەگەر گەشەی ئەدەبی هەورامان بە سێ قۆناغ دابەش بکەین دەتوانین لە قۆناغی سێهەمدا ئاماژە بە مامۆستا بێسارانی بکەین و بڵێین بێسارانی شاعێری گەورەی هەورامان یەکێک لەو کەسانەیە کە دەور و کاریگەریەکی یەکجار گرینگ و بەرچاوی لە گەشەی ئەدەبی هەوراماندا هەبووە کە بە داخەوە لەبەر چەند هۆکارێک بۆ ماوەی نیوسەدە کە بە داخەوە لێرەدا ناگونجێت بیخەینە بەر باس و شرۆڤە، ئەو گەشە ڕاوەستا و دیسان لەسەردەمی ئەڵماس خانی کەنۆڵەیی و خانای قوبادیدا دەستی پێکردەوە[1].

بێسارانی ئەستێرەیێکی گەش و پڕشنگداری ئاسمانی ئەدەبی کورد بە تایبەت هەورامانە کە پاش ٣٢٨ ساڵ هەر وریشەی دێت و شێعرە پڕ ناوەرۆکەکانی ڕازێنەرەوەی شێعری شاعێران و کۆڕ و کۆبوونەوەی شاعێران و ئەدیبان و ئەدەب دۆستان و دەنگ خۆشانی کوردستانە.

خوێندنەوەی شێعری بێسارانی لە کۆنە کتێبان و گوڵبژێرە چاپ کراوەکان و دنیای مەجازی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر منیان تووشی مەراقی شێعرەکانی دەکرد بەڵام خۆ منی هەژار و بێ دەسەڵات نە توانای دواکەوتن و نووسینەوەی نوسخە جۆراوجۆرەکانم هەبوو نە توانای ساق کردنەوەی ڕێنووسی کۆنی ئەو سەردەمە. ناچار خۆم دایە دەستی زەمەن بەڵکوو لە شوێنێکەوە ڕۆشناییەک بکرێتەوە، ساڵی ٩٥ی هەتاوی دیوانی بێسارانی بە کۆکردنەوە و لێکدانەوەی مامۆستا «عەبدوڵڵای حەبیبی» چاپ بوو و هاتە بازاڕی ئەدەبەوە و ئەو ئاواتە لە مێژینەم هاتە دی. کاتێک بە وردی دیوانەکەم خوێندەوە تێگەیشتم کە تا ئێستا ئەو کارەی لە سەر شێعری بێسارانی کراوە دڵۆپێک لە دەریای شێعری بێسارانی بووە. پاش ماوەیەک کەوتمە بیری ئەوەی بڵێی دیوانی بێسارانی بە

---

١- ئامیلکەی مێژووی ئەدەبی کوردی ١، د. بەختیار سەجادی، ١٣٩٥ی هەتاوی.

سۆرانی شەرح و لێکدانەوەی بۆ کرابێت؟ پاش بە دواداچوونێکی زۆر زانیم جگە لە ئەو دیوانەی مامۆستا حەبیبی سێ جار دیوانی بێسارانی چاپ کراوە:

١- کاک کیومەرس نیک ڕەفتار کە بە داخەوە تەنیا بەشێکی کەم لە شێعرەکانی چاپ کردووە.

٢- کاک سدیق بۆرەکەیی کە تەنیا شێعرەکانە بە بێ شەرح.

٣- کاک حەکیم مەلا ساڵح کە بە داخەوە نە شێعرەکان بە تەواوی شێعری بێسارانین و نە شەرحەکەیشی شەرحێکی ڕێک و پێک و پڕ بە پێستە.

پاش ئەم بە دواداچوونە بیری وەرگێڕانی شەرحە هەورامییەکەی مامۆستا حەبیبی کەوتە سەرم و شانم لێ شل کرد و دەستم کرد بە وەرگێڕانی. ئەوەی کە منی بەچکە سۆرانی لە کوێ و چۆن فێری هەورامی بووم چیرۆکێکی دوور و درێژی هەیە کە نە من حەزم لە باس کردنیەتی و نە ئێرەیش جێگەی ئەوە.

بەڵام چۆن وەرگێڕانێک:

شاعێر، نووسەر، وەرگێڕ و کۆڵەری گەورەی کورد، مامۆستا هەژاری نەمر سەبارەت بە وەرگێڕان دەفەرموێ کتێبێک پێویستی بە وەرگێڕان هەیە کە کۆمەڵگا هەست بە پێویست بوونی ئەو کتێبە بکات. ئایا ئەو کارەی من بە نیازی کردنی بووم پێویست بوو یا هەر حەزێکی دەروونی خۆم بوو؟ بەڕاستی ئەوەی کە دیوانی مامۆستا مەولەوی بە دەیان جار و هەر جارە بە جۆرێک و بە قەڵەمی کەسێک کۆکراوەتەوە و چاپ کراوە و ئێستەیش چینە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگا بە تامەزرۆییەوە بە دوای چاپ و شەرحی تازەیدا وێڵن و دیوانی بێسارانی، هەژار و بێ ناز کەوتووە و کەس لێی ناپرسێت ئەو پێویست بوونەوەی لای من دروست کرد، مامۆستا هەژار لە بەشێکی دیکەی قسەکانیدا دەفەرموێ پاش ئەوەی لەسەر پێویست بوونی وەرگێڕانی کتێبێک ساق بوویتەوە بە جوانی بیخوێنەوە لێکی دەوە لێی تێ بگە و بە وشەی خۆماڵی بە

شێوەیەکی جوان دایڕێژەوە. منیش پاش سێ ساڵ ژیان لەگەڵ ڕۆحی بەرز و پیرۆزی مامۆستا بێسارانی و نوقم بوون لە زەریای شێعرە پڕ ماناکانی، بە ترس و لەرزێکی زۆرەوە دەستم پێکرد و بە یارمەتی خودا توانیم پاش ماوەیەکی زۆر ئەم کارە بە ئاکام بگەیەنم و پێشکەشی کتێبخانەی ئەدەبی کوردی بکەم.

چەند سەرنج:

هەرچەند من شەرحە هەورامییەکەی مامۆستا «حەبیبی»م وەرگێڕاوەتە سەر سۆرانی بەڵام زۆر لە وەرگێڕان جیاوازترە و تایبەتمەندی خۆی هەیە کە یەک یەک دەیخەینە بەر باس:

١- ئەم دیوانە دوو پارچە شێعری لە دیوانەکەی مامۆستا «حەبیبی» زیاترە کە بە وتەی خۆیان لە دوای چاپی دیوانەکە کەوتووەتە بەر دەستیان و بۆ منیان نارد و منیش لە جێی خۆیدا نووسیم و بە پێی توانا شەرحم کرد و بە ئەم دوو پارچە شێعرەوە سەرجەمی شێعرەکانی بێسارانی ٣١٢ پارچەیە.

٢- ئەو وشانەی لە زمانی هەورامی‌دا ئاساییـن و خەڵک لە ژیانی ڕۆژانەدا بە کاری دەبەن و مامۆستا «حەبیبی» مانای نەکردووتەوە من بە پێی پێویست مانام کردوەتەوە.

٣- وشەکان بە پێی مانای شێعرەکان مانا کراونەتەوە و جاری وایە یەک وشە لە دوو شێعردا دوو مانای جیاوازیان هەیە. بۆ وێنە:

وشەی «جەفا» لە هەندێ شێعردا بە مانای «بێ وەفایی یار» و لە هەندێ شێعری دیکەدا بە مانای «ئێش و ئازار» هاتووە.

وشەی «چوون» لە هەندێ شێعردا بە مانای «بە وێنەی، وەکوو» و لە هەندێ شێعری دیکەدا بە مانای «چۆن» هاتووە.

و......

٤- پاش شەرحەکەی مامۆستا «حەبیبی» لە هەر کوێدا بە پێویستم زانیبێت لە ناو کەوان « »دا لە ژێر ناوی «وەرگێڕ»دا مانای بەیتەکان و تێبینی خۆمم نوسیوە.

٥-لەم وەرگێڕانەدا هەوڵم داوە زمانێکی پاراو و نەرم بە کار ببەم و ئەوەی گچکە سەوادێکی ببێت بۆی دەخوێنرێتەوە و هەستی پڕ لە جوانی بێسارانی بۆ ئاشکرا دەبێت و لێی تێدەگات.

لە کۆتاییشدا سپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی مامۆستا و هاوڕێیانی ئازیز و خۆشەویست، کاک «مەسعوود حەکیمی» و مامۆستا «عەبدوڵڵا حەبیبی» و مامۆستا «سەعدی غەریبی» دەکەم کە بۆ مانای وشەی و ڕستە دژوارەکان یارمەتیان داوم بە تایبەت مامۆستا «سەعدی غەریبی» و مامۆستا «عەبدوڵڵا حەبیبی» و مامۆستا «عابید حسەینی» کە وێڕای سەرقاڵیەکانی خۆیان کاتیان دانا و پێداچوونەویان بۆ وەرگێڕانەکەی من کرد. سەربەرز و سەرکەوتوون.

مەهدی فەللاحی ڕۆستەمان

«سەرمەس»

پاییزی ٢٧١٩ی کوردی- ساحێب

## پێشەکی

کاتێک دەستم کرد بە کار لەسەر دیوانی مەولەوی و شێعرەکانیم خوێندەوە بۆم بوو بە پرسیار کە مەولەوی لەبەر چی هێندە هۆگری شێعرەکانی بێسارانییە و بە «سەودایی کامڵ[1]» و «سەرمەشق مەینەت» ناوی دەبات و بە شێعرەکانی ئەو، شێعری خۆی دەڕازێنێتەوە؟ بەڵام کاتێک سەیری شێعرەکانی بێسارانیم لە دیوانە چاپ کراوەکاندا کرد، هەرچەند شێعرەکانی بە چێژ بوو بەڵام لە زۆر شوێندا یا لێیان نەدەگەیشتم یا بە دروستیانم نەدەزانی هەر ئەوە بوو بە هاندەری من کە دوای نوسخە خەتیەکانی شێعری بێسارانی بکەوم. پاش گەڕانێکی زۆر چەن نوسخە لە نوسخە خەتیەکانم بە دەست هێنا[2] و دەستم کرد بە نووسینەوەیان، وردە وردە کە شێعرەکانم دەنووسیەوە تێگەیشتم کە شێعری بێسارانی لە دیوانە چاپ کراوەکاندا زۆر بە هەڵە نووسراون و کۆکراونەتەوە. بە ڕاستی جێگەی داخە کە تا ئێستا ئەدەبیاتی کلاسیکی ئێمە کارێکی ڕێک و پێکی لەسەر نەکراوە و ئەو کارانەیش تا ئێستا کراوە هیچ کامیان هەورامی زمان نەیکردووە. لە دیوانی مەولەوی و سەیدی و بێسارانییەوە بگرە هەتا دیوانی وەلی دێوانە و ئەحمەد بەگی کۆماسی و.... ئەڵبەت ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی کە زەحمەتی ئەو مامۆستایانە لەبەر چاو نەگرین، بەڵکوو گلەیی و توانج لەو هەورامی زمانانەیە کە دەتوانن و نایکەن.

ئەم دیوانەی کە لەبەر دەستی ئێوەی خۆشەویستدایە، بەرهەمی پێنج ساڵ کار و تێکۆشان لەسەر نوسخە خەتیەکان و هەڵسەنگاندنیان لەگەڵ یەک و جیاکردنەوەی شێعرەکانی بێسارانی و پاشان ڕێک و پێک کردنیان و دووبارە نووسینەوەیانە.

---

١- «های ڕەحمەت ئەو قەبر سەودایی کامڵ/ سەرمەشق مەینەت بێساران مەنزڵ».(مەولەوی)

٢- لە بەشی نوسخە خەتیەکاندا بە وردی باسی لەسەر کراوە.

ژیان لەگەڵ ڕۆحی بەرزی بێسارانی لەم ماوەدا، نێعمەتێکی نەبڕاوە بوو کە خودای مەزن کردی بە نەسیبی من تا بتوانم هەنگاوێک بۆ ئەدەبیاتی هەورامان هەڵبگرم.

شتێکی دیکە لێرەدا پێویستە باس بکرێت، شەرحی شێعرەکانە کە من بە هەورامی نووسیومە، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە پێشتر زمانی هەورامی نەسری پێ نەنووسراوە و پێویستە لەم بوارەیشدا خزمەتی پێ بکرێت. لەوانەیە دواتر کەسێک دڵی پێوە بێت بە سۆرانی شەرحی بکات و لە چاپی بدات.

بۆ نووسینەوە و شەرحی شێعرەکانی بێسارانی چەند خاڵێک لەبەر چاو گیراوە کە پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێ بکەین.

١- نوسخەی «ک» کە لە بەشی نوسخە خەتیەکاندا بە وردی باسمان لەسەر کردووە و کۆنترین و دروسترین نوسخەی خەتی شێعرەکانی بێسارانییە، وەک نوسخەی بنەڕەت داماننا و شێعری نوسخەکانی دیکەمان لەگەڵ ئەودا هەڵسەنگاند و نووسیمانەوە.

٢- بۆ هەر شێعرێک هەموو ئەو سەرچاوانەی کە شێعرەکەیان تێدا هاتووە ئاماژەمان پێ کردووە و بە پێی پێویست وتراوە کە لە هەر سەرچاوەیەکدا بە چ شێوەیەک هاتووە. پێویستە ئەمەیش بڵێین کە بەو جۆرەی لە بەشی نوسخە خەتیەکاندا ناوی نوسخە خەتیەکانمان بردووە، لە تۆتۆی دیوانەکەیشدا هەر بەو جۆرە ناومان بردوون.

٣- هەموو ئەو هەڵە تایپی و ڕێزمانی و نوسخە خوێندنەوە کە لە دیوانە چاپ کراوەکاندا هەیە ڕاست کراوەتەوە و بە دروستی نووسراوەتەوە.

٤- ئەگەر شێعرێکی بێسارانی لە لایەن شاعێرێکی دیکەوە تێهەڵکێش کرابێت یا لە ڕەدیفی شێعرەکانیدا شێعرێک هۆنرابێتەوە، تا ئەو جێگە دەستی دابێت و شێعرەکان لەبەر دەستدا بووبێت هێناومانە و شرۆڤەمان لەسەر کردووە و بێجگە لەوەیش لە بەشی بێسارانی و شێعرەکانیدا بە تێر و تەسەلی یەک بە یەک ناوی ئەو شاعێرانە و شێعرەکانیانمان هێناوە.

٥- مانای هەندێ وشە لە دیوانی بێسارانیدا لەگەڵ ئەو مانایە کە بۆ هەوەڵ جار دێتە بیر و مێشکی خوێنەر جیاوازە و بە پێی مانای شێعرەکان مانایان ڕوون ئەبێتەوە وەک «گڵ» بە مانای «خاک» و «ڕەز» بە مانای «باخ» و....

لێرەدا پێویستە سپاسی هەموو ئەو کەسانە بکەم کە لەم کارەدا یارمەتیان داین بە تایبەت کاک «سەعدی غەریبی» و کاک «حافێزی ئەحمەدی» و کاک «فەتحوڵڵا ڕەزایی» بۆ خوێندنەوەی کارەکە و دیاری کردنی هەڵە تایپییەکان و کاک «موحەممەد ڕەشید ئەمینی» و کاک «ڕەفێق ساڵح» و کاک «مەزهەری ئەدوای» و کاک «عەبدوڵڵا ڕەحیمی» بۆ وە بەر دەست نانی ئەو نوسخە خەتیانەی کە لە لایان بووە.

عەبدوڵڵا حەبیبی

نۆتشە - هاوینی ١٣٩٥ی هەتاوی

## بێسارانی و شێعرەکانی

### بێسارانی کێ بووە؟

بێسارانی، شاعێری «پاییز» و «خەزان» و شاعێری «عەشق» و «سۆز» و «خۆشەویستی» ناوی «مەلا موستەفا»ی کوڕی «مەلا قوتبەدین»ی کوڕی «مەلا شەمسەدین» لە ساڵی ۱۰۵۳ کۆچی مانگی لە دێی «بێساران» لە بنەماڵەیەکی ئایینیدا چاوی بە دنیا هەڵهێنا. هەر بە منداڵی لە خزمەتی باوکیدا بە خوێندن دەستی کرد و پاشان وەک فەقێ چووەتە حوجرە و خوێندنی مەلایەتی دەست پێ کردووە، لە حوجرەکانی «بێساران» و «نۆتشە» و «پایگەلان» وانەی ملایەتی خوێندووە و بۆ تەواو کردنی مەلایەتی چووەتە «سنە» و لەوێ ئیجازەنامەی مەلایەتی وەرگرتووە و پاشان گەڕاوەتەوە بێساران و لە حوجرەی بێساران دەستی کردووە بە وانە وتنەوە بە فەقێیان و هەر وەک دیاری کراوە تا کۆتایی تەمەنی هەر لەوێ ماوەتەوە و لە ۱۱۱۳ی کۆچی مانگی، ئەم دنیایە بە جێ هێشتووە و لە گۆڕستانی «پیرە هەژارە» ئەسپەردە کراوە.

هەرچەند لە هەندێک جێگەدا ئاماژە کراوە کە بێسارانی تا کۆتایی تەمەنی هاوسەرگیری نەکردووە بەڵام بە پێی ڕەگەزنامەیەک کە «مەلا موحەممەد»ی قازی جوانڕۆ، کە بە خەتی خۆی نووسیویە و خوا لێ خۆشبوو «سەیید تاهێری هاشمی» باسی لەسەر کردووە، بێسارانی هاوسەرگیری کردووە و نەوە و نەتیجەیشی هەبووە. وەک لەو ڕەگەزنامەدا دەردەکەوێت «مەلا موحەممەد» بە پێنج پشت دەگەڕێتەوە سەر بێسارانی.

بێسارانی مەلایەکی ژیر و زیرەک بووە و لەسەردەمی خۆیدا جێگەی ڕێز و حورمەتی هەموو ئەو مەلایانەی بووە کە ناسیویانە و پەیوەندیان لەگەڵی هەبووە.

هەندێکیشیان لە ڕەدیفی شێعرەکانیدا شێعریان هۆنیوەتەوە و وڵامی شێعریان داوەتەوە کە زیاتر بە «مەولام» دەست پێدەکات و وەک دیارە لە نێوان خۆیاندا بە «مەولا» ناویان بردووە[1].

وەک لە شێعرەکانیدا دەردەکەوێت بێسارانی مەلایەتی لەگەڵ دنیای شێعریدا ئاوێتە نەکردووە و شێعری ئایینی نەهۆنیوەتەوە و ئەو شێعرە ئایینیانەیش کە پێشتر بە ناوی بێسارانییەوە چاپ کراوە بە پێی نوسخە خەتیەکان هیچیان شێعری بێسارانی نین، هەرچەند ئێمە بە پێی هەندێک سەرچاوە دوو پارچەمان هێناوە و لە جێگەی خۆیدا باسی لەسەر کراوە.

## تایبەتمەندی شێعرەکانی بێسارانی

شێعری بێسارانی چەند تایبەتمەندی هەیە کە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو تایبەتمەندیانە بە ئاسانی دەتوانی شێعری بێسارانی لە شێعری شاعێرانی دیکە جودا بکەیتەوە:

١- زمانی شێعرەکانی بێسارانی زمانێکی هەورامی و ڕەوانە، هەرچەند بە کار بردنی وشەی عەرەبی و فارسی لە شێعری کلاسیکی هەورامیدا باو بووە و لەو سەردەمەدا باسی زمان پارێزی لە ئارادا نەبووە، بەڵام بێسارانی هەوڵی داوە شێعرەکانی زیاتر هەورامی و زمانێکی ڕەوان و پاراویان هەبێت و ئەو وشە عەرەبیانەیش کە بە کاری هێناوە لە شێعرەکانیدا بە جۆرێک گۆڕیویە و کردوویە بە هەورامی! وەک «مالووم» بە جێگەی «مەعلووم»، «ڕام» بە جێگەی «ڕەحم» و «زامەت» بە جێگەی «زەحمەت» و.... کە ئەڵبەتە ئەم گۆڕانکاری وشانە بێ یاسا نەبووە، لە هەر جێیەکدا «ح» یا «ع» گەیشتبێت بە دەنگداری «ە»، بووە بە «ا». تەنانەت بۆ وشە فارسیەکانیش پەیڕەوی لەم

---

١- لە درێژەی ئەم بابەتەدا و لە بەشی «مەولای شاعێران»دا بە وردی باسی لەسەر کراوە.

یاسا کراوە و بۆ وێنە «زەخم»ی کردووە بە «زام». ئەم کارە دوای بێسارانی پەرەی سەندووە و لە دیوانی شاعێرەکانی دیکەدا وەک مەولەوی و ئەحمەد بەگی کۆماسی و.... دیارە.

٢- شێعری بێسارانی کۆتا و کورتە و بە دەگمەن پارچە شێعری هەیە کە لە دە، دوانزدە بەیت زیادتر بێت.

٣- وێنەسازی لە شێعرەکانی بێسارانیدا زۆر بەر چاوە و هەر پارچە شێعرێکی وەک تابلۆیەکی شێوەکارییە و بە خوێندنەوەی هەر کام لە پارچە شێعرەکانی تابلۆیەکی بێ وێنە لە بیر و زەینی خوێنەردا دەخولقێت.

٤- هەوێنێک لە عەشق و خۆشەویستی لە تۆتۆی شێعرەکانیدا هەیە.

## دابەشکردنی شێعرەکانی بێسارانی

ئەگەر بمانەوێت شێعرەکانی بێسارانی بە سەر چەن بەشدا دابەش بکەین دەتوانین بڵێین شێعرەکانی بێسارانی دەبنە پێنج بەش:

١- شێعری عاشقانە و خۆشەویستی کە بەشێکی زۆری شێعرەکانی بێسارانی لەبەر دەگرێت و زیاتری ئەو پارچە شێعرانەی کە بە «چراخ»، «زلێخا»، «شیرین» و «قیبلەم» دەست پێدەکات دێنە ئەم بەشەوە. پێویستە ئەمەیش بوترێت هەر وەک پێشتریش ئاماژەی پێ کرا، ئەو بەشەکانی تریش هەر هەوێنی عەشق و خۆشەویستیان تێدا بەدی دەکرێت.

٢- شێعری خەزان و پاییزی کە لەو پارچە شێعرانەدا زیاتر خۆی لە گەڵایەکی خەزان لێدراو بەدردەدارتر دەزانێت و لەگەڵ خەزاندا دەردە دڵ دەکات و هەر وەک ئەو تابلۆ شێوەکاریانە کە بە گەڵای ڕەنگامە دەخولقێت و ئەو بە دەستکردی سوەیلی دەزانێت، لە شێعرەکانیدا پێمان نیشان دەدات. لەبەر ئەم پارچە شێعرانە دەتوانی بێسارانی بە شاعێری «خەزان» و «پاییز» و «سوەیل» ناو ببەیت.

٣- شێعری بەهاری کە لە زۆربەیاندا خۆی لە بەهار بێـزار نیشـان ئـەدات، چـون بـەهار وەرزی سەرهەڵدانی گوڵانە و ئەویش لە گوڵەکەی دوورە و بولبول بە ویسالّی گوڵ دەگات لە حاڵێکدا بێسارانی داخی لە دڵدایە و بەهاری لە لا جوان و ڕازاوە نییە.

٤- ئـەو پارچـە شـێعرانەی کـە تـاریفی سرووشـتی شـوێنێک دەکـات و بـە جـوانی دەیڕازێنێتەوە. وەک پارچە شێعرەکانی «تاف دێوانە» و «هەبڵی جام جەم».

٥- چەن پارچە شێعرێک کە لە هەرکامیاندا تـاریف و مـەدحی گوڵێـک دەکـات و لـە کۆتاییشدا ئەو گوڵە دەشوبهێنێ بە «باڵا»، «زوڵـف»، «خـاڵ»ی ... یـارەکـەی. ئەمـە سەبک و شێوازێکی تایبەت بە بێسارانی خۆیەتی. وەک پارچە شێعرەکـانی «ڕێحـانێو مـەبۆ پەل دێز بێگەرد»، «سۆسـەنێ مـەبۆ، سۆسەنێ وەش وەخت»، «لێوە لەولاوێ مـەبۆ نە چەمەن» و....

## بێسارانی و عەشق و خۆشەویستی

هەروەک پێشتر ئاماژەی پێ کرا بەشێکی زۆری شێعرەکانی بێسارانی عاشقانەیە و بەشەکانی دیکەیشـی هـەوێنێک لـە عەشـق و خۆشەویسـتی تێدایـە. هەرچەنـد بـە خوێندنەوەی شێعرەکان ئەم دیاردە زیاتر بەرچاو دەکەوێت بەڵام پێویسـتە لێرەدا ئاماژە بـە سێ خاڵ بکەین تا ئەم باسە زیاتر ڕوون بێتەوە:

١- زیاتری شێعرەکانی بێسارانی بە «چراخ» و «قیبلە» و «زلێخا» و «شیرین» دەست پێ دەکات و دیارە ئامانجی ئەم بەکاربردنە ئاماژەیە بۆ دڵدار و عەشقی مەجازی.

٢- لە دوو پارچە شێعردا بە ئاشکرایی ئاماژە بە نـاوی خۆشەویسـتەکـانی دەکـات: لـە پارچە شێعری «جەمینش سافەن» بە ناوی «ئیسـاف» و لـە پارچـە شـێعری «چـراخم ئامان» ئاماژە بە ناوی «مروەت» دەکات.

٣- وەک باس کراوە (روحانی، ١٣٩٠: ١٧٣)کاتێک لە «پایگەلان» فەقێ بووە بە رێبواری چاوی بە کچێکی «ئامینە» ناو دەکەوێ و هەزار دڵ ئاشقی دەبێ. ماڵی ئامینە دراوسێی ئەو حوجرە بووە کە بێسارانی تێیدا دەرسی خوێندوویە و هەر بەو بۆنەوە چەن جارێکی تریش چاوی پێ کەوتوەتەوە بەڵام بەس چاو پێککەوتن بووە، نە جێگەی ئەوە بووە و نە زاتی قسەکردن لەگەڵ یەکتریان هەبووە. بەیانییەک کە بێسارانی وەک فەقێیانی دیکە هەستاوە بۆ نوێژی بەیانی، پاش نوێژ دەنگی ئامینەی دێتە بەر گوێ و گورج کتێبێک دەگرێت هەڵدەگرێت و دەچێتە سەربانی حوجرەکە تا بتوانێت لەوێوە چاوی بە ئامینە بکەوێت بەڵام کاتێ دەیهەوێ سەیری نازدارەکەی بکات دار «توو»یەکی گەورە و باڵابەرز بەر چاوانی گرتووە و ناهێڵێت حەوشەی ماڵی ئامینەی لێوە دیار بێت و چاوی بە باڵای یارەکەی بکەوێت. بێسارانی هەر لەوێ دادەنیشێت و ئەم پارچە شێعرە ئەهۆنێتەوە:

| | |
|---|---|
| چڵێ بە پەنا، چڵێ بە پەنا | چڵێ چوون رەقیب بیەن بە پەنا |
| هۆرئامان، مدران نە رای تەمەننا | مەر دەست قودرەت بذۆش بە فەنا |
| مەر بە باد بەد لەتار بۆ | نمازۆ باڵای قیبلەم دیار بۆ |
| بسۆچۆ بایر بازەدەی سەحەر | ریشەش جە زەمین باوەرۆ وە بەر |
| تا باڵای قیبلەم چوون شەم خانان | بوینووش بە چەم جە بەرزە بانان |

وەک لەم سەرچاوەدا ئاماژەی پێ کراوە، پاش ئەوەی ئەم شێعرە دەنووسێت و چەند جار بە دڵ لەبەر خۆیەوە دەیخوێنێتەوە «با»یەک هەڵدەکا و لق و پۆپی دار تووەکە دەشکێنێ و ئیتر لە بانی حوجرەکەوە بە باشی دڵدارەکەی دەبینێت.

لێرەدا ئاوڕ لە ڕاست و درۆیی ئەم ڕێکەوتە نادەینەوە، بەڵام ئەوەی کە بێسارانی شێعری بۆ خۆشەویستەکەی هۆنیوەتەوە گومانی تێدا نییە.

## نازناوی شێعری بێسارانی

بـە پێچەوانـەی ئـەوەی کـە زۆربـەی خـەڵک «بێسـارانی» بـە نازنـاوی «مـەڵلا موستەفا» دەزانن، بێسارانی لە شێعرەکانیدا لە وشەی «بێسارانی» وەک نازناو کـەڵکی وەرنەگرتووە. وەک دیارە وشەی بێسارانی تەنیا لەبەر ئەوە بووە بە نازناوی ئەم شاعێرە کە خەڵکی «بێساران» بووە و یەکەم جار بە «مەلا موستەفای بێسارانی» ناسراوە و لەبـەر ئەوەی شاعێرێکی بە دەسەڵات و پایەبەرز بووە بە هاتنی ناوی «بێسارانی» هەمووکەس زانیویانە مەبەست «مەلا موستەفایە». لە دیوانە چاپ کراوەکاندا لە پارچـە شـێعری «ئێمشەو دڵ جـە دەرد »دا نـاوی «بێسـارانی» هـاتووە و ئەمـەیش ئـەو بەیتەیـە کـە هێناویانە:

چوون «بێسارانی» هەرکـەس بـێ دڵ بـۆ     چوون باخچەی بێ ئاو دایـم بـێ گـوڵ بـۆ

ئێمە لەبەر ئەم چەند خاڵە ئەم بەیتە بە هی بێسارانی نازانین و دیارە لە کۆتاییەوە بە پارچە شێعرەکەوە لکێندراوە:

١- هەروەک لە شەرحی پارچە شێعرەدا ئاماژەمان پێ کردەووە بێ ئەم بەیتـەیش مانـای شێعرەکە تەواوە.

٢- لە شێعری بێسارانی ناچێ و دیارە کەسێکیتر نووسیویە.

٣- لە هیچ کام لە نوسخە خەتیەکاندا نەهاتووە.

٤- کاکە حەکیم مەلا ساڵح لە شەرحی شێعرەکەدا ئەڵێت کە لە نوسخە خەتیەکاندا نییە و بەس لەبەر ئەوەی لە دیوانە چاپ کراوەکەی کاکە کەیۆمەرس نیـک ڕەفتـاردا هـاتووە هێناویەتی (بێسارانی، ١٣٧٥: ٥٩) و کاکە سدیق بۆرەکەییش بە پێی ئەو هێناویەتی. کە وایە «بێسارانی» نازناوی «مەڵلا موستەفا» نەبووە

لە دوو دانە لە نوسخە خەتیەکاندا (ج، عم) دوو پارچە شێعر بە ناوی بێسارانییەوە هاتووە کە نازناوی «موستەفا»یان تێدایە. هەر دوو پارچە شـێعرەکـە یـەک ناوەرۆکیـان

هەیە و وەک لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین بۆی هەیە هی بێسارانیش نەبن. لە نوسخەی (ج)دا پارچە شێعری «جە بەیانەوە» هاتووە و لە سەری نووسراوە «بێسارانی» و پاش ئەوە پارچە شێعری «چراخم بەیان» هاتووە و لەسەری نووسراوە «و لە». ئەمەیش پارچە شێعری «جە بەیانەوە»:

جە بەیانەوە، جە بەیانەوە     حاڵێ پێیم یاوان جە بەیانەوە

خاڵێ دیم جە بەین دوو بەیانەوە     مەدرۆشۆ چوون نەجم جە بەیانەوە

حەیان لوول وەردەن وە بەیانەوە     وە بان بەیاندا مەشنیانەوە

حەکاکان دەور گشت بەیانەوە     کێ دیەن مەغریب جە بەیانەوە؟

هەرتا «موستەفا» سەر مەنیانەوە     هەر ها وە حەسرەت ئەو بەیانەوە

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ئەم پارچە شێعرە لە (ب) و (ح)یشدا هاتووە و کاکە حەکیم مەلا ساڵح لە شەرح کردنیدا نووسیویە: «ئەم شێعرە لە نوسخەکەی بەردەستمان و بەرهەمەکەی (ک)یشدا نەبوو، ئێمەیش لە کتێبی (پیرشالیاری زەردەشتی)مان وەرگرت» و هەروەها نووسیویە:«ئەم شێعرە لە کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردیدا لاپەڕەی ٢٢١ بە ناوی (حەسەن کەنۆش) بڵاوکراوەتەوە» (بێسارانی، ١٣٧٥: ١٠٧).

ئەمەیش پارچە شێعری «چراخم بەیان» بە پێی نوسخەکانی «ج» و «عم»:

چراخم بەیان، چراخم بەیان     کاتێ مەخێزی جە وەخت بەیان

دەستم دامانت بنمانە بەیان     تا دیدەم وە سەیر بەیانت بەیان

نەبا ڕەقیبان جە خاودا بەیان     ڕاز من و تۆ بکەران بەیان

قیبلەم باجەتی حەی واچە حەیان     وەنەوز نەکەران جە دەور بەیان

ناڵەم بەرزتەرەن جە ناڵەی نەیان     ئەگەر ڕەقیبان جە خاودا بەیان

«موستەفا» تا سەیر بەیانت کەردەن     داخ بەیانت بەردش وە مەردەن

هەروەها کە ئاماژەمان پێ کرد ئەم دوو پارچە شێعرە لە هیچ کام لە نوسخە بنەڕەتیەکانی ئێمەدا نەهاتووە و ئێمە تەنیا بە پێی ئەو دوو نوسخە هێناومانە و بۆیشی هەیە هی بێسارانی نەبن، بەڵام خۆ ئەگەر هی بێسارانیش بن بەو مانا نییە کە بێسارانی «موستەفا»ی وەک نازناوی شێعری بە کار هێنابێت، چون تەنیا لەو دوو پارچە شێعرەدا «موستەفا»ی بە کار هێناوە. کە وابوو بێسارانی لە نازناوی «موستەفا»یش کەڵکی وەرنەگرتووە.

**ئەی نازناوی بێسارانی چی بووە؟**

هەروەک لە سەرەوە ئاماژەمان پێ کرد مەلا موستەفا لە شێعرەکانیدا نازناوی بۆ خۆی هەڵنەبژاردووە و کەڵکی لە نازناو وەرنەگرتووە بەڵام لە سەردەمی خۆیدا- بە پێی ئەو خاڵانەی لە پاشدا ئەیهێنین - لە نێوان شاعێراندا بە «مەحزوونی» ناسراوە و ناو براوە. هەرچەند خۆی (جگە لە یەک جێگەدا) ئاماژەی پێ نەکردووە:

١- لە نوسخە خەتیەکاندا «بە تایبەت نوسخەی (ک)» لەسەر پارچە شێعرەکانی بێسارانیدا نووسراوە «و لە محزونی» یا «مولانا محزونی».

٢- «دەردین» کە شاعێرێکی هاوچەرخی بێسارانی بووە و شێعری بۆ بێسارانی نووسیوە و لە نوسخەی «ک»دا شێعرەکەی دەردین هاتووە، لەسەری نووسراوە «دەردین در سوال»، لەو شێعرەدا دەردین بە «مەحزوونی» وڵامی بێسارانی دەداتەوە. ئەمەیش شێعرەکەی دەردین بە پێی ئەو نوسخە:

| | |
|---|---|
| ئەرێ مەحزوونی!، ئەرێ مەحزوونی! | هام ستارەی قەیس وێڵ، مەحزوونی! |
| پەی دەردەداران تۆ ڕانموونی | ماچا تۆ نۆشان جام مەجنوونی |
| ئوجاخ قەدیم مورشێد زادەنی | جە سەرمەشق عەشق تەعلیم دادەنی |
| دڵ سەودای کەسێش یا کەوتەن وە سەر | نوورش زیادەن جە نوور خاوەر |
| ها نە جایێدا یاگەی دەنگ نیەن | دڵە سۆزانەن ئەو بە تەنگ نیەن |

پیـــر دەردەدار!، ڕەهنومـــای عەشـــق     یـە کـام خەیاڵـەن دڵ مەکـەرۆ مەشـق؟

بێسارانیش بە پارچە شێعری «دەردین دڵ بە کام» وڵامی داوەتەوە و لە نوسخەکەدا لەسەری نووسراوە «محزونی در جواب» و لە لێکدانەوەی پارچە شێعرەکەی بێسارانی دا زیاتر باسی لەسەر کراوە.

٣- خودی بێسارانی لە شێعری «ناڵەی دەردەدار بێ ئاخ نمەبۆ»دا وشەی «مەحزوونی» بە کار بردووە: «مەحزوونی! عاشق بێ یار نمەبۆ».

بە پێی ئەم چەن خاڵە کە باسمان کرد دەتوانین بڵێین کە بێسارانی سەردەمی خۆی و تەنانەت دوای خۆیشی بە «مەحزوونی» بە ناوبانگ بووە.

## «مەولا»ی شاعێران

هەرچەند شێعرەکانی بێسارانی، بە ڕواڵەتیش بێت عاشقانەیە و هیچ بەڵگەیـەک بە دەستەوە نییە کە موریدی هیچ شێخێک بوویێـت، بـەڵام لـە عیرفـان دوور نـەبووە و زۆرێک لە شاعێرانی هاوچەرخی و شاعێرانێکیش کە پاش خـۆی هاتوونەتـە گۆڕەپـانی ئەدەبەوە بە «مەولا» ناوی دەبەن. ئەمە نیشاندەری ئەوەیە بێسـارانی سـەردەمی خـۆی مەلایەکی تەواو و خاوەن پلە و پایەیێکی مەعنەویش بووە. هەروەک لـە شێعریشـیدا خاوەن دەسەڵات بووە و شاعێرە هاوچەرخەکانی بە مامۆستای خۆیان ناسیویانە.

بۆ وێنە بە چەند شـاعێر لـەو شـاعێرانەی کـە هاوچـەرخی بـوون و شـێعریان بـۆ نووسیوە و یا لە ڕەدیفی شێعرەکانیدا شێعریان هۆنیوەتەوە ئاماژە دەکەین کە بـە داخـەوە ژیان و بەسەرهاتی زۆریان بە جوانی و ڕێک و پێکی دیار نییە و تەنانەت هەندێکیشیان تەنیا لەبەر ئەوەی لە ڕەدیفی شێعرەکانی بێسارانیدا شێعریان هۆنیوەتەوە ناویـان مـاوە و لە کەشکۆڵی «ک»دا کە لە بەشی نوسخە خەتیەکاندا باسی لەسەر کـراوە، بـە بۆنـەی بێسارانییەوە ناویان هاتووە.

١- موحەممەد قولی سلێمان: ئەم شاعێرە لە ڕەدیفی پارچە شێعری «ئارۆ دیم خەزان دوور جە پای نەمام»دا پارچە شێعرێکی هۆنیوەتەوە کە بەم جۆرە دەست پێدەکات: «ئارۆ شیان دیم ڕەنگ خەزانان» کە بە داخەوە لە دیوانە چاپ کراوەکاندا دراوەتە پاڵ بێسارانی. بە سەرنج دانی وردی دوو پارچە شێعرەکە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بێسارانی چەند کاریگەری لەسەری هەبووە، بە جۆرێک کە زۆر کەس شێعرەکە لە شێعری بێسارانی جیا ناکاتەوە[١].

٢- پەشێو: ئەم شاعێرە کە بە داخەوە سەبارەت بەو زانیاریەک لەبەر دەستدا نییە شێعرێکی بۆ بێسارانی نووسیوە کە بەم جۆرە دەست پێدەکات:

مەولام! پێم هاڵێ، مەولام! پێم هاڵێ     مەولام! دوور جە تۆ، پێم یاوان هاڵێ

و بەم جۆرە تەواو دەبێت:

مەولام تۆ مەولای گشتین مەولانی     هومێم هەر بە تۆن، مەولای ئەولانی

پەشێو لە پارچە شێعرەکەیدا بێسارانی بە «مەولا» و «مەولای ئەولا» ناو دەبات. بێسارانی بە پارچە شێعری «پەشێو! پێکیای ناوەک ئەندازان» وڵامی داوەتەوە کە لە شەرحی شێعرەکەی بێسارانیدا شێعرەکەی ئەویشمان هێناوە.

٣- شێخ ئەحمەد تەختی مەردوخی (١١٣٤-١٠٢٩ ک.م): شێخ ئەحمەد لە ڕەدیفی شێعری «میرزام نەو وەهار»ی بێسارانیدا شێعرێکی داناوە کە بەم جۆرە دەست پێدەکات:

تەرزێو خەزان دیم جە فەسڵ هامن     بە گڕ مەسۆچیا بەتەرتەر جە من

وە بەم جۆرە تەواو دەبێت:

مەولام! هەر کەسێو دەروون پەڕ دەردەن     جە هەر فەسڵێدا زایف و زەردەن

---

١- لە لێکدانەوەی شێعرەکەی بێسارانیدا شێعرەکەی موحەممەد قولی سلێمانیشمان هێناوە و بۆ هەڵسەنگاندن دەتوانن سەیری بکەن.

هەروەها کە دیارە ئەمیش بێسارانی بە «مەولام» ناو دەبات. شێعرەکە بە تەواوی لە شەرحی پارچە شێعرەکەی «میرزام نەو وەهار»ی بێسارانیدا هاتووە. پێویستە ئاماژە بەمەیش بکەین کە ئەم پارچە شێعرە لە بەرگی یەکەمی «تاریخ مشاهیر کرد» لاپەڕەی ٢٢٧و هەر وەها نوسخەی «ک» و نوسخەی «ئێ»دا بە ناوی «شێخ ئەحمەد»ەوە هاتووە بەڵام بە داخەوە لە دیوانە چاپ کراوەکاندا دراوەتە پاڵ بێسارانی.

٤- حاجی عەلی موحەممەد بەگ تیلەکۆ: بە داخەوە لەسەر ئەم شاعێرەیش زانیاریەکی ئەوتۆ بە دەستەوە نییە بەڵام لە ڕەدیفی پارچە شێعری «ساقی مەی داریم»ی بێسارانیدا پارچە شێعری «موتریب نەوای چەنگ»ی هۆنیوەتەوە کە لە دیوانە چاپ کراوەکاندا هەر وەک پارچە شێعری «چراخم ئەر بەی» کە هی ئەوە، بە ناوی بێسارانییەوە چاپ کراوە.

٥- دەردین: ئەم شاعێرە پارچە شێعرێکی ناردووە بۆ بێسارانی کە بەم جۆرە دەست پێ دەکات:

ئەرێ مەحزوونی!، ئەرێ مەحزوونی! هام ستارەی قەیس وێڵ، مەحزوونی!

و بەم جۆرە تەواو دەبێت:

پیر دەردەدار!، ڕاهنمای عەشق! یە کام خەیاڵەن دڵ مەکەرۆ مەشق؟

دیارە ئەم شاعێرەیش بێسارانی بە «پیر» و «ڕاهنمای عەشق» ناو دەبات. بێسارانی بە شێعری «دەردین دڵ بە کام» وڵامی داوەتەوە کە لە شەرحەکەیدا شێعرەکەی دەردینیشمان بە تەواوی هێناوە.

٦- شێخ لوتفوڵڵا: لە ڕەدیفی «ڕوێ سپای کوفر دیم نە دەور دین»ی بێسارانیدا، شێعری «ڕوێ دیم کوفرێ ڕووی ئیمان مەگرت»ی هۆنیوەتەوە کە بە داخەوە لە دیوانە چاپ کراوەکاندا دراوەتە پاڵ بێسارانی. لە شەرحی شێعرەکەی بێسارانیدا شێعرەکەی ئەویشمان هێناوە.

٧- یۆسف یاسکە: شاعێری دەرباری خان ئەحمەد خان و هاوچەرخی بێسارانی بووە.[1] لەگەڵ بێسارانی شێعریان بۆ یەک نووسیوە و ئەویش بێسارانی بە «مەولا» ناو دەبات. بێسارانی پارچە شێعری «یۆسف دارایی»ی بۆ ئەو نووسیوە و ئەویش بە پارچە شێعری «مەولام! پەرِ جە دەرد» وەڵامی داوەتەوە کە لە شەرحی شێعرەکەی بێسارانیدا پارچە شێعرەکەی یۆسف یاسکەیشمان هێناوە. هەر وەها پارچە شێعری «ئارۆ کوفرێ دیم ئیمان مەپۆشا»ی لە ڕەدیفی «ڕوێ سپای کوفر دیم نە دەور دین»ی بێسارانیدا هۆنیوەتەوە و پارچە شێعری «جە بێساران ماڵ»ی بۆ بێسارانی نووسیوە و بێسارانیش بە شێعری «یۆسف کەم نیەن» وڵامی داوەتەوە کە لە شەرحی شێعرەکەی بێسارانیدا شێعرەکەی یۆسف یاسکەیش هاتووە.

٨- مەلا تاهێر هەورامی: بە داخەوە زانیاری زۆرمان لەسەر ئەم شاعێرە نییە بەڵام وەک دیارە دەبێت هاوچەرخی بێسارانی بووبێت. لە ڕەدیفی شێعری «ڕێحان بێ گەرد»ی بێسارانیدا پارچە شێعری «تەڵێو جە ڕێحان پەرێشان شێوە»ی هۆنیوەتەوە کە لە شەرحی شێعرەکەی بێسارانیدا هێناومانە.

٩- میرزا ئیبراهیم: بە ناوی «شێخ ئیبراهیم»یشەوە ناسراوە و وەک لە پێشەکی «کەشکۆڵی شێعری کوردی گۆرانی» نووسراوە خەڵکی هەورامان و هاوچەرخی بێسارانی

---

١- جێگەی ئاماژەیە کە لە کتێبەکانی «سیرالاکراد» و «تاریخ اردلان»دا یۆسف یاسکە وەکوو گۆرانیبێژ و شاعێری دەرباری «خان ئەحمەد خانی یەکەم» ناسراوە و هەر بە دەستی ئەویش کوژراوە. خان ئەحمەد خان تا ساڵی ١٠٤٦ کۆچی ژیاوە و بێسارانیش ساڵی ١٠٥٣ کۆچی هاتووەتە دونیا و ئەم دوو مێژووە یەک ناگرنەوە و ئەوەش کە مامۆستا بێسارانی و یۆسف یاسکە شێعریان بۆ یەکتر نووسیوە، شک و گومانی تێدا نییە و بەم پێیە ئەگەری ئەوە دێتە ئاراوە کە ساڵەکانی لە دایکبوون و کۆچی دوایی مامۆستا بێسارانی (١٠٥٣-١١١٣) دروست تۆمار نەکرابن. (ئەم تێبینییە دوای چاپی دیوانی بێسارانی بە کۆکردنەوەی مامۆستا حەبیبی لە لایەن بەرێزیانەوە زیاد کراوە/وەرگێڕ).

بووه و له ساڵەکانی ١٠٥٠ی ک.م دا ژیاوه. پارچه شێعری «زڵێخام تەیار»ی له ڕەدیفی پارچه شێعری «زڵێخام ساوان»ی بێسارانیدا هۆنیوەتەوه که به داخەوه له دیوانه چاپ کراوەکاندا به ناوی بێسارانییەوه هاتووه.

١٠- ئەلیاس بەگ: زانیارییەکی زۆرمان لەسەر ژیانی نییه بەڵام وەک دیاره هاوچەرخی بێسارانی بووه و پارچه شێعری «ساقی ساکەی کەی؟»یی له ڕەدیفی شـێعری «سـاقی مەی داریم»ی بێسارانی هۆنیوەتەوه که ئەمیش هەر وەک پارچه شێعرەکانی دیکـه لـه دیوانه چاپ کراوەکاندا به نـاوی بێسـارانییەوه چـاپ کـراوه. لـه شـەرحی شـێعرەکـەی بێسارانیدا ئاماژەمان پێ کردووه.

١١- مەلا فەزلوڵڵا: که به «مەلای هەورامی»یـش ناسـراوه، پارچـه شـێعری «سـاقی ناڵەی نەی»یی له ڕەدیفی «ساقی مەی داریم»ی بێسارانیدا هۆنیوەتەوه که لـه دیوانـه چاپ کراوەکاندا به ناوی بێسارانییەوه چاپ کراوه و ئێمەیش لـه شـەرحی شـێعرەکـەی بێسارانیدا ئاماژەمان پێ کردووه.

١٢- ئوستاد میکائیل: زانیارییەکی زۆر لەسەر ژیانی له بەر دەستدا نییه بـەڵام بـۆی هەیه هاوچەرخی بێسارانی بووبێت، ئەویش له شێعرێکدا که بۆ بێسارانی نووسـیوه بـه «مەولا» ناوی دەبات. پارچه شێعری «مەولام! گوڵ خونچەی ساوای نەشـکوفته»ی لـه ڕەدیفی شێعری «گوڵخونچێوه دیم وەرەق نەشکوفته»ی بێسارانی نووسیوه که به داخەوه له دیوانه چاپ کراوەکاندا دراوەته پـاڵ بێسـارانی و بـه نـاوی ئـەوەوه چـاپ کـراوه. لـه شەرحی شێعرەکەی بێسارانیدا، شێعرەکەی ئوستاد میکائیلیشمان هێناوه.

١٣- مەولانا زەینولعابدین: کـه بـه «زەینولعابـدین پاڵنگـانی» ناسـراوه و هاوچـەرخی بێسارانی بووه و بێسارانی به «مەولا» ناو دەبات. پارچه شێعری «مەولام! سۆسەن گوڵ نەشکاویا دەم»ی له ڕەدیفی شێعری «سۆسەن گوڵێ دیم بـۆش چـوون عەنبـەر بـێ»ی بێسارانی هۆنیوەتەوه و له شەرحی شێعرەکەی بێسارانیدا شێعرەکەی ئەویشمان هێناوه.

١٤- مەولانا قاسم: وەک کاک ئەنوەری سوڵتانی لە سەرەتای «کەشکۆڵە شێعری کوردی گۆرانی» نووسیویە «مەلا قاسم» خەڵکی «پایگەلان» و خەزوورەی بێسارانی بووە. ئەویش لە ڕەدیفی شێعری «باد هەر جایی» بێسارانیدا پارچە شێعری «مەولام! جە سەحەر»ی هۆنیوەتەوە کە لە دیوانە چاپ کراوەکاندا بە ناوی بێسارانییەوە چاپ کراوە. دیارە ئەویش بێسارانی بە «مەولا» ناو بردووە. لە شەرحی شێعرەکەی بێسارانیدا شێعرەکەی مەولانا قاسمیشمان هێناوە. شایانی باسە کە پارچە شێعری «قیبلەم جە لاتەن»یش هەر شێعری «مەولانا قاسم»ـە کە ئەویش هەر لە دیوانەکاندا بە شێعری بێسارانی لە قەڵەم دراوە.

١٥- مەولانا فەڕوخ پاڵنگانی: هیچ زانیارییەک لەسەر ژیانی مەولانا فەڕوخ لەبەر دەستدا نییە. لە ڕەدیفی پارچە شێعری «تاف دێوانە»ی بێسارانیدا شێعری «مەولام! بێ قەرار»ی هۆنیوەتەوە کە ئەویش هەر بێسارانی بە «مەولا» ناو دەبات. لە دیوانە چاپییەکاندا شێعرەکەی مەولانا فەڕوخیش هەر بە شێعری بێسارانی لە قەڵەم دراوە و ئێمەیش لە شەرحی پارچە شێعرەکەی «تاف دێوانە»دا هێناومانە.

١٦- مەلا حافێز فەرهاد: سەبارەت بە مێژووی لە دایک بوون و ژیانی هیچ زانیارییەک لە بەر دەستدا نییە، پارچە شێعری «مەولام! دەردەشەن»ی لە ڕەدیفی شێعری «تاف دێوانە»ی بێسارانیدا هۆنیوەتەوە و بێسارانی بە «مەولا» ناو دەبات. پارچە شێعرەکەی مەلا حافێزیش بە ناوی بێسارانییەوە چاپ کراوە و ئێمە لە شەرحی شێعرەکەی بێسارانیدا بە تەواوی هێناومانە.

## کاریگەری بێسارانی لەسەر شاعێران

بەڕاستی دیاری کردنی ئەوەی کە بێسارانی یا هەر شاعێرێکی دیکە چ کاریگەرییەکیان لەسەر شاعێرانی تر هەبووە کارێکی ئەستەم و دژوارە بەڵام بە پێی

ئەوەی بێسارانی سەبک و شێوازێکی تایبەت بە خۆی هەبووە دەتوانین تا ڕادەیەک کاریگەریەکانی لەسەر شاعێرانی دیکە دیاری بکەین.

گومانی تێدا نییە کە بێسارانی لەسەر شاعێرانی هاوچەرخی خۆی کاریگەریەکی زۆری هەبووە، بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بکەین بەو شاعێرانەی کە لە بەشی **«مەولای شاعێران»**دا باسمان کردن، تەنانەت هێندە دوای سەبک و شێوازی بێسارانی کەوتوون کە شێعرەکانیان بە ناوی بێسارانییەوە لە چاپ دراوە. ئەمە نیشاندەری ئەوەیە شێعرەکانیان زۆر لە سەبک و شێوازی بێسارانییەوە نزیکە، هەروەک لە شەرحی شێعرەکانی بێسارانیدا نموونەمان هێناوە و ئاماژەمان پێ کردووە کە زۆربەیان هەر شوێن شێوازەکەی ئەو کەوتوون. پێویستە ئەوەیش بڵێین کە لەو بەشەدا ئێمە تەنیا ئاماژەمان بەو شاعێرانە کردووە کە لە ڕەدیفی شێعرەکانی بێسارانیدا شێعریان هۆنیوەتەوە و شێعرەکانیان بە ناوی خۆیانەوە لە نوسخەی «ک»دا نووسراوە. بۆی هەیە کە بێ گومان هەر وەهایشە ئەو شاعێرانە زیاتر بن کە بە داخەوە ناویان نییە و شێعرەکانیان فەوتاوە و ئەگەریش مابێت بە ناوی یەکترەوە لە قەڵەم دراون.

کاریگەری بێسارانی تەنیا لەسەر ئەو شاعێرانە نەبووە کە هاوچەرخی بوون و لە سەردەمی خۆیدا ژیاون، بەڵکوو پاش خۆیشی و تا ئێستایش ئەو کاریگەریە هەر درێژەی هەیە. ئێمە لێرەدا ئاماژە بە چەن نموونە دەکەین کە بە ڕوونی دیارە شێعری بێسارانیان خوێندووتەوە و لە ژێر کاریگەری شێعرەکانی ئەودا شێعریان نووسیوە.

١- مەولەوی تاوگۆزی: مەولەوی یەکێک لەو شاعێرە پایە بەرزانەیە کە لە سەردەمی خۆی و دوای خۆیشی بەشێکی زۆر لە شاعێران لە ژێر کاریگەریدا بوون و تەنانەت پلە و پایەی لای شاعێرانی دیکە بە ڕادەیەک بەرز بووە کە شاعێرانێکی وەک «داخی» و «مەحرووم» و «شێخ عەزیز» و «شیخ عەبدولڕەحمان» و «شێخ یۆسف» و... شێعری خۆیان بۆ هەناردووە تا هەڵیسەنگێنێت و عەیاریان دیاری بکات. بەڵام کاریگەری

بێسارانی لەسەر ئەو زاتە گەورە بە رادەیەک بووە کە بە «سەودایی کامڵ» ناوی دەبات و شێعرەکانی تێهەڵکێش دەکات. ئەمە نیشاندەری پلە و پایەی بێسارانییە کە چ شاعێرێکی پایە بەرز و بە دەسەڵات بووە. مەولەوی لە شێعرەکانیدا هەم ناوی بێسارانی بردووە و هەم لە شێعرەکانیدا شێعری بێسارانی هێناوە کە لێرەدا ئاماژە بە چەن نموونەی دەکەین:

- لە پارچە شێعری «هەرچەند هێجرانت یەند زۆر ئاوەردەن»دا کاتێ باسی «هیجران» دەکات و گلەیی لە دووری یارەکەی دەکات، لە کۆتاییدا بێسارانی بە «سەودایی کامڵ» ناو دەبات و دەست دەبات بۆ بەیتێکی ئەو و بەو بەیتە دڵی هێوەر دەکاتەوە:

دەک ڕەحمەت ئەو قەبر سەودایی کامڵ     سەرمەشق مەینەت بێساران مەنزڵ
«یانە وێرانی هەر بە من ئامان     مەتاوو گێرتەی کەسێوتەر دامان»[1]

- کاتێک کە «تەوێڵی ئارەزووی ئەژنۆی دەکات»[2] و دەیەوێت «تەعزیمی جەنابی پیری بکات» و داوای لێخۆش بوون لە خودا دەکات، دەلاڵێتەوە کە موتریب بە دەنگە خۆشەکەی وێرانەی دڵی ئاوەدان بکاتەوە و چەند بەیتێک لە شێعرەکانی بێسارانی بۆ بخوێنێتەوە تا بەو شێعرانە دڵی ئارام بێتەوە:

موتریب! بۆ وە داد دڵگیریمەوە     پیری ها ئاما وە پیریمەوە
نەوات وێرانەی دڵ کەرۆ ئاوا     چەنی بەستەی فەرد «بێساران» ماوا
«ئانە گشت جە وەخت ناذانیم بیەن     فەسڵ سەرمەستی و جەوانیم بیەن
ئیسە ها جە گشت پەشیمانیم بەرد     فەسڵ پیریمەن، جەوانیم وەرد

---

١- دێڕێکە لە شێعری «چراخ نە تۆ بەست»ی بێسارانی. لە دیوانی مەلەویدا بە جێگەی «بە من» «وە من» و بە جێگەی «مەتاوو»، «مەتاوون» نووسراوە.

٢- لە پارچە شێعری «پێشانیم هەوەس زانووش جازمەن» دا.

وادەی پیریمـــــەن، یـــــاوانم نۆبـــــە      نۆبـــەی تۆبەمـــەن، کەرەمـــدار تۆبـــە »[١]

- کاتێک وڵامی نامەکەی « شێخ عـەزیز جانـەوەرەیی» ئەداتـەوە[٢] و داوای لـێ دەکـات سەری لێ بدات تا بەشکوو بە یەک گرتنیان خەمیان کەم بێتەوە. خۆشترین شتێک کە پێی ئیلهام دەبێت ئەوەیە کە «خەم چەنی خەمان زوو مەبۆ ساکن»:

تەشـــریف بـــاوەرە جەرگـــەمان جـــەم بـــۆ      بەڵ وەی جـەم خـەمێ جـەلامان کـەم بـۆ

«بێســارانی»یــەن نــە تــۆی فــەرد مــن      «خەم چەنی خەمان زوو مـەبۆ سـاکن»[٣]

- کاتێک وڵامی نامەی شێخ «سیراج الدین» ئەداتەوە[٤]، وەک دیارە شێخ لە شێعرەکەیدا دێرێک لە شێعرێکی[٥] بێسارانی هێنـاوە و مەلـەویش ئامـاژەی پـێ دەکـات و لەگـەڵ بەیتێکی تری شێعرەکەی شێخ دا دەیهێنێت[٦]:

دەرگـــای حوققـــەی لاڵ دانـــەت شـــکاوان      جـــە ڕووی لوتفـــەوە پێســـەت فـــەرماوان

«یـــا کاغـــەز بریـــان، یـــا مـــەڵلا مـــەردەن      یا خۆ عارتـــەن جـــە دۆس یـــاد کـــەردەن»[٧]

«خـــەمگین مـــەنیشـــە، خـــەم بـــدەر وە بـــاد      فەلـــەک نمـــازۆ کـــەس وە خـــاتر شـــاد»[٨]

---

١- ئەم سێ بەیتە لە پارچە شێعری «گەردوون بەردەنم»ی بێسارانی گیراوە.

٢- لە پارچە شێعری «نامەکەت یاوا کۆسم کەوتەوە».

٣- نیوەبەیتێکە لە پارچە شێعری «یاران کی دیەن»ی بێسارانی.

٤- لە پارچە شێعری «شێخ دەوڵەمەند بەهرەی سەرمەدی»یدا.

٥- پارچە شێعری «چراخم کامەن»ی بێسارانی.

٦- کاکە حەکیم مەلا ساڵح بەیتە شـێعرەکەی شێخیشـی داوەتـە پـاڵ بێسـارانی و بـە نـاوی ئـەوەوە هێناویە.

٧- لە دیوانەکەدا بە جێگەی «جە دۆس یاد کەردەن»، «دۆس وە یاد کەردەن» نووسراوە.

٨- ئەم بەیتە شێعرە هی شێخ «سیراج الدین»ـە

- کاتێک داوا لە دەروێش دەکات کە بە دەنگی دەفەکەی ڕایبچڵەکێنێت و تەرکی خەوی شیرینی بکات دەفەرموێ[1]:

واچە: هەی دڵەی ئەبڵەی بێ خەبەر     هۆرێز، ساتێ تەرک خاو شیرین کەر
«شەوەن، خەڵوەتەن، ماڵ بێ ئەغیارەن     ئاڵەم گرد وتەن دۆس خەبەردارەن»[2]

- هەر وەها لە دوو دێڕە شێعردا دەفەرموێ:

«پەردەی[3] سیاماڵ هۆردا، دیاوە     چوون مانگ نە گۆشەی هەور سیاوە»
بە خودا قەسەم پاسەم ئومێدەن     (حور المقصورات فی الخیام) ئێدەن

کە بەیتی هەوەڵی شێعری بێسارانییە[4]

٢- ئەحمەد بەگی کۆماسی: بێسارانی لەسەر «خاڵۆی کۆماسی»یش کە هاوچەرخی مەلەوی بووە و ئەوی بە خاڵۆی کۆماسی ناو بردووە، کاریگەریەکی زۆری هەبووە. ئەگەر بە وردی سەیری شێعرەکانی ئەحمەد بەگ بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە تا چەند شوێن سەبکی بێسارانی کەوتووە، هەرچەند خۆی لە شێعرەکانیدا ئاماژەی پێ نەکردووە بەڵام بۆ هەڵسەنگاندیان دەتوانن سەیری ئەو پارچە شێعرانەی ئەحمەد بەگ بکەن کە بە «چراخ» و «قیبلەم» دەست پێ دەکات، بۆ نموونە ئاماژە بە سێ پارچە شێعری دەکەین:

ئەحمەد بەگ دوو پارچە شێعری هەیە کە بە «چراخم شەو بۆ» دەست پێدەکات و هەردوو پارچە شێعرەکەی لە سەر ناوەرۆکی پارچە شێعری «قیبلەم وە شەو بۆ»ی بێسارانی هۆنیوەتەوە.

ئەمە پارچە شێعرەکەی بێسارانییە:

---

١- لە پارچە شێعری «بەزم هام فەردان یار مۆبەت کێش»دا.

٢- تاکە بەیتێکە لە بێسارانی.

٣- لە دیوانی مەولەویدا بە جێگەی «پەردەی» نووسراوە «گۆشەی».

٤- لە پارچە شێعری «شیرین نیاوە»یە.

قیبلەم! وە شەو بۆ، قیبلـەم! وە شـەو بـۆ    مەیل کەر وە جەستەم شەوێ وە شـەو بـۆ
بڎەم نـە دەمـاخ شـەوبۆت چـوون شـەوبۆ    تـا دڵـم سـاکن وە بـۆی شـەوبۆت بـۆ
نـە ماچـان شـەوبۆ جـە سەرنسـاران    شـەو بـۆش مەبەخشـۆ پـەی دەردەداران
قیبلەم! تۆیچ بـەو ڕەنـگ شـەوبۆ بنمانـە    شـەوێ بـە شـەماڵ شـەوبۆت بکیانـە
شـەماڵ بـۆی شـەوبۆ بـە دەوان دەو    بـاوەرۆ پـەرێ دەردەدار شـەو

ئەمەیش دوو شێعرەکەی ئەحمەد بەگ:

چـراخم! شـەو بـۆ، چـراخم! شـەو بـۆ    شـەوێ جـە شـەوان شیم پـەرێ شـەوبۆ
هەراس بـیم جـە داخ شـەوبۆی زڵـف تـۆ    لاعـەلاج چنـیم دەسـتەی شـەوبۆی کـۆ
شـایەد بـۆی زڵفـت کـەمێ بـەیۆ لـێش    بەڵکـە زامـانم کەمتـەر کـەران ئـێش
چەنـدێ بـۆ نیـام بـۆ وە بـۆی شـەوبۆ    بۆش مـەڎا ئـەمما نـە چـوون زڵـف تـۆ
فیدای ئەو شا بـام تـۆش ئیجـاد کـەردەن    زڵفانـت گـرەو جـە شـەوبۆ بـەردەن
ئەر شـەو بـۆی زڵفـت بـڎەم بـە شـەو بۆ    دەیـری بـام نـە جـەمع دەیریـان کـۆ
ئەحمەد تـا زێنـدەن هـەر سـەرگەردانەن    پـەی شـەوبۆی زڵفـت وێـڵ هەردانـەن

(کۆماسی، ١٣٨٩: ٨٤)

وە:

چـراخم! شـەو بـۆ، چـراخم! شـەو بـۆ    مەیل کەر وە جەستەم شەوێ جە شەو بـۆ
شەوبۆ جـە شـەوبۆی شـەوبۆت گێرتـەن بـۆ    جە شەوبۆی شەوبۆت شەوبۆ بۆش چوون تـۆ
شەوبۆی شەوبۆوان هەم جە شەوبۆی تـۆن    شەوبۆی تۆ نەبۆ، شەوبۆ بـۆش جـە کـۆن
شـەو بـۆ وە نـاز بـۆ شـەوبۆت وە نـاز بـۆ    شـەو چـەنی شـەوبۆت بـڎەر پـێم تـا ڕۆ
ئەر شەو بۆت بـڎەون مـن بـە شـەوبۆوان    چـەنی شـەوبۆوان بگنـوو ئـەو کـۆوان
«ئەحمەد» خۆ شەیدای شەوبۆی نازتـەن    شـێوەی کرێشـمەی شـەوئەندازتەن

(هەر ئەوە: ٨٥)

هەر وەها پارچە شێعری «چراخم جەی ڕۆ» کە ڕەنگ و بۆی پارچە شێعری «قیبلەم نەکێشۆ»ی بێسارانیی پێوە دیارە. سەرەتا سەیری بەشێک لە پارچە شێعرەکەی بێسارانی بکەن:

قیبلەم نەکێشۆ، قیبلەم نەکێشۆ     سەرێ کە سەودای خاڵت نەکێشۆ
خاترێ وە غەم تۆ نەیەندێشۆ     وە زام ناوەک سوب سەحەر بێشۆ
سەرێ وە لای تۆ سەر نەدۆ شەوان     پایێ کە نەیۆ وە لات وە دەوان
ئەو سەر سەرنگوون گڵکۆی تازە بۆ     ئەو پا گەستەی مار بێ ئیجازە بۆ
دیدێو نەوینۆ هەر سەحەر ڕەنگت     زوانێو نەبۆ شەو بە هام دەنگت
ئەو دیدە ئەسرش بێ مدارا بۆ     ئەو زوان بە سەنگ سیای سارا بۆ
دەسێو نەکەرۆ سەیرانی باخت     نەکەرۆ خزمەت بەرزی دەماخت
ئەو دەستە بەستەی جەلادی گەور بۆ     هەر ڕۆ جە نۆوە سزاش بەی تەور بۆ

کۆماسی:

چراخم! جەی ڕۆ، چراخم! جەی ڕۆ     من جە ڕۆی ئەزەڵ مەتەرسام جەی ڕۆ
مەزانام گردش ئی چەرخ بێ پۆ     مەکەرۆم مەحرووم جە دیدار تۆ
ڕۆی وەسڵت هەر بیم ئی ڕوە پێم بێ     جەو بۆنەو هەر ڕۆ ڕو ڕۆ خدێم بێ
ها فەڵەک ئەو ڕۆ نیشان دادەن پێم     ئای تەرسیاکەی گیر ئاوەردە وێم
ئیسە کێ تاقەت دووری تۆ دارۆ     دەک بەرق غەزەب وە بەختم وارۆ
پەی چێش ئی عومر تاڵتەر جە ژارە     ئی ئەعزای بێ سەرف مەینەتان بارە
چوونکە کۆچمەن جە دیدار تۆ     هەر یەک وە دەردێ با گرفتار بۆ
دیدەی نەوینۆ هەر سەحەر دیدەت     نەدێو وە خاڵان قودرەت ڕەژیدەت
ئەو دیدە وە نێش نێشتەر کنیابۆ     دیانش وێنەی زڵف سیا بۆ
زوانێ هەر شەو چەنیت نەبۆش باس     فەرەق فەرەق بۆ چوون سفتەی پەلاس

دەستێو جەم نە چێر جەیرئاسات نەبۆ / گاگا شانەی زڵف تا وە تات نەبۆ

ئەو دەستە گەستەی مار پەڕ ژار بۆ / وە گاز ماران لەتار بۆ

گۆشێ نەشنەوۆ ڕێزەی ڕاز تۆ / ئەو چفەی وە نەرم دڵنەواز تۆ

هەر پەی ئێدْ خاسەن ئەترەش بۆ دەربەس / بادا نەشنەوۆ هەنی دەنگ کەس

وەلحساڵ ژیان بێ دیدار تۆ / بەدْتەرەن جە مەرگ نەونەمام نۆ

«ئەحمەد» ئومێدْش بە دانای داوەر / یا تاقەت یا مەرگ یا وەسڵ دڵبەر

(هەر ئەوە: ٧٦)(لە ڕووی نوسخە خەتیەکانەوە هەڵەکانی ڕاست کراوەتەوە.)

٣- مەلا عومەر زەنگەنە (ڕەنجووری): ئەم شاعێرە پایە بەرزە کە لە ساڵی ١١٦٤ک.م لە دایک بووە یەکێک لەو شاعێرانەیە کە شێعری زۆربەی شاعێرانی پێش خۆی خوێندوەتەوە و تەنانەت لە پارچە شێعری «شوعەرای کوردستان گویەندان خاس» (زەنگەنە، ١٩٨٣: ٧٠) ناوی زۆربەیان دەبات و یەک لەو شاعێرانە بێسارانییە کە بە «مەڵڵا مستەفا، بێساران مەنزڵ» ناوی دەبات. ئەگەر بە وردی سەیری شێعرەکانی بکەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە تا چەند کاریگەری لە بێسارانی وەرگرتووە و دوای سەبک و شێوازی بێسارانی کەوتووە. زۆربەی ئەو شێعرانەی کە بە «چراخ» و «قیبلەم» و «زلێخا» و «شیرین» دەست پێدەکات، بە تایبەت بەشی شێعرە «دڵداری»یەکانی، بە تەواوی ڕەنگ و بۆی شێعرەکانی بێسارانی پێوە دیارە کە بۆ وێنە دوو پارچە شێعری دەهێنین:

بێسارانی:

قیبلەم! وە شەو بۆ، قیبلەم! وە شەو بۆ / مەیل کەر وە جەستەم شەوێ وە شەو بۆ

بدەم نە دەماخ شەوبۆت چوون شەوبۆ / تا دڵم ساکن وە بۆی شەوبۆت بۆ

نە ماچان شەوبۆ جە سەرنساران / شەو بۆش مەبەخشۆ پەی دەردەداران

قیبلەم! تۆیچ بەو ڕەنگ شەوبۆ بنمانە / شەوێ بە شەماڵ شەوبۆت بکیانە

شـــەماڵ بـــۆی شـــەوبۆ بـــە دەوان دەو　　بـــــاوەرۆ پـــــەرێ دەردەدار شـــــەو

ڕەنجووری:

چـراخم! بـە شـەو، چـراخم! بـە شـەو　　شەوێ چوون شەوبۆ با بۆت بـۆ بـە شـەو

شـەو بـۆت نـە دەمـاخ شـەوبۆ دەورێ دۆ　　تا شەوبۆ بۆی ئەو شـەو بـۆن خـۆش بـۆ

شەو بۆی شەوبۆوان جەوپەی وەش شێوەن　　شەو بۆیێش جە بۆی شەوبۆی تـۆ پێـوەن

ڕۆ ڕەنگـت مـەذۆ شـەوق وە نـوور چـەم　　شـەو شـەوبۆت نـە دڵ هـیچ نمـازۆ خـەم

ئـەر شـەوێ شـەوبۆت بـەیۆم نـە دەمـاخ　　پەی بۆی شەوبۆوان کەی مەکێشام داخ؟

ئـەر شـەوبۆت بـذۆ وە مـن بـۆی شـەوبۆ　　شەڵڵا ڕۆی ڕۆشن جە لام چـوون شـەو بـۆ

ڕەنجووری هەر شەو ئـارەزووش بـۆی تـۆن　　جەو پەی دەماخش پـەڕ عـەتر شـەوبۆن

(زەنگەنە ١٩٨٣: ١٠٠)

هەر وەها لە دیوانی ڕەنجووری دا پارچە شێعرێک بە نـاوی ئـەوەوە هـاتووە کـە تـەواوی شێعرەکە جگە لە چەن بەیتی، شێعری بێسارانییە. سەرەتا سەیری شێعرەکەی بێسارانی بکەن:

ناڵـــەی دەردەدار بـــێ ئـــاخ نمـــەبۆ　　دەروون عاشـــق بـــێ داخ نمـــــەبۆ

عاشـــق تـــا دەمـــێ جـــەفاش نمـــەبۆ　　بـــێ جـــەفا هـــەرگێز ســـەفاش نمـــەبۆ

گـــوڵ جــە گوڵســـتان بـــێ خـــار نمـــەبۆ　　بولبـــوڵ جـــە عەشـــقش بێـــزار نمـــەبۆ

هـــەر کەســـێ عاشـــق ڕەفیـــق نمـــەبۆ　　واســـڵ تـــەریق تـــەحقیق نمـــەبۆ

مـــەحزوونی عاشـــق بـــێ یـــار نمـــەبۆ　　عاشـــقان بـــێ یـــار مـــەدار نمـــەبۆ

تـــا مـــەجاز نـــەبۆ حـــەقیق نمـــەبۆ　　بـــێ مـــەجاز حـــەقیق تـــەحیق نمـــەبۆ

لێـــوەیی مـــەجنوون بـــێ لـــەیل نمـــەبۆ　　کۆکـــەنی فـــەرهاد بـــێ مـــەیل نمـــەبۆ

هەرکەســێ بــە عەشــق دڵشــاد نمــەبۆ　　دەر خـــەیر پـــەرێش گوشـــاد نمـــەبۆ

ئەمەیش شێعرەکەی ڕەنجووری کە لە لاپەڕەی ٢٢٧ی دیوانەکەیدا هاتووە:

| | |
|---|---|
| ناڵـــەی دەردەدار بــێ ئــاخ نمـــەبۆ | دەروون عاشـــق بـــێ داخ نمـــــەبۆ |
| عاشـــق تـــا دەمـــێ جـــەفاش نمـــەبۆ | بــێ جـــەفا هـــەرگێز ســەفاش نمـــەبۆ |
| گـــوڵ جـــە گوڵســتان بــێ خــار نمـــەبۆ | بولبـــوڵ جـــە عەشــقش بێــزار نمـــەبۆ |
| هـــەر کەســێ عاشــق ڕەفیــق نمـــەبۆ | واســڵ بـــە تـــەریق تـــەحقیق نمـــەبۆ |
| تـــا مـــەجاز نـــەبۆ حـــەقیق نمـــەبۆ | بــێ مـــەجاز حـــەقیق تـــەحیق نمـــەبۆ |
| شـێوەیی مـــەجنوون بــێ لـــەیل نمـــەبۆ | کۆکـــەنی فـــەرهاد بــێ مـــەیل نمـــەبۆ |
| هەرکەسـێ بـــە عەشـــق دڵشـــاد نمـــەبۆ | قـــاپی خـــەیر پـــەرێش گوشـــاد نمـــەبۆ |
| حـــەق ڕاگـــەی ڕاســـەن فـــەنوازی نیـــەن | حـــەق جـــە فـــەنبازان هـــیچ ڕازی نیـــەن |
| حـــەق وە حەســابات پـــارە و پـــووڵ نیـــەن | لاش بەندەی دوو ڕەنگ هیچ قەبووڵ نیـــەن |
| ڕاگـــەی حەقیقـــەت بگێـــرە وە دەســـت | بشـــۆ وە مەیـــدان بــێ پیاڵـــە مەســـت |
| نوتـــق نـــەزانیت بـــەرەش بـــە قەفـــەس | ڕاز پـــەنهانیت مەواچـــە بـــە کـــەس |

بە بڕوای من ئەم چوار بەیتە زۆر ناشیانە ئاوێتەی شێعرەکەی بێسارانی کراوە و مـن بـە شێعری ڕەنجووریی نازانم بەڵام بە داخەوە مامۆستا موحەممەد عـەلی قـەرەداغی کـە دیوانی ڕەنجووری کۆکردوەتەوە سەرنجی بەوە نەداوە. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی کاریگەری بێسارانی لەسەر ڕەنجووری دەتوانن سەیری دیوانەکەی بکەن.

٤- خانای قوبادی: هەرچەند خانای قوبـادی زیـاتر بـە مەنزوومـەبێـژ ناسـراوە و زیـاتر مەنزوومەکانی نیزامی گەنجەوی وەک «خوسرەو و شـیرین» و «لـەیلێ و مـەجنوون» و... کـردووە بـە هـەورامی بـەڵام هـەم لـە شـێعرەکانیـدا و هـەم لـە مەنزوومـەکانیـدا دەردەکەوێت کە شـێعرەکـانی بێسـارانی خوێندوەتـەوە و سـەبکی بێسـارانی لـە تۆتـۆی شێعرەکانیدا دیارە. بۆ وێنە:

بێسارانی:

ئانــە گشــت جــە وەخــت نــاڎانیم بیــەن فەســڵ سەرمەســتی و جــەوانیم بیــەن

ئیســە هــا جــە گشــت پەشــیمانیم بــەرد فەســــڵ پیریمــــەن، جــــەوانیم ویــــەرد

خانا:

مەعلوومــەن ئــەو وەخــت نــاڎانیم بیــەن توغیــــان مەســــتی و جــــەوانیم بیــــەن

ئیســــە ســــەرگەردان ڕای نەڎامــــەتم شــەرمەندەی عەرســەی ڕۆی قیامــەتم[1]

(قوبادی، ١٣٩٤: ٢٥٣)

بێسارانی:

ســەرێ وە لای تــۆ ســەر نــەڎۆ شــەوان پــــایێ کــــە نــــەیۆ وە لات وە دەوان

ئــەو ســەر ســەرنگوون گڵکــۆی تــازە بــۆ ئــەو پــا گەســتەی مــار بــێ ئیجــازە بــۆ[2]

خانا:

سەری بــە ئــێخلاس پــاک نــە ڕات نــەبۆ چــەمێ توتیــاش خــاک پــات نــەبۆ

ئەو ســەر ســەرنگوون جــە تــەن کنیــا بــۆ ئــەو چــەم نابینــای هــەر دوو دنیــا بــۆ

(قوبادی، ١٩٧٥: ٦٠٦)

هەر وەها پێویستە ئاماژە بەم دوو خاڵەیش بکەین:

- خانای قوبــادی پارچــە شــێعری «وە لاڵ نمــەبۆ»ی(قوبــادی، ١٣٩٤: ٢٣٥) لــە ژێــر کاریگەری پارچە شێعری «ناڵەی دەردەدار بێ ئاخ نمەبۆ»ی بێسارانی هۆنیوەتەوە کە بۆ هەڵسەنگاندنی زیاتر دەتوانن سەیری دیوانەکەی بکەن.

- هەر وەها کە لە کۆتایی ئەم باسەدا ئاماژەمان پێ کردووە بێسارانی قــاڵبێکی جیــاوازی هێناوەتە نێو شێعری مســنەوی بڕگــەیی هەورامیــەوە کــە تــا ئــەو جێگــە لــە نوســخە

---

١- دوو بەیت لە پارچە شێعری «تۆتی من تشاء»

٢- دوو بەیت لە پارچە شێعری «قیبلەم نەکێشۆ».

خەتیەکاندا هاتبێ، بەر لە ئەو نەبووە و ئەو دایهێناوە. هەر وەها کە باسمان کردووە قاڵبەکە تێکەڵێکە لە تەرجیع بەند و تەرکیب بەند، خانای قوبادی بە زۆری ئەم قاڵبەی بەکار بردووە و شێعری زۆری پێ هۆنیوەتەوە کە لەبەر درێژی پارچە شێعرەکانی، لێرەدا نایانهێنین و دەتوانن بۆ هەڵسەنگاندنی زیاتریان سەیری دیوانەکەی بکەن.

٥- میرزا عەبدولقادری پاوەیی: جێگە پێی بێسارانی لە تۆی شێعرەکانی میرزا عەبدولقادری پاوەییش‌دا دیار و بەرچاوە. میرزا عەبدولقادری پاوەیی پارچە شێعرێکی هەیە بە ناوی «دارای خەمانم» کە شەش بەیتی لە دیوانی بێسارانیشدا هەیە(بێسارانی، ١٣٧٥: ٢٤٣) و بە هەڵە بە ناوی بێسارانییەوە چاپ کراوە و لە ڕەدیفی شێعری «یاران کێ دیەن»ی بێسارانیدا هۆنیویەتەوە. لێرەدا شێعرەکەی بێسارانی لەگەڵ چەن بەیت لە شێعرەکەی میرزا عەبدولقادر دەهێنین:

بێسارانی:

یاران کێ دیەن، یاران کێ دیەن　　سەرڕەشتەی خەمان چوون من کێ دیەن
قاڵبم جە خەم ڕێزەی خەم بیەن　　ڕۆحم بە خەمناک نە قاڵب شیەن
ئەسڵم جە خەمەن، جە خەم بیەنان　　بابۆی من خەمەن، خەمان دیەنان
سەرتاپام خەمەن، جە مەدرەسەی خەم　　دەرس خەم وانان جە لام نیەن کەم
دەرسم هەر خەمەن، هەر خەم مەوانوو　　غەیر جە خەم فێشتەر هیچ نمەزانوو
هەر کەس خەمینەن بەیۆ وە لاو من　　خەم چەنیو خەمان زوو مەبۆ ساکن[١]

میرزا عەبدولقادر:

دارای خەمانم، دارای خەمانم　　سەرقەیتولەی خەم نە ڕووی جەهانم

---

١- ئەم پارچە شێعرە لە دیوانی سەیدی‌دا، چاپی ١٣٨٥ بڵاوگەی کوردستانی سنە لاپەڕەی ٢١٣ بە هەڵە بە ناوی ئەوەوە هاتووە بەڵام شێعری بێسارانییە و لە نوسخەی «ک»دا هەیە. ئەو نوسخە لە ساڵی ١١٩٧ی ک.م دا نووسراوە لە حاڵێکدا سەیدی ساڵی ١١٩٩ ک.م لە دایک بووە!

خـەم بیـەن وە مـار پـەی ڕیشـەی گیـانم نـیش خـەم نیشـتەن نـە ئوسـتخوانم
ئوستادم خەمـەن جـە مەدرەسـەی خـەم دەرس خـەم وانـان جـە لام بیـەن جـەم
دەرس من خەمەن، هەر خـەم مـەوانوون غـەیر جە خەم فێشـتـەر هـیچ نمـەزانوون
سـا هـەر کـەس خـەمێ نـە دەروون دارۆ دوور بـای وێنـەی مـن وە خـەم مـەویارۆ
خـــەم بـــذۆ وە بـــاذ بـــەیۆ وە لاو مـــن خـەم چـەنی خـەمان زوو مـەبۆ سـاکن

(پاوەای، ١٣٨٨: ٥١)

٦- پیرەمێرد: حاجی تۆفێق، ناسراو بە «پیرەمێرد» یەک لەو شاعێرە سۆرانی زمانانەیە کە کاتی خۆی هەندێک لە شێعرەکانی بێسارانی وەرگێڕاوەتە سەر سۆرانی و لە ڕۆژنامەی «ژین»دا کە خۆی سەرنووسەری بووە چاپی کردووە و لە زۆر جێگەدا ئاماژەی نەکردووە کە ئەسڵی شێعرەکە هەورامی بووە و ئەم وەریگێڕاوە، یا تەنیا نووسیویە بێسـارانی یـا هـەر هیچی نەنووسیوە. لێرەدا بۆ نموونە چەند شێعرێک لەو شێعرانە دەهێنین:

بێسارانی:

تـەرز بیـد بـە تـار، تـەرز بیـد بـە تـار تەرز بیـد چـوون زلـف مەلـەرزۆ بـە تـار
بـە هـەوای پرشـنگ تـاف بـێ قـەرار نـە پـای بـالوول کـۆ، تـەخت دەڕنەشـار
وەڵـگ بیـد زایـف، تـەرز تـووڵ زەبـوون زەبـوون تـەر جـە تـەرز تـای گوڵابتـوون
مەلـەرزۆ بـە بـاد سـەرد سـەبایی نـە ڕووی گـۆڵ سـەوز سـاف مینـایی
پەرسام ئـەرێ بیـد دەسـت نشـان دەسـت تورک تەڕنەندام، سای سەهەند پەیوەست
چێشـەن درەختـان ڕووشـان نـە بـاڵان تـۆ سـەر سـەراوێز ڕووی زەمـین مـاڵان
بیـد ئامـا جـواب بـە زوان حـاڵ چوون پەرسات هـاڵم پێـت واچـوو هـەواڵ
منـیچ نۆنـەمام نـازک نـۆ بـیم سـەرتەرز لـەرزان تـاف لـەب ڕۆ بـیم
ناگـا جـە تەقـدیر دیـدە سـیایێ خاوئـاڵووی سـوبخێـز جـە ڕەم جیـایێ
ئامـا نـە سـایەم مەخسـەڵ دا خـاڵان کۆکـۆ کـۆی خەرمـەن خـەمان دا تـاڵان

جـەو سـاوە جۆیـای ئـەو تـەتارەنان جـەو پـەی سـەراوێز بـێ قـەرارەنان

پیرەمێرد:

بیـدی مـەجنوونی، بیـدی مـەجنوونی بـالّا بـەرز و نـەرم، زار و زەبـوونی

بـە لار و لەنجـە لـەیلا نمـوونی بـەڵام لـە داخـی دڵ سـەرنگوونی

ئـاوارە و لـەرزان بـە گـوێ تافـەوە پەخشـان بـە شـنۆی هـەوای سـافەوە

عەنبـەربار بـە بـۆی مسـکی نافـەوە رەخشـان بـە پـەلکی زەڕ کڵافـەوە

بـە دەنگـی تاڤگـەی ساز و سەمتووری ئەینۆشـی بـادەی ئـاوی بلـووری

سـایەبانی بـان تـەختی گـەنجووری بـەڵام تامـت تـاڵ بـە دەردی دووری

وتـم شـۆڕەبی دەسـت نیشـانی دۆسـت سێبەر دەوای تا، سەڵفات و زینک پۆست

درەختان سەربەرز بە بێ قۆرت بێ شۆست بۆچ سەرت شـۆڕە وێنـەی کەفتـەکۆسـت

جـوابی دایـەوە بـە زبـانی حـاڵ بـۆچ تـۆ نـازانی پیـری کۆنـەسـاڵ

من سەربەرزێک بووم شیرین پـەڕ و بـاڵ سـوجدەم بـردە بـەر بـاڵای سۆسـەن خـاڵ

(هاوار، ١٣٩٢: ٣٠٠)

بێسارانی:

جـە بەیانـەوە، جـە بەیانـەوە حـاڵێ پـێم یـاوان جـە بەیانـەوە

خـاڵێ دیـم جـە بـەین دوو بەیانـەوە مەدرۆشـۆ چـوون نـەجم جـە بەیانـەوە

حـەیان لـوول وەردەن وە بەیانـەوە وە بـان بەیانـدا مەشـنیانەوە

حـەکاکان دەور گشـت بەیانـەوە کـێ دیـەن مـەغریب جـە بەیانـەوە؟

هـەرتا «موسـتەفا» سـەر مەنیانـەوە هـەر هـا بـە حەسـرەت ئـەو بەیانـەوە

پیرەمێرد:

هـای لـە بەیانـدا، هـای لـە بەیانـدا هـای لـەو بەیانـەی دیـم لـە بەیانـدا

خاڵێـک لـە مـابین جووتـەی بەیانـدا ئەسـتێرەی بـەیان لـە تـۆی بەیانـدا

دوو مــار بــە حەڵقــە دەوری بــەیان دا    تــا ڕێــی بــەی نــەبێ دز لــە بەیانــدا
کــێ تــوانی ئەمــە شــەرح و بــەیان دا    ڕەشــــە ئێــــوارە لــــە دەم بەیانــــدا
مــــاری لای بــــەیان بۆیــــە نیهانــــدا    هەر کەس دەس بەرێ مــاری لــێ هــان دا
ئەمــەوێ لــە خــوا مــەرگم نیشــان دا    ســەر لــە بەیانــدا، ســەر لــە بەیانــدا

(هەر ئەوە: ٢٩١)

بێسارانی:

چــراخ! وەنەوشــە، چنــوور چــەنی گــوڵ    عــــەزم ڕای وێســــاڵ تۆشــــانەن نــــە دڵ
چنوور جە ســەر کۆ، وەنەوشــە جــە چــەم    گــوڵ جــە گوڵســتان وە هــەم بیــەن جــەم
یــەک یــەک چــەنی هــەم ماجەراشــانەن    خــــەیاڵ وێســــاڵ تــــۆ سەوداشــــانەن
واتشــــان دەردیــــن! بەنــــدەی فلانــــی    چــوون حــاڵ زانــەنی هــەم حــاڵ مــەزانی
وێنــــەی حاڵزانــــان بکــــەرە کــــارێ    بیــاومێ بــە وەســڵ ئــەو دڵبــەر جــارێ
چراخ یا هــەر ســێم بەســتەن بــە دەســتە    چ دەســتە؟ دەســتەی بــە زگــار بەســتە
هــەر ســێم یــا ئــاوەرد چــوون خاکســاران    هەر یەک وایــەی وێ بــە چــەم مــەداران
چنــوور پــەی زلفــت پەشــێو حاڵشــەن    وەنەوشــــە ســــەودای خــــاڵ خەیاڵشــــەن
گوڵ پەی جەمینت مەسۆچۆ چوون شــەم    جە دووریت نیشتەن نــە پــاش خــار خــەم
ســاحیب مایــەنی، بوڵەنــد بــۆ پایــەت    بــا وایــە گێــران هــەر یــەک نــە سایەت

پیرەمێرد:

گیانــە وەنەوشــە چنــوور لــە گــەڵ گــوڵ    ســــەودای دیــــدەنی تۆیــــان کەوتــــە دڵ
چنــوور لــە کێــوان، وەنەوشــە لــە چــەم    گوڵ لە گوڵستان یــەکیان گــرت ســەرجەم
هاتنــــە لام وتیــــان تــــۆ ڕابــــەرمان بــــە    ئەمەمان بــۆ بکــە و تــاجی ســەرمان بــە
ئــەوا هەرســێکم بەســتن بــە دەســتە    هاتنــە خزمــەتت بــە دەســتی بەســتە
هــەر یــەک بــە ڕەنگــێ مــەرامی پێتــە    بــــۆ نیــــازی خــــۆی خــــاکی بەرپێتــــە

چنــوور بــۆ زوڵفــت لــوول و پەشــێوە وەنەوشــە مــل کــچ خــاڵی لای لێــوە
گــوڵ کــە نــازکی گۆنــای تــۆی دیــوە چقڵی خۆی لـە ژێـر پێـی هەڵچـەقیوە
تــۆ پایەبــەرزی شــای شــیرین ئەنــدام بــا لــە ســایەتا بگــەن بەمــەرام

(هەر ئەوە: ١٥٨)

بێسارانی:

وەیمـــەن دەردەدار، وەیمـــەن دەردەدار وەیمەن پەی کەسێ چـوون مـن دەردەدار
بــڎیا بــە شــێوەی نــەقش نــەو وەهــار هۆرگێرتـا مایـەی گـوڵان سـەد هـەزار
جە زەردگـوڵان ڕەنـگ، جـە نـەورۆزان داخ جە شەونم ئەسـرین، جـە دوود تـەم ئـاخ
جە وەنەوشـە خـوم، جـە نـەرگس خومـار جـە گـوڵاڵان هـوون دیـڎەی شـەوبێدار
جـە خونچـە پـەیکان جـە سـەوزە خـارێ خـارێ نـە دڵ بـۆ جـە زەخـم یـارێ
جـە بـاڵای نـەمام تیـر خـار جـەرگ جە گوڵگەز هووناو گوڵ گوڵ کەرۆ بەرگ
جـــە دەردەداران هـــەر منـــەنان وەس مـەڎیەو مـەوینوو هـەنیچ نیـەن کـەس
تــەن بــە داخ دەرد خــەمان مەســپاروو چـەنی بـێ دەردان هـیچ کـار نـەداروو

پیرەمێرد:

وەک مــن دەردەدار، وەک مــن دەردەدار گـوڵان ببیـنن ڕەنـگ ڕەنـگ بـە قـەتار
ئــای بــۆ یــارێکی وەک مــن دەردەدار ســەیری بــەهار کــەین دیــارە و دیــار
بـە هـەر غـەمێکی تێـر و پـڕ بگـرین لـە هـەر ڕەنگێکیـان غـەمێک وەرگـرین
گوڵاڵــە خــوێنی دیــدەی شــەو بێــدار لـە وەنەوشـە شـین، لـە نیـرگس خومـار
لە غونچە پەیکان، لە گوڵ سۆسـەن خـار لــە نــەورۆز بــۆ دڵ زامــی پــڕ ئــازار
چنـــوور وەک پێوەنـــد، چنـــار ســێدارە هەمیشـــە بـــەهار وەک وەرەمـــدارە
ڕێحانــە پــەلکی شــینی ماتــەم بــێ مینا مینای غـەم بـا نەشـئەی کـەم بـێ
بــەڵام هــەر تــەنها خــۆم دەردەدار بــم هەر غەم بـە بـاری غـەمان غـەمبار بـم

(هەر ئەوە: ١٦١)

بێسارانی:

چــراخم! شــەهید، چــراخم! شــەهید وەختــێ بــە نێگــات مەکــەریم شــەهید
بــۆ بەشــق خــوداێ حەمیــد و مەجیــد جــە زڵــف ســیات تــاییوە وەحیــد
وزەم نــە گــەردەن بــە وێنــەی زوننــار بــەو زوننــارەوە مەشــوو وە مــەزار
تــا ئــەر مەلــەکان بــەیانێم وە ســەر وینــا بــە زوننــار تــۆم بەســتەن کەمــەر
شــەرم زڵــف لــوول ســیات کــەرانێ عــەزاب دۆزەخ پــێم نــەدەرانێ

پیرەمێرد :

گیانــە ئــەژمێرم، گیانــە ئــەژمێرم بــۆ ئاکــامی مــەرگ نەفــەس ئــەژمێرم
کــاتێ بــە نیگــای تــۆ گیــان ئەســپێرم تیپــی فریشــتە گشــت دێنــە ســەیرم
خــۆم بــە شــەهیدی عەشــق ئــەژمێرم مــەقبوولی مزگــەوت پەســەندی دێــرم
تاوێــک لــەو زوڵفــەی ســەودای زەرەتــار لــە گــەردنما بێــت بــە وێنــەی زەننــار
قەباڵــەی عیســا و ئەحمــەدی موختــار پارێزگــارم بــن لــە دووتــوێی مــەزار
ئەوســا فریشــتە دێنــە ســەرینم تــا لــێم بپرســن رێگــای ئــایینم
شەرمی تــای زوڵفــی لــوولی وەک زەننــار فریشــتەکانم لــێ ئــەکا بــە یــار
هیچکــەس نــاتوانێ بڵــێ کــوڕی کێــی یا خەڵکی کام دێی؟ یا لــە کوێــوە دێــی؟

(هەرئەوە: ١٦٩)

بێسارانی:

چــــراخ! وە ڕەزان، چــــراخ! وە ڕەزان ئــارۆ ڕایــێم کــەوت شــیان وە ڕەزان
بــە زوان هــاڵ پەرســام جــە خــەزان تەن بیەن مەجرووح چوون مــاران گــەزان
واتــم هــەی خــەزان ڕەژیــدەی چەمــەن ئوســتاد نــەققاش بلــەرم یەمــەن
ســەبەب جــە چێشــەن ڕەنــگ زگــارەنی ســەرتاپا هــوونین دڵ ئــەفگارەنی؟

واتش هەی بێ مەیل ناکا جە ڕۆیێ دیم ئاما و ویەرد زڵف ئەشەدبۆیێ
خەرامان ویەرد بە سەد نازەوە بە دیدەی قەتران سورمەسازەوە
مەودای موژانش نیشتەن نە جەرگم یە هوون دڵەن پێ ڕەژیان بەرگم
نە، من زایفیم جە بۆنەی لەیلەن عامیان ماچان ڕەشتەی سوەیلەن
ئێمەیچ چوون خەزان هوون دڵ وەردیم جە دووری یاران داخ وە گڵ بەردیم

پیرەمێرد:

لە ناو ڕەزانا، لە ناو ڕەزانا ئەگەرام بە ناو ڕەستی مێوانا
مێوم دی لە توێی شێوەی عوریانا گرژ بووبوو لە ناو گەڵاڕێزانا
وەختێ بە وەرزی تەرزی خۆش تەرزی سەری بەرز ئەکرد بە بەرگی سەوزی
هێشووی مرواری گەردنی بەرزی بە بای غرووری شۆخی ئەلەرزی
تیف تیفەی ئەدا نم نمەی باران بۆ تامە تامەی گرۆی مەی خواران
گەڵای بۆ خەنەی زولفی نازداران ترێکەی ئەبوو بە دیاری یاران
ئێستا بێ بەر و بێ سەر و سامان ڕەنگ زەردی وەرەم سەر تا وە دامان
بە شنۆی خەزان وێنەی نەمامان ئەلەرزێتەوە ئامان سەد ئامان
پرسیم ئەی هەڵەم دانەت بێ هەڵەم بۆچ زەرد هەڵگەڕای بە دەردی وەرەم؟
شەراب لە مێوەی تۆ دێتە بەرهەم ئەبێ بە شفای پەژارە و ئەلەم
تۆ خوا پێم بڵێ چییە ئەم دەردە؟ ئەم پەشێویە و ئەم ڕەنگە زەردە؟
ئەم بێ ڕەنگییە بەم قەوزەی سەردە؟ ئەم مەلوولییە وەک ئازیز مەردە
وتی لێم گەڕێ دەروون لە غەم کەیل منیش وێنەی تۆ کەوتمە سەودای لەیل
عاشق بووم بە ڕووی ئەستێرەی سیوەیل شۆڕی کەوتبووە دڵەکەی پڕ مەیل
پرشنگی جەوری هەڵی قرچاندم سەودای دڵداری جەرگی سووتاندم
دوایی بێ مەیلی خۆی پێ نواندم بای بێ وەفایی هەڵی وەراندم

وەسیەتی مـن بـێ جوانـت خـۆش نـەوێ    کێ دیویـە وەفـا لای جـوان دەس کـەوێ؟
گیـــرۆدەت ئـەکا بـــە تـەنها شـەوێ    لـەپڕ وەک ئاسـکی سـڵ لێـت ئـەڕەوێ
ئێســتا وەک جوانـــان ڕۆڵـــەی زەمانـــە    کەمەنـدت ئەکـــەن بـــە یـــەک گیانـــە
بـــۆ ئـیش پـــێڵاوت لـــە سـەر چاوانـــە    کـــە ئیشـــیان نـــەما دەردت گرانـــە

(هەرئەوە: ١٤٩)

بێسارانی:

چـــراخم! نـــە دڵ، چـــراخم! نـــە دڵ    دڵ پـەڕ ئـایرەن بـۆ وەس شـۆم نـە دڵ
نازکتـــەرەنی تـــۆ جـــە پـــەڕەی گـــوڵ    نـەداری تاقـەت زڵـف شـاخ سـونبوڵ
دڵ ئـاخ مەکێشـۆ گـر مـەیۆ وە بـەر    نـــەبا نەیشـــەڵلا پێـــت یـــاوۆ زەرەر
تێـــدا مەنیشـــە هـــەی بەرگوزیـــدە    بـــۆ جـــات بکـــەروون وە بـــان دیـــدە
موژەم هەم ئەبرووم کـەرووت بـە پـەرچین    تـــا پێـــت نـــەیاوۆ نـــاواک بـــەدبین
ئەوسـە تەماشـای سـەرجۆی ڕەوان کـەر    باڵات وێنەی سەڵو تـێ دەس نشـان کـەر
عەجـــەب یاگەتـــەن نـــەمام وایـــەم    پایەبوڵەنـــد بـــای پـــەرێ سەرسـایەم

پیرەمێرد:

لـــە هێلانـــەی دڵ، لـــە هێلانـــەی دڵ    ئەگەر جێت تەنگ بـێ لـە هێلانـەی دڵ
ئـەو لەشـە جوانـەی نـازکتر لـە گـوڵ    لـە ئـاهی گـەرمی دڵـەی پـڕ سـکڵ
تینـــی بگـــاتێ دڵ ئـــەبێ خـــەجڵ    دڵـیش بـە بـێ تـۆ هـەڵکردی موشـکڵ
کـــەوابێ بـــارێ ئـــەی بەرگوزیـــدە    بگـــــوێزەرەوە گلێنـــــەی دیـــــدە
برژانگـــەکانم ببێـــت بـــە پـــەرژین    ڕێ گـوزەر نـادا بـە دیـدەی بـەدبین
بـە هـەر چـوار دەورا بـە ئـاوی دیـدەم    جەزیرەیـــەکت بـــۆ دێتـــە بەرهـــەم
لـــەوێ وەک پـــەری جـــەزیرەی واق واق    چونکـە تاقانـەی دانیشـە بـە تـاق

(هەرئەوە: ١٦٨)

لە دیوانەکەیدا لەسەر ئەم پارچە شێعرە نووسراوە: «ئەم هەڵبەستەی خوارەوەش لە کاتی خۆیدا پیرەمێرد بە ناوی بێسارانییەوە بڵاوی کردوەتەوە، بەڵام هــی خۆیــەتی تــەنها دێڕی چوارەم هی مەولەوییە و تێهەڵکێشی کردووە لەگەڵ ئەو دێڕانەی تردا.»! هەروەها بۆ مانای «بارێ» کە وشـەیەکـی فارسـییە (بـاری) و ماناکـەی دەبێتـە بـە هـەر حـاڵ، نووسراوە: «بارێ: بە شێوەی هەورامی یانی وەرە»!!

ئەم شێعرانە کە لە پیرەمێرد هێنامان و لەگەڵ شێعرەکانی بێسارانیدا بـەراوەردمان کرد تەنیا بەشێکە لەو شێعرانەی بێسارانی کە پیرەمێرد کردوویە بـە سـۆرانی و لــە نــاو دیوانەکەیدا هاتوون. جیا لە وەرگێڕانی شێعرەکان، مەزموون و بابەتی زۆربەی شێعرەکانی هی بێسارانییە. لێرەدا لەوە زیاتر لەسـەر ئەمـە نـاڕۆین و داواکـارین خۆتـان بـە وردی سەیری دیوانەکەی پیرەمێرد بکەن.

٧- سەیدی: یەکێکی دیکە لەو شاعێرە گەورانەی هەورامانە کە جێگە پێی شێعرەکانی بێسارانی لە شێعرەکانیدا دیارە، سەیدی هەورامییە. لە شێعرەکانی سەیدی هـەورامی‌دا ئەوەی کە مەسنەوی دە بڕگەییە لە زۆر شوێندا بـۆنی شـێعرەکـانی بێسـارانی ئـەدات. هەرچەن کە لە هیچ شوێنێکدا شێعری بێسارانی تێهەڵکێش نەکردووە یا وەک مەولەوی ناوی نەبردووە ، بەڵام خۆ کاریگەری شێعرەکانی ئەوی بەسەرەوە دیارە. بۆ نموونە دەتـوانن ئەم شێعرانە لە هەر دوو شاعێر لەگەڵ یەک هەڵبســەنگێنن: «بـاد عــەتر ئـامێز»ی سـەیدی لەگـەڵ «چـراخ وەنەوشــە، چنــوور چــەنی گــوڵ»ی بێســارانی، «چــوون کـۆی عەوداڵان»ی سەیدی لەگەڵ «شای کەمەر لاڵان»ی بێسارانی، «دەنگـی یـار مــەیۆ»ی سەیدی لەگەڵ «چراخ یانی چێش»ی بێسارانی. هەروەها بابەتی ئەم شێعرانەی سەیدی زۆر لــە شــێعرەکــانی بێســارانییەوە نزیکـە: «قیبلــەم تاســەمەن»، «نــەورۆز گــوڵ»، «هامسەران ئامان» و «وە بان چاوان». بەڵام ئەوەی کـە پێویسـتە لێـرەدا ئامـاژەی پـێ بکرێت ئەوەیە کە دوو پارچە شێعری بێسارانی لە دیوانەکەی سەیدیدا بـە نـاوی ئـەوەوە

هاتووە. هەر چەند لە سەرچاوەکانی لای ئێمەیشدا بە ناوی بێسارانییەوە هاتوون بەڵام خۆ هەر بە سەیرکردنی شێعرەکانیشدا دیارە کە سەبکیان سەبکی بێسارانییە. یەکێک لەو شێعرانە «چراخ جەی دنیا»یە کە لە دیوانەکەی سەیدی‌دا بە «قیبلەم چی دونیا» دەست پێدەکات، هەر وەها دوو بەیتیشی لە شێعرەکەی بێسارانی زیاترە کە ئەویش لە جێگەی خۆیدا و لە شەرحی پارچە شێعرەکەی بێسارانیدا باسمان کردووە. لێرەدا بۆ هەڵسەنگاندنی زیاتر هەر دوو پارچە شێعرەکە دێنین.

بێسارانی:

چراخ! جەی دنیا، چراخ! جەی دنیا ئەوەند ئاواتم مەندەن جەی دنیا
وەرتەر جە مەردەن بە دیدەم بدیا لەب وە بان لەب لاڵ تۆم بنیا
بۆ بنیام وە بۆی زلف موشکینت بکەردام تەواف کەعبەی جەمینت
بدیام دەست تۆم شیەن نە گەردەن دەرسات مەواستم ئاوات وە مەردەن
بالای وێم پەشتان بالات بکەردام داخم نەمەندا ئەوسا بمەردام

سەیدی (ئەوەی کە لە دیوانەکەی سەیدی‌دا هاتووە):

قیبلەم چی دونیا، قیبلەم چی دونیا ئێندە ئاواتم مەندەن چی دونیا
ڕوێ وەر جە مەرگ بە دیدەم بدیا لەب وە بان لەب لاڵ تۆم بنیا
هەر دوو بنیامان سەر وە یەک سەرین کەرداما‌ن ڕازی ویەردەی دێرین
بدیام دەست تۆم وستەن وە گەردەن ئەوسا بواستام ئاوات وە مەردەن
بۆ بنیام وە بۆی زوڵف موشکینت بکەردام تەواف کابەی جەمینت
بالای وێم پەشتان بالات بکەردام داخم نەمەندا ئەوسا بمەردام
ئەوسا جەو دما ئەگەر مەمەردم پەی مەردەیی وێم شاذی مەکەردم

(صەیدی، ١٣٨٥: ١٦١)

هەر وەها کە دیارە ئەم پارچە شێعرە بە هەڵە بە ناوی سەیدیەوە هاتووە و ئەو دوو بەیتیشە کە لە دیوانەکەی سەیدیدا زیادییە و لە سەرچاوەکانی بەر دەستی ئێمەیشدا هاتووە کە لە شەرحی شێعرەکەی بێسارانی لەم دیوانەدا لەسەری دواوین.

ئەو پارچە شێعرەکەی تریش کە بە ناوی سەیدیەوە هاتووە پارچە شێعری «یاران کێ دیەن»ە. ئەم پارچە شێعرە لە زۆربەی نوسخە خەتیەکانی بەردەستی ئێمەیشدا هەر بە ناوی بێسارانییەوە هاتووە و هەر وەها مەولەویش دێڕی کۆتایی ئەم شێعرەی بە ناوی بێسارانییەوە تێهەڵکێش کردووە. لێرەدا هەر دوو پارچە شێعرەکە دەنووسین:

یاران کێ دیەن؟ یاران کێ دیەن؟ سەررەشتەی خەمان چوون من کێ دیەن؟
قالبم جە خەم ڕێزەی خەم بیەن ڕۆحم بە خەمناک نە قالب شیەن
ئەسڵم جە خەمەن، جە خەم بیەنان بابۆی من خەمەن، خەمان دیەنان
سەرتاپام خەمەن جە مەدرەسەی خەم دەرس خەم وانان، جە لام نیەن کەم
دەرسم هەر خەمەن، هەر خەم مەوانوو غەیر جە خەم فێشتەر هیچ نمەزانوو
هەر کەس خەمینەن بەیۆ وە لاو من خەم چەنی خەمان زوو مەبۆساکن

سەیدی (ئەوەی کە لە دیوانەکەی سەیدیدا هاتووە):

یاران کێ دیەن؟ یاران کێ دیەن؟ سەررەشتەی خەمان چوون من کێ دیەن؟
قەلبم جە بۆتەی زەڕەی خەم بیەن ڕۆحم بە خەمناک ئی قالب شیەن
ئەسڵم جە خەمەن، جە خەم بیەنا بابۆ من خەما، خەما دیەنا
سەر تا پام خەمەن جە مەدرەسەی خەم دەرسی خەم وانام، جە لام بیەن جەم
دەرسم هەر خەمەن، هەر خەم مەوانوو غەیر جە خەم فێشتەر هیچ نمەزانوو
هەر کەس خەمگینەن بەیۆ وە لای من خەم چەنی خەمان زوو مەبۆ ساکن

(صەیدی، ١٣٨١: ٢١٣)

جیا لەوەی شێعرەکەیان بە هەڵە بە ناوی سەیدییەوە هێناوە، بە ئاشکرایی هەڵەی ڕاست کردنەوەیشی پێوە دیارە. هەر وەها کە پێشتریش ئاماژەمان پێکرد مەولەیش دێڕی کۆتایی ئەم شێعرەی بە ناوی بێسارانییەوە تێهەڵکێش کردوە و دیارە کە شێعری بێسارانییە:

تەشریف باوەرە جەرگەمان جەم بۆ    بەڵ وەی جەم خەمێ جە لامان کەم بۆ

«بێسارانی»یەن نە تۆی فەرد مـن    «خەم چەنی خەمان زوو مەبۆ ساکن»

٨- وەلی دێوانە: «وەلید» کوڕی «کوێخا حەمە سوور» و دڵداری «شەم» ناسراو بە «وەلی دێوانە» هەرچەند سەرجەمی شێعرەکانی بۆ «شەمسە»ی دڵداری هۆنیوەتەوە بەڵام ڕەنگ و بۆی شێعرەکانی بێسارانی بە شێعرەکانیەوە دیارە. لێرەدا بۆ وێنە پارچە شێعرێکی دێنین کە لە ژێر کاریگەری پارچە شێعری «قیبلەم نەکێشۆ»ی بێسارانی هۆنراوەتەوە. سەرەتا بەشێک لە پارچە شێعرەکەی بێسارانی:

قیبلەم! نەکێشۆ، قیبلەم! نەکێشۆ    سەرێ کە سەودای خاڵت نەکێشۆ

خاترێ وە غەم تۆ نەیەندێشۆ    وە زام ناوەک سوب سەحەر بێشۆ

سەرێ وە لای تۆ سەر نەدۆ شەوان    پایێ کە نەیۆ وە لات وە دەوان

ئەو سەر سەرنگوون گڵکۆی تازە بۆ    ئەو پا گەستەی مار بێ ئیجازە بۆ

دیدێو نەوینۆ هەر سەحەر ڕەنگت    زوانێو نەبۆ شەو بە هام دەنگت

ئەو دیدە ئەسرش بێ مدارا بۆ    ئەو زوان بە سەنگ سیای سارا بۆ

دەسێو نەکەرۆ سەیرانی باخت    نەکەرۆ خزمەت بەرزی دەماخت

ئەو دەستە بەستەی جەلادی گەور بۆ    هەر ڕۆ جە نۆوە سزاش بەی تەور بۆ

وەلی دێوانە:

قیبلەم! ڕێش نەبۆ، قیبلەم! ڕێش نەبۆ    ئەر دڵ وە مەودای عەشقت ڕێش نەبۆ

ئەر تەن بەڵابار مەینەت کێش نەبۆ    ئەر دیدەم خار دووریت تێش نەبۆ

ئـەو دڵ سیاسـەنگ، ئـەو دیـدە تـار بـۆ ئەو تەن کەوتەی کونج مـاوای مـەزار بـۆ

سـەرێ سەراسـەر نـە سـەودات نـەبۆ گشت دەمێ نـە گـەرد خـاک ڕات نـەبۆ

ئەو سـەر بـێ سامان جـە تـەن جیـا بـۆ خـامۆش خـەڵتان خـاک سـیا بـۆ

پـایێ نەکـەرۆ ئامەشـۆ وە لات دەسـتێ نەکێشـۆ شـەو و ڕۆ جـەفات

ئەو پا گەستەی مار ئەفعی حەفتسەر بـۆ ئـەو دەسـتە مـەجرووح زام خەتـەر بـۆ

زوانـێ نـە زکـر سـەنای تـۆ نـەبۆ شـەو و ڕۆ نـە فکـر دۆعـای تـۆ نـەبۆ

ئـەو زوان بـێ نوتـق هـەر وە پـەلاس بـۆ ئـامین بوڕیـدەی تـێغ ئـەڵماس بـۆ

من جە دووری تـۆ شـای شـەم جـەمینان هـەر کـاتێ زانـای لاشـەم مـەوینان

(دێوانە، ١٣٨٤: ١٣٧) (لە ڕووی نوسخە خەتیەکانەوە هەڵەکانی ڕاست کراوەتەوە.)

٩- ئەحمەد پریسی (مەجزووب): خەڵکی ئاوایی «پریس»ی نزیکی «هەڵەبجە»یـە و هاوچەرخی مەولەوی بووە. بە جوانی لە خزمەتی تەریقەتدا بووە و موریدی شێخ «سراج الدین» بووە. چوون زۆر ئەهلی جەزبە بووە بە «مەجزووب» ناوی دەرکـردووە، پلـەکـانی تەریقەتی یەک دوای یەک بڕیوە و لـە «فـەنا» تێپـەڕیوە و گەیشـتووەتە «ولایـەت» (روحانی، ١٣٩٠: ٢/١١). مەولەوی لە وەسفیدا دەفەرموێ:

بڕیـا وە بـاڵای کـاڵای ڕەئیسـی (رجـال الغیـب)ە «ئەحمـەد پریسـی»

مـەجزووب پارچـە شـێعرێکی هەیـە کـە دیـارە شـوێن پارچـە شـێعری «قیبلـەم نەکێشۆ»ی بێسارانی کەوتووە. ئەم پارچە شێعرە بە هەڵـە بـە نـاوی وەلـی دێوانـەوە لـە قەڵەم دراوە و لە دیوانەکەی وەلی دێوانەدا هاتووە، بەڵام لە نوسـخەیەکـی خەتیـدا کـە لەبەر دەستی ئێمەدایە نووسراوە «احمد دیوانـە» و لـە دێـڕی کۆتـایی شـێعرەکەیشـدا نازناوی ئەحمەد پریسی یانی «مەجزووب» هاتووە. ئەمەیش پارچە شێعرەکەی ئەحمەد پریسی:

قیبلەم! مـەلاڵ بـۆ، قیبلـەم! مـەلاڵ بـۆ دڵـێ غـەیر جـە خـەم خاڵـت مـەلاڵ بـۆ

ئـەو دڵ ئـەر دانـەی شـەوچرای لاڵ بـۆ　　تـۆ خـوداّ بـازەش بـا وە زوخـاڵ بـۆ

دیـــدّەم دیـــدّەیێ نـــەوینۆ بـــاڵات　　هـــەر دەم نەرەشـــیۆ وە گـــەرد پـــاڵات

ئـەو دیـدّە دیـدّەی جـەیر تونـدخێز بـۆ　　تـۆ خـوداّ بـازەش بـا سـۆمابێز بـۆ

سەرێ وە سـەر سـەر کـەمان بـۆ هـەر ڕو　　شـەوان سـەر نـەدّۆ وە ئاسـتانەی تـۆ

ئـەو سـەر ئـەر سـەردار دەوران دوون بـۆ　　تـۆ خـوداّ بـازەش بـا سـەرنگوون بـۆ

دەسێ دەس نەدّۆت نـە کەمـەر پـەیوەس　　نەشـۆت وە گـەردەن پەیاپـەی دەس دەس

ئـەو دەسـە ئـەر دەس جـەلاد مـەور بـۆ　　تۆ خـوداّ بـازەش بـا بەسـتەی گـەور بـۆ

پـایێ پـەی پـەیڕەو تـۆ نـەبۆ وە پـا　　وە ڕای یانـەی تـۆ نەشـۆ وە ڕای ڕا

ئەو پا ئـەر پـای پـاک بـەدر مـونیر بـۆ　　تـۆ خـوداّ بـازەش بـا نـە زەنجیـر بـۆ

قیبلـەم! بـا دەسـم وە دامانـت بـۆ　　«مەجزووب» جە زومـرەی غوڵامانـت بـۆ

١٠- شێخ «نعمت اللّه» ناسراو بە «نەوازی»: لە سەرجەمی ئەو پارچە شێعرانەی کە لە نوسخە خەتیەکاندا بە ناوی «نەوازی»یەوە هاتووە، بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە کاریگەری بێسارانی لە سەر شێعرەکانی زۆر زۆر بووە و دەتوانین بڵێین ڕەنگ و بۆی شێعرەکانی بێسارانی بە هەموو شێعرەکانیەوە دیارە. چەند پارچە شێعرێکی هەیە وەک «قیبلەم نەسپەردم» و «چراخم نە دڵ» و... کە زۆر لە ناوەڕۆک و سەبکی شێعرەکانی بێسارانییەوە نزیکە. لێرەدا بۆ وێنە تەنیا پارچە شێعرێکی دێنین کە دیارە لەسەر پارچە شێعری «قیبلەم نەکێشۆ»ی بێسارانی هۆنیویەتەوە:

چـراخ! جـەمینت، چـراخ! جـەمینت　　دیـدّیو نـەوینۆ هـەر ڕۆ جـەمینت

نـەدّیۆ بـە خـاڵان ئـاڵای موشـکینت　　نەکـەرۆ تـەواف زڵـف چـین چینـت

ئەو دیـدّە بـە نـێش مـوژەت زامـدار بـۆ　　ڕۆشـنی بەسـات نـە دیـدّەش تـار بـۆ

گۆشـیو نەژنـەوۆ ڕێـزەی ڕازانـت　　زوانـێ نـەبۆ بـە هـام زوانـت

ئـەو گـۆش نەژنـەوای هـەواڵ نـەزان بـۆ　　ئـەو زوانـە لاڵ دەنـگ و دوان بـۆ

ئەر دڵ نە خەیاڵ خاڵت نەبۆ قەست     ئەر دەستێو بە زڵف تۆ نەبۆ پابەست

ئەو دڵ سەنگ سەخت سیا نسار بۆ     ئەو دەست بەستەی بەند گەور کوففار بۆ

سەرێو سەر نەدۆ هەر شەو واستانەت     پایێ نەکەرۆ ئامەشۆی یانەت

ئەو سەر، سەر وە سەنگ ئەلحەد نیا بۆ     ئەو پا گەستەی مار ئەفعی سیا بۆ

ئەر «نەوازی» ناز تۆش نەبۆ نە ویر     گیر وەرۆ بە دەست جەللاد بێ پیر

١١- مەلا فەتحوڵڵا فاوەجی (پاوەیی): مەلا فەتحوڵڵا یەکێک لەو شاعیرانەیە کە هێشتا شێعرەکانی کۆنەکراوەتەوە و تەنانەت سەبارەت بە ژیانیشی زانیاریەکی ئەوتۆ لەبەر دەستدا نییە. وەک لە هەندێک دەستنووس و قەباڵەدا ناوی هاتووە زۆر دوور لە چەرخی بێسارانی نەبووە تا ئەو جێگە باسی کراوە لە ساڵەکانی ١١٣٠ی کۆچی مانگی ژیاوە و مەلایەکی زیرەک و بە دەسەڵات بووە. لە نوسخەیەکی خەتیدا هەندێک شێعرمان کەوتوەتە دەست کە دیارە شاعیرێکی بە توانا بووە. لەسەر شێعرەکانی نووسراوە «من کلام ملا فتح اللّٰه فاوجی». هەندێک لە شێعرەکانی بە ڕادەیەک لە شێعرەکانی مەولەوییەوە نزیکە کە لە زۆر شویندا وا هەست دەکەی شێعری مەولەوی دەخوێنیتەوە و ئەمە ئەو گومانە دەخاتە ئاراوە کە یا دەبێت ئەو دواکەوتووی مەولەوی بێت یا مەولەوی لە شێعرەکانیدا کاریگەری لەو وەرگرتبێت. بە داخەوە هەر وەک باسمان کرد زانیاریەکی زۆر لەسەر ژیانی بە دەستەوە نییە و تا ئێستا شێعرەکانی کۆنەکراونەتەوە، ئەڵبەت دەتوانێت ئەو مەلا فەتحوڵڵایشە نەبێ کە لەو قەباڵە و بەڵگانەدا ناوی هەیە و مەلا فەتحوڵڵا پاوەییەکی دیکە بێت. لە پارچە شێعرێکیدا یادی بێسارانی دەکات و بە «تووتی وەش تەقریر مەعارف ئەحواڵ» و «عێرفان نیای پاک» ناوی دەبات و بۆ تەواو کردنی مانای شێعرەکەی خۆی، دێڕێک لە شێعرەکانی بێسارانی تێهەڵکێش دەکات. ئەمەیش ئەو پارچە شێعرە بە پێی نوسخە خەتیەکە:

جە وەیشوومەی سەرد سەردی مەیلەکەم     جای ناز و نیاز، سەرتاسەر ئازەرم

یـانێ هـەی ئـازیز قیبلـەی ئـەهل دەرد ‌ ‌ ‌ باغ شـادی و زەوق یەکسـەر خـەزان کـەرد
وەڵـــگ دار عـــەیش وە دەم زەلانـــدا ‌ ‌ ‌ چـوون مـەلان مـلان وە سـەر ملانـدا
تـاف سـەر چـمان نـە چـەم بێزیـا ‌ ‌ ‌ وەڵـگ نۆنـەمام شـادیم ڕێزیـا
ئـازیز نۆپـاییز هێجـران بەنـد کـەردەن ‌ ‌ ‌ گـرەو جـە زمسـان مـەردەنی بـەردەن
چەم نەمێش نە چـەم چـمان سـەرچەمان ‌ ‌ ‌ چـمان هـەم چـەمان جـمان جـە جـەمان
چوون خەستەن وە جەور مەینەتان جەستەم ‌ ‌ ‌ ئامان نـە دڵ فـەرد جـەی وەرتـەر بەسـتەم
هێجرت موژدەی وەسـڵ غـەریو مـەدارۆ ‌ ‌ ‌ مەرگ مـەیخوری مـەرگێتـەر مـارۆ
داد سـەختی سـەخت پاییزمـەن قـەرین ‌ ‌ ‌ تـا وەهـار لوتـف مەیلەکـەی وەریـن
تـووتی وەش تـەقریر مـەعارف ئـەحواڵ ‌ ‌ ‌ عێرفـان نیـای پـاک بێسـارانی مـاڵ
خاس بەسـتەن نـە عەقـد نـەزم نێزامـی ‌ ‌ ‌ ڕەحمـەت بـۆ ئـی فـەرد فەریـدەی نـامی
«ئێمـە چـەنی دەرد جـەفای ڕۆزگـار ‌ ‌ ‌ دەست نـە گـەردەنین تـا فەسـڵ وەهـار»

١٢- شێخ جەمالەدینی یەکەمی مەردوخی[1]، میرزا ئەحمەد داواشی[2] و... هەر کام لەم شاعێرانە بە جۆرێک شوێن پێی شێعرەکانی بێسارانی بە شێعرەکانیانەوە دیارە و ڕەنگـی داوەتەوە کە نموونەی شێعرەکانیانمان لە شـەرح و لێکدانـەوەی شـێعرەکـانی بێسـارانیدا هێناو. بێ گومان ئەم شاعێرانەی کە ناومان بردن تەنیا نموونەیەکن لە دەیـان شـاعێری دیکە کە لە ژێر کاریگەری بێسارانیدا بوون و شێعری بێسارانی وەک چرایـەک ڕۆشـنی بەخشی ڕێگایان بووە.

بەڕاستی ئەگەر بمانەوێت ئاماژە بە هەموو کاریگەریەکـانی بێسـارانی بکـەین و شوێن پێی لە ئەدەبیاتی کوردیدا بە تەواوی دیاری بکەین، دەبێت چـەن سـەد لاپـەڕەی لەسەر بنووسین، پێویسـتە ئـەوەش بڵـێین کـە ئـەو نموونانـەی ئێمـە هێناومانـە بـە

---

١- سەیری شەرحی پارچە شێعری «تاف دێوانە»ی بێسارانی بکەن لەم دیوانەدا.

٢- سەیری شەرحی پارچە شێعر «قیبلەم وە شەو بۆ»ی بێسارانی بکەن لەم دیوانەدا.

خوێندنەوەی دیوانی ئەو شاعێرانە کە شێعریان چاپ بووە و هەروەها بە گەڕان بە ناو ئەو نوسخە خەتیەکانە کە لەبەر دەستمان بووە نووسیومانە. بێ شک زۆر نوسخەی خەتی دیکە هەیە کە هێشتا بە دەستی خەڵک و لە کتێبخانەکانی دنیا دان و نەکەوتوونەتە ڕوو. دیاریشە شێعری زۆر لە شاعێرانی تێدایە کە ناویشیان لە مێژووی ئەدەبیاتماندا نەهاتووە.

## شێوازێکی تایبەت

جگە لەوەی کە بێسارانی سەبکێکی تایبەت بە خۆی بووە و بە ئاسانی شێعری لە شاعێرانی دیکە جیا دەکرێتەوە، شێوازێکی هێناوەتە نێو شێعری مەسنەویی دە بڕگەییەوە و دوو پارچە شێعری بەو شێوازە هەیە و دەتوانی بڵێی ئاوێتە کردنێکە لە «تەرکیب بەند» و «تەرجیع بەند». تەرکیب بەند و تەرجیع بەند دوو قاڵبن لە غەزەڵدا و بەو جۆرەیە کە دوای چەن بەیت کە هاو سەروان و پێیان دەوترێت یەک بەند، بەیتێکی دیکە دێت و دیسان بەندێکی دیکە، کە لە تەرکیب بەنددا ئەو بەیتەی لە نێوان بەندەکاندا دێت لەگەڵ یەکدی جیاوازن و لە تەرجیع بەنددا بەیتێک کە لە نێوان بەندەکاندا دێت یەک بەیتە و دووپات دەبێتەوە. بەڵام شێوازەکەی بێسارانی بەم جۆرەیە کە ئەو بەیتەی لە نێوان بەندەکاندا دێت، نیوە بەیتی هەوەڵی جیاوازە و نیوە بەیتی دووهەمی ناگۆڕێت و دوو پات دەبێتەوە. هەر کام لە پارچە شێعرەکانی پێنج بەندە کە بەندی هەوەڵی بە سێ نیوە بەیت دەست پێدەکات و «نیوە بەیتی دووپات» دێنێت و بە دوایدا چوار دانە پێنج نیوە بەیتی(مسراع)، کە دوای هەرکامیان نێوە بەیتێکی دووپات دێت. یەکێک لەو پارچە شێعرانە پارچە شێعری «دڵە زام نۆ»یە کە نیوە دێڕی دووپاتی «ئاخ پەی بەخت وێم، دڵە داخ پەی تۆ»یە:

دڵـــــە! زام نـــۆ. دڵـــــە! زام نـــۆ     زایــــف و زەبــــوون زەدەی زام نـــــۆ

چەنـد تیـر کاریـت نـە دڵ گێرتـەن کـۆ     ***ئاخ پەی بەخت وێم، دڵـە داخ پـەی تـۆ***

مـن زار خـەمناک زەدەی هێجـران بـار	پێکیـای پـەیکان تایێفـەی تـەتار
دەروون سـیا داخ، سـۆچیای خـەمان	بـێ زەوق کـەم چـاخ خـار سـتەمان
کەردات بـە سەرمەشق زامـان بـێ شـۆ	*ئاخ پەی بەخت وێـم، دڵـە داخ پـەی تـۆ*
فـرێم وات دڵـە مروەتـەن ئامـان	مـەوزەم نـە گێجـاو بـەحر بـێ سـامان
هـەر نـە تـاو عەشق نـە دەروون فرِیـای	تـا بـە شـۆڵەی شـەم چراخـان گڕیـای
تـەن بـی بـە زوخـاڵ سیاسـفتەی کـۆ	*ئاخ پەی بەخت وێـم، دڵـە داخ پـەی تـۆ*
ئـایر دەروون سـەر کـەردەن نـە دڵ	جـەرگم چـوون کـەباب پێکیـان وە چـڵ
نازاران بـە خەشم غـەزەب گێرتـەن لـێم	بـێ وەرمـی شـەوان بیـەن بـە خـڎێم
جـە تـاو زلفـان سـیای عەنبـەریـۆ	*ئاخ پەی بەخت وێـم، دڵـە داخ پـەی تـۆ*
حـەکیمان مـەیان مـەوینان سـزام	شـاڎەت مـاوەران وە سـفتەی سـیام
دەیسـە بگێـرە دەسـت بـە زامـەوە	بـە زام خـەدەنگ نۆنەمامـەوە
هـەر بپێکـە ئـاخ شـەوان تـا بـە ڕۆ	*ئاخ پەی بەخت وێـم، دڵـە داخ پـەی تـۆ*

پارچە شێعری «دڵە بە دامـن»یـش هـەر بـەم شـێوازە هۆنراوەتـەوە و لـەودا ئـەو نیوەبەیتە کە دوو پات ئەبێتەوە «ئاخ وەیمەن پەی دڵ، دڵە های وەی مـن»ـە. ئـەویش هەر پێنج بەندییە کە بە بەیتێکی سێ نیوەبەیتی دەست پێدەکات و لـە دوایـدا نیـوە بەیتێک دووپات دەبێتەوە و ئەو چوار بەندەکەیشی پێنج نیوە بەیتە لەگەڵ نیوە بەیتـە دووپاتەکە، بەڵام بە داخەوە لەم پارچە شێعرەدا لەو نوسخە خەتیانەدا (ئەو دوو سەرچاوە کە شێعرەکەی تێدایە) بەیتێکی لە بەندی دووهەمی کەمە، واتە بەندی دووهەمەکـەی بە جێگەی ئەوەی پێنج نیوە بەیت بێت، سێ نیوە بەیتە. دیارە کە بەیتێکی کەمە.

دوای بێسارانی هەندێک لە شاعێران دوای ئەم شـێوازە کـەوتوون و شـێعریان پـێ هۆنیوەتەوە کە لەو شاعێرانە دەتوانین «خانای قوبادی» نـاوبردە بکـەین. خانـا جگـەی لەوەی تەرجیع بەندی وەک «قەدیم موتڵەق» و «دنیا مەکارە»ی هۆنیووەتەوە کـە دوای

چەن بەیت بەیتێک دووپات بووەتەوە. بەم شێوازە تایبەتەی بێسارانیش چەند پارچە شێعری وەک «هەی یاران نیان» و « دڵ بیەن سەرشار»ی هۆنیوەتەوە کە بۆ هەڵسەنگاندنی زیاتر دەتوانن سەیری دیوانەکەی خانای قوبادی بکەن.

## نوسخە دەستنووسەکان و دیوانە چاپکراوەکان

### ئەلف) نوسخە دەستنووسەکان

ئەو نوسخە دەستنووسانەی کە بۆ نووسینی ئەم دیوانـە کـەڵکمان لـێ وەرگرتـوون ئەمانەن کە لێرەدا باسیان دەکەین و لە دیوانەکەدا هەر کامیان بـە پیتێـک یـان دوو پیت ناوبردە کراون و لێرەیش‌دا هەر بەو ناوە دەیانهێنین.

١- ک: کەشـکۆڵە شـێعرێکی هەورامییــە کــە «شـێخ عــەبولموئمێن دووهــەمی مەردوخی»[1] لە سـاڵی ١١٩٧ ک.م نووسـیویە و بەشـێکە لـە نوسـخەیەکی خـەتی قەدیمی بە ژومارەی ms.or.٦٤٤٤ لە کتێبخانەی بریتانیادا دەپارێزرێت. ئەم نوسخە خەتیە ٦٨ لاپەڕەیـە کـە بەشـێک لـە سـەرەتاکەی تەجویـدی قورئـان و دۆعـا و نـزا و پاڕانەوەیە بە زمانی عەرەبی و چەند شێعرێکی فارسیە و بەشی دووهەمیشـی شـێعری هەورامییە. «میرزا سەعید»[2] ناوێک لە ساڵی ١٩٠٢ی زایینی‌دا ئەم نوسخەیە بردووە و فرۆشتوویە بە کتێبخانەی بریتانیـا و پاشـان کەسـانێک وەک مێجرسـۆن (لـە سـاڵی ١٩٢١ز) منێورسکی (لە ساڵی ١٩٤٣ز) و مەکنـزی (لـە سـاڵی ١٩٦٥ز)دا وتاریـان لەسەر شێعرە هەورامییەکان نووسیوە. ئەم کەشکۆڵە ٣٨٢ [3] پارچە شـێعری هـەورامی

---

١- کوڕی شێخ جەماڵەدینی هەوەڵی مەردووخی، لە ساڵی ١١٥٢ی کۆچی مانگی لە دایک بووە و لە ساڵی ١٢١١ی کۆچی مانگی لە سنە فەوتی کردووە. (روحانی، ١٣٩٠: ١/٢٨١).

٢- لە کۆتایی کەشکۆڵەکەدا بە ئینگلیزی نووسـراوە:«لـە ئـەکتوبری ١٩٠٢دا لـە میـرزا سـەعید کڕیاوە» پاشان مێجرسۆن لە وتارەکەیدا ئەو میرزا سەعیدەی بە دوکتـور سـەعیدی کوردسـتانی لـە قەڵەم داوە.

٣- لە بنەڕەتدا ٣٨١ شێعری هەورامی لە کەشکۆڵەکەدا هەیە بەڵام پێش دەسـپێکی کەشـکۆڵەکە پارچە شێعری «حافیز باجەتی شاخ نەباتت»ی بێسارانی هاتووە کە دەکاتە ٣٨٢ پارچە شێعر.

تێدایە کە ۲۷۷ پارچەی شێعری بێسارانییە و ئەوانەی دیکەی شێعری ۳٦ شاعێری دیکەن کە زۆربەیان تەنیا لەم کەشکۆڵەدا ناویان هەیە. شاعێرەکان ئەمانەن: ئاغە کوڕ، شێخ ئەحمەد تەختەیی[1]، ئەلیاس بەگ، ئومیس بەگ، پەشێو، میرزا ئیبراهیم[2]، شێخ جەمالەدین هەوەڵی مەردووخی[3]، مەلا حافێز فەرهادی هەشەمێزی، شێخ حەسەنی دەرەهەردی، خانای قوبادی، لالۆ خوسرەو، دەردین، ڕەزا بەگی هەورامی، مەولانا زەینولعابدینی پاڵنگانی، شاکە، شێخ شەمسەدین دەرەهەردی، مەلا تاهێری هەورامی، عەبدی کەلاتەرزانی، عومەر نجاری، شێخ عەبدولموئمێن دووهەمی مەردووخی[4]، سۆفی عەلی کێونانی، حاجی عەلی موحەممەد بەگی تیلەکۆ، مەولانا فەڕوخ پاڵنگانی، مەلا فەزلوڵڵا (مەلای هەورامی)، مەولانا قاسم پایگەلانی، شێخ لوتفوڵڵا، موحممەد ئەمین بەگی هەورامی، موحەممەد قولی سولەیمان، شێخ موستەفا تەختەیی، ئوستاد میکائیل، نازر بستی، یۆسف یاسکە، یۆسف، مەولانا یۆسفی گلان، مەولانا یۆسفی ڕۆیسە، شێخ یەعقووب جان.

هەر وەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد لەم کەشکۆڵەدا بێسارانی بە «مەحزوونی» ناو دەبرێت و زۆربەی ئەو شێعرانەی لە ڕەدیفی شێعرەکانی بێسارانیدا هۆنراوەتەوە تێیدایە و بە پێچەوانەی نوسخەکانی دیکە ناوی شاعێرەکان لەسەر شێعرەکان نووسراوە. کاک

---

۱- کوڕی شێخ موستەفای تەختەیی بووە.(۱۱۳٤-۱۰۲٦ ک.م). (روحانی، ۱۳۹۰: ۱/۲۲۷).

۲- بۆی هەیە شێخ ئیبراهیمی هەورامانی یا مەلا ئیبراهیمی بیاری بێت. (ب: روحانی، ۱۳۹۰: ج۱، ل ۱۸٦و۳٤۱)

۳- بابی نووسەری کەشکۆڵەکە.

٤- نووسەری کەشکۆڵەکە.

«ئەنوەری سوڵتانی» ئەم کەشکۆڵەی بە ڕێنووسی ئەمڕۆیی نووسیوەتەوە و تا ئێستا دوو جار لە چاپ دراوە[١]. بەڵام بەداخەوە هەڵە و پەڵەی زۆری تێدایە.

چون ئەم نوسخە خەتیە بەڕاستی نوسخەیەکی کامڵ و ڕێک و پێکە و بە بڕوای ئێمە شێعرەکانی بێسارانی دەست کاری نەکراوە و تەواو هەورامی نووسراوەتەوە و زۆرترین شێعری بێسارانی تێدایە، ئێمە وەک نوسخەی بنەڕەتی بۆ ئەو کارە دامانناوە و لەم دیوانەدا بە نوسخەی «ک» ناوی براوە.

٢- ئێ: کاتێک کاک «عەبدوڵڵا ڕەحیمی» سەرقاڵی کۆکردنەوەی شێعرەکانی مامۆستا «بەدبەخت» دەبێت، نوسخەیەکی خەتی بەرچاو دەکەوێت کە شێعری بێسارانی تێدا نووسراوە، ئەو نوسخە خەتیە لە ساڵی ١٢١٤ ک.م بە دەستی «ئیسماعیل» ناوێک نووسراوە و ئیسکەن کراوە و گەیشتووەتە دەستی ئێمە و لەلایەن بنەماڵەی مامۆستا بەدبەختەوە پارێزراوە. نوسخەکە بە خەتی نەستەعلیقی زۆر جوان نووسراوە و سەرەتاکەی بەم شێوە دەست پێدەکات: «کلیات مولانا مصطفی بیسارانی دریای معانی» و شێعرەکانی بەم شێوە دابەش کردووە: «بهاریات»، «پاییزیات»، «چراخیات»، «دڵە» و «ابیات متفرقه» و بە داخەوە وەک دیارە بەشی «یاران»ی نەماوە.

ئەم نوسخە ١٩١ پارچە شێعری بێسارانی تێدایە کە زۆر ڕێک و پێک نووسراوە و چەن پارچە شێعری شاعێرانی دیکەی کە لە ڕەدیفی شێعرەکانی بێسارانیدا هۆنراوەتەوە وەک «دەردین» و «پەشێو» و «مەلا فەڕوخ» و «مەلا قاسم» و «یۆسف یاسکە»ی تێدایە. لە کۆتایی نوسخەکەیشدا نووسراوە: «تم بید الجریر الحقیر الفقیر الذلیل اسماعیل فی سلخ شهر رمضان المبارک١٢١٤». بە داخەوە بۆمان دیاری نەکرا ئەو ئیسماعیلە کێ بووە. لەم دیوانەدا ئەم نوسخە بە «ئێ» ناو براوە.

---

١- جارێکیان ساڵی ١٩٩٨ز لە لەندەن «تراستی سۆن بۆ کوردستان» و جارێکیشیان ساڵی ٢٠١٠ز «بنکەی ژین» لە سلێمانی چاپی کردووە.

٣- س: خودا لێخۆشبوو سەیید تاهێری هاشمی یەکێک لەو کەسانە بووە کە لە کۆکردنەوەی شێعری شاعێرە هەورامییەکاندا زۆر تێکۆشاوە[1]. بە تایبەت زۆری دڵ پێوە بووە بتوانێ شێعرەکانی مەولەوی و بێسارانی بە تەواوی کۆبکاتەوە. ئێمە دوو نوسخەی خەتی شێعرەکانی بێسارانیمان بە خەتی سەید تاهێری هاشمی بە لاوەیە:

ئەلف): نوسخەیەکی خەتیە کە ٢٢٠ پارچە شێعری تێدایە و لە سەرەتاوە ١١٥ شێعری مەولەوییە کە لە نێوانیاندا چوار پارچە شێعری لە شاعێرانی دیکەی هێناوە کە بە شێعرەکانی مەولەوییەوە نزیکە. پاشان نووسراوە: «بحمدللّٰه تمام شد اشعار حضرت جنت جایگاه سید عبدالرحیم المولوی المتخلص بمعدوومی رحمةاللّٰه علیه در ٢٠شهر رجب ١٣٥٧» و ئینجا دەستی کردووە بە نووسینی شێعرەکانی بێسارانی و ١٠١ پارچە شێعری نووسیوە کە هەمووی هی بێسارانییە. مێژووی تەواو بوونی بۆ دانەناوە و بە پێی ئەوەی کە لە دواییدا باسی دەکەین، زانیویە کە ئەوانە سەرجەمی شێعرەکانی بێسارانی نییە و بە هیوا بووە کە لە دواییدا پێی زیاد بکات. وەک لە کۆتایی شێعرەکانی مەولەویدا نووسیویە ئەم نوسخە لە ساڵی ١٣٥٧ی ک.م واتە ١٣١٧ی ک.ه نووسراوە.

ب): نوسخەیەکی خەتیە کە ٢٦١ شێعری تێدایە و لە کۆتاییدا نووسراوە: « اللهم صلی علی سیدنا محمد و علی آلە و صحبە و سلم. بخواهش دوست ارجمندم استاد [...][2]جناب آقای مولانا ملا علی صبّار سلمەاللّٰه تعالی استنساخ دیوان عارف ربانی مولانا ملا مصطفی بیسارانی رحمةاللّٰه تعالی پایان یافت. کرمانشاه بتاریخ

---

١- من نوسخەی خەتی زۆرم لەلایە کە خودا لێخۆشبوو سەیید تاهێر هاشمی شێعرەکانی مەولەوی و بێسارانی و سەیدی و زۆری تر لە شاعێرانی بە خەتی خۆی نووسیویە.(حەبیبی)

٢- وشەیەکە کە بۆم نەخوێنرایەوە. (حەبیبی).

یکشنبه شانزدهم ذی الحجةالحرام سنه ۱۳۹۲ مطابق اول بهمن ماه ۱۳۵۱. محمد طاهر سیّد زاده هاشمی سولەئی برزنجی عفی عنه و عن والدیه. تقریباً ۱٦۰۲ بیت».
و بە دوایدا ڕوون کردنەوەیەکی نووسیوە و پێویستە بۆ دەرکەوتنی ئەوەی بۆچی لەم نوسخەدا شێعری شاعێرانی دیکەی بە ناوی بێسارانییەوە نووسیوە، هەندێکی بنووسین: «بسمەتعالی. نخستین بار که من نام بیسارانی را شنیدم تقریبا چهل و شش سال پیش بود یعنی سنه ۱۳٤٤ قمری بود. در این سال مرحوم ملا علاءالدین فرزند مرحوم حاج ملا علی گلینی نسخهای از دیوان عارف و شاعر بزرگوار کرد مرحوم ملا مصطفی بیسارانی را به عنوان هدیه برای پدر نگارنده آورده بود. من آن وقت بی تمیز بودم، به یاد دارم که مرحوم پدرم گاهی بمطالعه آن نسخه میپرداخت و گاهی مرحوم ملا علی با صوت بم و گیرای خود ابیاتی از آن را در مجلس پدرم می خواند.
.... چند سال از این تارخ گذشت و من مختصری از خواندن و نوشتن یاد گرفته بودم و برای اولین دفعه در سنۀ ۱۳۵۱ قمری(۱۳۱۱ شمسی) به استنساخ این دیوان موفق شدم.
نسخه اهدایی مرحوم ملا علی بخط خوش و خوانای ملا عبدالرحمن مازی بنی در سنه ۱۲۷۸ قمری تحریر یافته و در غایت صحت و اعتبار بود. این نسخه بعداً به تملک من درآمد و چون از ابتدای آن مقداری افتاده بود مصمم شدم که بتکمیل آن بپردازم. بنابراین در زمستان ۱۳۲۳ شمسی در سنندج یک نسخه ناقص از دیوان بیسارانی را که با خطی نستعلیق و زیبا نوشته شده بود از دوست محترم جناب آقای عباس خان آزادپور (جناب سرهنگ آزاد پور فعلی) عاریه گرفتم. و چون در آن اوان شخصاً فرصت کتابت نداشتم لذا از آقای ملا محمد رشید معدومی فرزند حاج ملا ابراهیم دولابی که آن ایام در دولت آباد اقامت داشت، خواستار شدم که از هر دو نوسخه دیوانی تشکیل دهد. آقای معدومی ملتمس مرا اجابت نمود و از روی هر دو نسخه

سابق الذکر نسخه ثالثی تدوین نمود و در منطقۀ ژاورود نسخه دیگری بدست آورده و غزلیات اضافه را نیز بر این نسخه بیفزود و فی الحقیقه پیدایش نسخه حاضر بیشتر مرهون جدیت و زحمات و پشتکار ایشان است.

..... البته نمی توان مدعی شد که این مجموعه کلیه غزلیات بیسارانی را حاوی است، زیرا بسیاری از ابیات بیسارانی در افواه مردم ساری است و در این نسخه موجود نمی باشد..... لیلۀ یک شنبه ۱۳۵۱/۱۱/۱ محمد طاهر سید زاده هاشمی».

لەم نووسراوەدا چەند بابەتێک بۆ ئێمە ڕوون دەبێتەوە:

* قەدیمیترین نوسخەیەک کە بە دەستی خودا لێخۆشبوو سەیید تاهێرەوە بووە و چاوی پێ کەوتووە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ۱۲۸۷ی ک.م، لە حاڵێکدا نوسخەی «ک» لە ساڵی ۱۱۹۷ ک.م و نوسخەی «ئێ» لە ساڵی ۱۲۱٤ ک.م دا نووسراوە. یانی زۆر قەدیمیترن.

* یەکەمین نوسخەی خەتی لە شێعرەکانی بێسارانی کە بە دەستی سەیید تاهێری هاشمی نووسراوە لە ساڵی ۱۳۵۷ ک.م و دووهەمیان لە ساڵی ۱۳۹۲ک.م دا بووە.

* کاری ئەم نوسخە دوایی‌یە زیاتر «مەلا موحەممەد ڕەشیدی مەعدوومی دۆڵابی» ئەنجامی داوە کە ئەو نوسخە خەتیە بۆ سەیید تاهێری هاشمی نووسیوە و کەوتوەتە دەستی ئێمە کە دواتر باسی لەسەر دەکەین.

لە هەڵسەنگاندنی نوسخە خەتیەکانی ئەو لەگەڵ نوسخەکانی دیکە دوو شتمان بۆ ڕوون بووەوە:

یەک) بە داخەوە ئەو هەڵانە کە لە نوسخە خەتیەکەی «مەلا عەلا»دا بوون و ئەوانیشە کە دواتر «مەلا موحەممەد ڕەشید» نووسیون، هاتوونەتە نێو ئەم نوسخەیش و بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە ئەم نوسخە دواییەی سەیید تاهێر نوسخەی بنەڕەتی

بووە بۆ ئەو دیوانانەی کە چاپ کراون(حەکیم مـەلا سـاڵح، نیـک ڕەفتـار، بـۆرەکـەیی) ئەوانیش دیسان ئەو هەڵانەیان دووپات کردوەتەوە.

دوو) لە سەرجەمی ئەو ٢٦١ پارچە شێعرەی کە سـەیید تـاهێری هێناویـە لـە دیوانـە چاپ کراوەکاندا دووپات بوونەتەوە، بە بەڵگەوە ١٦ پارچە شـێعری، شـێعری بێسـارانی نییە و هی شاعێرانی دیکەیە و لە ڕەدیفی شێعرەکانی بێسارانیدا هۆنیویانەتەوە و لێرەدا ناوی شاعێرەکان و ئەو پارچە شێعرانەی لە ڕەدیفی شێعرەکـانی بێسـارانیدا هۆنراوەتـەوە، دەینووسین. شایانی باسە کە لە شەرحی شێعرەکانی بێسارانیدا ئەو شێعرانەمان هێناوە:

- ئارۆ شیان دیم ڕەنگ خەزانان (موحەممەد قـولی سـولەیمان لـە ڕەدیفـی: ئـارۆ دیـم خەزان دوور جە پای نەمام)

- تاف دێوەزناو[1] (شێخ جمال الدین مەردووخی لە ڕەدیفی: تاف دێوانە)

- تەرزێو خەزان دیم جە فەسڵ هامن ( شێخ ئەحمەد تەختەیی لە ڕەدیفی: میرزام نەو وەهار)

- چراخم ئەر بەی (حاجی عەلی موحەممەد بەگ تیلەکۆ)

- دڵە تۆ جە تەوق (موحەممەد قولی سولەیمان)

- ڕوێ دیم کوفرێ ڕووی ئیمان مەگرت (شێخ لوتفوڵڵا لە ڕەدیفی: ڕوێ سپای کوفر دیـم نە دەور دین)

---

١- سەیید تاهێری هاشمی لە نوسخە خەتیەکەیدا لەسەر ئەم شێعرە نووسیویە: «این غزل ازحیـث سبک و اصطلاحات و نتیجه‌گیری ادنی شباهتی به شعر بیسارانی ندارد. غالب ظن نگارنده بـر آن است که از سید صادق بوده و مقطع آن را از حیث تقدیم عاشق بر صادق تغیر داده باشند. از ایـن سید صادق چند غزل به همین شیوه هیجده هجایی[؟] اورامانی نزد من موجود است. سید طاهر هاشمی ٥١/١٠/٣٠» ئەمە نیشاندەری ئەوەیە کە خۆیشی زانیوە هی بێسارانی نییە بەڵام بە جوانی نەیزانیوە شێعری کێیە. بۆچی بە ناوی بێسارانییەوە نووسیویە نازانم.

- ڕۆی کوفرێ دیم ئیمان مەپۆشا (یۆسف یاسکە لە ڕەدیفی: ڕوێ سپای کوفر دیم نە دەور دین)
- زڵێخام تەتار (میرزا ئیبراهیم لە ڕەدیفی: زڵێخام ساوان)
- ساقی کەی بۆ کەی (ئەلیاس بەگ لە ڕەدیفی: ساقی مەی داریم)
- ساقی ناڵەی نەی (میرزا فەزلوڵڵا لە ڕەدیفی: ساقی مەی داریم)
- قیبلەم جە لاتەن (مەلا قاسم)
- مەولام بێ قەرار (مەولانا فەروخ پاڵنگانی لە ڕەدیفی: تاف دێوانە)
- مەولام جە سەحەر (مەلا قاسم لە ڕەدیفی: باد هەرجایی)
- مەولام دەردشەن (مەلا حافێز فەرهاد لە ڕەدیفی: تاف دێوانە)
- مەولام گوڵخونچەی ساوای نەشکوفتە (ئوستاد میکائێل لە ڕەدیفی: گوڵخونچێوە دیم وەرەق نەشکوفتە)
- موتریب نەوای چەنگ (حاجی عەلی موحەممەد بەگ تیلەکۆ لە ڕەدیفی ساقی مەی داریم)

جگە لەم پارچە شێعرانە کە وتمان هەندێ شێعریشی هێناوە کە یا بە هەڵە نووسیویە و یا هەر هی بێسارانی نییە و چون لە سەبکی بێسارانی دوورن و زۆر سووکن وەک «قیبلەم تۆ ئامای»(ب: بێسارانی، ۱۳۷۵: ۳۸۱) و «قیبلەم دیدارت»(هەر ئەو سەرچاوە: ٤٠٣) کە ئێمە لە ناوئاخنی شێعرەکانی بێسارانیدا دەرمان هێناون.

نوسخەکەی سەیید تاهێری هاشمی لەم دیوانەدا بە «س» ناوبردە کراوە.

٤- ڕ: هەر وەک سەیید تاهێری هاشمی ئاماژەی پێ کردووە ساڵی ۱۳٤۱ی ک.هـ «مەلا موحەممەد ڕەشید مەعدوومی دۆڵابی» دیوانی بێسارانی لە ڕووی نوسخە خەتیەکانەوە نووسیوەتەوە و داویە بە «سەیید عەلی هاشمی» بەرای سەیید تاهێر و پاشان کەوتوەتە دەست سەیید تاهێر و ئەویش هەڵەکانی ڕاست کردوەتەوە و هەندێ

شێعری پێ زیاد کردووە و داویەتەوە دەست مەعدوومی و ئەویش پاکنووسی دیوانەکەی لـە ١٣٥١/٦/٢٥ ک.ھ تـەواو کـردووە. هـەر وەک لـە سـەرەتای دیـوانی بێسـارانی (بێسارانی، ١٣٧٥: ٢٥) هاتووە ئەم نوسخە، نوسخەی بنەڕەتی بووە بۆ کارەکەی کـاک حەکیم مەلا ساڵح و ئاگـاداریش بـووە کـە ئەویشـە هـەر هینـەکـەی سـەیید تـاهێری هاشمییە. ئەو نوسخە خەتیەی مەلا موحەممەد ڕەشید کە بە لای ئێمەوەیە ئەوەیە کە بۆ سەیید عەلی هاشمی نووسراوە و سەیید تاهێری هاشـمی ڕێکـی خسـتووە و خـەتی هەردووکیانی پێوەیە. لە سەرەتای شێعرەکانەوە نووسراوە: «این دیوان پر شور و شـرر کـه نمونۀ بارز از عالم عشق و عاشقی است و غنچۀ نو دمیدۀ گلزار گلستان ادبیات کردی زبان به شمار می آید از اثر طبع آتشین شاعر شیرین زبان ادیب زمان مرحـوم مبـرور جنّت جایگاه ملا مصطفی بیسـارانی اسـت رحمـه اللّٰه علیـه و بـاللّٰه توفیـق و علیـه التکلان» و لە کۆتاییشەوە نووسیویە: «بتاریخ هشتم فروردین ماه سال هزار و سیصد و چهل و یک شمسی بر حسب فرمودۀ حضرت قبله گاهی محترم مولا زادۀ معظم جناب آقای آقا سید علی فرزند مرحوم مبرور جنت جایگاه حضـرت سـید قیـدار ملقـب بـه سیدالدوله اقدام به استنساخ دیوان اشعار شاعر شیرین زبان سرباختۀ میدان عشـق و عاشقی مرحوم ملا مصطفی بیسارانی گردید. امید میرود هر گاه که حضرت معظم له دیوان مرحوم ملا مصطفی را در نظر بگذراند این حقیر محمد رشید فرزند مرحوم ملا ابراهیم فرزند خلیفه عبداللّٰه فرزند خلیفه ملا غنی فرزند ملا مصـطفی کـه مشـهور است به خلیفه مصطفی فرزند حاجی شفیع فرزند پیر میـرزا فرزند ملا رمضـان فرزنـد ملا شهاب که اباً عن جد مرید و سرسپردۀ خاندان جلیلۀ سولەای بودەایم بدعای بقـای ایمان و حسن خواتم یادآور شوند. انا الحقیر العاصی سگ درگاه حضـرت سـید رسـول محمد رشید معدومی.» ئینجا پاش ئـەوەی گەیشـتووە بـە دەسـتی سـەیید تـاهێر و ڕاستی کردوەتەوە، ئەویش لە ژێر نووسراوەکەی مەلا موحەممـەد ڕەشـیددا ئـەم چەنـد

دێڕەی نووسیوە: «در روز ۱۳٤۱/۹/۱۵ از مطالعه و تقریباً تصحیح این دیوان معارف بنیان که برادر عزیز و رفیق شفیقم آقای مـلا محمـد رشـید معـدومی دولابـی جهـت حضـرت اخوی آقای سید علی هاشمی استنساخ نموده فراغت حاصـل گردیـد. البتـه نمی توانم عرض کنم که با این یک بار مطالعه تصحیح کامل یافته است. امیدوارم بـا مقابله با نسخ صحیح کلیهٔ اغلاط صحت یابد. تاریخ ٤۱/۹/۱۵ . دولت آبـاد. طـاهر هاشمی». ئەم نوسخە خەتیە ۲۸٦ پارچـە شـێعری تێدایـە کـە ۱٦ پارچـەی شـێعری شاعێرانی دیکەیە و بە ناوی بێسارانییەوە نووسـراوە. (هـەر ئـەو ۱٦ پارچەیـە کـە لـە نوسخەی «س»یشدا هاتووە). ۱۲ پارچەی ئاخری سەیید تاهێر پێی زیـاد کـردووە و ۲ پارچەی دووپات کراوەتەوە و پارچەیەکیشی شـێعری «دەردیـن»ـە و ۲٤۹ پارچەیشـی شێعری بێسارانییە کە وەک پێشتریش ئاماژەمان پێکرد هەڵە و پەڵـەی زۆری تێدایـە. ئەم نوسخە لەم دیوانەدا بە «ڕ» ناو براوە.

٥- ئا: کەشکۆڵێکە کە ۱۰۲ پارچە شێعری تێدایە. بە خەتێکی جـوان نووسـراوە و لـە دێی ئارندان پارێزراوە و تەنیا وێنەی نوسخەکە لە لایەن مامۆسـتا موحەممـەد ڕەشـید ئەمینییـەوە بـە دەسـتی مـن گەیشـت، بـە وتـەی جـەنابیان نووسـەری نوسـخەکـە «عەبدولقادر ئارندان»ی بووە کە ئەڵبەتە ۸ پارچە شێعریش لـە کۆتـایی نوسـخەکـەوە هاتووە و لە سەری نووسراوە «من کلام عبدالقادر».

لە کۆی ئەو ۱۰۲ پارچە شێعرە ٥۸ پارچە شێعری هی بێسـارانییە و ئـەوانی دیکـەش شێعری شاعێرانێک وەک وەلی دێوانە و ئەحمەد بەگ کۆماسـی و حـەزین و خەسـتە و.....ـە. مێژوویێک بۆ نووسینی نوسـخەکـە دیـاری نـەکـراوە و تـەنیا لـە شـوێنێکدا نووسراوە «سنه ۱۳۹». ئەم نوسخە لەم دیوانەدا بە «ئا» ناوبردە کراوە.

٦- عـم: نوسخەیەکی خەتیە کـە خـودا لێخۆشـبوو مەلاعەبدولکـەریمی مـودەڕیس نووسیویە و شێعرەکانیشی شەرح کردووە و وا دیارە بۆ چاپ ئامادەی کردووە. ئەم نوسخە

١٤٤ شێعری تێدایە کە مامۆستا هەمووی بە ناوی بێسارانییەوە هێناوە بەڵام بە پێی نوسخەکانی دیکە کە لای ئێمە هەیە ١١٨ پارچەی شێعری بێسارانییەوە و ٢ پارچەی دووبیات کراوەتەوە، پارچەیەکی شێعری ئەحمەد بەگی کۆماسی‌یە و پارچەیەکی هی فانی و ٢٢ پارچەیشی هی شاعێرانی دیکەیە کە بە هەڵە بە ناوی بێسارانییەوە نووسراوە. لەبەر ئەوەی مامۆستا مودەڕیس سەرچاوەی دیاری نەکردووە و ئەو شاعێرانەی دیکەمان بۆ نەدۆزرایەوە. پێویستە ئاماژە بەوەیش بکەین جگە لە هێنانی ئەو ٢٤ پارچە شێعرە بە ناوی بێسارانییەوە لە زۆر جێگەی شەرحی شێعرەکانیشدا هەڵەی کردووە و مامۆستا بە جوانی ماناکەی نەپێکاوە.

لە کۆتایی نوسخەکەدا ئەو دێڕانە نووسراوە: «الحمدللّٰه رزگار بوم لە نوسینەوەی ئەم شیعرانی بیسارانییە لە گەل شەرحەکەیا لە حوجرەی مدرسەی حضرتی شیخ عبدالقادری گیلانیدا قدس سره لە بغدادا شەوی یەک شنبە ٢٦/١١/١٩٧٢ میلادی وە ٢١/١٠/١٣٩٢ هجریدا والحمدللّٰه رب العالمین و الصلوة و السلام علی سیدنا محمد و آله و صحبه اجمعین و مؤلف تە بە شەرحەوە نوسەر عبدالکریم محمد المدرس».
ئەم نوسخە لەم دیوانەدا بە «عم» ناودێر کراوە.

٧- م: کەشکۆڵە شێعرێکی هەورامییە کە بە ژمارەی ٤١٨١ لە کتێبخانەی زانکۆی تاران ئەپارێزێت. ئەم کەشکۆڵە کە نوسخە دیجیتاڵیەکەی لای ئێمە هەیە دیارە بە ڕێکی و پێکی ئیسکەین نەکراوە و لاپەڕەکانی لە شوێنی خۆیدا و بە دوای یەکدا نین. نوسخەکە دووبەشە، بەشێکی چیرۆکی «خورشید و خاوەر»ـە بە نەزمی هەورامی نووسراوە و ئەو بەشەکەی تریشی شێعری هەورامییە لە شاعێرگەلێک وەک: میرزا شەفیع، ئەحمەد بەگی کۆماسی، سەرعی، شێخ شەهاب، خەمین و... جگە لەمانەیش ٥٤ پارچە شێعری بێسارانی تێدایە کە لە جێگەی خۆیدا بەهرەمان لێ بردووە. لە لاپەڕەیەکی نوسخەکەدا مێژووەکەی بەم شێوە دیاری کراوە: «هوالمعین. در هذه سنة

لوی ئیل[1] فقیر میرزا محمد صادق بجهة برادر عزیز محمد آقا ولد آقا محمود ولد مرحوم محمد آقا ولد مغفور خواجه صادق تحریر نمود. فی سنه ١٢٩٨.» ئەم نوسخە لەم دیوانەدا بە «م» دیاری کراوە.

٨- ع: کەشکۆڵە شێعرێکی هەورامییە کە لە پاوە دەپارێزرێت و مامۆستا موحەممەد ڕەشید ئەمینی کۆپیەکەی بۆ ئێمە هێنا، شێعری شاعێرانێک وەک: میرزا شەفێع، وەلی دێوانە، شێخ موحەممەد سەلیم، مەهجووری، شێخ شەهاب و... و ٢٨ پارچە شێعری بێسارانی تێدایە و لە کۆتاییشدا نووسراوە: «هزاران درود هزاران سلام از ما بر محمد علیەالسلام [...] شد از دست حقیر عبدالفتاح [...] ١٢٩٠». وا دیارە نووسەرەکەی ناوی «عبدالفتاح» بووە و لە ساڵی ١٢٩٠ک.م دا نووسراوە. ئەم نوسخە نوسخەیەکی زۆر ئەعلایە بەڵام بە داخەوە زۆری دڕاوە شیرازەی پچڕاوە و شێواوە. تەنانەت مێژووی نووسینەکەیشی کە ئاماژەمان پێ کرد بە ڕێک و پێکی ناخوێنرێتەوە و دوو جێگایشی دیار نییە چی نووسراوە کە بە هێمای [...] دیاری کراوە. ئەم نوسخەیش لەم دیوانەدا بە پیتی «ع» ناوبردە کراوە.

٩- ل: کەشکۆڵە شێعرێکی هەورامییە کە وێنەی نوسخەکە لە لایەن مامۆستا موحەممەد ڕەشید ئەمینییەوە بە دەستی من گەیشت و شێعری چەن شاعرێکی وەک: میرزا شەفێع، فلانی[؟]، میرزا[؟]، غوربەتی، خانا، کۆماسی، شێخ شەهاب، مەولەوی، چەند پارچە شێعرێکی ژنانە کە نووسەرەکەی دیاری نەکراوە و هەروەها ٢٥ پارچە شێعری دیاری کراوی بێسارانی و ٧ پارچە شێعری دیاری نەکراوی تێدایە. لە دوو سێ جێگەدا مێژووی پێوە نووسراوە. جێگەیەی نووسراوە: «تولد نور چشم عزیزم پسر محمد صادق بیگ کە شب دوشنبە شهر صفرالمصفر چهار از نیمە گذشتە پسرانە [؟] سنە ١٢٨٦» و لە جێگەیەکی دیکەدا نووسراوە: «سنە ١٢٨٦» و لە

---

١- بە تورکی یانی «ساڵی نەهەنگ» و پەنجەمین ساڵە لە ساڵە دوانزەیەکانی تورکی.

جێگەیەکی دیکەدا نووسراوە: «لطف اللّٰه. پایز، روز جمعه. بتاریخ غره شهری سنه ١٢٨٢». وەک دیارە نووسەری ناوی «لوتفوڵڵا» بووە و لە ساڵەکانی ١٢٨٢ تا ١٢٨٦ی کۆچی مانگی دا نووسراوە. ئەم نوسخە لەم دیوانەدا بە «ل» ناو براوە.

١٠- ج: کەشکۆڵە شێعرێکی قەدیمییە کە بە داخەوە سەرەتا و کۆتاییەکەی نەماوە و دیار نییە کێ نووسیویە، تەنیا لە شوێنێکیدا نووسراوە: «تاریخ. عبدلقادر پسر خضر چاوش ١٢٤٥. آمدن سلیمان پاشا از [...] محمود پاشا از بند [...] ١٢٤٥»[1]. لە بەر ئەوە وا دیارە لە ساڵی ١٢٤٥ ک.م نووسراوە. ئەم کەشکۆڵە شێعری شاعێرانێک وەک: یۆسف یاسکە، وەلی دێوانە، خانای قوبادی، مەینەتی، تالع و... و هەروەها ١٩ پارچە شێعری دیاری کراوی بێسارانی و ٩ پارچە شێعر کە ناوێتەی شێعرەکانی بێسارانی بووە و لێیانەوە نزیکە کە لە جێی خۆیدا هێناومانە و باسمان لەسەر کردووە، تێدایە. ئەم نوسخە لەم دیوانەدا بە «ج» ناوبردە کراوە.

١١- مج: نوسخەیەکی خەتیە کە لای کاک «مەزهەر ئەدوای» بە دەستی ئێمە گەیشت. ئەم نوسخە خەتیە لە ساڵەکانی١٢٨١ تا ١٢٨٣ کۆچی مانگی بە دەستی «مەلا ئەحمەد جوانرۆیی» نووسراوە، کەشکۆڵە شێعرێکی هەورامییە کە شێعری هەندێک لە شاعێرانی وەک: مەولەوی و ئەحمەد بەگی کۆماسی و مەهجووری و سەیدی و بوڵبوڵ و... هتدی تێدان. لەم نوسخەدا ٤٨ شێعر بە ناوی بێسارانییەوە هاتووە کە لە سەرەتاوە نووسراوە: «بسم اللّٰه الرحمن الرحیم اول دیوان مولانا مصطفی علیه الرحمه، بسم اللّٰه خیر الاسماء. در تعریف بهاریات.» وەها دیارە بە هیوا بووە کۆی شێعرەکانی بێسارانی بنووسێت بەڵام بە داخەوە تەنیا ٤٨ پارچە شێعری نووسیوە کە سێ پارچەی، شێعری شاعێرانی دیکەیە و بە هەڵە بە ناوی بێسارانییەوە نووسراوە. نوسخەکە بە خەتێکی نەستەعلیقی زۆر جوان نووسراوە. لە چەند جێگەدا مێژووی نووسینی

---

١- بە داخەوە دوو جێگەی بە باشی ناخوێنرێتەوە، بەڵام وەها دیارە ئاماژەیە بە ڕووداوێکی مێژوویی.

پێوەیە، لە جێگەیەکدا نووسراوە: «در حالت بی رحمی یـار و مشـکلات روزگـار قلمـی گردید ۱۲۸۱»، لە جێگەیەکی دیکەدا نووسراوە: «در حالت غـافلی صـورت اختتـام پذیرفت ۱۲۸۳»، لە جێگەیەکی دیکەدا نووسراوە: «حسب الالتماس برادرم فقیه احمد قلمی گردید گستهٔ جوانرودی در حجره ملا عمر، سنه ...» کە ساڵەکەی دیار نییە و لە دواییدا بە خەتێکی دیکە ساڵی ۱۳۰۷ی بۆ نووسراوە. ئەم نوسـخە لـەم دیوانـەدا بـە «مج» ناوبردە کراوە.

۱۲- بر: نوسخەیەکی خەتیە کە بە ژومارەی Hs.or.۹۸۷۸ لـە کتێبخانـەی برلینـدا پارێزراوە و بەداخەوە نە دیارە کێ نووسیوە و نە کەی نووسـراوە. لـەم نوسـخەدا شـێعری شاعێرە هەورامییەکان وەک: مەولەوی، فەقێ حەسەن، فانی، شێخ نعمـت اللّٰە نـەوازی، میرزا شەفێع، دەردین، سەیدی، خانا، یۆسف یاسکە، شێخ شـەهاب، ئـەلیاس بـە گ و هەر وەها ۹ پارچە شێعری دیاری کراوی بێسارانی و ۷ پارچە شـێعری دیـاری نـەکـراوی هاتووە. ئەم نوسخە لەم دیوانەدا بە «بر» ناو براوە.

۱۳- پ: نوسخەیەکی خەتیە بە خەتی «مەحموود پاشای جاف» کە بنکەی ژیـن لـە ساڵی ۲۰۱٤ی میلادیدا وەک خـۆی لـە دوو بـەرگـدا چـاپی کـردووە و یـەکێکـە لـە کەشکۆڵە هەرە چاکەکان کە زیاتر شێعری مەولەوی تێدایە، بەڵام شـێعری شـاعێرانێکی دیکەیشی وەک: شێخ موستەفا تەختەیی، کۆماسی، مەلا وەڵەد خان، حەسەن کەنۆش، مەولانا خالید، نەجەف، فەخرولعولەما، میرزا شەفێع، غوڵام شاخان، سەرعی، جنوونی، قەمەر عەلی، یۆسف بە گ، وەلی دێوانە، میـرزا موحەمـەد، کاکـە ئەحمـەد، مـەلا موستەفا کلاشی، مەلا عەبدولخالەق پاوەیی، شێخ شەهاب، میرزا یاقۆ، خانا، مەحرووم، و هەروەها سێ پارچـە شێعریشـی لـە بێسـارانی تێدایـە. لـەو جێگەیـدا شـێعرەکـانی بێسارانی نووسیوە لە پاڵیدا نووسیویە: «این گورانیِ ولی، بـا گـورانی سـوال و جـواب بیسارانی و یوسف نوشته شد از تاریخ ۱۳۰۹ از ضامن کوه شمیران از پانزدهم رمضان،

میرزا محمد یاقو که در نزدم بود از بر می خواند و من می نوشتم و صلّی اللّه علی خیر خلق سیّدنا و نبیّنا محمّد و آله و صحبه و خلفائه اجمعین آمین والحمداللّه رب العالمین.» ئەم نوسخە لەم دیوانەدا بە «پ» ناو براوە.

١٤- ی: سێ نوسخەی دەستنووسە بەم شێوە:

١٤-١) نوسخەیەکی خەتیە کە زیاتر شێعری مەولەوی تێدایە و بە ژومارە ١٧/٢٤٠ لە کتێبخانەی گوڵپایەگانی شاری «قوم» دەپارێزرێت و ٢ پارچە شێعری بێسارانی تێدایە و دیاریش نییە کێ نووسیویە.

١٤-٢) نوسخەیەکی خەتیە کە زیاتر شێعری مەولەوی تێدایە و بە ژومارەی Hs.or.٩٨٨٢ لە کتێبخانەی برلیندا دەپارێزرێت، ٦ پارچە شێعری بێسارانی تێدایە و نووسەرەکەی دیار نییە، بەس ئەوە دیارە لە ساڵەکانی ١٢٩٧ تا ١٣٠٤ ک.م نووسراوە.

١٤-٣) نوسخەیەکی خەتیە کە زیاتر شێعری مەولەوی تێدایە و بە ژومارەی Hs.or.٩٨٧٣ لە کتێبخانەی برلیندا پارێزراوە و ٢ پارچە شێعری بێسارانی تێدایە بەڵام نە نووسەر نە ساڵی نووسینی دیار نییە.

ئەم سێ نوسخە، شێعری هاوبەشیان تێدا نییە و لەم دیوانەدا بە «ی» ناویان براوە.

لە نوسخەی Hs.or.٩٨٧٣دا دوای دوو پارچە شێعرەکە شێعرێک نووسراوە کە هەندێ لەگەڵ نوسخەی «ع»دا جیاوازی هەیە، زۆر لە شێعری بێسارانی دەچێت و بەو شێواز و سەبکە تایبەتە کە لە بەشی «بێسارانی و شێعرەکەی»دا باسمان کردووە نووسراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە نوسخەکانی دیکەدا نییە و لە هیچکام لەم دوو نوسخەدا هیچی لەسەر نەنووسراوە و دیار نییە شێعری کێیە، لێرەدا هەر بۆ هەڵسەنگاندن دەیهێنین:

قیبلەم! دین تۆم، قیبلەم! دین تۆم ئازیز ئینتیزار پەرێ دین تۆم

بێ خواب و ئارام، دڵ غەمگین تۆم **ئارەزووی یەک ماچ پای جەمین تۆم**

| | |
|---|---|
| دێوانـــەی دیـــدەی ئاهووتـــار تـــۆم | پێکیـــای مـــوژەی خەدەنگـــدار تـــۆم |
| مـەحبووس زێنـدان سیادەسـتەی تـۆم | کوشـــتەی لیمـــوان تازەڕەســـتەی تـــۆم |
| نمـــەد پۆشـــەکەی شـــار چـــین تـــۆم | **ئارەزووی یـەک مـاچ پـای جـەمین تـۆم** |
| عاشـــق وە بـــاڵای نەونـــەمام تـــۆم | گرفتـــار شـــێوەی پـــەری‌ســـام تـــۆم |
| زەدەی ئـێش نـێش سـەخت بـرین تـۆم | **ئارەزووی یـەک مـاچ پـای جـەمین تـۆم** |
| شـــەرتەن بزانـــی مـــن بـــەدحاڵ تـــۆم | غـــوڵام ئـــێخلاس زڵـــف و خـــاڵ تـــۆم |
| ژیـــن و ژیـــانم گشـــت بـــە دیـــن تـــۆم | **ئارەزووی یـەک مـاچ پـای جـەمین تـۆم** |

**ب) دیوانە چاپکراوەکان**

۱- ن: دیوانی بێسارانی کە بە دەستی کاک «کیومەرس نیک ڕەفتـار» کـۆ کراوەتـەوە و بەرگی یەکەمی (پیتی ئەلف تا دال) لە ساڵی ۱۹۸۲ی مـیلادی‌دا چـاپ کـراوە. ئـەو دیوانە سەرجەم ۱۱۲ پارچە شێعری تێدایە کە سێ پارچەی، شێعری بێسارانی نییە و بە هەڵە هاتوەتە نێوە شێعرەکانی بێسارانیەوە و ئەوانەیش ئەم پارچە شێعرانەن: «ئارۆ شیان دیم ڕەنگ خەزانان» کە شێعری «موحەمەد قولی سولەیمان»ـە و «چراخم ئەر بەی» کە شێعری «حاجی موحەممەد عەلی بەگی تیلەکۆ»یە و «دڵـە تـۆ جـە تـەوق» کـە ئەویش هەر شێعری «موحەممەد قولی سولەیمان»ـە. هەرچەند هەڵەی تـایپی زۆری تێدایە بەڵام وەک دیوانەکانی‌تر نییە و لە شەرحی شێعرەکاندا هەڵەی زۆری پیـوە دیـار نییە.

۲- ح: دیوانی بێسارانی کە کاک «حەکیم مـەلا سـاڵح» کـۆی کردوەتـەوە و لـە سـاڵی ۱۳۷۵ی ک.ه بڵاوگەی «گۆران» لە سنە چاپی کردووە. هەر وەها کە لـە سـەرەتاکەیدا هاتووە لە نوسخەکانی «ڕ» و «س» وەک نوسخەی بنـەڕەتی کـەڵک وەرگیـراوە کـە لـە بەشی نوسخە خەتیەکاندا باسمان کرد و هەر وەها لە چەند دەفتەری دەستنووسی تـر و

«کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی» و دیوانە چاپ کراوەکەی «ن» کە لە هەرکامیان چەند پارچە شێعر وەرگیراوە.

لەم دیوانەدا ٣٠٢ پارچەی شێعر بە ناوی بێسارانییەوە چاپ کراوە کە ٣٥ پارچەی شێعری بێسارانی نییە و بە هەڵە بە ناوی بێسارانییەوە نووسراوە. ١٦ پارچە لەم ٣٥ شێعرە لە بەشی نوسخە خەتیەکاندا باسمان کردووە و وتوومانە کە هەر کامیان شێعری کێن و لە ڕەدیفی کام پارچە شێعری بێسارانی هۆنراونەتەوە. هەر وەها کە ئاماژەمان پێ کرد ئەم هەڵە یەکەم جار لە نوسخەی «س»دا کراوە و کاک حەکیمیش بە پێی ئەو نوسخە دووپاتی کردوەتەوە. ١٩ شێعری تری لە دەفتەرە دەستنووسەکان هێناوە، لە هیچ کام لە نوسخە خەتیەکاندا نییە و لە هەندێ جێگەیشدا خودی کاک حەکیم ئاماژەی کردووە کە ئەم شێعرە بە شێعری بێسارانی ناخوات. جگە لە هێنانی ئەو ٣٥ پارچە شێعرە کە بە ناوی بێسارانییەوە چاپ کراوە، ئەم دیوانە هەڵەی زۆر زۆر زەق و بەرچاوی تێدایە، هەم لە بواری خوێندنەوەی شێعرەکان لە ڕووی نوسخە خەتیەکانەوە و هەم لە بواری شەرحی شێعرەکاندا. لێرەدا بۆ وێنە ئاماژە بە چەند خاڵ دەکەین:

- زیاد کردنی پیتی «ی» لەنێوان (مضاف) و (مضاف الیە) بە شێوەی سۆرانی وەک «ڕەنگی خەزانان» کە دەبێت «ڕەنگ خەزانان» بنووسرێت و لە نوسخە خەتیەکاندا نووسراوە «رنگ خزانان». پێویستە ئەوەش بڵێین کە هێمای زیاد کردن لە هەورامیدا «واو»ە وەک «ڕەنگوو خەزانا» کە لە ئەدەبیاتی کلاسیکدا ئەم قاعیدە لەبەر چاو نەگیراوە و بە جێگەی ئەوە کەسرەی کورت (نەبینراو) بە کار براوە کە لەم ئەلفبایەدا نانووسرێت و هیچ هێمایەکی بۆ دانەنراوە. کە وایە لە شێعری شاعێرانێک وەک مەولەی و بێسارانی و سەیدی و... جۆری نووسینی تەرکیبی ئیزافی (هەر وەک لە دەستنووسەکاندا هاتووە) بێ هێمایە و ئێمە ناتوانین بە دڵی خۆمان هێمای ئیزافەی بۆ بێنین. ئەم کارە لە هەموو دیوانەکەدا دووپات کراوەتەوە.

- گۆڕینی وشەکان لە نووسینەوەیان دا لە ڕێنووسی فارسییەوە بە ئەم ڕێنووسە: ئەم هەڵە بە ڕادەیەک لە دیوانەکەدا دووپات کراوەتەوە کە بێ گومان دەتوانین بڵێین لاپەڕەی نییە ئەم هەڵەیە تێدا نەبێت، بە جۆرێک کە ئەگەر بمانەوێ ئاماژەیان پێ بکەین دەبێت کتێبێکی تەواو بنووسین بۆ هەڵەکان. پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە ئەو نوسخە خەتیە کە بۆ کارەکەی کاک حەکیم بنەما بووە لای ئێمەیش هەیە ئەو هەڵانەی باسمان کرد تێدا نییە و زیاتری هەڵەکان لە خوێندنەوە و نووسینەوەی شێعرەکاندا هاتوەتە ناو دیوانەکەوە.

- بە سۆرانی خوێندنەوەی زۆرێک لە وشە فارسی و هەورامییەکان وەک «ئێمشەو» کە بە «ئیمشەو» نووسراوە لە حاڵێکدا لە نووسخە خەتیەکاندا «امشو» نووسراوە. یا «مێنقار» بە «مینقار»، «پەڕ» بە «پڕ»، «مێسل» بە «میسل» و «شکەستە» بە «شکستە» و....

- لە مانا کردنی شێعرەکاندا هەڵە بە زۆری هەیە بە جۆرێک کە دەتوانم بڵێم لە زۆر جێگەدا کاک حەکیم مانای شێعرەکەی نەپێکاوە و بە کەیفی خۆی مانای کردوەتەوە و تەنیا داوا لە ئازیزان دەکەین خۆیان بڕۆن مانای شێعرەکان لە دیوانی کاک حەکیمدا لەگەڵ مانای شێعرەکانی ئێمە لەم دیوانەدا بەراوەرد بکەن.

۳- ب: دیوانی بێسارانی بە ئامادە کردنی «سدیق بۆرەکەیی» کە لەساڵی ۱۳۸۱ ک.هـ. بڵاوگەی کوردستان لە سنە چاپی کردووە و ۲۷۷ پارچە شێعری لە خۆی گرتووە کە ۱٦ پارچەی شێعری بێسارانی نییە. سەرچاوەی کاک سدیق بۆرەکەیی بۆ نووسینەوەی ئەم دیوانە دوو نوسخە بووە. یەکیان نوسخەی خەتی سەیید تاهێری هاشمی کە پێشتر باسمان کرد و ئەوی تریشیان نوسخەیەکی خەتی بە خەتی «سالمی سنە».

ئەم دیوانە جگە لەوەی ١٦ پارچە شێعری تێدایە کە بە هەڵە بە ناوی بێسارانییەوە چاپ کراوە و زیاتری ئەو شێعرانەن کە لە نوسخەکەی سەیید تاهێری هاشمیشدا هەیە

و پێشتر لەسەری دواین، ئەو هەڵانە کە لە «ح»دا هەیە لەم دیوانەدا نابینرێت. بۆ وێنە تەرکیبە ئیزافەکانی بە دروستی نووسیوە و زۆربەی ئەو وشانەی لە «ح»دا هەورامیانە نەنووسراوە ڕاست کراوەتەوە. پێویستە بڵێین کە ئەم دیوانە شەرح نەکراوە و تەنیا شێعرەکانی نووسیوەتەوە بەڵام دوور لە هەڵە و پەڵە نییە و لە هەندێ شوێن دا وەک کاک حەکیم بە هەڵە شێعری نووسیوەتەوە.

-١-[١]

ئاخ پەی منالّی، ئاخ پەی منالّی
ئاخ وا دەرێغا پەرێ منالّی[٢]

گۆشەی خاترم جە خەم بێ خالّی
لاقەید بیم جە تان، جە وەشی و تالّی[٣]

هەر بازیم مەکەرد مـن چەنی یاران
مەشیم وە باوەش نازک نازاران[٤]

نازاران جەمین لێم نمەپۆشان
مەکەردم سەیران زلّف وەش بۆشان[٥]

---

-١-

١- ح، س، ب، ن، ڕ، ج، عم.

٢- پەی: بۆ. دەرێغا: حەیف. پەرێ: بۆ. واتە: ئاخ و داخ و حەیف بۆ سەردەمی منداڵیم.

٣- لاقەید: کەسێک کە بەرپرسایەتی هیچ لە ئەستۆ ناگرێت و گوێ بە هیچ نادات. بیم: بووم. جە: لە. تان: تانە و تەشەر. وەشی: خۆشی. بێ: بوو. واتە: ئاخ و داخ و حەیف بۆ ئەو سەردەمەی کە هیچ خەم و خەفەتم نەبوو و گوێم بە خۆشی و تالّی ڕۆژگار نەدەدا.

٤- مەکەرد: دەمکرد. چەنی: لەگەڵ. مەشیم: دەچووم، دەڕۆیشتم. واتە: لەو کاتەدا من لەگەڵ یاراندا گاڵتە و گەمەم دەکرد و بێ ئەوەی کەس لۆمەم بکات دەچوومە کۆشی ناسک و نازدارانەوە.

٥- جەمین: ڕوخسار، ڕوومەت. نمەپۆشان: نەیاندەپۆشی. مەکەردم: دەمکرد. زلّف: پرچ، زولّف، قژ. وەش بۆشان: بۆنخۆشیان. واتە: ئەو ناسک و نازدارانە ئەو سەردەمە ڕوخساریان لە من نەدەپۆشا و بێخەم سەیری زولّفی بۆنخۆشیانم دەکرد.

ئیسە جە شوومی زەمانەی باتڵ

نازاران یەک یەک لێم مەکەران سڵ[١]

☆☆☆

-٢-[٢]

ئاخ جە کەردەی وێم، ئاخ جە کەردەی وێم

ئاخ ئاخ پەی خزمەت عەبەس کەردەی وێم[٣]

ڕەنج سەدساڵە لاودا بەردەی وێم

جە نەمام عەیش بەرنەوەردەی وێم[٤]

بە ئایر هێجران دەروون گڕیای وێم

پای ئامەشۆی ڕاز جە دۆست بڕیای وێم[٥]

---

١- شوومی: نەحسی، بەدبەختی. لێم مەکەران سڵ: سڵم لێ دەکەن، نزیکم ناکەون. واتە: ئێستە لە نەحسی زەمانە گەورە بووم و ئەو نازدارانە کە بە منداڵی لە کۆشیاندا بووم و بۆنی زوڵفیانم دەکرد دووریم لێ دەگرن و نزیکم ناکەون.

-٢-

٢- ل، بر.

٣- جە:لە. کەردە: کردەوە. وێم: خۆم. پەی: بۆ. عەبەس: بێ سوود، بێ کەڵک. واتە: ئاخ بۆ ئەو کار و کردەوە بێ سوودەی کردم.

٤- لاو:لافاو، سێڵاو. بەردەی: بردوو، براو. عەیش: ژیان. بەر: سەمەر. نەوەردە: نەخواردوو. واتە: ئاخ بۆ ڕەنجی سەدساڵەی لافاو بردووم کە لە نمامی ژیانم میوە و بەرهەمم نەخوارد.

٥- ئایر: ئاگر، گڕ. هێجران: هیجران، دووری، فیراق. گڕیای: گڕ تێبەربوو. ئامەشۆ: ئامشۆ، ☜

جــه خێــڵ خــه‌مان ده‌روون ئــاوای وێــم
بــێ داده‌ی مــوراد کــام نــه‌یاوای وێــم[١]

دووری یــار جــه‌فا پــێ نمانــای وێــم
جــه‌رگ لــت لــت کــه‌س پــێ نــه‌زانای وێــم[٢]

مــه‌گه‌ر خوداوه‌نــد کــه‌ره‌م کــه‌رۆوه
بــه دیــدار دۆســت شــادم کــه‌رۆوه[٣]

چه‌نــدێ بگێڵــۆ ده‌وران بــه چــاخم
وه‌گه‌رنــه بــه خــاک سـارێش بـۆ داخــم[٤]

---

☜ هات و چوو. ڕاز: قسه‌، په‌یڤین. بڕیای: بڕاو. واته‌: ئه‌ویش له‌به‌ر ئه‌وه‌یه که له یار دابڕاوم. ده‌نگی یار پێی لێم بڕاوه و چیتر ده‌نگی نابیستم.

١- خێڵ: تایه‌فه‌، ده‌سته‌، چه‌ند ماڵێکی کۆچه‌ری. ئاوا: ئاوه‌دان. بێ داده‌ی موراد: موراد نه‌دراو. کام نه‌یاوا: به موراد و ئاوات نه‌گه‌یشتوو. وێم: خۆم. واته‌: خێڵی خه‌مان ده‌روونی منیان ئاوه‌دان کردووه‌ته‌وه به موراد نه‌گه‌یشتووم «به ئاواته‌کانم نه‌گه‌یشووم.»

٢- نمانا: نواندن، نیشان دان. نه‌زانا: نه‌زانرا. واته‌: دووری له یار بێ وه‌فایی پێم نواندووه و جه‌رگم له‌ت له‌ت بووه و که‌سیش پێی نازانێت.

٣- که‌ره‌م: به‌خشین، گه‌وره‌یی. که‌رۆوه: بکاته‌وه. ئه‌م به‌یته ته‌نیا له نوسخه‌ی «ل»دا هاتووه و سه‌رواکه‌یشی کێشه‌ی هه‌یه و دیاره که به هاتنی ئه‌م به‌یته شێعره مانای شێعره‌که‌یش ته‌واو ده‌بێت. مانای ئه‌م به‌یته له گه‌ڵ به‌یتی دوایی‌دا دێت.

٤- چه‌ندێ: چه‌ندێک، تاچه‌ند. بگێڵۆ: بگه‌ڕێت: بسووڕێته‌وه‌. چاخ: که‌یف، مه‌یل. سارێش: سارێژ، خۆش بوونه‌وه‌ی زام. واته‌: مه‌گه‌ر خوداوه‌ند که‌رم بکات ئه‌م چه‌رخه چه‌ند ڕۆژێک به که‌یفی ☜

هـەی داد هـەی بێـداد هـەی ڕۆ هـەی هـاوار
وەڵـــڵا موشـــکێڵەن دووری و جـــەفای یـــار[1]

☆☆☆

-٣-[2]

ئـــــارۆ خـــــەزانێ زەردبـــــامم وینـــــا
کەفتـــەبێ نـــە لێـــو تـــاف گـــۆڵ مینـــا[3]

عـــەکســـش دیـــار بـــێ نـــە گـــۆلاو تـــاف
چـــمان مـــن مـــەڎیام نـــە ڕووی جـــام ســـاف[4]

---

☜ من بسووڕێت و خۆشم بێت ئەگینا مەگەر بمرم و بمنێژن و ئەو خاکی گـۆڕە زامـەکانم سـاڕێژ بکات.

١- موشکێڵەن: ئەستەمە، سەختە، دژوارە. ماناکەی ئاسانە و پێویست بە شەرح کردن ناکات. ئـەم بەیتە لە شێعری بێسارانی ناچێت بەڵام لە نوسخەکاندا بەم جۆرە هاتووە.

-٣-

٢- ک، ح، س، ن، ئێ، ب، عـم، ڕ.

٣- ئارۆ: ئەمڕۆ، ئیمڕۆ. خەزانێ: گەڵای زەرد، گەڵای خەزان لێدراو. زەردبام: زەردفام، ڕەنگێک کە بە زەرد بگۆڕدرێت. کەفتەبێ: کەوتبوو. لێو: لێوار، قەراخ، کەنار. تاف: تاڤگە، ئابشار، ئاوشار، قەڵوەز. وینا: بینیم، دیتم. گۆڵ: گۆلاو، گۆلی ئاو، گۆلکەئاو، جۆگە. مینا: شووشە، شیشە. واتـە: ئـەمڕۆ چاوم کەوت بە گەڵایەکی زەردی خەزان لێدراو کە لەو نێوەدا کەوتبووە لێواری تاڤگەیەک کە گۆلکە ئاوەکەی هێندە ڕۆشن بوو هەر دەتکوت شووشەیە.

٤- عەکس: وێنە. دیار بێ: دیار بوو. نە: لە. چمان: پێم وابوو، لام وابوو. مەڎیام: دەمڕوانی. واتە: وێنەی گەڵاکە کەوتبووە نێو گۆلکە ئاوەکەوە لام وابوو خەریکم لە ئاوێنەیەکی ساف و بێگەرددا☜

شـــیان هـــۆرم گێـــرت دیـــام پێشـــەڎا
چـــمان چـــەمم دا بـــە ســـەد نێشـــەڎا [1]

✡✡✡

-٤[2]-

ئـــارۆ خـــەمانم چـــوون دەماوەنـــد بـــیٚ
دیـــڎەی قیبلـــەی وێـــم بەنـــد شـــەوبەند بـــیٚ [3]

---

☞ دەروانم. مەبەستی ئەوەیە ڕەنگی منیش وەک گەڵاکە زەردە و لام وابوو وێنـەی منـە لـە گۆلـە ئاوەکەدا.

١- شیان: ڕۆیشتم. هۆرم گێرت: هەڵم گرت. دیام: ڕوانیم. پێشەڎا: پێیدا. چەم: چاو. نـێش: چـزە، لێرەدا بە مانای سیخ یان هەر شتێکی نووک تیژە. واتە: ڕۆیشتم و هەڵمگرت و خـۆمم تێـدا دیـت. وەک ئەوە بوو سەد سیخی تیژ بچێت بە چاومدا. مەبەستی ئەوەیە بە بینینی ڕەنگی گـەڵا زەردەکـە ڕەنگ زەردی خۆمم بیر کەوتەوە، زۆر عاجز بووم و خەفەتم خوارد و چاوم پـڕ بـوون لـە ئەسـرین. لـە سەرچاوەی «ن»دا ئەم بەیتە بەم جۆرە نووسراوە:

شـــیام هـــۆرگێرتم دیـــانیٚ پێشـــدا     چمان کاسەی خوم ڕێـزان بـە وێشـدا

-٤-

٢- س، ن، خ، ب، م.

٣- ئارۆ: ئەمڕۆ. چوون: وەک، وێنەی. بیٚ: بوو. دیڎە: دیدە، چاو. وێم: خۆم. شەوبەند: چارشـێو یـا هەر شتێک ڕوخسار بپۆشێت، وا دیارە بێسارانی مەبەستی «ڕووبەند» بووە. واتە: ئەمڕۆ یارم بینی کە ڕووبەندی دابوو بە ڕوویدا و چاوانیم نەبینی، منیش لەبەر ئەوەی کـە نـەمتوانی چاوانی ببیـنم خەمم بە قەت کێوی دەماوەند بوو.

واتــــم هـــەی قیبلـــەم! ئـــیمان و دیــــنم!
مـــن بـــەو دیــــدەی تـــۆ دنیـــا مـــەوینم[١]

مەگـــەر نەیشـــەڵڵا ئێشـــێ هـــا تێشـــدا
پەوکـــەی شـــەوبەندت ئـــاوردەن پێشـــدا؟[٢]

واتـــش بـــێ ڕامـــەن وە شـــەڕ شـــەریکەن
هوونیـــــەن، دەردیـــــن، ڕاویـــــار پێکـــــەن[٣]

ئـــەر مەرەخـــەس بـــۆ چـــوون هـــەردەجـــاران
دەییـــــــار نمـــــــازۆ جـــــــە ڕاویـــــــاران[٤]

---

١- واتم: وتم. مەوینم: دەبینم. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٢- نەیشەڵڵا: نە ئیشەڵڵا، خوا نەکردە، خوا نەخواستە. تێشدا: تێیدا. پەوکەی: بۆیە، لەبەر ئەوە. ئاوردەن: هاوردووە. پێشدا: پێیدا. واتە: وتم ئەی قیبلەم! دین و ئیمانەکەم! من هەموو دنیا لە چاوی تۆدا دەبینم یا من بە چاوانی تۆ دنیا دەبینم، مەگەر خوانەکردە چاوت دێشێت کە ڕووبەندت پێدا کێشاوە و داتپۆشیوە؟

٣- واتش: وتی. بێ ڕام: بێ ڕەحم، دەتوانێ بە مانای «کێوی و دەستەمۆنەکراو»یش بێت هەروا دەتوانێ کورت کراوەی «بێ ئارام» بێت یانی ئەو کەسەی کە ئارام و قەراری نییە. هوونیەن: خوێناوییە، قاتڵە، بکوژە. دەردین: دەردەدار. ڕاویار: ڕێبوار. واتە: ئەگەر دەبینی ڕووبەندم هێناوە بە مل دیدەمدا لەبەر ئەوەیە کە چاوم خوێنڕێژە و ڕێبوار و دەردەدار دەپێکێت و دەیانکوژێت.

٤- دەییار: کەسێک، دەتوانێت دیاریش بێت بە مانای شوێن و جێگە. نمازۆ: ناهێڵێت. جە: لە. ئەر: ئەگەر. هەردەجاران: وێنەی پێشوو، وەکوو جاران. واتە: ئەگەر ڕووبەندەکەم لابەم و چاوم وێنەی پێشوو ئازاد بێت و پێشی پێ نەگرم هیچ ڕێبوارێک دەرناکات و هەمووی دەکوژێت.

منـــیچ جـــەو بۆنـــە مەحبووســـم کـــەردەن
هوونـــان ناحـــەق نـــەیـــۆم وە گـــەردەن[١]

ســـا زانـــام تـــاقی حـــەقش بـــە دەســـتەن
ڕاویـــار کوشـــەن، ئەنقەســـش بەســـتەن[٢]

❋❋❋

-٥-[٣]

ئـــارۆ دیـــم بـــە دەســـت شـــیرین ئـــەنـــدامێ
ســـاوای تـــەن تـــەڕاو، تووڵـــەنـــەمامێ[٤]

---

١- منیچ: منیش. جەو بۆنە: بەو بۆنەوە. مەحبووس: زیندانی، بەندی. کەردەن: کردووە. هوونان: کۆی خوێن. نەیۆ: نەیەت. واتە: منیش لەبەر ئەوە زیندانم کردووە و دامپۆشیوە تا خوێنی ناحەقم نەیەتە مل.

٢- زانام: زانیم، تێگەیشتم. تاقی: بەڕاستی، بە تەحقیق. ڕاویار کوشەن: ڕێبوار کوژە. واتە: ئینجا زانیم کە بەڕاستی حەقی بە دەستە و چاوەکانی ڕێبوار کوژن و بە ئەنقەسەت دایپۆشیوە.

-٥-

٣- ح، س، ب، ن، ک، ئێ، م.

٤- ئارۆ: ئەمڕۆ، ئیمڕۆ. ساوا: تازە پێگەیشتوو. تەن: جەستە، بەدەن. تەڕاو: تەڕ، ئاودار. واتە: ئەمڕۆ تووڵەنەمامێکم بینی کە بە دەستی شیرین ئەندامێکی تازە پێگەیشتووەوە بوو. لە سەرچاوەکانی «ب»، «ح»، «س» و «ن»دا ئەم بەیتە بەم جۆرە هاتووە:

ئـارۆ دیـم بـە چـەم نـازک ئەنـدامێ ســاوای تـەن تـەڕاو، تووڵەنـەمامێ

و بە دوایدا ئەم دوو بەیتە هاتووە:

گـــا بـــە دیـــدەی نـــاز مـــەڎیا پێشـــەڎا
گـــا مـــە گێرت بـــە بـــەژن بـــاڵای وێشـــەڎا [١]

ئەوســـە لـــێش مـــەڎیا بـــە نـــاز چـــەمان
چەفت مەبی جـە تـاو مـوژەش، چـوون کـەمان [٢]

وەختـــێ مـــەکـــەردش ڕاســـت چـــەنی بـــاڵا
مەلـــەرزا و مـــەکـــەفت نـــە پـــاش مـــەناڵا [٣]

---

☞

عەرعـەر بـاڵایێ، شـای جـەمین جـامێ     زڵفـان چـوون کەمەنـد خەیاتـەی خـامێ
گرتـەبێش وە دەس تـوولێ جـە عەرعـەر     سـاوای نـازک تـەن، سـاف نازپـەروەرر

کە بە پێی مانای شێعرەکە زیادکراوە و هەروەها کە لە بەشی نوسخە خەتیەکاندا ئاماژەمـان پـێ کـرد، ئەم سەرچاوانە بۆ زۆربەی شێعرەکان یەک سەرچاوەیان هەبووە.

١- مەڎیا: دەیڕوانی. پێشەڎا: پێیدا. مەگێرت: دەگرت. بەژن: قەد و باڵا. وێشەڎا: خۆیـدا. واتـە: جارجار پێیدا دەڕوانی و جارجاریش بە قەد و باڵای خۆیدا دەگرت.

٢- ئەوسە: ئەوسا، پاشان. لێش مەڎیا: لێی دەڕوانی. چەمان: کۆی چاو، چـاوان. چـەفت: چـەوت، لار. مەبی: دەبوو. جە: لە. موژە: برژانگ، مژۆڵ. چوون: وێنەی، وەک. واتە: دوای ئەوەی بـە نـازی چاوانی پێیدا دەڕوانی ناسکە نمامەکە لە تاوی برژانگەکانی لار دەبوو و وەک کەوانی لێ دەهات.

٣- مەکەردش: دەیکرد. چەنی: لەگەڵ. مەلەرزا: دەلەرزی. مەکـەفت: دەکـەوت. مـەناڵا: دەنـاڵی، دەیناڵاند. واتە: کاتێ ڕاستی دەکردەوە و بە باڵای خۆیدا دەگرت ناسکە نمامەکە دەلەرزی و لە دەسـتی دەکەوتە خوارەوە بۆ ژێر پێی و دەیناڵاند.

یـــانێ جـــه هـــەر کـــۆ نـــەمام بـــاخ بـــۆ
یـــا ئـــەو بـــە بـــاڵای وێـــش بـــە دەمـــاخ بـــۆ[١]

هـــەنیچ بـــە بـــاڵای وێشـــان نـــەنازان
ئـــاوات وە ســـایەی بـــاڵاش بـــوازان[٢]

***

-٦[٣]-

ئـــارۆ دیـــم خـــەزان دوور جـــە پـــای نـــەمام
زایـــف و زەبـــوون هێجـــران ســـەرئەنجام[٤]

---

١- جه هەر کۆ: لە هەر کوێ. دەماخ: خۆشحاڵ شادمان. بۆ: بێ، بێت، هەبێت. مانـای ئـەم بەیتـە بەستراوە بە بەیتی دواییەوە.

٢- هەنی: ئیتر. وێشان: خۆیان. نەنازان: نەنازن، ناز نەکەن. باڵاش: باڵای. بـوازان: بخـوازن. واتـە: ئەوە یانی لە هەرکوێدا نمامێکی باخ هەبێت کە لەبەر بەرزی و ڕێـک و ڕاسـتی بـاڵای بـە خۆیانـدا دەنازنن و خۆشحاڵن، ئیتر بە خۆیاندا نـەنازن و دەبێـت ئـاوات بـە سـایە و سـێبەری ئـەو بخـوازن. مەبەستی ئەوەیە کە یارەکەی لە هەموو ئەو نمامانە ڕێک و پێکترە.

-٦-

٣- ح، ئێ، ن، س، ک، ب، ئا، م عم، مج.

٤- ئارۆ: ئەمڕۆ، ئیمڕۆ. زایف: زەعیف، لاواز، ڕەنـگ زەرد، بـێ گریـک. زەبـوون: بێچـارە. هێجـران: دووری. سەرئەنجام: عاقیبەت. واتە: ئەمڕۆ گەڵایەکم بینـی داکـەوتبوو و لـە پـای نمامەکـە دوور کەوتبوەوە و بێ گریک و بێچارە بوو و ئاخر و عاقیبەتی ببوو بە دووری و دوورکەوتنەوە لـە یـار (لـە نمامەکە). بێسارانی لەبەر ئەوە کە گەڵاکە لە نمامەکە یانی ئەسڵ و بنەڕەتەکـەی دوور کەوتوەتـەوە پێی دەڵێت: «هێجران سەرئەنجام» یانی کەسێک کە ئاخر و عاقیبەتی دووری یارە.

ئــــەویچ بـــــە جەســـــتەم مــــەناڵا بـــــە زار
بـــە جـــەفای هێجـــران مـــەکـــەردش ئێقـــرار[١]

پەرســـــام هـــــەی زەدەی گـــــەردوون بـــێ ڕام
زێنـــدەی سەرەشـــووم دوور جـــە پـــای نـــەمام[٢]

یـــە چ بەدبـــەختین پێســـە پێـــت ئامـــان؟
مـــەر جـــە خـــاو وینـــی بـــاڵای نـــەمامان[٣]

واتـــش هـــەی هـــام دەرد، دەروون پـــەڕ جـــە خـــار
سەرگەشـــــتەی هێجـــــران، زەدەی ڕۆزگـــــار[٤]

---

١- ئەویچ: ئەویش. مەناڵا: دەیناڵاند. مەکەردش: دەیکـرد. ئێقـرار: دان نـان بـە ڕاسـتیدا، وتنـی ڕاستی. واتە: ئەویش (گەڵاکە) بە کزێکەوە بۆ من دەگریـا و ناڵـەی دەهـات، بـەو ناڵـەوە دانـی بـە سەختی و مەینەتی دووری یاردا دەنا.

٢- پەرسام: پرسیم. زەدەی: پێکراوی. بێڕام: بێ ڕەحم. زێندە: زیندوو. سەرەشووم: نەگبەت. واتـە: لێم پرسی و وتم ئەی کە بە تیری گەردوونی بێ ڕەحم پێکراوی، زیندووی بەدبەختی و دوورکەوتوو لە یار. پرسیارەکەی لە بەیتی دوایی‌دا ئەڵێت.

٣- یە: ئەمە. پێسە: بەم شێوە. ئامان: هاتووە. مەر: مەگەر. خـاو: خـەو. وینـی: ببینـی. واتـە: ئەمە چ بەدبەختییەکە کە وەهات بە سەر هاتووە، مەگەر لە خەودا باڵای نمامان ببینی؟

٤- واتش: وتی. پەڕ: پڕ. خار: دڕوو، دڕک. سەرگەشتە: سەر لێ شێواو. واتە: وڵامی دایەوە و وتی ئەی هاودەردەکەم و ئەی سەر لێ شێواوی دووری یار و ئەی پێکراوی ڕۆژگار. درێژەی وڵامەکـەی لـە بەیتی دوایی‌دایە.

یــە هێجــران کــەردەن جــە دیــدە کــوٚر بــام
نـــە تـــەرز مـــەوینوو، نـــە بـــاڵای نـــەمام[١]

ئـــەو جـــە نـــاڵینش ســـتاران ڕێـــزا
مـــن جـــاه ســـەردم قیامـــەت خێـــزا[٢]

☆☆☆

---

١- کەردەن: کردووە. جە دیدە کوٚر بام: لێڵاییم دابێت، کوێر بم. تـەرز: خـەڵف. مـەوینوو: دەبیـنم. واتە: گەڵاکە وتی ئەمە دووری پێمی کردووە - یاخوا لێڵاییم دابێت - کـە ئێسـتە نـە خـەڵفی نمـام دەبینم و نە باڵای.

٢- ستاران: کوٚی ستارە، ئەستێرەکان. من جاه سەردم: لە ئاهی سەردی من (جاه = جە ئاه، لە ئاه). ڕێزا: داکەوت، ڕژا. خێزا: هەستا. واتە: بە گریان وناڵەی ئەو ئەستێرەکان کەوتنە خوارەوە و لە ئاهی سەردی من قیامەت هەستا. ئەم بەیتە لە دیوانە چاپ کراوەکاندا نییە بەڵام لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا هەیە و دروستیشە چوون مانای شێعرەکە تەواو دەکات. لە دیوانە چاپ کراوەکانـدا(«ح» و «ب») شێعرێک هەیە بە ناوی بێسارانییەوە لە قەڵەم دراوە، بەڵام لە نوسخەی «ک»دا پاش ئـەم شێعرە هاتووە و لەسەری نووسراوە «محمد قلی سلیمان» و هەر وەها لە نوسخەی «ئێ»شـدا دوای ئەم شێعرە هاتووە و لەسـەری نووسراوە «سلیمان در ردیـف». کـاک ئـەنوەری سـوڵتانی کـە لەسـەر نوسـخەی «ک» کـاری کـردووە لـە پێشـەکیەکەیدا نووسـیویە «مـەکێنزی» و « مینوٚرسـکی» و «مێجرسوٚن»یش کە لەسەر ئەم نوسخە کاریان کردووە، بە شـێعری بێسـارانیان نـەزانیوە و تەنانـەت مێجرسوٚن بە ناوی «محمد قلی سلیمان»ـەوە وەری گێڕاوەتە سەر ئینگلیزی. وا دیارە «محمد قلـی سلیمان» لە وڵامی ئەم شێعرە پاییزیەی بێسارانیدا هوٚنیویەتەوە کە ئێمەیش وەک لـە نوسـخەکاندا هەیە و هەندێ جیاوازی لەگەڵ دیوانە چاپ کراوەکاندا هەیە، دەینووسینەوە:

ئــاروٚ شــیان دیــم ڕەنــگ خــەزانان    هاڵیشـــان بیـــەن ئێمـــە نـــەزانان

☜

-٧-[1]

ئــــارۆ ڕایــــێم کــــەوت مــــن بــــە چەمەنــــدا
دیم بوڵبـوڵ جـە سـەحن باغچـەی گوڵشـەندا[2]

مــــەدۆ بــــە ســــەردا ئــــەو بــــە ئەنــــدووی دڵ
مــــاچۆ کــــۆن ڕەونــــەق بــــازار بوڵبــــوڵ؟[3]

جـە جەسـتەی پەشـێو ئـەو پەشـێو جەسـتە
منـیچ جـە هێجـران خەسـتە بـیم خەسـتە[4]

---

☞

| | |
|---|---|
| دیــم بــە تــەرزەوە خــەزانێ بــە تــەرز | تــەمام هــاڵ وێــش پــەرێ کــەردان عــەرز |
| پەرسـام یـە چێشـەن هـای زەردی خـەزان | وات مــەیۆم نــە خــاو جیــایی تــەرزان |
| واتــم ئێمــە و تــۆ هــەر دوو جەسـتەمان | زام یــەک گــازەن مــاران گەســتەمان |
| تــۆ جیـا جـە تـەرز، مـن جـە بـاڵایێ | تەڕتــەر جــە نــەرگێس ســەرەواڵایێ |
| داخ جیــــایی نــــەوتووڵ نــــەمامان | تــۆ نــە خــاوت دی مــن پەنــەم ئامــان |

-٧-

١- ح، ک

٢- ئارۆ: ئـەمڕۆ. ڕایـێم: ڕێگـەیـەکم. سـەحن: حەوشـە. واتـە: ئـەمڕۆ ڕێگـەم کەوتـە چیمـەن و سەوزەڵانێک و بولبولێکم بینی وا لە نێو سەوزەڵانی و باغچەی گوڵاڵاندا.

٣- مەدۆ: دەدا. ئەندوو: خەفەت، پەژارە. ماچۆ: دەڵێت. کۆن: لە کوێیە، کوا. واتە: بولبولەکە دڵـی پڕ بوو لە خەفەت و پەژارە و دەیدا بە سەری خۆیدا و دەیکوت لە کوێیـە و چـی لـێ هـات گـەرمی بازارم. (گەرمی بازارم کوا؟ «وەرگێڕ»).

٤- جەستە: لاشە، لێرەدا مەبەست بارودۆخە. خەستە: ماندوو، هیلاک، دەتوانێت بە مانای ☜

دەردی دووری یـــــار وەنـــــەم دێویـــــا
شـــادیم جـــە شـــیوەن بولْبـــولْ شـــێویا[١]

ئەســـــرینان ســـــەردان جـــــە دەروونـــــەوە
مـــەردوم دام بـــە دەم دەریـــای هوونـــەوە[٢]

✿✿✿

## ٨[٣]

ئـــارۆ وێنـــەی وێـــم دیـــم خـــەزانێو زار
بەنـد بـێ بـە زامـەت جـەور و جـەفای خـار[٤]

---

برینداریش بێت. واتە: کە حاڵی پەشێوی ئەو بولبولم بینی منیش لەبەر دەردی دووری، بریندار بووم. (دەردی دووری یارم بیر هاتەوە).

١- وەنەم: لە من، لێم. وەنەم دێویا: هێرشی کرد بە سەرما. شێویا: شێوا. واتە: کاتێک حاڵی ئەو بولبولەم بینی منیش دەردی دووری یارم هاتەوە بیر و دیاریدا لە ڕووم و شیوەنی بولبولەکە شادی و خۆشی منیشی تێکدا.

٢- ئەسرینان: فرمێسکان. سەردان: هەستان، کەلاویان کرد. مەردوم: گلێنە، بیلبیلەی چاو. هوون: خوێن. واتە: فرمێسک لە دەروونمەوە کەلاوی کرد و چونکە لە دەروونمەوە هەستا ئاوێتەی خوێن ببوو و هاتە نێو چاوانم و منیش گلێنەی چاوانم دا بە دەم دەریای خوێنەوە. مەبەستی ئەویە فرمێسکی خوێنم دەڕژاند. نیوە بەیتی دووهەمی ئەم بەیتە لە سەرچاوەی «ح»دا بەم جۆرەیە: «موژەم دان بە دام دەریای هوونەوە».

-٨-

٣- ن، ک، نێ، س، ح، ب، ئا، ڕ، مج.

٤- ئارۆ: ئەمڕۆ، ئیمڕۆ. وێنەی وێم: وێنەی خۆم، وەک خۆم. خەزانێو زار: گەڵایەکی زەرد و

ئـــەو جـــە دەرد وێـــش بـــێ مـــدارا بـــێ
خـــار، چنـــگ زامـــەت لـــێش ویـــارا بـــێ[١]

بـــــە زارزارەوە هـــــەر وێـــــش مەشـــــانا
جـــە زامـــەت خـــار دووریـــش مـــەنمانا[٢]

خـــار شـــەرمش نـــەکـــەرد جـــە ڕەنـــگ زەردش
تـــا بـــە جـــەفا و جـــەور ســـەد پـــارە کـــەردش[٣]

---

☜ پترووکاو. بێ: بوو. زامەت: زام، زەخم، ئێش و دەرد. خار: دڕوو، دڕک. واتە: ئەمڕۆ گەڵایـەکی زەردم بینی کە ئەویش وێنەی من بێ تین و هێز و گیرۆدەی زام و ڕەنج و جەفای دڕوو بوو.

١- وێش: خۆی. مدارا: ئارام گرتوو، هێمن. لێش: تێی، تێیدا. لێش ویارا بێ: تێیچەقاندبوو. واتە: ئەویش لەبەر دەردی خۆی ئارام و قەراری نەبوو و دڕوو خۆی پێیدا چەقاندبوو و ببـوە هـۆی ئـێش و ئازاری. لە نوسخەی «ک»دا بە جێی «دەرد وێش»، «بێ دەردیش» نووسراوە کە ئەگەر وابێت دەبێ ئاوەها مانا بکرێتەوە: «لەبەر ئەوەی بێ دەرد بوو، ئارام و قەراری نەبوو و هەر لەبەر ئەوەیش دڕووی خۆی پێیدا چەقاندبوو.» لە نوسخەی «ئێ»یشدا نووسراووە: «جە پەی دەردش» کە ماناکـەی هـەر دەبێتە «لەبەر دەردی خۆی».

٢- مەشانا: ئەشەکاندەوە. مەنمانا: دەنواند. واتە: بە بێ تینی و لاوازی هـەر خـۆی دەشـەکاندەوە و وەهای دەنواند کە بە نیازە لە ئێش و ئازاری دڕوەکە خۆی دوور بخاتەوە. مەبەستی ئەوەیە بە هیوایـە بە خۆشەکاندنەوە خۆی لە دەست دڕوەکە ڕزگار بکات.

٣- خار: دڕوو، دڕک. شەرمش نەکەرد: شەرمی نەکرد، خەجاڵەتی نەکێشا. واتە: دڕوەکە شەرمی لە ڕەنگ زەردی گەڵاکە نەکرد و بە جەفا و جەور کردی بە سەد پارچەوە. مەبەستی ئەوەیە هەرچی خۆی دەشەکاندەوە زیاتر پارچە پارچە دەبوو.

فــــەرزەن جـــە هـــەر كـــۆ دەردەدارێـــو بـــۆ
زەدەی زام ســــەخت نـــێش خـــارێو بـــۆ[١]

ئـــەویچ چـــوون جەســـتەی مـــن دەردەدار بـــۆ
یـــا بـــەی تـــەور زەدەی زامـــەت خـــار بـــۆ[٢]

-٩[٣]-

ئافتـــاب پێـــوار بـــی، ئافتـــاب پێـــوار بـــی
وەختـــێ جـــە مـــەغرێب ئافتـــاب پێـــوار بـــی[٤]

---

١- فەرزەن: پێویستە. جە هەر كۆ: لە هەر كوێ. دەردەدارێو: دەردەدارێک. بۆ: هەبێت، ببێت. زەدە: پێكراو. نێش: نـووكی تیـژ. خـارێو: دڕوویـەک، دڕكێـک. واتـە: پێویسـتە لـە هـەر جێگەیـەک دەردەدارێک ببێت كە پێكراوی زامی سەختی دڕوو بێت. مانای وتەكەی لە بـەیتی دوایـیدا تـەواو دەكات.

٢- ئەویچ: ئەویش. چوون: بە وێنەی، وەكوو. جەستە: لاشە، بەدەن، ئازای ئـەنام. بـەی تـەور: بـەم جۆرە. زامەت: زام، ئێش و ئازار. خار: دڕوو، دڕک. واتە: پێویستە ئەو دەردەداریشە وێنەی لاشـەی من دەردەدار بێت، یا وێنەی ئەم گەلا، پێكراوی ئێش و ئازار بێت.

-٩-

٣- ح، ب، ک، س، ن، ئێ، ڕ.

٤- ئافتاب: هەتاو، خۆر. پێوار: ون، گوم،گم. مەغرێب: خۆرنشین، ڕۆژاوا، خۆراوا. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایـیدا دێت.

جەمینش جە بورج تەشاب دیار بی
پەیوەستکەر وەخت سەبا و ئێوار بی [١]

بە نوور جەمین شەوقئارای تەمام
یاونا بە یەک وەخت سوبح و شام [٢]

پرشنگ نوورش پەی پەی مەشانا
من دەرسات نە ڕووش لافەتام وانا [٣]

---

١- جەمین: نێوچاوان، ڕوومەت. بورج: جێگایەکی بەرزە کە ئەستێرەی لێوە دیاری دەدا. تەشاب: دەلاقە، پەنجەرە، ڕۆچن. پەیوەستکەر: پەیوەندەر، هەر شتێک دوو شت بە یەکەوە پەیوەند بدات. سەبا: بەیان، بەیانی. ئێوار: ئێوارە، تاریکان. واتە: کاتێ هەتاو بەودیودا کەوت و لە خۆراوادا نیشت ڕوومەتی لە دەلاقەوە دەرکەوت (کاتێ ڕۆژ ئاوا دەبێت، مانگ هەڵدێت. بەڵام بێسارانی ڕوومەتی یاری شوبهاندووە بە هەتاو و ئەو دەلاقەی کە ڕوومەتی لێوە دیارە، شوبهاندوویە بە بورجێک کە هەتاوی تێدا هەڵدێت و ئەڵێت کاتێ هەتاو لە ڕۆژاواوە ئاوا بوو دیسان لە دەلاقەوە هەتاوێکی دیکە هەڵدێت). و ئێوارەی پەیوەند دا بە بەیانییەوە. مەبەستی ئەوەیە ڕوومەتی وێنەی هەتاوە و هەر چەن هەتاو ئاوا بووە و ئێوارەیە بەڵام کاتێ ڕوومەتی لە دەلاقەوە دەرکەوت وەک ئەوە بوو دیسان هەتاو هەڵبێت و چیتر شەو نەما و دیسان ڕۆژ بوەوە و ئێوارەی پەیوەند دا بە بەیانەوە.

٢- شەوقئارا: ڕۆشن کەرەوە. یاونا: گەیاندی. واتە: بە نووری ڕوومەتی کە ڕۆشن کەرەوەیەکی تەواو بوو بە وێنەی هەتاو، وڵاتی ڕۆشن کردەوە و چیتر شەو نەما و کاتی ئێوارە و بەیانی بە یەک گەیاند.

٣- پرشنگ: تیرێژ، تیشکی هەتاو، تیشک. پەی پەی: بە دوای یەکدا، بێ وچان. دەرسات: گورج، بێ ماتڵی، بێ کات بە فێرۆدان. مەشانا: دەهاویشت. لافەتا: هیچ کوڕێکی لاو نییە، ئاماژەیە بە ئەم حەدیسە کە بۆ حەزرەتی عەلی وتراوە: «لافَتی اِلاّ عَلیِّ وَلا سَیفَ اِلاّ ذُوالفَقار» یانی «هیچ لاوێک نییە مەگەر عەلی و هیچ شمشێرێک نییە مەگەر زولفەقار». واتە: کاتێک ڕوومەتی وەک ☜

سـپەردم بـە نـوور بارگـەی ئیمامـان
چەندێ نووربەخش بۆ پەی سەحەر شامان[1]

***

-۱۰-[2]

ئامـا و شـیانێ، ئامـا و شـیانێ
چەنـد ڕا بـە بێـڕا، ئامـا و شـیانی[3]

تـا کـەوتا نـە وەنـد نـاواک نیـانێ
نیـانش کـەردان بـە یـەک دیـانێ[4]

---

☞ هەتاو دەرکەوت، بێ وچان تیشکی دەهاویشت و منیش چاوم پێ کەوت و بێ ماتڵ بوون «لافەتام» بۆ خوێند و وتم هیچ کەسێک وێنەی ئەو نییە. لە نوسخەی «ئێ»دا بە جێی «لافەتا»، «لاحەول» نووسراوە.

۱- سپەردم: سپاردم. بارگە: شوێنێک کە گۆڕی گەورەی دینی تێدایە. واتە: سپاردم بە نووری بارگەی ئیمامان تا ئەوان ئاگاداری بن زیاتر بمێنێت بۆ ئێوارە و بەیانی بە یەک گیاندن.

-۱۰-

۲- ک، ئێ، ح.

۳- ئاما و شیانێ: هاتم و ڕۆیشتم. چەند ڕا: چەند جار، چەند کەڕەت. بە بێڕا: لە گۆترە، بێ ئامانج. واتە: چەند کەڕەت بێ ئامانج و ئاوات هاتم و ڕۆیشتم.

٤- ناواک: تیر، لێرەدا مەبەست برژانگە. نیان: نەهان، شاراوە، نادیار، نەبینراو. دیان: بینراو، دیتراو. وەند: نزیک. واتە: تا کەوتمە بەر چاوی کەسێک کە تیری شاراوەیە و دیار نییە و بەو چاو پێ کەوتنە و لەبەر چاو بوونە، نادیاری کردم و لە ناوی بردم.

سـەگەوند بـە زامـەت سـینە چـاک چاکـان
فــــریم ئـــــاوردەن زام ناواکـــــان[١]

بــەی تــەور جــەی نێگــای نیــان کێشــانم
هــیچ نــاواک نــەدان جــەفای ئێشــانم[٢]

✯✯✯

-١١-[٣]

ئــاهووی خوتــەنخێــز، دیــدە پەڕخــەتا
تاریــای ڕەوێــڵ، نافــەی موشــک مــەتا[٤]

---

١- سەوگەند: قەسەم، سوێند. زامەت: زام، ئێش و ئازار. چاک چاک: لـەت لـەت، کـوت کـوت. فریم: زۆرم. ئاوردەن: هاوردووە. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٢- بەی تەور: بەم شێوە، بەم جۆرە. جەی: لە ئەم، لەم. واتە: قەسەم بە ئێش و ئازاری ئەوانـەی کـە سینەیان بریندار و لەت لەتە، تـا ئێسـتا بـەم تیرانـە زۆر پێکـراوم بـەڵام ئـەو ئێشـە کـە بـەم تیـرە نەبینراوانە پێم گەییوە تا ئێستا لە هیچ تیرێکم نەکێشاوە.

-١١-

٣- ک، ئێ، ح.

٤- ئاهوو: ئاسک. خوتەن: ناوی ناوچەیەکە لە تورکستان کە ئاسکی ئەو ناوچەیـە لـەلای ناوکیانـەوە کیسەیەکی بچووک هەیە ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆشی بە ناوی موشک تێدایـە. خـەتا: هەڵـە، ناڕاست، ناوی شارێکی تورکستانە کە ئەویش ئەو ئاسکەی هەیە کە «موشک»ی هەیە. تاریا: جیـا بووەوە، لە گەڵ جێماو، کاتێک حەیوانێک لە گەلەڕانەکەی جیا دەبێتەوە دەڵـێن تاریـاوە یـا تـەریک بووەتەوە. ڕەوێڵ: سەرکەش، سرک، دەستەمۆ نەکراو، بە مانای دەستە و تاقمیش دێت. نافە: لێـرەدا مەبەست ئەو کیسە بچووکەیە کە موشکی تێدایە. موشک: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆش ☜

وەختێـــو نیمەشـــەو خـــاو مـــەبۆ نـــەزداو
تمـــەز دیـــدەی وێـــش مـــەوینۆ نـــە خـــاو[١]

مـــوژانش هـــەر یـــەک چـــوون خـــەدەنگ وەی
نیـــان نـــە چللـــەی کـــەمان پـــەڕ پـــەی[٢]

جـــە ســـام مـــوژەی وێـــش بێـــدار مـــەبۆ
دەرســـات بـــێ پـــەروا جـــە ڕەم تـــار مـــەبۆ[٣]

---

☜ که لە پەنا ناوکی ئاسکدایە. مەتا: کاڵا، شت و مەک، کەل و پەل. واتە: ئاسکێک کە لە ناوچەی خوتەنەوە هاتووە و چاو پڕ ئەفسوون و جادوو و دەستەمۆ نەکراوە و تەریک لە هەواڵانیە و کاڵایشی کیسەی موشکی بۆنخۆشە. لە بەیتی دواییدا دەردەکەوێ بۆچی دەڵێ «دیدە پەرخەتا».

١- خاو: خەو. مەبۆ: دەبێت، ئەبێت. نەزداو: نزیک. تمەز: تۆ مەڵێ. وێش: خۆی. مەوینۆ: دەبینێت. نە: لە(فارسی: دَر). واتە: کاتێک نیمەشەو خەوی لێ دەکەوێت، تۆ مەڵێ چاوی خۆی لە خەودا دەبینێت. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «وەختێو»، «وەقت» و بە جێی «خاو مەبۆ نەزداو»، «خاو مەیۆ نەزد ئەو» نووسراوە.

٢- چوون: وێنەی، وەک. خەدەنگ: تیر، لە بنەڕەتدا خەدەنگ ناوی دارێکە کە لەبەر پتەو و هێقم بوونی تیری لێ دروست دەکەن. وەی: ئازار، بەڵا، خەم؛ وەی لە هەورامیدا مانای زۆری هەیە وەک: ساحیب و بەڵا و... لێرەدا بە مانای ئازار و بەڵایە، بۆ ئەوەی بە کەسێک بڵێن خەم و پەرۆشیت لێ دوور بێت ئەڵێن: «بێ وەی بی». چللە: ڕێخۆڵەی بادراو کە ئەم سەر و ئەو سەری کەمانی پێ دەبەستن. پەی: بڕین. واتە: برژانگەکانی کە وەک تیرن و دەتوانن ئازار بە کەسێک بگەیەنن و نراونەتە ژێی کەمانێ کە دەتوانێ تا ئەو پەڕ ببڕێت و تەی بکات، ئامادەی هاویشتنن. دیارە مەبەستی لە کەمان برۆی یارە کە وەک کەمان وایە. ئەم بەیتە لە سەرچاوەی «ح»دا نییە.

٣- جە: لە. سام: هەیبەت. وێش: خۆی. مەبۆ: دەبێت. دەرسات: بێ ماتڵ بوون، بێ وچان. ☜

مـــەگوریزۆ جـــە مولـــک زامـــن خوتـــەن
مـــەیۆ کـــۆ بـــە کـــۆ وەتـــەن بـــە وەتـــەن[١]

پـــــای تیزدەوانـــــی نمەکـــــەرۆ کـــــەم
تـــا زێـــد هـــەبڵی مـــەوینۆ بـــە چـــەم[٢]

هـەبڵی چێش؟ تـافێو چـوون ئـەو خـاتر شـاد
جـــە وەشـــی دەوران، ســـاف ســـەرئازاد[٣]

---

بێ پەروا: بێ ترس و خۆف. ڕەم: ڕان، گەلەڕان، دەستە، تاقم. واتە: لـە هەیبـەتی برژانگـەکانی خۆی بە ئاگا دێتەوە و بێ وچان و بێ ترس لە تاقمەکەی جودا و تەریک دەبێت.

١- مەگوریزۆ: هەڵدێت. مولک: وڵات. زامن: نیشتمان، جێگەی نیشتەجێ بوون و ژیان، جێگـەی لە دایک بوون. مەیۆ: دێت. واتە: بە خێرایی لە وڵاتی خوتەن کە وڵاتی خۆیەتی کۆ بـە کـۆ و وڵات بە وڵات دێت بە ڕێوە. ئەم بەیتە لە سەرچاوەی «ح»دا نییە.

٢- تیزدەوانی: بە توند و تیژی ڕۆیشـتن. نمەکـەرۆ: ناکـات. زێـد: وەتـەن، شـوێنی ژیـان. هـەبڵی: سەیرانگا و سەرئاوێکی خۆشی شاری پاوەیە. مەوینۆ: دەبینێت. چەم: چـاو. واتـە: هـیچ لـە تونـد ڕۆیشتنی کەم ناکاتەوە تا دێت و سەراوی هەوڵی بە چاو دەبینێت کە شوێنێکی خۆشە بۆ ژیان.

٣- وەشی: خۆشی. تاف: تاڤگە، ئابشار، ئاوشار، قەڵوەزە. سەرئازاد: سـەربەرز. واتـە: دەسـا هـەوڵی چی؟ تاڤگەیەکە ئەویش وەک ئەم سەرخۆش و دڵشاد، لە خۆشـی ڕۆژگـار سـاف و سـەربەرزە. لـە نوسخەی «ک»دا نیوەبەیتی هەوەڵی ئەم بەیتە بەم جۆرەیە: «هەبڵی چێش تافێو خاتر مەبۆ شاد» و لە سەرچاوەی «ح»دا بەم جۆرە: «بەڵێ چێش مەبۆ، ڕەوان خاتر شاد»!

ئـــەخیاوان پـــەڕگوڵ، چێقـــەی بولْبـــولاّن
دایێـــرەی زەنجیـــر زلْـــف ســـونبولاّن[١]

مـــەبۆ بـــە پابەنـــد ئـــی خوتـــەنخێـــزە
ئـــی ئـــاهووی ڕەوێـــلْ موشـــک نـــاف بێـــزە[٢]

بـــۆی خوتـــەن نیـــان بـــە ئـــی تافـــەوە
تـــاف پێچیـــان بـــە بـــۆی موشـــک نافـــەوە[٣]

---

١- ئەخیاوان: شەقام، خیابان، چیمەن وسەوزەلانیەک ڕێگەیەک بە نێویدا تێپەڕێت. چێقە: قیـژە، دەنگی بـەرز و زیـق. زلْـف: زولْـف، پـرچ، قـژ. سـونبول: نـاوی گوڵێکـە. واتـە: لـە «هـەولی»دا سەوزەلانیەکان پڕ بوون لـە گـولاو و دەنگـی خوێنـدنی بولبـولان و ئەوانـەی زولْفیـان وەک سـونبول حەلقەی دابوو و گردەوارییان دروست کردبوو. لە «ح»دا بە جێی «چێقە»، «نالە» نووسراوە.

٢- مەبۆ: دەبێ. پابەند: ئەسیر. خێز: هەستاو. ئی: ئـەم. ڕەوێـلْ: سـەرکەش، سـرک، دەسـتەمۆ نەکراو. موشک ناف بێز: بۆیەک کە ئەگەر ئەوت بێت بە لووتا لـە بـۆی موشـکیش بێـزار دەبـی. واتە: ئەو ئاسکەی کە پێشتر دەستەمۆ نەکراوە و ئەگەر بۆی ئەوت بێت بە لووتدا لە بـۆی موشـک بێزار دەبیت، کە دێتە هەولی و چاوی بەو گوڵ و گوڵزارە دەکەوێت ئەسیر دەبێت و دەمێنێتەوە.

٣- نیان: ناوە. پێچیان: لوولی خواردووە. واتە: بۆی موشـکی خوتـەنی نـاوە بـە ئـاوی تاڤگەکـەوە و ئەویش ئاوێتەی بۆنی موشکەکە بووە. دەشکرێت بلْێین: تاڤگەکەیش ئاوێتەی بۆی موشکەکە بووە و بە پێچ خواردن دەڕوات بە ڕێوە. لە نوسخەی «ک» و «ئێ»دا بە جێی «بە بـۆی» نووسـراوە «جـە گەرد».

ئیسە کەردەنش بە زێد و ماوا
ئاوا بۆ شەڵڵا پێش بیەن ئاوا[١]

یا شا بەشق خەیر خاتر ئازادان
نەوزینەش نە دام ناشی سەیادان[٢]

***

-١٢-[٣]

ئەجەڵ! داوم بۆ، ئەجەڵ! داوم بۆ
تاکەی چەنی خەم دەوران داوم بۆ[٤]

---

١- کەردەنش: کردوویە. شەڵڵا: ئیشەڵڵا. واتە: ئێستە هەوڵی کردووە بە مەسکەنی خۆی و ئیشەڵڵا هەر ئاوەدان بێت کە بە هاتنی ئەو ئاوەدان بوەوە.

٢- یاشا: ئەی خودا. بەشق: بە ئەشقی، بە خاتری. نەوزینەش: نەیخەیتە. واتە: ئەی خودایە بیکە بە خاتری ئەوانەی دڵ و دەروونیان پاکە و لای تۆ سەربەرزن ئەو ئاسکە نەخەیتە داوی ڕاوکەرانی نەزان و ناشی. وەها دیارە بێسارانی باسی کیژێکی جوان دەکات کە لە شوێنێکی دیکەوە هاتووە بۆ پاوە و لەوێ ماوەتەوە.

-١٢-

٣- ح، ک، ن، س، ر، ب

٤- بۆ: بێت، ببێت. چەنی: لەگەڵ. داو: دەستەوئاژەیەکی کایەی تەختە نەردە بە مانای نۆبەتی کایە، بە واتای حەریف بۆ شەڕیش دێت.

اهل نظر دو عالم در یک نظر ببازند — عشق است و داو اول بر نقد جان توان زد

«حافظ شیرازی»

واتە: ئەی ئەجەل! تاکەی دەبێت من لەگەڵ خەم و خەفەتی ڕۆژگار نۆبەتی کایەم بێت (خەمی

تاکـــەی بـــە بـــێ یـــار شـــیرین خـــاوم بـــۆ؟
ســـا بـــۆ پـــات وە بـــان هـــەر دوو چـــاوم بـــۆ[١]

ئەرســـــەد پـــــەژاران گیـــــانم مـــــەســـــتانان
وەس نیـــــەن، بـــــە نـــــام زێنـــــدەم مـــــەوانان[٢]

ســـپای غـــەم بـــەی تـــەور زۆر گێرتـــەن وەنـــەم
هـــــەر ســـــاتێ مـــــەرگێ مـــــەنمانۆ پەنـــــەم[٣]

مـەنـــــدەن نیمـــــەیێ، ئـــــەویچ هێجرانـــــان
گـــــەرەکشـــــان بـــــە زۆر چەنـــــەم بســـــتانان[٤]

---

دەوران خەباتخوازی من بێت) و چاوەڕێی ئەوە بم بزانم خەمی دەوران تاکەی گەمەم پێ دەکات؟

١- خاو: خەو. سا: دەی سا. بۆ: وەرە، بێ. واتە: ئەی ئەجەل! تاکەی دەبێت من بـە بـێ یـار بنـووم؟ دەسا وەرە پێت لەسەر هەر دوو چاوم بنێ. لێرەدا شاعێر لـە ئەجـەل دەپاڕێتـەوە کـە بێـت و گیـانی بکێشێت و ئەڵێت بەخێر بی سەر چاوانم.

٢- ئەرسەد: گەرچی، ئەگەرچی، هەرچەند. پـەژارە: خـەم و خەفـەت. مەسـتانان: دەسـتێنن. وەس نیەن: بەس نییە. زێندە: زیندوو، کەسێک کە دەژی. مەوانان: دەخوێننەوە. واتە: هەرچەنـد خـەم و خەفەت گیانم دەکێشن بەڵام ئەوە بەس نییە، چونکە بە ناو ئەڵێن زیندووە و منیش ئـاواتم مـەرگـە کەوایە من دەمەوێت تۆ گیانم بکێشیت با ئیتر بە ناویش نەڵێن زیندووە.

٣- بەی تەور: بەم شێوە، بەم جۆرە. گێرتەن: گرتووە. وەنەم: لێم. مەنمانۆ: دەنوێنێت. پەنـەم: پـێم. واتە: سپای خەم و خەفەت بە جۆرێک زۆری بۆم هێناوە کـە هـەر سـات مـەرگێکم نیشـان دەدات. مەبەستی ئەوەیە من بە دەستی خەمەوە هەر ساتێکم مەرگێکە.

٤- مەندەن: ماوە. ئەویچ: ئەویش. هێجران: دووری. گەرەکشان: دەیانەوێ، بە هیوان، هەرەکیانە.

نـــەوا بـــواچی مـــن پـــێم نـــەزانا
ئیســـە مـــەواچوو ئەجـــەڵ! هـــا هانـــا[١]

گیـــانێ کـــە بەرشـــی بـــە یـــەک دیـــانێ
جـــە کـــۆ بـــاوەروون پـــەی تـــۆیچ گیـــانێ[٢]

***

چەنەم: لێم، لە من. بستانان: بستێنن، وەربگرن. واتە: نیوەگیـانێکم مـاوە کـە ئـەویش دەردی دووری دەیانەوێ بە زۆر لێم بستێنن.

١- نەوا بواچی: نەوەک دواتر بڵێی. نەزانا: نەمزانی. مـەواچوو: دەڵـێم، ئێـژم. مانـای ئـەم بەیتـە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دایە.

٢- بەرشی: دەرچوو. دیان: بینین، دیتن. جە کۆ: لە کوێ. باوەروون: بێنم. پـەی تـۆیچ: بـۆ تـۆیش. واتە: ئەی ئەجەل! چیتر دوایی نەڵێی من بەم شتەم نەزانی ئەوە ئێستە پێت دەڵێم و هانات بۆ دێنم کە بگەی بە دادم، وەرە تا ئەو نیوە گیانەیشم کە ماوە، بیبە بۆ خۆت، چونکە کاتێکت زانی بە دیتنی یار دەربچێت و ئیتر کاتێک تۆ لەسەر وادەی خۆتدا هاتی بۆ گیان کێشانم و داوای گیانت لـێم کـرد، گیانێکی دیکە لە کوێ بێنم و تەسلیمی تۆی بکەم.

لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، « س» و «ر»دا بە دوای ئەم بەیتەدا دوو بەیتی دیکە هەیە کە وەک دیارە پەیوەندی مانایان بەم شێعرەوە نییە و بە هەڵە لێرەدا هاتووە و لـە دەستنووسـەکانی لای ئێمـە دوو بەیت لە شێعری «بە جەستەم یاران»ـە کە بۆ روون بوونەوەی باسەکە دوو بەیتەکە دێنـین و بـۆ هەڵسەنگاندنیان دەتوانن سەیری پارچە شێعری «بە جەستەم یاران» بکەن:

شـــەماڵ شـــۆ واچـــە بـــەو ئایرناکـــە        بەو دڵ سفتەی خەم سینە چاک چاکە
ئەر سەد ساڵ سۆچۆ وەندار جە شاخان        چ پـــەروا دارۆ عـەرعـــەر جـــە باخـــان

-١٣[1]-

ئـــــەرێ بینــــــاییم! ئـــــەرێ بینــــــاییم!
ئـــــەرێ خاترتــــەڕ! مایـــــەی بینــــاییم![2]

هــــــامڕاز شــــــەوان بەیـــــدی تـــــەنیاییم
ڕەفێـــــق ناڵــــەی ســـــوب ســـــەحەرگاییم[3]

گوشــــــادی خــــــاتر پەشــــێوی جەســــتەم!
ڕۆشــــــنی نووربـــــەخش! ئاواتـــــەوەســــتەم![4]

ســــــەوگەند بــــــە ڕێـــــزەی خــــاڵان ئــــاڵات
نیـــــەن زێنـــــــدەگیم نــــــەوینوو بـــــاڵات[5]

-١٣-

١- ک، ئێ، م، بر، ح.

٢- بینایی: نووری چاوان. خاترتەڕ: دڵ تەڕ، شۆخ. واتە: ئەی نووری چاوان و ئەی شۆخێک کە تۆ مایەی بینایی چاوەکانمی. لە نوسخەی «م»دا ئەم شێعرە بە «دیدەم! بینناییم» دەست پێدەکات و نیوە بەیتی دووهەمیشی بەم جۆرەیە: «شۆخ خاترتەڕ، دیدەم بیناییم». هەروەها لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «خاترتەڕ»، «خاتردار» نووسراوە.

٣- بەیدی: وشەیکی عەرەبییە بە مانای «بیابان و سارا». سوب: بەیانی. واتە: ئەی ئەو کەسەی کە هاو قسە و هاوڕازی شەوانی تەنیایی بیابان و هاوڕێی ناڵەی دەم بەیانی منی.

٤- گوشادی خاتر: مایەی فەرێحی دڵ. جەستە: لاشە، بەدەن. ئاواتەوەستە: ئاوات خوازراو. واتە: ئەی کە مایەی فەرێحی دڵم و ڕۆشنایی دەر و ئاوات خوازراوی منی.

٥- سەوگەند: قەسەم، سوێند. ڕێزە: ڕیز، ڕەدیف، قەتار. ئاڵا: پەرچەم، شتێک لە دوورەوە دیار ☜

ئومێــــدم ئێــــدەن خـــاتر پـــەڕەی گـــوڵ
حـــەرف بـــەدۆاچـــان نـــەگیری نـــە دڵ[١]

☆☆☆

-١٤-[٢]

ئەوسـا کـە تڵـف بـیم، ئەوسـا کـە تڵـف بـیم
چ خـاس وەشـیم بـێ ئەوسـا کـە تڵـف بـیم[٣]

---

☞ بێت، دەتوانێت بە واتای «نەعلا»یش بێـت یـانی نـەخت، زۆر چـاک و عـالی. نیـەن: نییـە. نەوینوو: نەبینم. واتە: سوێند بە قەتار و ڕیزی خاڵە نەختەکانت، ئەگەر باڵات نـەبینم چیتـر ژیـانم نییە و ناژیم.

١- ئومێدم ئێدەن: هیوادارم، هیوام ئەمەیە. خاتر پەڕەی گوڵ: کەسێک کە دڵی ناسـک بێـت و زوو عاجز بێت. حەرف: قسە، وتە. بەدۆاچان: خراپە بێژان. نەگیری: نەگری. واتـە: ئـەی کەسـێک کـە خاترت بە وێنەی پەڕەی گوڵ ناسکە، هیوادارم وتەی ئەوانەی کە خراپەی مـن بـە لاتـەوە ئـەڵێن بـە دڵەوە نەگری.

-١٤-

٢- ئەم پارچە شێعرە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هەیە و ناتەواوە. بە داخەوە لە هیچ کـوێی تریشـدا دەستمان نەکەوت. لە نوسخە خەتیەکەدا وەک دیارە «شێخ عەبدولموئمێن»یش جێگـە خـاڵی بـۆ داناوە تا بینووسێت بەڵام بە هەر هۆیەک بووبێت هەروا ماوەتەوە و تەواوی نەکردووە. ئێمەیش لەبەر ئەوەی زۆر لە شێعری بێسارانی دەچێت هەروا بە نیوەچڵی نووسیمانەوە تا بەڵکوو لە شوێنێکی ترەوە پارچە شێعرەکەمان بە تەواوی دەست بکەوێت. مانا و بابەتی شێعرەکە زۆر لە پارچـە شـێعری «ئـاخ پەی منـاڵی» دەچێت.

٣- تڵف: منداڵ. بیم: بووم. واتە: ئەو کات کە منداڵ بووم چ خاس و خۆشم بوو و خۆشیم دەکرد.

مـــەحرەم حەڵقـــەی کڵافـــەی کڵــف بـــیم
گوســـتاخ خەرگـــەی لەرزانـــە و زڵــف بـــیم[1]

.........................................

☆☆☆

-۱۵-[2]

ئێمشـــەو ئـــایرێم گـــڕ بەســـت نـــە دەروون
بڵێســـەش یـــاوا بـــە ســـەقف گـــەردوون[3]

جـــە گڕکـــۆی ئـــایر، جـــە بڵێســـەی نـــار
ســـتێزام چـــوون بـــەرق، هـــەر کـــەردم هـــاوار[4]

---

۱- کڵف: کڵاف، کڵافە، گڵۆڵە، ئەو کات پرچیـان دەگرتـەوە و پێیـان دەوت پەلکـە. کڵافـەی کڵـف: پەلکە، گڵۆڵەی زوڵفی گیراوە. گوستاخ: نەترس، بێ باک، ئازا، بە جەرگ. خەرگە: خـەرگا، چـادر، خێوەتی گەورەی گەورەپیاوان، لێرەدا بە مانای شوێنی گەورە و مەیدانە. لەرزانـە: جۆرێـک زیـوەر و مت و مووروو کە ژنان دەیانکرد بە خۆیانەوە. واتە: وەک منداڵ بـێ خـەم بـووم و دەمتـوانی بچمـە کۆشی نازاران و مەحرەمی حەڵقەی زوڵفیان بووم و لە مەیدانی لەرزانـە و پـرچدا بـێ تـرس و بـاک بووم.

-۱۵-

۲- ک، ن، س، م، ب، ح، ر، عـم، ج.

۳- ئێمشەو: ئەمشەو. ئایر: ئاگر. گڕ بەست: گڕی کردەوە. بڵێسە: کڵپە، شۆعلە. یـاوا: گەیشـت. سەقف: بان. سەقف گەردوون: ئاسمان. واتە: ئەمشەو ئاگرێک لە دەروونم بەربوو و بڵێسەی هێندە بەرزە بوو کە گەیشت بە ئاسمان.

٤- جە: لە. گڕکۆ: جەرگەی گڕ، گڕی زۆر بەرز. ستێز: هەڵقرچان و هەڵخستنەوە. چوون: وەک،

جــــە هـــاوار هـــاوار ســـزا و ناڵـــەی مـــن
جە هــەی ئــاو هــەی ئــاو، شــین و زاڵــەی مــن[١]

تمـــــەز مەژنــــەوۆ یــــەک خوداتەرســــێ
موســـڵمان ســێفەت ڕاگــەی حــەق پەرســێ[٢]

مــــاوەرۆ کـــــۆزەی نــــەفت بــــەیتولماڵ
مشــانۆ وە ئــایر گـــڕ ســـەندەی شـــەماڵ[٣]

پۆســــــە مـــــەزانۆ یـــــە کـــــۆزەی ئـــــاوەن
نمـــەز کـــۆزەی نـــەفت تـــەوەن پـــێ تـــاوەن[٤]

---

☜ وێنەی. کەردم: کردم. واتە: لەبەر زۆری ئاگرەکە و بەرکەوتنی بڵێسەی ئاگرەکە وەک بزووسکەی ئاگر هەڵقرچام و هەڵمخستەوە و هاوارم کرد.

١- سزا: ئێش و ئازار. شین: گریان. زاڵە: داد و هاوار، کورت کراوەی زایەڵەیە. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدایە.

٢- تمەز: تۆ مەڵێ. مەژنەوۆ: دەبیستێت. ڕاگە: ڕێگە، ڕێگا. واتە: تۆ مەڵێ دەنگی ئێش و ئازار و ناڵە و هاوار و گریانی مـن و هـەی ئـاو کـردنم بـەرز بووەتـەوە . کابرایـەکی خواترسـی موسوڵمان کە لە ڕێگەی حەق دەپرسێت دەنگی هاوارەکانمی بیستووە کە ئەڵێم پیاوەتیتـان هـەبێت ئاو بێنن و ئەم ئاگرە خامۆش بکەن.

٣- ماوەرۆ: دێنێت. بەیتولماڵ: بیت المال، وشەیەکی عەرەبییە بە واتای شتێکی گشتی کـە کـەس بۆی نییە بەهرەی تاکەکەسی لێ ببات. مشانۆ: دەپاشێنێ، دەیکا بـە سـەریا. واتـە: گـۆزەی نـەوتی بەیتولماڵ هەڵدەگرێت و دەیهێنێ و دەیکا بە سەر ئەو ئاگرەدا کە شەماڵ خەریکە دەیگەشێنێتەوە.

٤- پۆسە مەزانۆ: وا دەزانێ. یە: ئەمە. نمەز: نازانێ. تەوەن: بەرد. تەوەن پێ تاوەن: بەرد ☜

کــــۆزەی نـــــەفتش کـــەرد بـــە بڵێســـــەمدا
قرچــــەی کـــــۆزەی نــــەفت یەنــــد ســــتێزم دا [١]

هـــەرتا ســـەحەر بـــی مـــن ســـۆزام بـــە ســـۆز
سەحەر بای شـەماڵ سـفتەم بـەرد چـوون تـۆز [٢]

هەرکـــەس وێنـــەی مـــن ســـتارەش چەفتـــەن
نـــەواچۆ هـــەی ئـــاو، نەســـیبش نەفتـــەن [٣]

☆☆☆

تاوێنەرە. واتە: وا دەزانێ ئەمە گۆزەی ئاوە و ئـاوی تێدایـە و نـازانێ گـۆزە نەوتـە کـە بـەردیش دەتاوێنێتەوە.

١- یەند: هێندە، ئەوەندە. واتە: نەوتی گۆزەکەی کرد بە سەر کڵپەی ئاگرەکەمدا و بە قرچەی نەوتەکە هێندەی دیکە گڕم کێشا و هەڵمخستەوە و هاوارم کرد.

٢- سۆزام: سووتام. سفتە: خۆڵەمێش، بەروو. واتە: هەتا بەیانی من بە سۆزەوە سـووتام و بـەیانی شەماڵ هات و ئەوەی لە سووتانم مابووەوە وێنەی تۆز بردی. لە هەندێک لە نوسخەکاندا نیوەبـەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «سەحەر سفتەکۆم با بەردش چوون تۆز» و لە نوسخەی «ک»دا بە جێی «سفتەکۆم»، «سفتە کـرۆم» نووسـراوە. ئێمـە ئـەم نیـوە بەیتـەمان بـە پێـی نوسـخەی «م» نووسیەوە کە دیارە وەها دروسترە.

٣- چەفت: لار. ستارەی چەفت: بێ شانسی. نەواچۆ: نەڵێت. یانی: هەرکەس وێنـەی مـن بـەختی لارە و بێ شانسە نەڵێت ئاو بێنن چون بە جێگەی ئاو نەوتی بە نەسیب دەبێت.

-١٦-[1]

ئێمشەو جە خاودا زڵف دێزێ دیم
چوون سیاشامار ژارئاوێژێ دیم[2]

شیانێ گێرتم من بە نەزانی
نمەز ئەو قاتڵ داوی گەزانی[3]

تێژتەر جە ئەڵماس قولاپێش سازا
یەک زەڕەی تەنم ناستش بە ئازا[4]

---

-١٦-

١- ن، ک، ئێ، ح، ب، س، ڕ.

٢- خاو: خەو. دێز: ڕەش، قەترانی. سیاشامار: ڕەش ماری گەورە. ژارئاوێژ: ژەهرپرژێن. واتە: ئەمشەو لە خەودا زوڵفێکی ڕەشم بینی کە وەک ڕەش مار ژەهری دەپژاند.

٣- شیانێ: ڕۆیشتم. گێرتم: گرتم. نمەز: نەمزانی. داو: نۆبە، نۆبەت. واتە: ڕۆیشتم و بە نەزانی ئەو زوڵفەم گرت و نەمزانی ئەو خوێنرێژە کاتی گەستنیەتی. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «شیانێ گێرتم» نووسراوە «شیام هۆرم گرت» کە دیارە دروست نییە چون زوڵف دەگیریەت، هەڵناگیریەت و بەم جۆرەیش مانا کراوەتەوە: «چووم ئەو هەورەم بە نەزانی گرت»!!. هەر وەها نیوە بەیتی دووهەمیشی بەم جۆرە نووسراوە: «نمەز ئەو قاتڵ دەوای گەزانی» و بەم جۆرەیش مانا کراوەتەوە: «ئەو بکوژە دای بە دەستمەوە و گەستمی» کە ئاشکرایە دروست نییە.

٤- تێژتەر: تیژتر. سازا: دروستی کرد. ناستش: نەیهێشت. واتە: قولاپێکی لە ئەڵماس تیژتری دروست کرد و بێ وچان دەیوەشاند ئازای سالمی لە لاشەمدا نەهێشت و هەمووی بریندار کرد.

رۆح جە تاوياى زام گيرگاز
پەرێ ئاسايێش ئاما وە پەرواز [1]

واتش مەر بەرشوو دوور بوو جە ئێشان
زامەت مار گاز نمەتاوو كێشان [2]

ئەودى، هەم بەردش سەر نە دەهانم
ڕاگير بى پەرێ ڕۆح ڕەوانم [3]

ڕۆح جە ئێش زام قاپيەى قاتڵ
وێش جە پەروازى ئەوە كەرد باتڵ [4]

---

١- تاوياى: توانەوە، تاوانەوە. زام گيرگاز: زامى بە داوە بوون، زامى قەپ لێ گرتن. ئاسايێش: ئاسوودەيى، ڕەحەتى. پەرواز: باڵ گرتنەوە. واتە: ڕۆحم بە توانەوەى ئەو زامە كە بوەتە جەستەم و بۆ ڕزگار بوون لە دەستى و ئاسوودە كردنى خۆى، باڵى گرتەوە و بە تەما بووە لە لاشەم بفڕێت (خەريك بوو گيانم دەربچێت). ئەم بەيتە لە نوسخەى «ک»دا نييە.

٢- واتش: وتى. بەرشوو: دەربچم. زامەت: ئێش و ئازار. نمەتاوو: ناتوانم. واتە: ڕۆحم وتى مەگەر بفڕم و لە ئێش و ئازار دووركەومەوە چونكە ناتوانم بارى ئێشى زامى ماران گەستە بكێشم.

٣- ئەودى: ديسان، هەم ديسان، دواى ئەوە. دەهان: دەم. ڕاگير: ڕێگر، كەسێك كە ڕێگەى كەسێكى ديكە ببڕێت. پەرێ: بۆ. واتە: پاشان ڕەش مارەكە(زوڵفە ڕەشەكە) سەرى بردە نێو دەمم و ڕێگەى ڕۆحمى گرت كە نەتوانێت بێتە دەر و بفڕێت.

٤- قاپيە: قاپيەوان، نگابانى درگا، درگابان، درگاوان، دەمى شوبهاندووە بە درگا و كە ڕەش مارەكە بووە بە درگابانى و ئيزنى فڕينى ڕۆح نادات. واتە: ڕۆح لەبەر ئێشى درگابانە قاتڵ و خوێنڕێژەكە نەيتوانى باڵ بگرێتەوە و بفڕێت.

بــەی گشــت زامـــەوە شـــی وە تـــەنم دا
بـــە تـــەن پـــەڕ دەرد، خـــەم وەتـــەنم دا [١]

✲✲✲

-١٧-[٢]

ئێمشەو جەستەی من، ئێمشەو جەستەی مـن
ئێمشەو ئەر مـەذێش کەسێ جەستەی مـن [٣]

حـاڵ پەشـێویای جەسـتەی خەسـتەی مـن
نائومێـذ مـەبی پـەرێ جەسـتەی مـن [٤]

---

١- بەی: بەم. گشت: هەموو، سەرجەم. شی: ڕۆیشت. تەن: لاشە، جەستە. خەم وەتـەن: جێگـەی خەم. واتە: ڕۆحم بەم هەموو زامانەوە ڕۆیشتەوە نێو لاشەم کە پڕە لە دەرد و مەکۆی خەمانە.

-١٧-

٢- ئەم پارچە شێعرە لە سەرچاوەکانی «ن»، «ب»، «ح» و «ر»دا هەیە. بەڵام زۆر ساکار و سادەیە و بە بڕوای من شێعری بێسارانی نییە. ئەو پێنج سەرچاوەیەش کە ئەم شێعرەی تێیدایە هەر وا کە لـە بەشـی نوسـخە دەستنووسـەکاندا ئاماژەمـان پێکـرد، هـەموویان یـەک سـەرچاوەیان هـەبووە. لـە نیوەبەیتی چوارەمیشدا دیسان «جەستەی من»ی کردوە بە سەروا کە بێسارانیانە نییـە، بـەڵام چـون بەڵگەیەک بە دەستمانەوە نییە کە شێعری بێسارانی نییە ئێمەیش هەروا کە هاتووە دەینووسینەوە.

٣- مەذێش: دەیبینی. مانای ئەم بەیتە بەستراوە بە بەیتی دواییەوە.

٤- خەستە: هیلاک، ماندوو، بریندار. نائومێذ: نائومێد، نائومید، بێ هیوا. مەبی: دەبوو. پەرێ: بۆ. واتە: ئەگەر ئەمشەو کەسێک حاڵی پەشێو و لاشەی زامدار و هیلاکی من دەبینی لـە لاشـەی من نائومێد دەبوو.

دەروون جــــە دووری مـــــەگریا بـــــە تـــــاو
جـــە چـــەم مـــەتکیا پەیاپـــەی هوونـــاو [١]

ناڵـــەی نـــاڵینم وە پـــای عـــەرش یـــاوا
ڕوخســـــارم نـــە ڕووی زەمــــین مەســـــاوا [٢]

نـــە گـــاهێ ڕاحـــەت، نـــە لادێ ئـــارام
تـــا ســـوب ســـپی بـــی وەی تـــەور ویـــارام [٣]

کەســـێ پـــەی قیبلـــەیش یەنـــد ژیـــانش بـــۆ
پەیش کەمەن بەی تەور ئەر ســەد گیـانش بـۆ [٤]

---

١- مەگریا: دەکوڵا. بەتاو: بە گەرمی، بە کوڵ بە جۆش. جە: لە. چەم: چاو. مـەتکیا: دەتکـی، دەرژا. پەیاپەی: زووزوو، بێ وچان. هووناو: خوێناو. واتە: دەروونم لەبەر دووری یار بە کوڵ دەکـوڵا و بێ وچان ئەسرینی خوێن لە چاوم دەڕژا. یا دەتوانین بەم جۆرەیش مانای بکەینەوە کە دەروون بە کوڵ دەگریا. یا دەتوانین «مەگریا» بە «مەگرِیا» بێنینە ئەژمارە و بڵێین دەروون ئاگری گرتبوو.

٢- یاوا: گەیشت. مەساوا: دەساوی، هەڵدەسوو. واتە: ناڵە ناڵەم گەیشتە ئاسمان و لەبـەر ئـێش و ئازاری زۆر ڕووی خۆم لە زەمین هەڵدەسوو.

٣- لادێ: تاوێک، ساتێک. سوب سپی بی: هەوا ڕوون بووەوە. ڕۆشنی کرد. واتـە: نـە سـاتێک لـە دەست ئێش و ئازار ڕاحەت بووم و نە تاوێک ئارام و ئۆقرەم دەگرت و تا هەوا ڕۆشن بـووەوە مـن بـەم حاڵەوە شەوم ڕابوارد. (بە ئێش و ئازارەوە شـەوم ڕۆژ دەکردەوە. «وەرگێڕ»).

٤- یەند: هێندە، ئەوەندە، لێرەدا ئەمە. پەیش: بۆ ئەو، بۆی. بەی تەور: بەم شێوە، بەم جـۆرە. واتـە: کەسێک کە لە دووری یارەکەی ئەمە ژیانی بێت، ئەگەر سەد گیانیشی ببێت هێشتا هەر کەمە.

-١٨-[١]

ئێمشـــەو خـــار یـــاڎ زەمانـــەی وێســـاڵ
بـــەردم بـــە دڵـــدا جـــە دەســـت خـــەیاڵ[٢]

وەختـــێ خـــار نـــە تـــەخت دڵ گێـــرتش قـــەرار
مـــن شـــکوفت نـــە ڕووم گـــوڵ هـــەزار هـــەزار[٣]

جـــە پـــەی زام خـــار دەســـت نیشـــان دڵ
چـەم بـێ بـە گـوڵزار، مـن بـیم بـە بوڵبـوڵ[٤]

---

-١٨-

١- ن، ک، ئێ، ح، س، ب، ڕ.

٢- ئێمشـەو: ئەمشـەو. خـار: دڕوو، دڕک. وێسـاڵ: وەسـاڵ، ویسـاڵ بـە یـەک گەیشـتنی دوو خۆشەویست. خار یاڎ زەمانەی وێساڵ: ئیزافەی تەشبیهییە و یادی کاتی ویساڵی یاری تەشبیە کردوە بە دڕوو، وا دیارە بە ویساڵ نەگەیشتووە و هەر بە خەیاڵ بیری لێ کردوەتەوە و ئەمیشە بووە بە هۆی ئازارانی. بەردم: بردم. واتە: ئەمشەو لە دەستی خەیاڵاتەوە دڕووی یادی زەمانەی ویساڵی یارم برد بە دڵدا.

٣- تەخت: سارا، دەشت. شکوفت: پشـکووت، پشـکی. واتـە: کاتێـک دڕوەکـە لـە سـارای دڵـمدا گرت و پێیدا چەقی بە هەزار هەزار گوڵی ڕووم دەپشکی. مەبەستی لەو گوڵانە لە بەیتی دوایـیدا دەڵێت.

٤- جە پەی: لەبەر، بە خاتر. دەست نیشان: بە دەست نراو. چەم: چاو. بیم: بـووم. بوڵبـوڵ: بولبـول (لە هەورامان بە لامی قەڵەو گۆی دەکەن. «وەرگێڕ»). واتە: لەبەر زامی ئەو دڕوە کە لە نێو دڵمدا چەقیبوو، زەوی چاوانم بە ئەسرین تەڕ بوو و گوڵێکی زۆری لێ ڕوا و چاوم بوو بە گـوڵزار و منـیش بووم بە بولبولی نێو ئەو گوڵزارە.

نالـــەی بوڵبـــوڵیم بوڵەندپایـــە بـــی
جـە پـەی شـووم بـەختیم ئـایر مایـە بـی[١]

جەســـتەم هـــەر گڕیـــا تـــا ســـوب بەیانـــدا
ســـوب بـــاڵام نیشـــان ســـفته نـــەیان دا[٢]

✵✵✵

-١٩-[٣]

ئێمشـــەو خـــار یـــاد زەمانـــەی وێســـاڵ
بـــەردم بـــە ڕێـــدا بـــە دەســـت خـــەیاڵ[٤]

---

١- بوڵەند: بەرز. شووم بەختی: بەدبەختی. ئایر: ئـاگر. مایـە: دەسـكەوت. واتـە: ناڵـەی بولبـول ئاساییم بەرز بووەوە و لەبەر بەدبەختی و سیاچارەییم دەسكەوتی ئەو ناڵە بەرزە، ئاگر بوو.

٢- گڕیا: سووتا. بەیان: بەیانی زوو، كازیوە. نەیان: كۆی وشەی نەی، قـامیش. واتـە: پـاش ئـەوەی دەسكەوتم بوو بە ئاگر تا بەیانی لاشەم هەر سـووتا، بـەیانی بـاڵام نیشـانی قامیشـی سـووتاو دا تـا بزانیین كام یەک لە ئێمە زۆر سووتاوین. لە شـێعری شـاعێرە كلاسـیكە فارسـەكاندا زۆربـەی كـات قامیشەلان سووتاوە. لە نوسخەی «ک»دا بە جێی «هـەر گڕیـا»، «گێـرت نـوور» نووسـراوە و لـە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «سفتە نەیان» نووسراوە «سفتە دڵان».

-١٩-

٣- ئەم پارچە شێعرە تەنیا لە نوسخەكانی «ک» و «ئێ»دا هەیە و لە هەردوو نوسخەكەیشـدا بـەم جۆرە نووسراوە و لە هەندێ جێگەیشدا ماناكەی ڕاست نابێتەوە.

٤- خار: دڕوو، دڕک. وێساڵ: وەساڵ، ویساڵ، بە یەک گەیشتنی دوو خۆشەویست. بەردم بـە ڕێـدا: بردم بە ڕێگایەكدا. واتە: ئەمشەو بـە دەسـتی خـەیاڵ، دڕووی یـادی كـاتی ویسـاڵم بـە ڕێگایەكـدا (شوێنێكدا) برد.

تـــا بـــە دەســـت نـــێش خـــار خـــەیاڵ بـــی
نـــە دەوران کـــۆی ســـتەم تیژبـــاڵ بـــی[١]

وەختـــیٚ خـــەم زەنجیـــر مـــەنیاش وە گـــەردەن
ســـەد پایـــە مەویـــەرد جـــە ئـــاداب مـــەردەن[٢]

کەســـیٚ پـــەی قیبلـــەش یەنـــد ژیـــانش بـــۆ
پـــەیش کەمـــەن بـــەی تـــەور ژار گیـــانش بـــۆ[٣]

✲✲✲

-٢٠-[٤]

ئێمشـــەو دڵ جـــە دەرد، ئێمشـــەو دڵ جـــە دەرد
تـــا ســـوب ســـپی بـــی هـــەر نـــاڵا جـــە دەرد[٥]

---

١- واتە: تا نێشی ئەو دڕوە بە دەستی خەیاڵەوە بوو بـە دەوری کێـوی سـتەمدا هـەر دەخولایـەوە و وێنەی باڵدارێک بە دەوریدا باڵ لیٚ دەدا.

٢- مەنیا: دەنا. مەویەرد: تێدەپەڕی. واتە: کاتێک خەم زنجیری دەخستە گەردنی خەیاڵ و ئەسیری دەکرد، هێندەی بە لاوە سەخت بوو کە سەد پلـە لـە مـەرگ تێدەپـەڕی و مەرگیشـی هێنـدە لـە لا سەخت نەبوو.

٣- یەند: هێندە، ئەوەندە. پەیش: بۆ ئەو، بۆی. بەی تەور: بەم شێوە، بەم جۆرە. واتە: کەسێک کە بۆ خۆشەویستی خۆی ژیانی بەم جۆرە بێت، کەمە کە ئاوا گیانی بۆی ژەهراوی بێت.

-٢٠-

٤- ح، ک، ن، ئێ، ب، س، ع، ر.

٥- ئێمشەو: ئەمشەو. جە: لە. سوب سپی بی: هەوا ڕۆشن بووەوە، تاو هەڵات. ناڵا: ناڵاندی. ☜

پەیوەست مەکێشاش هەناسان سەرد
هەر سەنگ و ئاهەن، پێش مەبی بە گەرد [١]

واتم هەی دڵە، دەیسە وەس ناڵە
خەڵکان جە ناڵەی تۆشان شی زاڵە [٢]

واتش بێ مروەت خەبەرسەردەنی
چەنی نەناڵوو، مەر بێ دەردەنی؟ [٣]

---

☜ واتە: ئەمشەو هەتا تاو هەڵات دڵم لەبەر ئێش و ئازار هەر ناڵاندی.

١- پەیوەست: بەدوای یەکدا، بێ وچان. مەکێشاش: دەیکێشا، هەڵیدەکێشا. سەنگ: بەرد. ئاهەن: ئاسن، کانزا. پێش: بە ئەو، پێی. گەرد: تۆز. واتە: هەر هەناسەی ساردی هەڵدەکێشا و هەر بەرد و ئاسن بوو کە بە هەناسەی ساردی ئەو دەبوون بە تۆز.

٢- واتم: وتم. دەیسە: دەی ئیسە، دەی ئیتر. وەس: بەس. شی: ڕۆیشت. زاڵە: کیسەی سەفرا، پێشتر لەسەر ئەو بڕوا بوون ئەگەر کەسێک زۆر بترسێت و لە ترسدا بێ هۆش بێت ئەوە کیسەی سەفرای تەقیوە و لەبەر ئەو وتوویانە «زاڵەی تەرەکیوە». واتە: وتم ئەی دڵە! ئیتر بەسە و بەس بناڵە، چون خەڵک لەم ناڵە ناڵەی تۆ ترسان و زاڵەیان ڕۆیشت و مردن.

٣- واتش: وتی. بێ مروەت: بێ ڕەحم، کەسێک کە پیاوەتی لە دەست نەیەت. خەبەرسەردەنی: بێ خەبەری، بێ هەواڵی. چەنی نەناڵوو: چۆن نەناڵم. مەر: مەگەر. بێ دەردەنی: بێ دەردی، دەردت نییە. واتە: وتی ئەی بێ ڕەحم! مەگەر خەبەرت نییە؟ چۆن نەناڵم مەگەر تۆ خۆت بێ دەردی کە نازانی حاڵی دەردەدارێکی وەک من چۆنە؟

جەی وەرتـەر قیبلـەم هـەر شـام هـەر سـەحەر
مـــــەنماناش بـــــاڵای نـــــەمام نەوبــــــەر[١]

ئیســـــــە لـــــێڵاوی ئـــــەو نەدینمــــــەن
جەوپـــــەی ئـــاه ســــەرد، زاری و شـــینمەن[٢]

یــــــە خـــــەیلێ وەختـــــەن لـــێم نادیـــارەن
نـــــە شـــــەو خـــاوم هـــــەن، نـــــە ڕۆ قـــــەرارەن[٣]

---

١- جەی وەرتەر: پێش ئەمە، بەرلەمە. شام: ئێوارە. سەحەر: کازیوە، بەیانی. مەنماناش: دەینواند. واتە: پێشتر قیبلەم هەموو ئێوارە و بەیانییەک باڵای وەک نمامی نۆبەری دەنواند و نیشانی منـی دەدا.

٢- لێڵاو: کوێرایی، نەمانی سۆمای چاو. نەدین: نەبینین. جەوپەی: لەبەر ئـەوە، بـەخاتری ئـەوە، بۆیە. زاری: گریان. شین: شیوەن. واتە: ئێستە لەبەر نەبینینی ئەو کوێرایی چاوانم داهاتووە و بۆیە هەناسەی سارد هەڵکێشان و گریان و شیوەنمە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە دوای ئەم بەیتەدا بەیتێکی دیکە هەیە کە لە هێچکام لە نوسخەکانی لای ئێمـە نییـە و کـاک حـەکیمیش نووسـیویە کـە لـە سەرچاوەی «ن» هێناویە. ئەمەیش بەیتەکە:

ئیســە پــەی دووری قیبلــەم مــەناڵوو گــەرد پــا و پــاڵاش وە مــوژە مــاڵوو

هەر وەها کە وتمان لە هیچکام لە نوسخە دەستنووسەکانی لای ئێمەدا نییـە و وادیـارە لـە نوسـخە نووسیندا لکاوە بە شێعرەکەوە و بێ ئەو بەیتەیش مانای شێعرەکە تەواوە و زیـاتر لـە هـەمووی، لـە شێعری بێسارانیش ناچێت. ئێمەیش تەنیا لەبەر ئەوەی لە سەرچاوەی «ن»دا هەبوو لێرەدا هێنامان.

٣- یە: ئەمە. خەیلێ وەختەن: زۆر لە مێژە. خاو: خەو. ڕۆ: ڕۆژ. واتە: زۆر لە مێژە نـایبینم و هـەر لەبەر ئەوە نە شەو خەوم هەیە و نە ڕۆژ ئارام و قەرار.

کەســـێ کـــە دۆســـش نـــە پێـــوارش بـــۆ
چـــەنی بـــە شـــەو خـــاو، ڕۆ قـــەرارش بـــۆ؟[١]

☆☆☆

١- پێوار: ون، نادیار، گوم. بۆ: بێت، بێ. خاو: خەو. ڕۆ: ڕۆژ. واتە: کەسێک کە یاری لێ ون بێت و نەیبینێت چۆن دەبێ شەوان خەو و ڕۆژان ئارام و قەراری بێت. لە دیوانە چاپ کراوەکانـدا («ح» و «ب») دوای ئەم بەیتە بەیتێکی دیکە هاتووە و کاک حەکیم نووسیویە لە سەرچاوەی «ن» هێناویە و بەیتەکە ئەمیە:

چوون «بێســارانی» هەرکـەس بـێ دڵ بـۆ     چوون باخچەی بێ ئاو دایم بـێ گـوڵ بـۆ

بەڵام هیچکام لە نوسخە دەستنوسەکانی لای ئێمە ئەم بەیتەی تێدا نییە و بە ڕای من لەبـەر ئـەم خاڵانە شێعری بێسارانی نییە و لکاوە بە شێعرەکەوە:

یەک: بێسارانی لە سەرەتاوە تا کۆتایی لەگەڵ دڵی خۆیدا قسە دەکات، چۆن لە کۆتایی دا خـۆی بـە بێ دڵ دادەنێ و دەڵێت: «چوون بێسارانی هەرکەس بێ دڵ بۆ»؟!

دوو: بێسارانی نازناوی بۆ خۆی هەڵنەبژاردووە (لە پێشەکیەکەدا و لە بەشی بێسارانی و شێعرەکانیدا بە وردی باسمان کردوە) و لـە هـیچ کـام لـە شـێعرەکانیدا (جگـە لـەو دوو پارچـە شـێعرە کـە نـاوی «موستەفا»یان تێدایە و ئەویش بە جێی خۆی باسمان کردووە و بۆی هەیە شێعری ئەویش نەبن) ناو یا نازناوی خۆی نەهێناوە. هەرچەند لە دەورەی خۆیدا و پاش خۆیشی تا ماوەیەک، بە «مەحزوونی» ناسراوە و پاشان لەبەر ئەوەی خەڵکی دێی بێساران بووە هێدی هێدی بە بێســارانی نـاوی دەرکـردووە. بەڵام مەحزوونیشی لە شێعرەکانیدا نەهێناوە و بەس لە شێعری «ناڵەی دەردەدار بێ ئاخ نمەبۆ»دا لە هەندێک لە نوسخەکاندا بەیتێک هەیە کە ئەویش لە زۆربەی نوسخەکاندا نییـە و مـەعلووم نییـە هی بێسارانی بێت، لەوێدا وشەی مەحزوونی هاتووە. ئەمەیش بەیتەکە کە لە شـوێنی خۆیـدا لـەو پارچە شێعرەدا زیاتر باسی لەسەر کراوە:

مـــەحزوونی عاشـــق بـــێ یـــار نمـــەبۆ     عاشـــقان بـــێ یـــار مـــدار نمـــەبۆ

-٢١-[1]

ئێمشەو مەن گریام، خرووس کەرد نالێن
سوب ئەو بێ نیشان، مەن زوخ نە باڵین[2]

گریەی مەن جە داخ دووری کەسێ بێ
ئەو جە دەرد بێ باک، وەش نەفەسێ بێ[3]

نەسۆزا بە سۆز، نە بەردەمەوە
ناما، نەپەرساش بە دەردەمەوە[4]

وێنەی بێ دەردان سەرد خاو خەیاڵ
تا سوب مەن گریام نەزاناش بە هاڵ[5]

-٢١-

١- ن، ک، ئێ، ح، ب، س، م، ڕ.

٢- خرووس: کەڵەشێر. زوخ: زووخاو. باڵین: سەرین، هەرشتێک کە بنرێتە ژێر سەر. واتە: ئەمشەو من گریام و کەڵەشێریش دەنگی ناڵە ناڵی دەهات بەڵام کە ڕۆژ بووەو هیچ نیشانێک لەو نەبوو و من زووخاو لە سەری سەرینمدا بوو.

٣- وەش: خۆش. واتە: گریانی من لە داخ و حەسرەتی دووری کەسێک بوو بەڵام کەڵەشێرەکە هیچ دەردێکی نەبوو و بە دەنگێکی خۆش دەیخوێند.

٤- نەسۆزا: نەسووتا. ناما: نەهات. نەپەرساش: نەیپرسی. واتە: کەڵەشێرەکە بە سۆزەوە نەسووتا، لە حاڵێکدا لە بەردەمی مندا بوو بەڵام نەهات و نەیپرسی دەردت چییە. مەبەستی ئەوەیە چونکە ئەو خۆی بێ دەرد بوو گوێی لە دەردی منیش نەبوو.

٥- خاو: خام کاڵ، نەگەیشتوو. سوب: بەیانی. نەزاناش: نەیزانی. هاڵ: حاڵ. واتە: من تا ☜

بــــێ دەرد بــــێ دەردیــــش ئەوســــە دیــــار دا
ناڵــــەش بــــێ ئەنــــدوو مامــــا بــــە شــــاردا [١]

☆☆☆

☞ بەیانی گریام و ئەویش وەک ئەوەی بێ دەرد و خەیاڵ خاوە بە حاڵ و ئەحواڵی منی نەزانی.

١- ئەوسە: پاشان، دواتر. بێ ئەندوو: بێ خەم و خەفەت. ماما: دەهات. واتە: ئەو کە بێ دەرد بوو، بێ دەردییەکەی بە دوای ئەوەدا دیاری دا کە دەنگی کە هیچ خەم و خەفەتێکی پێوە دیار نەبوو، لە هەموو شوێنێکی شاردا دەبیسترا.

-١-[١]

باد هەر جایی! باد هەر جایی!
باد بێ مەکان! هەرزەی هەرجایی![٢]

تۆ خۆ دەربەدەر وێنەی گەدایی
کەی نیشتی نە تەخت مەرتەبەی شاهی؟[٣]

کەی بیت وە هامراز زلف موشک ئەندام؟
تاتاش مەکەری جە سوب تا بە شام[٤]

-١-

١- ک، نێ.

٢- باد: با، شنانەوەی هەوا. هەرجایی: بێ شوێن و جێگە، شوێن نادیار، بێ ئەسڵ و نەسەب، بێ مەکان. هەرزە: بێ سەمەر، بێ بەهرە. واتە: ئەی «با»ی بێ جێگە و مەکان و بێ ئەسڵ و نەسەب و بێ سەمەر.

٣- نیشتی: دانیشتی، نیشتەجێ بووی. مەرتەبە: پلە و پایە، مەقام. واتە: خۆ تۆ وێنەی گەدا دەربەدەر و ئاوارەی. لە کەیەوە گەیشتووی بەم پلە و پایە شاهییە و لەسەر تەختی شاهی دانیشتووی؟

٤- کەی بیت: کەی بووی. زلف: زوڵف، پرچ، قژ. موشک: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆش کە لە کیسەی پەنا ناوکی ئاسک دایە. موشک ئەندام: کەسێک کە هەموو ئەندامی وێنەی موشک بۆی خۆشی لێ دێت. مەکەری: دەکەی. جە: لە. سوب: کازیوە، بەیانی. شام: ئێوارە. واتە: لە کەیەوە بووی بە هاوڕازی زوڵفانی یار و هەر بەیانی تا ئێوارە دەیانخەی بەم دیو و بەو دیودا و تاڵ تاڵیان دەکەی؟

نــه، حەیفــەن هــامراز زڵــف موشــک پــەروەر
چــوون تــۆ پــەروەردەی ســارا و دەشــت و دەر[١]

ئەو زڵـف دەسـتەی وێـش خـوڎای خـاس کـەردە
تــۆ کــەم فــام چــوون کــورد ســاراپەروەردە[٢]

کەســێ وێنــەی کــورد پــەروەردەی ســاران
چووزانــۆ بــە قــەدر مایــەی عــەتتاران؟[٣]

---

١- حەیفەن: حەیفە. چوون: وێنەی، وەکوو. واتە: نە نە، حەیفە کەسێکی وەک تۆ کە پەروەردەی بیابان و دەشت و دەر بێت، بێت و ببێت بە هاوڕاز و هاوڕێی ئەو زوڵفانە کە بە موشکی بۆنخۆش پەروەردە بووە.

٢- وێش: خۆی. فام: عەقڵ، ئاوەز. کورد: بە هۆی ئەوەی کورد ئاژەڵدار و کۆچەر بووە بەردەوام بە کەش و کۆوە بوون و گەرمێن و کوێستانیان کردووە و لەبەرانبەردا لە هەورامان بەو شێوە نەبووە و خەڵک کۆچەر نەبوون، وا دیارە بێسارانی بە هۆی ئەوەی «با» دایمە سەرگەردانە و لە جێگەیەکدا ناسرەوێت، ئەڵێت بە وێنەی کوردیت، یانی دایمە وای بە کەش و کۆوە و ئامانت نییە. ئەم مانا لە بەیتەکانی دواییدا باشتر ڕوون دەبێتەوە. ئەڵبەت پێویستە ئەوەیش بڵێین کە لە ئەدەبیاتی کلاسیکی فارسدا «کورد» بەردەوام وەک شوان ناسراوە و بۆی هەیە بێسارانی لەبەر ئەوە لە وشەی کورد کەڵکی وەرگرتبێت. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا دێت.

٣- عەتتار: عەتر فرۆش. مایەی عەتاران: دەس مایەی عەتار کە دەبێتە عەتر. چووزانۆ: چووزانێت، چۆن دەزانێت. واتە: ئەو زوڵفانە خودا دەستەی کردووە و دەستە کردن و داهێنانی پێویست نییە تۆیش بێ عەقڵ و کەم فامی و بە وێنەی کورد پەروەردەی کەش و کۆی و لێیان دەدەیت تاڵ تایان دەکەیت، ئاخر کەسێکی وێنەی کورد کە پەروەردە و گەورە بووی کەش و کۆ بێت قەدری ئەو عەتر و عەبیرە چۆن دەزانێت؟

نـــەبا جـــەو دمـــا کـــورد بینـــە کـــەم فـــام
بشـــانی دەســـــتەی زڵـــف عەنبــــەرفام[١]

بـــە غـــەیر جـــە شـــاناى وەڵـــگ دار کـــۆ
کـــێ پێـــت ســـپەردەن زڵـــف ئەشـــەدبۆ؟[٢]

✡✡✡

١- نەبا: نەوەک، نەکا. جەودما: بە دوای ئەوەدا. کەم فام: بێ عەقڵ و کەم هۆش. بشانی: بشەکێنی. عەنبەر: ماکێکی(مادەیەکی) بۆنخۆش کە بۆ دروستکردنی عەتر بە کاری دێنن و ڕەنگێکی نزیک بە ڕەشی هەیە. فام: ڕەنگ. عەنبەرفام: ڕەنگ ڕەش. واتە: نەوەک پاشان وێنەی کورد بی و بە بێ عەقڵی و کەم فامی ئەو دەستە زوڵفانە کە بە وێنەی عەنبەر ڕەشن بشاڵۆزێنی.

٢- شاناى: شەکاندن. وەڵگ: گەڵا، بەرگ. ئەشەدبۆ: گیایەکی بۆ خۆشە کە بە فارسی پێی دەڵێن «علف گربە» و سۆرانیش «گیا کتک»ی پێ دەڵێن. سپەردەن: سپاردووە. واتە: ئەی «با»ی بێ شوێن و مەکان و کەش و کۆ گەرد تۆ کە جگە لە شکاندنەوەی گەڵای داری کێوان کارێکی دیکەت نییە، ئێستە کێ ئەو زوڵفانەی کە بۆیان وێنەی ئەشەدبۆ وایە بە تۆ سپاردووە. لە نوسخەی «ئێ»دا بە جێی «وەڵگ دارکۆ»، «وەڵگ دار و کۆ» و بە جێی «زڵف ئەشەدبۆ»، «زڵف موشکین بۆ» نووسراوە.

لە هەردوو نوسخەکەدا پاش ئەم شێعرە، پارچە شێعرێک هاتووە کە لە وڵامی ئەم شێعرەدا وتراوە و لە نوسخەی «ک»دا لەسەری نووسراوە «مەولانا قاسم» و لە نوسخەی «ئێ»دا نووسراوە «ملا قاسم در جواب» یانی «مەلا قاسم لە وڵامی» کە هەم لە مانای شێعرەکەدا و هەم لە نوسخەکاندا وادیارە وڵامی ئەم شێعرەی بێسارانی داوەتەوە. بەڵام لە سەرچاوەکانی «ح» و «س»دا بە ناوی بێسارانییەوە هاتووە و هەندێک جیاوازی لەگەڵ نوسخە دەستنووسەکانی بەردەستی ئێمەدا هەیە کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێ دەکەین. کاک ئەنوەری سوڵتانی لە پێشەکی کەشکۆڵەکەیدا نووسیویە کە «مەلا قاسم» خەزووری بێسارانی و خەڵکی ئاوایی «پایگەلان» بووە. ئەمەیش شێعرەکەی مەلا قاسم:

-٢[١]-

بای شەماڵ تای زڵف، بای شەماڵ تای زڵف
دڵ پێ زەروورەن، تایێ جە تای زڵف[٢]

قەترانی شەوڕەنگ کڵێوەی سەرکڵف
ستەم زەدەی دەست، ناخوون کەندەی تڵف[٣]

---

☜مەولام جە سەحەر، مەولام جە سەحەر | باد نمناکێ مەیۆ جە سەحەر
جەوپەی مەشانۆ زڵف موشکپەروەر | تا کەیل موشک بۆ سارا و دەشت و دەر
نە، جەوپەی زڵفش مەکەرۆ لەرزان | یانێ موشک خام جێش مەبۆ ئەرزان
ناگا هەر وەختێ مەیۆ بە نەمین | زڵفان مەویارۆ جە قورس جەمین
بادت ڕەنجنان تۆ بە بێ گونا | کەردەنت بە کورد بێ پەردە و پەنا

*لە سەرچاوەی «ح»دا نیوە بەیتی کۆتاییەکەی بەم جۆرە نووسراوە: «کەردەت بکەرۆ پەروەردە بونا»!. و لە نوسخەی «س»دا بەم جۆرە نووسراوە: «کەردەت بکەرۆ پەڕ دەردە بینا»!. هەر وەها بە دوای ئەم بەیتەدا لەو دوو سەرچاوەدا بەیتێکی دیکە هەیە کە دیارە بە هەڵە لکاوە بە شێعرەکەوە و ماناکەی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا یەک ناگرنەوە. ئەمەیش بەیتەکە:

ئیسە سەبەب چێش جە کردگاران | نماری بۆی زڵف چوون هەردە جاران

-٢-

١- ک، ئێ، ح، س، ن، ب، ڕ.

٢- تا: تاڵ. زڵف: زوڵف، پرچ، قژ. دڵ پێ زەروورەن: دڵ پێویستی پێیەتی. واتە: ئەی شەماڵ تاڵێک لەو زوڵفانەم بۆ بێنە چون دڵم پێویستی پێیەتی. لە بەیتی دوایی‌دا دەڵێت ئەو زوڵفانە کامانەن. لە سەرچاوەکانی «ح»، «س»، «ب»، «ڕ» و «ن»دا بە جێی «دڵ پێ زەروورەن»، «دەستم دامانت» نووسراوە.

٣- قەترانی: بە ڕەنگی «قەتران» کە مادەیەکی ڕەشە. شەوڕەنگ: بە ڕەنگی شەو. کڵێوە: لوول.☜

وەختێ مەگێرۆ تڵف بە سینەوە
سا تڵف مەکێشۆ زڵف بە قینەوە[١]

ئەوسە مەگێرۆ کڵافەی کلفش
لازم مەدەرۆ بە دەست تڵفش[٢]

ساکە مەگێرۆ مەکێشۆش بە قەست
چۆگە حازر بە بستانەش جە دەست[٣]

---

☜ سەرکڵف: سەرلوول خواردوو، سەری ئەو زوڵفە کە بە پەلکە گیراوەتەوە. ستەم زەدە: ئازار دراو. ناخوون کەندە: بە نینۆک کەنراو. تڵف: منداڵ کۆرپە. واتە: ئەو زوڵفە کە بە وێنەی قەتران ڕەشە و بە ڕەنگی شەوە و پەلکە کراوە و سەری لوولە و گیراوەتەوە و بە هۆی ئەوەوە کە دەستیان لێدراوە، لایان سەخت و ئەستەم بووە و بە نینۆکی دەستی منداڵەوە هەڵکێندراون. (منداڵی بچووک بگرێت و بیکێشیت).

١- مەگێرۆ: دەگرێت. مەکێشۆ: دەکێشێت. واتە: کاتێک کۆرپەکەی دەگرێتە ئامێزی، کۆرپەکەی بە قینەوە زوڵفی دەکێشێت. ئەم بەیتە لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا نییە. نیوە بەیتی هەوەڵی ئەم بەیتە لە سەرچاوەی «ن»دا بەم جۆرەیە: «وەختێ یەک ڕۆ تڵف دەست بە سینەوە».

٢- ئەوسە: ئەوسا، پاشان. مەدەرۆ: دەیدا، ئەیدا. واتە: پاش ئەوەی کڵافەی زوڵفە لوولەکانی دەگرێت، ناچارە بیدا بە دەستی کۆرپەکەیەوە.

٣- بەقەست: بە ئەنقەست، بە نییەتەوە. چۆگە: لەوێدا، لەو جێگەدا. بستانەش: وەریبگرە، بیسێنە. واتە: کاتێک کۆرپەکەی زوڵفەکانی دەگرێت و بە قینەوە دەیکێشێت، (ئەی شەماڵ) تۆ لەوێ حازر بە و لە دەستی کۆرپەکەی وەریبگرە.

باوەڕەش پەرێم چوون پەیک تێژباڵ
هێمای دڵ نەبیەن یەکسان بە زوخاڵ[1]

☆☆☆

-٣-[2]

بورچین سەرسەوز، بورچین سەرسەوز
فەڕ سەراوان، بورچین سەرسەوز[3]

شیرین شێوەیێ، قامەت تووڵ جەوز
سایەی زڵف وێش سەیر مەکەرد نە حەوز[4]

---

١- باوەرش پەرێم: بۆم بێنە. چوون: وێنەی، وەک. پەیک: نامەبەر. تێژباڵ: باڵدارێک کە زۆر بە خێرایی باڵ بگرێتەوە، لێرەدا بە مانای گورج و گۆڵە. هێمای: هێشتا. نەبیەن: نەبووە. واتە: ئەی شەماڵ ئەو زوڵفە کە وتم لە دەستی کۆرپەکەی وەربگرە وەک پەیکێکی گورج و گۆڵ باڵ بگرەوە و زوو بۆم بێنە چون هێشتا دڵم نەبووە بە زووخاڵ و ئەگەر زوو بیهێنی دەبێتە هۆی سارێژ بوونی.

-٣-

٢- ئەم پارچە شێعرە تەنیا لە سەرچاوەکانی «ک»، «ئێ» و «ح»دا هەیە. لە سەرچاوەی «ح»دا تەنیا دوو بەیتی هاتووە و نووسراوە کە دیارە ناتەواوە. بەڵام لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا هەر چوار بەیتەکەی هەیە.

٣- بورچین: سەوزە مراوی کە سەر و ملی سەوزە و سینەی خەنەییە، لێرەدا شاعێر یاری شوبهاندووە بە بورچینەوە. فەڕ: شکۆ، ڕازێنەر. سەراوان: سەرئاو، سەرچاوەی ئاو. واتە: سەوزەمراوی هۆی جوانی و ڕازاندنەوەی سەرئاوە. ئەڵبەت وەک ئاماژەمان پێکرد مەبەست لە سەوزەمراوی یاری جوان و ڕازاوەیە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێگەی «فەڕ سەراوان»، «نە سەر سەراوان» نووسراوە.

٤- شیرین شێوە: شێوە جوان، دەتوانێت بە مانای کەسێکیش کە شێوەی بە وێنەی «شیرین»ی ☜

زڵفـــش کـــەردەبێ بـــە ڕەزانـــە واز
تەماشــاش مەکــەرد وێنــەی ســپی بــاز[١]

ئــەر جــە تانــەی بــەد نمەکــەرد ئەنــدێش
چــوون بــاز مەشــاناش ئــەو وە ســایەی وێــش[٢]

***

---

☞ خۆشەویستی «فەرهاد»ە بێت. جەوز: گوێز. واتە: یار کە بە وێنەی سەوزە مراوی شێوەی جوان بوو، باڵای بە وێنەی لقی ناسک و باریکی داری گوێز بوو هات بۆ سەراو و لەسەر حەوزەکە سەیری سێبەری زوڵفەکانی دەکرد کە کەوتبووە نێو حەوزەکەوە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «شێوەیێ»، «شێوە ناز» و بە جێگەی «جەوز»، «سەوز» نووسراوە.

١- کەردەبێ: کردبووی. ڕەزانە: هێواشی، سەنگینی، وقار. سپی باز: بازی سپی، شاباز. واتە: زوڵفی بە هێمنی و ئارامی باز کردەبوو و بە وێنەی شابازێک لە ئاوی حەوزەکەدا سەیری دەکرد.

٢- ئەر: ئەگەر. جە: لە. نمەکەرد: نەدەکرد. ئەندێش: بیر کردنەوە. چوون: وێنەی، وەک. واتە: ئەگەر لەبەر تانە و تەشەر و لۆمەی نەیاران نەبوایە بە وێنەی شاباز لە سێبەری خۆیدا بڵاوی دەکردەوە. مانای ڕێک و پێکی ئەم بەیتەمان بۆ ڕوون نەبوەوە بەڵام وادیارە کاتێ شاباز سێبەری خۆی دەبینێت پێی وایە باڵدارێکی دیکەیە و هێرشی بۆ دەبات، لێرەدا بێسارانی ئەیەوێت ئاماژە بەوە بکات. لە نوسخەی «ئێ»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «چوون باز مەشاناش وە سای زڵف وێش» کە ئەویش هەر بەو مانایە جیاوازیەکی زۆریان نییە.

-٤[١]-

بــــه بــــاد بۆبــــەخش، بــــه بــــاد بۆبــــەخش
بــــه بــــاد دەوان، شــــەریف بۆبــــەخش[٢]

تاتــــا کلافــــەی زڵــــف دێــــز کــــەرد پــــەخش
داراوە جــــه مــــای دارای موشــــکین بــــەخش[٣]

گــاهێ چــوون پــەڕگار ڕێــک مــاوەرد پــەرواز
گا مەکــەرد نــه پــاش، چــین چــین ســەرئەنداز[٤]

-٤-

١- ک، نێ.

٢- باد: با. دەوان: گورج و گۆڵ توند و تیژ. شەریف: پلە و پایە بەرز. مانـای ئـەم بەیتـە لەگـەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٣- تاتا: تاڵ تاڵ. دێز: رەنگی رەشی بەرەو خۆڵەمێشی. داراوە: ئـاوی داوە. مـا: مـاءی عـەرەبی بـە مانای ئاو. دارا: دەوڵەمەند، بە دەسـەڵات، کەسـێک کـە شـتێکی هـەبێت. موشـک: هـەم مانـای بۆنخۆشی هەیـە و هـەم مانـای رەش، بەسـتراوە بـە موشـکەوە کـە مـاکێکی (مادەیـەکی) رەشـی بۆنخۆشە. واتە: یار بە هۆی باوە کە شەریفە و پلە و پایەی بەرزە و گورج و گۆڵ و توند و تیژە، بـۆنی خۆشی بڵاو کردەوە، پەلکەی زوڵفە رەشەکەی تاڵ تاڵ کـرد و دای بـە دەم بـاوە و بـە ئاوێـک کـە بـۆی موشکی لێ دەهات ئاوی دا و تەری کرد.

٤- پەڕگار: کەرەستەیەک بۆ جەغز (دایەرە) کێشانەوە، لێرەدا بە واتـای ڕێـک خـول دانـە. مـاوەرد: دەیهێنا. پەرواز: باڵ گرتنەوە. سەرئەنداز: سەرەوخوار، لێرەدا بە واتای لە سەروە بەرەو خـوار هاتنـە. واتە: جارجار بە وێنەی پەڕگار زوڵفەکانی بە ڕێکی هەڵدەخولان و لوولی دەدا و جارجاریش دەیهێنا و بەری دەدایەوە خوار کە بگاتە لای پێی.

مـــن دیـــدە بـــە ئەســـر زوخ ســـیا تـــەڕ
دڵ جـــە ئـــارەزووی دیـــن بـــاڵاش پـــەڕ[١]

مـــدرا، نـــە پـــەی بـــێم شـــکات زوان
نـە پـام بـێ جـە سـام نـەخش ئـەو لـوان[٢]

بیـان بـە سـوورەت فـەرهاد کەنـدەی سـەنگ
ئەنـدام ئـادەم تـەور، دوور جـە دوا و دەنـگ[٣]

٭٭٭

---

١- ئەسر: ئەسرین، فرمێسک. زوخ سیا: زوخاوی ڕەش. دین: دیتن، چاو پێکەوتن. پەڕ: پڕ، لیـپ، لێوانلێو. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٢- مدرا: وەستا. بێم: بووم. جە: لە. سام: هەیبەت، حەیبەت. لوان: ڕۆیشتن. واتە: من کە چاوم بە زوخاوی ڕەشی دەروونم تەڕ بوو و دڵم پڕ بوو لە ئارەزووی دیتنـی بـاڵای و کـەلاوی کردبـوو، بـە پێـوە وەستابووم و نە زمانم لە گۆ دەهات تا بتوانم گلەیی لێ بکەم و نە پێم لەبەر نەخشی جـوانی هێـزی ئەوەی بوو کە بتوانم بڕۆم و جێی بهێڵم.

٣- بیان: بووم. سوورەت: نەخشی دیمەنی مرۆڤ کە لەسـەر شـتێک بکێشـرێت. فـەرهاد کەنـدەی سـەنگ: وا قاوە کە فەرهاد نەخشی شیرینی لە ڕووی بەرد کێشاوە و لە شـێعری زۆربـەی شـاعێراندا ئاماژەی پێکراوە. مەولەوی دەفەرموێ:

هـێچ کـەس نـەواچۆ وە فـەرهاد ڕەنـدەن   نەقش شیرینش نـە ڕووی سـەنگ کەنـدەن
دەک ڕێزان دەس با وەر جـە گیـان سـەندەن   کێ ئەڵماس نە ڕووی دیدەی وێش شەندەن؟

٭ تێبینی: جارێکیان هەر لە خودی مامۆستا عەبدوڵڵای حەبیبیم بیست کـە فـەرمووی ئـەم دوو بەیتە شێعرە، شـێعری مامۆسـتا مەولـەوی نییـە و شـێعری کەسـێک بـە نـاوی «مڵکـەی مـوراد وەیس»ـە، بەڵام لە دیوانی مەولەویدا بە ناوی مەولەویەوە هاتووە. «وەرگێڕ».

-٥[1]-

بـــــه ڕەزانـــــــەوە، بـــــه ڕەزانـــــــەوە
ســـــا شـــێوەی کەســـێن بـــــه ڕەزانـــــەوە[2]

ئـــەو بـــــه ڕێـــزەی ڕاز، لــــەب گەزانـــــەوە
مـــــن بــــه ڕەنـــگ زەرد چـــوون خەزانـــــەوە[3]

---

ئەندام: ئەعزای لەش. ئادەم تەور: وێنەی مرۆڤ. دوان: دواندن، ئاخاوتن، قسـه کـردن. واتـه: بووم به وێنەی نەخشی مرۆڤێک که فەرهاد له ڕووی بەرددا کێشابووی، جەستەم لـه مـرۆڤ دەچـوو بەڵام نه دەمتوانی قسه بکەم و نه دەنگێکم لێوە دەهات. مەبەستی ئەوەیه که لەوێدا وەستابووم و وشک بووم و نه دەمتوانی قسه بکەم و نه دەمتوانی بڕۆم و به جێی بهێڵم، به وێنەی نەخشـی ڕووی بەردم لێ هاتبوو که سەیری دەکەی له مرۆڤ دەچێت بەڵام گیانی نییه و نه دەتوانێت بجوولێت و نه دەتوانێت قسه بکات. له نوسخەی «ئێ»دا به جێی «دوور جه دەوا و دەنگ» نووسراوە «بـێ دەوا و بێ دەنگ».

-٥-

١- ک، ئێ، س، ب، ح، ڕ.

٢- ڕەزان: کۆی وشـەی «ڕەز»ە به مانای «باخ»، له بنەڕەتدا به مانای مێوی دێمییه بەڵام له دیـوانی بێسارانیدا «ڕەز» به گشتی به مانای باخ هـاتووە. واتـه: سـا ئـەوە شـێوەی کەسێکه کـه بـه نێـوە باخەکەدا دەگەڕێت. وێنەیەک که بێسارانی لێرەدا دەخوڵقێنێت ئەوەیه کەسێک له دوورەوە بڕوانێـت بۆ نێو باخێکدا و شێوەی یاری له نێو باخەکەدا ببینێت. لـه دیوانـه چاپکراوەکانـدا بـه جێـی «بـه ڕەزانەوە»، «به بەرزانەوە» نووسـراوە.

٣- ڕێزەی ڕاز: وردە قسه. لەب گەزان: لێو گەستن، ئاماژەیەی بۆ تووڕە بوون. چوون: وێنەی، وەک. واتە: ئەو خەریکی وردە قسه و لێو گەستن و تـووڕە بوونـه و مـنـیش بـەم ڕەنگـه زەردەوە کـه وەک ڕەنگی خەزان وایه، مامەتەوە.

ئـــەو بـــە پـــەروازەی، پـــەریـــان شـــێوە

مـــن دڵ هـــەزار زام ئـــەو پـــەری پێـــوە[١]

ئـــەو ســـلێمان تـــەخت، دەمـــاخ چـــوون دارا

من تەن مات نـە خـاک چـوون سـەنگ سـارا[٢]

تـــا کـــە ئـــەو یـــەک جـــار پـــەرواز نـــاز بـــی

مـــن ســـەد جـــار جـــە تـــەن گیـــانم پـــەرواز بـــی[٣]

یـــانێ چـــێش؟ یـــانێ جـــەو ســـاوە گیـــانم

نەشـــــیەن بـــــە تەنـــــدا، نیـــــەن ژیـــــانم[٤]

---

١- پەروازە: زرق و برق، هەر شتێک لـە دوورەوە زریقـە و بریقـەی بێـت، شـادی و خۆشـی. پـەری: بوونەوەرێکی ئەفسانەییە و مەبەست ژنی جوانە. پەری شێوە: کەسێک کە شێوەی بە وێنەی پـەری بێت. واتە: ئەو لە دوورەوە بریقەی دێت و کەیف خۆشە و شێوەی لە شێوەی پەری دەچێت و منـیش هەزار زامی ئەو پەریە وا بە دڵمەوە.

٢- سلێمان تـەخت: کەسـێک کـە تـەختێکی وێنـەی تـەختی حـەزرەتی سـلێمانی ببێـت. دارا: داریوشی سێهەم کە یەکێک بوو لە پاشاکانی ئێران. سەنگ سارا: بەردی بیاوان. تەن: بەدەن، لاشـە. واتە: ئەو تەختی سلێمانی هەیە و بە وێنەی دارا دەماخی بەرزە و خۆش دەماخە و منـیش وێنـەی بەردی بیاوان لاشەم ماتە و وا لە نێو خاکدا.

٣- واتە: تا ئەو جارێک بە باڵی نازەوە باڵی گرت من سەد جار گیانم باڵی گرتەوە و لە لاشەم دەرچوو. مەبەستی ئەوەیە هێندە ناز دەکات من بە یەک جار ببینینـی ئـەو هـەموو نـازە سـەد جـار گیـان دەسپێرم.

٤- یانێ چێش: یانی چی. جەو ساوە: لەو کاتەوە، لەو وەختەوە. نەشیەن: نەڕۆیشتووە، نەڕۆیـیوە☜

دەلیـــل شـــۆ واچـــە بـــەو هـــاڵ نەزانـــە
گونامـــان چێشـــەن ئـــی لـــەب گەزانـــە [1]

☆☆☆

---

☜ نەچووە. نیەن: نییە. واتە: ئەم قسە کە کردم یانی چی؟ یانی ئەوە لەو کاتەوە چاوم بەو هـەموو نازە کەوتووە و گیانم دەرچووە، هێشتا نەچوەتەوە نێو لاشەم و هەر لەبەر ئەویشە ژیانم بۆ نەماوە. لـە سەرچاوەی «ح»دا ئەم بەیتە نییە.

١- دەلیل: چاوساغ، ڕێنەما، کاتێک شاعێر خۆی ناتوانێت بڕوا بۆ لای یارەکەی یا ناتوانێـت قسـەی لەگەڵ بکات بـە خـەیاڵ کەسـێک دەنێرێـت بـۆ لای. زۆربـەی شـاعێران ئـەو کەسـە خەیاڵییـەیان «شەماڵ»ـە بەڵام بێسارانی زۆرکات بە جێی ئـەوە بـە شـەماڵ بڵێـت بـڕوات و کـارێکی بـۆ بکـات «دەلیل» دەنێرێت کە جگـە لـەوەی دەتوانێـت بـڕوات ڕێگـە زانیشـە و ون نابێـت. لـە ئـەدەبیاتی کلاسیکیشدا «دەلیل» جێگەی تایبەتی هەیە:

دەلـــیلم کیاســـت ڕاگـــە ڕازنـــۆ     نـــەزانام دەلیـــل شـــەڕ هۆرخێزنـــۆ

(یا:

دەلـــیلم هـــەنارد بـــۆم بێنـــێ هـــەواڵ     دەلیـــل هاتـــەوە وێنـــەی کـــەڕ و لاڵ

فولکلۆری کوردی). «وەرگێڕ»

شۆ: بڕۆ. واچە: بڵێ، بێژە. هاڵ نەزان: حاڵ نەزان. گونا: تاوان، گوناح. چێشـەن: چییـە. ئـی: ئـەم. واتە: بڕۆ بڵێ بەو کەسە کە هیچ ئاگای لە حاڵی ئێمە نییە (یار) مەگەر تاوانی ئێمە چییە کە بـەم جۆرە لە دەسمان عاجز و تووڕەیە و لێومان لێ دەگەزێت.

-٦[١]-

بـــە جەســـتەم یـــاران!، بـــە جەســـتەم یـــاران!
شـــەڵڵا کـــەس نـــەبۆ بـــە جەســـتەم، یـــاران![٢]

مـــــەگرێۆ بـــــە تـــــاو وێنـــــەی وەنـــــداران
جـــــە ئـــــەزرەت بـــــاڵای ســـــپی چنـــــاران[٣]

دەروون کـــوورەی گـــڕ، دەهـــەن پـــەڕ جـــە دوود
تەن سووراخ چوون مەجمـەرەی عـوود[٤]

---

-٦-

١- ئێ، ک.

٢- شەڵڵا: ئیشەڵڵا. نەبۆ: نەبێت. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٣- مەگرێۆ: دەگرێت، دەسووتێت. وەندار: داری وەن. ئـەزرەت: عـەزرەت، حەسـرەت، تاسـە. سـپی چنار: سپیدار، سوورە چنار. واتە: ئەی یاران بەڵکوو هیچ کەس بـە وێنـەی لاشـەی منـی بـە سـەر نەیـەت وەک داری وەن بسـووتێت کـە تاسـەی دیتنـی سـوورە چنـاری بێـت. لێـرەدا شـاعێر خـۆی دەشوبهێنێت بە داری وەنەوە کە وا بە کەش و کێوەوە، ئەگەر خەڵک چڕ و چیلکەیان پێویست بێت ئەو دەبڕن و ئاگری دەدەن، تەنانەت زۆر جاران لەبەر ئەوە زوو وشک دەبێ و دەبێت بە چڕ و چیلکە و کەڵەدار بنجەکەی ئاگر دەدەن، و یاری شوبهاندووە بە سوورە چنارەوە کە وا لە باخدا ئاودێری دەکـەن و لە سێبەری دا دادەنیشن.

٤- مەجمەرە: مەنقەڵ، جێگەی ئاگر کردنەوە. عوود: چێوی دارێکە بە ناوی «بلسـان» کـە کاتێـک ئاگری دەدەی بۆنێکی خۆشی هەیە، هەر شتێکی بۆنخۆش. سووراخ: کـون. واتـە: دەروونـم وێنـەی کوورەیەکە پڕە لە گڕ و دەمیشم وێنەی قوڵەکوورە پڕە لە دووکەڵ و دووکەڵی لێوە دێـت، لاشەیشـم بـە وێنەی مەنقەڵ کون کونە کە شتێکی بۆنخۆشی تێدا دەسووتێت. ئەگەر سەرەنج بدەین داری ☜

دڵ تــێش مەســۆچۆ، بــاد بــۆش مــاوەرۆ
پــەخش نــە پــای چنــار باخــان مەکــەرۆ[١]

ســـپی چنـــاران بـــە ئاهـــەنگ ســـاز
چـــەنی بـــای شـــەماڵ، ئێـــذ مەکـــەران ڕاز[٢]

شـــەماڵ شـــۆ واچـــە بـــەو ئایرناکـــە
بـــەو دڵ ســـفتەی داخ، ســـینە چـــاک‌چاکـــە[٣]

ســـەد ســـاڵ بســـۆچۆ وەنـــدار داخـــان
چ پـــەروا دارۆ چنـــار جـــە باخـــان؟![٤]

☆☆☆

---

وەن کاتێک دەسووتێت بۆنێکی خۆشی هەیە. ئەڵبەت لێرەدا بێسارانی مەبەستی لەو بۆنە دڵی خۆیەتی کە دەسووتێت.

١- تێش: تێدا. مەسۆچۆ: دەسووتێت. ماوەرۆ: دەهێنێت. مەکەرۆ: دەکات. واتە: دڵم لەنێو مەنقەڵی لاشەم دا دەسووتێت و «با» بۆنەکەی دێنێت و لەبەر دەمی چناری نێو باخدا بڵاوی دەکاتەوە. مەبەستی ئەوەیە بڵێ ئاگادارین ئەوە ئەو دارە وەنەیە کە لە حەسرەتی دیداری ئێوەدا بە گڕ دەسووتێت.

٢- ئاهەنگ ساز: بەزمی خۆش، گۆرانی. چەنی: لەگەڵ. ئێذ مەکەران ڕاز: ئەم قسانە دەکەن. مانای ئەم بەیتە بەستراوە بە بەیتەکانی دوایی‌یەوە و مانای هەرسێ بەیتەکە پێکەوە دێت.

٣- شۆ: برۆ. واچە: بڵێ. ئایرناک: ئاگرتێبەربوو. سفتە: سووتاو. چاک‌چاک: لەت لەت.

٤- بسۆچۆ: بسووتێت. داخان: کەش و کۆ. پەروا: ترس. واتە: سوورەچنارەکان کە قەت گوێیان لێ نییە پاش ئەوەی لە شەماڵەوە هەست بە بۆنەکە دەکەن بە بەزم و ڕەزم و گۆرانی و ئاهەنگەوە

-٧-[1]

بـــە دامانـــت بـــۆ، بـــە دامانـــت بـــۆ
شـــا ســـوهیل! دەســـتم بـــە دامانـــت بـــۆ[2]

---

ئەمانە بە شەماڵ دەڵێن: شەماڵ! برۆ بەو ئاگر تێبەربوو و دڵ سووتاو و سینە لەت لـەت بـووە بڵێ ئەگەر سـەد ساڵیش دارەوەن بەو کەش و کێوە بسووتێت، سوورەچناری باخەکان چ باکێکیان هەیە و کوا گوێیان لێیە؟ مەبەستی ئەوەیە کە مەعشووق گوێی لە سـووتانی دڵـی عاشـق نییـە و هـەر خەریکی بەزم و ڕەزم و ئاهەنگی خۆیەتی. دوو بەیتی کۆتایی ئـەم پارچـە شـێعرە لـە سـەرچاوەکانی «ب» و «ح»دا لکاوە بە کۆتایی شێعری «ئەجەڵ داوم بۆ»ـەوە کە دیارە هەر دوو نوسـخەکە یـەک سەرچاوەیان بووە و بە هەڵە لەوێدا هاتووە. بۆ هەڵسەنگاندنی زیاتر سەیری پارچە شـێعری «ئەجـەڵ داوم بۆ» بکەن.

-٧-

١- ن، ک، س، ع، ب، ڕ، ئا، ح.

٢- بە دامانت بۆ: بە دامانت بێ. شا: پادشـا، حـوکم ڕان. سـوهیل: دووهـەمین ئەسـتێرەی گەشـی ئاسمان کە لە کۆتایی هاوین و سەرەتاکانی پاییزدا هەڵدێت و لە وڵاتە باکووریـەکانی گـۆی زەمیـنـدا دەبینرێت و زیاتر بە ئەستێرەی باشووری دەناسرێت. کاتی هەڵاتنی سەرەتا لە «یەمەن»دا دەبینرێت و هەر بەم هۆوە وتوویانە لە لای یەمەنەوە هەڵدێت. سوهیل لـە وشـەی «سـوهەیل»ی عەرەبییـەوە گیراوە و بە مانای «درەخشان»ـە. لەبەر ئەوەی لە سەرەتای پاییزدا هەڵدێت و ئەو کاتەیش وردە وردە ڕەنگی گەڵای داران بە زەرد و سوور دەگۆڕدرێت لە قەدیمدا وتوویانە هەڵهاتنی ئەو ئەستێرە دەبێتـە هۆی زەرد و سووربوونی گەڵای داران و لەبەر ئەوە وتوویانـە «ڕەشـتەی سـوهیل»، واتـە سـوهیلە کـە گەڵاکان دەرێژێت و ڕەنگیان دەگۆڕێـت. ئـەم بابەتـە لـە شـێعری شـاعیرانێکی وەک «سـەیدی» و «بێسارانی» و هەروەها لە ئەدەبیاتی فولکلۆریش دا ڕەنگی داوەتەوە. شـا سـوهیل: لـە زۆر جێگـەدا بێسارانی بە جێی «سوهیل»، «شا سوهیل» بەکار دەبات چونکە سوهیل بە پاشـای پـاییز دادەنێـت. واتە: ئەی ئەستێرەی سوهیل دەستم بە داوێنت بێـت. لـە دیوانـە چاپکراوەکانـدا بـە جێگـەی «شـا سوهیل»، «سا سوهیل» هاتووە، کە ئەگەر وای دانین ماناکەی ئەبێتە «دە سا ئەستێرەی سوهیل

ئەوسە جە یەمەن بەرئامانت بۆ

ئەوەڵ ڕەشتەی سەڵو خەرامانت بۆ[1]

شا سوەیل! سەرەم نە ڕات توفەیل بۆ

ئانە مەڕەژی با باڵای لەیل بۆ[2]

خەزان مەڕەژی، زوو مەڕێزیۆ

لەیل نە مەڕێزیۆ، نە مەبێزیۆ[3]

❊❊❊

---

☛ دەستم بە داوێنت بێت».

١- ئەوسە: پاشان، دوای ئەوە. بەرئامان: هەڵهاتن. ڕەشتەی: ڕەنگ کردن. سەڵو: گوڵی پۆپەکەڵەشێر، گیایەکی جوان کە گوڵی زەرد و سوور و وەنەوشی هەیە و بە فارسی «تاج خروس» و «زلف عروسان»ی پێ دەڵێن. خەرامان: بە لار و لەنجە ڕۆیشتن. سەڵو خەرامان: مەبەستی یارە کە وەک گوڵی سەڵو جوانە و بە ناز و لار و لەنجەوە دەڕوات بە ڕێدا. واتە: پاش ئەوەی لە یەمەنەوە هەڵهاتی یەکەم شتێک کە دەیڕەشێت با یاری سەوڵ قامەت بێت. دەکرێت بەم جۆرەیش مانا بکرێتەوە کە هەر مەبەستی ئەوە بێت کە «گوڵی سەڵو» بڕێشێت بەڵام ئەو کاتە (پاییز) سەڵو گوڵی نەماوە ڕشتنیش زیاتر بۆ گەڵای دارەکان بەکار دەبرێت و لە بەیتی دوایشدا دەڵێت کە مەبەستی لە «سەڵو خەرامان» چییە.

٢- ڕات: ڕێگەت. توفەیل: لە بنەڕەتدا ناوێکی عەرەبییە بە مانای کەسێکە بەبێ هەواڵ دان ببێتە میوانی ماڵێک بەڵام لێرەدا بە مانای «فیدا» و «قوربانی»بوونە. لەیل: لەیلا، خۆشەویستە ناودارەکەی مەجنوون، لێرەدا مەبەست یارە. واتە: ئەی سوەیل سەرم قوربانی ڕێگەت بێت ئەوەی دەیڕێشیت با باڵای لەیل(یار) بێت.

٣- خەزان: گەڵای دار. مەڕێزیۆ: دەڕژێت، دەوەرێت. مەبێزیۆ: نابێزرێت، لەبەر چاو ناکەوێت.☛

-٨-[1]

بـــەڕەزایێو هـــەن نـــە ســـای کەمـــەردا
پەخشـــەن، پەڕکەنـــدەن، بـــە ســـەراندەردا [2]

چـــوون زڵـــف یـــاران ســـاف ســـەراوێز
مـــەگێڵۆ نـــە دەور تۆفـــان ســـوب خێـــز [3]

گـــا گـــرژ و لوولـــەن چـــوون زڵـــف نمنـــاک
گـــا بـــاد مەکـــەرۆش تاتـــا جـــە هـــەم تـــاک [4]

---

☜ واتە: ئەی سـوەیل تۆ گەڵای داران دەڕێشیت کە زوو خەزان ئەکەن و دەوەرن بەڵام لەیل (یار) نە دەوەرێت و نە دەبێزریەت.

-٨-

١- ن، ک، س، ح، ب، ڕ، عم، مج.

٢- بەڕەزا: گیاییێکە کە لە بەهاراندا لەسەر کێو و بەرددا دەڕوێت. پەخشەن: بڵاوە. پەڕکەندەن: پەلی ڕاکێشاوە. سەرانداز: شوێنێکی هەڵەموت و سەخت کە کەم کـەس دەتوانێـت پێیـدا هەڵگـەڕێت. لەبەر ئەوە پێی دەڵێن «سەراندەر» یـانی لـە سـەران (کـۆی وشـەی سـەر) دەمـاڵێ، ئـەو جێگایـە هەمیشە بە جۆرێکە کە لە کێوەکە هاتوەتە دەرەوە و بەڕەزایش زیاتر لەو جۆرە شـوێنانەدا دەڕوێـت و کەم کەس دەستی پێ دەگات و دەتوانن هەڵیبکەنن. واتە: بەڕەزایەک هەیە لە سـای بـەرد و کێـودا ڕواوە و پەخش و بڵاوە و پەلی ڕاکێشاوە وا بە «سەراندەرە»ـەوە.

٣- چوون: وێنەی، وەک. زڵف: زوڵف، پرچ، قژ، کەزیە. سەراوێز: شۆڕ، ئاوێزان. تۆفان سـوب خێـز: تۆفانێک کە لە بەیاندا هەستێت. واتە: بەڕەزاکە بە وێنەی زوڵفی یار سافە و لە سـەر تـا بـە خـوار ئاوێزان بووە و «با»ی توندی بەیانی بە دەوریدا هەڵدەخولێت.

٤- گرژ: کرژ، بەرانبەری خاو. نمناک: نمدار. مەکەرۆش: دەیکات. تاتا: تاڵ تاڵ. تاک: جودا ☜

بەرمـــەیۆ نـــە پـــای بـــەرزەمـــەغاران
شـــەماڵ مەشـــانۆش چـــوون زڵـــف یـــاران[١]

شـــێوەی بـــەڕەزا هـــا بـــەو زڵفـــەوە
بـــەو زەنجیـــرەی زڵـــف دەســـت تڵفـــەوە[٢]

☆☆☆

-٩[٣]-

بـە کـەم، کـەم کـەردم، بـە کـەم، کـەم کـەردم
کۆکـۆ، کـۆی خـەمان، بـە کـەم، کـەم کـەردم[٤]

---

☜ کراوە. مەکەرۆش: دەکات. واتە: بەڕەزاکە جارجار کرژ و لوولە و بە وێنەی زوڵفێکە کە نمی پێوە بێت و لوول بووە و جارجاریش بایەک دێت و لێی دەدا و تاڵ تاڵ و لە یەکی جودا دەکاتەوە.

١- بەرمەیۆ: دەردێت، دەڕوێت. مەغـار: ئەشـکەوت. مەشـانۆش: دەیشـەکێنێتەوە. واتـە: لەبـەر دەمی ئەشکەوتدا دەڕوێت و شەماڵ وێنەی پرچی یار دەیخاتە لەرە و دەیشەکێنێت بەم لاولادا.

٢- تڵف: منداڵی بچووک، کۆرپە. واتە: دیتن و شێوەی ئەو بەڕەزا لـەو زوڵفانـە دەچێـت، کـە وەک زنجیر وا بە دەستی ئەو کۆرپە ساواوەوە. شاعیر بە نەزاکەتێکی جوان و بـێ وێنـە بـە جێـی ئـەوەی زوڵفەکان بشوبهێنێت بە بەڕەزاکەوە بە پێچەوانەوە بەڕەزاکە دەشوبهێنێت بە زوڵفی یـارەوە کـە ئەمـە پێی دەڵێن «تەشبیهی مەقلووب». هەروەها شوبهاندنی بەڕەزا بە زوڵفی یار نیشاندەری ئەوەیـە کـە بەڕەزاکەیش وەکوو زوڵفی یار وایە، شوێنی سەختە و دەست پێ گەیشتنی ئەستەمە.

-٩-

٣- ک، س، ح، ب، ن، ر.

٤- کەم: بێژنگ. کەم کەردم: کەمم کردەوە، کردم بە بێژنگدا. کۆکۆ: کێو بە دوای کێـودا. کـۆی: کـێو. واتە: یەک یەک خەمەکانم کرد بە بێژنگدا و خەمە وردەکانم لابرد و درشتەکان مانەوە ☜

مـــــن مـــــن، منـــــامن، هـــــوون دڵ وەردم
پـــەی پـــەی، پەیاپـــەی، داخ وە گـــڵ بـــەردم[١]

ســـەد مـــەردەم مـــەردەن، ســـەد کۆسـم کەفتـــەن
هـــیچ کـــەس ئـاخ و داخ جـە مـن نەشـنەفتەن[٢]

ئـــــــاخ ئـــــــاخ و داخ داخ، وەی وەی و ڕۆ ڕۆ
هـــەر هەشـــت بـــە غـــەزەب لـــێم بیـــەن بـــە کـــۆ[٣]

---

بۆ خۆم. دەکرێت وەهایش مانای کەیتەوە کە کۆی خەمەکانم وردە وردە کەم کردەوە! دیارە کە لە ناو بێژنگدا خاک ناوەستێت و کەس ناتوانێت بە بێژنگ خاکێکی زۆر لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە ببات و کەمیان بکاتەوە. واتە خەمەکانم هەر ماون و وان لە سەر جێگای خۆیاندا هیچیان لێ کەم نەبوەتەوە.

١- من: مەن، سێ کیلۆ، بەڵام ئەوسا لە مەیخانەدا جامێک هەبووە با ناوی «جام شراب یک منی» کە لە شێعری شاعێرە فارسەکاندا بە تایبەت حافزی شیرازی زۆر هاتووە و بڕی ٧٥ گرم شەرابی گرتووە، چون بێسارانی لێرەدا باسی خوێنی دڵ دەکات وا دیارە مەبەستی ئەو مەنەیە، واتە بڕێکی زۆر. منامن: مەن بەسەر مەندا. هوون: خوێن. وەردەم: خواردم. گڵ: قوڕ، لێرەدا مەبەست خاکی گۆڕە. واتە: مەن مەن و مەن بەسەر مەندا خوێنی دڵم خواردەوە و پەی پەی و بێ وچان بێ قەراریم بردەوە تۆی گڵ. مەبەستی ئەوەیە بەو هەموو خەمەوە مردم.

٢- مەردەم: مردووم، ئەو خزمانەی لێم مردوون. مەردەن: مردووە. کۆس: بەخت. کۆس کەفتەن: کۆس کەوتن، ئازیز مردن. کاتێک کەسێک ئازیزێکی دەمرێت دەڵێن «کۆسی کەوتووە». نەشنەفتەن: نەبیستووە. واتە: سەد کەسم لێ مردووە و سەد کۆسم کەوتووە بەڵام تاکوو ئێستا کەس ئاخ و داخێکی لێم نەبیستووە.

٣- وەی وەی و ڕۆڕۆ: دەنگێکە کاتێک کەسێک کەسێکی لێ دەمرێت بە زمانی دەهێنێت.

قیبلـــەم جـــە دووریـــت یەنـــدە داخـــم بـــەرد
خـــەیاڵ بـــە داخـــمای خـــەمان شـــادم کـــەرد [1]

❋❋❋

-١٠-[2]

بـــەی گشـــت دەردەوە، بـــەی گشـــت دەردەوە
بـــەی گشـــت زامـــەوە، بـــەی گشـــت دەردەوە [3]

بـــەی جەســـتەی خـــەمین، ڕەنـــگ زەردەوە
هـــا جـــە نـــۆ قـــەبرم ئـــاوا کـــەردەوە [4]

---

☜ غەزەب: قین، رق. کۆ: جەم، جەمع. واتە: هەرچەند تا ئێستە سەد کەسم لێ مـردووە و سـەد کۆسم کەوتووە و تا ئێستا کەس ئاخ و داخێکی لێم نەبیستووە بەڵام ئێستە لە دووری تـۆ ئـاخ ئـاخ، داخ داخ، وەی وەی و ڕۆڕۆ هەر هەشتیان بە قینەوە لای من کۆریان بەستووە.

١- یەندە: هێندە، ئەوەندە. بەرد: برد. داخما: شوێنێک کە بە هۆی داخ کردنـەوە بەسـەر جەسـتەوە دەمێنێتەوە. واتە: قیبلەم! لە دووری تۆ هێندەم ئاخ برد بـە دڵـدا کـە ئێسـتە خـەیاڵم شـوێنی داخ کراوی خەمەکانتم نیشان دەدا و پێیان شادم دەکاتەوە.

-١٠-

٢- ن، ک، ئێ، س، ب، ع، ل، ح، ڕ، ج، عم.

٣- بەی: بە ئەم، بەم. گشت: هەموو. واتە: بەم هەموو دەرد و زامەوە.

٤- ها جە نۆ قەبرم.....: پێشتر مردبووم! ئەوە دیسان مردمەوە. واتە: بەم جەستە خەمگین و ڕەنگە زەردەوە ئەوە دیسان دەمرمەوە و سەر لە نوێ گۆڕم ئاوەدان دەبێتەوە.

بامانەت ئەوسا وە قەبرم بەران

نیشانەی جەستەی خەستەم بکەران[١]

بە وەڵگ خەزان بپۆشان سەنگم

تا نیشانە بۆ جە زەردی ڕەنگم[٢]

کۆنە کەمانان باوەران وە بەر

هەر یۆ خەمتەرەن بنیانێم وە سەر[٣]

بنیان وە سەرم کۆنە کەمانێ

ئەو جە قامەتم دارۆ نیشانێ[٤]

---

١- بامانت: بە ئەمانەت، ئاگادار بن. خەستە: بریندار، ماندوو، هیلاک. واتە: ئاگادار بن پاش ئەوەی کە دەمبەن بۆ گۆڕ نیشانەیەک بۆ ئەم لاشە بریندار و ماندووم دیاری بکەن.

٢- وەڵگ: گەڵا، بەرگ. بپۆشان: بپۆشن، داپۆشن. سەنگ: کێل، ئەو بەردە گەورەی بۆ دیاری کردنی گۆڕ دایدەنن. واتە: لە گەڵای دارە خەزان لێدراوەکان کێلی گۆڕەکەم بپۆشن تا هێما و نیشانەیەک بێت بۆ ئەوەی کە من بە ڕەنگ زەردییەوە مردووم.

٣- باوەران: بهێنن، بێنن. هەریۆ: هەریەک. خەم: لار، چەماو. بنیانێ: بنن، بینن. واتە: کۆنە کەمانەکان بخەنە ڕوو و پێدا بگەڕێن هەرکامیان لارتر و چەماوتر بوو لەسەر گۆڕەکەمی دابنن.

٤- واتە: کۆنەکەمانێک بێنن و لەسەر گۆڕەکەمی دابنن کە ئەو کۆنەکەمانە هێمایەکە بۆ قامەتی لاری و چەماوی من. مەبەستی ئەوەیە کە قامەتم لە ژێر باری خەمدا لار و چەوت بووە.

تـــا وینـــان خـــەزان چـــەفتی کـــەمانم
بزانـــــان کوشــــتەی دەرد خـــــەمانم[١]

✲✲✲

-١١[٢]-

بێدەرد چێش بە وێش؟ بێدەرد چێش بە وێـش؟
بێدەرد چێش واچـۆ؟ چـێش کـەرۆ بـە وێـش؟[٣]

جـارێ بـە نـاواک ئـەبرۆی کـەمان کـێش
نەبیـەن بـە جەسـتەی جگـەرپارەی ڕێـش[٤]

---

١- وینان: ببینن. چەفتی: لاری، چەوتی. بزانان: بزانن. واتە: تا گەڵای خەزان لێدراوی دارەکـان کـە کەوتوونەتە سەر گۆڕەکەم، لاری کەمانم ببینن با بزانن کە کوشتەی دەرد و خەمم.

-١١-

٢- ک، ئێ.

٣- چێش بە وێش: چی بە خۆی. واچۆ: بڵێ، بێژێ. چێش کەرۆ: چی بکات. واتە: بـێ دەرد و ئـازار قسەی نییە بۆ کردن، چی بڵێ و چی بکا لە خۆی؟

٤- ناواک: کۆی وشەی ناوەک بە مانای تیر، تیرەکان. کەمان کێش: وێنەی کەمان کێشراو. نەبیـەن: نەبووە. ڕێش: بریندار، زامدار. واتە: جارێک بە تیرەکانی ئەبرۆی یار کە وێنەی کەمانە، نەپێکراوە و وەک لاشەیەک کە جەرگی کوت کوت بێت نەبووە و زامدار نەبووە. مەبەستی ئەوەیە کە بێـدەرد تـا ئێستە تیری ئەبرۆی یاری بەرنەکەوتووە جەرگی کوت کوت نەبووە ئیتر چی هەیە بۆ وتن و پێناسەی خۆی بە چی بکات.

نەدێـــەن بـــە وێـــوە شـــەوێ جـــە خـــاوێ
دیـــدەی پـــەڕ جـــە زوخ ، ناڵـــەی ســـەراوێ[١]

چـــوون یانـــە وێـــران فـــرە بـــێ دڵـــەن
گـــوڵ جـــە لاش خـــارەن، خـــار جـــە لاش گوڵـــەن[٢]

وێنـــەی سەرســـامان ســـەخت ســـەرگەردان
بـــــەری جـــــە گـــــرۆی ســـــاحیب دەردان[٣]

وەلـــی هـــا، بـــێ ســـۆز، بـــێ شـــێوە و دەردەن
ڕازەش چـــوون هـــەوای زمســـتان ســـەردەن[٤]

---

١- نەدێەن: نەیدیوە، نەیبینیوە. بە وێوە: بە خۆوە، بە خۆیەوە. واتە: بێدەرد و ئازار تا ئێستە لە خەویشدا دیدەی پڕ لە زووخاو و ناڵەی سەراوی بە خۆیەوە نەبینیوە.(ئیتر مانای خۆی بە چی ئەنێ و چیی هەیە بۆ وتن).

٢- چوون: وێنەی، وەک. یانە وێران: ماڵ وێران، ماڵ کاوڵ، زیاتر بە کەسێک دەڵێن ژنی مردبێت. فرە: زۆر. جە لاش: لە لای، لە کن ئەو. واتە: وەک کەسێک کە ماڵی وێران بێت، بێ دڵە و دڵی نییە و گوڵی بەلاوە دڕووە و دڕووی بەلاوە گوڵە. یانی جیاوازی نێوان جوانی و ناشیرینی و چاکی و خراپی نازانێت.

٣- سەرسامان: کەسانێک کە سەرەگێجەیان هەیە و خول دەخۆن و سەرسامیان گرتووە. بەری: بێبەش. گرۆ: دەستە، تاقم. واتە: بێدەرد وێنەی کەسێکە کە سەرەگێجەی گرتووە و خولی بدەن و زۆر سەرگەردان بێت لە ناو دەستە و تاقمی ئەوانە کە خاوەنی دەردن، بەریە و لە دەستەی ئەوان نییە.

٤- وەلی: بەڵام. ڕازش: قسەکردنی. واتە: ئەو بێدەردە و هیچ سۆزێکی نییە کە ئەگەر کەسێک بە نیاز بێ بەو شێوە و سۆزە بیناسێت و بزانێت کە بێدەردە، بەڵام کاتێک لەگەڵی بدوی قسە کردنی☜

هەر کەسێ یـەک سـات چـەنیش هامدەمـەن
ئـەو سـاعـەت عـومرش نـە ئاڵـەم کەمـەن[1]

☆☆☆

-١٢-[2]

بینـــایی دیـــدە!، بینـــایی دیـــدە!
ڕۆشـــنی نووربـــەخش!، بینـــایی دیـــدە![3]

بـــاڵا ســـپیسـەڵو شاپەســـەندیدە!
فرشـــتەی شـــەریف حـــەقئافەریـــدە![4]

---

☜ وەک کەش و هەوای زستان ساردە و ئەتوانی بەوە بیناسیتەوە.

١- چەنیش: لەگەڵی. هامدەم: دۆست، هاوڕێ. نە: لە، (فارسی: دَر). ئاڵـەم: عالـەم، دنیـا. واتـە: هەرکەسێک ساتێک لەگەڵ بێدەرد هاودەم بێـت ئـەو سـاتەی بـە فیـرۆ ڕۆیشـتووە و وەکـوو ئەوەیـە لەخۆیەوە لە تەمەنی کەم بووبێتەوە و ئەو سەعاتە لە دنیادا نەبووبێت.

-١٢-

٢- ن، ک، نێ، س، ب، م، ل، ح، ی، بر.

٣- نووربەخش: ڕۆشنایی دەر. واتە: ئەی کەسێک کە بـۆ مـن وەک ڕۆشـنایی چـاوانی و ڕۆشـنایی ئەبەخشی بە چاوانم . ئەی نووری چاوانم.

٤- سەڵو: گوڵی پۆپەکەڵەشێر،گیایەکی جوان کە گوڵی زەرد و سوور و وەنـەوش ئـەکا و بـە فارسـی «تاج خروس» و «زلف عروسان»ی پێی دەڵێن بەڵام نازانم بە هۆی چییەوە بێسـارانی لێـرەدا دەڵێـت «سپی سەوڵ» چون سەڵو گوڵی سپی نییە و زیاتری گوڵەکانی وەنەوشـە. شاپەسـەندیدە: کەسـێک کە پاشا پەسـندی بکات، ناوی گوڵێکی جوانیشە کە «شاپەسەند»ـی پێ دەڵێن و گوڵی جـوانی بـە ڕەنگی زەرد و سوور و وەنەوش و شین و سپیی هەیە. شەریف: پلە و پایە بەرز. حەق ئافەریدە: ☜

دیـــده ئـــاهووی وەحـــش بیابـــان وەتـــەن!
ســـونبوڵ چەڕیـــدەی ڕەوێڵـــەی خوتـــەن![1]

دەلیلـــەی ســـەرکێش دیـــدەوان دەیـــر!
پەڕەنـــدەی پـــەرواز، باڵـــدار وێنـــەی تـــەیر![2]

لـــەب جـــام یـــاقووت پـــەڕ جـــە مـــرواری!
دەنـــگ ڕێـــزەی شـــەربەت شـــەفای بـــیماری![3]

---

☜ دەستکردی خودا، دروستکراوی خوا. واتە: ئـەی کەسێک کـە لـە گـوڵی سـەڵو و شاپەسـەند دەچیت یا هێندە جوانی کە پاشا تۆی بە دڵە و پەسـەندت دەکـات و وەکـوو فریشـتە کـە دەسـتکاری خودایە پلە و پایەت بەرزە.

١- وەحش: وەحشی، دەستەمۆنەکراو، کێوی. سونبول: سمڵ، نـاوی گـوڵێکی جـوان و بـۆن خۆشـە. چەڕیدە: لەوەڕیا. ڕەوێڵ: دەستەمۆنەکراو، جودا بووەوە. خوتەن: ناوی ناوچەیەکـە لـە تورکسـتان کـە ئاسکی موشکـداری هەیە. واتە: ئەی کەسێک کە چاوت بە وێنەی چاوی ئاسکی دەسـتەمۆنەکراوە کە ژیانی وا لە بیابان و لەوەڕیشی گوڵی سونبوڵە و ئەی ئاسکی دەستەمۆنەکراوی خوتەن.

٢- دەلیلە: ناوێکی «مێ»یینەیە و لە وشەی «دەلیل»ـەوە گیراوە و بە مانای ڕێگەزان و ڕێنوێنە و یەکێکە لە دەستەواژەکانی ڕاوچیان کە بۆ کەڵێک بە کاری ئەبەن کە ڕابـەری گـەلی کـەڵان دەکـات و گەلەکە لە مەترسی دەپارێزێت. سەرکێش: لێرەدا بە مانـای ئـەو ئاژەڵەیـە کـە دەکەوێتـە بـەردەمی گەلەڕان و ڕێ نیشان دەریانە. دیدەوان: چاوەدێر، لێرەدا بە مانای نگابان و پاسەوانە. دەیـر: کـەش و کۆ. پەڕەندە: پەلەوەر، باڵدار. پـەرواز: بـاڵ گرتنـەوە. تـەیر: باڵـدار، پەلـەوەر. واتـە: ئـەی ئاسـکە پێشـکەوتوو و ڕێ نیشـاندەری گـەل و چـاوەدێری وڵات و ئـەی کەسێک کـە وێنـەی پەلـەوەر بـاڵ دەگریتەوە و گورج و گۆڵی و وەک پەلەوەرێکی کە باڵی هەیە.

٣- لەب: لێو، لچ. جام: کاسەیەک کە شەرابی پێ دەخۆنەوە. یاقووت: جەواهێرێکی سووری بە☜

هـــەر وەتـــەن لادێ مـــەگێڵیش پێـــدا
بـــۆی موشـــک نـــافش پـــەخش مـــەبۆ تێـــدا [1]

چـــمان جـــە ســـارای خوتـــەن چـــەردەنی
ئـــەو زێـــد ئـــاوا بـــۆ تـــۆش پـــەروەردەنی [2]

***

نرخە. مرواری: لێرەدا بە مانای ددانە. واتە: ئەی کەسێ کە دەم و لێوت وێنەی کاسەی شەراب خواردنەوەیە کە (لەبەر ڕەنگی سووری وائەزانی) لە یاقووت دروست کراوە و پڕە لە مرواری و دەنگ و قسەت وێنەی ڕێژەی شەربەتە کە مایەی خۆش بوونەوەی نەخۆشییە. لە نوسخەی «ک»دا بە جێگەی «دەنگ»، «ڕەنگ» نووسراوە.

١- لادێ: تاوێ. مەگێڵی: دەگەڕێ. موشک ناف: ماکێکی ڕەنگ ڕەشی بۆنخۆشە کە وا لە کیسەی پەنا ناوکی جۆرە ئاسکێک کە لە خوتەندا ئەژین و موشکی بە ناوبانگە. واتە: هەر نیشتمان و وەڵاتێک کە ساتێک پێیدا بگەڕێت بۆنی موشکی تێدا بڵاو دەبێتەوە. یانی تۆ لە ئاسکی خوتەن دەچیت. لە سەرچاوەکانی «ک» و «ل»دا جێی «پێدا» و «تێدا» ناڵ و گۆڕ کراوە بەڵام بە پێی مانای شێعرەکە بەم جۆرە کە نووسیومانە دروستە.

٢- چمان: وا ئەزانی، ئێژی. خوتەن: ناوی وڵاتێکە کە ئاسکی موشکداری هەیە و ئەو وڵاتەیش هەر بەم هۆوە ناوی دەرکردووە. چەردەنی: لەوەڕیاوی، لەوەڕیاگی. زێد: وڵات، وەتەن، نیشتمان. تۆش پەروەردەنی: تۆی پەروەردە کردووە. واتە: وا ئەزانی لە سارای وڵاتی خوتەندا لەوەڕیاوی کە بە هەر وڵاتێکدا بگەڕێی بۆنی موشک دەگرێت، ئەو وڵاتە ئاوەدان بێت کە تۆی پەروەردە کردووە.

-١[1]-

پــــــاییز ئامــــــاوه، پـــــاییز ئامــــــاوه

ئـــــەودی نۆپــــاییز جـــــە نـــــۆ ئامــــــاوه[2]

بلـــــــەرمان ســـــــەرتەرز زەردی ڕامــــــاوه

عاشـــــــقان ســـــــەودای دەروون فامــــــاوه[3]

---

-١-

١- ن، ح، ک، ب، س، ڕ.

٢- ئاماوه: هاتەوه. ئەودی: دیسان. جە نۆ: لە نوێ. واتە:دیسان پاییز هاتەوه.

٣- بلەرم: بە ڕێک و پێکی مانای ئەم وشەمان بۆ ڕاست نەکراوه بەڵام بە پێی مانای شـێعرەکە و بـە پێی ئەوەی کە لە دوو جێگەی تریشدا هاتووه وا دیارە بە مانای «داری بەرز»ە یا ناوی جۆرە دارێکە کە ئێستە وای پێ ناڵێن و ئێمە بە مانـای «داری بـەرز» هێناومانـە. هـەروەها لـە پارچـە شـێعری «چراخ وه ڕەزان» و پارچە شێعری «نەوسوەیل باخان»یشدا هـاتووه. ڕامـای: خـەڵف کردنـەوه، وەچ کردنەوه. سەودا: مەراق، مەیلی زۆر، فکر و خەیاڵ. فامـاوه: تێگەیشـتن. واتـە: بـە هـاتنی پـاییز سەرتەرزی دارە بەرزەکان ڕەنگی زەردیان دیاری دا و ڕەنگی خەزانیان بە خۆیانەوه گـرت و عاشـقانیش فکر و خـەیاڵی دەروونیـان هاتـەوه بیـر و تێگەییشـتن چ باسـە. لـە سـەرچاوەی «ح»دا بـە جێـی «بلەرمان»، «بلەریان» نووسراوه و لە سەرچاوەی «ب»دا نیوه بەیتی هـەوەڵی بـەم جـۆرە نووسـراوه: «بوڵبوڵ پەرێ گوڵ مات و داماوه» و لە سەرچاوەی «ح»دا بەم جۆرەیە: «بلـەریان سـەرتەرز وەی ڕا ئاماوه» و لە هەمان سەرچاوەدا بە جێگەی «فاماوه»، «تاوناوه» و لـە سـەرچاوەکانی «ن»، «س» و «ب»دا «تاماوه» نووسراوه و لەوه دەچێ «تاماوه» دروست بێت بەڵام هەرچی گەڕاین ماناکەیمان بە دەست نەهێنا. لە نوسخەی «س»دا بە جێگەی «زەردی»، «سەوزی» نووسراوه.

قافڵـــەی ســـوهیل زیـــا جـــە یەمـــەن
کـــەردەوە ســـێوەنگ ســـەرتاپای چەمـــەن[١]

تەبـــەق تەبـــەق هـــەور ســـیای دوود تـــەم
نـــم دا ســـەرزەمین بـــە ســـەیلات خـــەم[٢]

---

١- سوهیل: دووهەمین ئەستێرەی گەشی ئاسمان کە لە کۆتایی هاوین و سەرەتاکانی پاییزدا هەڵدێت و لە وڵاتە باکووریەکانی گۆی زەمیندا دەبینرێت و زیاتر بە ئەستێرەی باشووری دەناسرێت. کاتی هەڵاتنی سەرەتا لە «یەمەن»دا دەبینرێت و هەر بەم هۆوە وتوویانە لە لای یەمەنەوە هەڵدێت. سوهیل لە وشەی «سوهەیل»ی عەرەبییەوە گیراوە و بە مانای «درەخشان»ـە. چون لە سەرەتای پاییزدا هەڵدێت و ئەو کاتەیش لەبەر ئەوەی ڕەنگی گەڵای داران بە زەرد و سوور دەگۆڕەرێت لە قەدیمدا وتوویانە هەڵهاتنی ئەو ئەستێرە دەبێتە هۆی زەرد و سووربوونی گەڵای داران و لەبەر ئەوە وتوویانە «ڕەشتەی سوهیل»، یانی سوهیلە کە گەڵاکان دەرێژێت و ڕەنگیان دەگۆڕێت. قافڵەی سوهیل: هەڵهاتنی سوهیلی شوبهاندووە بە قافڵێکەوە کە لە وڵاتی یەمەنەوە هاتووە و ڕەنگی خەزانی لەگەڵ خۆی هێناوە. زیا: هەڵهات. سێوەنگ: ڕەشێکی جوان و دڵپەسەند (زیاتر بۆ چاو و برۆ دەڵێن). واتە: قافڵەی سوهیل لە وڵاتی یەمەنەوە هەڵهات و ڕەنگی چەمەنی کردوە بە ڕەش. پێویستە بڵێین کە بە پێچەوانەی گەڵای داران کە سوهیل دەیکا بە زەرد و سوور، گیا سەرما دەیبات و ڕەنگی دەبێ بە ڕەش.

٢- تەبەق تەبەق: پەڵە پەڵە. دوود تەم: تەمی شوبهاندووە بە دووکەڵ. سەیلات: کۆی سەیلە بە مانای لافاو، لێرەدا بە مانای تاوە بارانە. واتە: پەڵە پەڵە هەوری ڕەش هات و تەمی بە وێنەی دووکەڵ پێیە، وردە وردە سەرزەمینی بە لافاوی خەمان تەڕ کرد. مەبەستی ئەوەیە کە لە پاییزدا دڵ تەمیار و دەروون تەمین و خەماوی دەبێت. دەتوانێ مەبەستی لە «سەیلات خەم» ئەو ئەسرینە بێت کە لەبەر خەمی دڵی تەم گرتوو لە چاوی دەڕژێت و ئەبێ بە لافاوی خەم.

قــــەترە قــــەترە نــــەرم هوونـــــاو وەشــــتەوە
جــــە ســــەدهەزار ڕەنــــگ خــــەزان ڕەشــــتەوە[١]

پــــەل پــــەل مــــەڕێزۆ مــــەگنۆ وە ڕووی ســــەنگ
بــــە ئــــەمر خــــالێق بــــێ دوا و بــــێ دەنــــگ[٢]

بــــــــــــەیان بوینــــــــــــان، زەردەدار دەرد
خــــــــــەزان زایــــــــــف، زافــــــــــەران زەرد[٣]

---

١- هووناو: خوێناو، خوێنی تێکەڵ بە ئاو. وەشتەوە: باریوە. ڕەشتەوە: ڕەنگی کرد، ڕەنگی گۆڕا. واتە: دڵۆپ دڵۆپ خوێنی دڵ کە تێکەڵی ئەسرینی چاوم بوو، لەم چاوانە بە سەد هەزار ڕەنگ هاتە خوارەوە و گەڵای دارانی ڕەنگ کرد. لێرەدا بێسارانی ئەسرینی خۆی دەشوبهێنێ بەو بارانەی کە لە پاییزدا دەبارێت. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هاتووە و هەر وەک دیارە بە بێ ئەم بەیتە مانای شێعرەکە ڕاست نابێتەوە. لە بەیتی دوایی‌دا ئەم باسە بە جوانی دیارە.

٢- پەل پەل: گەڵا گەڵا، بەرگ بەرگ. مەڕێزۆ: دەڕژێت. مەگنۆ:دەکەوێت. سەنگ: بەرد. بە ئەمر خالێق: بە ئەمری خودا. بێ دوا: بێ قسە. واتە: دانە دانەی ئەو گەڵانەی کە سوەیل ڕەژتوویە بە ئەمری خودا و بێ قسە و بێدەنگ دەڕژێن و دەکەونە سەر بەردی پای دارەکان.

٣- بەیان بوینان: وەرن ببینن. زەردەدار: کەسێک کە نەخۆشی زەردەیی هەیە. زایف: زەعیف، لاواز، بێ هێز، بێ گریک. زافەران: زەعفەران، بنی گوڵی گیایەکە بە ڕەنگی زەرد و هەر بە ناوی گوڵەکەوە پێی دەڵێن زەعفەران. لێرەدا بە واتای ڕەنگی زەردە. واتە: با خەڵک بێن ئەم دارانە ببینن کە بە وێنەی کەسێکن کە دەردی زەردوویان هەبێ و ئەم گەڵا لاواز و بێ هێزانە ببینن کە وەک زافەرانیان لێ هاتووە. دەکرێت ئاواش بڵێین کە مەبەستی خۆیەتی کە ڕەنگی زەرد بووە و بە وێنەی کەسێکە کە زەردوویی هەیە.

وەشـــڵەیم بـــە خـــەزان بـــە وێـــش مـــەبۆ زەرد
ئـــەو جـــە وادەی وێـــش، مـــن جـــە تـــاو دەرد [١]

٭٭٭

-٢-[٢]

پـــــاییز نمانـــــا ، پـــــاییز نمانـــــا
نیشـــانەش بـــە بـــاد ســـتەم نمانـــا [٣]

خـــەت غـــەزەبناک خـــەزانان وانـــا
پـــەل پـــەل و زار زار نـــە ڕووی خـــاک شـــانا [٤]

---

١- وەشڵەیم: خۆزگەم. بە وێش: بە خۆی. مەبۆ: دەبێ. واتە: خۆزگەم بە گەڵای پاییز کە خـۆی زەرد دەبێ و کەس کاری بە سەریەوە نییە و لە کاتی خۆیدا زەرد دەبێ، بەڵام من بە هـۆی زۆر بـوونی دەردە کە وەها زەردم. لە سەرچاوەی «ن»دا بە جێی «وەشڵەیم»، «وەشڵەی» نووسـراوە و لـە سـەرچاوەکانی «ح»، «ب» و «س»دا نووسراوە «وەشڵە».

-٢-

٢- ن، ح، ک، ئێ، س، ب، ڕ، عم.

٣- نمانا: نواندی. باد ستەم: بـای سـامناک و وێرانکـەر. واتـە: پـاییز نیشـانەی بـە هێنـانی بـای سامناک و وێرانکەر نواند.

٤- خەت غـەزەبناک: ئـەو دەسـتنووسـەی کـە حـاکم دەیـدا بـە دەسـتی جارچییـەوە و بـۆ خـەڵکی دەخوێندەوە و باسی مەحکووم بوونی کەسێکی تێدا بوو، لێـرەدا بێسـارانی پـاییزی شـوبهاندووە بـە حاکم و بای ستەمی شوبهاندووە بە جارچی و دار و گەڵادارەکەیشی شـوبهاندووە بـە مەحکوومـەکـە. وانا: خوێندەوە. پەل پەل: گەڵا گەڵا. زارزار: بە زەلیل کردن. شـانا: شـەکاندنەوە، ڕاشـەکاندن. واتـە: «با» وێرانکەرەکە ئەو دەستنووسە پڕ لە غەزەب و قینەی کە پاییز دابوویە دەستی و حوکمی ☞

چەنــدێو ســەرپا ســەوز وێنــەی ســەیێدان
چەنـدێو بـەرگ هـوونین وێنـەی شـەهێدان[١]

چەنــدێو بــە بارگــەی بــەرگ هوونــەوە
مــدرابێ چــوون چــەتر بــێ ســتوونەوە[٢]

ســەدهەزار ڕەنگــێ نــە مایەشــان بــێ
دڵــدار و بێــدڵ نــە سایەشــان بــێ[٣]

---

☜ مەحکووم بوونی گەڵاکانی تێدا بوو خوێندیەوە و گەڵاکانی یەک یەک و بە ناڕەحەتی لە دارەکان کەندەوە و خستی بە سەر خاکدا.

١- چەندێو: چەندێک، چەند. سەیێدان: کۆی وشەی «سەیید»ە، سەیی، ئەولادی پێغەمبەر(د.خ). بەرگ هوونین: جل و بەرگی خوێنین. شەهێدان: ئەوانەی کە لە ڕێگەی خودادا دەکوژرێن. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوەیە.

٢- بارگە: گۆڕی گەورە و خاسی خودا. مدرابێ: وەستابوو. بێ ستوون: بێ کۆڵەکە. واتە: چەند داری سەرتاپا سەوز بە وێنەی سەیید و چەند داری جل و بەرگ سووری وێنەی شەهیدان و چەند بە بارگە و جل و بەرگی خوێنینەوە وێنەی چەتر و دەواری بێ کۆڵەکە وەستابوون. مەبەستی ئەوەیە کە دارەکان هێندە لق و پۆپیان زۆر بوو وات ئەزانی دەوارە و بێ کۆڵەکە وەستاوە و مەبەستی لە کۆڵەکە لاشەی دارەکانە کە لە بەیتی داهاتوودا ئاماژەی پێ دەکات. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب» و «س»دا بە جێی «چەتر بێ ستوون»، «کۆی بێ ستوون» نووسراوە کە کاک حەکیم بە «شاخی بێستوون» مانای کردوەتەوە کە وا لە ڕۆژاوای شاری کرماشاندا. بە بڕوای من «بێ ستوون» یانی بێ کۆڵەکە چون باسی دارە و لە بەیتە دواییەکاندا ئاماژەی بە «چەتر» و «ستوون» کردووە.

٣- مایە: دەست مایەی کاسبی. دڵدار: مەعشووق. بێ دڵ: عاشق. واتە: ئەو دارانە، بەر لە هاتنی پاییز هەزاران ڕەنگ مایەیان بوو و عاشق و مەعشووق لە سایەیاندا دەحەسانەوە.

ناگـــا بـــادێ هـــات چـــوون حـــاڵ نـــەزانان
بـــڕیش گـــرد تـــەنـــاف چـــەتر خـــەزانان[١]

پـــارە پـــارەش کـــەرد وەڵـــگ جامـــەی دار
ڕێـــزە ڕێـــزە بـــی گشـــت ئامـــا بـــە وار[٢]

ســـــتوونان مەنـــــدەن ســـــەرتاپا ســـــیا
وێنـــەی غوڵامـــان جـــە حەبـــەش زیـــا[٣]

منـــیچ چـــوون ئـــەوان دەروون ســـوفتەنان
بـــە بـــاد جـــەفا ســـەد جـــار ڕوفتـــەنان[٤]

* * *

---

١- ناگا: ناناگا، کوتوپڕ. بادێ: بایەک. چوون: وێنەی، وەک. حاڵ نەزان: نەفام. بڕیش: پچڕانـدی. گرد: هەموو، گشتی. مانای ئەم بەیتە و دوو بەیتی دوایی پێکەوەیە.

٢- وەڵگ: گەڵا، بەرگ. جامەی دار: جل و بەرگی دار. ئاما: هات. وار: خوار. مانـای ئـەم بەیتـە لەگەڵ بەیتی پێشو و بەیتی دوایی پێکەوەن.

٣- ستوون: کۆڵەکە. مەندەن: ماوە. حەبەش: وڵاتی حەبەش. زیا: هـەڵهاتوو، هـاتوو. واتـە: پـاش ئەوەی گەڵای دارەکان وەرین، ساقەی دارەکان بـە وێنـەی کۆڵەکـەی دەوار بـە تـەنیا مانـەوە و وەکـوو غوڵامانێکیان پێ هات کە لە وڵاتی حەبەشەوە هاتبێتن، هەم ڕەشن و هەم ڕووتن. لاشـەی دارەکـانی هەم لە ڕووتی و هەم ڕەشی و سووتاوی‌دا شوبهاندوویە بەو غوڵامانەی کە لە حەبەشەوە هاتبێتن.

٤- سوفتە: سووتاو. جەفا: بێ وەفایی و بێ مەیلی یار. ڕوفتە: گزی دراو، گسک دراو، خاوێن کراوە، هەڵکەنراو. واتە: منیش بە وێنەی ئەو دارانە دەروونم سووتاوە و بە بای جەور و جەفای یار سەد جار گسک دراوم.

-٣-[١]

پەڕخومارشـــــەن، پەڕخومارشـــــەن
شـــیرین، دوو دیـــدەی پەڕخومارشـــەن[٢]

جەوپـــەی دیـــدە و دڵ ئێنتێزارشـــەن
فێشـــتەر مەیرشـــەن، کـــەمێو قارشـــەن[٣]

ئـــەر گـــاهێ بـــە سـێخ دڵ مـــەدۆ وە تـــێخ
مـــەیرش مەرهەمـــەن، نـــەدارۆ درێـــخ[٤]

-٣-

١- ک، ئێ، ن، ب، س، ح، ر.

٢- پەڕ: پڕ. خومارشەن: خوماریەتی. واتە: چاوی یار (شیرین) خومـار و مەستە. لـە نوسـخەی «ک» نیوە بەیتی دووهەم بەم جۆرەیە: «ئەو شیرین شێوە پەڕخومارشەن» و لە نوسخەی «ئێ»دا بەم جۆرە: «ئەو شیرین دیدەی پەڕخومارشەن» نووسراوە.

٣- جەوپەی: لەبەر ئەوە. ئێنتێزار: چاوەڕێ. فێشتەر: زیاتر، زۆرتر. مـەیر: مێهـر، خۆشەویستی. کەمێو: کەمێک. قار: تووڕەیی، عاجزی، لالووتی. واتە: لەبەر ئەوە دیدە و دڵ چـاوەڕێی دەکـەن کـە دۆستی و خۆشەویستی لە تووڕەیی و لالووتی زیاترە. لـە سـەرچاوەکانی «ح»، «ب» و «س»دا بـە جێی «مەیر»، «مەیل» و لە «ح»دا بە جێی «کەمێو»، «کەمتەر» نووسراوە.

٤- ئەر: ئەگەر. گاهێ: جارجار، جار و بار. مـەدۆ: دەدا، ئـەدا. مەرهـەم: مەڵهـەم، دەوا. نـەدارۆ: نیەتی. واتە: ئەگەر جارجار بە سیخ دڵم دەدا بە تێخەوە و دەیجنێ و کون کونی دەکات کێشـە نییـە چون دۆستی و خۆشەویستیی وەهایە مەڵهەمە بۆ زامەکانم و ئـەویش ئـەو مەڵهەمـەم لـێ درێـخ ناکات.

یانێ دڵ زایف بار دەرد بیەن
نیمەشەو کوشتەی ئاه سەرد بیەن[١]

ئەرنە زەڕێو مەیر ئەو سۆسەنخاڵە
وەسەن پەی مەرهەم زام سەدساڵە[٢]

☆☆☆

١- یانێ: یانی، واتە. بیەن: بووە. کوشتەی: کوژراوی. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا پێکەوەن.

٢- ئەر نە: ئەینا، ئەگینا، ئەگەر وانەبێ. زەڕێو: زەڕەیەک. سۆسەن خاڵ: کەسێک کە خاڵی بە وێنەی گوڵی سوێسنە بێت. وەسەن: بەسە. واتە: ئەگەر دەبینی کە دڵ خەریکی بەهانە گرتنە و چاوەڕێی شیرینە و پەلەیەتی بگات بە شیرین، لەبەر ئەوەیە بۆ هەڵگرتنی باری دەرد زایف و بێ هێز و بێ گرێک بووە و توانایی هەڵگری ئێشی دەردی نییە و کوژراوی هەناسەی ساردی نیوەشەوانە، ئەگینا خۆشەویستی و مەیلی شیرین مەڵهەمە و لە منی دریغ ناکات و زەڕەیەک لە خۆشەویستی ئەو سوێسن خاڵە بۆ مەڵهەمی زامی سەدساڵە بەسە. لە نوسخەی «ک»دا بە جێی «سەد ساڵە»، «چەند ساڵە» و لە سەرچاوەکانی «ح» و «ن»دا بە جێی «مەرهەم»، «شیفای» نووسراوە.

-٤-[1]

پەشـێو جـە پێکیـای نـاوەک ئەنـدازان!
چـە جـای تـۆ، نـە مـن دەروونـم ئـازان؟[2]

---

-٤-

١- ح، ک، ئێ، س، ب. ئەم پارچە شێعرە لە وڵامی شێعرێکی «پەشێو»دا نووسراوە. «پەشێو» شاعیرێکی هاوچەرخی بێسارانی بووە و لە نوسخەی «ک»دا لەسەری نووسراوە «پشیو در سوال»، لە نوسخەی «ئێ»یشدا هەر لەسەری نووسراوە «در سوال». هەر ئەو شێعرە لە پەراوێزی سەرچاوەی «ح»یش دا نووسراوە بەڵام بە ناوی «دەردین»ـەوە نووسراوە. لە نوسخەی «س»یشدا پێش شێعرەکەی بێسارانی هێناویە و لەسەری نووسراوە «مولانا دردین در سوال از مولانا بیسارانی» و بە دوایدا ئەم پارچە شێعرەی بێسارانی هێناوە و لەسەری نووسراوە «مولانا بیسارانی در جواب». لە نوسخەی «ک»یش دا بە دوای شێعرەکەی پەشێودا ئەم شێعرەی بێسارانیی هێناوە و نووسیویە «محزونی در جواب». ئەمەیش شێعرەکەی پەشێو بە پێی نوسخەکانی «ک» و «ئێ» کە هەندێ جیاوازی لەگەڵ سەرچاوەکانی «ح» و «س» و «ب»دا هەیە:

مـەولام پـێم هـاڵێ، مـەولام پـێم هـاڵێ     مـەولام دوور جـە تـۆ پـێم یـاوان هـاڵێ
سـا مایـەی عـومرم یـاوان وە سـاڵێ     دڵ بیـەن پێکیـای سۆسـەنی خـاڵێ
مودام هـەر دایـم ئـەر ڕۆن، ئـەر شـەوەن     چـوون قیبلـەنما ڕووم نـە ڕای ئـەوەن
خـەیاڵ خـاڵش فـام سـەندەن جـە دڵ     دڵ بـەردەن خـەیاڵ وسـتەن وە ڕووی گـڵ
دڵ پەروانە بـەخت نێـدٚ مەکـەرۆ مەشـق     بسـۆچنۆمان بـە ئـاهێر عەشـق
مـەولام تـۆ مـەولای گشـتین مـەولانی     هـومێم هـەر بـە تـۆن مـەولای ئـەولانی

٢- پەشێو: سەر لێ شێواو، هەروەها ناوی شاعیرێکیشە کە بێسارانی شێعری بۆ نووسیوە. جە: لە. پێکیای: پێکراو. ناوەک: تیر، ناوەک ئەنداز: تیر وەشێن، تیرەناز. واتە: ئەی کە لە تیری تێروەشێن سەرت لێ شێواوە، کەی من دەتوانم خۆم لە جێگەی تۆ دابنێم مەگەر من دەروونم ئازا و بە جەرگـە؟ واتە منیش بێ شک دەروونم ئازا نییە و ناتوانم خۆم لە جێگەی تۆ دابنێم. ئەگەر بە وردی ☜

ئــەر ســەد بــار ئێمــە خــاڵی خــەیاڵیم
جــە ســۆز ســەودای وەریــن بــەتاڵیم[١]

بــەڵێ چــوون زامــدار کۆنــەســاڵانیم
پێکیــای پــەری پــای ئــەوداڵانیم[٢]

هــەر وەختــێ ناگــا دیــدەتــەتارێ
نگــاهێ کــەرۆ لــێمان بــە تــارێ[٣]

---

☜ سەیری شێعرەکەی «پەشێو» بکەین لێرەدا پەشێو دەڵێت کە «ئێستە کە کۆتایی عومری منە و تەنیا ساڵێک لە عومرم ماوە و لەم وەختە تەنگەدا دڵم بە تیری سۆسەن خاڵێک پێکراوە و هیوام بە تۆیە کە دەرمانێک بێنی بۆ ئەم دەردەم و چارەی بکەی» ئینجا بێسارانیش دەڵێت منیش هەر وام لەو جێگەی تۆدا هەر وەهام بەسەر دێت و منیش دەروونم ئازا نییە. لە بەیتە دواییەکاندا ئەم باسە زیاتر روون دەبێتەوە.

١- ئەر سەد بار: هەرچەند. وەرین: پێشوو. بەتاڵ: ئازاد. مانای ئەم بەیتە بەستراوە بە سێ بەیتی دواییەوە. لە زۆربەی نوسخەکاندا بە جێی «وەرین»، «دەردین» نووسراوە.

٢- بەڵێ: بەڵام. چوون: وێنەی، وەک. پێکا: پێکراوی. ئەوداڵان: عەوداڵان، ناوی کێوێکە کە دەکەوێتە پشتی دێی دەرەکییەوە ئەڵبەتە ئەو «حەت ئەوداڵان»ی پێ دەڵێن. مانای ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو و دوو بەیتی دوایی پێکەوەن.

٣- دیدە تەتار: کەسێک کە چاوی بە وێنەی چاوی ئاسک جوان بێت. کەرۆ: دەکات. تار: تەرح، جۆر، شێوە. بە تار: بە جۆرێک، بە شێوەیەک. مانای ئەم بەیتە و دوو بەیتی پێشوو و بەیتی دوایی پێکەوەن.

زام کۆنــــەمان دیســـــان جـــــە نـــــۆوە
چـــــەنی دەرد مـــــەرگ تـــــازە مـــــەبۆوە[1]

سـا تـۆ چـوون بـەی تـەور هـاڵێ پێـت یـاوان
زام نــــۆ کـــــەردەن، دەروونـــــت ئـــــاوان[2]

شــــەرت نیــــەن جۆیــــای داروی زامــــان بــــی
خــاس ئێــدەن جــەی زام، زوخــین دامــان بــی[3]

---

۱- چەنی: لەگەڵ. مەبۆوە: دەبێتەوە. واتە: هەرچەند خەیاڵم لەو شتەی کە تۆ باست کردووە خاڵیە و ئێستا من گرفتاری تیری سووسەن خاڵان نیم و لە سۆزی سەودا پێشووەکان ئازادم، بەڵام لەبەر ئەوەی زامداری پێشووم و پێکراوی پەریی داوێنی کێوی عەوداڵانم، هەر کاتێ بێ ئاگا چاو جوانێکی وەک چاوی ئاسک دەبینم زامی کۆنەم لەگەڵ دەرد و ئازاری مەرگدا تـازە دەبێتـەوە. مەبەستی ئەوەیـە هەرچەند کە ئێستە بە وێنەی تۆ نیم بەڵام دەزانم دەردت چییە و لێت حاڵیم.

۲- بەی تەور: بەم جۆرە، بەم شێوە. هاڵ: حاڵ. کەردەن: کردووە. ئاوان: ئاوەدانە. واتـە: دەسـا کاتێـک ئەم حاڵەت بەسەر هاتووە ئەوە کاری زامی تازەیە و دەروونت ئاوەدانە. لە سەرچاوەی «ح»دا پێش ئەم بەیتە، بەیتێکی تری هێناوە کە بەیتی کۆتـایی شـێعرەکەی «پەشـێو»ــە کـە بـە هەڵـە لکـاوە بـە شێعرەکەی بێسارانییەوە و ئەمەیش بەیتەکە:

مــەولام تــۆ مــەولای گشــتین مــەولانی     هــومێم هــەر بــە تــۆن مــەولای ئــەولانی

دیارە کە ئەم بەیتە هیچ پەیوەندی بە شێعرەکەی بێسارانییەوە نییە و لە هیچ کـام لـە سـەرچاوەکاندا (جگە ە «ح» و «س») لە ناو شێعرەکەی بێسارانیدا نەهاتووە.

۳- شەرت نیەن: دروست نییە، جوان نییە. خاس ئێدەن: باش وایە، بـاش ئەمەیـە. جـەی زام: لـەم زامەوە. زوخین: زوخاوی. واتە: ئێستە کە تۆ وەهات بە سەر هاتووە دروسـت نییـە کـە بـە شـوێنی دەرمانی زامەکانتەوە بی، خاستر وەهایە دامانت بەم زامەوە زوخاوی بێ و زامەکانت دەرمان نەکەی.

چ وەشـــەن نەفـــەس چـــەنی ئـــێش زام
بەرشـــۆ، بیـــاوۆ ســـاحیب زام بـــە کـــام[١]

✡✡✡

١- چ وەشەن: چەند خۆشە. چەنی: لەگەڵ. بەرشۆ: دەربێ، دەربچێت. بیاوۆ: بگـات. کـام: ئـارەزوو، ئاوات، مەیلی زۆر، تاسە. واتە: ئای کە چەند خۆشە یـەکێک لەگـەڵ ئێشـی زامەکـەی هەناسـەی دربچێت و بمرێت تا خاوەن زامەکە بە ئاواتی خۆی بگات. مەبەستی لە هەناسە دەرچـوون مردنـە و بە نیازە ئەوە بڵێت وەک چۆن تۆ ئێستە دەڵێی پیر بووم و سـاڵێک لـە عـومرم نـەماوە، زۆر خۆشـە کاتێک دەمریت بە ئێشی ئەو زامەوە بمریت تا بە ئاواتی خۆت بگەی. ئەم بەیتە لـە سـەرچاوەکانی «ح»، «ب» و «س»دا بەم جۆرەیە:

جـە وەش نەفەسـی چـەنی ئـێش زام    هـەر شـەو بیـاوۆ سـاحیب زام بـە کـام

و کاک حەکیم بەم شێوە مانای کردوەتەوە: « لە دەم و نەفەسی باشی ئەودا، لەگەڵ ئێشـی بـرین دا، هەموو شەوێ بریندار بە ئاواتی دڵ بگات». ئەگەر بە وردی سەیری ئەو شەرحە بکـەین کـە کـاک حەکیم بۆ ئەم شێعرەی نوسیوە دەردەکەوێت کە هەر لە بنەمادا مانای شێعرەکەی نەپێکاوە. بۆ وێنـە نیوەبەیتی دووهەمی بەیتی هەوەڵی بەم شێوە مانا کردوەتەوە: «ئیتر لـە بـەر چـی ئـازاری دەروونـم نەدەی»! یانی «دەروونم ئازان»ی بە «ئازاری دەروونم» داناوە.

*تێبینی: ئەم هەڵە مانا کردنەوە و نەپێکانی مانای شێعرییە لە هەموو شەرحەکەی کـاک حـەکیم دا بە ڕوونی دیار و بەرچاوە. «وەرگێڕ».

-٥-[١]

پــەل پــەل خــەزانان مــەرێزان نــە خــاک
مەکەران چوون نێش پـەردەی دڵ چـاک چـاک[٢]

دڵ جــە زام چــاک پــەرێو جەســتەی وێــش
قــەترە قــەترە هــوون جیــا مــەبۆ جــێش[٣]

مــەیۆ نــە دەوران دیــدەی پــەڕ جــە خــار
مــــــەوارۆ وە ڕووی خــــــەزانان زار[٤]

جــەو پــەی پــەڕەی دڵ پــڕان هــوون تێشــەن
یــانێ ڕەنــگ و بــۆی دوورینــان پێشــەن[٥]

---

-٥-

١- ک، نێ، س، ن، ب، ح، ر، ئا، عم، مج.

٢- پەل پەل: گەڵا گەڵا، پەڕ پەڕ. مەڕێزان: دەڕژێن. مەکەران: دەکەن، دەیکـەن. چـوون نـێش: بـە وێنەی کەرەستەیەکی نووک تیژ. چاک چاک: لەت لەت. واتە: یەک یـەک گـەڵای زەردی دارەکـان دەڕژێنە سەر خاک، بە وەرینیان دڵی من وەک شتێکی تیژی پێدا بێنی لەت لەت دەکەن.

٣- پەرێو: بۆی، بۆ ئەو. هوون: خـوێن. مـەبۆ: دەبـێ. جێش: لێـی. مانـای ئـەم بەیتـە و بـەیتی دوایی پێکەوەن.

٤- مەیۆ: دێت. نە: لە (فارسی: دَر). پەڕ: پڕ. مەوارۆ: دەبارێت. زار: بەسـەزوان، فەقیر، نارەحەت، لاواز. واتە: دڵی من بە هۆی ئەو زامانە و لەبەر جەستەی زامـداری، دڵـۆپ دڵـۆپ خـوێنی لـێ دەچۆڕێ و دەزایەتە نێو چاوە پڕ دڕوەکانم و لەوێشەوە دەبارێتە سەر گەڵا زەردە فەقیرەکان.

٥- جەو پەی: بە هۆی ئەوە، لەبەر ئەوە. پەڕە: پەردەی بارێک. پڕان: دڕاوە، لەت بووە. هوون: ☞

هـــەر خـــەزان بـــە زەرد زار مـــەڕێزیۆ
دڵ دەردش بـــە دیـــن ئـــەو مـــەخێزیۆ[١]

یەنـد پـەرواز مـەبۆ مـەر سـینەم بـۆ چـاک
تـا چـەنی خـەزان خـەڵتان بـۆ نـە خـاک[٢]

مـــەبۆش بیـــاوۆ بـــە هامـــدەرد وێـــش
ســـینەی پـــەڕ دەردم ڕا نمـــەدۆ پـــێش[٣]

جـــە ئـــەزرەت ڕێـــزاش، ڕێـــزا نـــە دەروون
ئێـــد ڕێـــزای خاکـــەن، ئـــەو خـــەڵتان هـــوون[٤]

☆☆☆

---

☜ خوێن. تێشەن: تێیدایە. دووریـنان: دوور کەوتوان. پێشەن: پێیەتی. واتە: پـەرەدی دڵـی مـن لەبەر ئەوە لەت لەت بووە و خوێنی تێدایە، یانی ڕەنگ و بۆی دوور کەوتوانی پێوەیە. مەبەستی لـە دوور کەوتوان ئەو گەڵا سوورانەیە کە ڕژاونەتە سەر عەرزەکە. ئەم بەیتە بە تـەنیا لـە نوسـخەکانی «ک» و «ئێ»دا هەیە. لە نوسخەی «ئێ»دا بە جێی «دووریـنان»، «خەزانان» نووسراوە.

١- مەڕێزیۆ: دەڕژێت، دەوەرێت. دین: چاوپێکەوتن. مەخێزیۆ: هەڵدەستێ. مانـای ئـەم بەیتـە و بەیتە دواییەکان پێکەوە دێن. لە سەرچاوەکانی «ح» و «ن»دا بە جێی «بە زەرد»، «وەڵگێ» و بـە جێی «دەردش»، «دەرۆش» نووسراوە.

٢- یەند: هێندە، ئەوەندە. پەرواز: باڵ گرتنەوە. مەر: مەگەر. بۆ چاک: بـدڕێت. چەنی: لەگـەڵ. خەڵتان: ئاوێتە بوون. مانای ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو لەگەڵ بەیتەکانی دوایی‌دا پێکەوەن.

٣- مەبۆش: دەیەوێت، بەنیازە. بیاوۆ: بیهێنێت. وێش: خۆی. پێش: پێی. پەڕ: پڕ. نمەدۆ: نادات.

٤- ئەزرەت: حەسرەت، تاسە، ئاواتی زۆر. ڕێزاش: ڕژانی گەڵاکە. ئێد: ئەم ئەمە. خەڵتان: ☜

-٦[١]-

پەنەش سەودای شەم، پەنەش سەودای شەم
پەروانە کەمەن پەنەش سەودای شەم[٢]

تا نمەوینۆ شەوق شەم بە چەم
نمەنیۆ نە ڕای سۆزانی قەدەم[٣]

---

☜ ئاوێتە بوون، تێوە گلان. هوون: خوێن. واتە: دڵ بە چاوپێکەتنی هەر گەڵایەک کە بە زەردی و لاوازی دەڕژێت دەست دەکات بە ئێشان و هێندە لە نێوە سینەمدا باڵەفڕێ دەکات تا سینەم بدڕێت، تا لەگەڵ گەڵا زەردەکان ئەویش بکەوێتە سەر خاک و ئاوێتەی خاک ببێت، ئاخر وای نیازە کە بگات بە گەڵا هاودەردەکەی بەڵام لەبەر ئەوەی سینەی پڕ دەردم ڕێگەی پێ نادا کە بڕوات لە تاسەی وەرینی گەڵاکە ئەویش دەکەوێتە دەروونمەوە. ئەم (گەڵاکە) دەڕژێتە سەر خاک بەڵام ئەو (دڵی من) خەڵتانی خوێن دەبێت.

-٦-

١- ن، ح، ک، ئێ، ب، ڕ، س.

٢- پەنەش: پێی، بە ئەو. سەودا: مەیلی زۆر، مەراق، فکر و خەیاڵ بە مانای مەعامەڵەیش دێت. شەم: شەمع. کەمەن: کەمە. واتە: پەپوولە زۆر لە خەیاڵی گەیشتن بە شەم نییە و مەیلی بۆ شەم کەمە. لە بەیتە دواییەکاندا هۆی ئەم قسەی ڕوون دەکاتەوە.

٣- نمەوینۆ: نابینێ. شەوق: لە بنەمادا بە مانای دڵ پێوە بوونە بەڵام لە هەورامیدا زیاتر بە واتای ڕۆشنایی و نوور بە کار دەبرێت. نمەنیۆ: نائێت. سۆزانی: سووتان. قەدەم: هەنگاو، شەقاو. واتە: پەپوولە تا بە چاوی خۆی ڕۆشنایی و شەوقی شەم نەبینێت بەرەو شەم هەنگاو هەڵناهێنێت. مەبەستی ئەوەیە کە سەرەتا دەبێت جەستەی شەمەکە بگرێت و گڕی بەرز بێت ئینجا پەپوولە بڕوا بۆ لای.

وێ سـوٚزان ئـەوەن، بـێ پـەروا جـە دوور
بسـوٚچوٚ، نـەبوٚش، مایـەی شـەوق نـوور [١]

هـێما جـە دوور بـوٚ، بژنـەوٚ نـامش
غـەیر جـە سـوٚزانی هـیچ نـەبوٚ کـامش [٢]

وێنـەی کـێ؟ وێنـەی مـن دەردەدار
سـەد بـار زوخـاڵ کـوٚ، پـەی دیـن ڕووی یـار [٣]

---

١- وێ سۆزان: کەسێک کە بە مەیلی خۆی، خۆی بسووتێنێت. ئەوەن: ئەوە. بێ پەروا: بێ ترس، بێ خۆف. بسۆچۆ: بسووتێت. نەبۆش: نەیبێت. مایە: دەست مایە. واتە: خۆ سووتێنەر ئەوەیە کە بێ ترس و خۆف لە دوورەوە بێت و بێ ئەوەی کە ڕۆشنایی و نووری دەسمایە بێت، خۆی بسووتێنێ. مەبەستی ئەوەیە کە نابێت بە پەپوولە بڵێی خۆی دەسووتێنێ، چون بۆ لای شەم ناچێت بەڵکوو بۆ لای ڕۆشنایی دەچێت. دەبێت بە کەسێک بڵێی کە بێ ئەوەی ڕۆشنایی لێوە دیار بێت خۆی بسووتێنێت. واتە عاشق دەبێت بێ ئەوەی بە تەمای شتێک بێت بەرەو مەعشووق بێت و پێی بنێتە نێو ڕێگەی عەشق.

٢- هێما: هێشتا. جە دوور بۆ: لە دوور بێ. بژنەوۆ: ببیسێت. نامش: ناوی، ناوی ئەو. نەبۆ: نەبێ. کام: ئارەزوو، مەیل. واتە: عاشق ئەوەیە کە هێشتا لە مەعشووقی دوور بێت و هەر لە دوورەوە گوێی لە ناوی بێت، جگە لە سووتاندنی خۆی هیچ مراد و ئارەزوویەکی نەبێ.

٣- بار: باری وڵاخ. کۆ: جەم بوون. دین: دیتن، چاوپێکەوتن. پەی: بۆ. واتە: وەک کێ؟ وەک منی دەردەدار کە بۆ چاوپێکەوتنی ڕووی یار هێندە سووتاوم کە سەد باری خەڵووز لە سووتانم کۆ بووەتەوە.

پەروانــە بــە شــەوق شــەم مــەبۆ واســڵ
ئــــەودی ســـــۆزانیش باتڵــــەن باتــــڵ[1]

☆☆☆

١- مەبۆ: دەبێ. واسڵ: ویساڵ وەساڵ پێ گەیشتن. ئەودی: ئیتر، چیتر، چیدی، ئیدی. سۆزانیش: سووتانی. باتڵ: بێ دەرەنجام، گۆترە. واتە: بۆ پەپوولە ڕۆشنایی شەمەکە بە وێنەی مەعشووقە نەوەک شەمەکە، ئەو لەبەر شەمەکە نایەت بەڵکوو لەبەر شەوقی شەمەکە دێت و کاتێک دەگات بە شەوقی شەمەکە سووتانی بێ دەرنجام و گۆترەی دەبێت چون بۆ لای شەمەکە نەهاتووە بەڵکوو بۆ لای شەوقی شەمەکە هاتووە. مەبەستی ئەوەیە کە من و پەپوولە جیاوازیمان ئەوەیە ئەو بۆ لای شەوقی شەمەکە دێت بەڵام من بۆ لای خودی یار دێم. لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا بە جێی «بە شەوق»، «نە شەوق» نووسراوە.

-١[1]-

تــا بــە ســەر یــار بــۆ، تــا بــە ســەر یــار بــۆ

یــاوەر ئــەو وەشــەن تــا بــە ســەر یــار بــۆ[2]

مــەیلش بــە وێنــەی ســەیل وەهــار بــۆ

دووری یــار پــەرێش زامــەت خــار بــۆ[3]

چــوون کــوورەی ئــایر بجۆشــۆ بــە تــاو

بــە بــێ یــار نەشــۆ شــەو نــە دیــدەش خــاو[4]

ئــاه ســەرد کێشــۆ شــەوان نــە جێــدا

بێــزار بــۆ جــەو جــێ، یــار نــەبۆ تێــدا[5]

✡ ✡ ✡

-١-

١- ک، ن، ح، ب، ر، س.

٢- بۆ: بێت، ببێت. یاوەر: دۆست، یار. وەشەن: خۆشە. واتە: ئەو یارە خۆشە تا سەر یار و یاوەر بێت.

٣- مەیلش: مەیلی. سەیل: لافاو. وەهار: بەهار. پەرێش: بۆی، بۆ ئەو. زامەت: ئێش و ئازار. خار: دڕوو، دڕک. واتە: مەیلی بە وێنەی لافاوی بەهار بێت و دووری یاری وەک ئێش و ئازاری دڕوویەک بێت کە بە شوێنێکیدا دەچەقێت.

٤- چوون: وێنەی: وەک. ئایر: ئاگر، ئاور. بجۆشۆ: بجۆشێت، بکوڵێت. نەشۆ: نەڕوات. نەچێت. دیدەش: دیدەی، چاوی. خاو: خەو. واتە: بە وێنەی کوورەی ئاگر بجۆشێت و بڵێسەی بەرز بێت و شەوانە بە بێ یار خەو نەچێتە چاوی، واتە خەوی لێ حەرام بێت.

٥- کێشۆ: بکێشێت. نە جێدا: لە جێگەدا. بێزار بۆ جەو جێ: لەو جێگە بێزار بێت. نەبۆ تێدا:☚

-٢[١]-

تـا بـه کـەی نۆشـوو؟، تـا بـه کـەی نۆشـوو؟
یـا ڕەب جـام خـەم تـا بـه کـەی نۆشـوو؟ [٢]

تاکـەی بـه خـەمین لۆنـگ خـەم پۆشـوو؟
تاکـەی چـوون کـوورەی ئـایر بجۆشـوو؟ [٣]

تاکـەی هەناسـەم چـوون سـیاتەم بـۆ؟
تاکـەی کـونج دڵ خەزێنـەی خـەم بـۆ؟ [٤]

---

☜ تێدا نەبێت. واتە: شەوانە لە جێگەی خۆیدا هەناسەی سارد هەڵبکێشێت و لەو جێگە بێزار بێت کە یاری تێدا نەبێت. لە سەرچاوەی «ب»دا ئەم پارچە شێعرە درێژەی هەیە و پارچە شێعری «جام خاترم گەرد ئالوود بیەن» لە درێژەیدا هاتووە. کە دیارە هەڵەی بەیاز نووسینە و دوو شێعری جیاوازن.

-٢-

١- ک، ن، ح، س، ع، ب، ر، عم، ج.

٢- نۆشوو: بنۆشم، بخۆمەوە. واتە: ئەی خودا تابەکەی دەبێ من پیاڵەی خەم بە سەرەوە بنم و خەم بخۆم؟

٣- خەمین: خەفەتبار. لۆنگ: فۆتەی حەمام. لۆنگ خەم: ئیزافەی تەشبیهییە و خەمی شوبهاندووە بە فۆتەی حەمامەوە. پۆشوو: لەبەر بکەم، بپۆشم. چوون: وێنەی، وەک. ئایر: ئاگر. بجۆشوو: بجۆشم، بکوڵێم، کوڵ بدەم. واتە: تاکەی دەبێ من بە خەفەتبارییەوە فۆتەی خەم لە خۆمەوە بەهاڵێنم و بە وێنەی کوورەی ئاگر بکوڵێم؟ لە سەرچاوەکانی «ن» و «س»دا بە جێی «بە خەمین»، «بە جەستەم» نووسراوە.

٤- سیاتەم: تەمی ڕەش، دووکەڵ. بۆ: بێ. خەزێنە: شوێنی شاردنەوەی شتێکی پڕ بەها، ☜

تاکـــەی گـــەرد دڵ بـــە ســـتێزە بـــۆ؟
تاکـــەی بەنـــد جـــەرگ ڕێـــزە ڕێـــزە بـــۆ؟ [١]

تاکـــەی چـــەنی بـــەخت بـــەدڵان بســـازوو؟
تاکـــەی وە مـــەرگم ئـــاوات بـــوازوو؟ [٢]

تاکـــەی بســـۆچوون نـــەبوون بـــە زوخـــاڵ؟
تاکـــەی بەیـــدی چـــۆڵ بکـــەروون بـــە مـــاڵ؟ [٣]

---

☞ شوێنی گەنج، زۆر جار هەر بە مانای گەنجیش دێت. واتـە: هەتاکـەی هەناسـەم بـە وێنـەی دووکەڵ و گونجی دڵم شوێنی خەم و خەفەت بێت؟

١- گەرد: تۆز. بە ستێزە بۆ: ڕاست ببێتەوە. ڕێزە ڕێزە: وردە وردە. واتە: تابەکەی دڵ ببـێ بـە تـۆز و تۆزی لێ هەستێت و تاکەی بەندی جەرگم ورد بێت؟

٢- چەنی: لەگەڵ. بەدڵان: خراپان. بسازوو: بسازم، بساچێنم. بوازوو: بخوازم. واتە: تاکەی دەبێ مـن لەگەڵ بەختی خراپدا بسازم و ئاواتە خوازی مەرگی خۆم بم؟ ئەم بەیتە تەنیا لە سەرچاوەکانی «ح»، «س» و «ب»دا هەیە و ئێمەیش وەک خۆی نووسیمانەوە.

٣- بسۆچوون: بسووتێم. نەبوون: نەبم. بەیدی: بیابان، سارا. بکەروون: بکەم. واتـە: تاکـەی دەبێـت من بسووتێم بەڵام نەبم بە زوخاڵ و تاکەی سارای چۆڵ و هۆڵ بکەم بە ماڵ و تێیدا بژیم؟ ئـەم بەیتـە لە سەرچاوەکانی «ح»، «س» و «ب»دا هەیە. لە سەرچاوەکانی «عـم» و «ج»دا بەیتێک پاش ئەم بەیتە هەیە کە وەک دیارە زۆر پەیوەندی بە شێعرەکەوە نییە. ئەمەیش ئەو بەیتە بـە پێـی ئـەو دوو نوسخە:

یـە بـەخت منـەن شـێویان چـوون خـوم     سـتارەی دەوڵـەت جـە لام بیـەن گـوم

ئێنســــــافەن وەســــــەن، نیازمەنــــــد دڵ
مــــازە حەســـرەتمەند ســـەر بـــەروو وە گـــڵ[١]

٭٭٭

-٣[٢]-

تاســــــــەی زەرووری، تاســــــــەی زەرووری
دەرد بـــــێ هـــــام دەرد، تاســــەی زەرووری[٣]

نـــــێش گیـــــان کـــــێش ژاراودای دووری
پـــێم بەخشـــان ئـــاداب دیـــدە بـــێ نـــووری[٤]

١- ئێنسافەن: بەڕاستی، لە ڕاستیدا. وەسەن: بەسە. نیازمەند: موحتاج، دڵخواز. مـازە: مەهێڵە، ئیزن مەدە. حەسرەت مەند: بە ئاوات نەگەیشتوو. گڵ: خاکی گۆڕ. واتـە: بـە ڕاسـتی چیتـر دڵـە موحتاجەکەم بەسیەتی، ئیزن مەدە پێش ئەوەی بە ئاوات بگات سەر بباتە ژێر خاکەوە و بمرێت.

-٣-

٢- ن، ک، ئێ، س، ح، ع، ب، ڕ.

٣- تاسە: مەیلی زۆر لە دووری شتێک یا کەسێک. دەرد بێ هام دەرد: دەرد و ئازارێک کە کەسی تر نەیبێت و کەسێک نەبێت کە بتوانی دانیشیت و دەردە دڵی لەگەڵ بکەی. واتە: تاسەی پێویستێک کە لە بەرانبەریدا هیچ دەسەڵاتێک نەبێت، دەردێکە کە کەس نیەتی.

٤- نێش گیان کێش: نێشێک کە ببێت بە هۆی گیان دەرچوون. ژاراودای دووری: بـە دووری ژەهـراو درابێت. ئاداب: ڕێ و ڕەسم، دەستوور. دیدە بێ نووری: کوێری. واتە: دووری، کە بە وێنەی نێشێکە کە بە ژەهری دووری ژەهراوی کراوە و گیانی کەسێک دەکێشێت، ڕێ و ڕەسمی کوێری پـێم بەخشـیوە. مەبەستی لە کوێری لە بەیتە دواییەکاندا ئەڵێت.

کـەس پـێـم نـەواچۆ نـوورش نـە دیـەن
نـوور دیـەی مـن ئـەو بەرگوزیـەن[١]

سـا کـە دیـن ئـەو جـە دیـەم دوورەن
لـێڵاو بـۆ دیـەم، دیـەم بـێ نـوورەن[٢]

***

-٤[٣]-

تـاف دێوانـە، تـاف دێوانـە
تـاف شـەیدای عەشـق، وێـڵ دێوانـە[٤]

---

١- نەواچۆ: نەڵێت. نە: لە (فارسی: دَر). بەرگوزیدە: هەڵبژێراو، تاقانە. واتـە: کـەس پـێم نـەڵێت کوێر نییە و ڕۆشنایی وا لە چاوانیدا، ڕۆشنایی چاوانی من ئەو یارە تاقانەیە. لـە سـەرچاوەی «ح»دا بە جێی «نوورش»، «نووریش» نووسراوە و لە نوسخەی «ئێ»دا «نوورم» نووسراوە.

٢- دین: چاو پێکەوتن، بینین. واتە: مادام کە من ناتوانم ئەو یارە ببینم و دیتنی ئەستەمە، چیتـر چاوانم لێڵاوی داهاتووە و بێ نوورە، نووری لە کوێ بوو.

-٤-

٣- ک، ئێ، ح، س، ر.

٤- تاف: تاڤگەی بەرز، زیاتر بە تاڤگەیەک دەڵێن کە دەستکردی مرۆڤ نەبێت. شەیدا: گیـرۆدەی عەشق. واتە: تاڤگەی شێت و شەیدا و وێڵ و دێوانە، خەریکە سیفاتی تاڤگەکە بەیان دەکـات. لـە سەرچاوەکانی «ح»، «س» و «ب»دا ئەم پارچە شێعرە بەم جۆرە دەست پێ دەکات: «تاف دێوەزنـاو، تاف دێوەزناو». بەڵام لە نوسخەکانی دیکەدا بەم شێوە نووووسـراوە کـە ئێمـە هێناومانـە. لـەم جـۆرە شێعرانەدا کە نیوە بەیتی هەوەڵی بە دووپات بوونەوە یەک شت دەست پێدەکات، دەبێـت سـێ نیـوە بەیتی دیکە بە شوێنیدا لەگەڵ نیوە بەیتی هەوەڵدا هاو سەروا بن کە لێرەدا «دێوانە» و ☜

بـــــه ســـــۆز ســــــەدای ڕازان تەرانــــــه
مەشـــــــانۆ كۆكــــــۆ مــــــرواری دانــــــه [١]

جۆشـــــش چـــوون زەریــــف مــــەحبووب دڵبــــەر
بــــه خەنـــــده مـــــەوزۆ مـــــرواری وه بـــــەر [٢]

شــــەو و ڕۆ نەغمــــەی ســـۆز ســـاز پێشـــەن
داخــۆ یەنـــد ســـەودا جــه عەشـــق كێشــەن؟ [٣]

---

☜ «دێوانه» و «تەرانه» و «دانه» هاو سەروان. بەڵام ئەگەر «دێوەزناو» بێت لەگەڵ «تەرانه» و «دانه» هاوسەروا نییه، كه وایه «دێوانه» دروسته. ئەو پارچه شێعره كه به «تاف دێوەزناو» دەست پێدەكات پارچه شێعرێكی دیكەیه كه له درێژەی شەرحی ئەم پارچه شێعرەدا دەیهێنین.

١- سۆز: دەنگی خەزین و خەمناک. ڕازان: ڕازاندنەوە. تەرانه: گۆرانی. مەشانۆ: بڵاو دەكاتەوە. كۆكۆ: زۆر زۆر. مرواری: جۆره جەواهێرێكی قیمەتییه له نێو لاشەی سەدەفدا دروست دەبێت، لێرەدا مەبەست له مرواری ئەو دڵۆپه ئاوەیه كه له تاقگەكه جودا دەبێتەوە و له مرواری دەچێت. واته: بــه سۆزی دەنگی كاتێک له پەڕان دایه پێت وایه خەریكی گۆرانی چڕینه و دڵۆپه ئاوەكەی كه بـەم لا و بەو لادا دەرپەڕژێت هەر له دانەی مرواری دەچن. له سـەرچاوەی «ح»دا به جێـی «ڕازان»، «سـازی» نووسراوە.

٢- جۆشش: جۆش خواردنی، شەپۆل دانی. چوون: بـه وێنـەی، وەک. زەریـف: جـوان. مـەحبووب: خۆشەویست. مەوزۆ: دەردەخات. واته: كاتێک كه شەپۆل دەدات، شەپۆلەكەی جوانـه و بـه وێنـەی پێكەنینی ئەو دڵبەرەیه كه له كاتی پێكەنیندا ددانـی وێنـەی مـرواری دەردەكـەوێت و لـه دەمیـدا دیاری دەدا. له سەرچاوەی «ح»دا ئەم بەیته بەم جۆره نووسراوە:

جۆشـــش زەریفـــەن شـــیرینەن دڵبـــەر    بــێ حــەد مــەذەرۆ مــرواری وه بــەر

٣- شەو و ڕۆ: شەو و ڕۆژ. نەغمه: دەنگی گۆرانی. سۆزساز: سازێنەری سۆز، عاشقكەر. ☜

هەر کەس عاشقەن پێسە جەستەش بۆ
پێسە جۆیای وەسڵ ئاوات وەستەش بۆ[1]

☆☆☆

پێشەن: پێیەتی. یەند: هێندە، ئەوەندە. سەودا: مەراق، مەیلی زۆر، فکر و خەیاڵ. کێشەن: کێیەتی، کێی ئەوە. واتە: شەو و ڕۆژ گۆرانی سۆزناکی عاشقکەر دەچڕێت، ئاخۆ ئەم هەمووە تاسە لە عەشقی کێ بێت؟ لە سەرچاوەکانی «ح»، «س» و «ڕ»دا بە جێی «سۆز ساز»، «سۆزانی» نووسراوە.

١- پێسە: وەها، بەو جۆرە. جەستەش: جەستەی، جەستەی ئەو. جۆیا: کەسێک کە بە دوای شتێکدا بگەڕێت. وەسڵ: بە یەک گەیشتنی دوو کەس کە یەکتریان خۆش دەوێت. ئاوات وەستە: ئاوات خواستراو. بۆ: بێ. واتە: هەرکەس عاشقە و خۆی بە عاشق دادەنێت، دەبێت وەک ئەم تاڤگە بە دوای ئەوەوە بێت بە ئاواتەکەی بگات.

لە سەرچاوەی «ح»دا پارچە شێعرێک هەیە کە بە «تاف دێوەزناو» دەست پێ دەکات و بە ناوی بێسارانییەوە نووسراوە. لە نوسخەی «ک» ئەو پارچە شێعرە هاتووە و لەسەری نووسراوە: «جناب افاضت مآب خطابت آداب ابویم دام ظله» واتە شێعری بابی نووسەری نوسخەکەیە واتە «شێخ عەبدولموئمین» کە بابی دەبێتە «شێخ جەمالەدین». هەر وەها لە نووسخەی «س»یشدا هەیە و خوا لێخۆشبوو«سەیید تاهێری هاشمی» لەسەری نووسیویە «مشکوک» و لە پەراوێزدا ئەم چەند دێڕەی نووسیوە: « این غزل از حیث سبک و اصطلاحات و نتیجه گیری ادنی شباهتی بە شعر بیسارانی ندارد. غالب ظن نگارنده بر آن است که از سید صادق بوده و مقطع آن را از حیث تقدیم عاشق بر صادق، تغییر داده باشند. از این سید صادق چند غزل به همین شیوۀ هیجده هجایی اورامانی نزد من موجود است. طاهر هاشمی ٥١/١٠/٣٠» ئەمە نیشاندەری ئەوەیە کە خوا لێخۆشبوو سەیید تاهێریش کاتی نووسینی نوسخەکەدا زانیویە شێعری بێسارانی نییە جا من نەمزانی مەبەستی لە «هەژدە هێجائی» چییە؟ ئەمیشە شێعرەکە بە پێی نوسخەی «ک»:

---

| | |
|---|---|
| تــــاف دێوەزنـــــاو، تــــاف دێوەزنــــاو | بولعەجــەب تــــافێن تــــاف دێوەزنــــاو |
| پەرێشــــان، عاشــــق، دەوەنــدەن بــە تــاو | بێ ســەبر و ئارام، بێ خورد و بێ خـاو |
| نــە لادێــو قــەرار جــە ئامــا و لــوان | نــە دەمــێ ســاکن، جــە دەنــگ و دوان |
| مــودام بــە ســەد ڕەنــگ نەغمەپــەردازەن | مــرواری غــەڵتان پــەی نســار ســازەن |
| مەنیشــۆ لـــەحزێ، نـــەدارۆ درەنـــگ | موغــەنی نــەواز بــە ســەد هــەزار ڕەنــگ |
| من مەندم حــەیران جــە پەشێو حاڵیش | جــە بێخــودی شــەوق، جــە لاتویــاڵیش |
| پەرســام ئــەرێ تــاف دێوەزنــاو مــەکان | جــە شــێوەی دێــوان گێرتــەنت نیشــان؟ |
| دائێمـــەن سەرســـام عاشـــق شـــێوەنی | یە جە عەشق کێن بەی تــەور لێــوەنی؟ |
| واتش هــەی ئەبلــەی کــەم فــام سەرشێت | گــۆش بــدارە پــێم تــا بواچــوون پێــت |
| ئــی ســـۆز و ســـەدا، ئــی بێقـــەراری | ئــی چــەرخ و ڕەقســە ئــی بــێ مــەداری |
| ئــی گەوهەرپاشــی و ئــی دورڕەفشــانی | مـــرواری ســـازی و نـــەقیم نشـــانی |
| جــە شــەوق کەسێن مــنش کــەرد پەیــدا | هەر جە عەشق وێش شێتم کــەرد شــەیدا |
| بـــەی گشـــت شـــێوەوە بـــێ قـــەرارەنان | پـــەی نســـار ئـــەو منـــەتبارەنـــان |
| هەرکــەس جــەی دنیــا ســادق عاشــق بــۆ | ســـەرباز وێنـــەی تـــاف دڵ موافـــق بـــۆ |

***

بۆچوونی من لەگەڵ ئەوەیە کە خوا لێخۆشبوو سەیید تاهێری هاشمی فەرموویە. واتە دەبێ ئەم پارچە شێعرە شێعری «سادق» ناوێک بێت، چون لە بەیتی کۆتاییدا ناوی خۆی دەهێنێت. لە نوسخەی «س»دا جێی «سادق» بە «عاشق» گۆڕاوە، بەڵام لە نوسخەی «ک»دا هەر بەو جۆرەیە کە ئێمە نووسیومانە. هەر بەو هۆیە دەفەرموێ: «مقطع آن را از حیث تقدیم عاشق بر صادق، تغییر داده باشند». هەر وەها لە دیوانە چاپ کراوەکاندا پارچە شێعرێک هاتووە کە بە ناوی بێسارانییەوە لە قەڵەم دراوە و بە «مەولام بێ قەرار» دەست پێدەکات. ئەو پارچە شێعرەیش لە نوسخەی «ک»دا بە دوای «تاف دێوانە»ی بێسارانیدا هاتووە و لە سەری نووسراوە «مولانا فرخ پلنگانی در ردیف» و لە نوسخەی «ئێ»یشدا هاتووە و لەسەری نووسراوە «ملا فرخ».

☜ پێویستە کە ئەم خاڵەیش لە بەرچاو بگرین کە زۆربەی ئەو شاعیرانەی کە هاوچەرخی بێسارانی بوون و لە ڕەدیفی شێعرەکانیدا شێعریان هۆنیوەتەوە و بۆیان ناردووە، شێعرەکانیان بە «مەولام» دەست پێدەکات. ئەڵبەت شێعرەکانیش خۆیان هاوار دەکەن کە شێعری بێسارانی نین. ئەمەیش شێعرەکەی «ملا فرخ» بە پێی نوسخەی «ک»:

| | |
|---|---|
| مەولام! بێ قەرار، مەولام! بێ قەرار | سپی تافێ دیم بێ حەد بێ قەرار |
| جە مای بەرزەوە وێش مەوزۆ بە وار | تەن پارە پارە مەبۆ سەدهەزار |
| دیسان جە گۆلدا مەخرۆشیۆوە | چەنی داخ عەشق مەجۆشیۆوە |
| پەرسام سپی تاف مودام خەرامان! | شێت و شەیدای عەشق، بێ سەر و سامان |
| یە جە عەشق کێن پێسە ڕەوانی؟ | بێ خورد و بێ خاو نیمەشەوانی؟ |
| جە گیانت یەندە گەوهەر مەسازی | پەی نسار کێ بە ئاوات موازی؟ |
| تاف ناڵا بە زار، وێش دا بە کەمەر | تەن سەد پارە بی، دووش بەرشی جە سەر |
| واتش یە خەیلێن جە یار بڕیانان | جەوپەی پەی وەسڵش بێ سەر و پانان |
| یەندە مەسازوو جە تەن مرواری | تا نە پای دۆسم کەروو نساری |
| حەرفێش ڕێزنا تەعجیل بە دەوان | سەر دا بە سەنگدا ڕاهی بی ڕەوان |
| مەولام هەر کەسێ تاڵب بە یار بۆ | شەرتەن وێنەی تاف بێ ئێختیار بۆ |

***

لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب» و «س»یشدا پارچە شێعرێک هەیە کە بە ناوی بێسارانییەوە لە قەڵەم دراوە و بە «مەولام دەرد شەن» دەست پێدەکات کە دیارە ئەویش هەر لە ڕەدیفی شێعری «تاف دێوانە»دا نووسراوە. لە نوسخەی «ک»دا بە دوای شێعرەکەی بێسارانیدا نووسراوە و لە سەری نووسرواە: «محزونی و قیل ملا حافظ فرهاد» واتە «مەلا حافێز فەرهاد وتی»، و هەروەها لە نوسخەی «ئێ»یشدا بە دوای شێعرەکەی بێسارانیدا هاتووە و شتێکیش لەسەری نووسراوە کە ناخوێنرێتەوە. دیارە کە هەر دوو نوسخەکە بە پێی پیتی ئەلف و بێ نووسراوە ئەم شێعرەیش بە «م»ـەوە دەست پێدەکات و ئەگەر شێعری بێسارانی بوایە دەبوو لە بەشی «م»دا هێنابایان. هەروەها پێویستە ئەم خاڵەیش لە بەرچاو بگرین کە ناکرێت بێسارانی بە یەک ناوەڕۆک و تەنانەت بە دوو پات کردنەوەی دەستەواژەکان چەند شێعری نووسیبێت. ئەمەیش شێعرەکەی «مەلا حافێز ☜

☜ فەهاد »:

| | |
|---|---|
| مەولام! دەردشەن، مەولام! دەردشەن | تاف دێوەزناو عەجەب دەردشەن |
| پڕشنگ مەشانۆ، ڕۆی نەبەردشەن | پەرێ وەسڵ دۆس شاه سەردشەن |
| بێ دەست و پا و سەر، ساف بێ جەستە | تەن پارە پارە، دەروون شکەستە |
| جە تاف قەڵوەز وێش مەوزۆ بە وار | مەگنۆ وە ڕووی سەنگ قەترەی خۆشگوار |
| زار زار مەناڵۆ چوون زامەت داران | جەوپەی ڕەوانیش بە بێ موداران |
| مەژەنۆ نەغمەی ساز زەرپاری | مەوزۆ وە کەنار سپی مرواری |
| جێش مەیۆ سەدای دەنگ نەهانی | دایم نە سەیرەن گەوهەرنەفشانی |
| دایم نە سەیرەن وەخت سوبح و شام | زەوق کەسێشەن، نەدارۆ ئارام |
| سا مەگەر وەختێ بگێرۆ قەرار | واسڵ بۆ، فانی، غەڵتان نە پای یار |
| بەحر بێ پایان مەدران بە خدمەت | مەکەرۆ تەسبێح قادر قودرەت |
| عاشقێ چوون تاف زەوق و شادیشەن | مەعشووق پەرێ ئەو یا عێبادیشەن |
| مەولام هەر کەسێ حاڵ تاف زانۆ | دانا بۆ، عارف، هەستیش مەمانۆ |

***

بە سەرەنج دانی هەرسێ پارچە شێعرەکە و هەروەها هەڵسەنگاندنیان لەگەڵ شێعرەکەی بێسارانی روون دەبێتەوە کە ئەم سێ پارچە شێعرەی لێرەدا هێناومانە ڕەنگ و بۆی شێعری بێسارانی نادات و ناگونجێت بێسارانی سەبارەت بە تاقگە چوار شێعری هۆنیبێتەوە کە هەر چواریشیان یەک ناوەرۆکیان هەبێت و جیاوازی مانایان زۆر نەبێت. پێویستە ئەمەیش بڵێین کە وەک دیارە هەر چوار پارچە شێعرەکە بۆ «تاف دێوەزناو» نووسراوە. جودا لەوەیش بە پێی ئەو نوسخەخەتیانە کە لای ئێمە نوسخەی بنەڕەتین («ک» و «ئێ») هیچ کامیان شێعری بێسارانی نین و ناوی شاعێرەکانیان لەسەری نووسراوە. ئەمە بە عەقڵ و ئاوەز نزیکترە کە لە ڕەدیفی ئەو شێعرەدا نووسرابن و شێعری ئەو شاعێرانە بن کە وتمان، چیتر «اللّٰه اعلم».

-٥-[1]

تــەرز بیــد بــە تــار، تــەرز بیــد بــە تــار
تــەرز بیــد چــوون زڵــف مەلــەرزۆ بــە تــار[2]

بــە هــەوای پڕشــنگ تــاف بــێ قــەرار
نــە پــای «بــالوول کــۆ» تــەخت «دەڕنــە شــار»[3]

وەڵــگ بیــد زایــف، تــەرز تــووڵ زەبــوون
زەبــوون تــەر جــە تــەرز تــای گوڵابتــوون[4]

---

-٥-

١- ک، س، ئێ، ح، ب، ڕ.

٢- بید: داری بی، شۆڕە بی، شەنگە بی. چوون: وێنەی، وەک. زڵف: زوڵف، کەزیە، پرچ، قژ. مەلەرزۆ: دەلەرزێ. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٣- پڕشنگ، پرژەی ئاو. تاف: تاڤگە، ئاوشار، ئابشار. بالوول کۆ: کێوی دالاهۆ کە یارسانەکیان پێیان وایە بارەگای بالوول (بهلول) لەوێیە. تەخت: تەختایی، ڕاسایی. دەڕنە شار: ناوی دێیەکی کۆنە کە دەکەوێتە لای سەلاسی باوەجانی و نزیکی ناوچەی یارسانەکان کە ئێستە تەنیا گۆڕەستانەکەی ماوە. واتە: لقێکی درێژەوەبووی شۆڕە بی بە وێنەی تاڵە زوڵف بە بای پرژە ئاوەکانی تاڤگە بێ ئارام و قەرارەکانی بەرکێوی «بالوول» و «دەڕنە شار»، دەلەرزێت. لە سەرچاوەکانی «ح» و«ب»دا بە جێی «تەخت»، «سەخت» نووسراوە. کاک حەکیم «بالوول کۆ»ی بە «گێژەلووکەی کێوێکی سەخت» مانا کردوەتەوە. لە سەرچاوەکانی «س»، «ب»، «ح» و «ڕ»دا بە جێی «دەڕنە شار»، «وەر نسار» نووسراوە کە دیارە ئەم هەڵە بە هۆی نەزانینی مانای «دەڕنە شار»ەوە هاتووەتە ئاراوە و ئەوانیش دووپاتیان کردوەتەوە.

٤- وەڵگ: گەڵا، بەرگ. زایف: زەعیف، لاواز، بێ هێز، بێ گریک. تووڵ: لقی تازەی دار.

مەڵـــەرزۆ بـــە بـــاد ســـەرد ســـەبایی
نـــە ڕووی گـــۆل ســـەوز ســـاف مینـــایی[١]

پەرســـام ئـــەرێ بیـــد، دەســـت نشـــان دەســـت!
تـــورک تەڕئەنـــدام، ســـای ســـەهەند پەیوەســـت![٢]

چێشـــــەن درەختـــــان ڕووشـــــان نـــــە بـــــاڵان
تـــۆ ســـەر ســـەراوێز، ڕووی زەمـــین مـــاڵان؟[٣]

---

☜ زەبوون: لاواز، فەقیر، هەژار. گوڵابتوون: تاڵێکی باریک کە لە زێڕ و زیو دروست دەبێ و لەگەڵ تاڵە هەورێشمدا دەیکەنە تان و پۆی پارچەی زەری. واتە: شۆڕە بییەکە گـەڵاکانی زەرد و بـێ گریـک بوون و لقەکانیشی کە بەرەو خوار شۆڕ بـوون تووڵـەکانی ئەونـدە باریـک و لاواز بـوون کـە لـە تـاڵی گوڵابتوون باریک و زایف تر بوون. لە سەرچاوەی «ح»دا بـە جێـی «گوڵابتـوون»، «کلاّفـی تـوون» نووسراوە و کاک حەکیم نیوە بەیتەکەی بەم شێوە مانا کردوەتەوە: «کزۆڵ تر لە تاڵی زولفی تۆ»!.

١- مەلەرزۆ: دەلەرزێت. باد: با، وا. باد سەبا: بایەک کە لە باکوورەوە دێت و فێنکە، ئەڵبەت لێرەدا دەتوانێت بای بەیانیش بێت کە کزەیەکی چیایی هەیە. گۆل سەوز ساف مینـایی: خەریکـە گـۆلی تاڤگەکە وەسف دەکات و دەڵێت نێو گۆلەکە قەوزەی کـردووە و ئـاو بـە سـەر قەوزەکـەدا دەڕوا و بـە وێنەی شووشەیەکی ساف، نێو گۆلەکە کـە سـەوزە دیـارە. واتـە: شـۆڕە بییەکـە وا بـە سـەر گـۆلی تاڤگەکەوە کە بە وێنەی شووشەیەکی ساف و سەوزە و شەماڵ لێی دەدا و دەکەوێتە لەرە.

٢- پەرسام: پرسیم. دەست نشان دەست: بە دەست نراو، دەسـت نیـا. تـورک: تـازە پـێ گەیشـتووی جوان. تەڕئەندام: تازە پێ گەیشتوو. سای سەهەند پەیوەست: سێبەرێک کە لە هیچ لایەکەوە خـۆر نەیگرێت. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٣- چێشەن: چییە. ڕووشان نە باڵان: ڕوویان لە سەرەوەیە، بەرەو سەرەوە دەڕۆن. سەراوێز: بەرەو خوار. ماڵان: ماڵیوە. واتە: پرسیم ئەی شۆڕە بی کە بە وێنەی جوانێکی تازە پێگەیشتووی کە ئاو لە ☜

بیــــد ئامـــا جـــواب بـــه زوان حـــاڵ
چـوون پەرسـات هـاڵم پێـت واچـوو هـەواڵ[1]

منــــیچ نۆنـــەمام نـــازک نـــۆ بـــیم
ســـەرتەرز لـــەرزان تـــاف لـــەب ڕۆ بـــیم[2]

ناگـــا پـــەی تەقـــدیر، دیـــدە ســـیایێ
خاوئـــاڵووی ســـوب خێـــز، جـــە ڕەم جیـــایێ[3]

---

☜ هەموو گیانت دەچۆڕێت و چوار تەنیشتت سێبەرە، هۆی چییە کە هەموو دارەکان بەرەو سەر باڵا دەکەن و تۆ سەرت شۆڕە و بەرەو خوارە و لە زەمینی دەماڵیت؟

١- ئاما جواب: هاتە جواب، وڵامی دایەوە. زوان حاڵ: زمانی بێ زمانی. چوون: چونکە، لەبەر ئەوە. پەرسات: پرسیت. هاڵم: حاڵم، حاڵی من. پێت واچوو: پێت دەڵێم. واتە: شۆڕە بییەکە بە زمانی بێ زمانی وڵامی دایەوە و وتی چونکە تۆ هەواڵی منت پرسی منیش حاڵ و هەواڵ و بارودۆخی خۆمت پێ دەڵێم.

٢- منیچ: منیش. نۆنەمام: نمامی تازە پێ گەیشتوو. لەب ڕۆ: لە کەناری لێودا ڕواو. واتە: منیش نەونمامێکی ناسک و تازە پێگەیشتوو بووم و سەرتەرزەکەم دەلەراوە و لە گۆشەی تاڤگەکەدا گەشەم دەکرد.

٣- ناگا: بێ ئاگا، ناخافڵ، لە ناکاو. پەی تەقدیر: بۆ بەختم، لە بەختم. دیدە سیایێ: چاو ڕەشێک. خاو ئاڵوو: خەو ئاڵوو، خەواڵوو، کەسێک کە تازە لە خەو هەستا بێت. سوب خێز: کەسێک کە بەیانیان زوو لە خەو هەستێت. ڕەم: گەل، تاقم، گروو، دەستە. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا پێکەوەن.

ئامـــا نـــە ســـایەم مەخســـەڵ دا خـــاڵان
کۆکـــۆ کـــۆی خەرمـــەن خـــەمان دا تـــاڵان[١]

جەوســـــاوە جۆیــــای ئـــــەو تـــــەتارەنان
جەوپـــــەی ســـــەراوێز بـــــێ قـــــەرارەنان[٢]

-٦-[٣]

تەشـــــریف نـــــاوەردی، تەشـــــریف نـــــاوەردی
بای شـــەماڵ! چـــێش بـــی؟ تەشـــریف نـــاوەردی؟[٤]

---

١- ئاما نە سایەم: هاتە سێبەرم. مەسخەڵ: شۆردن، جەلا دان، ڕۆشن کردنـەوە، وا دیـارە لـە وشـەی «مصقل»ـەوە گیراوە کە وشـەیەکی عەرەبییـە. کۆکۆ: کێـو بـە دوای کێـودا. خەرمـەن: خـەرمان، شوێنی کوتانی کڵۆش. واتە: بەیانییەکی زوو چاو ڕەشێک کە تازە لە خەو هەسـتا بـوو و هێشـتاکوو چاوی بە خەوەوە بوو لە تاقم و دەستەی دوور کەوتبووەوە و هات لە سێبەری منـدا خـاڵی جـەلا دا و بەم کارەی هەرچی خەم و خەفەتی من بوو دای بە تاڵاندا و خەم و خەفەتی پێم نەهێشت.

٢- جەوساوە: لەو کاتەوە. تەتار: ناوی وڵاتێکە کە ئاسکی بە ناوبانگی هەیە، کەسێک کـە لـە چـاو جوانیدا بە وێنەی ئاسک بێت. جەوپەی: لەبەر ئەوە، بەو هۆیەوە. سەراوێز: سـەربەرەوخوار. واتـە: لەو کاتەوە من هەر بە هیوای ئەو چاو جوانەم و چاوەڕێی ئەوم و لەبەر ئەوە بەم جـۆرە بـێ قـەرارم و شۆڕ بوومەتەوە.

-٦-

٣- ن، ک، س، ح، ر.

٤- تەشریف ناوەردی: تەشریفت نەهێنا، تەشریفت نەهات. چێش بی: چی بوو. واتە: ئەی شـەماڵ بۆچی تەشریفت نەهێنا؟

مەخسەڵمـاڵ خەم جە دڵ نەكەردی
مەر شەربەت دەست بێ شەرتان وەردی؟[١]

یەقین هەرزەگەرد بێ مەقامەنی
چوون سارائیان خەیاڵ خامەنی[٢]

سەرسام ساڎار، سارا گێڵەنی
چوون كورد كەم فام تەمام وێڵەنی[٣]

---

١- مەخسەڵ: شۆردن، جەلادان، ڕۆشن كردنەوە. نەكەردی: نەتكرد. مەر: مەگەر. بێ شەرت: بێ پەیمان، بێ بەڵێن، كەسێک كە پێبەندی قەوڵ و قەراری نییە. وەردی: خواردت. خواردووتە. واتە: خەمت لە دڵی من دانەماڵی و دڵی منت لە خەم پاک نەكردەوە، مەگەر شەربەتت لە دەستی بێ شەرتان خواردوەتەوە؟ لە مانای بەیتە دواییەكاندا دەردەكەوێ كە ئەو قەوڵە ئەوە بووە نامەی یاری بۆ بێنێت.

٢- یەقین: بێ شک، بێ گومان. هەرزەگەرد: كەسێک كە بێ هۆ و بێكار هەر بخولێتەوە. سارائیان: كۆی وشەی «سارایی»یە بە مانای كێوی، سارایی بە واتەی سەحرایی و كەسێكە هەر لە كەژ و كێودا دەژی. خەیاڵ خام: كەسێک كە فكر و خەیاڵی یەک نەگرنەوە و فكری دروست دەر نایە و لە ڕووی عەقڵەوە كار ناكات. واتە: بێ شک هەرزەگەردی و شوێنێكی دیاری كراوت نییە كە شوێنی ژیانت بێت و بەردەوام وێڵ و ئاوارەی و وەک ئەوەی لە سارا و بیاباندا بی، فكر و خەیاڵت گۆترەییە و لە ڕووی عەقڵەوە نییە.

٣- سەرسام: جۆرە نەخۆشینێكە هەركەس تووشی ببێت سەری دەماسێت و قسەی هەڵیت و پڵیت دەكات، لە دوو وشەی «سەر» و «سام» بە مانای ماسین و پەنەمیاو پێک هاتووە. ساڎار: شێت، كەسێک كە جن دەستی لێ وەشاندبێت. كورد: مەبەستی لە بەكار بردنی وشەی كورد ئەوەیە كە كورد لە یەک شوێندا جێگیر نەبوون و كۆچەر بوون و لە هەوراماندا ئەم شتە باو نەبووە. لە ☚

مـــەر هەرکـــەس دەلیـــل هێجـــران دارانـــەن
قاســـــێد نامـــــەی دووری یارانـــــەن[١]

چـــوون تـــۆ بـــێ بەینـــەت ئـــەحواڵ نـــاوەرەن؟
چـــوون هـــەرجائیان ســـەودا نەســـەرەن؟[٢]

ئومێـــد هـــەن دەرگێـــڵ ســـەرزەمینان بـــای
ئـــاوارەی وەتـــەن جـــام جـــەمینان بـــای[٣]

---

ئەدەبیاتی کلاسیکی فارسی‌دا کورد بە مانای شوان هاتووە و بۆی هەیە بێسارانیش ئەو مانایەی لە فکر و خەیاڵدا بوویێت. لە پارچە شێعری «باد هەر جایی»یشدا ئـەم وشـەیەی بـە کـار بـردووە. واتە: ئەی شەماڵ بێ شک تووشی نەخۆشی سەرسام بوویت و قسەی پـڕ و پـووچ دەکـەی و تـەواو شێت بووی و بە وێنەی کورد داوتە بە کـەژ و کێـودا و بـێ عـەقڵ و هـۆش و وێڵـی. لـە نوسـخەی «ک»دا بە جێی «سارا»، «سەحرا» نووسراوە و لـە سـەرچاوەکانی «ح»، «ن» و «س»دا بـە جێـی «چوون کورد»، «چۆڵ گەرد» نووسراوە. سەرچاوەکانی ئەو سێ سەرچاوە هەموویان تـازەن و دەتـوانن دەستکاری کرابن، بـەڵام لـە نوسـخەی «ک»دا کـە نوسـخەی بنـەڕەتی ئێمەیـە بـەو جۆرەیـە کـە نووسیومانە و بە بڕوای من و بە پێی شێعری «باد هەرجایی»یش هەر ئەوە دروستە.

١- مەر: مەگەر. دەلیل: ڕێگە بەڵەد، هەواڵبەر بۆ یار. هێجران دار: کەسێک کـە تووشـی دەردی دووری یارەکەی بێت. قاسێد: نامەبەر. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوەن.

٢- چوون: وێنەی، وەک. بێ بەینەت: بێ وەفا، بێ پەیمان. ناوەر: نەهێنا. هـەرجائی: بـێ شـوێن و جێگە، بێ ئەسڵ و نەسب. سەودا: فکر و خەیاڵی دەروونی، مەراق. نە سەرەن: لە سـەردایە. واتـە: مەگەر هەر کەسێک بە وێنەی تۆ ڕاسپاردەی ئەوەیە کە هەواڵی یارە دوور وڵاتەکان بێنێت بێ شەرت و پەیمانە و هەواڵی یار ناهێنێت و بێ شوێن و جێگـەیـە و هـەر فکـر و خـەیاڵی پـڕ و پـووچ لـە سەری دایە؟ ئەمە «ئیستهفامی ئینکاری»یە و واتە: هیچ ڕاسپاردەیەک وەک تۆ ناکات.

٣- ئومێد هەن: ئومیدم وایە. دەرگێڵ: بێ خانە و لانە و ئاوارەی کۆڵان. بای: ببیت، ببی. جام

تـــا بـــە جەســـتەی مـــن هـــەنیچ هـــەژاران
نەكـــــەری خـــەریک چەمــــەڕای یـــــاران[١]

✯✯✯

-٧[٢]-

تـــــەماکۆ جەســـــتەم، تـــــەماکۆ جەســـــتەم
دوود تـــــــەماکۆ مـــــــەزانۆ جەســـــــتەم[٣]

کـــــەردەن ئامەشـــــۆی دەروون خەســـــتەم
چوونـــەن، چ تـــەورەن، پـــەی ئـــاوات وەســـتەم[٤]

---

☜ جەمین: کەسێک کە ڕوخساری بە وێنەی جام و ئاوێنە وایە. واتە: هیوام وایە کە بەردەوام وێڵ و وەیلان و ئاوارەی وڵاتان بی و شوێن و مەکانت نەبێ و لە وڵاتی ڕوخسار جوانـان دوور بـی و چـاوت پێیـان نەکـەوێت. ئـەم بەیتـە لـە سـەرچاوەی «ن»دا نییـە و لـە نوسـخەی «ک»یشـدا بـە جێـی «دەرگێڵ»، «سەربەست» نووسراوە.

١- بە جەستەی من: بە وێنەی من. هەنیچ: ئیتر، هەروەها. نەکەری: نەکەی. خـەریک: پەشـۆکاو. چەمەڕا: چاوەڕوان. واتە: با چیتر بە وێنەی من هەژارێکی دیکە بە چاوەڕوانی یارەوە نەپەشۆکێنی. لە نوسخەی «ک»دا بە جێگەی «هەژاران»، «گەدایان» نووسراوە.

-٧-

٢- ک، ع.

٣- تەماکۆ: تووتن. جەستەم: لاشـەم. دوود: دووکـەڵ. مانـای ئـەم بەیتـە لەگـەڵ بـەیتی دوایـیدا پێکەوەن.

٤- کەردەن: کردوویە. ئامەشۆ: هات و چوو. خەستە: زامدار، هیلاک. چوونەن: چۆنە. چ تـەوەرن: بە چ جۆرە، چۆنە. ئاوات وەستە: ئاوات خواستراو. واتە: دووکەڵی تووتن ئاگای لە حاڵ و بار و ☜

مـــەڎیا ئـــەر جـــاییش نمـــەبی ســـیا
ئەڵبـــەت بـــە نیشـــتەن مـــەبی جابـــەجا[١]

دڵـــێ کـــە جـــای دوود نـــەمانۆ تێـــدا
پـــەی چـــی نـــەگرەوۆ وە بـــەخت وێـــدا[٢]

☆☆☆

دۆخی جەستەی من هەیە، چونکە هات و چووی دەروونی هیلاکی من کردووە و ئاگادارە چۆنە و لە چ حاڵێکدایە بۆ ئاوات خواستراوم.

١- مەڎیا:سەیری دەکرد. جاییش: جێگەیەکی، شوێنێکی. نمەبی: نەدەبوو. سیا: ڕەش. نیشتەن: جێگیربوون، دانیشتن. مەبی: دەبوو. واتە: دووکەڵەکە سەیری دەروونمی دەکرد و دەگەڕا بزانێت کام جێگەی ڕەش نەبوەتەوە شوێنی دەگۆڕا و لەوێ نیشتەجێ دەبوو و ئەوێشی ڕەش دەکردەوە. مەبەستی ئەوەیە کاتێ من دووکەڵی جگەرەکە قووت دەدەم و بە دەروونمدا دەگەڕێت، چون لە دووری یاری ئاوات خوازراوم شوێنێکی بە خاڵی نەماوەتەوە و هەمووی ڕەش بووەتەوە، چیتر نایەتە دەرەوە و هەرکوێ خاڵی بێ لەوێ نیشتەجێ دەبێت، بەڵام ئێستە چون لە دەروونمدا نامێنێتەوە و دێتەوە دەر بەو مانایەیە هیچ شوێنێکی خاڵی نییە و هەمووی ڕەش بوەتەوە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «جاییش»، «جارێ» و بە جێگەی «بە نیشتەن»، «نەشتەشەن» نووسراوە.

٢- نەمانۆ: نەمێنێت. پەی چی: بۆچی. وێدا: خۆی. واتە: دڵێک کە هێندە ڕەش بووبێتەوە و جێگەی دووکەڵی تێدا نەمابێت بۆچی دەبێ بۆ بەختی خۆی نەگری؟ یانی دەبێ حەتمەن بگری و دەلیلی نییە نەگری. لە نوسخەی «ع»دا ئەم بەیتە بەم جۆرە نووسراوە:

جـــایێ کـــە دوود ش نـــەمانۆ تێـــدا    پـــەی چـــی نەکـــەرۆ بـــەخت مـــن ســـیا؟

-١[١]-

جـــارێ بـــۆ جـــارێ، جـــارێ بـــۆ جـــارێ
قیبلـــەم تـــۆ خـــودا، جـــارێ بـــۆ جـــارێ[٢]

ئەگـــەر خـــەوفت هـــەن تـــۆ جـــە ئـــەغیارێ
ویانـــــە گێـــــرە بـــــۆرێ پـــــەی کـــارێ[٣]

ئێمـــــە یانـــــەمان جـــــەو بۆنـــــە کـــــەردەن
جـــارێ تـــۆ بەینـــە وە حاجـــەت بـــەردەن[٤]

ســـەد جـــار بـــە وەڵـــڵا دەردم پێـــت دەوان
حاجـــەت یانـــەم گشـــت بـــە تـــۆ ڕەوان[٥]

-١-

١- ن، س، ح، ب، ر.

٢- جارێ: یەک جار، یەک کەرەت. بۆ: بێ، وەرە. واتە: قیبلەم! تۆ خودا یەک جار وەرە بۆ ماڵمان.

٣- هەن: هەیە. ئەغیار: کۆی «غەیر» بە واتای بێگانە، نامۆ. ویانە: بەهانە، بیانوو، پەڵپ. گێرە: بگرە. بۆرێ: وەرە، بێ. پەی: بۆ. واتە: ئەگەر لە ترسی بێگانە و ئەغیار نایەی بۆ ماڵی ئێمە بیانوویەک بگرە و بە بۆنەی کارێکەوە وەرە.

٤- یانە: ماڵ، خانوو. جەو بۆنە کەردەن: بەو هۆیەوە دروست کردووە. بەینە: بێی، تەشریف بێنی. حاجەت: کەرەستەیەک کە کەسێک کاری پێی بێت، پێویستی، هەوەجێ. واتە: ئێمە بۆ ئەوە ماڵمان دروست کردووە کە تۆ جارێک بێی بۆ بردنی پێویستییەک.

٥- دەردم پێت دەوان: دەردم بە تۆ دەوا دەکرێت. ڕەوا: حەڵاڵ. واتە: سەد جار قەسەم بەخوا بێت☜

-٢-[١]

جــــام خــــاترم گــــەردئالوود بیــــەن
بــازار ســەودام بــە بــێ ســوود شــیەن[٢]

ســــۆز هەناســــەم نمانــــان ســــەردی
گــێڵان ڕەنــگ بــاخ شــادیم بــە زەردی[٣]

خــەم دنیــای دوون جــە نــەزانی وێــم
هــەر شــەو ســەد نێشــتەر مەشــانۆ نــە جێم[٤]

---

دەردم بە تۆ دەوا دەبێت و پێویستی ماڵم هەمووی بۆ تۆ حەڵاڵە و شایانی تۆیە.

-٢-

١- ن، ک، ئێ، ح، س، ب، ڕ.

٢- جام: ئاوێنە.خاتر: بیر و هۆش. جام خاتر: ئیزافەی تەشبیهییە و خاتری شوبهاندووە بە ئاوێنەیەک کە تۆزی لێ نیشتووە. گەردئالوود: تۆزاوی. بیەن: بووە. سەودا: مامەڵە، کڕین و فرۆشتن، بیر و خەیاڵ. شیەن: ڕۆیشتووە. واتە: جام یا ئاوێنەی بیر و هۆشم تۆزاوی بووە و بازاڕی مامەڵەم بێ هیچ قازانج و دەستکەوتێک لە دەستم دەرچووە.

٣- سۆز: گەرمی، تین. نمانان: نیشانی داوە، دیاریی داوە، نواندوویەتی. گێڵان: گەڕاوە. واتە: گەرمی هەناسەم سەردی نواندووە و ڕەنگی باخی شادیم بە زەردی هەڵگەڕاوە.

٤- دوون: پەست، بێ بایەخ. نێشتەر: نەشتەر، هەر شتێکی نووک تیژ کە خوێن لە لاشەی مرۆڤ بێنێت. مەشانۆ: دەوەشێنێت. نە: لە (فارسی: دَر). نە جێم: لە جێگەم. واتە: خەمی دنیای بێ بایەخ لەبەر نەزانی خۆم هەموو شەوێ سەد نەشتەرم لێ دەدات.

چەنـــدێو دڵ پەشـــێو ناڵـــەی شـــەوان بـــیم
جەلابـــەخش دەرد گشـــت بـــێ خـــەوان بـــیم[1]

ســـەرمایەی دیـــدەم غـــەیر جـــە هـــوون نـــەبێ
هـــیچ کـــارێم چـــەنی دنیـــای دوون نـــەبێ[2]

ئیســـــە بـــــە وێنـــــەی دنیاپەرەســـــتان
دنیاپەرەســـــتم بـــــە هـــــەزار دەســـــتان[3]

٭٭٭

١- چەندێو: چەندێک، چەند، تا چەند. بیم: بووم. جەلابەخش: ڕۆشـنایی دەر، ڕۆشـنکەرەوە. واتـە: ئەو کات کە لاو بووم چەند دڵ پەرێشانی ناڵە ناڵی شـەوان بـووم و چەنـد دەردی بـێ خـەوانم ڕۆشـن کردەوە، واتە دەردم لەوان زیاتر بوو. شاعێر لەم بەیتـە و بـەیتی داهـاتوودا باسـی ئـەوە دەکـات کـە سەردەمی لاوی چۆن بووە.

٢- هوون: خوێن. نەبێ: نەبوو. چەنی: لەگەڵ. واتە: سەرمایەی چاوانم بەس خوێن بوو و هیچی تر و هیچ کارێکم بەسەر دنیای بێ بایەخەوە نەبوو. مەبەستی ئەوەیە ئەو کات فکر و زیکرم تـەنیا یـار بوو و شەوانە خەوم نەبوو و هێندە دەگریام کە خوێن لە چاوانم دەهات و هیچ کارێکم بە سەر دنیـاوە نەبوو.

٣- دنیا پەرەست: کەسێک کە وا بە دوای ماڵ و موڵکی دنیاوە. دەستان: بـەزم، جـۆر، لـە بنـەمادا هەزاردەستان بە مانای بولبولە بەڵام لێرەدا بە مانای هەزار جۆر و هـەزار بەزمـە. واتـە: ئێسـتە بـە وێنەی دنیاپەرەستان منیش بە هەزار بەزم و هەزار جۆر دنیا دەپەرەستم.

-٣[1]-

جـــــه بەیانـــــەوە، جـــــه بەیانـــــەوە
حـــالّیّ پـــێم یـــاوان جـــه بەیانـــەوە[2]

خـــالّیّ دیـــم جـــه بـــەین دوو بەیانـــەوە
مەدرۆشـــۆ چـــوون نـــەجم جـــه بەیانـــەوە[3]

-٣-

١- ک، ب، ج، عم.
هەروەها کە لە بەشی «بێسارانی و شێعرەکانی»دا لـە باسـی «نازنـاوی بێسـارانی»، لـە سـەرەتای دیوانەکەدا باسمان لـە سـەر کـردووە، ئـەم پارچـە شێعرە تـەنیا لـە دوو نوسـخەی خـەتی («ج») و («عـم»)دا هاتووە و لە دیوانە چاپ کراوەکانیشدا («ح» و «ب») بە ناوی بێسارانییەوە هاتووە کـە لە سەرچاوەی «ح»دا لە شەرحی شێعرەکەدا وەها نووسراوە: «ئەم شیعرە لە نوسخەکەی بەر دەستمان و بەرهەمەکەی (ک)یشـدا نـەبوو، ئێمـەش لـە کتێبـی (پیرشـالیاری زەردەشـتی)مان وەرگـرت» و هەروەها نووسراوە: «ئەم شێعرە لە کەشکۆڵی کەلەپوری ئەدەبی کوردیدا لاپەڕە ٢٢١ بە ناوی حەسەن کەنۆش بڵاو کراوەتەوە.» بە پێی ئەم چەن خاڵـە و هـاتنی نـاوی «موسـتەفا» بـۆی هەیـە شـێعری بێسارانی نەبێت.
٢- جە: لە. بەیان: کازیوە، بەیانی زوو. یاوان: گەیشتووە. واتە: لە بەیانییەوە حاڵێکی وەهام بە سەر هاتووە و شێواوم. لە بەیتە دواییەکاندا هۆکەی بەیان دەکات.
٣- بەیان: کۆی بەی، بەهێ، مەبەستی سـینە و مەمکەیـە. مەدرۆشـۆ: دەدرەوشێتەوە، وریشـەی دێت. چوون: بە وێنەی، وەک. نەجم: ئەستێرە، هەسارە. واتە: چاوم کەوتووە بـە خاڵێـک لـە بـەینی سینەکانیدا کە وێنەی ئەستێرەیەکە لە کازیوەدا بدرەوشێتەوە و وریشەی بێت.

حـــــەیان لـــــوول وەردەن وە بەیانـــــەوە
وە بـــــان بەیانـــــدا مەشـــــنیانەوە[1]

حـــــەککاکان دەور گشـــــت بەیانـــــەوە
کـــێ دیـــەن مـــەغریب جـــە بەیانـــەوە[2]

هـــەرتا «موســـتەفا» ســـەر مەنیانـــەوە
هـــەر هـــا بـــە حەســـرەت ئـــەو بەیانـــەوە[3]

***

---

١- حەیان: کۆی وشەی «حەی» عەرەبییە بە مانای مار، مەبەستی پەلکەیە کە شوبهێندراوە بە مار. وەردەن: خواردووە. بەیان: کازیوە، بەیانی، مەبەستی سپیدە دەمە. بەیان: سینە، مەمکە. مەشنیانەوە: لەرەی دەهات، واتە: پەلکەی زوڵفی یار بە وێنەی مار لە سەر سینەیەوە پەپکەی خواردووە و هەر لەرەی دێت.

٢- حەککاک: مێژوونووس، کەسێک کە لە سەر تەختەبەرد کەندەکاری دەکات بۆ ئەوی بۆ هەمیشە بمێنێتەوە. دەور: دنیا، ڕۆژگار. گشت: هەموو. بەیانەوە: بێن، حازربن. دیەن: بینیوە، دیوە. واتە: هەموو مێژوونووسان بانگ بکەن با بێن بزانم تاکوو ئێستە کێ مەغریبی لە کازیوەدا بینیوە. مەبەستی لە کازیوە سینە و بەرۆکی یارە و مەغریبیش خاڵە ڕەشکەی نێوان مەمکەکانی یارە کە لە بەیتە پێشووەکاندا دەڵێت چاوم پێی کەوتووە و حاڵمی تێکداوە.

٣- هەرتا: هەتاکوو، هەتا وەکوو. موستەفا: ناوی بچووکی بێسارانییە. سەرمەنیانەوە: سەر دەنێتەوە، دەمرێت، لە زمانی هەورامی‌دا سەر نیانەوە بە مانای مردنە. حەسرەت: خەم و خەفەت خواردن. واتە: هەتا ئەو ڕۆژەی موستەفا سەر دەنێتەوە و دەمرێت هەر وا بە ئاواتی ئەو سینانەوە یا ئەو خاوەن سینەوە. لەم بەیتەدا بەیان هەم دەتوانێت بە مانای بەی بێت هەم بە مانی کازیوە.

-٤[1]-

جـە کۆشـان بـی دەرد؟ جـە کۆشـان بـی دەرد؟
فـەرهاد و مـەجنوون جـە کۆشـان بـی دەرد؟[2]

فـەرهاد نـە تـاوش بێسـتوون سـا کـەرد
مەجنوون جە ئاهش سـەنگ مـەبی بـە گـەرد[3]

فـەرهاد هـەر سـەنگش تاشـا بـە تێشـە
مـەجنوون کۆگـەردیش کـەردەبێ پێشـە[4]

---

-٤-

١- ن، ک، ح، ئێ، س، ب، ر، بر.

٢- جە کۆشان بێ: لە کوێیان بوو. واتە: فەرهاد و مەجنوون کە هێندە باسیان دەکەن و وەک دوو عاشق لە هەموو شوێنێک ناویان دەبەن کەی دەردیان بووە و دەردەدار بوون؟ (فەرهاد و مەجنوون دەرد و ئێش و ئازاریان لە کوێ بوو؟ ((وەرگێڕ)).

٣- نە تاوش: لە تاوی. سا کەرد: لە بێخی هێنا، خاپووری کرد. مەبی: دەبوو. گەرد: تۆز. بێستوون: ناوی کێوێکە کە وا لە ڕۆژهەڵاتی شاری کرماشاندا و وەها مەشهوورە دەڵێن فەرهاد لەبەر عەشقی شیرین و لەبەر ئەوەی شیرینی پێ بدەن دەستی کرد بە کەندنی ئەو کێوە و ... چیرۆکێکی درێژە کە لێرەدا ناگونجێت هەمووی بنووسین. واتە: لە تاوی عەشقی فەرهاد بێستوون خاپوور بوو و لە ئاخ هەڵکێشانی مەجنوون بەرد دەبوو بە تۆز. مەبەستی ئەوەیە بڵێت ئەوان تا ئەو ڕادە عاشق بوون بەڵام من لەوان عاشقترم. لە بەیتە دواییەکاندا ئەمە زیاتر دیاری ئەدات.

٤- تاشا: تاشی، داتاشی. تێشە: قوڵنگ، ترێشتە. پێشە: پیشە، کار، عادەت. واتە: فەرهاد هەر بە قوڵنگ بەردی دەتاشی و مەجنوونیش کار و پیشەی ببوو بە کێوگەردی.

فــەرهاد هــەر ســەنگش مەتاشــا جــە تــاش
مەجنوون جە ئاهش سەنگ مەبی خاش خاش[۱]

مەگـــەر دەردەدار چـــوون ئـــەوان مـــەبۆ؟
دایـــێم ڕەنـــگ زەبـــوون ناتـــەوان مـــەبۆ؟[۲]

دەردەدار کەســـێن دەردش بـــۆ نـــە ســـەر
دووش کـــۆی بێســـتوون بگێـــرۆ نـــە وەر[۳]

مـــن زەڕێ دەردم هـــا نـــە دەروونـــدا
وەختـــەن نەجـــد بـــدۆ وە بێســـتووندا[٤]

☆☆☆

۱- مەتاشا: دەتاشی. مەبی: دەبوو. خاش خاش، ڕێزە ڕێزە، ورد. واتە: فەرهاد هەر خەریکی تاشینی تاشە بەرد بوو و لە ئاهی سەردی مەجنوونیش بەرد ڕێزە ڕێزە دەبوو.

۲- چوون: وێنەی، وەک. مەبۆ: دەبێت، دەبێ. زەبـوون: لاواز، بـێ گریـگ. واتـە: مەگـەر دەردەدار دەبێ وەها بێت و بە وێنەی ئەوان دایبم لاواز و بێ گریگ بێت؟

۳- کەسێن: کەسێکە. بۆ نە سەر: لە سەردا بێت. دووش: دووکەڵی، دووکەڵی ئەو. گێـرۆ: بگرێـت. نە وەر: لە بەر. واتـە: دەردەدار کەسـێکە دەردی لـە سـەردابێت یـا دەردی ببێـت و سـەری نـەبێ، هەناسەی وەک دووکەڵی، کێوی بێستوون لەبەر بگرێت و چیتر بێستوون نەبینرێت.

٤- زەڕێ: زەڕەیەک. ها نە دەروونداَ: لە دەروونداَیە. وەختەن: وەختە، هاکـا، لەوانەیـە. نەجـد: نـاوی کێوێکە لە عەرەبستاندا کە وەها مەشهوورە مەجنوون لە تاو عەشقی لەیلا داویە بەو کێـوەدا و لـە چیرۆکی لەیلێ و مەجنووندا باسی کراوە. بدۆ: بدا. واتە: من زەڕەیـەک دەرد لـە دەروونمدایـە هاکـا کێوی نەجد بدا بە سەر بێستووندا. مەبەستی ئەوەیە کە من لە مەجنوون و فەرهاد عاشقترم.

-۵[1]-

جـــەمینش ســـافەن، جـــەمینش ســـافەن
شەخســێ چـوون ئافتـاب جـەمینش سـافەن[2]

ســـــەرتاپای بــــاڵاش موشـــکین کلاّفـــەن
جـــە نائیســـــافی نــــامێش «ئیســـــاف»ەن[3]

ئـــەر مـــــەبیش زەڕێ ئیســـــاف نـــە دڵـــدا
نمـــــەدا ش دەســـــتەی ســـونبوڵ بـــە گڵـــدا[4]

---

☜ لێرەدا بە هێنانی ناوی ئەو دوو کێوە (نەجد و بێستوون) لە ڕاستیدا دمیەوێت بڵێت من لە فەرهاد و مەجنوون دەردەدارترم چونکە خەریکم بێستوون و نەجد بە یەکدا دەدەم یا دەکرێت «بدۆ» بە «بدەو» بخوێنینەوە و بەم جۆرە مانای کەینەوە: «هاکا نەجد بماڵم بە بێستووندا».

-۵-

۱- ن، ئێ، ک، ب، ح، س، ڕ.

۲- جەمین: نێوچاوان، ڕوخسار. شەخسێ: کەسێک. چوون: وێنەی، وەک. ئافتاب: هەتاو، تاو، خۆر. سافەن: سافە. واتە: کەسێک ڕوخساری بە وێنەی هەتاو سافە.

۳- موشکین: ڕەش و بۆنخۆش بە وێنەی موشک. کلاّف: کلاّفە، لێرەدا مەبەست زوڵفە. نائیسافی: بێ ئینسافی، ناحەقی، بێ عەداڵەتی. نامێش:ناوی ئەو. ئیساف: عەداڵەت، هەر وەها ناوێکی ژنانەیشە. واتە: زوڵفی ئەوەندە درێژە سەرتاپای باڵای لەبەر گرتووە و بە ناحەق ناوی «ئیساف»ە. وا دیارە بێسارانی ئەم شێعرەی سەبارەت بە ژنێک (کچێک) نووسیوە بە ناوی «ئیساف» چون دەڵێت «نامێش ئیسافەن» و ئەوکات ناوی «ئیساف» زۆر بووە و ئێستەیش هەر هەیە.

۴- ئەر: ئەگەر. مەبیش: دەبیوو. زەڕێ: زەڕەیەک. نمەدا ش: نەیدەدا، نەی ئەدا. سونبول: سمڵ، ناوی گوڵێکی جوان و بۆنخۆشە. گڵ: قوڕ، هەڕ. واتە: من حەقمە ئەگەر بڵێم بێ ئینسافە ☜

مــەودای مــوژانش مێــڵســاو نمەکــەرد
پێشـــان ئاڵـــەمێ بـــێ خـــاو نمەکـــەرد [١]

هــەڵا، بــە شــەراب خــەمزەی نــاز فــرۆش
پەی چێش مەبەردش دیدەی وێش جە هـۆش؟ [٢]

یــا شــا، ئــەو زەریــف، ســاف سـیم ئەنــدام
نـــەدارۆ ئینســـاف، پەنـــەش نیـــەن ڕام [٣]

---

☜ چون ئەگەر ئینسافی ببوایە نەیدەهێشت ڕوڵفی ئەوەندە درێژ ببێت و بگاتە زەمین یا دەتـوانێ مەبەستی لە گڵ خەنە بێت واتە خەنەی لە زولفی نەدەگرت. دەکرێت وشەی «گڵ» بە پێی نوسخە خەتیەکان کە «گل» نووسراوە بە «گوڵ» بخوێنینەوە و بڵێین گوڵی بە زولفەکانیـدا نـەدەکرد. بـەڵام لەبەر ئەوەی لە نێوە بەیتی یەکەمدا «سەر تا ڵای باڵاش»ی هێناوە مانا پێشووەکە نزیکترە.

١- مەودا: نووکی تیژ. موژان: برژانگ، مژۆڵ. مێڵ: مێلی چاو ڕەشتن (مێڵ و کلە). مێڵساو: بـە مێڵ ساف کردن یا بە مێڵ ساوین، مەبەستی چاو ڕەشتنە. نمەکەرد: نەدەکرد. پێشان: پێیان. ئاڵەم: عالەم. بێ خاو: بێ خەو. واتە: ئەگەر ئینسافی ببوایە چاوی نەدەڕەشت و نووکی برژانگـە تیژەکـانی ساف نەدەکرد تا خەو لە عالەمێک حەرام بکات.

٢- هەڵا: دەنگێک بۆ ئاگادار کردنەوە. خـەمزە: ئیشـارەی چـاو. پـەی چـێش: بـۆچی. مەبـەردش: دەیبرد. وێش: خۆی. جە: لە. واتە: ئەگەر ئینسافی ببوایە بۆچی بە شەرابی خەمزە و ناز فرۆشتنی دیدەی خۆی مەست دەکرد؟ لە سـەرچاوەکانی «س»، «ب»، «ڕ» و «ح»دا بـە دوای ئـەم بەیتـەدا بەیتێکی دیکە هاتووە کە لە شێعری بێسارانی ناچێت و ئەمەیش بەیتەکە بە پێی ئەو سەرچاوانە:

یــا اللّٰە بــە حاجــەت دیــدەی پێغەمبــەر    بــە مــوعجیزەی دەســت درازی حەیــدەر

هەر وەها کە دیارە شێعرەکە ناشیگەری پێوە دیارە و لە شێعری بێسارانی ناچێت.

٣- یا شا: ئەی خودا. سیم: زێو، نوقرە، (دەکرێت بە مانای باریکیش بێت. «وەرگێڕ»). نەدارۆ: ☜

زەڕێ ئیســــــــافش وزی نــــــــە دەروون

تــــا دەردینـــــانش ســــەر نــــەنیان وە تـــوون[1]

☆☆☆

☜ نیەتی. پەنەش: پێی. ڕام: ڕەحم. واتە: ئەی خودا ئەو جوانە کە ئازای ئەنامی بە وێنـەی زێـو سپی و سافە، ئینساف و ڕەحمی نییە. لە بـەیتی داهـاتوودا نزاکـەی تـەواو دەکـات. لـە نوسـخەی «ک»دا نیوە بەیتی یەکەمی بەم جۆرە نووسراوە: «ئەو شۆخ ئەو زەریف ساف سیم ئەندام».

١- وزی نە دەروون: بخەیتە دڵەوە، لە دەروون بخەی. دەردینانش: دەردەدارەکانی، ئەوانـەی دەردەداری ئەون. توون: لێرەدا مانای سارای چۆڵ و گەرمی هەیە، لە بنەڕەتدا توون نـاوی شـارێکە کـە ئێسـتە ناوی «فیردەوس»ـە و ناوەندی پارێزگای خوراسانی باشوورییە لە ئێرانـدا. ئـەم وشـە زیـاتر لەگـەڵ وشەی «تەوەس»دا بە کار دەبرێت کە ئەویش هەر شارێکە لە کەناری تـوون دایـە، توونـاوتوون، بـە توون، بە تەوەس، سەرچاوەی هەموو ئەمانە هەر یەکن. وادیارە بە هۆی زۆر گەرم بوونیەوە کەوتووەتە سەر زار. واتە: بەڵکوو زەڕەیەک ئینساف بخەیتە دڵ و دەروونیەوە با چیتـر دەردەدارەکـانی سـەریان هەڵنەگرن و ڕوو لە توون نەکەن.

-١-[1]

چــراخ! ئــەر ســاتێ دوور گنــوو جــە تــۆ
نــــەمانوو شــــاڵڵا بوینــــوو ئــــەو ڕۆ[2]

خـــەیاڵ چـــوون نێشـــتەر دڵ مـــەکاونۆ
دڵ جــــە دیـــدەم ســــەیل زوخ مـــەیاونۆ[3]

دیـــــدەم بینـــــایی پـــــێش نمـــــەمانۆ
پـــەڕ و بـــاڵ نـــە دەور زوڵـــمات مەشـــانۆ[4]

---

-١-

١- ن، ک، ئێ، س، م، ب، ح، ڕ، ئا، عم.

٢- چراخ: بێسارانی لە زۆربەی شێعرەکانیدا بۆ خۆشەویستەکەی، وشەی «چراخ»ی بـە کـار بـردووە. دیارە لەبەر ئەوەیە کە چرا ڕۆشنایی دەرە و بە وێنەی شەم، پەپوولە لە دەوری کۆ دەبنـەوە و هـەروەها شەم هێمای عەشق و ئەوینە، چرایش لە شێعری بێسارانیدا بۆ ئاخاوتن لەگەڵ مەعشووقدایە بـێ ئەوەی ناوی ببات. گنوو: بکەوم. دوور گنوو: دوور بکەوم. نـەمانوو: نـەمێنم. شـەڵڵا: خوابکـات، ئیشەڵڵا. بوینوو: ببینم. ئەو ڕۆ: ئەو ڕۆژە. واتە: ئـەی یـار! ئەگـەر بێـت و سـاتێک لـە تـۆ دوور بکەومەوە خوا بکا نەمێنم تا ئەو ڕۆژە بە چاو ببینم.

٣- چوون: وێنەی، وەک. نێشەر: نەشتەر، کەرەستەیکی نووک تیژ کە خوێن لـە جەسـتەی مـرۆڤ بێنێت. مەکاونۆ: کون دەکات، توێ توێ دەکات، دەقڵیشـێنێت، دەتلیشـێنێت. سـەیل: لافـاو. زوخ: زووخاو. مەیاونۆ: دێنێت، دەهێنێت. واتە: فکر و خەیاڵی ئەوەی کە ڕۆژێک لە تۆ دوور بکەومـەوە وەک نەشتەر دڵم کون کـون دەکـات و دڵـم لافـاوی زووخـاو دێنێتـە چـاوانم و لە گـەڵ ئەسـرینەکانم دەبارێت.

٤- پێش: پێی، بە ئەو. نمەمانۆ: نامێنێت. نە دەور: لە دەور. زوڵمات: تاریکی. مەشانۆ: ☜

بەشـــق شـــای شـــاهان، هـــەی بەرگوزیـــدە
بینـــاییم تـــۆنی، مەشـــۆم جـــە دیـــدە[1]

-٢[2]-

چـــراخ ئـــەودالان، چـــراخ ئـــەودالان
پـــەیم کـــەردی تـــەواف بارگـــەی ئـــەودالان[3]

---

دەوەشێنێت، بڵاو دەکاتەوە. واتە: چاوم ڕۆشنایی بۆ نامێنێت و لـە تاریکـاییدا بـاڵ لـێ دەدا و هەر هەڵدەخولێت. مەبەستی ئەوەیە چون چاوم بینایی نامێنێت و سەرگەردانە وەک تەیرێک هـێچ نەبینێت لە گۆترە پەڕ و باڵ لێدەدات.

١- بەشق: بە عەشق، بە خاتری. شای شاهان: پێغەمبەر(س.خ). بەرگوزیـدە: هـەڵبژێراو، تاقانـە. تۆنی: تۆی، ئەتۆی. مەشۆم جە دیدە: لە چاوم مەڕۆ، لێم دوور مەکەوە. واتـە: ئـەی خۆشەویسـتە تاقانەکـەم! بینـایی چـاوانم ئـەتۆی، بیکـە بـە خـاتری پێغەمبـەر(س.خ) لـێم دوور مەکـەوە. لـە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «س» و «ن»دا بە جێی «مەشـۆم جـە دیـدە»، «بـۆ شـۆم جـە دیـدە» نووسراوە، بەڵام هەر وەها کە بێسارانی لە بەیتی یەکەمـدا دەڵێـت، یـاری لـێ دوور نییـە تـا بێـت و بچێتەوە تـۆی دیـدەی، بـەڵکوو وا لـە لای و ئەگـەر لێـی دوور بکەوێتـەوە وەک ئەوەیـە بینـایی و ڕۆشنایی لە چاوانی ڕۆشتبێت. کە وەها دەڵێت «نـووری چـاوانم تـۆی بیکـە بـە خـاتری پێغەمبـەر (س.خ) لە دیدەم مەڕۆ با دیدەم بینایی لە دەست نەدا و لە تاریکیدا باڵ لێ نەدات...».

-٢-

٢- ن، ک، ئێ، ح، س، ب، ڕ، عم.

٣- چراخ: خۆشەویست. ئەودالان: کۆی «عەبداڵ»ـە بە مانـای کەسانێک کـە ئـەولیای خـودان و حەوت یا حەفتا کەسن و دایم بە سەر زەمینـەوەن و کـەم نابنـەوە و ئەگـەر یـەکێکیان لـێ بمرێـت کەسێکی دیکە جێگەی دەگرێتەوە و هەروەها ناوی کێوێکە لە هەوراماندا کە دەکەوێتە پشتی

بێحـــــەد بــــە زاری وەنەشـــــان لاڵان
پێشـــان ســـپەردیم، شـــای سۆســـەن خـــاڵان![1]

بـــە مـــوژە جـــاڕووی ماواشـــان کـــەردم
بـــە زوان بـــاڵات پێشـــــان ســـپەردم[2]

سوودشـان چێش بـۆ قیبلـەم جـەی خاسـتەر؟
دۆعـاگووی تـۆ بـان هـەر شـام هـەر سـەحەر[3]

***

☜ دێی دەرەکی و وەک «سەیدی هەورامی» لە پارچە شێعری «چوون کۆی عـەوداڵان»دا باسـی دەکات، ئەو کێوە ئەشکەوتێکی تێدایە کە بارەگای «حەوت عەوداڵ» لەوێدایە و خەڵک بۆ گەیشتن بە ئاوات و موورادی دڵیان دەڕۆن لەوێ دەلاڵێنەوە، هەر وەها لـە کۆساڵانیشـدا شـوێنێک هەیـە کـە «حەوت ئەوداڵ»ی پێ دەڵێن. پەیم کەردی: بۆتم کرد، بۆ تۆم کرد. واتە: ئەی یار! ڕۆیشتم و تـەوافی بارەگای ئەوداڵانم بۆت کرد.

۱- وەنەشان: لێیان. لاڵان: لاڵامەوە، پاڕامەوە. پێشان سپەردیم: پێیانم سپاردی. سۆسەن خاڵ: ئەوەی کە خاڵی بە وێنەی گوڵی سوێسنە جوانە. واتە: بێ حەد و ئەنـدازە لێیـان پاڕامـەوە و تـۆ کـە شـای سووسەن خاڵانی پێیانم سپارد تا ئاگایان لێت بێت.

۲- موژە: برژانگ، مژۆڵ. جاڕوو: گسک. گزی. ماوا: شوێن و مەکان، جێگەی ئۆقرە گرتن. سپەردم: سپاردم. واتە: بە مژۆڵ شوێن و مەکانیانم خاوێن کردەوە و بە زمانیش پێیانم وت کە ئاگاتان لە بـاڵای بێت و باڵاتم پێیان سپارد.

۳- سوود: قازانج، دەستکەوت. چێش بۆ: چی بێت. جەی خاستەر: لە ئەمە خاستر، لەمە خاسـتر. دۆعاگووی تۆ بان: دۆعاگۆی تۆ بن، دۆعا بۆ تۆ بکەن. شام: ئێوارە. سەحەر: بەیانی، کازیوە. واتـە: چی هەیە لە ئەمە باشتر بێت بۆ ئەوان (ئەوداڵان) کە هەموو ئێوارە و بەیانییەک دۆعا بۆ تۆ ☜

-٣-[1]

چـــراخ بـــەدکاران، چـــراخ بـــەدکاران
مـــەزانی چوونـــەن واتـــەی بـــەدکاران[2]

بـــەو ســـەیل مـــەمانۆ جـــەوەڵ وەهـــاران
مـــەوارۆ وە ســـاق ســـپی چنـــاران[3]

نـــە مـــەتاوۆ ڕەنـــگ ســـپیش بـــەرۆوە
نـــە بـــاڵاش جـــەو تـــەرح کۆتـــا کـــەرۆوە[4]

هەرچەنـــد فێشـــتەرەن ســـەیل وەهـــاران
خاســـتەرەن ڕەونـــەق چـــەتر چنـــاران[5]

---

☜ بکەن؟ مەبەستی ئەوەیە لە ئەمە باشتریان دەست ناکەوێت کە هەموو ئێوارە و بەیانییەک خەریکی دۆعا کردن بۆ تۆ بن.

-٣-

١- ن، ح، ک، ئێ، س، ب، ڕ.

٢- بەدکار: خراپ کار، کەسێک کە کاری چاکی لە دەست نایە. مەزانی: دەزانی. چوونەن: چۆنە. مانای ئەم بەیتە و سێ بەیتی دوایی لەبەیتی چوارەمدا پێکەوە دێن.

٣- سەیل: لافاو. مەمانۆ: دەچێت، شێوەی دەدات. بەو سەیل مەمانۆ: لەو لافاوە دەچێت. جەوەڵ: لە ئەوەڵ لە سەرەتاوە. مەوارۆ: دەبارێت. ساق: لاشە. سپی چنار: سپیدار، سوورە چنار.

٤- مەتاوۆ: دەتوانێت، پێی دەکرێت. بەرۆوە: بباتەوە. جەو: لەو، لە ئەو. تەرح: شکڵ و شێوە. کەرۆوە: بکاتەوە، بکات.

٥- فێشتەرەن: زۆرترە، زیاترە. وەهار: بەهار. خاستەرەن: خاسترە، باشترە. ڕەونەق: گەشە. چەتر: ☜

چــراخ! ئــەر ســەد بــار بــەدان بــەدگۆ
وێنــەی ســەیل بــەدی بواچــان بــە تــۆ[١]

تــۆ هــەر بــەو چنــار ســپی بنمانــە
جــە واتــەی بــەدان جــەلا بســتانە[٢]

***

-٤[٣]-

چــراخ تــا کــەردم، چــراخ تــا کــەردم
یــەک تــایێ جــە زڵــف ســیات تــا کــەردم[٤]

---

☜ گەڵا و لق و پۆپ. واتە: ئەی یار! دەزانی وتەی بەدکاران لە چی دەچێت؟ بە وێنەی ئەو بارانەیە کە سەرەتای بەهار دەبارێت بە سەر لاشەی سوورە چنارانـدا، بەڵام نـە دەتوانێـت ڕەنگـە سپییەکەیان ببات نە دەتوانێت باڵایان کورت بکاتەوە و هەرچی بارانی بەهاری زیـاتر بێـت گەشـە و نەشەی سوورە چناریش زیاترە.

١- بەدگۆ: خراوگۆ، فیتنە، کەسێک کە خراپەی کەسانی دیکە دەڵێت. بواچان: بڵێن، ببێژن. مانـای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دایە.

٢- بنمانە: بنوێنە. واتەی: وتەی، قسەی. جەلا بستانە: جـەلا بسـێنە، ڕۆشـن ببـەوە، بریقەداربـە. واتە: نازیز ئەگەر سەد جاریش فیتنەیان خراپەیان پێ وتی تۆ هەر بە وێنەی ئەو سوورە چنارە بـە و بە وتەی خراپیان جەلا بستێنە و گەشە بکە. مەبەستی ئەوەیە گوێت لە وتەی فیتنە و خراپە وتـان نەبێت.

-٤-

٣- ن، ح، ک، نێ، س، ب، ر، ئا، عم.

٤- چراخ: خۆشەویست، نازیز. تا کەردم: تاکم کردەوە، جیام کردەوە، جودام کردەوە. تایێ: تاڵێک. ☞

ڕۆح چـــەنی ئـــەو تـــا جابـــەجا کـــەردم
ســـەد نفــرین وە تــەخت شــاهی شــا کــەردم[1]

ئیســـە مـــن گیـــانم ئـــەو تــایێ وەش بـــۆن
ئـــەو گیـــان نـــە جـــای تـــایێ زلـــف تـــۆن[2]

***

-٥-[3]

چـــــراخ جگـــــەرم، چـــــراخ جگـــــەرم
چـــراخ ســـەد پـــارەن بـــێ تـــۆ جگـــەرم[4]

---

زلف: زوڵف، پرچ، قژ، کەزیە. واتە: ئەی یار! تاڵێک لە زوڵفە ڕەشەکانتم جودا کردەوە.

١- چەنی: لەگەڵ. جابەجا: جێ بە جێ، گۆزانەوە، شوێن گۆڕین. نفرین: نەعلەت، نەحلەت، دۆعای شەڕ. واتە: هەر ئەو کاتە کە تاڵی زوڵفە ڕەشەکانتم جودا کردەوە، ڕۆحیشم جودا کردەوە و بردم لە جێگەی تاڵە زوڵفەکەی تۆدا دامنا و سەد نەعلەتم لە تەختی پاشایی کرد چون لە پاشا خۆشترم بوو. لە نوسخەکانی «ک»، «ئێ» و «ئا»دا بە جێی «جابەجا کەردم»، «جابەجا بەردم» نووسراوە. بەڵام لەبەر ئەوەی «کەردم» سەروای هەر چوار نیوە بەیتەکەیە «بەردم» دروست نییە.

٢- وەش بۆن: بۆن خۆشە، خۆش بۆیە. تۆن: تۆیە، ئەتۆیە. واتە: ئێستە بە جێگەی گیانی من ئەو تاڵە زوڵفەی تۆیە و تاڵە زوڵفەکەی تۆ لە جێگەی گیانی منە و بووە بە گیانی من و گیانی منیش چووەتە جێگەی زوڵفەکەی تۆ و ئاوێتەی زوڵفە بۆن خۆشەکانت بووە.

-٥-

٣- ن، ک، ئێ، ح، س، ب، ڕ، عم.

٤- پارە: لەت لەت، کوت کوت. واتە: ئەی یار! جگەرم لە دووری تۆ لەت لەت بووە. لە هەندێک لە سەرچاوەکاندا بە جێی «چراخ جگەرم»، «چراخم جەرگم» نووسراوە بەڵام دەبێت هەر چوار نیوە

هــەر یەنــد مــەیۆ ئــاه دڵ پــارە کــەرم
پــارەش مــەویارۆ جــە بــاڵای ســەرم[1]

بــە وێنــەی پڕشــنگ کــوورەی گــڕ نــە ســەر
هەناســـەم ڕێــزەی دڵ مــارۆ وە بــەر[2]

فیــدای کــەردەی کــار بــە بــێ تۆییــت بــام
خــەیاڵ کوشــتەی ماوەرۆییــت بــام[3]

***

---

بەیتی سەرەتایی شێعرەکە هاوسەروا بن و ئەگەر «جەرگم» بێت لەگەڵ «کەرم» و «سەرم» هاو سەروا نین. لە نوسخەی «س»دا نووسراوە «جەرگم» بەڵام خوا لێخۆشبوو سەیید تاهێری هاشمی لە کەناری دا نووسیویە: «بیت دوم این غزل می بایست قافیە از قبیل مرگ و برگ داشتە باشد. ظاهراً یک بیت ناقص دارد. طاهر هاشمی» کە دروست بۆی چووە بەڵام نەیزانیوە بەیتی یەکەم کێشەی هەیە.

۱- یەند: هێندە، ئەوندە. مەیۆ: دێت. مەویارۆ: تێ دەپەڕێ. واتە: هێندە ئاهی دڵ کوت کەر لە دەروونمەوە دێت و دڵم کوت کوت دەکات کە کوتی دڵم لە سەرمەوە تێدەپەڕێ.

۲- پڕشنگ: پژگە، پریسکە. مارۆ: دێنێت، دەهێنێت. واتە: بە وێنەی پریسکەی ئاگری کوورەیەک کە گڕی لە سەریەوە بەرز دەبێتەوە، هەناسەی منیش کوتی دڵم دێنێتە دەر و بە وێنەی پریسکەی ئاگر دەپرشێنێت.

۳- ماوەرۆییت: هێنانەوەت. واتە: بە قوربانی ئەو کارە بم کە بە بێ ئەوەی خۆت لەوێ بیت دەیکەی کە کوشتنی منە و دیسان بە قوربانی ئەو خەیاڵەت بم کە کوژراو زیندوو دەکاتەوە. واتە لە دوورەوە بە بیر کردنەوەی تۆوە دەمرم و دیسان بە خەیاڵی تۆوە زیندوو دەبمەوە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «کەردەی کار»، «کردەگار» نووسراوە کە دیارە هەڵەی ڕاست کردنەوەیە و کاک حەکیم بەم شێوە

-٦[1]-

چــــراخ جـــه خـــاودا، چـــراخ جـــه خـــاودا
نیمەشـــەو ئامـــای جـــه شـــیرین خـــاودا[2]

ئـــــایر دای وه دڵ، دەروونـــــم تـــــاو دا
دیـــدەم بـــه موژگـــان ســـەیل زاخـــاو دا[3]

دەرســـات جـــه خـــاودا ئوفتـــادەی پـــات بـــیم
ڕوخســـار گـــەردئالوود خـــاک پـــای ڕات بـــیم[4]

---

مانای کردوەتەوە: «بێ تۆ هەر خۆم بە قوربانی ئەو خوا بم کە وای لێکردم کوشتەی ئەو ناهە بم تۆ نەیهێنی پێمدا »!.

-٦-

١- ن، ک، ب، س، ح، ڕ، عم، ئا.

٢- جه خاودا: لە خەودا. ئامای: هاتی. واتە: ئەی یار! نیمەشەو کاتێک لە شیرین خەودا بووم هاتیە خەونم. یا دەکرێت بڵێین: نیمەشەو هاتیە خەونی شیرینم. * تێبینی: بە بڕوای من ئەو مانا دووهەمە کە مامۆستا حەبیبی نووسیویە، لە مانای شێعرەکەوە دوورە. «وەرگێڕ»

٣- ئایر: ئاگر. مەر: مەگەر. تاو: گەرمای زۆر. موژگان: برژانگ، مژۆڵ. سەیل: لافاو، تاوە باران. زاخاو: زاخ ئاو، زاخ لە وشەی زاج گیراوە کە مادەیەکە بە ڕەنگی جۆاوجۆر و یەکێک لەوانە زاجی ڕەشە کە بۆ ڕەنگ کردنی پێڵاو بە کاریان بردووە. واتە: کە هاتیە خەونم، ئاگرت لە دڵم بەردا و دەروونم تاوی گرت و دووکەڵی دەروونم بەرز بووەوە و ئاوێتەی ئەسرینی چاوانم بوو و بوو بە ئاوێکی ڕەش و چاوانیشم ئەو ئاوە ڕەشەی بە وێنەی تاوە باران باراند بە سەر مژۆڵمدا و مژۆڵمی پێ ڕەشت.

٤- دەرسات: بێ ماتڵ بوون، بێ ماتڵی، هەر ئەو کاتە. ئوفتادە: کەوتوو. بیم: بووم. گەردئالوود: تۆزاوی. واتە: بێ ماتڵ بوون و هەر ئەو کاتە کەوتمە بەر پێت ڕووم بە خاکی بەرپێت تۆزاوی بوو.

واتـــم مـــەر بڎیـــەی وە جەســـتەی هـــاڵم
بزانـــی پـــەی چـــێش دەروون زوخـــاڵم[١]

تـــۆ جـــە تانـــەی بـــەد ڕەقیبـــان تەرســـای
هـــیچ هـــاڵ دەروون ســـفتەم نەپەرســـای[٢]

ڕووت جێم گەردان کەرد، مـن سـەرگەردان بـیم
بـــەی تـــەور پابەنـــد بەنـــد زێنـــدان بـــیم[٣]

فیـــدات بـــام واتـــەی بـــەدکاران چێشـــەن
تـــۆ دڵـــت جێشـــان یەنـــد بـــە ئەندێشـــەن[٤]

***

١- واتم: وتم. بڎیەی: سەیر بکەی. هاڵ: حاڵ. پەی چێش: بۆچی. واتە: پاش ئەوەی خۆم خستە بەر پێتەوە وتم مەگەر سەیری حاڵی ئەم لاشەم بکەی و بزانی لەبەرچی بەم شێوە دەروونم بووە بە زوخاڵ و ڕەش بووەتەوە.

٢- تەرسای: ترسای، خۆفت کرد. سفتە: سووتاو. نەپەرسای: نەتپرسی. واتـە: بـەڵام تـۆ لـە تانـە و تەشەری ڕەقیبان ترسای و هیچ حاڵێکت لە دەروونی سووتاوی من نەپرسی.

٣- جێم: لە من. گەردان کەرد: وەرگێڕا، وەرچەرخاند. بەی تەور: بەم جۆرە، بـەم شـێوە، بـەم تـەرزە. پابەند: زنجیرکراو، ئەسیر. زێندان: زیندان: بەندیخانە. بیم: بووم. واتە: ڕووت لێم وەرگێڕا و منیش سەرگەردان بووم و بەم جۆرە ئەسیر و زنجیری بەندیخانە بووم.

٤- فیدات بام: بە قوربانت بم. واتە: وتە، قسە. چێشەن: چییە. جێشان: لـە ئـەوان، لـەوان. یەنـد: هێندە، ئەوەندە. بە ئەندێشەن: لە فکردایە. واتە: بە قوربانت بم مەگەر وتەی بەدکاران چییە کە تـۆ هیندە بەو وتە دڵت پەشۆکاوە و لە بەر تانە و تەشەری ئەوان حاڵی جەستەی من ناپرسی و ڕووم

-٧[١]-

چــراخ جــەی دنیــا، چــراخ جــەی دنیــا
ئەوەنـــد ئـــاواتم مەنـــدەن جـــەی دنیـــا[٢]

وەرتـــەر جـــە مـــەردەن بـــە دیـــدەم بـــدیا
لـــەب وە بـــان لـــەب لاڵ تـــۆم بنیـــا[٣]

---

☜ لێ وەردەگێری و سەرگەردانم دەکەیت.

-٧-

١- ن، ح، ب، س، ر، عم، مج.

ئەم پارچە شێعرە لە دیوانی «سەیدی هەورامی»یشدا هەیە و بە ناوی ئەویشەوە هاتووە و لەوێدا بە «قیبلەم جەی دنیا» دەست پێدەکات. لە نوسخەبنەڕەتیەکانی ئێمـەدا («ک» و«ئـێ») نـەهاتووە، ئەگەری ئەوە هەیە شێعری سەیدیش بێت بەڵام لـە بـەر ئـەوەی لـەو حـەوت سـەرچاوەدا بـە نـاوی بێسارانییەوە هاتووە و قاڵب و سـەبکی و شێوازی شێعرەکەیش لـە شـێعرەکانی بێسـارانییەوە نزیکـە ئێمەیش لێرەدا بە ناوی بێسارانییەوە هێنامان. پێویسـتە ئامـاژە بەمـەیش بکـەین کـە زۆرجـار لـە نوسخە نووسینەوەی شێعری شاعێراندا لە کەناری یەکتردا نووسراون و ناوی شاعێران دیاری نەکراوە و هەر بەو بۆنەوە شێعری شاعێران بە ناوی یەکترەوە نووسراوە.

٢- جەی: لەم. جەی دنیا: لەم دنیا. ئەوەند: ئەوەندە، هێندە. مەندەن: مـاوە. واتـە: ئـەی یـار! مـن تەنیا ئەوەندەم ئاوات و ئارەزوو لە دنیادا ماوە.... لە بەیتە دواییەکاندا دەڵێت ئـاوات و ئارەزووکـەی چییە.

٣- وەرتەر: پێشتر. مەردەن: مردن، گیان دەرچوون. بدیا: بـدیبا، دیتبـا. لاڵ: لـەعل، بـەردێکی پـڕ بەهایە بە ڕەنگی سوورێکی کاڵ. لەب لاڵ: لێوێک کە بە ڕەنگی لەعل بێت. بنیا: بنایە، دام بنایـە، لە سەرم نایە. واتە: پێش ئەوەی بمرم بە چاوی خۆم بدیبا کە لێوم لەسەر لێوە سـوورەکانی تۆیـە. لـە سەرچاوەی «ح»دا بە دوای ئەم بەیتەدا بەیتێکی دیکە هەیە کە دیارە بە هەڵە لێرەدا نووسراوە ☜

بـــۆ بنیـــام وه بـــۆی زڵـــف موشـــكینت
بكـــه‌ردام تـــه‌واف كه‌عبـــه‌ی جـــه‌مینت[١]

بـــڎیام ده‌ســـت تـــۆم شـــیه‌ن نـــه گـــه‌رده‌ن
ده‌رســـات مه‌واســـتم ئـــاوات وه مـــه‌رده‌ن[٢]

بـــاڵای وێـــم په‌شـــتان بـــاڵات بكـــه‌ردام
حه‌ســـره‌ت نمـــه‌بی، ئه‌وســـه بمـــه‌ردام[٣]

* * *

---

چونكه به‌یتێكه له شێعری «چراخم كه‌ره‌م». به‌یته‌كه ئه‌مه‌یه:

هه‌ر دوو بنیامان سـه‌ر وه یـه‌ک سـه‌رین    كـــه‌ردامان ڕازان ویـــه‌رده‌ی وه‌ریـــن

١- زڵف: زوڵف، كه‌زیه، قژ، پرچ. موشكین: به وێنـه‌ی موشـك ڕه‌ش و بۆنخـۆش. كه‌عبـه: كابـه، مـاڵی خـودا. جـه‌مین: ڕوخسـار. كه‌عبـه‌ی جـه‌مین: ئیزافـه‌ی ته‌شـبیهییه و ڕوخسـاری یـاری شوبهاندووه به كابه‌وه. واته: بۆنی زوڵفه بۆن خۆشه‌كانتم بكردایه و هه‌ر وه‌ک حاجی كه ته‌وافی ماڵی خودا ده‌كات منیش به ده‌وری ڕوخسارتدا بگه‌ڕایه‌م و ته‌وافی ڕوخسارتم بكردایه.

٢- بڎیام: بمدیبا، دیتبام. شیه‌ن: ڕۆیشتووه. نه گه‌رده‌ن: له مل. ده‌رسـات: بـێ مـاتڵی، بـێ ماتـڵ بوون، هه‌ر ئه‌و كاته. مه‌واستم: ده‌م خواست. واته: بمدیبا ده‌ستی تۆم لـه ملدایـه هـه‌ر ئـه‌و كاتـه ئاواتی مردنی خۆمم ده‌خواست.

٣- وێم: خۆم. په‌شتان: په‌خشان، ئاوێته بوون، به وێنه‌ی لاولاو ئاڵان بـه ده‌وری شـتێكدا. بكـه‌ردام: بمكردایه. حه‌سره‌ت نمه‌بی: داخم نه‌ده‌ما. ئه‌وسه: پاشان، دوای ئه‌وه. بمه‌ردام: بمردمایه، بمردایـه‌م. واته: باڵای خۆم ئاوێته‌ی باڵات بكردایه و باڵام له باڵات بئاڵایه و پاشان ئه‌گه‌ر بمردایه‌م چیتر داخ له دڵمدا نه‌ده‌ما. له سه‌رچاوه‌ی «ن»دا به جێی «په‌شتان»، «په‌خشان» نووسراوه و له نوسخه‌ی

-٨-[1]

چــراخ! چــەنی تــۆ، چــراخ! چــەنی تــۆ
وێــم بــە وێــم بــدیام شــەوێ چــەنی تــۆ[2]

بــۆ بنیــام نــە بــۆی شــەمامەی وەشــبۆ
بویــارام بــە شــاد ئــەو شــەو تــا بــە رۆ[3]

---

☞ «س»یشدا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «داخم نەمەندا، ئەوسا بمەردام» و هەر لەو نوسخەیشدا بە دوای ئەم بەیتەدا بەیتێکی دیکە هاتووە کە بەیتی کۆتایی پارچە شێعری «چراخم کەرەم»ـە و بەیتەکە ئەمەیە:

ئەوســا جــەودما ئەگــەر مەمــەردم    پــەی مــەردەنی وێــم شــادی مەکــەردم

-٨-

١- مج.

ئەم پارچە شێعرە تەنیا لە نوسخەی مەلا ئەحمەدی جوانڕۆییدا هاتووە و هەر وا کە دیارە دوو بەیتی لەگەڵ شێعری پێشوو «چراخ جەی دنیا»دا هاویەشن، بەڵام لەبەر ئەوەی دەسپێکەکەی لەگەڵ ئەودا جیاوازی هەیە و هەر چوار نیوە بەیتەی سەرەتاییکەی جیاوازە وەک شێعرێکی سەر بە خۆ لێرەدا هێنامان.

٢- چەنی تۆ: لەگەڵ تۆ. وێم بە وێم: خۆم بە چاوی خۆم. بدیام: بم دیبا، دیتبام. واتە: ئەی یار! ئاواتم ئەوەیە کە جارێک بە چاوی خۆم بمدیبا شەوێک لەگەڵ تۆدام. (بە کوردی و کورتی واتە: ئاواتم ئەوەیە شەوێک خۆم لەگەڵ تۆدا ببینم «وەرگێڕ»).

٣- بۆ بنیام: بۆنم بکردایە. شەمامە: میوەیەکی بۆنخۆشە بە وێنەی کاڵەک و لە پرتەقاڵ گەورەترە کە بە فارسی «دستنبو»ی پێ دەڵێن، لێرەدا مەبەست لە سینەی یارە. وەش بۆ: بۆنخۆش. بویارام: ڕامبواردایە. ڕۆ: ڕۆژ. واتە: سەرم لەسەر سینەت بنایە و بۆنی سینەی بۆنخۆشتم بکردایە و ئەو شەوەم تا بەیانی بە خۆشی ڕابوردایە.

بــۆ بنیــام بــە بــۆی زڵــف موشــکینت
بکــەردام تــەواف کەعبــەی جــەمینت[1]

بــاڵای وێــم پەشــتان بــاڵات بکــەردام
هــیچ داخــێ نــەبیام، ئەوســە بمــەردام[2]

لــەبان لاڵــت وێنــەی جــام مــەی
بگێرتــام نــە دەم بواتــام ئۆخــەی[3]

✡✡✡

---

۱- زڵف: زوڵف، کەزیە، پرچ، قژ. موشکین: بە وێنـەی موشـک ڕەش و بۆنخـۆش. کەعبـە: کابـە، ماڵی خودا. جەمین: ڕۆخسار. کەعبەی جەمین: ئیزافەی تەشبیهیە، ڕوخساری یـاری شـوبهاندووە بە کابەوە. واتە: زوڵفە ڕەش و بۆن خۆشکانتم بۆن بکردایە و وەک حـاجی کـە تـەوافی مـاڵی خـودا دەکەن منیش تەوافی ڕوخسارتم بکردایە. ئەم بەیتە لە شێعری «چراخ جەی دنیا»یش دا هەیە.

۲- پەشتان: پەخشان، ئاوێتە بوون، بە وێنەی لاولاو ئاڵان بە دەوری شتێکدا. بکـەردام: بمکردایـە. داخێ نەبیام: داخێکم نەبوایە. ئەوسە: ئەو کات، ئەو وەختە. بمەردام: بمردایەم، مردبام. واتە: باڵای خۆم پەخشانی باڵای تۆ بکردایە و لە دەوری باڵاتم بئاڵاندبا و هیچ داخ و حەسرەتێکم نەبوایـە و ئـەو کاتە بمردایەم. ئەم بەیتە بە هەندێک جیاوازییەوە لە شێعری «چراخ جەی دنیا»یشدا هاتووە.

۳- لەبان: لێوان، لچ. لاڵ: لەعل، سوور بە وێنەی لـەعل. جـام مـەی: پیاڵـەی شـەراب. بگێرتـام: گرتبام. بواتام: بم وتایە، وتبام. ئۆخەی: وشەیەکە بۆ دەربڕینی هەستی گەیشتن بە ئاواتێک. واتـە: لێوە سوورەکەتم بە وێنەی پیاڵەی شەراب بە دەم بگرتبا و وتبام ئۆخەی کە بە ئاواتی خۆم گەیشتم.

-٩[١]-

چـــراخ! حـــاڵ دەرد، چـــراخ! حـــاڵ دەرد
بـــێ خەبـــەر جـــە دەرد!، نـــەزانحـــاڵ دەرد![٢]

جـــە ڕووی نـــازەوە ئـــەر مـــن نـــازێم کـــەرد
شـــەرتەن جـــەو نـــازە خـــاتر گێـــرۆت گـــەرد؟[٣]

کـــەردەی گوســـتاخیم جـــە پـــەی نـــازەوەن
نـــازم هـــەر جـــە ڕەنـــج بـــێ ئەنـــدازەوەن[٤]

---

-٩-

١- ن، ک، س، ئێ، ح، ڕ، عم.

٢- واتە: ئەی خۆشەویستم! تۆ کە لە دەردی من بێ خەبەری و ئاگات لە دەردی من نییە.

٣- جە: لە. نازێم کەرد: نازێکم کرد. شەرتەن: شەرت وایە. خاتر گێرۆت: خاترت بگرێت. گەرد: تۆز. واتە: ئەگەر من لە ڕووی نازەوە نازێکم کرد، دروستە تۆ لەو نازەی من خاترت تۆزاوی بێت و لە دستم عاجز بیت؟ مەبەستی ئەوەیە کە نابێ وابێت و خاترت تۆزاوی بێت. خاتری شوبهاندووە بە جامێک کە تۆزی گرتووە و چیتر ئەوی تێدا نابینێت. لە هەندێک لە سەرچاوەکاندا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «خاس نیەن جەو ناز خاتر گێرۆت گەرد».

٤- کەردە: کردەوە. گوستاخ: بێ ئەدەب، بێ شەرم و حەیا، ڕوودار. جە پەی نازەوەن: لە ڕووی نازەوەیە. واتە: ئەو کردەوە بێ شەرمانەم لە ڕووی نازەوە بوو و نازیشم لەبەر ئەو ڕەنجە بێ ژومارەیە کە بۆ تۆم کێشاوە. واتە لە خۆم ڕابینی کە نازم کرد.

ئەگـــەر نمـــەبیت وە یاگـــەی نـــازم
کـــەی نـــازم مەکـــەرد، هـــەی ئـــاوات وازم؟[١]

ئـــی ســـوخەن پەنـــدەن جـــە قـــەدێمیامان
«خواجـــان مەکێشـــان نـــاز غوڵامـــان»[٢]

٭٭٭

-١٠-[٣]

چـــراخ! خاســـەنی، چـــراخ! خاســـەنی
مـــاچی خاســـەنان، بـــەڵێ خاســـەنی[٤]

---

١- نمەبیت: نەدەبووی. یاگە: جێگە، شوێن. مەکەرد: دەکرد. ئاوات واز: ئاوات خـواز. واتـە: ئـەی ئەو کەسەی من تۆ بە ئاوات دەخوازم! ئەگەر من تۆم بە نازکێشی خۆم نەزانیبا و تـۆ نازکێشـی مـن نەبوویتایە من کەی نازم دەکرد؟

٢- ئی: ئەم. سوخەن: وتە، قسە. پەند: ئامۆژگاری. قـەدێمیامان: پێشـینیانمان. خواجـە: گـەورە، ئاغا، ئاغە. مەکێشـان: دەکێشـن. غـوڵام: نۆکـەر، ڕەنجـۆر، خزمـەتکار. واتـە: ئـەم قسـە پـڕ لـە ئامۆژگارییە قسەی پێشینیانە کە وتوویانە گەورە دەبـێ نـازی خزمـەتکاری بکێشـێت. مەبەسـتی ئەوەیە کە تۆ گەورەیت و من خزمەتکارم و دەبێ نازم بکێشـی و ئەگـەر کـارێکی نابـەجێم کـرد لـێم ببوورە. لە هەندێک لە سەرچاوەکاندا بە جێی «جە قەدێمیامان» نووسراوە «جە قەدێم ئامان».

-١٠-

٣- ح، ن، س، ب، ر.

٤- خاس: لێرەدا بە مانای جوان و ڕێک و پێکە. ماچی: دەڵێیت، ئێژیـت. واتـە: ئـەی یـار! خـۆت دەڵێی جوان و ڕێک و پێکم، ڕاستە و وەهایە کە خۆت دەڵێی.

چانــەی حــەرف نیــەن، حەقــەن پاســەنی
بەڵێ، حەیف سەد حـەیف حـەق نەشناسـەنی[١]

وەش ڕەنـــگ و وەش بـــۆ وەش ڕەفتـــارەنی
پــەڕ جــەفا و بــێ مــەیل، دڵ ئــازارەنی[٢]

دوو ڕۆ بـــە یـــارێ یـــاوەر نیـــەنی
خۆفنـــاک جـــە قـــار داوەر نیـــەنی[٣]

-١١-[٤]

چـــراخ! دا جـــارێ بـــۆ نـــە خاومـــدا
پـــا بنیـــە وە بـــان هـــەردوو چاومـــدا[٥]

---

١- چانەی: لەوەدا، لە ئەوەدا. حەرف: قسە. بەڵێ: بەڵام. حەق نەشناسەنی: حەق نەناسی. واتـە: ئەوەی کە دەڵێی جوان و ڕێک و پێکم قسەی تێدا نییە و بەڕاستی کە وایە بەڵام سەد داخ و حـەیف کە حەق نەناسی.

٢- وەش: خۆش. ڕەفتار: کردەوە. پەڕ: پڕ، لیپ. دڵ ئازار: ئازار دەری دڵ. واتە: خۆش ڕەنگ و بۆیت و کردەوەت پاکە بەڵام بێ وەفا و مەیلی و دڵی عاشقان ئازار دەدەیت.

٣- دوو ڕۆ: دوو ڕۆژ. یاوەر: یارمەتی دەر. قار: غەزەب، قین. داوەر: خودا. نیەنی: نیت. واتـە: دوو ڕۆژ لەگەڵ کەسدا دۆست و یاوەر نیت و لەوە ناترسی کە خودا غەزەبت لێ بگرێت.

-١١-

٤- ک، ئێ، س، ن، ب، ح، ر، ئا، عم.

٥- بۆ: بێ، وەرە. خاو: خەو. بنیە: بنە، بنێ. واتە: ئەی یار! دا جارێک بێرە خەوم و پێ بنێ بە

مەواچــە مــوژەت تیژتــەرەن جــە خــار
پــای گــوڵ ئەنــدامم مــەدەرۆ ئــازار [١]

مــن بــەی مــوژەی خــار یــە خــەیلێ وەختــەن
بــە جاروکــاری نــە ڕای تــۆم جەختــەن [٢]

شــەو و ڕۆ نــە ڕات جــە پــەی ئــی ســەودا
یــەک یــەک بیێنــێ شکەســتە مــەودا [٣]

---

☜ سەر هەردوو گلێنەی چاومدا. دەکرێت وەهایش مانای کەیتەوە کە کاتێک لە خەودام وەرە و پێ بنێ سەر چاوانم، بەڵام لە بەیتی کۆتایی شێعرەکەدا وا دەردەکەوێت کە دەبێت هەردووکیان لە خەودا بن.

١- مەواچە: مەڵێ، مەیەژە، مێژە. موژە: برژانگ، مژۆڵ. تیژتەرەن: تیژترە. جە: لە. خار: دڕوو، دڕک. گوڵ ئەندام: ئەندامی ناسک وەک گوڵ. مەدەرۆ: دەدات. واتە: مەڵێ مژۆڵت لە دڕوو تیژترە و پێی ناسکی وەک گوڵم ئازار دەدات.

٢- بەی: بە ئەم، بەم. موژەی خار: مژۆڵی وەک دڕوو. خەیلێ وەختەن: زۆر لەمێژە، ماوەیەکی زۆرە. جاروکاری: گسک دان، خاوێن کردنەوە. ڕا: ڕێگە. جەخت: گورج و گۆڵ و بە پەلە. واتە: من لە مێژەوە تا بە ئێستە بە پەلەم تا بەم مژۆڵانە کە تۆ دەڵێی وەک دڕوون، ڕێگەی تۆ خاوێن بکەمەوە یا بە پەلە ڕێگەی تۆم گزی دەدا.

٣- شەو و ڕۆ: شەو و ڕۆژ. نە ڕات: لە ڕێگەت، لە ڕێگەی تۆ. جە پەی: بۆ. ئی: ئەم. سەودا: مەراق، فکر و خەیاڵی دەروونی. بیێنێ: بووە. شکەستە مەودا: شتێکی نووک تیژ کە نووکەکەی شکا بێت. واتە: لەبەر ئەو ئاواتەی کە هەیانە و ئەیانەوێ ڕێگەی تۆ خاوێن بکەنەوە شەو و ڕۆژ بە سەر ڕێگەتەوە بوون و خەریکی گزی دان بوون هەر لەبەر ئەوەیە کە ئێستە وەکوو شتێکی نووک تیژیان لێ هاتووە کە نووکەکەی شکابێت. مەبەستی ئەوەیە کە خەمت نەبێ بە پێتدا ناچەقن ☜

بــۆ بــه بــێ ئەنــدێش پــا بنیــه لێشــان
بڎیــه بینــایی هــیچ مەنــدەن تێشــان؟[۱]

ئەگـەر تێشـان بـۆ غـەیر جـه هـوون فێشـتەر
هێجرانــت بەتــەر لێشــان دۆ نێشــتەر[۲]

ســـەحەر مـــەزانی بـــاڵا زەڕســـتوون
پـــات وێنــەی حــەنا ڕەژیــا بــۆ بــه هــوون[۳]

***

---

چون هێندە بە پەلە ڕێگەی تۆیان گرێ داوە نووکەکەیان شکاوە و تیژییان نەماوە.

۱- بۆ: بێ، وەرە. بێ ئەندێش: بێ بیر کردنەوە، بێ ترس، بێ باک. بنیە: بنە، بنێ. لێشان: لێیان. بڎیە: ببینە، سەیرکە. مەندەن: ماوە. تێشان: تێیاندا. واتە: وەرە و بێ خەم پێ لە سەر چاوانم دانێ و بزانە هیچ بیناییکیان تێدا ماوە؟

۲- غەیر: بێجگە، جگە. هوون: خوێن. فێشتەر: زیاتر، زۆرتر. هێجران: دووری. نێشتەر: نەشتەر. واتە: سەیرکە و بزانە ئەگەر چاوم لە خوێن زیاتر هیچی تری تێدا بوو بەشکەم ئیشەڵڵا دووریت لەوە خراپتر نەشتەریان لێ بدات. مەبەستی ئەوەیە ئێستە وایان بە سەر هاتووە و ئەگەر وا نەبێت سزایان ئەوە بێ کە لەوە زیاتر لە تۆ دوور بن، واتە دووری یار بە سەختترین سزا دەزانێت بۆ خۆی و چاوانی.

۳- سەحەر: بەیانی زوو، کازیوە. مەزانی: دەزانی، ئاگادار دەبیتەوە. زەڕستوون: کۆڵەکەی زێڕ. حەنا: خەنە، (پوودرێکی قاوەیی ڕەنگە کە ژنان لە سەریان دەگرن تا قژی سپی سەریان داپۆشێت، هەندێ جاریش جووتیاران و وەرزێران دەیگرنە دەست و پێیان بۆ ئەوەی پێستی دەست و پێیان قایم بێتەوە. «وەرگێڕ»). ڕەژیا بۆ: ڕەنگ بوویێت. هوون: خوێن. واتە: ئەی ئەو کەسەی کە باڵات لە کۆڵەکەی زێڕ دەچێت، بەیانی کاتێ لە خەو هەستی دەبینی کە پێت بە خوێن وەها ڕەنگ بووە کە دەڵێی خەنەت تێ گرتووە. مەبەستی ئەوەیە هەرچەند من دەڵێم چاوم لە دووری تۆ بینایی نەماوە

-۱۲-[1]

چــــراخ! دێوانـــــه، چــــراخ! دێوانـــــه
دڵ پــــەی زڵـــف تـــۆ بیـــەن دێوانـــه[2]

ئەوســـا مەکـــەری زڵفـــان بـــه شـــانه
یـــەک تـــایێ بـــه عەشـــق یـــەکتای یەگانـــه[3]

بـــدەر پـــەی زەنجیـــر دڵـــەی مـــەجنوون خـــۆ
پـــــەرێ دێوانـــــان زەنجیـــــرێ مـــــەبۆ[4]

---

☜ بەڵام ئەگەر بڕوات نییە شەوێک وەرە خەونم و پێ لە سەر چاوانم دابنێ ئینجا کاتێ بەیانی لە خەو هەستای دەبینی کە ژێر پێت بە خوێنی چاوی من سوور بووە. لە سەرچاوەی «ح»دا نیوە بەیتی دووهەم بەم جۆرە نووسراوە: «پات وێنەی هەنار ژیا بۆ بە هوون» و بەم جۆرە مانای کردوەتەوە: «ژیا بۆ بە هوون = ڕەنگی خوێنی گرتووە. پێت وەکوو هەنار بە خوێن سوور بووە».

-۱۲-

۱- مج

۲- چراخ: یار، خۆشەویست. دێوانە: شێت. پەی: بۆ. زڵف: زوڵف، کەزیە. بیەن: بووە. واتە: ئەی یار! دڵ بۆ زوڵفەکانت شێت بووە.

۳- ئەوسا: ئەو کاتە، ئەو وەختە. مەکەری: دەکەی. تایێ: تاڵێک. بە عەشق: بە خاتری، لەبەر. یەکتای یەگانە: خودا. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا پێکەوەن.

٤- بدەر: بدە. پەی: بۆ. مەجنوون خۆ: کەسێک کە خوڵق و خووی وەک مەجنوونە و شێتە. پەرێ: بۆ. دێوانان: شێتان. واتە: ئەو کاتەی کە زوڵفت شانە دەکەی بەڵکوو بە خاتری خودای تاک و تەنیا تاڵێکم پێ بدەی بۆ زنجیر کردنی ئەم دڵەم کە وێنەی مەجنوون شێت بووە. بۆ ئەو کەسەی کە شێت بووە دەبێت زنجیرێک ببێت بۆ بەستنەوەی. مەبەستی ئەوەیە کە دڵم بۆ زوڵفەکانی تۆ شێت ☜

حاجەتێ نیەن بە تۆ ستەم بۆ
یەک تایێ جە زلف کلافەت کەم بۆ[1]

با وەس دڵ پەی زلف تۆ دێوانە بۆ
گیان من قوربان پەنجە و شانە بۆ[2]

☆☆☆

☜ بووە و چون شێتیش دەبێت بە زنجیر ببەسرێتەوە، تاڵێک لە زوڵفەکانتم پێ بدە با بیکەم بە زنجیر بۆ دڵە شێتەکەم و پێی ببەستمەوە. لێرەدا شاعێر بە جوانیەکی بێ وێنە ئاماژە بەوە دەکات کە دەردی دڵی و شێتییەکەی لەبەر زوڵفی یارە و زنجیریش هەر بە زوڵفی یار دروست دەبێت و دەبێت هەر بە زوڵفەکانی یار زنجیر بکرێت.

١- حاجەت: خوازراو، پێویستی. نیەن: نییە. تایێ: تاڵێ. جە: لە. واتە: ئەو داواکاری منە، داواکارییەک نییە کە بۆ تۆ ئەستەم بێت. کارێکی سەخت نییە بۆ تۆ کە تاڵێکی زوڵفت کە بە وێنە کلافە پێچراوە بە یەکدا کەم بێتەوە. لە نوسخەخەتیەکەدا بە جێگەی «یەک تایێ»، «سە تایێ» نووسراوە بەڵام وا دیارە هەڵەی نوسخە نووسینەوەیە چون پێشتر خۆی ئاماژەی کردووە کە تەنیا تاڵێک لە زوڵفەکانی یارم دەوێت. لە بەر ئەوەی هیچ نوسخەیەکی دیکە لە بەر دەستماندا نییە کە ئەم پارچە شێعرەی تێدا بێت، ئێمەیش بە پێی مانای شێعرەکە و بەیتە پێشووەکان بە جێی «سە تایێ»، «یەک تایێ»مان نووسی.

٢- وەس: بەس. بۆ: بێت، بێ. پەنجە: لێرەدا مەبەست پەنجەی دەسە کە شانەی پێ دەگیرێت و یار زوڵفی پێ شانە دەکات. واتە: با چیتر دڵم بەس بۆ زوڵفەکانت شێت و دێوانە بێت. گیانی من بە قوربانی ئەو پەنجەت بێت کە شانەی پێ دەگری و بە قوربانی ئەو شانەیش بم زوڵفی پێ شانە دەکەی. هەروا کە پێشتریش ئاماژەمان پێ کرد ئەم پارچە شێعرە تەنیا لە یەک سەرچاوەدا هاتووە کە ئەویش نوسخەی مەلا ئەحمەدی جوانڕۆییە(مج) و ئەگەر بە وردی سەیری ناوەرۆک و سەبک و شێوازی شێعرەکە بکەین گومانمان نامێنێ کە شێعری بێسارانییە. هەرچەند لە هیچ کام لە ☜

-۱۳-[1]

چـــــراخ! ڕەزان بــــۆ، چـــــراخ! ڕەزان بــــۆ
خـــاس ئێــدەن گڵکــۆم نـــە پـــای ڕەزان بـــۆ[2]

نــــە پڕشـــــنگ تـــاف ســــەرقەڵوەزان بــــۆ
ئامێتــــەی خـــــاکم وەڵـــــگ خـــــەزان بـــــۆ[3]

بامانـــــــت بشـــــان بــــــە ڕەزانـــــــەوە
تـــــەرزان ببــــــڕان بـــــــە خەزانـــــــەوە[4]

---

☜ نوسخەکانی دیکەدا نەهاتووە، بەڵام ئێمە لێرەدا هێنامـان. ئەگـەری ئـەوەیش هەیـە شـێعری بێسارانیش نەبێت و لە بەر نزیکی بە شێعرەکانی بێسـارانی بـە هەڵـە لـە نێـوە شـێعرەکانی ئـەودا نووسرابێت. (اللّه اعلم).

-۱۳-

۱- ک، ئێ، م، ن، ح، ب، س، ئا، عـم، ڕ، ی.

۲- ڕەزان: کۆی «ڕەز»ـە، لە بنەمادا ڕەز بە مانای باخی ترێیە بـەڵام لـە شـێعرەکانی بێسـارانیدا بـە گشتی بە مانای «باخ» هاتووە. خاس ئێدەن: خاس وەهایە، باشتر وایە. بۆ: بێ، بێت. گڵکۆ: گـۆڕ، قەبر. واتە: ئەی یار! خاستر وایە کاتێک مردم گۆڕەکەم لە نێوە باخاندا بێت.

۳- نە: لە (فارسی: دَر). پڕشنگ: پرشەی ئاو. تاف: تاڤگە. قەڵوەز: قەڵبەزەی ئاو، تاڤگە. ئامێتە: ئاوێتە، تێکەڵ. وەڵگ: گەڵا، بەرگ. خەزان: زەرد. واتە: با گۆڕەکەم لە جێیەکـدا بێـت کـە پرشـەی ئاوی تاڤگـەی لـێ بپرشـێت و خـاکی گۆڕەکـەم تێکـەڵی گـەڵای خـەزان بێـت. لـە هەنـدێک لـە سەرچاوەکاندا نیوە بەیتی یەکەم بەم جۆرە نووسراوە: «نزیک وە پڕشنگ پای قەڵوەزان بۆ».

٤- بامانت: بە ئەمانەت، ئاگادار بی حەتمەن ئەو کارە بکرێت. بشان: بـڕۆن. تـەرز: لقـی ناسـک. ببڕان: ببڕن. واتە: با ئەوانە من لە گۆڕ دەنێن بڕۆن بۆ نێو باخان و تەرز و لقی دارەکان بە گەڵا ☜

بـــــاوەران پـــــەرێم بـــــە بـــــێ دڕەنگـــــێ
وەڵـــــگ خـــــەزانان هـــــەریۆ جـــــە ڕەنگـــــێ[١]

پـــــەرێم بـــــاوەران بـــــە بـــــێ مـــــەدارا
گڵکـــــۆم جـــــە خـــــەزان بکـــــەران دارا[٢]

بـــــە وەڵـــــگ خـــــەزان بپۆشـــــان ســـــەنگم
تـــــا نیشـــــانە بـــــۆ جـــــە زەردی ڕەنگـــــم[٣]

بـــــادا وە گڵکـــــۆم خـــــاک نـــــۆ نـــــەبۆ
بـــا یـــەکجار کۆنـــەی ســـەد ســـاڵ کۆنـــە بـــۆ[٤]

---

☜ زەردەکانەوە ببڕن. ئەم بەیتە و سێ بـەیتی داهـاتوو تـەنیا لـە نوسـخەکانی «ک» و «ئـێ» و «ئا»دا هەیە و دیارە بە نەبوونی ئەم بەیتانە مانای شێعرەکە ڕاست نابێتەوە چون شاعێر داوا دەکـات بیبەن لە نێو باخدا بینێژن بەڵام ئەگەر ئەم چوار بەیتە نەبێت هۆی ئەم داواکارییە ڕۆشن نابێتەوە.

١- باوەران: بێنن. پەرێم: بۆ من، بۆم. بێ دڕەنگ: بێ ماتڵ بوون. وەڵگ: گەڵا، بەرگ. هەریۆ: هەر یەک. واتە: بێ ماتڵ بوون لە گەڵا خەزان لێدراوەکان کە هەر یەکەیان لە ڕەنگێکن بێـنن بـۆم. (لـە پاییزدا گەڵای داران هەر یەکە بە ڕەنگێک دەنوێنن).

٢- مدارا: ماتڵ بوون. بکەران: بکەن. دارا: دەوڵەمەند. واتە: بێ ماتـڵ بـوون گـەڵام بـۆ بێـنن تـا گۆڕەکەم لە هەبوونی گەڵا خەزان لێدراوەکان دەوڵەمەند بێت.

٣- بپۆشان: بپۆشن، داپۆشن. سەنگ: کێڵی گۆڕ. واتە: بە گەڵا خەزان لێـدراوەکان کێڵـی گۆڕەکـەم بپۆشن تا ئەو گەڵا زەردانە ببنە هێمای ڕەنگ زەردی من. ئەم بەیتە لە پارچە شێعری «بـەی گشـت دەردەوە»یش‌دا هەیە. لە نوسـخەی «ئێ»دا شێعرەکە لێرەدا کۆتایی دێت.

٤- بادا: با، با وەکوو، باکوو. واتە: با خاکی گۆڕەکەم تازە نەبێت و بە یەکجاری کۆنەی سەد ساڵە ☜

مەواچـــە، قیبلـــەم جـــە ناکـــام جـــارێ
ڕام بـــۆزۆ وە ســـەر، بـــەزم شـــکارێ[1]

نابەڵـــەدْ بنیـــۆ پـــا بـــە گڵکۆمـــدا
بـــە خـــاک کۆنـــەی قەبرەکـــەی نۆمـــدا[2]

مەگـــەر جـــەو دەمـــدا ســـاکن بـــۆ دەردم
تـــا ســـەنگ نەســـۆچۆ بـــە ئـــاه ســـەردم[3]

***

---

☜ بێت. لە بەیتە دواییەکاندا دەڵێت لەبەر چی دڵی پێویستە خاکی گۆڕەکەی کۆنە بێت. لە نوسخەی «ک»دا ئەم بەیتە نییە. لە سەرچاوەکانی «ن» و «ب»دا نیوە بەیتی یەکەم بەم جۆرە نووسراوە: «با خاک گڵکۆم خاک نۆ نەبۆ».

١- مەواچە: مەڵێ، دەنگ مەکە با کەس نەزانێت بەڵکوو وا بێت. جە ناکا: نا ئاگا، لە خۆیەوە. ڕام بۆزۆ وە سەر: ڕێگەی بکەوێتە سەرم. بەزم: بە عەزم، بە نیەت. شکار: ڕاو. واتە: بەڵکوو قیبلەکەم جارێک کتوپڕ بۆ ڕاو کردن ڕێگەی بکەوێتە ئێرە و خاکی گۆڕەکەم بە تازە نەزانێت و پێی پێدا بنێت.

٢- نابەڵەدْ: ناشارەزا، نا ئاگا. بنیۆ: بنێت. واتە: ناشارەزا بێت و پێ بنێ بە سەر گۆڕەکەمدا. ئەو گۆڕە دروستە تازەیە بەڵام خاکەکەی کۆنەیە و کەس نازانێت تازەیە.

٣- جەو دەمدا: لەو کاتەدا. نەسۆچۆ: نەسووتێت. واتە: مەگەر لەو کاتەدا و بەو شێوە دەردم دابمرکێت و ساکن بێت، با ئەو بەردە کە نراوەتە سەر گۆڕەکەم (بەردی ئەلحەد) بە هەناسەی سەردی من نەسووتێت.

-١٤-[1]

چـــراخ! زاریمـــــەن، چـــراخ! زاریمــــەن
زگـــاریم پـــەی تـــۆن، پـــەی تـــۆ زاریمـــەن[2]

پـــەی تـــۆ جـــەفا و جـــەور دەرد کاریمـــەن
پـــــەی تـــــۆ زام ســـــەخت نادیاریمــــەن[3]

پـــەی تـــــۆ ڕەســـــتاخێز ڕۆی نەبەردمــــەن
پـــەی تـــۆ پەیاپـــەی ئـــاه ســـەردمەن[4]

-١٤-

١- ن، س، ل، ر، م، ب، عم، ح، مج.
ئەم پارچە شێعرە بۆی شێعری بێسارانی نادات و بێسارانی عادەتی دووپات کردنەوەی زۆر شتی نییـە یا چەند بەیت بە یەک مەزموون و ناوەڕۆکەوە بنووسێت. لێرەدا «پەی تۆ» زۆر دووپات کراوەتەوە. لە کۆتاییشدا شێعرەکەی بە ڕێک و پێکی کۆتایی نایەت. بە بڕوای من شێعری بێسارانی نییە. لەو دوو نوسخەیش‌دا کە بۆ ئێمە نوسخەی بنەما و بنەڕەتی بوون نـەهاتووە بـەڵام بـە پێـی ئـەوەی کـە لـەو سەرچاوانەدا هاتووە ئێمەیش هێنامان.
٢- زاری: شیوەن. زاریمەن: شیوەنمە. زگاری: کزی و بێ گریکی. پەی تۆن: بۆ تۆیە. واتە: ئەی یار! من خەریکی شیوەن کردنم و شیوەنم بۆ تۆیە.
٣- واتە: لەبەر تۆیە کە ئەم هەمووە ڕەنج و ناڕەحەتیە دەکێشم و ئەم دەردە کارییەم گرتـووە و لەبـەر تۆیە کە زامانی سەختم گرتووە و دیاریش نین.
٤- ڕەستاخێز: هەستان، ڕاست بوونەوە، قیامەت. ڕۆ: ڕۆژ. نەبەرد: شەڕ. واتە: بۆ تۆیە کە ئەم دنیا بۆ من بـووە بـە قیامـەت و ڕۆژی شـەڕ و بـۆ تۆیـە کـە یـەک بـە دوای یـەکدا هەناسـەی سـارد هەڵدەکێشم.

پــــەی تـــۆ ســـــەرتاپا دەروون زوخـــــاڵم
پـــەی تـــۆ، دوور جـــە تـــۆ، وێرانـــەن مـــاڵم[1]

قیبلـــــەم ســـا شـــــەرتەن حـــاڵم بزانـــی
بێـــــزار بیـــــەنان جـــــەی زێنـــــدەگانی[2]

***

۱- پەی تۆ: بۆ تۆ. دوور جە تۆ: سێ جۆر مانا دەکرێتەوە ۱- لە دووری تۆیە. ۲- دوور بم لە تۆ. ۳- دوور بێ لە گیانی تۆ. واتە: لەبەر تۆیە کە من سەرتا بە خواری دەروونم سووتاوە و بووە بـە زوخـاڵ و دیسان هەر لەبەر تۆیە و لە دووری تۆیە یا دوور بم لە تۆ یا دوور لە گیانی تۆ ماڵم وێرانە.

۲- شەرتەن: شەرتە. جەی: لەم. بیەنان: بوو وم بووگم. زێنـدەگانی: ژیـان. واتـە: قیبلـەم شـەرتی دۆسی وایە لە حاڵم بپرسی و لە حاڵ و بار و دۆخم ئاگادار بیت چونکە لـەم ژیانـە بێـزار بـووگم. لـە نوسخەی «ل»دا پاش ئەم بەیتە بەیتێکی دیکەی بەم جۆرە هەیە:

خـــوذا شـــاهێدەن ئاگـــان بـــەی کـــەلام    هـــا بـــیم بـــە زوخـــاڵ بـــاقی وەســـــەلام

کە دیارە شێعری بێسارانی نییە و ڕەنگ و بۆی شێعرەکانی ئەو نادات.

-١٥-[1]

چــــراخ! زولجـــــەلال، چـــــراخ! زولجـــــەلال
ســـەوگەندم بـــە حـــەیی دانـــای زولجـــەلال[2]

مـــەر ئەوســـا نامـــت بەرشـــۆم نـــە خـــەیاڵ
هـــۆرگێران تـــەرمم، بەربـــەران جـــە مـــاڵ[3]

---

-١٥-

١- عم، مج.

ئەم پارچە شێعرە تەنیا لەو دوو سەرچاوەدا هاتووە و نارۆکی شێعرەکە بە شێعری بێسارانی دەخوات بەڵام لەبەر هێنانی هەندێک وشە دەتوانێت شێعری بێسارانیش نەبێت. بۆ وێنە «جەلال»ی لەگەڵ «خەیاڵ» و «ماڵ»دا کردووە بە سەروا، هەرچەند دەتوانین «جەلال» بە «جەڵاڵ» بخوێنینەوە. هێنانی هەندێک لە وشەکان بۆ سەروا، نیشاندەری ئەوەیە کە شاعێر دەستی تەنگە بۆ سەروا بەڵام بێسارانی زۆر لەوانە بە دەسەڵات تر بووە. دووجار «چۆگە» و دووجار «ئەوسا» و جارێکیش «ئەوسە»ی هێناوە کە دیارە بێسارانیانە نییە، کە وایە ئەگەری ئەوە هەیە شێعری بێسارانی نەبێت. (واللە اعلم).

٢- جەلال: گەورەیی، بە دەسەڵات بوون. زولجەلال: ذوالجلال، ساحێب گەورەیی، خودا. حەیی: زیندوو. واتە ئەی یار! قەسەم بەو خودایەی کە دایم زیندوو و بە دەسەڵاتە. لە نوسخەی «عم»دا بە جێی «سەوگەندم بە حەیی» نووسراوە «بە حەیی بێ چوون».

٣- مەر: مەگەر. ئەوسا: ئەو وەختە، ئەو کاتە. بەرشۆ: دەربچێت. هۆرگێران: هەڵبگرن. بەربەران: ببەنە دەر. جە: لە. واتە: مەگەر ئەو کاتە ناوی تۆم لە خەیاڵ دەربچێت کە بمرم و تەرمەکەم هەڵبگرن و لە ماڵ ببەنە دەر.

تـــا بـــە قەبرســـتان لاشـــەم ببـــەران
چۆگـــە ئەســـپەردەی خـــاکم بکـــەران[١]

یـــاران بـــەیاوە، مـــن چۆگـــە مـــانوو
ئەوســـە هـــیچ ئـــەحواڵ بـــاڵات نـــەزانوو[٢]

ئێمکـــان هـــەن ئەوســـا بەریشـــیم جـــە دڵ
پـــەی چـــی؟ چـــەنی دەرد وێـــم مـــەبوون خجـــڵ[٣]

* * *

---

١- ببەران: ببەن. چۆگە: لەوێ، لەو جێگە. ئەسپەردە: سپاردن، ناشتنی مردوو. بکـەران: بکـەن. واتە: تەرمەکەم ببەن تا گۆڕستان و لەوێ بمنێژن . لە نوسخەی «مج» نیـوە بـەیتی یەکـەمی بـەم جۆرە نووسراوە: «وە مەقەبەرستان ئاواییم بەران».

٢- بەیاوە: بێنەوە. مانوو: بمێنمەوە. ئەوسە: پاشان، پاش ئەوە. نەزانوو: نەزانم. مانـای ئـەم بەیتـە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٣- ئێمکان: بۆی هەیە. لەوانەیە. بەرشی: دەربچی، بـڕۆی. پـەی چـی: بـۆچی، لەبـەرچی. چـەنی: لەگەڵ. وێم: خۆم. خجلَ: پەشۆکاو. واتە: پاش ئەوی ناشتمیان و چیتر هەواڵی بـاڵات نـەزانم، بـۆی هەیە لە دڵم دەربچی، ئەویش لەبەرچی؟ لەبەر ئەوە لە نێو گۆڕەکەدا دەپەشۆکێم بە دەردی خۆمـەوە و کاتی بیر کردنەوە لە باڵای تۆم نییە. لە نوسخەی «عـم»دا ئەم بەیتە بەم جۆرە نووسراوە:

مـــەر ئەوســـا قیبلـــەم بەریشـــۆ جـــەدڵ    چـــەنی دەرد وێـــم وەس ببـــوو خـــەجڵ

-١٦[١]-

چـــــــــراخ! زەروورەن، چـــــــــراخ! زەروورەن
ئەوەنـــــد پـــــەی دینـــت تاســـــەم زەروورەن[٢]

هـــەر شـــەو نـــە ئاڵـــەم ناڵـــەم مەنشـــوورەن
ڕۆی ڕۆشـــــن پـــــەرێم شـــــەو دەیجـــوورەن[٣]

نـــە بـــە ڕۆ قـــەرار، نـــە شـــەوم خـــاوەن
شـــەوان جـــە ناڵـــەم ئاڵـــەم بـــەتـــاوەن[٤]

-١٦-

١- ن، ک، ئێ، م، س، ع، ل، ئا، ر، عم، ح، مج.

٢- ئەوەند: ئەوندە، هێندە. پەی: بۆ. دینت: دیتنت، بینینت. تاسەی: مەیلی زۆر، ئیشتیا. واتە: ئەی یار! هێندە بۆ دیتنت ئیشتیام زۆرە. لە بەیتە دوایی‌یەکاندا هۆکەی دەڵێت.

٣- ئاڵەم: عالەم، دنیا. مەنشوور: مەشهوور، دەنگ زڕاوە، بەناوبانگ. ڕۆی: ڕۆژی. پەرێم: بۆ من، بۆم. دەیجوور: لە بنەمادا بە مانای خاکی ڕەشە بەڵام بە گشتی بە مانای ڕەش دێت و زیاتر سیفەتی شەوی زۆر تاریکە، شەوەزەنگ. واتە: هەموو شەوێک ناڵەم لە هەموو دنیادا زڕاوەیە و هەموو کەس دەیبیستێت و دەیناسێت و ڕۆژی ڕوونم لا شەوەزەنگە.

٤- خاو: خەو. بە تاو: گەرمی و گڕ تێبەربوو. واتە: نە بە ڕۆژ ئارام و قەرارم هەیە و نە بە شەوانە خەو و شەوان لە ناڵەی من عالەم گڕی تێبەر دەبێت. ئەم بەیتە لە سەرچاوەکانی «ن»، «س» و «ح»دا نییە.

پەی دین دەستەی زڵف پەڕ جە خەم
قامەت چوون کەمان سەرنیان وە هەم[1]

سا مەن یەند تاسەی زڵف یارم بۆ
چەنی بە شەو خاو، ڕۆ قەرارم بۆ؟[2]

☆☆☆

-١٧-[3]

چراخ! سەرسەوزێو مەبۆ سپی و ساف
ئاینە گۆلاو، ماوا لێو تاف[4]

---

١- پەی: بۆ. دین: دیتن، چاو پێکەوتن. پەڕ: پڕ. خەم: لوول، پێچراو بە یەکدا. چوون: وێنەی، وەک. سەر نیان وە هەم: سەری ناوە بە یەکەوە. واتە: بۆ دیتنی دەستە زوڵفە پڕ خەم و لوولەکەت قامەتم بە وێنەی کەمان چەمیوە و سەری بە یەکەوە ناوە.

٢- یەند: ئەوەندە، هێندە. تاسە: ئاوات، ئیشتیا. بۆ: بێت، بێ. چەنی: چۆن. خاو: خەو. واتە: سا من هێندە ئیشتیای زوڵفەکانی یارم بێت، چۆن شەوان خەو و ڕۆژان ئارامم هەبێت؟

-١٧-

٣- س، ک، ئێ، ب، ح، ڕ، عم.

٤- سەرسەوز: باڵدارێکە وەکوو «خومەڕەژە» کە «سەوزە مراوی» پێ دەڵێن و سەرملی سەوزە و سینەی خەنییە و جۆرێکیشی هەیە سەرملی سەوزە و سینەی سپییە. مەبۆ: دەبێت. ئاینە: ئاوێنە، جام. گۆلاو: گۆلکە ئاو، گۆلی ئاو. لێو: لێوار، قەراخ، کەنار. ماوا: شوێن، جێگە. تاف: تاڤگە، ئاوهەڵدێر، ئابشار، ئاوشار. واتە: ئەی یار! سەرسەوزێک هەیە جوان و ساف و ئاوێنەی خۆ سەیرکردنی گۆلکە ئاوە و هێلانەی وا لە قەراخی تاڤگەدا. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «سەرسەوزێو»، «سەرسۆز» نووسراوە و بە جێگەی «ئاینەی گۆلاو»، «ئاینەی گوڵاو» نووسراوە☜

گۆشــش دان بــە دەنــگ تــاف ســاف نەفــەس
مەجیۆش سـاحیب خـاڵ هـەنیچ نیـەن کـەس [١]

وێــش مـــەوزۆ نــە کــۆڵ گــۆل وێنــەی ســەدەف
کۆکــۆ مـــرواری پـــەیش مـــەنیۆ وە کـــەف [٢]

هــــەردەم مەکـــــەرۆ بــــە خـــوردەی بــــاڵش
رێــــــزەی مـــــــرواری خـــــەلتان خــــــاڵش [٣]

☜ و کاک حەکیم بەیتەکەی بەم شێوە مانا کردوەتەوە: «خۆشەویستەکەم چرای سەر سۆزی سپی و بێ گەرد نابێ بە ئاوێنەی گوڵاوی سەرلێوی تاڤگە»!.

١- گۆشش دان: گوێی داوە. ساف نەفەس: زیاتر بۆ گۆرانی بێژ بـە کـار دەبرێـت و لێـرەدا شـاعێر دەنگی تاڤگەکەی بە دەنگی گۆرانی بێژ و تاڤگەکەی بە گـۆرانی بێـژ لـە قەڵـەم داوە. مـەجێوش: وادەزانێت، پێی وایە. هەنیچ: ئیتر، چیتر، چیدی. واتە: ئەو سەرسەوزە گوێی داوە بە دەنگی تاڤگـە دەنگ سافەکە و پێی وایە بێجگە لە خۆی ئیتر کەس ساحێب خاڵ نییە.

٢- وێش: خۆی. مەوزۆ: دەخاتە. کۆکۆ: دەستە دەستە. مەنیۆ: دەنێت. کەف: لەپی دەسـت. واتـە: خۆی دەخاتە مل گۆلاوی تاڤگەکە و دەپەڕێتە نێـو ئاوەکـە و کـاتێ دێتـە دەرەوە ئـاوی سـەر پشـتی دەتەکێنێت کە لە مرواری دەچێت. شاعێر دەیەوێت لێرەدا ئەو دیمەنە بخاتە بەر چاو کاتێک مراوی دەپەڕێتە نێوە ئاو لەبەر چەوری پەڕ و باڵی تەڕ نابێت و ئاوەکە دڵۆپ دڵۆپ بە سەر پەڕ و باڵیـەوە دەمێنێتەوە و ئەو دڵۆپە ئاوەی شوبهاندووە بە مرواری.

٣- هەر دەم: هەمووکات. مەکەرۆ: دەکات. بە خوردەی باڵش: بـە کـەوتنی بـاڵی، بـە جولاندنـەوەی باڵی. رێزە: ورد. خەڵتان: ئاوێتە، تێکەڵ بوون، کەوتنە نێو شتێک. واتە: هەرکات باڵی دەماڵێت بـە ئاوەکەدا وردە مرواری دەکەوێتە سەر خاڵی و لە گەڵ خاڵەکانی ئاوێتە دەبێت. لەم بەیتەوە تـا کۆتـایی شێعرەکە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هەیە.

سـا وەخـت سـەیرەن، فەسـڵ نـەووەهار
شـۆ وە سـەیر گـۆل سـاف سـەدەفکـار[١]

چۆگـە بنمانـە خـاڵ موشـکینت
بـیلا بـا پـەخش بـۆ زڵـف وە جـەمینت[٢]

سـا سەرسـەوز جـە خـاڵ وێـش بێـزار مـەبۆ
کۆکـۆ پەشـێوی وەنـەش بـار مـەبۆ[٣]

***

---

١- شۆ: برۆ، بچۆ. سەدەفکار: ئەوەی کە وەک سەدەف کاری دروست کردنی مرواربیە. واتە: ئێستە کە سەرەتای بەهارە و کاتی سەیرانە، برۆ بۆ سەیرانی ئەو گۆلاوی تاڤگە کە وێنەی سەدەف مرواری دروست دەکات.

٢- چۆگە: لەوێ، لەو جێگە. بنمانە: بنوێنە، نیشان بدە. موشکین: بە وێنەی موشک ڕەش و بۆنخۆش. بیلا: بهێڵە، ئیزن بدە. بۆ: بێ، بێت. جەمین: ڕوخسار. واتە: لەوێ خاڵە ڕەشەکەت دەربخە و بهێڵە با زوڵفەکەت بێت بە سەر ڕوخسارتەوە.

٣- مەبۆ: دەبێت. کۆکۆ: زۆر. واتە: کاتێک سەرسەوزەکە تۆ بەو شێوە دەبینێت تێدەگات کە تۆ زۆر لەو جوانتری و خاڵەکەی خۆی لەبەر چاو دەکەوێت و مەلوول و خەمبار دەبێت. لە سەرچاوەی «ح»دا لە کۆتایی ئەم پارچە شێعرەوە بەیتێک بەم جۆرە هاتووە:

تـۆیچ بـەو چنـار سـپی بنمانـە جـە واتـەی بـەدان جـەلا بسـتانە

ئەم بەیتە، بەیتی کۆتایی پارچە شێعری «چراخ بەدکاران»ـە کە دیارە بە هەڵە لێرەدا نووسراوە و هیچ پەیوەندیەکی بەم شێعرەوە نییە.

-١٨-[1]

چراخ! سیای تۆ، چراخ! سیای تۆ
بە هەر دوو دیدەی مەست سیای تۆ[2]

بە نیم نگای ناز ناگا دیای تۆ
بە زڵف حەبەش پەشێویای تۆ[3]

بە تاق ئەبرۆی قەڵەم کێش تۆ
بە موژەی ناواک ژار نێش تۆ[4]

---

-١٨-

١- ک، ئێ، س، ح، ب، ن، ڕ، ئا، عم، مج.

٢- واتە: ئەی یار! قەسەم بە هەردوو چاوە مەستە ڕەشەکانت.

٣- نیم نگا: بە گۆشەی چاو سەیرکردن. ناگا: ناکاو، کتوپڕ. دیا: بینین. زڵف: زوڵف. حەبەش: ڕەش، چون خەڵکی وڵاتی حەبەش ڕەش پێستن وشەی «حەبەش»ی بە مانای ڕەش بەکار هێناوە. پەشێویا: ئاڵۆز. واتە: قەسەم بە گۆشە چاوەکەت کە بە نازەوە لە ناکاو دەیهاوێژی و قەسەم بە زوڵفە ڕەشە ئاڵۆزەکەت.

٤- قەڵەم کێش: بە قەڵەم کێشراو. موژە: برژانگ، مژۆڵ. ناواک: کۆی وشەی «ناوەک» بە مانای تیر. ژار نێش: نووکی تیری ژەهراوی. واتە: قەسەم بە ئەو تاقی ئەبرۆیانەت کە هێندە جوان و ڕێک و پێکن دەڵێی بە قەڵەم کێشراون و قەسەم بە مژۆڵەکانت کە لە تیری ژەهراوی دەچن.

بــــه ڕێـــــزەی ڕازان شـــــەکەرڕێز تـــــۆ
بــــه نــــاف ئــــاهووی عەنبــــەربێز تــــۆ[١]

بــه بــــاڵای چــــوون ســــەڵو خــــەرامان تــــۆ
بــــه جــــەور و جــــەفای بــــێ ســــامان تــــۆ[٢]

یــه گشــت سـەوگەند بــۆ جـەمین وێنـەی جـام
دووری تــــۆ کــــەردەن خــــاو وەنــــەم حــــەرام[٣]

☆☆☆

١- ڕێزەی ڕاز: وردە قسە. ناف ئاهوو: نێوکی ئاسک کە موشکی بۆن خۆشی هەیە. مەبەستی بۆنی خۆشی یارە. عەنبەر: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆشە کە بۆ عەتر دروست کردن بـە کـار دەبرێـت و ڕەنگێکی نزیک بە ڕەشی هەیە. بێز: بێزران. واتە: قەسەم بە وردە قسـەی تـۆ کـە هێنـدە شـیرینن شەکەریان لێ دەبارێت و قەسەم بە بۆنی خۆشت کە بە لووتی هەرکەسدا بچێـت لـە بـۆنی عەنبـەر بێزار دەبێت.

٢- چوون: وێنەی، وەکوو. سەڵو: گوڵی پۆپەکەڵەشێرە کە بە فارسـی «تـاج خـروس»ی پـێ دەڵـێن. خەرامان: بە لار و لەنجە بە ڕێدا ڕۆیشتن. سەڵو خەرامان: مەبەستی باڵای یارە کە بە وێنەی گوڵی سەڵو جوانە و بە ناز و لار و لەنجە بە ڕێدا دەڕوات. بێ سامان: بێ ئەمان، بێ ئامان. واتە: قەسـەم بە باڵات کە بە وێنەی سەڵوی خەرامانە و قەسەم بەو جەور و جەفا بێ ئەمانەت.

٣- یە: ئەمە. سەوگەند: قەسەم. جەمین: ڕوخسار. کەردەن: کردووە. خاو: خەو. وەنەم: لێم. واتـە: ئەی کەسێک کە ڕوخسارت بە وێنەی ئاوێنەیە بە هەموو ئەمانە کە وتـم قەسـەم بێـت، دووری تـۆ خەوی لێم حەرام کردووە و خەوم نەماوە.

-١٩-[1]

چــــراخ! قنيــــاتم بـــــه خەياڵتــــەن
بــــه خـــــەياڵ لاڵ موشــــكين خاڵتــــەن[2]

دايـــم جـــه تەنـــدا چـــوون گيانمـــەن
هـــەر بـــەو زێنـــدەنان، بـــەو ژيانمـــەن[3]

ئـــەر ناگـــا خـــاوێم مەشـــۆ نـــه ديـــده
نمـــازووش جـــه دەس هـــەی بەرگوزيـــده[4]

-١٩-

١- ن، ک، ئێ، س، ب، ح، ڕ، عم.

٢- قنيات: بژيوی، ئەو شتەی مرۆڤی پێ دەژيەت. لاڵ: لەعل، ناوی بەردێكی بە نرخە بـە ڕەنگـی سووری كاڵ، مەبەست لێوە. موشک: بە وێنەی موشک ڕەش و بۆنخۆش. واتە: ئـەی يـار! مـن بـە خەياڵی تـۆوە دەژيـم و زينـدووم، بـە خـەياڵی ئـەو لێوەتـەوە كـە خـاڵێكی ڕەشـی بەسـەرەوەيە. لـە نوسخەكانی «ک» و «ئێ»دا بە جێی «لاڵ»، «زلف» نووسراوە.

٣- تەن: لاشە، جەستە. چوون: وێنەی، وەک. گيانمەن: گيانمە. زێنـدەنان: زينـدووم، مـاوم. واتـە: دايم ئەو خەياڵەی تۆ بە وێنەی گيان وا لە لاشەی منـدا و هـەر بەوەيـە مـن زينـدووم و مـاوم. لـە نوسخەی «ک»دا بە جێی «دايم» نووسراوە «واتم».

٤- ئەر: ئەگەر. ناگا: ناكاو، كوتووپڕ. خاوێم: خەوێكم. مەشۆ: دەڕوات، دەچێـت. نمـازوو: نـاهێڵم، ئيزن نادەم. بەرگوزيده: هەڵبژێراو، تاقانە. مانای ئەم بەيتە و بەيتی دوايی پێكەوە دێن.

سـەر منیـەو نـە پـا وێنـەی حەڵقـەی دام
تـا مـەر پابەنـد بـۆ بەرنەشـۆ جـە لام[١]

بـە فیـدای خـەیاڵ گرانمایـەت بـام
سـەرگەرد تـای زڵـف موشـکین سـایەت بـام[٢]

☆☆☆

-٢٠-[٣]

چـراخ! قوربانـەن، چـراخ! قوربانـەن
ئینـە عەیـد نـۆ، جـەژن قوربانـەن[٤]

---

١- منیەو: دەنێم. حەڵقە: چەڵەمە. دام: داو، تەڵە. پابەند: ئەسیر. بەرنەشۆ: نەڕوات. واتە: ئەی یارە تاقانەکەم ئەگەر کوتووپڕ خەوم لێبکەوێت خەیاڵی تۆ لە دەست نادەم. چون بەم شێوە دەنووم کە سەرم دەنێمە نێوان پێم و بە وێنەی چەڵەمەی تەڵە چەڵەمەیەک ساز دەکەم تـا ئـەو خەیاڵـەی تـۆ ئەسیری بێت و نەتوانێت لە لای من بڕوات.

٢- گرانمایە: هێژا، بە نرخ. سەرگەرد: هەڵسووڕان بە دەوری شتێکدا. سایە: سێبەر. بم: ببم. واتە: بە قوربانی ئەو خەیاڵە هێژا و بە نرخەت بم کە گیانی منی پێوە بەنـدە و بـە سـەرگەردی ئـەو تاڵـە زوڵفانەت بم کە سێبەریان بە وێنەی سێبەری موشکە.

-٢٠-

٣- ع، ن، س، م، ب، ح، ڕ، عم، مج.

٤- قوربان: مەبەست جەژنی قوربانە کە دەکەوێتە دەیەمین ڕۆژی مـانگی «ذی الحجـە»ی کـۆچی مانگی کە لەو ڕۆژەدا حاجیان و زۆربەی خەڵکی دیکە قوربانی دەکەن. ئینە: ئەمە. عەیـد: جـەژن. نۆ: نوێ، تازە. واتە: ئەی یار! ئەمە جەژنی نوێیە و جەژنی قوربانە.

زەمزەمـــەی تەوحیـــد ڕای حـــاجی‌یانـــەن
قوربـــانی قوربـــان ئـــەمر ســـوبحانەن[1]

دارا و نـــەدارا، مســـکین و دەروێـــش
مەکـەرۆ هــەر کـەس قوربـانی پـەی وێـش[2]

تـــۆیچ ئـــەمن بـــەرە بـــە قوربـــانی‌گـــا
قوربـــانیم کـــەرە چـــوون «خلیـــل اللّه»[3]

---

١- زەمزەمـە: خوێندنەوەی شتێک لەبەر خۆوە بە دەنگی نزم. تەوحید: بە تاک و تەنیا زانینی خودا، لێرەدا مـەبەستی ئەو زیکرەیە کە حاجیان لە حەج دەیڵێن واتە «لبیک اللهم لبیک، لبیک لا شریک لک لبیک». ڕا: ڕێگە. ئەمر: دەستوور. سوبحان: پاک و بێ وێنـە، مەبەسـت خـودای گەورەیـە. واتە: دەنگی حاجیان دێت کە «لبیک اللهم لبیـک» دەڵـێن و کـاتی قوربـانی کردنـە کـە فـەرمانی خودای مەزنە و دەبێت قوربانی بکرێت.

٢- دارا: دەوڵەمەند. نەدار: فەقیر و بێ پووڵ و ماڵ. مسـکین: بێ پووڵ و هەژار. دەروێـش: لێـرەدا مەبەست هەژار و دەست تەنگە. واتە: لەبەر ئەوەی ئەمری خودای گەورەیە، ئەو کەسەی هەیەتی و نیەتی و دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵاتە، هەموو کەس بۆ خۆی خەریکی قوربانی کردنە.

٣- تۆیچ: تۆیش. بەرە: ببە. قوربانی‌گا: جێگەی قوربانی کردن. قوربانیم کەرە: بمکـە بـە قوربـانی، سەرم ببڕە. خلیل اللّه: مەبەستی حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیلە (س.خ) کە بە فەرمانی خودای مەزن حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی برد بۆ شوێنی قوربانی کردن و چەقۆی نایە ملی تا قوربانی بکات بەڵام لەو کاتەدا خودای مەزن کاوڕێکی هەنارد و ئەمری کرد بە جێی کوڕەکەت ئەو کاوڕە بکە بە قوربانی. واتە: ئەی یار! تۆیش وەرە من ببە بۆ ئەو شوێنەی قوربانی تێدا دەکەن و وێنەی حەزرەتی ئیبـراهیم کە قوربانی کرد قوربانیم بکە.

تێــغ بــێ درێــغ بنیــەم نــە گــەردەن
جــارِ دە بــە شــاردا قوربــانیم کــەردەن[1]

منــیچ بــەو قوربــان منــەت بارەنــان
قوربــانی قوربــان بــالآی یارەنــان[2]

-۲۱-[3]

چــراخ! قوربانــەن، قوربانیــەنان
غــەیر پــەی تــۆ پــەی کــەس قوربــان نیــەنان[4]

۱- تێغ بێ درێغ: تێخێکی تیژ کە هەموو شتێک دەبڕێت. بنیەم نە گەردەن: بنە لە ملم. جارِ: هاواری بەرز بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵک لە هەواڵێک. کەردەن: کردووە. واتە: تێخێکی تیژ و بێ درێغ بنە لە ملم و سەرم ببڕە و پاشان لە شاردا جارِ بدە و بڵێ قوربانیم کردووە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی نیوە بەیتی دووهەم نووسراوە: «تۆ ساحێب سەواب من شاد وە مەردەن».

۲- منەت بارەنان: منەت بارم. واتە: منیش بەو قوربانی کردنە منەت بارم لەبەر ئەوەی بووم بە قوربانی باڵآی یار.

-۲۱-

۳- ک، ئێ، ن، س، م، ب، ح، ر، ئا، عم، مج.

٤- قوربان: جەژنی قوربان. قوربانیەنان: قوربانیم، حازرم بۆ قوربانی بوون. غەیر: بێجگە، جگە. پەی: بۆ. نیەنان: نیم. واتە: ئەی یار! جەژنی قوربانە و منیش حازرم تا ببم بە قوربانی بەڵام جگە لە تۆ حازر نیم ببم بە قوربانی کەسی دیکە.

دیـــدەم نگـــەران تـــێخ دەســـت تـــۆن
ئـــەرواحم جۆیـــای کوشـــتەی قەســت تــۆن[١]

پـــەی تێخـت جـــە هــوون مەوجـــەن دەروونـــم
بـــــێ تێخـــــت ڕەوان نمـــــەبۆ هـــــوونم[٢]

ســـا دەس وە قـــەبزەی تـــێخ ئـــەڵماس بـــەر
قوربانیــت بــە وەخــت، قوربــان! خــەلاس کــەر[٣]

ئەرســـــەد کـــــە وینـــــۆ دەســـــتت ئـــــازارێ
ســەواب تــەر جــەی کــار نیــەن هــیچ کــارێ[٤]

---

١- نگەران: پەرۆش، پەرێشان. تۆن: تۆیە. جۆیا: ئەوەی بە دوای شتێکدا بگەڕێت. واتە: چاوم پەرۆشە و چاوەڕێی ئەو تێخەی دەستی تۆیە و ڕۆحیشم وا بە دوای ئەوەوە بزانێت تۆ قەستی قوربانی کردنی کێت هەیە.

٢- پەی: بۆ. هوون: خوێن. مەوج: شەپۆڵ. نمەبۆ: نابێت. واتە: بۆ تێخی تۆ خوێن لە دەروونمدا گێژ دەخوا و شەپۆڵ دەدات و بێ تێخی دەستی تۆ خوێنی ناکەوێتە ڕێگە و جمە ناکات. مەبەستی ئەوەیە کە تەنیا بۆ تۆ دەتوانم ببم بە قوربانی و تەنیا تێخی تۆ دەتوانێت من بکات بە قوربانی.

٣- قەبزە: مشتووی شمشێر و خەنجەر، شوێنی دەست پێوەگرتنی شمشێر و خەنجەر. تێخ ئەڵماس: هەر تێخێک زۆر تێژ بێت دەڵێن دەڵێی ئەڵماسە. بەر: ببە. کەر: بکە. واتە: دەسا مشتووی خەنجەرەکەت بگرە و قوربانیەکەی خۆت کە منم لەم کاتی جەژنی قوربانەدا لە دەستی ڕەنج و مەینەت خەلاس بکە.

٤- ئەرسەد: هەرچەند. وینۆ: دەبینێت. جەی: لەم. نیەن: نییە. واتە: هەرچەند لە کاتی قوربانی کردنی مندا بە هۆی گرتنی تێخەکەوە دەستت ماندوو دەبێت بەڵام هیچ کارێک لەم کارە ☜

تــێخ بــە دەســت وێــت بنیــەم وە گــەردەن
تــۆ ســاحیب ســەواب، مــن شــاد وە مــەردەن[1]

☆☆☆

-۲۲[2]-

چراخ! کەی بـۆ کـەی؟ چـراخ! کـەی بـۆ کـەی؟
جـە دوور زامنـــی، دینــت کــەی بــۆ کــەی؟[3]

چەنـد کـۆی پەڕزامــەت، سـارای پـەڕ جـە وەی
جـە گەردشـت چـەرخ گـەردان کـەریم تـەی؟[4]

---

☜ (قوربانی کردنی من) خاستر و سەواب تر نییە.

۱- وێت: خۆت. بنیەم وە گەردەن: بنە لە ملم. واتە: بە دەستی خۆت تێخ بنە لە ملم و سەرم ببـڕە، ئەو کاتە تۆ بە سەوابی خۆت دەگەی و منیش لـە مـەرگی خـۆم شـادمانم کـە لـە دەسـتی ئـازار و ناڕەحەتی ڕزگارم دەبێت.

-۲۲-

۲- ن، ک، ئێ، س، ب، ح، ڕ، عم.

۳- کەی بۆ: کەی بێت. زامن: شوێنی لـە دایـک بـوون و ژیـان، وەتـەن. دینـت: دیتنـی تـۆ، چـاو پێکەوتنی تۆ. واتە: ئەی یار! ئێستە کە لە وەتەن دوورم، داخۆ چاوم پێت بکەوێتەوە؟

٤- پەڕ: پڕ. زامەت: ئێش و ئازار. سارا: سەحرا، بیابـان. وەی: ئـێش و ئـازار. گەردشـت: گـەڕان، هەڵسووڕان. چەرخ گەردان: گەردوون. کەریم: بکەین. تەی: ڕێگە بڕین. واتە: چەند کـەش و کـۆ و بیابانی پڕ زەحمەت و ئێش و ئازار لەبەر کەج هەڵسووڕانی چەرخی ڕۆژگار بپێوین و ببڕین؟

چەند چۆڵ ئەربەد، بەرِ بێ سامان؟
چەند گێج گۆلاو، دەریای بێ ئامان؟ [١]

چەند خار موغیلان بیابان دەرد
پەردەی تەن شکاف، سەر نە دەروون بەرد؟ [٢]

چەند ڕوان جەفا، شەوان بێداری؟
بێداری چەنی سەیلات زاری [٣]

ئێمە بە بێ تۆ سا لێوە و سەرسام
خەیاڵ چەنی دەرد بێ خاوی و بێ ڕام [٤]

---

١- ئەربەد: بیابان، دەشتی چۆڵ و بێ ئاو. بەرِ: وشکانی. بێ سامان: بێ حەد و ئەندازە. گێج: گێژاو. گۆلاو: گۆلکە ئاو، گۆلە ئاو. بێ ئامان: مۆڵەت و فرجە بە کەس نادات. واتە: چەند دەشت و بیابانی بێ ئاو و چۆڵ و بێ حەدم پشکنی و چەند کەوتمە نێو گێژاوی دەریای بێ ئامانەوە؟ ئەم بەیتە لە سەرچاوەکانی «ب» و «س»دا نییە.

٢- خار: دڕوو، دڕک. موغیلان: جۆرە دارێکە بە ناوی «ام غیلان» بە واتای «دایکی دێوان» کە زیاتر لە بیابانی وڵاتانی عەرەبدا دەڕوێت و دڕووەکەی بەناوبانگە. بیابان دەرد: ئیزافەی تەشبیهیە و دەردی شوبهاندووە بە بیابانێکەوە کە دڕووی لێ دەڕوێت. پەردەی تەن: پێست، پۆس. پەردەی تەن شکاف: پێست دڕ، پێست بڕ، سیفەتە بۆ دڕووکە. سەر نە دەروون بەرد: سەری برد بە ناخمدا. واتە: چەند دڕووی پێست بڕی بیابانی دەرد چەقا بە دەروونم و سەری بە ناخمدا برد.

٣- ڕوان: ڕۆژان. جەفا: بێ وەفایی یار. چەنی: لەگەڵ. سەیلات: کۆی «سەیل»ـە، لافاو، تاوە باران. زاری: گریان. واتە: چەند ڕۆژ جەفا و شەو بێداری و نەنووستن لەگەڵ بارینی ئەسرینی چاوەکانم؟

٤- لێوە: شێت. سەرسام: قسەی هەڵیت و پەڵیت کردن، قسەی حەلەق مەلەق کردن. بێ خاوی:

یـــانێ ئەنــــدامم نــــەڕێزا نـــــە خــــاک
وەرنـــە دڵ چـــوون گـــوڵ ســـینە کـــەردەن چـــاک[١]

٭٭٭

-٢٣-[٢]

چـــراخ! لـــەنگم بـــێ، چـــراخ! لـــەنگم بـــێ
جـــە دووریـــــت زوان لاڵ و لــــەنگم بـــــێ[٣]

خـــــاترێ وێنــــــەی سیاســــــەنگم بـــــێ
شـــەوان چـــەنی بـــەخت تـــا ڕۆ جـــەنگم بـــێ[٤]

---

☞ بێ خەوی. بێ رام: بێ ئارام. واتە: من بە بێ تۆ وێنەی شێتێکم کە قسەی حەلەق مەلەق دەکات و دایم وام لە فکر و خەیاڵدا و بە وێنەی دەردەدارێک نە خەوم هەیە و نە ئارام و قەرار.

١- یانێ: یانی، واتە. ئەندامم: ئازای لەشم. نەڕێزا: نەڕژا. وەرنە: ئەینا، ئەگینا. کەردەن: کردووە. چاک: دڕاو. واتە: یانی تەنیا نەمردووم و لاشەم نەڕژاوەتە سەر عەرز ئەگینا چۆن گوڵێک زەوی شەق دەکات و دێتە سەر، بەو شێوە دڵی منیش لە دووری تۆ سینەمی شەق کردووە و دەیەوێت بێتە دەر و بە تۆ بگات. (بەس بە ناو زیندووم «وەرگێڕ»).

-٢٣-

٢- ک، ئێ، س، ن، ب، ح، ر، ئا، عم.

٣- لەنگ: زمانێک کە لە قسە کردن کەوتبێ. بێ: بوو. واتە: ئەی یار! لە دووریت زمانم لە گۆ کەوتبوو و لاڵ بووبووم.

٤- خاتر: فکر و خەیاڵ. سیاسەنگ: بەردی ڕەش. چەنی: لەگەڵ. ڕۆ: ڕۆژ. جەنگ: شەڕ. واتە: لە دووری تۆ فکر و خەیاڵم بووبوو بە بەردی ڕەش و شەوانە تا ڕۆژ دەبوویەوە لەگەڵ بەختمدا شەڕم بوو و بە گژیدا دەچووم.

نـــە تـــەوانام بـــێ چـــەنی کـــەس دوان
نـــە پـــام بـــێ، بـــێ تـــۆ وە جـــایێ لـــوان[١]

وێنـــەی سەرســـامان، نـــەزان هـــەواڵان
زەدەی زام ســـــەخت تیـــــر خـــــەیاڵان[٢]

وێـــڵ وێـــڵ مـــە گێڵام بێـــزار جـــە ژیـــان
خـــەمێو فـــراوان، کـــەمێو جـــە گیـــان[٣]

یـــانێ هـــا دووریـــت نەکـــەرد ئـــەو کـــارێ
وەرنـــە مـــەر گڵکـــۆم بوینـــات جـــارێ[٤]

***

---

١- دوان: قسە کردن. لوان: ڕۆیشتن. واتە: لە دووری تۆ نە هێزی ئـەوەم بـوو کـە لەگـەڵ کەسێک بدوێم و نە پێی ئەوەمە بوو کە بۆ جێگەیەک بڕۆم .

٢- سەرسام: قسەی هەڵیت و پەڵیت کردن بە هۆی یاوی زۆر یا نەخۆشینەوە. زەدەی: پێکراوی. واتە: بە وێنەی ئەوانە بووم کە سەرسامیان گرتووە و قسـەی حەلـەق مەلـەق دەکـەن و بـە تیـری خـەیاڵ پێکراون.

٣- وێڵ: ئاوارە، سەرگەردان. مەگێڵام: دەگەڕام. خەمێو: خەمێک، یەک خەم. کەمێو: کەمێک. واتە: ئاوارە و سەرگەردان دەگەڕام و لە ژیانی خۆم بێزار بووم و خەمێکیش زۆر بوو بۆ نـەمانی ئـەو کەمە گیانەم کە مابوو.

٤- نەکەرد ئەو کارێ: ئەو کارەی نەکرد، کاری خۆی یەک لایی نەکردەوە. وەرنە: ئەینا، ئەگینا. مـەر: مەگەر. گڵکۆ: خاکی گۆڕ. بوینات: بتبینایە، چاوت پێ کەوتبایە. واتە: هەر وەها کە وتم گیانێکی زۆر نەمابوو و خەمێکیش زۆر بوو بۆی کە ئەویش نەمێنێت بەڵام دووریت کاری خۆی یەک ☜

-٢٤-[١]

چـــراخ! مـــن ئێشـــان، چـــراخ! مـــن ئێشـــان
مـــن خـــاتر تـــەنگ بـــوو بـــە دەرد و ئێشـــان[٢]

مـــن بـــوو چـــوون زڵفـــت تاتـــا پەرێشـــان
پەنـــەم هـــەن تاقـــەت جـــەفای دەردکێشـــان[٣]

تـــۆ هـــەر زڵفـــت بـــۆ پەرێشـــان جەســـتە
جیـــۆتی بـــاڵات مـــن بـــوون تـــەن خەســـتە[٤]

---

☜ لایی نەکردەوە ئەگینا دەبوو بمردایەم و تۆیش یەکجاری چاوت بە خاکی گۆڕم کەوتبایە.

-٢٤-

١- ک، ئێ، س، ن، ب، ح، ڕ، عم، ئا.

٢- ئێشان: کۆی «ئێش». خاتر تەنگ بوو: دڵم تەم بگرێت، عاجز بم. واتە، ئەی یار! یا خودا دەرد و ئێش بێ بۆ من و دڵم بە دەرد و ئێش بێشێت و تەم بگرێت و عاجز بم.

٣- بوو: ببم. تاتا: تاڵ تاڵ. زڵف: زوڵف، کەزیە. پەنەم: پێم. هەن: هەیە. جەفا: ئێش و ئازار. واتە: من بە وێنەی زوڵفەکانت تاڵ تاڵ و پەرێشان و شێواو بم، چون تاقەت و ئۆقرەی دەرد کێشانم هەیە.

٤- بۆ: ببێت. جەستە: لاشە، شێوە. جیۆتی: جیاتی، بە جێگەی. بوون: ببم. تەن: لاشە، بەدەن. خەستە: بریندار، زامدار، دەتوانێ بە مانای هیلاک و ماندوویش بێت. واتە: تۆ با هەر زوڵفت پەرێشان شێوە و شێواوە بێت، لە باتی باڵای تۆ من لاشەم زامدار بێت و ئێش و ئازار بە باڵای تۆ نەگات.

ئەوســـا مـــن زامـــەت تـــۆ کێشـــانم بـــۆ
حاشـــا گـــەر ئانـــە چێـــو ئێشـــانم بـــۆ[١]

٭٭٭

-٢٥-[٢]

چـراخ! مـــن زامـــەت، چـراخ! مـــن زامـــەت
مـــن زامەتـــدار بـــوو، مـــن کێشـــوو زامـــەت[٣]

مـــن بـــوو دەروون هـــوون، بـــار مەلامـــەت
مـــن زامـــەتکـێش بـــوو پـــەرێ ئـــەو قامـــەت[٤]

---

١- ئەوسا: پاشان، ئینجا، دوای ئەوە. زامەت: زەحمەت، ئێش و ئازار. حاشا: قەت وەها نییە. واتە: چیتر با لەوە بە دوا من خەریکی ئێش و ئازار کێشان بە جێگەی باڵای تۆ بم، حاشا ئەگەر ئـەوە بـۆ من ئێش بێت. واتە ئێش و ئازارێک کە باتی باڵای تۆ دەیکێشـم مـن هـەرگیز بـە ئـێش و ئـازار و شوێنی ئێشانی نازانم.

-٢٥-

٢- ک، ئێ، س، ن، ب، ح، ر، عم.

٣- زامەت: ئێش و ئازار. زامەتدار بوو: دەردەدار بم. کێشوو: بکێشم. واتە: ئـەی یـار! بـا ئـێش و ئازار بێ بۆ من و من دەردەدار بم.

٤- هوون: خوێن. مەلامەت: لۆمە، توانج، سەرزەنش. پەرێ: بۆ. قامەت: باڵا. واتـە: بـا مـن دڵ و دەروونم پڕ بێت لە خوێن و باری لۆمە و سەرزەنشی خەڵک بە سەر شانمەوە بێت و ئێش و ئازار بارم بێت بۆ ئەو باڵایە.

بــه شـــەوان، ڕۆیـــێ، مـــاهێ یـــا ســـالێ
ئـــەر بـــە تـــۆ یـــاوۆ کەمتـــەر مـــەلالێ[١]

ئـــەمن جیۆتیـــت ســـەر و مـــاڵ و مـــین
مـــاڵ خـــوڵکـــان بـــەران، ســـەر خـــاک زەمـــین[٢]

☆☆☆

-٢٦-[٣]

چـــراخ! نـــۆش کـــەردەن، چـــراخ! نـــۆش کـــەردەن
جەوســـاوە دڵ جـــام دووریـــت نـــۆش کـــەردەن[٤]

---

١- ڕۆیێ: ڕۆژێک. یاوۆ: بگات. مەلاڵ: ناڕەحەتی، بێزار بـوون. مانـای ئـەم بەیتـە لەگـەڵ بـەیتی دوایی‌دا دێت.

٢- جیۆتیت: لە باتی تۆ، بە جێگەی تۆ. مـین: بـە تـەنیا خـۆی مانـای نییـە و دەنگێکـە لەگـەڵ «ماڵ»دا دێت واتە «ماڵ و مـین» و هەر بە مانای ماڵە. خوڵکان: خـەڵک، لـە نوسـخەخەتیەکاندا هەر بەو شێوە نووسراوە واتە «خولکان». واتە: هەر کاتێـک بـێ، شـەو بـێ یـا ڕۆژ، هـەر مانـگ و ساڵێک بێت ئەگەر کەمتر خەم و ناڕەحەتی و بێزاری بە تۆ بگات من بە جێگـەی تـۆ سـەر و مـاڵم ئەدەم و با ماڵم خەڵک ببیات و سەریشم بچێتە ژێر خاک.

-٢٦-

٣- ک، س، ن، ب، ح، ر، عم، ئا، مج.

٤- نۆش کەردەن: خواردوویە، نۆشیوە. جەو ساوە: لەو کاتەوە، لەو وەختەوە. مانای ئەم بەیتە لەگـەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

جـــه چـــەم هـــوون دڵ یـەنـــد خـــرۆش کـــەردەن
ســـوەیل چەمـــەنان پـــێ ڕەنـــگ‌پـــۆش کـــەردەن[١]

جـــــه زەردی ڕەنگـــــم، جـــــه پـــــەی بـــــار دەرد
مایـــــــــه هۆرگێرتـــــــــەن خـــــــــەزانان زەرد[٢]

وەختـــــێ نەوســـــوەیل وە ڕەنگـــــێش مەیلـــــەن
مـــــوژانم مـــــووی دەســـــت نـــــەخش ســـــوەیلەن[٣]

---

١- جه: له. چەم: چاو. هوون: خوێن. یەند: هێندە، ئەوەندە. خرۆش کەردەن: خرۆشاوە، بە خوڕ هاتنه خوارەوە. سوەیل: دووهەمین ئەستێرەی ڕووناکی ئاسمانه کـه کۆتـایی هـاوین و سـەرەتای پـاییز لـه ئاسماندا هەڵدێت و له وڵاته باکووریەکانی گۆی زەمیندا دەبینرێت و زیاتر بـه ئەستێرەی بـاکووری دەناسرێت. لەبەر ئەوەی له سەرەتای پاییزدا هەڵدێت و هاو کاته لەگەڵ زەرد و سـوور بـوونی گـەڵای داران، قـەدیمی وتوویانـه هـەڵهاتنی ئـەو ئەبێتـه هـۆی زەرد و سـوور بـوونی گـەڵاکان. چەمـەن: سەوزەڵانی. واته: ئەی یار! لەو کاتەوە دڵی من جامی دووری تۆی نۆشیوە خوێنی دڵم هێنده له چاوم خرۆشاوە و هێنده ئەسرینی خوێنم وەراندووە ئەستێرەی سـوەیل بـه خـوێنی چـاوی مـن سـەوزەڵانی ڕەژتووە.

٢- جه پەی: لەبەر. مایه: ئامیان، هەوێن، ئەسڵی شتێک. هۆرگێرتەن: هەڵگرتووە. واته: له ڕەنگی زەردم کە لەبەر باری دەرد زەرد بووە، گەڵای زەردیـش مایـەیان هـەڵگرتووە و زەرد بـوون. واتـه گـەڵای زەردیش ڕەنگیان لای من بردووە و خۆیان ڕەنگ کردووە.

٣- مووی دەست نەخش: فڵچەی نەقاشی. واته: کاتێک نەوسـوەیل دڵـی بـه ڕەنـگ کردنـەوە بێـت مژۆڵی من فڵچەی دەستیەتی چونکه له چاوانی من ئەسرینی خوێن دەڕژێت.

فیـــدای دووریـــت بـــام پێســـەش کـــەردەن پـــێم
ســـوەیل مایـــەی ڕەنـــگ هۆرمـــە گێرۆ جـــێم[١]

✵✵✵

-٢٧-[٢]

چراخ! نە تـۆ بەسـت؟، چـراخ! نـە تـۆ بەسـت؟
نـە تـۆ چـەنی مـن عـاد و بـەینت بەسـت؟[٣]

نـە تـۆ بـە قورئـان شـەریف کێشـای دەسـت؟
ڕووم نیـــــەن نـــــە ڕای ڕەقیبـــــان گەســـــت[٤]

---

١- بام: ببم. پێسە: بەم جۆرە، بەم شێوە، ئاوەها. کەردەن: کردووە. هۆرمەگێرۆ: هەڵدەگرێت. جێم: لە من. واتە: بە قوربانی دووریەکەت بم کە کارێکی وەهای پێم کردووە سوەیل بۆ ڕەنگ کردنی داران لای من ڕەنگ دەبات.

-٢٧-

٢- ک، ئێ، س، ن، ب، ح، ر، عم، مج.

٣- نە تۆ: تۆ نەبووی. عاد: عەهد، پەیمان. بەین: شەرت و بەڵێن. واتە: ئەی یار! مەگەر تۆ نەبووی لەگەڵ من شەرتت کرد و پەیمانت بەست؟ ئەم پارچە شێعرە لە هەندێک سەرچاوەدا بە «چراخ بەینت بەست» دەست پێدەکات.

٤- کێشای: کێشات. نیەن: نییە. نە: لە (فارسی: دَر). ڕا: ڕێگە. ڕەقیب: پاسەبان، چاودێر، لێرەدا بە مانای ناحەز و بەدخواز هاتووە. گەست: ناحەز، ناپاک، ناشرین. واتە: مەگەر تۆ نەبووی دەستت کێشا بە سەر قورئاندا و وتت من ڕووم لە ڕێگەی بەدکاران نییە و بەس تۆ دەبینم.

واتـــت تـــا بـــەو ڕۆ بەرمەشـــۆم نەفـــەس
جـــە بـــەد بێـــزارم، هـــەر تۆمـــەنی کـــەس[١]

ســـەوگەندت مـــەوارد بـــە دانـــای داوەر
غـــەیر جـــە تـــۆ فێشـــتەر بـــە کـــەس نـیم یـاوەر[٢]

ئیسە سەوگەندت پـەی چـێش شـی جـە یـاد؟
پەی چـێش عـاد و بـەین وەفـات دا بـە بـاد؟[٣]

یانـــە وێرانـــی هـــەر بـــە مـــن ئامـــان
مـــەتاوو گێرتـــەی کەســـێوتەر دامـــان[٤]

***

---

١- واتت: وتت. تا بەو ڕۆ: تا ئەو ڕۆژە. بەرمەشۆم نەفەس: گیـان دەسـپێرم، هەناسـەم دەردەچێـت. تۆمەنی کەس: کەسم تۆی. واتە: وتت تا ئەو ڕۆژەی گیان دەسپێرم لە بەدان بێزارم و کەسم هەر تۆی.

٢- سەوگەند: قەسەم. مەوارد: دەتخوارد. دانای داوەر: زانایەک کە حەقی خەڵک بستێنێت، خودا. غەیر: بێجگە، جگە. فێشتەر: زیاتر، زۆرتر. یاوەر: دۆست، یار، هاوڕێ. واتە: قەسەمت بە خـودای گەورە خوارد کە جگە لە تۆ لەگەڵ کەسیتر یار و هاوڕێ نیم.

٣- پەی چێش: بۆچی. شی: ڕۆیی. عاد: عەهد، پەیمان. بـەین: شـەرت و بـەڵێن. واتـە: ئێسـتە لەبەرچی قەسەمەکەت بیر چووە و پەیمان و شەرت و بەڵێنت و وەفات دا بە بادا؟

٤- یانە: ماڵ، خانوو. ئامان: هاتووە. مەتاوو: ناتوانم. گێرتـەی: گـرتن. کەسـێوتەر: کەسـێکیتـر، کەسێکی دیکە. واتە: ماڵ وێرانی هەر بـە مـن دەکـەوێت کـە نـاتوانم دامـانی کەسـێکی دیکـە و یارێکیتر بگرم. لە نوسخەی «ک»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جـۆرە نووسـراوە: «نمـەتاوو گێـروو کەسێونی دامان» کە «کەسێونی» کورت کراوەی «کەسێو هەنی» و بە مانای «کەسێکی تر»ە.

-٢٨[١]-

چـــراخ! نـــە دڵـــەن، چـــراخ! نـــە دڵـــەن
هەرکـەس غەریبـەن هـەر خـەم نـە دڵـەن[٢]

دڵـــەی غـــەریبان چـــوون پـــەڕەی گوڵـــەن
گـــوڵ خـــار تـــێش نیشـــۆ خـــەیلێ موشـــکڵەن[٣]

گـــوڵ ئـــەر بنیشـــۆش خـــارێ نـــە ڕوخســـار
جـــە زەخـــم ئـــەو خـــار، زایـــف مـــەبۆ، زار[٤]

---

☞ مەولەوی ئەم بەیتەی بێسارانی لە پارچە شێعری «هەرچەند هێجرانت یەند زۆر ئاوەردەن»دا بەم شێوە تێهەڵکێش کردووە:

های ڕەحمەت ئەو قەبر سەودایی کامڵ    سەرمەشق مەینەت بێساران مەنزڵ
«یانە وێرانی هەر بە من ئامان    مەتاوو گێرتەی کەسێوتەر دامان»

کە هەڵبەت بە جێی «بە من»، «وە من» و بە جێی «مەتاوو»، «مەتاوون» نووسراوە.

-٢٨-

١- ک، ئێ، س، ن، ب، ح، ع، ئا، ڕ، عم، ج، مج.

٢- نە دڵەن: لە دڵدایە. واتە: ئەی یار! هەرکەس غەریب و دوورە وڵات بێت هەر خەم و خەفەتی لە دڵدایە.

٣- چوون: وێنەی، وەکوو. پەڕەی گوڵ: مەبەست ناسک بوونە. خار: دڕوو، دڕک. تێش: تێی. نیشۆ: بنیشێت، جێگیر بێت. خەیلێ: زۆر. واتە: دڵی غەریبان وێنەی پەڕەی گوڵ وایە و ئەگەر گوڵیش دڕووی تێ بچەقێت ئێشی زۆرە و زۆر سەختە.

٤- زایف: زەعیف، لاواز. مەبۆ: دەبێت. زار: لاواز، کەسێک کە هیچ کارێکی پێ نەکرێت، لێرەدا بە مانای «سیس»ـە. واتە: ئەگەر دڕوویەک بە ڕوومەتی گوڵدا بچەقێت لەبەر زامی ئەو دڕووە ☜

غـــەریب ئـــەر پەنـــەش بواچـــان ســـەردێ
هـــەر ســـەردێ مـــەبۆ پـــەرێش بـــە دەردێ[1]

دڵـــەی غـــەریبان مێســـل گـــوڵ دارۆ
کـــافر ئـــەو کەســـەن غـــەریب مـــازارۆ[2]

موڵـــک غـــەریبیم بـــێ حەســـاب دیـــەن
داخ غـــەریبیم جـــە حـــەد بەرشـــیەن[3]

هەرکـــەس مەکـــەرۆ غـــەریبنـــەوازی
بـــێ شـــک خوداوەنـــد جـــێش مـــەبۆ ڕازی[4]

---

☜ سیس و لاواز دەبێت.

١- پەنەش: پێی، بە ئەو. بواچان: بڵێن، بێژن. سەرد: قسەی ناشرین، قسەی سارد و سووک، جوێن. مەبۆ: دەبێت. پەرێش: بۆی، بۆ ئەو. واتە: ئەگەر قسەی ناحەز و ناشرین بە غەریبێک بکەن، هەر کام لەو قسانە دەبێت بە دەردێک بۆی و وێنەی ئەو گوڵە لاوازی دەکات.

٢- مێسل گوڵ دارۆ: وێنەی گوڵە. ئەو کەسەن: ئەو کەسەیە. مازارۆ: ئازار ئەدات. واتە: دڵی غەریبانیش بە وێنەی گوڵە هەر وەک گوڵ ئەگەر درووی پێدا بچەقێت لاواز و سیس دەبێت ئەگەر کەسێکیش ئازاری غەریبان بدا، ئەوانیش دڵیان دەڕەنجێت، کە وایە هەرکەس غەریبان ئازار بدات کافرە. لە هەندێک سەرچاوەدا بە جێی «مازارۆ»، «ئازارۆ» نووسراوە و لە نوسخەی «ئێ»یشدا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «کافرەن ئەو کەس غەریب ئازارۆ».

٣- موڵک: وڵات، مەملەکەت. دیەن: دیوە، بینیوە. بەرشیەن: دەرچووە. واتە: من زۆرم وڵاتی غەریبی بینیوە و داخی غەریبیم هێندە زۆرە لە ئەژمار نایەت.

٤- مەکەرۆ: دەکات. جێش: لێی، لە ئەو. مەبۆ: دەبێت. واتە: هەرکەس قەدر و ڕێزی غەریب ☜

هـــەر کـــەس مـــە گێرۆ غـــەریبان عێـــززەت
پـــەی وێـــش مەســازۆ جـــایێ جـــە جەنـنــەت[1]

☆☆☆

-٢٩-[2]

چــــراخ! نـــــەزانام، چــــراخ! نـــــەزانام
مـــــن بــــێ وفاییــــت جــــەزەڵ نـــــەزانام[3]

وێنــــەی غولامـــــان وێـــم پێــــت نمانــــام
چـــەنــی وێـــرد، ئـــەوراد نامـــت مـــەوانام[4]

---

☜ بگرێت بێ گومان خودای لێ ڕازی دەبێت.

١- مەگێرۆ: دەگرێت. عێززەت: ڕێزگرتن، گەورە کردن. پـەی وێـش: بـۆ خـۆی. مەسـازۆ: دروسـت دەکات، چێ دەکات. جەننەت: بەهەشت. واتە: هەرکەس ڕێزی غەریبان بگرێت شوێن و جێگەیەک بۆ خۆی لە بەهەشتدا دروست دەکات.

-٢٩-

٢- ک، ب.

٣- چراخ: یار، خۆشەویست. نەزانام: نەمزانی، ئاگادار نەبووم. جەزەڵ: لە ئەزەڵ، لە سەرەتاوە. واتـە: ئەی یار! من لە سەرەتاوە نەمزانی تۆ بێ وەفایت.

٤- نمانام: نیشانم دا، نواندم. وێم: خۆم. چەنی: لەگەڵ. وێـرد: ویـرد، دۆعـای پـاش بانـگ و نـوێژ. ئەوراد: کۆی «ویرد»ـە. مەوانام: دەمخوێند. واتە: من خۆم وەک غولام و نۆکـەر بـە تـۆ ناسـاند و نواند و لەگەڵ ویرد و دۆعادا ناوی تۆم دەبرد. مانای ئەمەیە من خۆم زۆر بـە کـەم و تـۆم زۆر بـەرز دانا.

نــــەزانام بـــێ شـــــەرت وەفـــا و بەینـــــەنی
بـــێ بـــاک جـــە تانـــەی مـــەنا و مەینـــەنی[١]

نیـــــەنی بـــــە تـــــەنگ نـــــەنگ و نامــــەوە
چەنــد جــار پــام پێچــای تــۆ بــەو دامــەوە[٢]

ئیســـــە بــێ شـــــەرتیت مــــالووم بیــــەن لــێم
بــــیم بــــە ســــەرکۆنەی هامســــــەران وێـــم[٣]

چــــــــەنی ناکەســـــــان کـــــــــەردات وەراوەر
ســـەنگ ونـــەت وارۆ خاســـت بـــەرد ئـــەو ســـەر[٤]

✻✻✻

١- بەین: شەرت و وەفا. بێ باک: نەترس. مەنا: بەرگری کردن، لۆمــە کـردن. مــەین: منــت دانــان، کاتێک مەنا و مەین پێکەوە دێن بە مانای لۆمــە کردنــە. واتــە: نــەمزانی بــێ وەفایــت و شــەرت و بەڵێنت نییە و گوێت لە تانە و تەشەر و لۆمە کردن نییە.

٢- نیەنی بە تەنگ: گوێت لێ نییە، بە تەنگەوە نیت. نـەنگ: شـەرم و حـەیا. پێچـای: هاڵانـدت. واتە: نەمزانی گوێت لە خراپە وتنی خەڵک نییە کە بە خراپ ناوت ببەن و گوێت لە شەرم و حـەیا نییە و هەر لەبەر ئەوەیشە بێ ئەوەی نزیکت بکەوم چەند جارێک منت خستە داوی عەشقی خۆت (لە حاڵێکدا تۆ بێ وەفا بوویت و من نەمزانیبوو).

٣- مالووم: مەعلووم، ئاشکرا. بیەن: بووە. بیم: بووم. سەرکۆنە: جێگەی کوتان و لۆمە و سەرزەنش. هامسەران: دۆستان، یاران، هاورێیان. واتە: ئێستە چیتر بێ وەفایی و بێ شەرتی تۆم بۆ ئاشکرا بووە و دۆست و هاورێیانم دایمە لۆمە و سەرکۆنەم دەکەن و دەمکوتن.

٤- چەنی: لەگەڵ. کەردات: کردمت. وەراوەر: بەرانبەر. وەنەت وارۆ: لێت بباری. بەرد: برد. ☜

-٣٠-[1]

چـــــراخ! نــــــەزانان، چـــــراخ! نــــــەزانان
چـێش کـەروون جـە دەسـت ئـەحواڵ نـەزانان؟[2]

بڎیـــــە وە چەنـــد تــــەرح جـــەفا مــــەنمانان
گـــولێ وە ســـەحرا پــەی گـــڵ مـــەکیانان[3]

---

واتە: لەگەڵ مرۆڤە لار و ناکەسەکاندا هەڵتسەنگاندم و سەیرت کردم، ئەی بەردت لـێ ببارێـت شەرت و بەڵێنەکەت خاس بردە سەر. «خاست بەرد ئەو سەر» لە بنەمادا یـانی خاسـت بـردە سـەر بەڵام بێسارانی لێرەدا تانە لە یار دەدات بەو مانایە کە «شەرت و بەڵێنەکەت خاس نەبردە سەر».

-٣٠-

١- ح، ن، س، ب، ر.

ئەوکات بۆ جوانکاری نێوماڵ بە گڵە سپی سواخیان دەدا و هەر دێیەکیش گڵەجانێکی بۆ گڵە سپیە هەبوو، زۆرجاریش گڵەجانەکە لە دێ دوور بوو، ژنان دەچوون و بە کۆڵ خۆڵیان دەهێنا بۆ مـاڵ سـواخ دان. وا دیارە بێسـارانی کاتێک ئەم شێعرەی هۆنیوەتەوە کە ماڵێک جوانە کچێکیان نـاردووە بـە کـۆڵ خۆڵ بێنێت بۆ ماڵ سواخ دان. بە پێی ئەوەی لە شێعرەکەدا «گڵ» و «گوڵ» و «کۆڵ» زۆر دووپـات کراوەتەوە و لە نوسخە قەدیمەکاندا هەر سێی بە «کل» نووسراوە، کاک حەکیم و مامۆستا بۆرەکەیی زۆر بە هەڵە ڕاستیان کردوەتەوە و تەنانەت کاک حەکیم کاتێک مانای کردوەتەوە زۆر دوور بۆی چـووە و بە مەسەلەی «گەرمیان و کوێستان» و «ژن بە ژن» مانای کردوەتەوە.

٢- چێش کەروون: چی بکەم. واتە: ئەی یار! مـن چیبکـەم لـە دەسـت هـەواڵ نـەزانان و ئەوانـەی هیچیان حاڵی نییە؟

٣- بڎیە: سەیر بکە، ببینە. تەرح: جۆر، شێوە. مەنمانان: دەنوێنن. سەحرا: دەشت، مـەزرا. پـەی: بۆ. گڵ: خاک. مەکیانان: دەنێرن. واتە: سەیرکە بزانە بە چەند جۆر جەفا دەنوێنن،گوڵێک

گــــوڵێ پـــــەروەردەی ڕێــــزوان مـــــاوا بـــــۆ
چ لایێـــــق پـــــەرێ یانـــــە ئـــــاوا بـــــۆ؟ [1]

یانـــــە و ماواشـــــان بـــــە کـــــەلارە بـــــۆ
جەرگشـــــان بـــــە تـــــێخ پـــــارە پـــــارە بـــــۆ [2]

ســا کــەی بــی، کــێ دی، جــەی وەرتــەر ڕۆیــێ؟
گــڵ ئــاران بــە کــۆڵ گــوڵ ئەشــەدبۆیێ؟ [3]

یــا شــا هــەر کەســێ گــڵ بــە گــوڵ ئــارۆ
شــەڵڵا وە بــالاش ســەنگ و گــڵ وارۆ [4]

***

☜ دەنێرن بۆ دەشت و مەزرا خاک بێنێت.

١- ڕێزوان: باخی بەهەشت. ماوا: جێگە. بۆ: بێ، بێت. پەرێ: بۆ. یانە: ماڵ خانوو. واتە: گوڵێک کە پەروەردەی باخی بەهەشت بێت و جێگە و مەکانی باخی بەهەشت بێت حەیف نییە ماڵی پێ ئاوەدان بکەیتەوە؟

٢- کەلارە: شوێنێکی وەک ماڵ بەڵام بێ سەرە و بەرە و سەر نەگیراو و دیوار لار و ناڕێک، کەلاوە. واتە: یاخودا ماڵ و مەنزڵیان ببێت بە کەلاوە و جەرگیان بە تێخ لەت لەت بێت.

٣- جەی وەرتەر: لەوە پێشتر. ڕۆیێ: ڕۆژێک. ئاران: بهێنن. ئەشەدبۆ: گیایەکی بۆن خۆشە کە بە فارسی «علف گربە» و بە سۆرانی «گیا کتک»ی پێ دەڵێن. واتە: لەوە پێشتر کەی بووە و کێ بینیویە بە کۆڵی کەسێکی وێنەی گوڵی ئەشەدبۆ خاک و خۆڵ بێنن بۆ ماڵ چێ کردن؟

٤- یاشا: یا خودا، یاخوا. ئارۆ: بێنێت. شەڵڵا: لە خوام دەوێت، ئیشەڵڵا. وارۆ: بباریێت. واتە: یاخودا هەرکەسێک بە کۆڵی گوڵ خاک بێنێت ئیشەڵڵا بەرد و خاکی بە سەردا بباریێت. واتە ☜

-٣١-[١]

چـــــــراخ! وه ڕەزان، چـــــــراخ! وه ڕەزان
ئـــــارۆ ڕایـــــێم کـــــەوت شـــــیان وه ڕەزان[٢]

بـــــه زوان هـــــاڵ پەرســـــام جـــــه خـــــەزان
تـــەن بیـــەن مـــەجرووح چـــوون مـــاران گـــەزان[٣]

واتـــــم هـــــەی خـــــەزان ڕەژیـــــدەی چەمـــــەن
ئوســـــــتاد نـــــــەقاش بلـــــــەرم یەمـــــــەن[٤]

---

☜ ئیشەڵڵا بمرێت و بیکەن بە ژێر بەرد و خاکی گۆڕەوە.

-٣١-

١- ک، ئێ، ح، ب، ن، س، ڕ، عم، ی.

٢- ڕەزان: باخ، مەزرا، لە بنەڕەتدا «ڕەز» بە مانای مێوی دێمییە بەڵام لە دیوانی بێسارانیدا بە گشتی بە مانای «باخ» هاتووە. ئارۆ: ئەمڕۆ، ئیمڕۆ. ڕایێم: ڕێگەم. شیان: ڕۆیشتم. واتە: ئەی یار! ئەمڕۆ ڕێگەم کەوت و بە نێو باخاندا ڕۆیشتم.

٣- زوان حاڵ: قسە کردن بە حاڵ و بار و دۆخ نە بە زمان و دەنگ. پەرسام: پرسیم. خەزان: گەڵای زەردی داران. تەن: لاشە. بیەن: بووە. مەجرووح: زامدار. چوون: وێنەی، وەکوو. واتە: بە زمانی حاڵ لە گەڵای زەردی دارەکان کە لە دارەکان جودا ببوونەوە و کەوتبوون و بە وێنەی ماران گەستە لاشەیان زامدار ببوو پرسیارم کرد. لێرەدا «تەن بیەن مەجرووح چوون ماران گەزان» شەرحی حاڵی گەڵاکانە نە خودی بێسارانی.

٤- واتم: وتم. ڕەژیدە: ڕەشتوو، ڕەشتراو. نەققاش: وێنەکێش. بلەرم: بە ڕێک و پێکی مانەکەیمان بۆ ڕاست نەکرایەوە بەڵام بە پێی مانای شێعرەکە و بە پێی ئەوەی لە دوو جێگەی تریشدا هاتووە وا دیارە یا بە مانای «داری بەرز»ـە یا ناوی جۆرە دارێکە کە ئێستا وای پێ ناڵێن و ئێمە بە مانای ☜

سەبەب جە چێشەن ڕەنگ زگارەنی؟
سەرتاپا هوونین دڵ ئەفگارەنی؟ [١]

واتش هەی بێ مەیل! ناکا جە ڕۆیێ
دیم ئاما ویەرد زڵف ئەشەدبۆیێ [٢]

---

☞ «داری بەرز» هێنامان. هەر وەها لە دوو پارچە شێعری «پاییز ئاماوە» و «نەوسوەیل باخان»یش‌دا هاتووە.(تێبینی: بلەرم، هەرشتێک بێت دار یا ..... بە بڕوای من لە وڵاتی یەمەندا زۆرە و بە ناوی یەمەنەوە ناسراوە چون دەڵێ «بلەرم یەمەن». وەرگێڕ). یەمەن: وڵاتی یەمەن. ئوستاد نەققاش بلەرم یەمەن: مەبەست ئەستێرەی سوەیلە کە لە پاییزدا هەڵدێت و یەکەم جار لە وڵاتی یەمەنەوە دەبینرێت و قەدیمیان لە سەر ئەو باوەڕەن کە هەڵهاتنی سوەیل دەبێتە هۆی گۆڕینی ڕەنگی گەڵای داران و لەبەر ئەوە وتوویانە سوەیل ڕەشتوویە. واتە: وتم ئەی گەڵا زەردەکە کە لەم سەوزەڵانییەدا بە دەستی وێنەکێشی وڵاتی یەمەن کە دارە بەزرەکان دەڕێشێت، ڕەشتراوی و ڕەنگ کراوی.

١- سەبەب: هۆکار. چێشەن: چییە. زگار: مەلوول، کز، دڵتەنگ. هوونین: خوێنین. ئەفگار: زامدار. واتە: لەبەر چییە بەم جۆرە زەرد و کزی و سەرتاپات خوێنییە و دڵت زامدار بووە. گەڵای داران کە لە پاییزدا ڕەنگیان زەرد و سوور دەبێت ڕەنگی زەردی بە کزی و مەلوول بوون داناوە و سووریشی بۆ خوێنین و دڵ زامدار بوون.

٢- واتش: وتی. ناکا: ناکاو، کوتوپڕ. ڕۆیێ: ڕۆژێک. ئاما: هات. ویەرد: تێپەڕی، ڕۆیشت. ئەشەدبۆ: گیایەکی بۆنخۆشە، (بە سۆرانی «گیا کتک»ی پێ ئەڵێن «وەرگێڕ»). واتە: گەڵاکە وڵامی دایەوە و وتی ئەی بێ مەیل! هۆی ڕەنگ زەردی من ئەوەیە ڕۆژێک کوتوپڕ جوانێک کە زوڵفی لە ئەشەدبۆ دەچوو هات و لێرەوە ڕۆیشت.

خـــەرامان وێـــەرد بـــە ســـەد نـــازەوە
بـــە دیـــدەی قـــەتران ســـورمە ســـازەوە[١]

مـــەودای مـــوژانش نیشـــتەن نـــە جـــەرگم
یـــە هـــوون دڵـــەن پـــێ ڕەژیـــان بـــەرگم[٢]

نـــە، مـــن زایفـــیم جـــە بۆنـــەی لەیلـــەن
عامیـــان ماچـــان ڕەشـــتەی ســـوەیلەن[٣]

ئێمـــەیچ چـــوون خـــەزان هـــوون دڵ وەردیـــم
جـــە دووری یـــاران داخ وە گـــڵ بـــەردیم[٤]

***

---

١- خەرامان: بە لار و لەنجە. قەتران: ماکێکی(مادەیەکی) ڕەشە. سورمە: کل، کلە. سورمەساز: بە کلە ڕازێنراو. واتە: بە لار و لەنجە و سەد ناز و بە چاوی ڕەشی کلە ڕازێنەرەوە ڕۆیشت.

٢- مەودا: تیژی، نووکی تیژ. موژان: کۆی «موژە»، مـژۆڵ برژانـگ. نیشـتەن: نیشـتووە. نـە: لـە (فارسی: دَر). یە: ئەمە. هوون: خوێن. ڕەژیان: ڕەنگ کراوە. واتە: نووکی تیژی مژۆڵەکانی چەقا بـە جەرگمدا و ئەوە خوێنی دڵمە کە جل و بەرگمی پێ ڕەنگ بووە.

٣- زایفیم: مەلوولیم، کزبوونم. جە: لە. عامیان: خەڵکی بێ عیلم و سەواد، خەڵکی نەزان. ماچان: دەڵێن. ڕەشتە: ڕەنگ بوو، ڕەنگ کراو. واتە: هەرچەند خەڵکی نـەزان دەڵـێن کـە مـن ڕەنـگ کـراوی سوەیلم بەڵام وەها نییە، کزی و مەلوولی من لەبەر دووری لەیلە.

٤- ئێمەیچ: ئێمەیش. چوون: وێنەی، وەک. هوون: خوێن. وەردیم: خواردمـان. گـڵ: قـوڕ، خـاک، لێرەدا مەبەست خاکی گۆڕە. بەردیم: بردمان. واتە: ئێمەیش بە وێنەی گەڵا زەردەکان خوێنی دڵـمان خوارد (لە سەختی و مەرارەتدا بووین) و لە بەر دووری دۆست و یار و هاوڕێیان داخی دڵمان بردە...

-٣٢-[١]

چـــراخ! وەش بۆشـــەن، چـــراخ! وەش بۆشـــەن
پـــێچ زڵـــف تـــۆ ئەوەنـــد وەش بۆشـــەن[٢]

مـــەوینۆن چـــوون شـــەوق جـــەمینت ڕۆشـــەن
موشـک نـاف پـەرێش زەنگـی پـۆس پۆشـەن[٣]

خـــەیلێ پـــەی زڵفـــت وەردەن هـــوون جـــەرگ
جەوپـەی پـۆس پۆشـان، سـیا کـەردەن بـەرگ[٤]

---

☜ گۆڕ (مردین).

-٣٢-

١- ک، ئێ، ن، ب، ح، س، ر، ئا، عم.

٢- وەش بۆشەن: بۆنخۆشە. ئەوەند: ئەوەندە، هێندە. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێ.

٣- مەوینۆن: دەبینێت. چوون: وێنەی، وەک. جەمین: ڕوخسار، نێوچاوان. موشک ناف: مـاکێکی ڕەشی بۆنخۆش. پەرێش: بۆی، بۆ ئەو. زەنگی پۆس: پێستی ڕەش. واتە: ئەی یار! ئەو زوڵفـە لـوول خواردوانەت ئەوەندە بۆنخۆش و ڕەشن کە کاتێک موشک دەبینێت ڕۆشنایی ڕوخسارت بۆ زوڵفەکانت وەکوو ڕۆشنایی ڕۆژ وەهایە، لەبەر ئەوە کـە بتوانێـت ببێـت بـە وێنـەی زوڵفـەکانت پێـستی ڕەشـی پۆشیوە. لێرەدا شاعێر موشکی هێناوە هەم بۆ هەڵسەنگاندی لەگەڵ زوڵفی یـار و هـەم بـۆ ئـەوەی هەردوو بۆن خۆش و ڕەشن بەڵام ڕوڵفی یار چونکە وا لە کەناری شەوقی ڕوخساردا ڕەشتر دەنوێنێت و موشک کە چاوی بە ڕەشی ئەو دەکەوێت دەیەوێت کارێک بکات لەو ڕەشتر بێت هەر بۆیـە پێـستی ڕەش دەپۆشێت. دیارە کە موشک وا لە نێو کیسەیەکی پێستین‌دا و لێرەدا بێسارانی دەڵێت لەبەر ئەوە ئەو پێستەی پۆشیوە.

٤- خەیلێ: زۆر. پەی: بۆ. وەردەن: خواردووە. هوون: خوێن. جەو پەی: لەبەر ئەوە، بۆیـە. سیا ☜

دڵ کـــەردەن جـــە دەرد، زڵـــف تـــۆ دارا
قـــەیس ئاســـا مـــاواش بـــەردەن وە ســـارا[1]

فیـــدای زڵفـــت بـــام بـــۆ وەشـــبۆی کـــڵاف
دەرد مـــەجنوونیش دا بـــە موشـــک نـــاف[2]

☆☆☆

---

☞ کـەردەن: ڕەش کـردووە. بـەرگ: جـل و بـەرگ، لیبـاس. واتـە: موشـک لەبـەر ئـەوەی وەک زوڵفەکانی تۆ بنوێنێت خوێنی دڵی زۆر خواردووە و کەوتۆتە سەختی و ناڕەحەتی بۆیە پێستی ڕەشی پۆشیوە و جل و بەرگی ڕەشی لەبەر کردووە تا بتوانێت ڕەنگی بە وێنەی زوڵفەکانی تۆ بێت.

١- کەردەن: کردووە. دارا: دەوڵەمەنـد. قـەیس: قەیسـی عـامری، خۆشەویسـتەکەی لـەیلا کـە بـە مەجنوون ناوی دەرکرد. قەیس ئاسا: بە وێنەی مەجنوون. ماوا: مـاڵ و مـەنزڵ، شـوێنی نیشـتەجێ بوون. بەردەن: بردووە. سارا: سەحرا، کەش و کۆ، دەرەوەی ئاوایی. واتە: موشک لەبەر ئەو دەردەی کە نەیتوانی وەکوو زوڵفەکانی تۆ بێت، دڵی بـە وێنـەی زوڵفـەکانی تـۆ ڕەش بـوو و لـە ڕەشـی و دەردی زوڵفەکانتدا دەوڵەمەند بوو و لە تاوا شێت بوو و بە وێنەی مەجنوون دای بە کەش و کـۆدا. لێـرەدا بێسارانی بە جوانکارییەکی تەواو دەردی زوڵفی یار بە دەوڵەمەندی و بە سەرمایەیەک بۆ عاشقی و مەجنوون ئاسایی بوون دادەنێت.

٢- بام: بم. کڵاف: پێچراو، لوول کراو، پەلکە. موشک ناف: مـاکێکی ڕەش و بۆنخـۆش. واتـە: بـە قوربانی زوڵفە لوول و بۆنخۆشەکانت بـم کـە دەردی مـەجنوونیان دا بـە موشـک، چونکـە موشـک نەیتوانی وەکوو ئەوان بێت و لە تاوا شێت بوو دای بە کەش و کۆدا.

-٣٣-[١]

چــــراخ! وەنەوشـــــە، چنـــوور چـــەنی گـــوڵ
عـــــەزم ڕای وێســــاڵ تۆشـــانەن نــــە دڵ[٢]

چنـــوور جــە ســـەرکۆ، وەنەوشــە جــە چــەم
گــوڵ جــە گوڵســـتان وە هـــەم بیـــەن جــەم[٣]

یـــەک یـــەک چـــەنی هـــەم ماجەراشـــانەن
خــــەیاڵ وێســـــاڵ تـــــۆ سەوداشــــــانەن[٤]

واتشــــــان دەردیــــــن! بەنـــــدەی فلانــــــی!
چـــوون حاڵزانـــــەنی و بــــە حـــاڵ مــــەزانی[٥]

---

-٣٣-

١- ک، م، ن، ح، س، ب، ع، ڕ، ئا، عم.

٢- وەنەوشە: بنەگیایەکی جوانکەلەیە بە چەن جۆرە گوڵی بۆنخۆشەوە. چنوور: گیایەکی بۆنخۆشە لە کوێستان دەڕوێ و گەڵاکەی لە شویت دەکات. چەنی: لەگەڵ. عەزم: نیەت کردن، نیاز. ڕای ویساڵ: ڕێگەی گەیشتن بە یار. تۆشانەن: تۆیانە. واتە: ئەی یار! چنوور و وەنەوشە و گوڵ بە نیازن بە ویساڵی تۆ بگەن.

٣- جە: لە. چەم: شیوی ئاودار. واتە: چنوور لە بەرزایی کێو و وەنەوشە لە چەم و گوڵ لە گوڵستانەوە هاتوون و یەکیان گرتووە.

٤- چەنی هەم: لەگەڵ یەک. ماجەراشانەن: ڕا و تەگبیریانە. سەودا: فکر و خەیاڵ. واتە: هەرسێکیان پێکەوە ڕا و تەگبیریانە و خەیاڵی بە تۆ گەیشتنیان لە سەردایە.

٥- واتشان: وتیان. دەردین: دەردەدار. بەندە: نۆکەر، ڕەنجۆر، بەڵام لێرەدا بە مانای تاکە. فلانی: ☜

وێنــــەی حـــاڵ زانـــان بکـــەرە کـــارێ
بیـــاومێ بـــە وەســـڵ ئـــەو دڵبـــەر جـــارێ[۱]

چــراخ! یـــا هەرســـێم بەســـتەن بـــە دەســـتە
چ دەســـتە؟ دەســـتەی بـــە زگـــار بەســـتە[۲]

هەرســـێم یـــا ئـــاوەرد چـــوون خاکســـاران
هەریـــەک وایـــەی وێ بـــە چـــەم مـــەدٚاران[۳]

---

☜ زیاتر بۆ کەسێکی نەناسراو بە کار دەبرێت بەڵام لێرەدا ئاماژەیە بۆ «خۆی». مانـای ئـەم بەیتـە لەگەڵ بەیتی دوایی دێت.

۱- بکەرە: بکە. بیاومێ: بگەیین. دڵبەر: یار، کەسێک کە دڵی کەسێکی دیکـە ببـات. واتـە: بـە منیان وت ئەی فلانکەس تۆ کە دەردەداری و خۆت ئەم حاڵەت (خەیاڵی ویساڵ) کێشاوە و بە حـاڵی ئێمە دەزانی وێنەی حاڵزانان کارێک بکە کە ئێمە تەنیا بۆ جارێک بگەین بە وەسڵی ئەو دڵبەرە.

۲- یا: ها، ئەوە. هەرسێم: هەر سێ‌یان (چنـوور و وەنەوشـە و گـوڵ). بەسـتەن: بەسـتووە. زگـار: مەلوول، خەمین. واتە: ئەی یار! ئەوە منـیش هەرسێ‌یانم دەسـتە کـرد و بەسـتم، بـەڵام چ دەسـتە کردنێک، دەستەیەک کە بە خەمباری کرابێت. ئەشکرێ ئاوا مانای بکـەین: «دەسـتەیەک کـە بـە دەزووی خەمباری بەسترابێت».

۳- ئاوەرد: هێنام، هاوردم. چوون: وێنەی، وەک. خاکسار: وێنەی خاک، کەوتنە نێو خاک و بەر پێی کەسێک بۆ نیشاندانی بچووکی، ڕۆح سووک. وایە: ئاوات و ئارەزوو. بە چەم مەدٚاران: چاوەڕوانن، بە هیوان. واتە: ئەوە منیش هەرسێ‌یانم هێنا و خۆیان خستە بەر پێت و هەر یەکەیان چاوەڕێی ئـەوەن بە ئاواتی خۆی بگات. لە بەیتە دواییەکاندا ئاواتەکانیان هەڵدەدا.

چنـــوور پـــەی زڵفـــت پەشـــێو حاڵشـــەن
وەنەوشـــە ســـەوداى خـــاڵ خەياڵشـــەن[١]

گـوڵ پـەی جـەمينت مەسـۆچو چـوون شـەم
جـە دووریـت نيشـتەن نـە پـاش خـار خـەم[٢]

ســـاحيب مايـــەنى، بوڵەنـــد بـــۆ پايـــەت
بـــا وايـــە گێـــران هەريـــەک نـــە ســـايەت[٣]

٭٭٭

١- پەی زڵفت: بۆ زوڵفت. واتە: چنوور بۆ زوڵفەکانت حاڵی پەشێوە و دەیەوێت وەک زوڵفی تۆ بێت و وەنەوشەیش فکر و خەیاڵی خاڵی تۆی لەسەردایە و دەیەوێت لە خاڵەکەت بچێت.

٢- جەمین: نێوچاوان، ڕوخسار. مەسۆچۆ: دەسووتێت. نیشتەن: نیشتووە. خار: دڕوو، دڕک. خار خەم: ئیزافەی تەشبیهییە و خەمی شوبهاندووە بە دڕوو. واتە: گوڵیش بۆ ڕوخسارت وەک شەم دەسووتێت و ئەویش دەیەوێت هێندەی ڕۆخساری تۆ جوان بێت و لە دووری تۆ دڕووی خەمی بە پێدا چەقیوە، واتە خەمبارە.

٣- ساحیب مایە: مایەدار، دەوڵەمەند. پایە بوڵەند: پایە بەرز. وایە: ئاوات، ئارەزوو. گێران: بگرن. واتە: تۆ مایەداری و ئەوانەی ئەوان دەیانەوێت بە تۆوە هەیە، پایەت بەرز بێت با هەر یەکەیان بێت لە سایەتدا بگات بە ئاوات و مەرامی خۆی.

«پیرەمێرد» ئەم شێعرەی بە سۆرانی وەرگێڕاوە کە لە سەرەتای کتێبەکەدا لە بەشی «کاریگەری بێسارانی لەسەر شاعێران»دا هێناومانە.

-٣٤-[١]

چـــــراخ! وه یـــــاران، چـــــراخ! وه یـــــاران
ئێمشـــەو جـــە خـــاودا شـــیم وه لای یـــاران[٢]

ئیجـــــازەم ئەســــــتە ئیجـــــازەداران
مولـــەمما بیـــان شـــەو چـــەنی مـــاران[٣]

جفتـــێ کاڵـــەبـــەی هـــا بـــەو دارەوە
دوو شـــامار بەنـــدەن بـــەو چنـــارەوە[٤]

مـــاران و بـــەیان هـــەر مەڵـــەرزانێ
نمـــەز چ ســـێڕەن نمەگـــەزانێ[٥]

---

-٣٤-

١- ک، نێ، ح، ن، س، ب، م، ڕ، ج، عم.

٢- ئێمشەو: ئەمشەو، ئیمشەو. جە خاودا: لە خەودا. شیم: ڕۆیشتم. واتە: ئەی یار! ئەمشەو لە خەودا چووم بۆ لای یاران و سەردانی ئەوانم کرد.

٣- ئیجازەم ئەستە: ئیزنم وەرگرت، ئیجازەم وەرگرت. ئیجازەداران: ئەوانەی ئیزنیان بە دەستە و دەبێ ئیزن بدەن. مولەمما: تێکەڵ بوون، ئاوێتە بوون، هەڵپێچان لەگەڵ. بیان: بووم. چەنی: لەگەڵ. واتە: ئیزنم لە ئیزن داران وەرگرت و شەو لەگەڵ ماران (زوڵفی یار) ئاوێتە بووم.

٤- جفتێ: جووتێک، دوو دانە. کاڵەبەی: بەی یا بەهێی نەگەیشتوو، مەبەست سینەیە. شامار: ماری گەورە. بەندەن: وەستاوە. واتە: جووتێک کاڵەبەی (سینە) وا بە دارەوە (باڵای یار) و دوو شامارێش (پەلکە) بەو چنارەوەیە (باڵای یار).

٥- مەڵەرزانێ: دەلەرینەوە. نمەز: نازانم لەبەر چییە. چ سێڕەن: چ سرێکە، چ بەزمێکە.

تەبارەکـــەڵڵا جـــەی دەســـتە چنـــار
شـــاماران جفتـــێن، مـــارتووڵان هـــەزار[١]

سـوب کـە سـپی بـی جـە خـاو بـیم بێـدار
نـە مـار مەنـدە بـێ، نـە بـەی، نـە چنـار[٢]

دەرێـــغ جـــە خـــاودا شـــامار بگەســـتام
چـــەنی بـــێ بەینـــەت، بەینـــەت نەبەســـتام[٣]

٭٭٭

☜ نمەگەزانێ: ناگەزن، نادەن پێمەوە. واتە: مارەکە و بەیەکە هـەر دەلەرانـەوە بـەڵام نـازانم لەبـەر چییە نامگەزن.

١- تەبارکەڵڵا: تبارک‌الله، خودا پاک و بێ وێنەیە، کاتێک کەسێک دەستکردێکی خـودا دەبینێـت لە جوانی و .... جێی سەر سوڕمانە ئەم وشە دەڵێت. مارتووڵ: توولەمار، ماری باریـک و بچـووک، زۆرجاران ئافرەتان زوڵفیان وەک قەیتان دەگرنەوە و پێیان دەڵێن «پەلکە» ئینجا دوودانە لەو پەلکانە دێننە سەر سینە کە لێرەدا بێساراني ئەوانەی شوبهاندووە بە شامار و ئەوانەی کە دەیخەنە پاشەوە و لە ئەوانەی پێشەوە باریک تر و کۆتاترن شوبهاندوویە بە «توولە مار». واتە: گشت کەس سەری لەم دەستکردەی خودا سڕ دەمێنێت کە بەم چنارەوە شامار دووە و توولەمار هەزار.

٢- سوب: بەیانی زوو، کازیوە. جە خاو بیم بێدار: لە خەو بە خەبەر هاتم، لە خەو هەستام. مەنـدە بێ: مابوو. واتە: کاتێک ڕۆژ بووەوە و لە خەو هەستام نە مار مابوو نە بەی و نە چنـار. مەبەسـتی ئەوەیە کاتێک لە خەو هەستام زانیم خەوم دیوە و ئەو یارە کە شەو لەگەڵم بوو نەمابوو.

٣- درێغ: شەڵڵا، خۆزگە، وشەیەکە کاتێک کەسێک دڵی لـە خـۆی دەمێنێـت دەیڵێـت. بگەسـتام: بیگەستایەم. چەنی بێ بەینەت: لەگەڵ بێ شـەرت، لەگـەڵ بـێ بـەڵێن. نەبەسـتام: نەمبەسـتایە، نەبەستایەم. واتە: خۆزگە لە خەودا ئەو شامارە بیگەستایەم بەو مەرجە لەگەڵ بێ وەفادا ☜

-۳۵-[1]

چراخ! یانێ چێش؟ چراخ! یانێ چێش؟
ئی چەم ئێشانە بە تۆ یانێ چێش؟[2]

دیدەی من خاسەن پەرێ ئێش نێش
ئێش دیدەی تۆ بەیۆ بشۆ جێش[3]

دیدەی من خاسەن پەرێ ئێشیان
پەردەی لێلاویش پێدا کێشیان[4]

---

☜ پەیمانم نەبەستایە. کاک حەکیم بە دوای ئەم بەیتەدا بەیتێکی دیکەی هێناوە کە لە سەرچاوەکانی «س» و «ن»یشدا هەیە. ئەمەیش بەیتەکە:

ئەگەر بێ بەینەت قەبرش پەڕ نوور بۆ    قەبرم جە قەبری بێ بەینەت دوور بۆ

کە بە پێی نوسخەخەتیەکان ئەم بەیتە بەیتی کۆتایی پارچە شێعری «دڵە تۆ بە تیر»ـە و ئێمەیش بە پێی مانای شێعرەکە جێگەکەیمان لەوێدا بە دروست زانی و لەوێدا هێنامان.

-۳۵-

۱- ک، ئێ، ح، ن، س، ب، ل، م، ع، ر، عم، ئا.

۲- یانێ چێش: یانی چی. ئی: ئەم. چەم: چاو. واتە: ئەی یار! ئەم چاو ئێشە چییە تووشی تۆ بووە؟ یانی چی؟

۳- دیدە: چاو «پیتی «ذ» پیتێکی تایبەت بە زمانی هەورامییە و لە نێوان لووت و قورگدا گۆ دەکرێت» (وەرگێڕ). پەرێ: بۆ. نێش: چزە، شتێکی نووک تیژ. بەیۆ: بێت. بشۆ: بڕوات، بچێت. جێش: تێی. واتە: چاوی من بۆ ئەوە خاسە گل بکات و بێشێت و شتی تیژی پێدا بچەقێت، یاخودا ئێشی چاوەکانی تۆ بێت و بچێتە نێو چاوەکانی من. (دەردی چاوەکانی تۆ لە چاوەکانی من).

۴- پەرێ: بۆ. ئێشیان: ئێشان. کێشیان: کێشراوە. واتە: چاوی من بۆ ئەوە خاسە بێشێت و ژان ☜

دیــدەی تــۆ نەیشــۆ پــەڕ بــادە و کەیفــەن
دیــدەی مــن بێشــۆ، کــێ مــاچۆ حەیفــەن؟[١]

باجــەتی ڕەســوول دیــدەی تــۆ نێشــۆ
ئــەخی جــەبرەئیل بــاڵش ســەر کێشــۆ[٢]

***

-٣٦[٣]

چــــراخم! ئامــــان، چــــراخم! ئامــــان
ئامــــان بــــێ مــــروەت، مروەتــــەن ئامــــان[٤]

---

☜ بکات چون پەردەی لێڵایی بە سەردا کێشراوە و هیچ نابینم.

١- نەیشۆ: نەیەشێت، ژان نەکات. پەڕ: پڕ. بێشۆ: بێشێت. ماچۆ: دەڵێت، ئێژێت. واتە: با چاوی تۆ ژان نەکات چونکە بۆ عاشقان بە وێنەی پیاڵەیەکە پڕ لە شەراب و خۆشی و کەیفە کە دەبینن مەستی دەبن و یا چاوت مەستە و پڕ لە خۆشییە، با چاوی من بێشێت و ژان بکات چونکە کەس ناڵێ حەیفە.

٢- باجەتی: کورت کراوەی بە حاجەتی، بە خاتری، لەبەر. ڕەسووڵ: حەزرەتی موحەممەد (س.خ). نێشۆ: نەیەشێت، ژان نەکات، لێرەدا لەبەر سەروای شێعرەکە «نێشۆ»ی هێناوە ئەگینا «نەیشۆ» دروستە. ئەخی: برا. جەبرەئیل: فریشتەی وەحی هێنان. کێشۆ: بکێشێت. واتە: بەڵکوو بە خاتری پێغەمبەر (س.خ) چاوی تۆ ژان نەکات و حەزرەتی جوبرەئیل باڵی بەسەردا بکێشێت و دەرد و ژانی قەرە نەکەوێت.

-٣٦-

٣- ل. ج. وا دیارە بێسارانی ئەم پارچە شێعرەی بۆ «مروەت» ناوێک نووسیوە.

٤- مروەت: پیاوەتی، پێویستە ئاماژە بکەین کە وشەی پیاوەتی تەنیا بۆ پیاو بەکار نایە و زۆر ☜

مـــــروەت! باجــــەتی بارگــــەی ئێمامــــان

بـــا وینـــووت جــەمین شــــای نۆنــەمامان![1]

مەشـــۆ نــــە مەزهـــەب خوداٚنەتەرســـان

بــــۆ بدیـــە وە زام بەنـــدەی وێــت پەرســـان[2]

سەوداٚی کوشتەی مــن بــا بەرشــۆت جــە ســەر

مــروەت! شــەرم جــە نــام شــەریف وێــت کــەر[3]

---

☜ جار بە ئافرەتیش دەڵێن «پیاوەتیت بێ»، وشەی «مروەت» زیاتر لەگەڵ «ڕەحم» دێت و دەڵێن «ڕەحم و مروەت» کە واتە لێرەدا دەتوانین بڵێن دەکرێت بە مانای «ڕەحم»یش هاتبێت. واتە: ئەی یار! ئامان ئەی بێ مروەت، با مروەت و ڕەحمت لەگەڵم بێت.

١- باجەت: کورت کراوەی بە حاجەت، بە خاتری. بارگە: بارەگا، گۆڕ، قەبر. جەمین: ڕوخسار. وینووت: بتبینم. نۆنەمام: نمامی تازە پێ گەیشتوو. واتە: ئەی مروەت! بێ و بە خاتری بارەگای ئیمامان با چاوم بە ڕوخسارت بکەوێت ئەی شای نمامە تازە پێ گەیشتووەکان.

٢- مەشۆ: مەڕۆ، مەچۆ. خوداٚنەتەرسان: ئەوانەی کە لە خودا ناترسن. بۆ: بێ، وەرە. بدیە: سەیربکە، ببینە. بەندەی وێت پەرسان: ئەو بەندەی خۆت دەپەرەستێت. واتە: مەچۆ سەر مەزهەبی ئەوانەی کە لە خودا ناترسن و هیچ ڕەحم و مروەتیان نییە، وەرە سەیری زامی من کە بەندەی خۆتم و خۆت دەپەرەستم بکە.

٣- سەوداٚ: مامەڵە. فکر و خەیاڵێک کە لە سەردایە. بەرشۆ: دەربچێت. شەریف: گەورە و بەرز و نەسەبدار. واتە: با فکری و خەیاڵی کوشتنی من لەسەرت بڕوات. ئەی بێ مروەت! شەرم لە ناوە گەورەکەی خۆت بکە. مەبەستی ئەوەیە کاتێک ناوت مروەتە، دەبێت مروەتت بێت.

نــــه حەیفــــەن ئــــازیز! چـــراخم! مــــروەت!
بـــێ دەردان بــــە تــــۆ واچـــان بـــێ مــــروەت[١]

بەشــــق زڵــــف وێـــت شــــای نۆنــــەمامان
بـــێ مــــروەت مەبــــە، مروەتــــەن ئامــــان[٢]

☆☆☆

-٣٧[٣]-

چـــــراخم! ئامــــــان، چـــــراخم! ئامـــــان
ئامانــــەت فــــەرزەن، ئامــــان ســــەد ئامــــان[٤]

وەســــیەتم ئێــــدەن دەســــتم بــــە دامــــان
بــــەی وە ســــەر گڵکــــۆم ســــەڵو خــــەرامان[٥]

---

١- واچان: بڵێن، بێژن. واتە: نە حەیفە، ئەی مروەت! ئەی یارە ئازیزەکەم! بێدەردان بە تۆ بڵێن بێ مروەت. مەبەستی ئەوەیە ئەگەر بێت و من بکوژیت قەیدی نییە بەڵام بێدەرد و بەتاڵ و بێکار حەیفە پێت بڵێن بێ مروەت.

٢- بەشق: بە عەشق، بە خاتری، لەبەر. زڵف: زوڵف، قژ. وێت: خۆت. واتە: بە خاتری زوڵفەکانی خۆت ئەی پاشای تازە پێ گەیشتووەکان بێ ڕەحم و بێ مروەت مەبە، ئامان با ڕەحم و مروەتت بێت.

-٣٧-

٣- ک، ئێ، ن، ح، س، ب، ل، م، ر، عم.

٤- واتە: ئەی یار! ئامان سەد ئامان بە جێ هێنانی ئەم ئەمانەتە (وەسیەتێک کە لە بەیتە دواییەکاندا ئەیکات) فەرزە و دەبێ بە جێ بێت.

٥- ئێدەن: ئەمەیە. دامان: داوێن. بەی: بێیت. گڵکۆ: گۆڕ، خاکی گۆڕ. سەڵو: گیایەکی ☜

زار زار بگـــــرەوی بــــە گڵکۆمـــــەدا

بــــە قـــەبر تـــازەی تـــاک نۆمـــەدا [١]

ئەســـرین جـــە دیـــدەی خـــەرامان تـــۆ

جـــە ســـەر بتکیـــۆ بگنـــۆم وە گڵکـــۆ [٢]

---

جوانە کە گوڵی زەرد و سوور و وەنەوش دەکات و بە فارسی «تاج خروس» و «زلف عروسان» و بە سۆرانی «گوڵی پۆپە کەڵەشێر»ی پێ دەڵێن. خەرامان: بە لار و لەنجە بە ڕێدا ڕۆیشتن. سەڵو خەرامان: مەبەستی «یارە» کە وەک سەڵو جوانە و بە لار و لەنجە بە ڕێدا دەڕوات. واتە: ئەی یار! وەسیەتم ئەمەیە بێیتە سەر گۆڕەکەم. لە بەیتە دواییەکاندا دەڵێت بێت چی بکا.

١- زارزار: بە ناڵەوە گریان، بەرز گریان. بگرەوی: بگریت. گڵکۆمـەدا: گڵکـۆمدا. نۆمـەدا: نـۆمدا. واتە: بە ناڵە و دەنگی بەرز بە سەر گۆڕەکەمـدا کـە لـە نێـو گۆڕەسـتاندا تاکـە و دیـارە بگـری. لـە سەرچاوەکانی «ح»، «س» ، «ب»، «ن»، «ڕ» و «عـم»دا ئەم بەیتە نییە.

٢- بتکیۆ: بتکێت، بڕژێت. بگنۆ: بکەوێت. واتە: ئەسـرین لـە چـاوە جوانـەکانی تـۆوە بڕژێـت و بکەوێتە سەر خاکی گۆڕەکەم. لە نوسخەی «ل»دا ئەو بەیتانە کە پاش ئـەم بەیتـە هـاتوون لەگـەڵ نوسخەکانی دیکەدا تەواو جیاوازن و سەرجەمی شێعرەکە بەم جۆرە هاتووە:

چـــــراخم! ئامـــــان، چـــــراخم! ئامـــــان ئامانـــەت فـــەرزەن ئامـــان ســـەد ئامـــان

وەســـــیەتم ئێـــــدەن ســـــەوڵ خـــــەرامان بـــەی وە ســـەر گڵکـــۆم، دەســـتم وە دامـــان

زار زار بگـــــــرەوە وە گڵکۆمـــــــــەدا وە قـــــەبر تاریـــــک تـــــازەی نۆمـــــەدا

ئەســـرین جـــە دیـــدەی نەونـــەمام نـــۆم بتکیـــــۆ وە بـــــان مـــــەزار گڵکـــــۆم

ئەرســـەد نـــە ســـەرای ئەلحـــەد مـــێمانم بـــەڵ زەڕێ جـــەو ئەســـر بگنـــۆ وە گیـــانم

ئێنشائەڵڵا ئەو ئەسـر چـوون ئـاب حـەیوان دیســان مەبەخشــۆ وە جەســتەی مــن گیــان

بە لای منەوە دەتوانێت وەکوو شێعرێکی جیـاواز بنووسـرێت بـەڵام لەبـەر ئـەوەی لـە نوسـخەکانی دیکەدا نییە و لە لایەکی دیکەوە چوار بەیتی سەرەتای لەگەڵ ئەم پارچە شێعرەدا هاوبەشـن لێـرەدا نووسیم.

ئەر خەڵکان پەرسان لەیلێ چێش بیەن؟
واچە هەی مەردوم زۆر وەنەم شیەن[١]

ئینە غولامێن بە تازە مەردەن
داخ دیدەی من وە گڵکۆش بەردەن[٢]

ئیسە ها نە ژێر تەختەپۆش سەنگ
نە قەبر تاریک بێ دوا و بێ دەنگ[٣]

---

١- ئەر: ئەگەر. خەڵکان: کۆی «خەڵک»ـە. پەرسان: پرسیان، پرسیاریان کرد. چێش بیەن: چی بووە، چی ڕوویداوە. واچە: بڵێ، بێژە. زۆر وەنەم شیەن: زوڵمم لێ کراوە. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن. لە نوسخەکانی «ک»، «ئێ» و «عم»دا ئەم بەیتە بەم شێوە هاتووە:

خەڵکان بپەرسان ئینە چێش بیەن     هەی موسەڵمانان زۆر وەنەم شیەن

و لە نوسخەی «م»دا بە جێی «واچە هەی مەردووم»، «واچە هامسەران» نووسراوە.

٢- ئینە: ئەمە. مەردەن: مردووە. بەردەن: بردووە. واتە: ئەگەر خەڵک پرسیاریان کرد چی بووە و لەبەر چی دەگریت؟ بڵێ هەی خەڵکە! زوڵمم لێ کراوە، ئەمە غولامێکمە بە تازەیی مردووە و داخی دیدەی منی یا داخی چاو پێ کەوتنی منی بردۆتە ژێر خاک.

٣- تەختە پۆش: وەکوو تەختەبەنی ماڵ و خانوو بە تەختە پۆشرابێت، کاتێک کەسێک بە خاک دەسپێرن سەری گۆڕەکەی بە بەرد تەختەپۆش دەکەن و لێرەدا مەبەستی لە «تەختە پۆش سەنگ» ئەوەیە. سەنگ: بەرد، تەوەن. نە: لە (فارسی: دَر). بێ دوا: بێ قسە کردن. واتە: ئێستە وا لەم ژێرەدا کە بە بەرد تەختەپۆش کراوە و وا لە نێو ئەم گۆڕە تاریکەدا بێ قسە و بێ دەنگە.

وە دەرگـــــای فەڵـــــەک زار زار بناڵـــــە
دوو گیســـووی سـیات نــە ڕووی خــاک ماڵــە[١]

واچــــە خوداوەنــــد ویـــــاری گونـــــاش
چـــوون مـــن جـــەی دنیـــا فـــرێم دان ســـزاش[٢]

☆☆☆

-٣٨-[٣]

چــــــراخم! ئامــــــان، چــــــراخم! ئامــــــان
چـــوون عـــەرەب دەخیـــل، مروەتـــەن ئامـــان[٤]

---

١- گیسوو: پەلکە. سیا: ڕەش. ماڵە: بماڵە. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٢- واچە: بڵێ. ویاری: ببوری. گوناش: گوناحی، گوناهی، تاوانی. جەی دنیا: لەم دنیـا. فـرێم دان: زۆرم داوە. واتە: دوو پەلکەکەت بێنە سەر گۆڕەکەم و بە دەنگی بەرز لە دەرگانەی خـودا بلاڵێڵـەوە و بڵێ خودایە لە تاوانەکانی خۆش ببە و ببیەخشە چونکە من لەم دنیادا زۆرم سزا داوە. لە نوسـخەی «ک»دا بە جێی «واچە خوداوەند»، «یا ئەڵڵا جەو دنیا» نووسراوە.

-٣٨-

٣- ک، ئێ، ن، م، ب، س، ح، ڕ، عم.

٤- چراخ: یار، نازیز، خۆشەویست. ئامان: پەنا خواستن، کاتێک دەوترێـت کەسـێک بیـەوێت پـەنا بخوازێت یا داوای لێبوردن بکات. چوون: وێنەی، وەکوو. دەخیل: پەنا خواستن بە زمـانی عـەرەبی. مروەتەن: ڕەحمەت بێت، پیاوەتیت بێت. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

ئــەر چێــوێم واتــەن جــە تــاو زامــان
ونــەت ســەخت نــەیۆ بەشــق ئێمامــان[١]

ئەگــەر کوشــتەنیم، بەنــدم خــەلاس کــەر
وەرنـــە دەروونـــم وەس بـــە پـــەڵاس کـــەر[٢]

تــۆ مەکوشــەم بــە تــێخ دیــارەن بــرین
سـا ماچـان خواجـە، غـوڵام کوشـت جـە قـین[٣]

---

١- ئەر: ئەگەر. چێوێم: شتێکم. واتەن: وتووە. وەنەت سەخت نەیۆ: پێت سەخەت نەبێت، لات گران نەبێت. بەشق: بە عەشق، بە خاتری. واتە: ئەی یار! وەک عەرەب دەڵێت دەخیل، ئامان ئەگەر من لە تاوی سەختی زامەکانم شتێکم وت بیکە بە خاتری ئیمامان پێت گران نەبێت و ڕەحمت بێت و لێم ببورە.

٢- کوشتەنیم: بۆ کوژرانم. بەند: تەنافی مل. وەرنە: ئەگینا، ئەینا. وەس: بەس. پەڵاس: قوماشێکی ڕەش کە لە مووی بزن دروست دەکرێت و دەواری هەوارنشینیانی پێ هەڵدەدەن. بە مانای قوماشی دڕاو و کون کونیش دێت. واتە: ئەگەر هی کوشتنم و دەتەوێت بمکوژیت بێ بمکوژە با ئیتر ئەم تەنافەم لە ملدا نەمێنێت، ئەگینا بەس دەروونم بکە بە پەڵاس و ڕەش و کون کونی بکە.

٣- مەکوشەم: مەمکوژە. دیارەن: دیارە، ئاشکرایە، مەعلوومە. برین: زام، ئەڵبەت دەتوانێت بە مانای «بڕین»یش بێت. ماچان: دەڵێن، ئێژن. خواجە: ئاغە، گەورە، ساحێب، سەروەر، پیاوی گەورە و دەوڵەمەند. غوڵام: نۆکەر، ڕەنجبەر. واتە: تۆ بە تێخ مەمکوژە چونکە جێگەکەی دیارە و دەڵێن ئاغەکە غوڵامەکەی لە قیندا کوشت.

تـــایێ زڵـــف دێـــز وزەم نـــە گـــەردەن
تـــا واچـــان بـــە مـــەرگ موفاجـــات مـــەردەن[١]

☆☆☆

-٣٩-[٢]

چـــراخم! ئێشـــان، چـــراخم! ئێشـــان
یـــە جـــە حـــەرف کـــێ خـــاترت ئێشـــان؟[٣]

کڵافـــەی زڵفـــت کـــەردەن پەرێشـــان
مـــن وە فیـــدات بـــام چـــەنی گـــرد خوێشـــان[٤]

قیبلـــەم! گیـــان وێـــم وە ســـەرگەردت بـــۆ
قـــەومم وە قوربـــان قـــەوم فـــەردت بـــۆ[٥]

---

١- تایێ: تاڵێک. دێز: ڕەش. وزە: بخە. گەردەن: مـل. واچـان: بڵـێن، بێـژن. موفاجـات: کوتـووپڕ سەندن. مەردەن: مردووە. واتە: تاڵێک لە زوڵفە ڕەشەکانت بخە ملم و بەو شـێوە گیـانم بکێشـە بـا خەڵک بڵێن لە ناکاو و کوتووپڕ مردووە و کەس نەیکوشتووە.

-٣٩-

٢- عم ج.

٣- یە: ئەمە. جە: لە. حەرف: قسە. واتە: ئەی یار! ئەمە لەبەر قسەی کێیە وەها عاجز بووی؟

٤- کڵافە: پێچراو، بەستراو، پەلکە. فیدات بام: بە قوربانت بم. چەنی: لەگـەڵ. خوێشـان: خزمـان. واتە: لەبەر قسەی کێ پەلکەی زوڵفەکانت کردووەتەوە و پەرێشانت کردووە، خوا بکات من و هـەموو خزمانم بە قوربانت بین.

٥- وێم: خۆم. بۆ: بێت. فەرد: تاک، لێرەدا بە مانای بێ وێنەیە. واتە: ئەی قیبلەم! بەڵکوو ☜

پەی چێش گۆش وە حەرف بەڎان مەڎەری؟
دەستەی زڵف وێت پەشێو مەکەری[1]

ئەوکەس کە خاتر تۆ چەنەش ئێشان
شەڵڵا مێڵ سەرد نە دیدەش کێشان[2]

-٤٠[3]-

چراخم! بە چەم، چراخم! بە چەم
بەینەت دووری بڎارە بە چەم[4]

---

☜ گیانی خۆم بە قوربانت بێت و خزمەکانیشم بە قوربانی خزمە بێ وێنەکانت بن.

١- پەی چێش: بۆچی. گۆش: گوێ، گوێچکە. بەڎان: خراوان، خراپان. مەڎەری: دەدەی. مەکەری: دەکەی. واتە: بۆچی گوێ بە قسەی خراپان دەدی و دەستەی زوڵفەکانت دەشێوێنی و پەرێشانیان دەکەی؟

٢- چەنەش: لێی. شەڵڵا: ئیشەڵڵا، بەشکەم، بەڵکوو. مێڵ سەرد: ئەو کات ئەگەر بیانویستایە کەسێک کوێر بکەن مێڵەیەکیان گەرم دەکرد و بەو مێڵە کوێریان دەکرد و بەو کاریان دەیان وت مێڵ کێشان، ئینجا مێڵ کێشان بە مێڵی گەرم زۆر سەخت و ئەستەم نەبووە چون لەبەر گەرمی مێڵەکە چاوی زوو سووتاندووە و خوێنی زۆری لێ نەهاتووە بەڵام بە مێڵی سەرد زۆر سەختە چون زامەکەی دێر خۆش دەبێتەوە. کێشان: بکێشن. واتە: بەشکەم ئەو کەسەی تۆی عاجز کردووە و خاترت لێی ئێشاوە بە مێڵی سەرد کوێری بکەن.

-٤٠-

٣- ک، ئێ، ن، س، ح، ب، ر، ئا، عم، ع.

٤- چەم: چاو. بەینەت: شەرت و وەفا و بەین. بەینەت دووری: کاتێک دوو دڵدار لە یەک ☜

ئـــەو ڕۆ بینـــایی دیـــڎەم بیـــەن کـــەم
فەڵـەک جیـا کـەرد مـن و تـۆ جـە هـەم[١]

نـــەبا خـــاترت جـــێم بگێـــرۆ گـــەرد
جـــە دوور وەتـــەنیم مـــەیلت ببـــۆ سـەرد[٢]

هــــەر پاســـە بیـــەن شـــەرت دڵـــداران
بەینــــەت دووری بـــە چـــەم مـــەڎاران[٣]

---

☜ دوور دەکەونەوە ئەو وەفا و بەینە کە پێشتر لـە نێوانیانـدا بـووە هـەر دەمێنـێ و بەمـە دەڵـێن بەینەت دووری. بڎارە بە چەم: چاوەڕێ بە، بە هیوا بە. واتە: ئەی یار! من ئەو شـەرت و بەینـە کـە پێشتر لەگەڵ تۆ بوومە ئێستەیش کە دوور کەوتوومەتەوە و لە تـۆ دوورم هـەر مـاوە و تـۆیش لـە دوورەوە چاوەڕێی ئەو شەرت و بەینە بە و مەیلت کەم مەکەوە.

١- ئەو ڕۆ: ئەو ڕۆژە، لەو ڕۆژەوە. بیەن: بووە. واتە: ئەو ڕۆژە بینایی چاوانم کەم بوەوە کە فەلەک من و تۆی لە یەک دابڕان و جودای کردینەوە.

٢- نەبا: باکوو وەها نەبێت. جێم: لە من. بگێرۆ: بگرێت. گەرد: تۆز. ببۆ: ببێت. واتـە: چـۆن جـام کاتێک تۆزی لێ نیشت چیتر هیچێکی تێدا نابینرێت، وەها نەبێ کە خاتری تۆیش تۆز بگرێت چیتر منت لە بیر نەمێنێت و وەها نەبێت چون من دوورە وەتەنم و نزیکت نیم مەیلت سەرد بێتەوە و ئیتر مەیلی منت لا نەمێنێت.

٣- پاسە: وەها. بیەن: بووە. بە چەم مەڎاران: چاوەڕێی دەکەن. واتە: شەرت و وەفـای دڵـداران هـەر وەها بووە کاتێک لێک دابڕاون وەفا و بەینیان کەم نەبووە و لە دوورەوە بە هیوای یەک بوون.

مــن ئــەرچی غــەریب دوور جــە زامــەنــم
هــێمای ئــەو غــوڵام دەســت وە دامــەنــم[١]

کەســێ کــە ئاهــەنگ ڕەســم یاریشــەن
جــە دوور وەتــەنان کــەی بێزاریشــەن؟[٢]

***

-٤١-[٣]

چــراخم! بــە چــەم، چــراخم! بــە چــەم
بەینــــەت دووری بــــڕاره بــــە چــــەم[٤]

---

١- ئەرچی: ئەگەرچی. زامەن: وەتەن، زێد، وڵات. هـێما: هێشـتا. واتـە: ئەگـەرچی مـن غـەریب کەوتووم و دوورە وەتەنم بەڵام هێشتا هەر ئەو غوڵامەم کە دەست بە دامەنم و لە تۆ دەلالەمەوە.
٢- ئاهەنگ: قەست و نیەت. یار: دڵدار. واتە: کەسێک کە قەست و نیەتی ڕێگە و ڕەسمی دڵداری بێت کەی دوورە وەتەنی و دوورە یاری گرینگی هەیە بۆی و کەی لەو یارە کە لێی دوورە بێزار دەبێت ؟
ئەم بەیتە لە سەرچاوەکانی «ح»، «س»، «ن»، «ب»، «ڕ» و «عم»دا نییە.

-٤١-

٣- ک

٤- چەم: چاو. بەینەت دووری: کاتێک دوو دڵدار لە یـەک دوور دەکەونـەوە ئـەو وەفـا و بەینـە کـە پێشتر لە نێوانیاندا بووە هەر دەمێنێ و بەمە دەڵێن بەینەت دووری. بڕاره بە چەم: چاوەڕوان بە، بـە هیوا بە، بە تەما بە. واتە: ئەی یارا من ئەو شەرت و بەینە کە پێشتر لەگەڵ تۆم هەبووە ئێستەیش کە دوور کەوتوومەتەوە و لە لای تۆ نیم هەر ماوە و تۆیش لە دوورەوە چاوەڕێی ئـەو شـەرت و وەفـا و بەینە بە و مەیلت کەم مەکە.

مـــەر دۆســـتێو هـــەنی یاونـــای وە هـــەم؟
یـــە خـــەیلێ وەختـــەن مـــەیلت بیـــەن کـــەم[۱]

ســـــەبرت بکـــــەردا دۆســــــتت بمــــــەردا
ئەوســــە فکـــر دۆســـت تـــازەت بکـــەردا[۲]

دۆســـــتت بمـــــەردا ببیـــــای ســــــەرگەردان
بـــــڎای بـــــە ســــــەردا بشـــــیای وە هـــــەردان[۳]

***

۱- مەر: مەگەر. هەنی: تر، دیکە. دۆستێو هەنی: دۆستێکی تر، دۆستێکی دیکە. یاونای: گیاندی. یە: ئەمە. خەیلێ: زۆر، فرە. بیەن: بووە. واتە: مەگەر لە دووری و نەبوونی من دۆستێکی دیکەت پەیدا کردووە کە لە مێژە مەیلت کەم بووە؟

۲- بکەردا: بکردایە. بمەردا: بمردایە. ئەوسە: ئەو کات، پاش ئەوە. واتە: سەبرت بکردایە تا دۆستەکەت - کە من بم - بمردایە پاشان بیری گرتنی دۆستی نوێت بکردایە.

۳- ببیای: ببوایەی، ببووتایە. سەرگەردان: سەر لێ شێواو. بڎای: بتدایە. بشیای: بڕۆشتایەی، بچووتایەی. هەرد: کەش و کۆ. واتە: با دۆستەکەت (من) بمردایە و سەرت لێ شێوابا و بەسەرتدا بدایە و بڕۆشتایەی بە کەش و کۆدا. وا دیارە ئەم پارچە شێعرە ناتەواوە بەڵام بەداخەوە لەو نوسخەدا هەر ئەوە نووسراوە و لە سەرچاوەکانی دیکەیشدا نەبوو.

-٤٢[١]-

چــراخم! بــه چــین، چــراخم! بــه چــین
ئــەر چــین زلّفــت بــدّەو بــه مــاچین[٢]

ئــەر یــەکتا چینــت بــدّەو بــه گــرد چــین
کــافر بــوو ئــازیز، بــەری بــوو جــه دیــن[٣]

ئــەر قــەوس ئــەبرۆت بــدّەو بــه حیّجــاز
ئــەر مــوژەی دیــدّەت بــدّەو بــه شــیراز[٤]

---

-٤٢-

١- ح، ب، س، ن، ل. به بڕوای من شێعری بێسارانی نییه و ڕەنگ و بـۆی شـێعری بێسـارانی نـادات بەڵام لەبەر ئەوەی لەو سەرچاوانەدا هاتووه منیش لێرەدا نووسیمەوه.

٢- چین: چینی زوڵف، وڵاتی چین. ئەر: ئەگەر. بدّەو: بـدەم. مـاچین: چینـی گـەورە، پێشـتر بـه تورکستانیان وتووه چین و به چینی ئێستایان وتووه ماچین. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوه دێن.

٣- یەکتا: بێ وێنه، یەک تاڵ تاڵێک. چین: چینی زوڵفان. گرد: هەموو. کافربوو: کافربم. جه دین: له دین. واته: ئەگەر تاڵێک له زوڵفەکانت بدەم به وڵاتی چین (چینی ئێستا) و ئەگـەر چینـی بـێ وێنەی زوڵفەکانت بدەم به هەموو چین یا خودا کافر و له دین بەری بم.

٤- ئەر: ئەگەر. قەوس: کەمان. حیّجاز: به بەشێکی عەرەبستان دەڵـێن کـه مەککـه و مەدینـەی تێدا هەڵکەوتووه. موژە: مژۆڵ برژانگ. شیراز: ناوی شارێکی ئێران. واته: ئەگەر ئەبرۆی کەمانیت و مژۆڵی چاوت به شیراز بدەم.....

ئـــەر بـــەینت بـــدەو بـــە خـــەتا و خوتـــەن
ئـــەر ڕێـــزەی ڕازت بـــدەو بـــە ئەرمـــەن[۱]

ئـــەر لـــەب لاڵـــت بـــدەو بـــە کەشـــمیر
ئـــەر بـــدەو بـــە هێنـــد سێلسـێلەی زەنجیـــر[۲]

ئـــەر ســـیب زەنـــەخ گوڵخونچـــەی دەهـــان
بـــدەوش بـــە یەکســـەر تـــەمام جـــەهان[۳]

ئـــەر پـــا و پـــووزت بـــدەو بـــە گەنجـــە
ئـــەر بـدەو بـە مێـــسر ئـەو دەسـت و پەنجـە[٤]

---

١- بەین: شەرت و وەفا. خەتا: بەشێکی وڵاتی چین کە پێی دەڵێن چینی باکووری. خوتـەن: چینـی ڕۆژهەڵات کە بە تورکستانی چین ناو دەبرێت، مەبەست لە خەتا و خوتەن چینی باکوور و تورکستانی ڕۆژهەڵاتە. ڕێزەی ڕاز: وردە قسە. ئەرمەن: وڵاتی ئەرمەنستان کە نێوانی ئازەربایجان و قەفقازدایە و وەها وتراوە کە «شیرین»ی خۆشەویستی فەرهاد خەڵکی ئەوێ بووە. واتە: ئەگەر شەرت و وەفای تۆ بدەم بە خەتا و خوتەن و ئەگەر وردە قسەکەت بدەم بە وڵاتی «ئەرمەنستان».....

٢- لـەب: لێـو، لـچ. لاڵ: لـەعل، نـاوی بـەردێکی بـەنرخی سـووری کاڵـە. کەشـمیر: ناوچەیـەکی هێندووستان کە لە نێوانی هێند و پاکستاندایە. سێلسێلەی زەنجیر: مەبەسـت زوڵفـی یـارە. واتـە: ئەگەر لێوی سوورت بدەم بە وڵاتی کەشمیر و ئەگەر زوڵفەکانت بدەم بە هێند....

٣- سیب: سێو، ساو. زەنەخ: چەنە، چەناکە. گوڵخونچە: خونچەی گوڵ. دەهان: دەم. واتـە: ئەگـەر چەناکەی وەک سێوت و دەمی وەک خونچەی گوڵت بدەم بە تەواوی دنیا....

٤- گەنجە: شاری گەنجە کە شارێکە لە وڵاتی ئازەربایجان. مێسر: وڵاتی میسر. واتە: ئەگەر پـا و پووزت بدەم بە شاری گەنجە و ئەگەر دەست و پەنجەی نەرمت بدەم بە وڵاتی میسر....

ئـــەر بـــەژن بـــاڵات بـــدەو بـــە ئێـــران
سـەد هـــەزار کـــەڕەت یانـــەم بـــۆ وێـــران[1]

سەراسـەر عـــومرم گـــرد شـــۆ بـــە تـــاڵان
جاگـــەم نـــە بـــەڕ بـــۆ نـــە پـــای ئـــەوداڵان[2]

پـــەی چـــێش؟ جـــە لای مـــن بـــاڵا زەڕســـتوون
تـــەنیا تـــۆ هـــەنی نـــە ڕووی دنیـــای دوون[3]

***

---

١- بەژن: قەد و باڵا. یانەم بۆ وێران: ماڵم وێران بێت. واتە: ئەگەر بەژن و باڵات بدەم بە ئێران یا خودا سەد هەزار جار ماڵم وێران بێت.

٢- گرد: هەموو. شۆ: بڕوات. جاگەم: جێگەم. بەڕ: دەشتی بێ ئاو، وشکانی. ئەوداڵان: عەبداڵان، کۆی وشەی «عەبداڵ»ـە بە مانای ئەولیا و خاسی خودایە کە حەوت یا حەفتا کەسن و دایم بە سەر زەمینەوەن و کەم نابنەوە و ئەگەر کەسێکیان لێ بمرێت کەسێکی دیکەی جێگەی دەگرێتەوە، هەروەها ناوی کێوێکە لە هەوراماندا کە دەکەوێتە پشتی دێی دەرەکی، ناوی شوێنێکە لە کۆساڵان کە «حەوت ئەوداڵان»ی پێ دەڵێن. واتە: ئەگەر بێت و وەها بێت و خودا بکات هەموو عومرم بە تاڵان بڕوات و جێگە و مەکانم کەژێکی بێ ئاو بێت لە خواری کێوی عەوداڵانەوە.

٣- زەڕستوون: کۆڵەکەی زێڕ. پەی چێش: بۆچی. هەنی: هەی، هەیت. دوون: بێ بایەخ، بێ ئەرزش. واتە: بۆچی؟ لەبەر ئەوە کە بە لای منەوە ئەی ئەو یارەی کە باڵات وێنەی کۆڵەکەی زێڕە، لەسەر ئەم دنیا بێ بایەخەدا تەنیا تۆم هەیت.

-٤٣[١]-

چـــراخم! بەختـــەن، چـــراخم! بەختـــەن
بـــە وێـــم مـــەزانوو بەدبـــەختیم بەختـــەن[٢]

جـــە دووری دینـــت زامـــەتم ســـەختەن
مـــەزانوو ئـــەحواڵ مـــەردەنیم وەختـــەن[٣]

ئـــەڵماس مـــوژەت وە دڵ کـــار کـــەردەن
بـــە ســـەد حـــەکیمان دەوا نەبـــەردەن[٤]

زامـــەت دووریـــت نـــە دڵ کـــەردەن کـــار
ســـەوا جـــە مـــەردەن کـــەس نەبـــەردەن چـــار[٥]

-٤٣-

١- ک، ئێ، م، ن، س، ح، ب، ر، عم، ی.

٢- وێم: خۆم. مەزانوو: دەزانم. واتە: ئـەی یـار! مـن خـۆم دەزانـم بەدبـەختی بەختمـە یـا بـەختم بەدبەختە.

٣- جە: لە. دین: دیتن، چاوپێکەوتن. زامەت: زام، برین، زەخم. سەختەن: سەختە، ئەستەمە. مەزانوو: دەزانم. مەردەنیم: مردنم. وەختەن: وەختە، کاتیە. واتە: لە دووری دیتنی تۆ زامم سەختە و خۆیشم بە ئەحواڵی خۆم دەزانم کە کاتێ مردنم هاتووە.

٤- موژە: مـژۆڵ، برژانگ. کەردەن: کـردووە. دەوا نەبـەردەن: دەوا نـەکراوە. واتـە: مژۆڵـی تـۆ وەک ئەڵماس دەروونمی توێ توێ کردووە و ئەگەر سەد حەکیمیش بێت ناتوانن دەوا و دەرمانی بکەن.

٥- زامەت: زام، برین، زەخم. نە دڵ: لە دڵدا. کەردەن کار: کاری کردووە. سەوا: جگە، بێجگە. نەبەردەن: نەبردووە. واتە: زامی دووری تۆ بە جۆرێک لە دڵمدا کاری کردووە کە بێجگە لە مردن ☜

شـــــيم وه لای حـــــەكيم ببـــــەرۆ دەوام
دەرد بـــێ بـــرین، هێجـــران ســـەرەنجام[١]

واتـــم هـــەی حـــەكيم هانـــا هـــەی هانـــا
ببـــــــەرەم دەوا حـــــــەكيم دانـــــــا[٢]

حـــەكيم وات فـــەقير زامـــت بـــێ چـــارەن
دەردت دەردێـــــــــوەن دەوا نـــــــــەدارەن[٣]

زام دووريـنـــــان وەنـــــەت جـــا كـــــەردەن
دەوايیـــت نيـــەن ئـــيللا كـــە مـــەردەن[٤]

---

☜ هیچ کەس ڕێگەی بە چارەکردنی نەبردووە.

١- شیم: ڕۆیشتم، چووم. ببەرۆ دەوام: دەرمانم بکات، دەرمانم پێ نیشان بدات. بێ برین: بێ زام، دەردێک کە زامەکەی نەبینرێت، مەبەستی ئەوەیە زامێکی لە دڵدایە کە زامەکەی دیار نییە و ئێشیشی هەیە. هێجران: دووری. سەرەنجام: عاقیبەت. واتە: چوومە لای حەکیم کە ئەم دەردەم کە زام و برینەکەی دیار نییە و لە دووری تووشم بووە دەرمان بکات.

٢- واتم: وتم. هانا: هانا بردن، پەنا بردن، بگە دادم، فریام بکەوە. ببەرە دەوام: دەرمانم بکە، دەوام بکە. دانا: زانا، لێزان. واتە: وتم ئەی حەکیمی زانا پەنات بۆ دێنم بە فریام بگە و ئەم دەردم دەرمان بکە.

٣- وات: وتی. فەقیر: بەسەزمان. بێ چارەن: بێ دەرمانە، چارە ناکرێت. دەردێوەن: دەردێکە. دەوا نەدارەن: بێ دەرمانە. واتە: حەکیم وتی ئەی بەسەزمان زامت چارە ناکرێت و دەردت دەردێکە دەوا و دەرمانی نییە.

٤- دووریـنان: ئەوانە کە دوورن. وەنەت: لێت، لە تۆ. جا کەردەن: جێگەی کردوەتەوە. نیەن: ☜

سـا زانـام حـەكيم دەواش نەبـەردا

دەسـێو خـوڵ، يـۆ خـاك، كـەردم بـە سـەردا[١]

هـەر دام بـە سـەردا پـەرێ جەسـتەی وێـم

دەرد بـێ بـرين جـێ نەڕەسـتەی وێـم[٢]

هـەر دام بـە سـەردا پـەی زام سـەختم

پـەی سـتارەی شـووم بەدبـەختى بـەختم[٣]

سـا كـە مـن حـەكيم نەبـەردەش دەوام

مـەر ئەجـەڵ بـەيۆ بـاوەرۆ شـەفام[٤]

☆☆☆

---

☜ نييە. ئيللا: مەگەر. مەردەن: مردن. واتە: زامى ئەو دڵبەرانە كە لێت دوورن كارى تێت كردووە و جێگەی كردوەتەوە و دەرمانت نييە مەگەر بە مردن ڕزگارت بێت.

١- نەبەردا: نەكرد، دەرمانى نەكرد. واتە: كە زانيم حەكيم دەرمانى منى پێ نييە بە دەستێكم خاك و بە ئەو دەستەكەی ديكەم خۆڵم كرد بە سەرمدا.

٢- پەرێ: بۆ. جەستە: لاشە. وێم: خۆم. جێ نەڕەستە: لێى نەبڕاو. واتە: بۆ لەشى خۆم و ئەو دەردە بێ زامەی كە لێى ڕزگار نەبووم و دەرمان نەكرا هەر دام بە سەرمدا.

٣- ستارە: ئەستێرە، هەسارە. شووم: نەحس، نەگبەت. واتە: بۆ ئەم زامە سەختەم و بۆ ئەستێرەی نەگبەتى بەختى بەدبەختم هەر دام بە سەرى خۆمدا.

٤- نەبەردش دەوام: دەرمانمى نەكرد، منى دەرمان نەكرد. مەر: مەگەر. بەيۆ: بێت، بێتەوە. باوەرۆ: بێنێ، بهێنێ. واتە: دەسا كاتێك حەكيم نەيتوانى زامى من دەرمان بكات ئيتر مەگەر ئەجەل بێت و شەفام بدات. مەبەستى ئەوەيە دەرمانى من مەرگە و تەنيا مردن دەتوانێت ڕزگارم بكات.

-٤٤[١]-

چــــراخم! بــــه وێــــم، چــــراخم! بــــه وێــــم
ئێمشـــەو دۆزەخ دیـــم مـــن بـــە دیـــدەی وێـــم[٢]

بڵێســـەی پـــەڕ دوود بـــە گـــڕ خێـــزا جـــێم
عـــەزاب ڕۆی حەشـــر قیامـــەت دا پـــێم[٣]

قرچـــەی ئوســـتخوان، کـــزەی دەروونـــم
بـــۆی کـــەباب جـــەرگ، جۆشـــیای هـــوونم[٤]

ئاڵـــەم گشـــت تـــەمام جـــێش ئامـــا وە تـــەنگ
لـــوان بـــە ســـارا فەرســـەنگ بـــە فەرســـەنگ[٥]

---

-٤٤-

١- ک، ئێ، س، م، ن، ب، ل، ئا، ڕ، عم، بر، ح.

٢- وێم: خۆم. ئێمشەو: ئەمشەو، ئیمشەو. دۆزەخ: جەهەننەم. دیم: دیتم، بینیم. دیدە: چاو. واتە: ئەی یارا من ئەمشەو دۆزەخم بە چاوی خۆم بینی.

٣- بڵێسە: گڕ. پەڕ: پڕ. دوود: دووکەڵ. جێم: لێم، لە من. ڕۆی: ڕۆژی. واتە: بڵێسەیەکی پڕ دووکەڵ بە گڕەوە لە من هەستا و عەزابی ڕۆژی حەشری نیشان دام.

٤- ئوستخوان: پێشە. جۆشیا: جۆش خواردن، کوڵان. هوون: خوێن. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٥- ئاڵەم: عالەم، هەموو دنیا، گیتی. گشت: هەموو. جێش: لێی، لە ئەو. ئاما: هات. لوان: ڕۆیشتووە. سارا: سەحرا، لێرەدا مەبەست کەش و کۆی دەرەوەی دێیە. فەرسەنگ: یەکەی پێوانەی ڕێگە بووە کە پێشتر بە کاریان بردووە و بەرانبەری شەش هەزار و دووسەد و چل میترە. واتە: ☜

بــەو حاڵــە مــن بــیم ئێمشــەو تــا بــە ڕۆ
هـــەر بـــەدْواز خـــاڵ دەور دیـــدەت بـــۆ[1]

فیـــدای بـــاڵات بـــام زڵـــف بـــۆ عەنبـــەرین
لـــەیل ســـایەدار، زڵـــف و خـــاڵ شـــیرین[2]

ئـــەو دۆزەخ چێشـــەن عـــەزابش جـــە کـــۆن
دۆزەخ هـــــەر دۆزەخ دووری بـــــاڵای تـــــۆن[3]

***

---

☜ هەموو دنیا لە قرچەی برژانی پێشەم و کزەی دەروونم و بۆی کەبابی جەرگم و جۆشینی خوێنم بە زاڵە هات و ئەو قرچە و کزە و بۆی کەبابە فەرسەنگ بە فەرسەنگ ڕۆیشت و کەش و کۆی گرتەبەر.

۱- بیم: بووم. ڕۆ: ڕۆژ. بەدْواز: خراپە ویست، کەسێک کە خراپەی کەسێکی بوێت، بەدخواز. بۆ: بێ، بێت. واتە: بەو حاڵەوە کە من ئەمشەو تا بەیانی بووم خوا بکات هیچ کەس ئەو حاڵەی نەبێت و هەر ئەو کەسە ئەو حاڵەی بێت کە بەدخوازی خاڵی دەوری چاوی تۆیە.

۲- فیدای باڵات بام: بە قوربانی باڵات بم. زڵف: زوڵف، کەزیە، قژ، پرچ. عەنبەر: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆشە کە بۆ دروست کردنی عەتر بە کار دەبرێت و ڕەنگێکی نزیک بە ڕەشی هەیە. سایە: سێبەر. سایەدار: هەر شتێک سێبەری هەبێت، ئەو کات زیاتر بۆ بوت بە کار براوە. واتە: لەیلا گیان! من بە قوربانی باڵای تۆ بم کە وێنەی عەنبەر بۆنخۆشە و بە وێنەی بوت سێبەرت هەیە زوڵف و خاڵت جوان و شیرینە.

۳- چێشەن: چییە. واتە: ئەو دۆزەخە چییە و عەزابی لە کوێ بوو (عەزابی نییە). دۆزەخی ڕاستەقینە دووری لە باڵای تۆیە. مەولەوی ئەم بەیتەی بێسارانی زۆر بە جوانی تێهەڵکێش کردووە و ئەمەیش شێعرەکەی مەولەوی: ☞

-٤٥-[١]

چــــراخم! بـــــەیان، چـــــراخم! بـــــەیان
کـــاتێ مـــەخێزی جـــە وەخـــت بـــەیان[٢]

دەســــــتم دامانـــــت بنمانـــــە بـــــەیان
تـــا دیـــــدەم وە ســــەیر بــــەیانت بـــەیان[٣]

---

☞ هەقت بە دەسەن کار بـە دەس ئاسـان   نەکێشانت جـەور مـوژەی خـاڵ خاسـان
«ئەو دۆزەخ چێشەن عەزابش جە کۆن   دۆزەخ هـەر دۆزەخ دووری بـاڵای تـۆن»

لە سەرچاوەی «ح»دا بە دوای ئەم بەیتەدا چوار بەیتی دیکە هاتووە کە وا دیارە لکاوە بە شێعرەکەوە و لە هیچ کام لە نوسخەخەتیەکاندا نییە و ئێمەیش بە شێعری بێسارانیی نازانین و لێرەدا تـەنیا بـۆ هەڵسەنگاندنی خوێنەر دەیهێنین:

دەروونـــم ئـــایر تـــوونی بـــێ ئـــاوەن   ناڵەم سەداش چـەرخ گـەردوون شـکاوەن
ناڵـــەم جـــە ئاڵـــەم ئـــایر خێزنـــا   ئەســـرینم تۆفـــان نـــۆح ئـــەنگێزنا
مــن وێنــەی غــەواس غــەرقی خەمیــدە   گــێج بــیم نــە گێجـاو تۆفـانی دیــدە
چـەنی ئـاهی دەرد مـەجنوون جـە خـاودا   هـەر گـێجم مـەوەرد شـەو نـە گێجـاودا

-٤٥-

١- ح، عم. ئەم پارچە شێعرە تەنیا لەو دوو نوسخەدا هاتووە و بە پێی ئەوەی وشـەی «موسـتەفا»ی تێدایە و بێسارانیش ناوی خۆی لە شێعرەکانیدا نەهێناوە، بۆی هەیە شێعری بێسارانی نەبێت. بـەڵام چونکە لەو دوو نوسخەدا بە ناوی بێسارانییەوە هاتووە ئێمەیش بە پێی ئەو نوسخانە هێنامان.

٢- بەیان: بەیانی زوو، کازیوە. مەخێزی: هەڵدەستی. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێ.

٣- بنمانە: بنوێنە، دەربخە. بەیان: کۆی «بەی»یە، مەبەست سینەی یـارە. دیـدەم: چـاوم. بـەیان: بێن. واتە: ئەی یار! کاتێک بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستی دەستم بە دامانت سینەکانت دەربخە تـا چاوانم بێن و سەیری سینەکانت بکەن.

نـــەبا ڕەقیبـــان جـــە خـــاودا بـــەیان
ڕاز مـــــن و تـــۆ بکـــەران بـــــەیان[١]

قیبلـــەم! باجـــەتی حـــەی واچـــە حـــەیان
وەنـــــەوز نەکـــەران نـــــە دەور بـــــەیان[٢]

ناڵـــەم بەرزتـــەرەن جـــە ناڵـــەی نـــەیان
ئەگـــەر ڕەقیبـــان جـــە خـــاودا بـــەیان[٣]

«موســـتەفا» تـــا ســـەیر بـــەیانت کـــەردەن
داخ بــــەیانت بـــــەردش وە مــــەردەن[٤]

✵✵✵

١- ڕەقیب: چاوەدێر، لێرەدا مەبەست بەدخوازە. خاو: خەو. بەیان: بێن. بکەران: بکەن. بەیان: قسە کردنەوە، گەڕاندنەوە. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٢- قیبلەم: خۆشەویستم. باجەتی: بە خاتری، لەبەر. حەی: زیندوو، خودا. حەیان: کۆی «حەی»یە بە مانای «مار»، مەبەستی پەلکەی یارە. وەنەوز: خەوی کۆتا، کورتە خەو. نەکەران: نەکەن. بـەیان: بەهێ، بەی. واتە: خۆشەویستم! بیکـە بـە خـاتری خـودا بـەو مارانـە (پەلکـە) کـە وان بـە دەوری سینەکانتەوە و چاوەدێری سینەکانتن بڵێ خەویان لێ نەکەوێت و ئاگاداری سـینەکانت بـن نـەوەک کاتێک ئەوان خەوتوون ڕەقیبان بێن و چاویان بە سینەکانی تۆ و چاوی مـن کـە سـەیری سـینەکانت دەکەن بکەوێت و ڕازی نێوانمان بزانن و لای خەڵکی بیگێڕنەوە.

٣- بەرزتەرەن: بەرزترە. نەیان: کۆی «نەی»، شمشاڵ. خاو: خەو. واتە: ئەگەر ڕەقیبان لە خەودا بێن و بە ڕازی نێوانی ئێمە بزانن ناڵەی من لە ناڵەی نەی بەرزتر دەبێت. ئەم بەیتە لە «عم»دا نییە.

٤- کەردەن: کردووە. بەردش: بردی. مەردەن: مردووە. واتە: لەو کاتەوە موستەفا چاوی بە ☞

-٤٦[١]-

چـــراخم! بـــێ تـــۆ، چـــراخم! بـــێ تـــۆ
ئێـــوار تـــا ســـەحەر بـــێ خـــاوم بـــێ تـــۆ[٢]

ئەســـرین جـــە دیـــدەم پەیاپـــەی مەشـــۆ
چـــوون ســـەیل وەهـــار شـــەوان تـــا بـــە رۆ[٣]

کـــزەی جـــەرگ وێـــم مەژنـــەوون بـــە گـــۆش
دڵ لادێـــو جـــە خـــەم نیـــەن فـــەرامۆش[٤]

---

سینەکانی تۆ کەوتووە لە داخی سینەکانت مردووە، یا تا کاتێک دەمرێت داخی سینەکانی تـۆی لە دڵدایە یا داخی سینەکانی تۆی بردووەتە گۆڕەوە.

-٤٦-

١- ک، ئێ، س، ح، م، ل ب، ئا، عم، ر.

٢- ئێوار: ئێوارە. سەحەر: بەیانی، کازیوە. خاو: خەو. واتە: ئەی یار! هەر لە ئێوارەوە تا کـازیوە بـە بێ تۆ خەوم نییە و خەو لە چاوم ناکەوێت.

٣- جە: لە. پەیاپەی: بە دوای یەکدا. مەشۆ: دەڕوات. چوون: وێنەی، وەک. سەیل: لافاو، تاوەباران. ڕۆ: ڕۆژ. واتە: هەموو شەوێک تا ڕۆژ دەبێتەوە بە وێنەی تاوەبارانی بەهاری ئەسرین بـێ وچـان لـە چاوانم دێتە خوار.

٤- وێم: خۆم. مەژنەوون: دەبیستم. گۆش: گوێ. لادێو: ساتێک، کاتێک. نیەن: نییـە. فـەرامۆش: لەبیر چوونەوە. واتە: کزەی برژانی جەرگم ئەوەندە بەرزە بە گوێی خۆم دەبیستم و خـەم سـاتێک دڵـم لەبیر ناکات.

ئیســـه زەڎەی زام، پەشـــێو هـــاڵ جەســـتە
ئێنتێـــزار بـــە دیـــن شـــای ئـــاوات وەســـتە[۱]

***

-٤٧[۲]-

چـــراخم! بـــێ تـــۆ گـــوڵان وەهـــار
مـــەیان وە دیـــڎەم بـــە نێشـــتەر هـــەزار[۳]

هەر یـەک چـوون نێشـتەر بەرگوزیـڎەی مـن!
بـێ تـۆ مەشـکاوا پـەردەی دیـڎەی مـن[٤]

---

۱- زەڎە: پێکراو. هاڵ: حاڵ بار و دۆخ. ئێنتێزار: چاوەڕێی بوون. دین: دیتن، چاوپێکـەوتن. ئـاوات وەستە: ئاوات خواستراو. واتە: ئێستە پێکـراوی زامـم و حـاڵی جەسـتەم شـێواوە و بـەم حاڵـەوە چاوەڕێی چاو پێکەوتنی ئەو پاشام کە بە ئاوات خواسـتوومە و دڵـم پێوەیـە ببیـنم. لـە نوسـخەی «ل»دا بە دوای ئەم بەیتەدا بەیتێکی دیکـە هـاتووە کـە زۆر بـە مانـای شـێعرەکەوە نزیـک نییـە. ئەمەیش بەیتەکە:

میرزام مەر ئەوسا ساکن بـوو جـە خـەم    خـاک ڕووی پـالات بماڵـوون وە چـەم

-٤٧-

۲- ک، ئێ، ح، ب، س، ن، ڕ، ئا، عم.

۳- مەیان: دێن. نێشتەر: نەشتەر، شتێکی نووک تیژ کە بۆ خوێن گرتن لە لاشە بـە کـار دەبرێـت. واتە: ئەی یار! بە بێ تۆ گوڵانی بەهار لە چاوی مندا هەزار جار لە نەشتەر تیژترن.

٤- چوون: وێنەی، وەک. بەرگوزیڎە: هەڵبژێراو، تاقانە. مەشکاوا: شەق دەکەن، دەدڕن. واتـە: ئـەی خۆشەویستە تاقانەکەم، لە دووری و نەبوونی تۆ هەر کام لەو گوڵانە پەردەی چاوی من دەدڕن.

بـــەڵێ بـــە بـــێ تـــۆ مەڎیـــەو نـــە لێشـــان
مـــــەیان وە دیـــڎەم تێژتـــــەر جـــە نێشـــان[١]

غـــەیر جـــە بـــێ تـــویی چـێش مـــەبۆ فێشـــتەر؟
گـــــوڵان حــــەریر کــــەری بــــە نێشـــــتەر[٢]

☆☆☆

-٤٨-[٣]

چــــــراخم! بــــــێ ڕام، چــــــراخم! بـــــێ ڕام
مەتەرســـوون جـــە جـــەور گـــەردوون بـــێ ڕام[٤]

---

١- بەڵێ: بەڵام. مەڎیەو: سەیر دەکەم، دەڕوانم. لێشان: لێیان، لەوان. مەیان: دێن. تێژتـەر: تیژتـر. نێش: نووکی تیژ، چزە. واتە: بەڵام کاتێک بێ تۆ سەیری گوڵان دەکەم و لێیان دەڕوانم لە چاوانمدا لـە چزە تیژترن.

٢- غەیر: جگە، بێجگە. چێش: چی. مـەبۆ: دەبـێ. فێشـتەر: زیـاتر، زۆرتـر. حـەریر: قوماشـی هەورێشمی. کەری: دەکەی. واتە: مەگەر لە نەبوونی تۆ زیاتر شتێک هەیە؟ نـەبوونی تـۆ دەبێتـە هۆی ئەوەی ئەو گوڵەی کە بە وێنەی حەریر نەرم و جوانە بۆم ببێتە نەشتەر.

-٤٨-

٣- ک، ئێ، س، م، ح، ن، ب، ئا، ڕ، عم.

٤- بێ ڕام: بێ ڕەحم. مەتەرسوون: دەترسم. جە: لە. جەور: ستەم. واتە: ئەی یار مـن لـە ستەمی گەردوونی بێ ڕەحم دەترسم.

ماچوو نەک بێ مەیل ڕۆیێ جە ناکام
وەنەم شۆ نە قین، دوور وزۆت جە لام[١]

بە وێنەی مەجنوون ڕوو کەروو نە بەڕ
ڕەوان بۆ هووناو بەسر دیدەی تەڕ[٢]

ئایر دووریت نە دڵ گێرۆ کۆ
بناڵوو جە داخ دەرد دووری تۆ[٣]

قیبلەم ئەر گەردوون ئێدش بۆ نە دڵ
هەڵای وەر جە گشت من بەرۆ وە گڵ[٤]

---

١- ماچوو: دەڵێم، ئێژم. ڕۆیێ: ڕۆژێک. ناکام: کوتووپڕ. وەنەم شۆ نە قین: لێم بکەوێ بە قیندا. وزۆت: بتخا. واتە: ترسم لە گەردوون لە بەر ئەوەیە ئەڵێم نەوەکوو گەردوونی بێ مەیل ڕۆژێک لێم بکەوێت بە قیندا و تۆم لێ دوور بخاتەوە.

٢- کەروو: بکەم. بەڕ: وشکانی، وشکایی. ڕەوان بۆ: بکەوێتە ڕێگە. هووناو: خوێناو، خوێنی ئاوێتەی ئاو. بەسر: بە ئەسر. ئەسر: ئەسرین، فرمێسک. واتە: من لە دووری تۆ بە وێنەی مەجنوون ڕوو بکەمە کەش و کۆ و هێندە بگریم بە ئەسرینی چاوەکانم کە ئاوێتەی خوێنە، خوێن و ئاو پێکەوە بەکەونە ڕێگە.

٣- ئایر: ئاگر، ئاور. گێرۆ کۆ: کۆ بگرێت، بڵێسە بسێنێت. بناڵوو: بناڵم. واتە: (ئەو کاتە) ئاگری دووریت لە دڵمدا بڵێسە بسێنێت و بە داخی دەردی تۆوە بناڵم.

٤- ئەر: ئەگەر. ئێدش: ئەمەی. بۆ: بێ، ببێت. هەڵای: لێرەدا بە مانای «بەشکەم»ـە. وەر جە گشت: پێش هەمووی. بەرۆ: ببات. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

پەی چێش؟ جای ئەلحەد تەنگنای گڵکۆ
خاستەرەن جە داخ دەرد دووری تۆ [1]

✲✲✲

-٤٩- [2]

چراخم! بی ڕێش، چراخم! بی ڕێش
ئەر جە حەرف من خاترت بی ڕێش [3]

گەرد پاتم بەرد پەی ساکنی ئێش
ئەر تۆ نارەزای منیەوش نە جای وێش [4]

---

١- ئەلحەد: بە ئەو بەردەی کە دەینێنە سەر گۆڕ دەڵێن ئەڵحەد یا ئەڵحەو. تەنگنا: تەنگەلان، تەنگەوەری. پەی چێش: بۆچی. واتە: ئەی یار! ئەگەر گەردوون لە دڵیدایە کە تۆ لە من دوور بخاتەوە بەڵکوو پێش هەموو شتێک من بباتە ژێر خاک. دەزانی بۆچی؟ چونکە لە ژێر ئەڵحەد و گۆڕی تەنگدا بوون زۆر لە دووری تۆ باشترە.

-٤٩-

٢- عم، ج.

٣- بی: بوو، بووە. ڕێش: زامدار. ئەر: ئەگەر. حەرف: قسە، وتە. واتە: ئەی یار! ئەگەر لە قسەی من عاجز بووی و خاترت زامدار بووە ....

٤- گەرد: تۆز. بەرد: برد. پەی: بۆ. ساکنی ئێش: سارێژ بوونی ئێش. نارەزا: ناڕازی. منیەوش: دەینێمەوە. وێش: خۆی. واتەی: تۆزی ژێر پێتم برد بۆ سارێژ بوونی ئێشم بەڵام ئەگەر تۆ ناڕازیت دەیهێنمەوە و دەینێمەوە جێی خۆی. لە نوسخەی «ج»دا بە جێی «گەرد پاتم بەرد»، «دیدەی تۆم ماچ کەرد» نووسراوە.

تــــۆ مەبـــە دڵگیـــر مــــن كـــەردم بێجـــا
بـــەو تـــەور بـــەردەنم هـــەم منیـــەوش وە جـــا[١]

قیبلـــەم خـــاترت بـــیلا نـــەبۆ تـــەنگ
پـــووچ بێجـــام كـــەرد، ســـەرم دا وە ســـەنگ[٢]

❋❋❋

-٥٠[٣]-

چـــراخم! تـــەناف، چـــراخم! تـــەناف
بـــە تـــای بـــێ هـــەمتای مـــاڵ بـــە بـــێ تـــەناف[٤]

جـــە دووری بـــاڵات سۆســـەنی كـــڵاف
بیـــەنان بـــە تـــووڵ تـــەن شكەســـتەی تـــاف[٥]

---

١- دڵگیر: عاجز، نارەحەت. كەردم: كردم. بێجا: بێجێگە، نابەجێ، هەڵە، خەتا. واتە: تۆ لەبەر ئەم كارە هەڵەی من خۆت عاجز مەكە بەو جۆرە بردوومە هـەر بـەو جـۆرە دەیهێـنم دەینێمـەوە جێگـەی خۆی.

٢- بیلا: بەشكەم، بەڵكوو. پووچ: خاڵی. واتە: ئەی قیبلەم بەڵكوو خاترت تـەنگ و عـاجز نـەبێ، من كارێكی هەڵە و نابەجێ و لارم كرد و سەرم دای لە بەرد.

-٥٠-

٣- ك، ئێ، ح، س، ب، ن، ل، ر، نا، عم.

٤- تای بێ هەمتا: كەسێك كە لە وێنەی نییە، خودا. ماڵ بە بێ تەناف: ماڵی بەبێ تەناف وەستاو، ئێستە بێ كۆڵەكە دەڵێن. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٥- سۆسەنی كڵاف: پەلكەی زوڵفانت لە گوڵی سوێسنە دەچێت. بیەنان: بووم، بووگم. تووڵ: ☜

گــا خــەریک گــێج بــەحر قــەڵوەزان
گــا زەرد وێنــەی وەڵــگ خــەزان وەزان[1]

زەردیــم جــە هێجــران خــاڵ ئاڵاتــەن
کڵافــەی موشــکین، بــەرز باڵاتــەن[2]

قیبلــەم مــەر ئەوســا ســاکن بــوو جــە خــەم
خــاک ئاســانەت بماڵــوو نــە چــەم[3]

٭٭٭

باریک و ناسکی دار. تەن: لاشە. شکەستە: شکاو. تاف: تاڤگە، ئاوهەڵدێر. واتـە: ئـەی ئـەو یارەی کە زوڵفت لە گوڵی سوێسن دەچێت، قەسەم بەو خودای لە وێنەی نییە و ماڵی بە بێ تـەناف وەستاوە من لە دووری باڵای تۆ وەکوو لقی باریکی دار کە کەوتبێتە بەر تافی ئاو شکاوم.

١- گێج: گێژئاو، گێژاو. بەحر قەڵوەزان: ئاوێکی زۆر کە لە تاڤگەوە بڕژێتە شوێنێک. وەڵگ: گەڵا، بەرگ. وەز: گوێز. واتە: جارجار لە گێژاوی تاڤگەدا پەشۆکاوم و جارجاریش بە وێنەی ئەو گەڵا گوێزە کە خەزان دەکات ڕەنگم زەردە. لـە سـەرچاوەکانی «ح»، «ن»، «س» و «ب»دا بـە دوای ئـەم بەیتەدا بەیتێکی دیکە هەیە کە بەیتێکە لە پارچە شێعری «چـراخم گـەردان» و دیـارە سـەرچاوەی هەر چوار نوسخەکە بۆ ئەم شێعرە یەک سەرچاوە بووە. ئەمەیش بەیتەکە:

گــا عــەزم تەنجــەی مــاوای توونمــەن     گــا تــەمای وەســڵت نــە دەروونمــەن

٢- هێجران: دووری. خاڵ ئاڵا: وردە خاڵ. خاڵی ورد. کڵافەی موشکین: پەلکەی زوڵف کە بە وێنـەی موشک ڕەش و بۆنخۆش بێت. واتە: ڕەنگ زەردیم لە دووری وردە خاڵەکانت و زوڵفـە ڕەشـەکە و بـاڵا بەرزەکەتە.

٣- مەر: مەگەر. ئەوسا: دوای ئەوە، پاشان. بوو: بم، ببم. ئاسانەت: بـەردرگات. بماڵـوو: بماڵـم. واتە: مەگەر ئەو کاتە خەمم نەمێنێت و دڵم ئارام بێتەوە کە خاکی بەردرگات بە چاوانمدا بماڵم.

-٥١-[1]

چـــــراخم! تێژتـــــەر، چـــــراخم! تێژتـــــەر
چەنــد مــوژە داری، جــە ئــەڵماس تێژتــەر[2]

هــەر یــەک هــەزار زام مەکــەران فێشــتەر
هــەم جــە پــەی زامــان تێــژ مــەیان تێژتــەر[3]

هــەر یــەک بــە مــوژەی سـیای مــەودایی
مەشـــکاوان ســـینەی بەنـــدەی ســـەودایی[4]

-٥١-

١- ک، ئێ، ن، ح، س، ب، ڕ، عم.

٢- تێژتەر: تیژتر. چەند موژە داری: چەند مژۆڵت هەیە. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایـیدا پێکەوە دێن. نیوە بەیتی دووهەم دەتوانێت پرسیاریش بێت، واتە: «چەند مـوژە داری جـە ئـەڵماس تێژتەر؟ ».

٣- مەکەران: دەکەن. فێشتەر: زیاتر، زۆرتر. جەپەی: لە بۆ. مەیان: دێـن. واتـە: ئـەی یـار! چەنـد مژۆڵت هەیە لە ئەڵماس تیژترن، هەرکامیان زیاتر لە هەزار زام دروسـت دەکـەن و بـۆ زامـدار کـردن تیژتر دەبن. نیوە بەیتی دووهەمی سەروای نییە و دەبێ بە جێگەی «تێژتەر» وشەیەکی دیکە بێـت چون لە بەیتی یەکەمدا «تێژتەر» هاتووە و ئەم دوو بەیتەی سەرەتا دەبێت هاوسـەروا بـن کـە بـەو جۆرە نییە، بەڵام لە هەموو نوسخەکاندا «تێژتەر» نووسراوە و ئێمەیش هەر ئەوەمان نووسیەوە.

٤- سیا: ڕەش. مەودایی: تیژی. مەشکاوان: شـەق دەکـن، کـوت دەکـن. سـەودایی: کەسـێک کـە خەیاڵێکی لە سەردایە. واتە: هەر کام لە مژۆڵە ڕەشەکانت سینەی منی سەودا لەسەر، شەق دەکن.

مــەوداش یـــا بــەردەن ســەر نــە یانــەی دڵ
جەوپــەی زاریشــەن مــەڕێزۆ نــە گــڵ[١]

⭑⭑⭑

-٥٢[٢]-

چـــراخم! جامــــەن، چـــراخم! جامـــەن
تـــۆ مـــاچی جـــەمین جـــەلاش بـــە جامـــەن[٣]

جـام مـاچۆ منـیچ نـەو جـەمین جامـەن
ئـەر ئـەو جـام نـەبۆ، مـن نـامێم کامـەن[٤]

---

١- یا: ها. بەردەن: بردووە. یانە: ماڵ، خانوو. جەوپەی: بۆ، لەبەر ئەوە. مەڕێزۆ: دەڕژێت. واتە: مژۆڵەکانت نووکی تیژیان بردووتەوە هێلانەی دڵم و هەر لەبەر ئەوەیە کە دڵەکەم بە زاری دەگری و دەڕژێتە نێو خاک (دەمرێت).

-٥٢-

٢- ک، ئێ، ن، س، ح، ب، ڕ، عم.

٣- جام: ئاوێنە، ئایەنە. ماچی: دەڵێی، ئێژی. جەمین: نێوچاوان، ڕوخسار، تەوێڵ. جەلا: ڕۆشنی، ساف و سۆڵی. واتە: ئەی یار! تۆ دەڵێی ڕۆشنی و سافی ڕوخسارت لە ئاوێنەوەیە.

٤- ماچۆ: دەڵێت، ئێژێت. منیچ: منیش. نەبۆ: نەبێ، نەبێت. نامێم: ناوم. کامەن: کامەیە، لە کوێ بوو. واتە: ئاوێنە دەڵێت جێگەی منیش ئەو ڕوخسارەیە و ڕوخساری لە من ساف ترە و منیش ڕۆشنی و سافیم لە نێوچاوانی ئەوەوە دەگرم و ئەگەر ئەو نەبێ ناوی من لە کوێوە دێت؟ مەبەستی ئەوەیە ناوی ئاوێنە لە ڕوخساری یارەوە وەرگیراوە و بە دیتنی ڕوخساری ئەو ناوی ئاوێنەیان لێ ناوە.

ئەگـــەر عـــەکس ئـــەو نـــەوینوو نـــە وێـــم
هـــەرگیز نـــام جـــام نمـــەواچان پـــێم[١]

مـــەواچان بـــەدڕەنگ شیشـــەی شکەســـتە
دوور جـە شـار، نـە خـاک سارایی، خەسـتە[٢]

ئیســـە ســـەرئەفراز کـــەردەی شـــاهێ بـــیم
ئـــازاد کـــەردەی شـــەوق شـــۆڵەی مـــاهێ بـــیم[٣]

☆☆☆

## -٥٣-[٤]

چـــراخم! جـــەزەڵ، چـــراخم! جـــەزەڵ
بـــەو کەلامانـــە نـــازڵ بـــین جـــەزەڵ[٥]

---

١- نەوینوو: نەبینم. نە وێم: لە خۆمدا. نمەواچان: ناڵێن، نایەژن. واتە: ئاوێنە دەڵێت ئەگەر وێنەی یار لە خۆمدا نەبینم و وێنەی نەکەوێتە سەر من، قەت ناوی ئاوێنە لە من نانێن.

٢- مەواچان: دەڵێن، ئێژن. سارایی: دەشتی، کێوی، سەحرایی. خەستە: ماندوو، هیلاک. واتە: پێم دەڵێن شووشەی شکاوی تەڵخی دوورە شاری و تێکەڵی خاک و خۆڵی دەشت و دەری.

٣- سەرئەفراز: سەربەرز. کەردە: کردەوە، کار. بیم: بووم. ماهێ: مانگێک. واتـە: ئێستـە کـردەوەی شاهێک (یار) بـوو بـە هـۆی ئـەوەی مـن سـەربەرز بـم و ئـازاد کـراوی شـۆڵەی مانگێکم(پێشتر شووشەیکی بێ نەرزش و بێ بایەخ بووم و یار لە منی ڕوانی و بووم بە ئاوێنە).

-٥٣-

٤- ک، ن، س، ب، ح، ر، عم.

٥- جەزەڵ: لە ئەزەلەوە، لە سەرتاوە. کەلام: وتە، کتێب، لێرەدا مەبەست ئەو کتێبانەیە کە لە ☜

ئــــەر مەشـــوو نـــە خـــاک، یـــاوانم جـــەدەڵ
هێجـــــران زەدەی تـــــۆم نـــــەواچان ئەجـــــەڵ[١]

نـــــەک هامســــــەرانم بـــــاوەران نـــــە دڵ
ئەجـــەڵ پـــەیم ئامـــا، مـــنش بـــەرد وە گــڵ[٢]

هـــــەر ئێـــــذ بواچـــان ئامانـــــەت فـــەرزەن:
بـــە هێجـــران شـــیەن، بـــێ ئەجـــەڵ مـــەردەن[٣]

***

---

لایەن خوداوە بۆ پێغەمبەران هاتووە. نازڵ بین: نازڵ بـووە، هاتوەتـە خـوارەوە. واتـە: ئـەی یـار! قەسەم بە ئەو کتێبانەی هاتوەتە خوارەوە. لە بەیتە دواییەکاندا دەردەکەوێت بۆچی قەسەم دەخوات.

١- ئەر: ئەگەر. مەشوو: دەڕۆم، دەچم. یاوانم: بۆم گەیشتووە، بـۆم هـاتووە. جـەدەڵ: گـۆڕ، قـەبر. نەواچان: نەڵێن، نەیەژن. واتە: ئەگەر کاتی مەرگم هاتووە و دەچمە نێو گۆڕ و ژێـر خاکـەوە، نـەڵێن ئەجەل هات و کوشتی، من کوشتەی دووری ئەتۆم.

٢- هامسەران: دۆستان و هاوڕێیان. باوەران نە دڵ: بە دڵیاندا بێت. پەیم: بۆ من، بۆم. ئاما: هـات. منش: منی. بەرد: برد. واتە: نەوەکوو دۆست و هاوڕێیانم بە دڵیاندا بێت کە ئەجەل هاتووە و منـی بردوەتە ژێر خاک. لە بەیتی دواییدا دەڵێت بۆچی مردووە.

٣- ئێذ: ئەمە. بواچان: بڵێن، بێژن. ئامانەت فەرزەن: ئەمە بە لاتانەوە فەرزە و لە سەرتان واجبە کە بە جێی بێنن. شیەن: ڕۆیشتووە. مەردەن: مردووە. واتە: ئەمە بـە لاتانـەوە فـەرزە و لەسـەرتانە بـە جێی بهێنن و بە دۆست و هاوڕێیانم بڵێن کە هەر ئەمـە بڵـێن کـە بـە دەردی دووری و بـێ ئەجـەل مردووە. کاک حەکیم بە دوای ئەم بەیتەدا بە پێی نوسخەی «ن» بەیتێکی دیکـەی هێنـاوە کـە لـە باری مانابییەوە بە بەیتە پێشووەکانەوە نالکێت و لێرەدا تەنیا بۆ هەڵسەنگاندن ئەو بەیتە دێنین:

ئـــی ڕەنجـــی دەروون دەردی بـــێ تـــاوان     تـــەن زوخـــاڵ کـــەردەن ئـــەعزام گـــرد کـــاوان

-٥٤-[1]

چــــراخم! جـــه لات، چــــراخم! جـــه لات
دڵ مــەیل کـەرد جەسـتەش بنمانـۆ جـە لات[2]

دەروون ڕاش نـــەدا، نـــەبیش دەســـەڵات
بی بە هــوون جـە چـەم، ڕێـزا، کـەفت نـە ڕات[3]

هـــەر قـــەترەی هـــوونش جـــە دیـــدە جیـــان
پـــەرێ داد، بـــە زوخ ســـەرتاپاش ســـیان[4]

---

-٥٤-

١- ک، نێ، س، ن، ب، ح، ڕ، ئا، عم.

٢- جە لات: لە لات، لە لای تۆ. بنمانۆ: بنوێنێت، نیشان بدات. واتە: ئەی یار! دڵـم مـەیلی کـرد و دڵی پێوە بوو جەستەی خۆی بە لای تۆوە بنوێنێ و خۆی نیشانی تۆ بدات. لە سەرچاوەی «ح»دا بـە جێی «بنمانۆ»، «بمانۆ» نووسراوە کە بە پێی مانای بەیتەکە «بمانۆ» دروست نییە.

٣- ڕاش نەدا: ڕێگەی نەدا. نەبیش: نەیبوو. هوون: خوێن. جە چەم: لـە چـاو. ڕێـزا: ڕژا. کـەفت: کەوت. نە ڕات: لە ڕێگەت. واتە: دەروون ڕێگەی نەدا کە دڵ جەستەی خـۆی نیشـانی تـۆ بـدات و ئەویش بێ دەسەڵات بوو، لە داخی ئەوەی نەیتوانی خـۆی نیشـانی تـۆ بـدات بـوو بـە خـوێن و لـە چاوانمەوە ڕژایە ڕێگەت.

٤- قەترە: دڵۆپ. جیان: جودایە. پەرێ: بۆ. داد: عەداڵەت. زوخ: زوخاو. سیان: ڕەشە. واتە: هەر دڵۆپە خوێنێک لە چاوانم دەکەوتە خوارەوە بۆ عەداڵەت خوازی سەر تا پای ڕەش دەبووەوە. بێسـارانی لەم بەیتەدا ئاماژە بەوە دەکات ئەو کات (زەمانی پێشتر) ئەگەر کەسێک زوڵمی لێ کرابا بۆ سەندنی مافی خۆی و عەداڵەت خوازی جل و بەرگی ڕەشی لەبەر دەکرد. ئەم بابەتە لە چیرۆکی «شـاه سـیاه پوشان» لە «هفت پیکر»ی «نظامی گنجوی»دا هاتووە.

شـــەرتەن بپەرســـی چێشـــەن داذشـــان
چێشـــەن ســـیابەرگ چـــوون سەواذشـــان[١]

ئەوســـە مـــەزانی دڵ جـــەفاش کێشـــان
هـــاڵ داذ و ئـــاخ بپەرســـی جێشـــان[٢]

☆☆☆

-٥٥-[٣]

چـــراخم! جـــە ویـــر، چـــراخم! جـــە ویـــر
جـــە دمـــای مـــەردەن نمەشـــیم جـــە ویـــر[٤]

---

١- شەرتەن: باش وایە. بپەرسی: بپرسی، پرسیار بکەی. چێشەن: چییە. بەرگ: جل و بەرگ، لیباس. چوون: وێنەی، وەک. سەواذ: ڕەشی. واتە: باش وایە پرسیاریان لێ بکەیت و داد و هاواریان بپرسی و بزانی بۆچی جل و بەرگی ڕەشیان لەبەر کردووە.

٢- ئەوسە: پاشان، دوای ئەوە. مەزانی: دەزانی. جەفا: بێ وەفایی، سەختی و تاڵی. کێشان: کێشاوە. هاڵ: حاڵ. جێشان: لێیان، لە ئەوان، لەوان. واتە: ئەگەر حاڵی ئاخ و داد و هاواریان بپرسی ئەوکاتە دەزانی دڵ چەند جەفا و ڕەنجی کێشاوە.

-٥٥-

٣- ک، ح، ن، س، ب، م، ئا، ڕ، عم.

٤- ویر: بیر، یاد. دما: دوای، پاش. نمەشی: ناڕۆی، ناچی. واتە: ئەی یار! دوای مردنیش لە بیرم ناچیت.

ئەگـــەر وە گڵکـــۆم ڕاێت بگنـــۆ تەقـــدیر

خـــاک ئەلحـــەدم مـــەبۆت دامـــانگیر [١]

زێنهـــار جـــە گڵکـــۆم پـــا نەکـــەری کـــەم

ڕۆح ڕەوانـــم! مـــەدارۆت بـــە چـــەم [٢]

نـــەواچی مـــەردەن هـــا نـــە ژێـــر گـــڵ

هـــێمای مـــەیل تـــۆم بەرنەشـــیەن جـــە دڵ [٣]

ئـــەو ڕۆ جـــە ئەلحـــەد ســـەر مـــاروو وە بـــەر

بـــە مـــەیل تـــۆوە مەشـــوو وە مەحشـــەر [٤]

---

١- ڕات: ڕێگەت. بگنۆ: بکەوێت. تەقدیر: هەڵکەوت. خاک ئەلحەد: خاکی گۆڕ. مەبۆ: دەبێت، دەبێ. واتە: ئەگەر کاتێک ڕێگەت کەوتە سەر گۆڕەکەم، خاکی گۆڕەکەم داوێن گیرت دەبێت.

٢- زێنهار: ئاگات لێ بێت. پا نەکەری کەم: هامۆشۆت کەم نەکەیتەوە، پێم لێ نەبڕی. مەدارۆت بە چەم: چاوەڕێتە، بە هیواتە. واتە: ئاگادار بە سەردانی گۆڕەکەم کەم نەکەیتەوە چون ڕۆحم چاوەڕێتە و ئاگای لێیە.

٣- نەواچی: نەڵێی، نەیەژی. مەردەن: مردووە، گیانی سپاردووە. هێما: هێشتا. بەر نەشیەن: دەرنەچووە. واتە: نەڵێی مردووە و لە ژێر خاکدایە، هێشتا مەیلی تۆ لە دڵمدا ماوە و نەڕۆیشتووە.

٤- ئەو ڕۆ: ئەو ڕۆژە. ماروو: دەهێنم. مەشوو: دەڕۆم. واتە: ئەو ڕۆژە کە قیامەت هەڵدەستێت و من لە لە نێو گۆڕدا هەڵدەستمەوە بە یادی مەیلی تۆوە دەڕۆم بۆ مەحشەر.

جــه ســۆنگ تــۆوە بەهەشــت مــەڎان پــێم
وەرنـــه چ کـــارەم؟ کـــێ مـــەزانۆ کـــێم؟[1]

٭٭٭

-۵٦-[2]

چـــراخم! جیـــا، چـــراخم! جیـــا
هــەر کەســێ کــەردش مــن جــه تــۆ جیـا[3]

نائومێـــڎ نیشـــۆ وە بـــەخت ســـیا
زیـــانش چـــێش بـــێ ئـــەر مـــن تـــۆم بـــڎیا[4]

---

۱- سۆنگ: بۆنه، هۆ. مەڎان: دەدەن. وەرنه: ئەگینا، ئەینا. مەزانۆ: دەزانێت. واته: بـه هـۆی تـۆوە بەهەشتم پێ ئەدەن، ئەگینا من چ کارەم و کێ دەزانێ من کێم. له نوسخەی «م»دا له دوو جێگـەدا ئەم پارچە شێعرە نووسراوە و له هیچ کامیاندا ئەم بەیتە نییه. له جێگەیەکیدا به جێی ئەم بەیتـه، بەیتی خوارەوە هاتووە:

زەنـــگ بـــەڎنامیم زڕیـــا جـــه شـــاران     مەسمووع بی پەی پۆل فێرقەی ئەغیاران

و له جێگەیەکی دیکەدا ئەم دوو بەیته:

بـــا واچـــان کوشـــتەی زام تـــەخش تـــۆن     نـــاواک نیـــان دیـــڎەی وەحـــش تـــۆن
وایـــه و مـــوراد چەنـــد ســـاڵ بیـــەن پـــێش     شـــوکر هـــەم یـــاوا ئـــەو بـــه وایـــەی وێـــش

که دوو بەیتی کۆتایی پارچە شێعری «چراخم زامێ»یه.

-۵٦-

۲- ن، ک، نێ، س، م ب، ح، عم، مج.

۳- کەردش: کردی. مانای ئەم بەیته و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٤- نائومێڎ: نائومید، بێ هیوا. نیشۆ، دابنیشێت. سیا: ڕەش. چێش بێ: چی دەبوو. بڎیا: ☜

هــەر کۆســت کەوتــە بــۆ کــەردش ئــەو کــاریٚ

نــــەوینوو بــــاڵات بــــە ســــەد ڕۆ جــــاریٚ[1]

هــەر کۆســت کەوتــە بــۆ کۆســت بــە کۆســتەوە

ئــــەڵڵا دۆس پێکــــۆ وە کەڵپۆســــتەوە[2]

---

☜ بدیبا، دیتبا. واتە: ئەی یار! هەر کەس من و تۆی لە یەک جودا کردەوە یا خودا بە نائومێدی و بەختی ڕەش دابنیشێت، ئاخر مەگەر چ زیانێکی پێ دەگەیشت من تۆم بدیبا.

١- هەر کۆس کەوتە بۆ: کۆستی بکەوێت، بەختی ڕەش بێت، بەدبەخت بێت، کنایە لە ئازیز مردنـە، کاتێک کەسێک کەسێکی ئازیزی دەمرێت دەڵێن «کۆستی کەوتووە». کەردش ئـەو کـاریٚ: کـارێکی وای کرد. نەوینوو: نەبینم. ڕۆ: ڕۆژ. واتە: یا خودا ئەو کەسەی من و تۆی لە یەک جودا کردەوە هەر کۆست کەوتە بێت کە کارێکی وای کرد بە سەد ڕۆژ جارێک باڵات نەبینم.

٢- کۆست بە کۆستەوە: کۆست دوای کۆست. پێکۆ: بپێکێت. کەڵپۆست: پێستی کەڵ جۆرە جـل و بەرگێکە کە پێشتر لە پێستی کەڵ دروست کراوە و نەداران و بێ دەسەڵاتان لەبەریان کردووە. واتە: یا خودا ئەو کەسەی من و تۆی لە یەک جودا کردەوە یەک بە دوای یەکدا کۆستی بکەوێت و دۆسـتی خۆی بە کەڵپۆستەوە ببینێت. دەکرێت نیوە بەیتی دووهەم بەم شێوەیش مانای بکەینەوە «یـا خـودا ئەو کەسە ببێتە دۆستی کەڵپۆست، واتە هێندە کۆستی بکەوێت لە تاودا بدا بە کـەش و کـۆدا» یـا «خودا کەسی بۆ نەهێڵێتەوە و تەنانەت خودا دۆستە کەڵپۆست پۆشەکانیشـی لـە نێـو ببـات» بـە بڕوای من مانای ئەم بەیتە پڕ بە پێست نییە و بـە داخـەوە مانایـەکی ڕێـک و پێـک بـە دەستەوە نادات. ئەڵبەت دەکرێت بە سێ یا چوار شێوە مانا بکرێتەوە بەڵام هیچیان پڕ پێست نـین. دەکرێـت ئەم نیوە بەیتە لە کاتی بێسارانیدا مەسەلە بوویێت.

* تێبینی: بە بڕوای من بە پێی «ئەڵڵا دۆس پێکۆ» پوختەترین مانای بۆ ئەم بەیتە ئەمەیە: (یـا خودا هەرکەس من و تۆی لە یەک جودا کردەوە هێندە بە دوای یەکدا کۆستی بکەوێت دۆستە نزیک و ئازیزەکانی لە کەڵپۆستدا ببینێت.) «وەرگێڕ»).

ئـــەر لادێ بـــاڵات نـــەوینوو بـــە چـــەم
مەشـوو نـە مەزهـەب مەسـیحای مەریـەم[١]

☆☆☆

-٥٧-[٢]

چـــراخم! چگیـــر دەســـتچن تـــۆ دیـــم
سەنگ بە سەنگ گریام، فیدای یەکـیەک بیم[٣]

پەرسام هەی چگیـر سـەنگ جـە سـەنگ جیـا!
یـــە دەســـت کـێ بـــی تـــۆش وە هـــەم نیـــا؟[٤]

---

١- ئەر: ئەگەر. لادێ: تاوێ، ساتێ. نەوینوو: نەبینم. چەم: چاو. مەشوو: دەڕۆم، دەچم. مەسیحای مەریەم: حەزرەتی عیسای کوڕی حەزرەتی مەریەم. واتە: ئەگەر تاوێک من باڵای تۆ نەبینم هێندەم بە لاوە گرانە کـە دەسـت لـە موسـوڵمانی بـەر دەدەم و دەچمـە سـەر دینـی حـەزرەتی عیسـا. لـە نوسخەکانی «ئێ» و «م»دا بە جێی «مەسیحای مەریەم»، «عیسی بن مەریەم» نووسراوە.

-٥٧-

٢- ن، ک، ئێ، ح، س، ب، ڕ، عم.

٣- چگیر: دیواری کەپری هەوار. دەست چن: بە دەست دانراو. فیدای بیم: بە قوربانی بـووم. واتـە: ئەی یار! ڕێگەم کەوتە هەوار و چاوم کەوت بە دیواری ئەو کەپرە کە تـۆ بـە دەسـتی خـۆت دروسـت کردبوو، بە سەر یەک بە یەکی بەردی دیوارەکەدا گریام و خۆم بە قوربانیان کرد.

٤- پەرسام: پرسیم. یە: ئەمە. نیا: دانا، چێ کرد. واتە: پرسیم ئەی دیواری کەپر کە بەردەکانت لێک جودایە، تۆ بە دەستی کێ دانراوی؟

واتـــش زلّێخـــای بـــووم خـــۆرە زەردەن
بـە پەنجـەی سـێوەنگ ئێمـە جـەم کـەردەن[1]

جـەو بۆنـە مـەبوو بـە فیـدای سـەنگش
ئەڵبـەت شـنەفتەن ڕازێ جـە دەنگـش[2]

ئـەو سـەنگ چگیـر ئـازیز چنـا بـێ
فیـداش بـام فیـدا هـێما نـەو جـا بـێ[3]

***

۱- واتش: وتی. بووم: ڕومەت، ڕوخسار. خۆرە زەرد: هەتاوی زەرد. سێوەنگ: سێ جار ڕەنگ کراو، ڕەش بوو، لێرەدا بە مانای ڕەنگین و ڕەنگ کراوە، دەتوانێت بە مانای دەست خەنەییش بێت. واتە: وتی کاری ئەو زولەیخایە کە ڕوومەتی بە وێنەی هەتاوە و بە دەستە ڕەنگینەکانی ئێمەی کۆ کردوەتەوە.

۲- جەو بۆنە: لەبەر ئەوە. مەبوو: دەبم. شنەفتەن: بیستووە، بیستوویە. ڕاز: قسە. واتە: لەبەر ئەوە من دەبم بەقوربانی بەردەکانی، چون بۆی هەیە قسە و دەنگی ئەویان بیستبێت.

۳- چنا بێ: چنی بوو، دای نابوو. هێما: هێشتا. نەو جا بێ: لەوێ بوو. واتە: بەقوربانی بەردی ئەو دیواری کەپرە بم کە یار لە سەر یەکی چنیبوو و هێشتا لەوێ مابوون.

لە سەرچاوەی «ح»دا بە دوای ئەم بەیتەدا بەیتێکی دیکە هەیە کە وا دیارە هەڵەی ڕاست کردنەوەیە چون بەیتی کۆتایی پارچە شێعری «چراخم چوونم»ـە و ئەمەیش بەیتەکە بۆ هەڵسەنگاندنی زیاتر:

من یەند سەبرم کـەرد سـەنگ نـەبی وە لاڵ    ها من بیم وە سـەنگ، سەنگ بی وە زوخـاڵ

-٥٨-[١]

چـــراخم! چـــوونم، چـــراخم! چـــوونم
چوون واچوون جـه دەسـت هێجرانـت چـوونم؟[٢]

گیـــــرووده‌ی ئافــــــاق دەور گــــــەردوونم
ســــەبرت ســــۆچنا یانـــــەی دەروونـــــم[٣]

بــه وێــت مــەزانی دڵ چەنـد سـەبرش بـەرد
پــەردەی ســرِ پۆشــا و شــکایەت نەکــەرد[٤]

-٥٨-

١- ن، ح، ک، ئێ، س، ب، م،ع، ڕ، ئا، مج.

٢- چوون: چۆن. چوونم: چۆنم. واچوون: بڵێم. هێجران: دووری. واته: ئەی یار! چۆن بڵێم لـه دووری تۆ حاڵم چۆنه؟

٣- گێرووده: گرفتار، ئەسیر. ئافاق: کەناری ئاسـمان کـه لـه سـەر کەلانـەوه دیـاره، وڵات. سـۆچنا: سووتاندی، گڕی تێبەردا. یانه: ماڵ، خـانوو. واتـه: ئەسـیری وڵاتـانی دوورم کـه بـه هـەڵسـووڕانی گەردوون تێیان کەوتووم، گەردوون لە تۆی دووری خستوومەتەوه و سەبر کردن بۆ دووبـاره دیتنـی تـۆ هێلانەی دەروونمی سووتاندووه. له نوسخەی «م»دا نیوه بەیتی یەکەمی بەم جۆره نووسـراوه: «تـەن ئالوودەی دەرد، دڵ مەوج هوونم».

٤- وێت: خۆت. مەزانی: دەزانی. سەبرش بەرد: سەبری کرد، به دیاریەوه وەستا. پەردەی سرِ پۆشـا: سرِی پۆشی، سرِی شاردەوه. واته: تۆ خۆت دەزانی دڵم چەند به دیاریەوه وەستا و سەبری کرد و سـرِی پۆشی و دەنگی دەرنەهات.

ئیســـە هــا ســـەبرم جـــە تاقـــەت بڕیـــا
یانـــەی ســـەبرم ســـفت، پـــەردەی دڵ دڕیـــا[۱]

پێسەشـــــان واتـــــەن حـــــەکیمان ســـــاڵ
جــە ســـەبر کـــەردەن ســـەنگ مـــەبۆ بـــە لاڵ[۲]

مــن یەنــد سـەبرم بـەرد سـەنگ نـەبی بـە لاڵ
من یا بیم بە سـەنگ، سـەنگ بـی بـە زوخـاڵ[۳]

***

---

۱- بڕیا: بڕا. یانە: ماڵ خانوو، لانە. سفت: سووتا. دڕیا: دڕا. واتە: ئەوە چیتر سەبرم تاقەتی لێ بڕا و لانەی سەبرم سووتا و پەردەی دڵم دڕا و سرِ کەوتە سارا و دەشت و دەرەوە و دیـاری دا. مەبەسـتی ئەوەیە چیتر ناتوانم سەبر بکەم و سەبرم نەماوە.

۲- پێسەشان واتەن: وەهایان وتوویە. سەنگ: بەرد. لاڵ: لەعل، بەردێکی بەنرخی بە ڕەنگی سووری کاڵ. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکـەوە دێـن. لـە نوسـخەی «ک» بـە جێـی «پێسـەشـان»، «پۆسەشان» و بە جێی «جە سەبر کەردەن»، «جە ماوای سەبرم» نووسراوە.

۳- یەند: هێندە: ئەوەندە. سەبرم بەرد: سەبرم کرد. یا: ها، ئەوە. زوخاڵ: خـەڵووز. واتـە: حـاڵ زانـان ساڵانی پێشوو وتوویانە ئەگەر سەبر بکەی بەردی بێ بایەخ دەبێت بە لەعل کە جۆرە جەواهێرێکـە، بەڵام من ئەوەندەم سەبر کرد کە بەرد نەبوو بە لەعل هیچ من بووم بە بەرد و بەردیش سووتا و بوو بە خەڵووز.

-٥٩-[١]

چـــــراخم! حاڵـــــت، چـــــراخم! حاڵـــــت

بـــــه بـــــه‌ذ مـــــه‌نوازان، بـــــه‌ذوازان حاڵـــــت[٢]

مـــــه‌واچان زڵفـــــان موشـــــکین زوخاڵـــــت

بـــــێ نـــــاز شـــــێویان وه بـــــووم لاڵـــــت[٣]

زوان به‌ســـــته بـــــان، یـــــه چـــــوون دڵ داران؟

بـــــاس تـــــۆ بـــــازار، ســـــتەم مـــــه‌ذاران[٤]

پـــــه‌ی چـــــێش؟ بینـــــایی هـــــه‌ر دوو دیـــــذه‌نی

بـــــه تـــــای بـــــێ هـــــه‌متا به‌رگوزیـــــذه‌نی[٥]

---

-٥٩-

١- ن ک، ح، ئێ، س، ب، ئا، ر، عم.

٢- به بەذ: به خراپ، به خراو. مەنوازان: دەنگیان دێت که دەڵێن. بەذواز: خراپە خوازی، فیتنە، کەسێک که خراپەی کەسێکی تری بوێ. واته: ئەی یار! دەنگی خراپه خوازانم دێته گوێ کـه دەڵـێن حاڵت خراپه و نەخۆشی.

٣- مەواچان: دەڵێن، ئێژن. زڵف: زوڵف، کەزیه، قژ. موشکین: به وێنەی موشک ڕەش و بۆنخۆش. شێویان: شێواوه، بڵاوه. بووم: ڕوومەت، ڕوخسار، دیمەن. لاڵ: لەعل. واته: دەڵێن زوڵفه خەڵووزییه ڕەشەکانت بێ ناز کەوتوون و به سەر ڕوومەتی وەک لەعلت پەرێشان و بڵاون.

٤- زوان بەسته بان: لاڵ بن. یه: ئەمه. دڵ داران: دڵیان دێت. بازار: به ئازار. مەذاران: نازانن. واته: بەڵکوو زمانیان لاڵ بێت چۆن دڵیان دێت باسی تۆ به نەخۆشی دەکەن و به ستەمی نازانن؟

٥- پەی چێش: بۆچی. تای بێ هەمتا: کەسێک که له وێنەی نەبێت، خودا. بەرگوزیذه: تاقانه ☜

بــــالاَ زەڕســـــتوون، خـــــاتردارەنی
نــــــەمام نـــــەوخێز، گەوهـــــەربارەنی [1]

خــاس ئێــدەن تــا دەور دنیـــای بــێ قـــەرار
تـــۆ نـــەبۆت ئـــازار، نەشـــێویۆت بـــازار [2]

خـودا پـەی شـەفات جـە سـەر بـە مـەیر بـۆ
ئـــازارت ئـــازار عاقیبـــەت خـــەیر بـــۆ [3]

***

---

☜ هەڵبژێراو. واتە: لەبەرچی دەڵێم چۆن دڵیان دێت وا دەڵێن؟ لەبەر ئەوەی تۆ نووری چاوانی منی و قەسەم بە خودای تاک و تەنیا، تاقانەیت و لە هەموو کەس سەرتری.

۱- زەڕستوون: کۆڵەکەی زێڕ. خاتردار: خۆشەویست، نازیز. نەوخێز: تازە پێگەیشتوو، تازە بەرگرتوو. گەوهەر: جەواهێر. بار: بەر، سەمەر. واتە: باڵات بە وێنەی کۆڵەکەی زێڕە و نازیز و خۆشەویستی و بە وێنەی نەمامێکی تازە پێگەیشتوویت کە سەمەرت جەواهێرە.

۲- خاس ئێدەن: خاس ئەمەیە، ئەمە باشە. نەبۆت: نەتبێ. نەشێویۆت بازار: بازارت نەشێوێت، بازاڕت تێک نەچێت. واتە: خاس ئەمەیە تا دنیای بێ قەرار بەم جۆرە هەڵدەسووڕێت و دەگەڕێت تۆ ئێش و ئازارت نەبێت و بازاڕت نەشێوێت.

۳- پەی: بۆ. مەیر: مێهر، دۆستی، خۆشەویستی، ڕەحم. واتە: خودای بانی سەر بۆ خۆش بوونەوەت ڕەحمی ببێت و نەخۆشینت نەخۆشینێک بێت ئاخری خێر بێت. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «جە سەر بە مەیر بۆ»، «جە سەیر نە سەیر بۆ» و لە «ن»دا «جە سەیر بە سەیر بۆ» و لە «ب»دا «جە سەر بە سێر بۆ» نووسراوە.

-٦٠-[1]

چـــــــراخم! دەردم، چـــــــراخم! دەردم
شـــــەوێ جـــە شـــــەوان دێونـــــا دەردم[2]

خـــەیاڵ خـــەم ئـــاوەرد، پـــەژارە بـــەردم
تـا سـوب سـپی بـی شـەو کـەرد، مـن کـەردم[3]

نـــەعرە دام، نـــاڵام، تـــا بـــە شـــەبەق زەرد
زەرێ خـــاو وە بـــان دیـــدەم مـــەیل نەکـــەرد[4]

هەرکـــەس گۆشـــش دا بـــە ئـــاه و ناڵـــەم
«لاحـــەول» مـــەوانا پـــەی شـــوومی تاڵـــەم[5]

---

-٦٠-

١- ح، ک، ئا، ڕ.

٢- دێونا: ئاڵۆزی کرد، شێوانی. واتە: ئەی یار! شەوێک لە شەوان دەردم ئارام و قەراری لێ بڕیم. بە پێی بەیتە دواییەکان، شەو دەردی بێسارانی دێوانە کردووە

٣- ئاوەرد: هێنا، هاورد. پەژارە: خەم و خەفەت. بەردم: بردم. سـوب: بـەیانی، کـازیوە. سـپی بـی: ڕۆشن بووەوە. کەرد: کرد. کەردم: کردم. واتە: هەر خەیاڵێک خەمێکی بیر هێنامەوە و هـەر خـەم و خەفەتم دەخوارد، ئەو شەوە تا بەیانی شەو کردی و من کردم.

٤- نەعرە: هاواری بەرز. ناڵام: ناڵاندم، هاوارم کرد. شەبەق: شەفەق، کاتێـک هـەتاو بکەوێتـە سـەر کەلان و هەوا ڕوون ببێتەوە. خاو: خەو. نەکەرد: نەکرد. واتە: تا کاتێک هەتاو کەوتـە سـەر کـەلان و هەوا ڕووشن بووەوە، بە دەنگی بەرز هاوارم کرد و ناڵاندم و خەوم لێ نەکەوت.

٥- لاحەول: لا حَولَ وَ لا قُوَّةَ إلاّ بِاللّه، کاتێک کەسێک بۆ کار یا نەخۆشینێک هیچی لە دەست ☜

مـــەواتش یـــا ڕەب یـــە کـــام دەردینـــەن
شـــەوان هـــەر نـــە فکـــر زایەڵـــە و شـــینەن؟[١]

تـــا وە ســـوب هـــەر کـــەس وەنـــەم بـــی نـــەزداو
جە شـــوومیم ئـــەو شـــەو هـــیچ نەکـــەردەن خـــاو[٢]

ســـەد بـــار واتـــەن پـــێم جـــە زوان لـــەنگ بـــای
دەیســـە ســـاکن بـــە، بـــە سیاســـەنگ بـــای[٣]

٭٭٭

☜ نەیەت یا چاوی بە شتێکی سەرسوورهێنەر بکەوێت ئەم زیکرە دەخوێنێت. مەوانا: دەخوێنـد. پەی: بۆ. شوومی: نەحسی، نەگبەتی. تاڵە: تاڵع، چـارەنووس. مانـای ئـەم بەیتـە و بـەیتی دوایـی پێکەوە دێن.

١- مەواتش: دەیگـوت، دەیـوت. یـە: ئەمـە. دەردیـن: دەردەدار. زایەڵـە: دەنگـی شـیوەن. واتـە: هەرکەس گوێی لە ئاهـ و ناڵەم بوو دوعـای «لا حَـولَ وَ لا قُـوَّةَ إلاّ بـِاللّه»ی بـۆ چارەنووسـی شـووم و نەگبەتم خوێند و وتی خودایە ئەمە کام دەردەدارە کە شەوانە هەر وا بە بیری شیوەن و گریانەوە. لـە سەرچاوەی «ح»دا ئەم بەیتە دوای بەیتی کۆتایی هاتووە.

٢- تا وە سوب: تا بەیانی. وەنـەم: لـێم. نـەزداو: نزیـک. نەکـەردەن: نـەکردووە. خـاو: خـەو. واتـە: هەرکەس نزیکم بوو لە تاوی شوومی بەختم و ناڵە و هاوارم تا بەیانی خەو نەچوە چاوی.

٣- واتەن پێم: پێی وتووم. جە زوان لەنگ بای: لاڵ بی. دەیسە: دەی ئێستە. ساکن بە: ئـارام بگـرە. سیاسەنگ: بەردی ڕەش، (زیاتر بە کوچکەی ئاگر دەڵێن «وەرگێر»). بای: ببی. واتە: سەدجار پێی وتووم بەشکەم لاڵ بیت و ببی بە بەردی ڕەش دەی ئیتر بەسە، ئارام بگرە.

-٦١-[١]

چـــراخم! دەســـترەس، چـــراخم! دەســـترەس
دەســـتێ نـــەداروو بـــە وەســـڵت دەســـترەس[٢]

بـــە چێـــو مـــەبۆ شـــاد خـــاتر هەركـــەس
شـــادی دوو دنیـــام خـــەیاڵ تـــۆ وەس[٣]

مـــوفلێس مەنیشـــۆ خـــەیاڵ مەكـــەرۆ
بـــەو خـــەیاڵ گـــەنجێ بـــە دەســـت مـــاوەرۆ[٤]

ئەوســـــە مەبـــــەرۆش خـــــەیاڵ وە جـــــایێ
نمـــەیۆش نـــە چـــەم چـــوون خوســـرەو شـــایێ[٥]

---

-٦١-

١- ح، ن، ب، س، ک.

٢- دەسترەس: دەست گەیشتن. نەداروو: نیمە. وەسڵ: بە یەک گەیشتن. واتە: ئەی یار! دەستێکم نییە کە بە وەسڵی تۆ بگەم. (دەسەڵاتی بە تۆ گەیشتنم نییە «وەرگێر»).

٣- چێو: شتێک. مەبۆ: دەبێ. وەس: بەس. واتە: خاتری هەرکەس بە شتێک شاد دەبێ مـن بـۆ شادی هەردوو دنیام خەیاڵی تۆم بەسە.

٤- موفلێس: ندار، گەدا، کەسێک کە هیچی نەبێت. مەنیشۆ: دادەنیشێت. مەکەرۆ: دەکات. بـە دەست ماوەرۆ: بە دەست دەهێنێت. واتە: کەسێک کە موفلیسە و هیچی نییە دادەنیشێت و دەست دەکات بە خەیاڵ کردن و بە خەیاڵ گەنج و خەزێنەیەک بە دەست دێنێت.

٥- ئەوسە: پاشان، دوای ئەوە. مەبەرۆش: دەیبات. نمەیۆش: نایەت. چەم: چاو. چوون: وێنەی، وەکوو. خوسرەو: خوسرەو پەرویز پاشای ئێران. واتە: پاش ئەوەی بە خەیاڵ گەنج و خەزێنەی بە ☜

منــیچ ئــەو مــوفلێس وەســڵ تــۆ گــەنجم
هــەر تــا زێنــدەنان پــەرێت نــە ڕەنجــم[١]

لازم یـــا مەشـــۆم ســـەر بـــە ڕەنجـــدا
یـــا ڕەنـــج مەبـــەرۆم پـــا بـــە گەنجـــدا[٢]

***

-٦٢[٣]-

چـــراخم ڕوێ جـــە ســـوب ســـەحەردا
ناگـــا خـــەدەنگێش بـــەرد بـــە جگـــەردا[٤]

---

دەست هێنا، خەیاڵ بۆ شوێنێکی دەبات کە پاشایەتی خوسرەو پەرویزی بە بەرچاو نایەت و بە هیچی نازانێت. مەبەستی ئەوەیە خۆی لە خوسرەو پەرویز بە زیاتر دەزانێت.

١- منیچ، منیش. زێندەنان: زیندووم. پەرێت: بۆ تۆ. ڕەنج: سەختی کێشان. واتە: منیش بە وێنەی ئەو موفلیسە گەنج و داراییم گەیشتن بە تۆیە و هەتا دەژیم بۆ گەیشتن بە تۆ ڕەنج و سەختی دەکێشم.

٢- لازم: پێویست. مەشۆ: دەڕوات. مەبەرۆم: دەمبات. واتە: لەم دوو حاڵەتە بە دەر نییە، یا سەرم لە ڕێگەی بە تۆ گەیشتندا دەڕوات یا ڕەنج و سەختی کێشان دەمگەیەنێت بە گەنج کە گەیشتن بە یارە.

-٦٢-

٣- ن، ح، ک، نێ، س، ب، ر، عم.

٤- ڕوێ: ڕۆژێک. سوب: بەرەبەیان. ناگا: کوتووپڕ. خەدەنگ: تیر. بەرد: برد. واتە: ڕۆژێک لە بەرەبەیانێکی زوودا یارم تیرێکی برد بە جگەرمدا.

جگــــەر پـــــەنهان کـــەرد تـــا دڵ نـــــەزانۆ
بـــێ ڕامـــــەن، نـــــەبا چەنـــــەش بســــتانۆ[١]

دڵ دەرســـات زانـــاش هۆرئامـــا بـــە جـــەنگ
گێرتـــەبێ بـــە دەســـت ســـەرفاقەی خـــەدەنگ[٢]

مەکێشــۆ مـــوو وەش، نـــەدۆش بـــە جگـــەر
جگـــەر ســـەخت گێرتـــەن نمـــەیۆ وە بـــەر[٣]

جـــــــەنگ پـــــــەنهانی دەروونشـــــــانەن
دامــــانم گوڵگـــــەز بـــــە هوونشـــــانەن[٤]

---

١- پەنهان کەرد: شاردیەوە. نەزانۆ: نەزانێت. بێ ڕام: بێ ڕەحم. نەبا: نەوەک. چەنەش: لێی، لە ئەو، لەو. بستانۆ: بستێنێت. واتە: جگەرم تیرەکەی شاردەوە تا دڵم نەزانێت، چونکە بێ ڕەحم و بەزەییە و نەوەک لێی بستێنێت.

٢- دەرسات: هەر ئەو کاتە، زوو، خێرا. زاناش: زانی، خەبەردار بوو. هۆرئاما: هەستا. جەنگ: شەڕ. گێرتەبێ: گرتبووی. سەرفاقە: مشتە، مشتەکی، شوێنی دەست پێوە گرتن. واتە: دڵ هەر زوو زانی و هەستا و دەستی کرد بە شەڕ کردن و مشتەی تیرەکەی لە دەست گرتبوو.

٣- مەکێشۆ: دەکێشێت. موو وەش: بە وێنەی موو. نەدۆش: نەدا. گێرتەن: گرتووە. نمەیۆ: نایەت. واتە: دڵ تیرەکە بە وێنەی موو دەکێشێت کە بیبات بۆ خۆی و نەیدا بە جگەر و جگەریش تیرەکەی بە توندی گرتووە و نایەڵێت بێتە دەر.

٤- پەنهانی: نادیار، نەبینراو. دەروونشانەن: دەروونیانە. گوڵگەز: بە ڕەنگی گوڵی داری گەز کە سوورێکی دێزە، سوور. هوونشانەن: خوێنیانە. واتە: لە دەروونمدا دڵ و جگەر شەڕێکی نادیاریانە بەڵام دامانم بە خوێنیان سوورە. مەبەستی ئەوەیە خوێنی لە چاوان دەڕژێت و دامانی سوورە.

فیدای دەستت بام هەی خەدەنگ بە دەست
با خەدەنگێو نیت بەربشۆ جە شەست[١]

بەرە بە دڵدا بە وێنەی جگەر
تا جەور و جەفام ناوەران وە سەر[٢]

☆☆☆

-٦٣[٣]-

چراخم! زامێ، چراخم! زامێ
دڵ ئاورد ڕوێ جە تەخشت زامێ[٤]

---

١- خەدەنگ: تیر. خەدەنگێو نیت: تیرێکی دیکەت، تیرێکی ترت. بەربشۆ: دەربچێت. شەست: لە بنەڕەتدا بە مانای قامکە کەڵەیە بەڵام لێرەدا مەبەست جۆرە کلکەوانەیەکە کە لە شاخ یا پێشەی ئاژەڵ دروست کراوە و لە کاتی ڕاودا لە قامکە کەڵەیان کردووە و ژێی کەوانەکەیان پێ گرتوور تا قامکیان نەبڕێت. واتە: ئەی تیر بە دەست! بەقوربانی دەست و تیرت بم با تیرێکی دیکە لە دەستت دەر بچێت (تیرێکی دیکە بهاوێژە).

٢- بەرە: ببە. ناوەران: نەهێنن. واتە: هەر وەک تیرت لە جگەرم دا تیرێکیش لە دڵم بدە با چیتر وازم لێ بێنن و کەم عاجزم بکەن و ڕەنجم بدەن.

-٦٣-

٣- ح، ک، ئێ، ن، ب، س، ڕ، عم.

٤- زامێ: یەک زام، زامێک. ئاورد: هێنا. ڕوێ: ڕۆژێک. تەخش: تیر. واتە: ئەی یار! ڕۆژێک دڵم بە تیری تۆ زامدار بوو.

زامـــیٚ ژارئـــالوود، بـــیٚ دەوا نـــامیٚ

مـــەزانوو جـــەی زام مـــەوینوو کـــامیٚ[1]

یـــە چەنـــدیٚ وەختـــەن دڵ جـــەفاش بـــەردەن

پـــەی زامـــیٚ بـــەی تـــەور گیـــانش پـــەروەردەن[2]

پەی چێش؟ پـەی ئەوسا وەخـت مـەرگش بـۆ

دوور جـــە ســـەر تـــۆ گڵکـــۆ بـــەرگش بـــۆ[3]

بواچـــان کۆشـــتەی زام تـــەخش تـــۆن

نـــاواک نیـــان دیـــدەی وەحـــش تـــۆن[4]

---

۱- ژارئالوود: ژەهراوی. مەزانوو: دەزانم. جەی: لەم، لە ئەم. مەوینوو: دەبینم. کام: لێرەدا مەبەست ئاواتی دڵە، ئارەزوو. واتە: زامێکی ژەهراوی کە ناوی زامی بێ دەرمانە و دەزانم کە بەم زامە بە ئاواتی دڵم دەگەم.

۲- یە چەندیٚ وەختەن: ئەمە چەند وەختە. جەفا: سەختی و ڕەنج. بەردەن: بردووە. پەی: بۆ. بەی تەور: بەم جۆرە. پەروەردەن: پەروەردە کردووە. واتە: ئەمە چەند وەختە دڵ بۆ زامێکی بەم جۆرە گیانی پەروەردە کردووە و جەفا و سەختی کێشاوە (ڕاهێنانی پێ کردووە).

۳- پەی چێش: بۆچی. پەی ئەوسا: بۆ ئەو کاتە. دوور جە سەر تۆ: لە تۆ دوور بێ، دوور لە گیانت. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ چەند بەیتی دوایی‌دا دێت. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هەیە.

٤- بواچان: بڵێن، بێژن. تەخش: تیر. تۆن: تۆیە. ناواک: کۆی وشەی «ناوەک»ـە بە مانای تیر. نیان: نیهان، شاراوە. وەحش: دەستەمۆ نەکراو، کێوی. مانای ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

وایــە و مــورادی چەنــد ســاڵ مــەبی پــێش
شــوکر هــەم یــاوا ئــەو بــە وایــەی وێــش [1]

☆☆☆

-٦٤- [2]

چـــراخم! زویـــر، چـــراخم! زویـــر
جـــە دووری بـــاڵات زامـــدارم، زویـــر [3]

هــەر یەنــد بــە خــەیاڵ مــاوەرووت ئــەو ویــر
بەتــەر بــە نێهــار داخــت مــەذۆم گیــر [4]

---

١- وایە: ئاوات، ئارەزوو. مەبی پێش: پێی بوو. یاوا: گەیشت، گەیی. وێش: خۆی. واتە: بۆچی؟ بۆ ئەوەی ئەو کاتە، کاتی مەرگی بێت دوور لە گیانت خاکی گۆڕی ببێت بە جل و بەرگ، خەڵک بڵـێن ئەمە بە زامی تیری تۆ کوژراوە. تیرێکی شاراوە کە لە چاوە دەستەمۆ نەکراوەکانتەوە هاوێشـتووتە و با بڵێین ئەمە ئاواتی چەند ساڵەی پێوە بوو و لە مێژە بە هیوا بوو بە زامی تیری تۆ بکوژرێت. شوکر بۆ خودا کە بە ئاواتی خۆی گەیشت.

-٦٤-

٢- ک، ئێ، ح، ن، س، ب، ئا، ر، عم، ی.

٣- زویر: خەمگین، عاجز. جە: لە. واتە: ئەی یار! من لە دووری باڵای تۆ زامدار و عاجزم.

٤- هەر یەند: هەر هێندە. ماوەرووت: دەتهێنم. ویر: بیر. بەتەر: خراوتر. نێهار: پـەژارە، حـەیف، ئەفسووس. مەذۆم: دەمدا. واتە: تا بە خەیاڵ دەتهێنمەوە بیر داخت خراوتـر بـە حـەیف و پـەژارەوە گیرم دەدات.

چـوون مـەگنۆم وە یـادْ گۆنـای گـوڵ بێـزت
دیدّەی بێ مەی مەست، مـوژەی هـوون ڕێـزت[١]

ڕەفتـار شـێوەی ئامـا و لواییـت
ئـاداب و دەسـتوور سـاحیب وەفاییـت[٢]

یـەک یـەک لـێم بیـەن بـە زام خەتـەر
نێهـاران فـرێن یـەک جـە یـەک بەتـەر[٣]

مـەر ئەوسـا داخـت بەرکـەروو جـە دڵ
ئـەو سـەرم کـۆ بـۆ کۆگـای سـەنگ و گـڵ[٤]

***

---

١- چوون: کاتێک. مەگنۆ: دەکەوێت. گۆنای گوڵ بێز: سەر کوڵمێک لە ڕەنگ و جوانیـدا لـە گـوڵ سەرتر بێت و بە بینینی گوڵت لەبەر چاو بکەوێت. موژە: مژۆڵ، برژانگ. هوون: خوێن. مانای ئـەم بەیتە و دوو بەیتی دوایی پێکەوەن.

٢- ئاما و لوا: هات و چوو. مانای ئەم بەیتە و بەیتی پێشو و بەیتی دوایی پێکەوەن

٣- بیـەن: بـووە. زام خەتـەر: زامـی کـاری. نێهـاران: کـۆی «نێهـار» بـە مانـای پـەژارە، حـەیف، ئەفسووس. فرێن: زۆرە. بەتەر: بەدتر، خراوتر. واتە: کاتێک کوڵمی سوور و جوانت کـە گـوڵ لەبـەر چاو دەبێزرێنێ و چاوە بێ شەرابە مەستەکانت و مژۆڵی وەک تیرت کە خـوێنی عاشـقان دەڕێژێـت و کردەوە و هات و چووی وەفادارانەتم دەکەوێتە بیر یەک یەک لێم دەبن بە زامێک کـە دەرچـوونم لـە دەستیان نییە و خەم و پەژارەت زۆرن و یەک لە یەک خەتەرتر و بکوژترن.

٤- مەر ئەوسا: مەگەر ئەو کاتە. بەرکەروو: دەربکەم. کۆ بۆ: کۆ بێت. کۆگا: مەکۆ. واتـە: مەگـەر ئەو کاتە سەرم بچێتە ژێر خاک و ببێتە مەکۆی بەرد و قوڕ تۆ لە دڵ دەربکەم و لە بیرم بچیتەوە.

-٦٥-[1]

چـــراخم! ژیـــام، چـــراخم! ژیـــام
ســا کــە مــن بــێ تــۆ نەمــەردم، ژیــام[2]

جــە چــەفتی چــارەم، جــە بــەخت سـیام
قــەدٚەمێ نــە ڕای ئەجــەڵ نــەنیام[3]

بـــێ تـــۆ ئـــایرێم نـــەخێزا نـــە دڵ
نــەبیم بــە زوخــاڵ، نــەڕێزام نــە گــڵ[4]

چــوون واچــوو جــە ســەیر وەفــای تــۆ دارام؟
تۆشـــەی ڕان پـــەرێ سەرســـامی ســـارام[5]

* * *

-٦٥-

١- ن، ک، ئێ، س، ب، ح، ڕ، ئا، عم.

٢- نەمەردم: نەمردم. واتە: ئەی یار! کاتێک من بە بێ تۆ نەمردم و ژیام....

٣- چەفتی: لاری. چارە: چارنووس. سیا: ڕەش. قەدٚەم: هەنگاو. ڕا: ڕێگە. ئەجەڵ: کاتی مردن. واتە: لەبەر ئەوەیە کە چارەم لارە و بەختم ڕەشە کە نەمزانی هەنگاوێک بۆ لای مەرگ بنێم. مەبەستی ئەوەیە لە دوای تۆ دەبوو بمردایەم.

٤- ئایر: ئاگر، ئاور. نەخێزا: هەڵنەستا. نەبیم: نەبووم. نەڕێزام: هەڵنەوەریم. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٥- چوون واچوو: چۆن بڵێم. دارا: دەوڵەمەند. تۆشەی ڕان: پاشەکەوتی ڕێگەیە. پەرێ: بۆ. ☜

-٦٦-[1]

چـــراخم! ســـیات، چـــراخم! ســـیات
قەســـەم بـــە دیـــدەی ســـێوەنگی ســـیات[2]

بـــە زڵـــف حەبـــەش تـــا جـــە تـــا جیـــات
نیـــەن زینـــدەگیم نـــەوینوو بـــاڵات[3]

فێراقـــت بـــەی تـــەور وەنـــەم گێرتـــەن زۆر
دیـــدەم نابینـــان، زەیـــنم بیـــەن کـــۆر[4]

---

☜ سەرسامی: لێرەدا بە مانای گێژ و وێڵ بوونە. سارا: سەحرا، دەشت، مەزرا. واتە: کاتێک دڵم بێ تۆ گڕی نەگرت و نەبوو بە خەڵووز و نەمردم چیتر چۆن دەتوانم بڵێم وەفادارم و لە وەفای تۆدا دەوڵەمەندم و وەفای تۆ لە کاتی وێڵی و ئاوارەییم لە کەش و کۆدا تۆشەی ڕێگەمە.

-٦٦-

١- ل، بر.

٢- سیا: ڕەش. سێوەنگ: سێ جار ڕەنگ کراو، زۆر ڕەش. مانای ئەم بەیتە بەستراوە بە بەیتی دواییەوە.

٣- زڵف: زوڵف. حەبەش: وڵاتی حەبەشە، بە هۆی ڕەش پێست بوونی خەڵکی وڵاتی حەبەشە، حەبەشی بە مانای ڕەش هێناوە. تا: تاڵی موو. نیەن: نییە. نەوینوو: نەبینم. واتە: ئەی یار! قەسەم بە چاو و تاتای زوڵفە ڕەشەکانت ئەگەر باڵای تۆ نەبینم ژیانم نییە (ژیانم لێ حەرامە).

٤- فێراق: دووری، جیایی. بەی تەور: بەم جۆرە. وەنەم گێرتەن زۆر: زۆری لێم گرتووە، هێزی لێم بڕیوە. نابینا: کوێر. زەین: بیر، هۆش، هزر. واتە: دووری تۆ بە جۆرێک زۆری بۆ هێناوم کە چاو و زەینم کوێر بووە، نە هیچ دەبینم و نە لە هیچ تێدەگەم.

جـــه دووری بـــاڵات زامـــم خەتـــەرەن
هەناســـەم جـــه زڵــف تـــۆ ســیاتەرەن[١]

شـــەو و ڕۆ نـــە فکـــر خـــاڵان ســـێوەنگ
بیـــەنان وە نـــەقش فـــەرهاد کەنـدەی سـەنگ[٢]

چـێش مـــەبۆ دیـــذەم! ســاڵێ بـــە جـــارێ
بـــــاوەریم وە یـــــاذ وە یادگـــــارێ؟[٣]

یـــا تـــایێ جـــه زڵــف ســیای موشـــکینت
یـــا دانـــەی جـــه خـــاڵ دەور جـــەمینت[٤]

---

١- زامی خەتەر: زامێک کە خۆش بوونەوەی نییە و نەبێتە هۆی مردن. سیاتەر: ڕەشتر. واتە: لە دووری باڵات زامی بێ دەرمانم تووش بووە و هەناسەم لە زوڵفەکانی تۆ ڕەشترە. مەبەستی ئەوەیە بڵێت دەروونم ئاگری گرتووە و بە جێی هەناسە دووکەڵ لە دەممەوە دێت.

٢- شەو و ڕۆ: شەو و ڕۆژ. سێوەنگ: زۆر ڕەش. نەقش: نەخش، وێنە. نەقش فەرهاد کەندەی سەنگ: بێ جم و جووڵ، دەڵێن فەرهاد وێنەی خۆشەویستەکەی (شیرین) لە ڕووی بەردێکدا هەڵکەندووە، لێرەدا بێسارانی جیا لەوەی ئاماژە بە خۆشەویستی فەرهاد بۆ شیرین دەکات، خۆیشی بە وێنەیەکی سارد و بێ گیان و بێ جم و جووڵ دێنێتە ئەژمار. واتە: شەو و ڕۆژ هێندە لە فکر و خەیاڵی خاڵە ڕەشکانتام وەکوو وێنەی سەر بەرد هیچ جم و جووڵ و حەرەکەم نەماوە.

٣- چێش مەبۆ: چی دەبێت. ساڵێ جارێ: ساڵێ جارێک، ساڵێ یەک جار. باوەریم وە یاذ: بە یادم بهێنی، یادم بکەی. مانای ئەم بەیتە و دوو بەیتی دوایی پێکەوەن.

٤- تایێ: تاڵێک، تاڵێ. زڵف: زوڵف. موشکین: بە وێنەی موشک ڕەش و بۆنخۆش. جە: لە. جەمین: ڕوخسار، ڕوومەت. مانای ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو و بەیتی دوایی پێکەوەن.

یـا زەڕێ جـە مـەیل عەهـد و وەفـای پـێش
بکیـانی پـەرێم پـەی سـاکنی ئـێش؟[١]

وەرنـە یـا مـەردم، سـپی سـەوڵ قامـەت!
دەعـوای مـن و تـۆ کـەوت ئـەو قیامـەت[٢]

***

-٦٧-[٣]

چـراخم! شـەندی، چـراخم! شـەندی
تـۆ تـوخم هێجـران وە بـەختم شـەندی[٤]

---

١- زەڕێ: زەڕەیەک، تۆزێ. بکیانی: بنێری. پەرێم: بۆم، بۆ من. پەی: بۆ. ساکنی: ئارام گرتن. واتە: ئەی نووری چاوەکانم! چی دەبێت ساڵی جارێک بۆ یادگاری یادم بکەیت و تاڵێک لە زوڵفە ڕەشە بۆنخۆشکانت یا خاڵێک لە خاڵە ڕەشەکانی دەوری ڕوومەتت یا تۆزێ لە مەیل و وەفای پێشووت بنێری تا ئازارەکانم ئارام بگرن؟

٢- وەرنە: ئەگینا، ئەینا. یا: ها، ئەوە. مەردم: مردم، گیانم دەرچوو. سەوڵ: گوڵی پۆپەکەڵەشێرە، گیایەکی جوانە کە گوڵی زەرد و سوور و وەنەوەشی هەیە بە فارسی «تاج خروس» و «زلف عروسان» پێ دەڵێن بەڵام نازانم لەبەر چی بێسارانی لێرەدا وتوویە «سپی سەوڵ» چون گوڵی سپی ناکات، زیاتری گوڵەکانی وەنەوشن. دەعوا: شەرع. واتە: ئەی کە قامەتت لە سەوڵی سپی دەچێت ئەگینا ئەوە من مردم و شەرعی من و تۆ دەکەوێتە قیامەت.

-٦٧-

٣- ن، ک، ئێ، س، م، ل ع، ب، ح، ر، ئا، عم، ی.

٤- شەندی: وەشاندت، چاندت. توخم: تۆم، توو. هێجران: دووری. واتە: ئەی یار! تۆ تۆمی دووریت بە بەختی مندا وەشاند.

تــــۆ وەشـــی دنیـــا جـــە دەســـتم ســـەندی
تـــۆ ڕیشـــەی نەشـــات زێنـــدەگیم کەنـــدی[١]

تـــۆ جـــام زوخـــاو مەینـــەت پـــێم نۆشـــای
تـــــۆ ســـــیادەوار وە جەســــــتەم پۆشـــــای[٢]

تـــۆ وە گـــــەردەنم خـــەمان کـــەردی بـــــار
تـــۆ کـــەردی ســـۆمای نـــوور دیـــدەم تـــار[٣]

تـــۆ وســـتا جـــە تـــەخت مەرتەبـــەی شـــاهی
تـــــۆ دای وە دەســـــتم عەســـــای گـــــەدایی[٤]

---

١- وەشی: خۆشی. سەندی: سەندت، ئەستاندت. نەشات: خۆشی و شادی. واتـە: تـۆ خۆشـی ئـەم دنیات لێم سەند و ڕیشەی شادی و کەیفی ژیانمت لە ڕیشە دەرهێنا.

٢- جام: پیاڵە. پێم نۆشای: پێمت خواردەوە، بە دەرخواردت دام. سیادەوار: چادری ڕەش، ئەو چادر یا دەوارەی لە مووی بزن دروست دەکرێت و هەوارنشینان تێیـدا دەژیـن. وە جەسـتەم پۆشـای: لەبـەرت کردم. واتە: تۆ پیاڵەی زوخاوی مەینەتت بە دەرخواردم دا و دەواری ڕەشت بە بەرمدا کرد.

٣- گەردنم: ملم. کەردی بار: بارت کرد. سۆمای نوور دیدەم: سۆمای چاوم. تار: لێـڵ. واتـە: بـۆچی خەمانت خستە ملم و نووری چاوانمت لێڵ کرد.

* تێبینی: مامۆستا عەبدوڵڵای حەبیبی تەنیا مانای وشەکانی نووسیبوو و شەرحی نەکردبوو. بـۆ هـەورامی زمانـەکان ئاسـانە و پێویسـت بـە شـەرح کردنـی نییـە بـەڵام مـن بـە سـۆرانی شـەرحم کرد.(وەرگێڕ)

٤- وستا: خستت. مەرتەبە: پلە و پایە. عەسا: گۆچان. گەدایی: هەژاری. واتە: تۆ منـت لەسـەر تەختی پاشایی خستە خوارەوە و گۆچانی هەژاریت دا بە دەستمەوە.

تـــۆ لۆنـــگ مـــەجنوون وســـتی وە شـــانەم
تـــــۆ دەســــــتەی ئـــایر وەردای وە یانــــەم[١]

چـــراخم! ئـــەر هـــەن جـــەفات جـــەی فێشـــتەر
ســـــزام دەر ســـــزا ڕۆ بـــــە ڕۆ بێشـــــتەر[٢]

ئەرســـــەد هێجرانـــــت وە جەســـــتەم بـــــارەن
دڵ بـــــە جـــــەفای تـــــۆ هـــــەر گرفتـــــارەن[٣]

***

١- لۆنگ: پەڕۆیەک کە لە بێ جل و بەرگیدا لە دەوری خۆیانی دەئاڵێنن، لێرەدا مەبەست ئەو پەڕۆیەیە کە مەجنوون لەسەر شانی خست و لە تاوی عەشقی لەیلا دای بە کەش و کێواندا. وستی: خستت، دات بە. ئایر: ئاگر، ئاور. وەردای: بەرتدا. یانە: ماڵ خانوو، لانە. واتە: تۆ بووی بە هۆی ئەوەی پەڕۆ شڕەکەی مەجنوون بدەم بە شانمدا و ڕوو بکەمە کەش و کێو و تۆ بووی ئاگرت لە ماڵم بەردا.

٢- ئەر هەن: ئەگەر هەیە. جەی: لە ئەمە، لەمە. فێشتەر: زۆرتر، زیاتر. سزا: جەزا بە خراپە. عەزاب دان، تۆڵە سەندنەوە. دەر: بدە. ڕۆبەڕۆ: ڕۆژبەڕۆژ. بێشتەر: زۆرتر، زیاتر. واتە: ئەی یار! ئەگەر لەمە زیاتر جەفای بێ وەفایی و ڕەنجت بۆم هەیە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاترم سزا بدە. لە زۆریەی نوسخەکاندا بە جێی «بێشتەر»، «بەدتەر» نووسراوە کە لەگەڵ «فێشتەر» سەروا نییە.

٣- ئەرسەد: هەر چەند. هێجرانت: دووریت. وە جەستەم بارەن: باری لاشەمە. واتە: هەرچەند دەردی دووریت وا بە سەر لاشەمەوە و باری لاشەمە، بەڵام دڵیش هەر گرفتاری بێ وەفایی تۆیە. مەبەستی ئەوەیە هەرچەند لێم دووری و دەردی دووریت لە جەستەم بارە، دڵیشم هەر گرفتاری بێ وەفاییتە.

-٦٨-[1]

چــــراخم! شــــەهید، چــــراخم! شــــەهید
وەختــــێ بــــە نگــــات مەکــــەریم شــــەهید[2]

بــــۆ بەشــــق خــــوڎای حەمیــــد و مەجیــــد
جــــە زڵــــف سیــــات تــــاییۆوە وەحیــــد[3]

وزەم نــــە گــــەردەن بــــە وێنــــەی زوننــــار
بــــەو زوننــــارەوە مەشــــوو وە مــــەزار[4]

-٦٨-

١- ن، ک، س، ب، ح، ئا، ڕ، عم.

٢- شەهید: کوژراو. نگات: سەیر کردنت. مەکەریم: دەمکەی. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی بەستراون بە بەیتی سێهەمەوە.

٣- بۆ: بێ، وەرە. بەشق: بە عەشق، بە خاتری. حەمید: ستایش کراوە، یەکێک لە ناوەکانی خودا. مەجید: پلە وپایە بەرز، یەکێک لە ناوەکانی خودا. تا: تاڵی زوڵف. سیا: ڕەش. وەحید: تاق، تەنیا، تاک. مانای ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٤- وزەم نە گەردەن: بیخەرە ملم. زوننار: پارچە قوماشێک کە مەسیحیەکان لە خۆیانەوە ئاڵاندووە بۆ ئەوەی لە موسوڵمانان جیا بکرێنەوە. مەشووم: دەڕۆم، دەچم. مەزار: گۆڕ، قەبر. واتە: ئەی یار! کاتێک بە سەیرکردن دەمکوژیت وەرە و بۆ خاتری خودا تاڵێک لە زوڵفە ڕەشەکانت بە وێنەی زوونار بخەرە ملم. من بە ئەو زوننارەوە دەچمە گۆڕ. لە بەیتە دواییەکاندا دەڵێت کە ئەو زوڵفەی بۆچییە.

تـــا ئـــەر مەلـــەکان بـــەيانێم وە ســـەر
وينـــان بـــە زوننـــار تـــۆم بەســـتەن کەمـــەر [١]

شـــەرم زلـــف لـــوول ســـيات کـــەرانێ
عـــــەزاب دۆزەخ پـــــێم نـــــەدەرانێ [٢]

✵✵✵

-٦٩- [٣]

چـــراخم! کامـــەن؟ چـــراخم! کامـــەن؟
مابـــەين دۆســـتی مـــن و تـــۆ کامـــەن؟ [٤]

---

١- ئەر: ئەگەر. مەلـەکان: مـەلائيکـە، فريشـتە. بـەيانێم وە سـەر: بێنـە سـەرم. وينـان: ببيـنن. بەستەن: بەستووە. مانای ئەم بەيتە و بەيتی دوايی پێکەوە دێن.

٢- کەرانێ: بکەن. نەدەرانێ: نەدەن. واتە: ئەو تاڵە زوڵفە بخەرە ملم تا کاتێـک دەمنێنـە گـۆڕ لـە ملمدا بێت تا ئەگەر مەلائيکە هاتنە سەرم ببينن من زونناری تـۆم بەسـتووە، شـەرمی زوڵفـەکانت بيانگرێت و عەزابی قيامەتم پێ نەدەن. لە نوسـخەی «ک»دا نيـوە بـەيتی دووهـەمی بـەم جـۆرە نووسراوە: «هێجران عەزاب بەدۆ نەدەرانێ».

-٦٩-

٣- ن، ک، س، ب، ح، ئا، ر، عم.

٤- کامەن: کامەيە. مابەين: نێوان. واتە: ئەی يار! چيتر دۆسـتی نێـوانی مـن و تـۆ کامەيـە؟ لـە بەيتە دواييەکاندا هۆکەی دەڵێت.

نــه عــەرزەت عــەرزەن، نــه نامــەت نامــەن
مــەر قــاتی کاغــەز دۆعــا و ســڵامەن؟[1]

مــەر پــەڕەی کاغــەز بڕیــان جــه شــاران
ســـیاش بکـــەری پـــەی دەردەداران؟[2]

یــا کاغــەز بڕیــان، یــا مــەڵڵا مــەردەن
یــا خــۆ عارتــەن جــه دۆس یــاد کــەردەن[3]

---

١- عەرزە: نامەیەک کە بۆ لە خۆت گەورەتری بنووسیت، لێرەدا بە مانای نامەیەکە کە حاڵ و وەزعی خۆتی تێدا بنووسیت. مەر: مەگەر. واتە: نە عەرزەیەکی ڕێک و پێکت نارد و نە نامەیەکی ڕێک و پێکت نووسی. مەگەر قات و قڕی کاغەزە کە دۆعا و سڵاومان بۆ بنێری؟

٢- بڕیان: بڕاوە. سیاش بکەری: ڕەشی بکەیتەوە، تێدا بنووسیت. پەی: بۆ. واتە: مەگەر لاپەڕەی کاغەز لە شاران بڕاوە کە شتێکی تێدا بنووسی و بینێری بۆ دەردەداران؟

٣- مەڵڵا مەردەن: مەلا مردووە،ئەو کاتە خوێنەواری ئاوایی تەنیا مەلای ئاوایی بووە و ئەگەر کەسێک بیویستایە نامەیەک بۆ کەسێکی بنووسێت دەچووە لای مەلای ئاوایی بۆی دەنووسی، لێرەدا بێسارانی دەڵێت کاغەز نەماوە یا مەلای ئاوایی مردووە کە نامەت بۆ بنووسێت. عارتەن: پێت عارە، پێت عەیبە. کەردەن: کردن. واتە: کاغەز نەماوە یا مەلا مردووە؟ یا هەر پێت عەیبە کە دۆستەکانت بەسەر کەیتەوە و یادیان بکەیت؟ لە سەرچاوەی «ح»دا بە دوای ئەم بەیتەدا بەیتێکی دیکە هاتووە کە لە هیچ کام لە سەرچاوەکانی دیکەدا نییە و ماناکەیشی بە شێعرەکە ناخوات:

غــەمگین مەنیشــه غــەم بــەدەر وە بــاد    فەڵــەک نمــازۆ کــەس وە خــاتر شــاد

وەرنـــە یـــانیٚ چـــێش بینـــایی چـــاوان
وســـتەنت وە بێـــز بەنـــدەی بـــیٚ تـــاوان؟[١]

☆☆☆

-٧٠-[٢]

چـــراخم! کـــەردم، چـــراخم! کـــەردم
ئێمشـــەو بـــە خـــەیر بـــۆ یـــادیٚ تـــۆ کـــەردم[٣]

جـــە دووروەتـــەنیت گـــران بـــی دەردم
ســـەد پایـــە جـــە پـــای مـــەردەن ویـــەردم[٤]

ئەوەنـــد زایـــف بـــیم جـــە ناڵینمـــدا
دیـــم ئەجـــەڵ ئامـــا وە باڵینمـــدا[٥]

---

١- وەرنە: وەگەرنە، ئەگینا، ئەینا. یانیٚ چێش: یانی چی. وستەنت وە بێز: بێـزراوی، بێـزاری، لەبـەر چاوت کەوتووە. واتە: ئەگینا نووری چاوانم یانی چی ئەم بەندەی بیٚ تاوانەت لەبـەر چـاو کـەوتووە و چیتر نامەی بۆ نانووسیت. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هەیە.

-٧٠-

٢- ن، ک، ح، ئیٚ، س، ع، م، ب، ر، عم.

٣- کەردم: کردم. ئێشەو: ئەمشەو، ئیمشەو. بە خەیر بۆ: خێر بێت. واتە: ئـەی یـار! ئەمشـەو بـە خەیرییەت یادی تۆم کرد (بە لای ناخێرمەوە یادی تۆم کرد).

٤- مـەردەن: مردن. ویـەردم: دەرچووم، گوزەرام. واتە: لەبەر ئەوەی تۆ دوورە وەتەنیت مـن دەردم گـران بووە و سەد جار لە مردن دەرچووم. واتە دەردم لە مردن سەد جار سەختترە.

٥- ئەوەند: ئەوەندە، هێندە. زایف: لاواز. بیم: بووم. ئاما: هات. باڵین: ژوورسەر. مانای ئەم ☜

هــەر یەنــد پــەیم گــێڵا نەژنــەوا دەنگــم
ئــەو پێســەش زانــا مــن سیاســەنگم[1]

فیــدات بــام ئــازیز کوشــتەو تۆنــانێ
ئەجــەڵ نــەزاناش مــن جــە کۆنــانێ[2]

***

-٧١-[3]

چــراخم! کــەرەم، چــراخم! کــەرەم
ئەگــەر کــەرەمدار بکــەرداش کــەرەم[4]

---

☞ بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

١- یەند: هێندە. پەیم گێڵا: بۆم گەڕا. نەژنەوا: نەیبیست. پێسەش زانا: وای زانی. سیاسەنگ: بەردی ڕەش. واتە: بە هۆی دوورە وەتەنی تۆ هێندە لاواز و بێ گریک کەوتبووم کە ناڵەم دەکرد و بینیم ئەجەڵ هاتە ژوور سەرم کە گیانم بکێشێت بەڵام هەرچی بە دوومدا گەڕا دەنگی ناڵەمی نەبیست و نەیبینیم و وای زانی بەردێکی ڕەشم لەوێدا کەوتووم.

٢- فیدات بام: بە قوربات بم. کوشتەو تۆنانێ: کوژراوی تۆم. نەزاناش: نەیزانی. من جە کۆنانێ: من لە کوێدام. واتە: ئازیز بە قوربانت بم! ئەجەل بە دوای زیندوودا دەگەڕێت کە گیانی بکێشێت بەڵام لەبەر ئەوەی من پێشتر کوژراوی تۆم چیتر ئەجەل نەیتوانی بمدۆزێتەوە و نەیزانی لە کوێدام.

-٧١-

٣- ن، ک، س، ح، ب، نێ، ع، ڕ، عم.

٤- کەرەم: بەخشین، دەس و دڵ بازی. کەرەمدار: کەسێک کە ساحێب بەخشینە. دەس و دڵ باز، خودا. بکەرداش: بکردایە. واتە: ئەی یار! ئەگەر خودا کەرەمی بکردایە.

شـــەوێ ئێمـــە و تـــۆ بیـــاواین وە هـــەم
مـــن چـــوون پەروانـــە تـــۆ بـــە وێنـــەی شـــەم[١]

لـــەب بـــە لـــەب بنیـــام، نـــاف بـــە نافـــەوە
ســـینە بـــە ســـینەی ســـیم ســـافەوە[٢]

تـــا ســـوب بنیامـــان ســـەر وە یـــەک ســـەرین
کـــــەرداماان ڕازان ویـــــەردەی وەریـــــن[٣]

قیبلـــەم! جـــەو دمـــا ئەگـــەر مەمـــەردم
پـــەی مـــەردەنی وێـــم شـــاذێ مەکـــەردم[٤]

٭٭٭

١- بیاواین: بگەیشتینایە. وە هەم: بە یەک. چوون: وێنەی، وەکوو. واتە: من و تۆ شەوێک بە یەک بگەیشتینایە، من بە وێنەی پەپوولە و تۆیش بە وێنەی شەم.

٢- لەب: لێو، لچ. ناف: ناوک، نێوک. سیم: زێو، نوقرە. واتە: لێو لەسەر لێو ناوک لە سەر ناوکمان بنایە و سینەم لەسەر سینەی ساف و سپی وێنەی زێوت بنایە. لە سەرچاوەی «ح»دا ئەم بەیتە نەهاتووە.

٣- سوب: بەیانی، کازیوە. بنیامان: بمانتنایە، بماننا. کەردامان: بمانکردا، بمانکردایە. ڕاز: قسە. ویەردە: ڕابردوو. وەرین: پێشوو. واتە: تا بەیانی سەرمان لەسەر یەک سەرین(سەنیا) دابنایە و قسەی ڕابردوومان بۆ یەک بگێڕایەتەوە.

٤- جەو دما: دوای ئەوە، پاشان. مەمەردم: دەمردم. پەی: بۆ. وێم: خۆم. مەکەردم: دەمکرد، دەکردم. واتە: ئازیزم! ئەگەر دوای ئەوەیش دەمردم بۆ مردنم شادیم دەکرد.(باکم لە مردن نەبوو.)

-٧٢-[1]

چـــراخم! گـــوڵان، چـــراخم! گـــوڵان
ئـــەر بـــێ تـــۆ بڎیـــەو مـــن وە ڕووی گـــوڵان[2]

بـــەری بـــوو جـــە ســـۆز ناڵـــەی بولبـــوڵان
هـــام دەرد بـــوو چـــەنی دەرد بـــێ دڵان[3]

ئـــەر چەمـــەن بـــێ تـــۆ بوینـــوو بـــە چـــەم
دڵ بـــە ئەســـر خـــەم چـــەم بـــڎەرۆ نـــەم[4]

---

-٧٢-

١- ن، ح، ک، ئێ، س، ب، ئا، ڕ، عم، مج.

٢- ئەر: ئەگەر. بڎیەو: بڕوانم، سەیر بکەم. واتە: ئەی یار! ئەگەر من بە بێ تۆ سەیری ڕووی گوڵان بکەم....

٣- بەری بوو: بێ بەش بم. چەنی: لەگەڵ. واتە: بەڵکوو لە سۆزی ناڵـەی بولبـوڵان بـێ بـەش بـم و دەنگیان نەبیستم و ببم بە هاودەردی ئەوانەی کـە دڵیـان نییـە و لـە عەشـق و خۆشەویسـتی هـیچ تێناگەن.

٤- چەمەن: سەوزەڵانی. بوینوو: ببینم. چەم: چاو. ئەسر: ئەسرین، فرمێسک. بڎەرۆ: بدات. نـەم: نم، تەڕایی. واتە: ئەگەر من بە بێ تۆ سەیری سەوزەڵانی و شینایی بکەم خوابکـات بـە ئەسـرینی خەمی چاوانم دڵیشم تەڕ بێت. (هێندە ئەسرینی خەم لە چـاوانم بڕژێـت دڵیشـم تـەڕ بکـات). لـە سەرچاوەی «ح»دا نیوەبەیتی دووهەم بەم جۆرە نووسراوە: «من جێم بە هووناو موژگان بـڎۆ نـەم» و لە سەرچاوەی «ب»دا بەم جۆرەیە: «من چەم بە هووناو موژگان بڎۆ نـەم» و لـە سـەرچاوەی «ن»دا بەم جۆرە نووسراوە: «من چەم بە موژگان هوونین بڎەو نەم».

جــە بــێ دەردان بــوو، دڵ بــە وێنــەی ســەنگ
ســـەنگێ ڕووبـــەڕووی ئـــادەم مـــەدۆ دەنـــگ[١]

ئـــاخر زێنـــدەگیم بــــێ تـــۆ بەتاڵـــەن
ئـــەر کەمتـــەرێو بـــۆ خـــاو یـــام خەیاڵـــەن[٢]

❋❋❋

-٧٣-[٣]

چـــراخم! گـــەردان، چـــراخم! گـــەردان
بڎیـــە وە گەردشـــت گـــەردوون گـــەردان[٤]

---

١- ئادەم: بەشەر، ئینسان، مرۆڤ، مرۆ. مەدۆ: دەدات، ئەدات. واتە: خودا بکات لەو کەسانە بم کە دەردی ئەوینیان نییە و دڵم بە وێنەی بەردێک بێت کە لە بەرانبەری مرۆڤدا دەنگ دەداتەوە. ئەگەر مرۆڤ لە بەرانبەری بەردی گەورە (کێو) بە دەنگی بەرز شتێک بڵێت دەنگ دەداتەوە، لێرەدا بێسارانی مەبەستی بەردی ڕەقە، واتە خودا بکات دڵم ببێت بە بەردێکی ڕەق.

٢- کەمترێو: کەمێک. خاو: خەو. واتە: (ئەمانەی کە وتم لەبەر چی بوو؟) لەبەر ئەوەی کە ژیانی من بە بێ تۆ بێ سوود و کەڵکە و ئەگەر کەمترین ژیانێکم بێت هەر خەون و خەیاڵە.

-٧٣-

٣- ن، ک، ئێ، س، ب، ح، ئا، ڕ، عم.

٤- گەردان: هەر شتێک بچەرخێت یا هەڵبخولێت. بڎیە: بڕوانە، سەیرکە. گەردشت: گەڕان. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

ئــەمن هێجــرانکــێش خــەم زەدەی دەردان
چــــوونش کـــەردەنا وێـــڵ ســـەرگەردان[١]

نـــە بـــە جایێـــدا یـــەک ســـات مـــودارام
نـــە خـــۆ یـــەکجار وێـــڵ گەردیـــدەی ســـارام[٢]

گـــا عـــەزم تەنجـــەی مـــاوای توونمـــەن
گـــا تـــەمای وەســـڵت نـــە دەروونمـــەن[٣]

---

١- هێجران: دووری. خەم زەدەی دەردان: پێکـراوی خـەمی دەردان. چـوون: چـۆن، بـە چ شـێوەیک. چوونش کەردەنا: چۆنمی کردووە. واتە: ئەی یار! سەیری دەورانی زەمانە بکە چۆن دەگـەڕێت کـە وای پێ کردووم دەردی دووری دەکێشم و پێکراوی خەمی دەردانم و وێڵ و سەرلێشێواوی کردووم.

٢- مودارا: ئارام و قەرار. گەردیدە: کەسێک کە زۆر دەگەڕێت، گەڕیدە. سارا: سەحرا، دەشت و دەر. واتە: (کارێکی وای پێ کردووم) نە لە جێیەک بۆ ساتێک ئارام و قەرارم هەیە و نە بە یەکجاری وێڵی دەشت و دەر و سارام و دەگەڕێم.

٣- گا: هەندێ جار. عەزم: نیەت. تەنجە: طنجە، یەکێک لە شارە گەورەکانی وڵاتی مەراکێشـە کـە ئەوسا لەسەر ئەو باوەڕە بوون نزیکی کێوی قافە و لێرەدا وەک وڵاتێکـی دوور نـاوی هـاتووە. تـوون: لێرەدا بە مانای بیابانی چـۆڵ و گەرمـە بـەڵام لـە بنـەمادا تـوون نـاوی شـارێکە کـە ئێسـتە نـاوی «فیردەوس»ـە و ناوەندی پارێزگای خوراسانی باشوورییە لە ئێراندا، ئەم وشـە زیـاتر لەگـەڵ وشـەی «تەوەس»دا دێت کە ئەویش هەر شارێکە لە نزیکی توون، توونائوتوون، بە توون، بە توون و تـەوەس، سـەرچاوەیان یەکێکـە، وادیـارە لەبـەر زۆر گـەرم بوونیـان کەوتوونەتـە سـەر زاران. تـەما: تـەماح، چاوەڕوانی. واتە: جاری وایە دڵم پێوەیە بچمە تەنجەی شوێنی توون و جاری وایش هەیە دڵم پێوەیـە بگەم بە تۆ. بە ڕێک و پێکی نەمزانی بۆچی وتوویە «تەنجەی ماوای توون». لـە نوسـخەی «م»دا ئەم بەیتە لە پارچە شێعری «چراخم تەناف»دا هاتووە.

مەگــــەر خوداوەنـــد حـــەکیم نــــەردباز
نـــەرد خـــەیر وە بـــەخت مـــن بکـــەرۆ ســاز[١]

ئـــــەودی بگێڵــــۆ دەوران بـــــە چـــاخم
شــاد کـــەرۆ بـــە شـــەوق شـــۆڵەت چـــراخم[٢]

☆☆☆

-٧٤-[٣]

چــراخم! مـــەیل کـــە، چـــراخم! مـــەیل کـــە
بـــۆ جـــارێ وە گەشـــت چەمـــەنان مـــەیل کـــە[٤]

---

١- حەکیم: زانا، زۆرزان، کەسێک کە کارەکانی لە جێی خۆیدان. نەردباز: کەسێک کـە مـۆرەی نـەرد هەڵدەخات. مەبەست ئەوەیە هەرچی بۆ هەرکەس پێش دێت کاری خودایە. بکـەرۆ: بکـات. واتـە: مەگەر خودا خۆی بەختم بە خێر بکات.

٢- ئەودی: دیسان، پاشان، دوای ئەوە. بگێڵۆ: بگەڕێت، هەڵبسووڕێت. چاخ: کەیف. کەرۆ: بکـات. واتە: مەگەر ئەوسا دەوران بە کەیفی من بگەڕێت و بە شەوقی شۆڵەی تۆ چرای مـن دایسـێ. بـە کوردی و کورتی: مەگەر خودا کارێک بکات من بە تۆ بگەم.

-٧٤-

٣- ن، ک، ئێ، س، ب، ح، ئا، ر، عم.

٤- بۆ: بێ، وەرە. گەشت: گەڕان، سەیران. چەمـەنان: کـۆی «چەمـەن»ـە بـە مانـای سـەوزەڵانی، شینایی. واتە: ئەی یار! جارێک تەشریف بێنە بۆ سەیران لە نێو سوزەڵانیدا.

تەماشای ڕەنگ بەست ڕەشتەی سوهیل کە
خەزانان دامان جە عەنبەر کەیل کە[1]

نەوسوهیل جە موڵک یەمەن بەرئامان
پۆشنان ڕەنگ ڕەنگ باڵای نەمامان[2]

وایەش هەر ئێدەن ناکا تۆ جارێ
ڕا وزی وە ڕەنگ ڕەشتەش گوزارێ[3]

---

١- ڕەنگ بەست: ڕەنگاڵە، ڕەنگاوڕەنگ، ڕەنگ کراو. ڕەشتەی سوهیل: ڕەشتراوی سوهیل، بە دەستی سوهیل ڕەنگ کراو. سوهیل: دووهەمین ئەستێرەی ڕووناکی ئاسمان کە لە سەرەتای پاییزدا هەڵدێت و هەڵهاتنی هاوکاتە لەگەڵ زەرد و سوور بوونی گەڵای داران هەر بۆیە پێشینیان وتوویانە هەڵهاتنی سوهیل دەبێتە هۆی زەرد و سوور بوونی گەڵای داران و وتوویانە «ڕەشتەی سوهیل» یانی سوهیل ڕەنگی کردوون و ڕەنگی گۆڕاون. عەنبەر: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆشە. کەیل: پڕ، لیپ. واتە: وەرە سەیری ڕەنگاڵەیی گەڵای داران بکە کە سوهیل ڕەشتوویە و داوێنی داران لە بۆنخۆشی عەتر و عەبیری خۆت پڕ بکە.

٢- جە: لە. موڵک یەمەن: وڵاتی یەمەن، ئەستێرەی سوهیل یەکەم جار لە وڵاتی یەمەنەوە بە باشی دەبینرێت و بەو بۆنەوە وتوویانە لە یەمەنەوە هەڵدێت. بەرئامان: دەرهاتووە، هەڵهاتووە. پۆشنان: پۆشیوە، لەبەری کردووە. واتە: ئەستێرەی سوهیل لە وڵاتی یەمەنەوە هەڵهاتووە و جل و بەرگی ڕەنگاوڕەنگی کردووە بە بەری نەمامەکاندا. نەمامەکانی شوبهاندووە بە بەشەر و گەڵا ڕەنگاڵەییەکانیشی شوبهاندووە بە جلی ڕەنگاوڕەنگ. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەکانی «ک»، «ئێ» و «ئا»دا هەیە.

٣- وایە: ئاوات، ئارەزوو. هەر ئێدەن: هەر ئەمەیە. ناکا: نائاگا، کوتوپڕ. ڕا: ڕێگە. وزی: بخەی. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوەن.

سـوەیل پـێ شـاذەن، خـەزان ڕەنـگ نـۆ
بگێـرۆ بـە شـەوق، شـێوەی ڕەنـگ تـۆ[١]

***

-٧٥-[٢]

چـراخم! نـە جـەرگ، چـراخم! نـە جـەرگ
هێجـران دووریـت چنـگ پێکـا نـە جـەرگ[٣]

سـەرتاپام سـیان، قەڵاخیمـەن بـەرگ
هـەر ڕۆ مـەوازوون سـەد ئـاوات وە مـەرگ[٤]

---

١- پێ شاذەن: پێی شادە، پێی خۆشحاڵە. بگێرۆ: بگرێـت. واتـە: سـوەیل ئـاوات و ئـارەزووی هـەر ئەوەیە تۆ کوتوپڕ بە ڕێبواری بێیت و ڕێگەت بکەوێتە ئەو شوێنە کـە ئـەو ڕەشـتوویە و هـەروەها زۆری کەیف لێیە گەڵا خەزان لێدراوەکان بە شەوقەوە لە شێوەی ڕەنگی تۆ، ڕەنگێکی تازە بە خۆیانەوە بگرن. مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر تۆ ڕێگەت بکەوێتە لای گـەڵا خـەزان لێـدراوەکان بـە شـەوقەوە ڕەنگی تازە لە تۆ دەگرن کە لە ڕەشتراوی سوەیل جوانترە و ئاواتی سوەیل هەر ئەوەیە.

-٧٥-

٢- ن، ک، ئێ، س، م، ب، ح، ئا، ج، ڕ، عم.

٣- واتە: ئەی یار! دەردی دووری تۆ چنگی خستە جەرگم (ئـەی یـار! دەردی دووری تـۆ جـەرگمی زامدار کرد «وەرگێڕ»).

٤- سیان: ڕەشە. قـەڵاخی: ڕەش. بـەرگ: جـل و بـەرگ، لیبـاس. هـەر ڕۆ: هـەر ڕۆژ. مـەوازوون: دەخوازم. واتە: سەر هەتا پێم ڕەشە و جل وبەرگم لە جل و بەرگی ئازیەتباران دەچێـت و ڕۆژێ سـەد کەڕەت ئاوات بە مەرگی خۆم دەخوازم.

دیــــدەم بــــێ نــــوورەن جــــە تــــاو ئەســــرین
هــــوون جــــێش مــــەتکیۆ چــــوون سفتەبــــرین [١]

جەوســــاوە دیــــدەم دوور کەوتــــەن جــــە تــــۆ
لــــێلاویش لێلــــەن، لێلاوتــــەر مــــەبۆ [٢]

ڕۆشــــنی بەســــات وە دیــــدەم تــــارەن
شــــادی و زێنــــدەگیم چــــوون ژار مــــارەن [٣]

کەســــێ کــــە بــــەی تــــەور حــــاڵ جەســــتەش بــــۆ
دەرد بــــێ دەرمــــان جــــێنەڕەســــتەش بــــۆ [٤]

---

١- دیدەم بێ نوورەن: چاوم ڕۆشنایی تێدا نەماوە. هوون: خوێن. جێش: لێی. مەتکیو: دەتکێت، دەڕژێت. چوون: وێنەی، وەکوو. سفتەبرین: برینی سووتاو. واتە: چاوم لە تاوی ئەسرین بێ نوور بووە و هیچ نابینم و بە وێنەی زامی سووتاو خوێنی لێ دەتکێت. خوێنێک کە لە زامی سووتاو دەتکێت ئاوی زامەکەی تێکەڵە، لێرەدا بێسارانی ئەسرینی چاوانی کە تێکەڵی خوێنیەتی شوبهاندووە بە ئەو خوێنی زامە.

٢- جەوساوە: لەو کاتەوە. دوور کەوتەن: دوورکەوتوەتەوە. لێلاوی: کوێری چاوان. مەبۆ: دەبێت. واتە: لەو کاتەوە چاوم لە تۆ دوور کەوتوەتەوە و تۆ نابینم لێلاویان داهاتووە و خەریکە لە دووری تۆ لێل تریش دەبن.

٣- بەسات: داخراو، بڵاوکراوە، وڵات، سەرزەمین. تار: تاریک. چوون: وێنەی، وەکوو. ژار: ژەهر. واتە: ڕووناکی دنیا بە لامەوە تاریکە و ژیانم بە وێنەی ژاری مار تاڵە.

٤- بەی تەور: بەم جۆرە، بەم شێوە. جەستە: لاشە. بۆ: بێ، بێت. جێنەڕەستە: لێ دەرنەچوو، لێ نەجات نەبوو. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

خاسش هەر ئێذەن مەرگش مێمان بۆ
مەگەر ئەو بە مەرگ دەردش دەرمان بۆ[١]

***

-٧٦-[٢]

چراخم! نە دڵ، چراخم! نە دڵ
دڵ پەڕ ئایرەن، بۆ وەس شۆم نە دڵ[٣]

نازکتەرەنی تۆ جە پەڕەی گوڵ
نەداری تاقەت، زڵف شاخ سونبوڵ[٤]

١- خاسش هەر ئێذەن: خاسەکەی هەر ئەمەیە. مێمان: مێوان، میوان. واتە: کەسێک کە حاڵی جەستەی بەم جۆرە بێت و دەردێکی بێ دەرمانی بێت کە نەتوانێت لێی ڕزگاری بێت، هەر بۆ ئەوە باشە مردن ببێتە مێوانی چون تەنیا بە مردن دەردی دەرمان دەبێت.

-٧٦-

٢- ن، ک، ئێ، س، ب، ح، ئا، ڕ، عم، مج، ی.

٣- پەڕ: پڕ، لیپ، لێوانلێو. ئایر: ئاگر، ئاور. بۆ: بێ، وەرە. وەس: بەس. شۆ: بڕۆ. واتە: ئەی یار! من دڵم پڕ لە ئاگرە وەرە و بەس بڕۆ نێو دڵمەوە. لە بەیتە دواییەکاندا دەڵێت بۆچی نایەوێت یار بچێتە دڵیەوە.

٤- نازکتەرەنی: ناسکتری. زڵف: زوڵف، قژ. سونبوڵ: سمڵ، ناوی گیایەکی جوان و بۆنخۆشە کە گوڵی وەنەوش دەکات. شاخ سونبوڵ: لقی گوڵی سمڵ. واتە: ئەی تۆ کە پرچت لە لقی گوڵی سمڵ دەچێت، تۆ لە پەڕەی گوڵ ناسکتری و لە نێو ئەو ئاگرەدا تاقەت ناهێنی.

دڵ ئـــاخ مەکێشـــۆ، گـــڕ مـــەیۆ وە بـــەر
نـــــەبا نەیشـــــەڵڵا پێـــــت یـــــاوۆ زەرەر [۱]

تێـــــدا مەنیشـــــە هـــــەی بەرگوزیـــــدە
بـــۆ جـــات بکـــەروون وە بـــان دیـــدە [۲]

مـــوژەم هـــەم ئـــەبرووم کـــەرووت بـــە پـــەڕچین
تـــا پێـــت نـــەیاوۆ نـــاواک بـــەدبین [۳]

ئەوســـە تەماشـــای ســـەرجۆی ڕەوان کـــەر
بـــاڵات وێنـــەی ســـەڵو تـــێ دەس‌نیشـــان کـــەر [٤]

---

۱- مەکێشۆ: دەکێشێت. مەیۆ: دەبێت. نەبا: نەوەک. نەیشەڵڵا: نە ئیشەڵڵا، خودا نـەکات. یـاوۆ: بگات. واتە: کاتێ دڵم ئاخ هەڵدەکێشێت گڕی لێوە دێتە دەر، خوا نەکردە نەوەکوو زیانت پێ بگات.

۲- مەنیشە: دامەنیشە، مەمێنەرەوە. بەرگوزیدە: هەڵبژێراو، تاقانە. بۆ: بێ، وەرە. جات بکـەروون: جێت بکەمەوە. واتە: تاقانەکەم لە دڵمدا مەمێنەرەوە و وەرە با لە سەر چاوانمدا جێگەت بکەمەوە.

۳- موژەم: مژۆڵم، برژانگم. کەروو: دەکەم. پەڕچین: پەرژین، حەسار. نەیاوۆ: نەگات. ناواک: کـۆی «ناوەک»ـە بە مانای تیر. بەدبین: چاوپیس. واتە: مژۆڵ و ئەبرۆمت بۆ دەکەم بە پەرژین تـا تیـری چاو پیسانت پێ نەگات.

٤- ئەوسە: دوای ئەو، پاشان. سـەرجۆ: جۆگەلە، جۆبەلە. سەڵو: گیایـەکی جوانـە کـە گـوڵی زەرد و سوور و بەنەوش دەکات. دەس‌نیشان: دارنان بە دەست، دەکرێت بە مانـای نیشـان و دیـاری کـردنیش بێت. دەس نیشان کەر: بنێ، بینە، بیچەقێنە، دیاری بکە. واتە: دوای ئەوەی جێگەم بۆ خۆش کردی و پەرژینم بۆ دروست کردی سەیری چاوانم بکە کە بە وێنەی جۆگەلە ڕەوانە و باڵای وێنەی سـەوڵتی تێدا بنە یان تێدا دیاری بکە.

عەجـــەب یاگەتـــەن نـــەمام وایـــەم
پایـــە بوڵەنـــد بـــای پـــەریٚ سەرســـایەم[١]

☆☆☆

-٧٧-[٢]

چـــــــراخم! وازان، چـــــــراخم! وازان
مـــن جـــە خوداوەنـــد تـــۆم بـــاوات وازان[٣]

بـــەو شـــا کـــە شـــاهان پەنـــەش مـــەنازان
حەڵقـــەگۆش تـــۆم شـــای شـــەکەرڕازان[٤]

---

١- عەجەب: وشەیەکە کاتی سەرسوڕمان بە کاری دەبرێت، جێی سەرسوڕمانە. وایە: ئاوات، ئارەزوو. پایە بوڵەند بای: پایە بەرز بێت. پەریٚ: بۆ. سەرسایە: سێبەری سەر. واتە: ئـەی ئـەو نمامـەی کـە ئاواتی منی! عەجەب جێیەکت هەیە (نێو چاوانی من) خوا بکات پایەبەرز بیت و لەوێدا بە وێنەی نەمامێک گەشە بکەی و لق و پۆپت بکەی و سێبەرت زۆر بێت و سـەری مـن لـە سـێبەری تـۆدا بێت.

-٧٧-

٢- ن، ک، س، م، ل، ب، ح، ئا، ڕ، عم.

٣- وازان: خواستم، خواستوومە. باوات: بە ئاوات. واتە: ئەی یار! تۆم لە خودا بە ئاوات خواستووە.

٤- بەو: قەسەم بە ئەو. پەنەش: پێی. مەنازان: دەنازن. شـا کـە شـاهان پەنـەش مـەنازان: خـودا. حەڵقەگۆش: غوڵام، نۆکەر، ئەوسا گوێی غوڵامیان دەسـمی و حەڵقـەیان تێـدەکرد تـا دیـاری بێـت. شەکەرڕاز: قسەخۆش، کەسێک کە قسەی بە وێنەی شەکەر شیرینە. واتە: قەسەم بە ئەو خودایەی کە شاهان پێی دەنازن ئەی شاهی قسەی شیرینان من غوڵامی حەڵقە بە گوێی تۆم.

ئەگــەر گشــت ئاڵــەم شــەکەرڕازان بــان
ســاحیب شــەرت و شــۆن زڵــفدرازان بــان[1]

غــەیر جــە تــۆ فێشــتەر لــەیل جــەمین جـام
پــەرێو کــەس نیــەن خــاو وەنــەم حــەرام[2]

دڵ پابەنــــدی تــــۆن شـــای بەینــــەتداران
بــەو «بابــا شــێخ»ە مــاڵ جــە بێســـاران[3]

***

---

١- گشت: هەموو. ئاڵەم: عالەم، دنیا. بان: بن. ساحیب شەرت و شۆن: وەفادار. زڵف: زوڵف، پرچ. دراز: درێژ. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٢- غەیر جە تۆ: بێجگە لە تۆ. فێشتەر: زۆرتر، زیاتر. جەمین جام: کەسێک کە ڕوخساری بە وێنەی ئاوێنە بێت. پەرێ: بۆ. نیەن: نییە. خاو: خەو. وەنەم: لە من، لێم. واتە: ئەگەر هەموو دنیا زوڵف درێژ و وەفادار بن ئەی لەیلەکەی ڕوخسار ئاوێنە جگە لە تۆ بۆ کەسی تر خەوم لێ حەرام نابێت.

٣- پابەند: ئەسیر، گرفتار. بەینەتدار: وەفادار. بابا شێخ: ناوی «سەیید عەلی» بووە و وەک لە سەر زارانە لە سەدەی هەشتەمی کۆچی مانگیدا لە دێی بێساران ژیاوە و لەوێش فەوتی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە. بێساران: دێی بێساران. واتە: قەسەم بە ئەو بابە شێخەی کە گۆڕەکەی لە بێسارانە دڵم ئەسیری تۆیە ئەی پاشای وەفاداران.

-٧٨-[١]

چـــراخم! وەفـــات، چـــراخم! وەفـــات
بـــێبەینەتـــەنی، هـــیچ نیـــەن وەفـــات[٢]

سێ ساڵ چوون یەک ڕۆ مـن کێشام جـەفات
جـەو سـێ سـاڵ ساتێ هـیچ نـەدێم وەفـات[٣]

ســی و شــش ماهــەن جــەفات مەکێشــوو
یانــەی ســەبرم سـفت تـا کـەی بنیشــوو؟[٤]

هـــــەزار و هەشـــتاد ڕوان بـــــی کامـــڵ
ڕۆیـــێ مـــوراڎم نەکـــەردت حاســـڵ[٥]

---

-٧٨-

١- ن، ک، س، م ب، ح، ڕ، عم، مج.

٢- بێ بەینەت: بێ وەفا، بێ شەرت و پەیمان. نیەن: نییە. واتە: ئەی یار، بێ شەرت و بەقایت و هیچ وەفات نییە.

٣- چوون: وێنەی، وەکوو. ڕۆ: ڕۆژ. نەدێم: نەمبینی. واتە: سێ ساڵ وەک ڕۆژێک من جەفای تۆم کێشا بەڵام لەو سێ ساڵەدا یەک سات وەفات نەبوو و من وەفای تۆم نەبینی.

٤- مەکێشوو: دەکێشێم. یانە: ماڵ، خانوو، لانە. سفت: سووتا. بنیشوو: دانیشم، دابنیشم. واتە: من سی و شەش مانگە جەفای تۆ دەکێشم بەڵام چیتر سەبرم نەماوە و لانەی سەبرم سووتاوە، تاکەی دەبێ من بە دیاری تۆوە دابنیشم؟

٥- ڕوان: ڕۆژان، کۆی «ڕۆ»یە بە مانای ڕۆژ. ڕۆیێ: ڕۆژێک، یەک ڕۆژ. موراڎم نەکەردت حاسڵ: بە ئاواتی خۆمت نەگەیاند. واتە: هەزار و هەشتا ڕۆژ (سێ ساڵ) تەواو بوو تۆ تەنانەت یەک ☜

قیبلــەم حەســاب کــەر ســاعەتان چەنــدەن
جــە هــەر ســەعاتێو دڵ جــە لات بەنــدەن[1]

بیســت و پــەنج هــەزار نۆســەد و بیســتەن
دڵ مــەیلش بــە تــۆن هــەر تــۆش ئەویســتەن[2]

ئەگــەر مــەیلت هــەن ڕاس بواچــە پــێم
وەرنــە ســاکن بــوو نــە کڵــێس وێــم[3]

***

---

ڕۆژ لەو هەموو ڕۆژە منت بە ئاواتی خۆم نەگەیاند.

۱- حەساب کەر: حەساو بکە، بژمێرە. هەر ساعتێو: هەر ساعەتێک. بەندەن: ئەسیرە، گرفتارە. واتە: ئەی قیبلەم حەساوی بکە بزانە ئەم سێ ساڵە دەکاتە چەند کاتژمێر، لە هەموو کاتژمێرێکدا دڵم لای تۆ بووە.

۲- دڵ مەیلش بە تۆن: دڵ مەیلی لە تۆیە. تۆش ئەویستەن: تۆی گەرەک بووە، تۆی ویستووە. واتە: بیست و پەنج هەزار و نۆسەد و بیست کات ژمێرە (سێ ساڵ) دڵم هەر مەیلی لە تۆ بووە و تۆی ویستووە.

۳- ڕاس بواچە پێم: ڕاستم پێ بڵێ، ڕاستم پێ بێژە. وەرنە: وەگەرنە، ئەگینا، ئەینا. ساکن بوو: ئارام بگرم. کڵێس: وێرانە، کاولە، کەلاوە. واتە: ئەگەر تۆیش مەیلت هەیە ڕاستم پێ بڵێ با بە دیارتەوە دابنیشم ئەگینا با بڕۆم و لە ماڵە وێرانەکەی خۆمدا ئارام بگرم. لە نوسخەی «م»دا ئەم پارچە شێعرە بەم جۆرە هاتووە:

چــراخم! وەفــات، چــراخم! وەفــات بــێ بەینەتــەنی هــیچ نیــەن وەفــات
سێ ماه چوون یەک ڕۆ من کێشام جەفات جــە مــاهێ ســاتێ مــن نــەدیم وەفــات

-٧٩-[١]

چڵـــێ بـــە پـــەنا، چڵـــێ بـــە پـــەنا
چڵـــێ چـــوون ڕەقیـــب بیـــەن بـــە پـــەنا[٢]

هۆرئامـــــان، مـــــدران نـــــە ڕای تەمـــــەنا
مـــەر دەســـت قـــودرەت بـــدۆش بـــە فـــەنا[٣]

---

نـــەوەد ڕۆی کامـــڵ جـــەفات مەکێشـــوو | یانـــەی ســـەبرم ســـۆت تـــا کـــەی بنیشـــوو؟
پـــــەنجاە و چلـــــەن ڕۆوان کامـــــڵ | ڕۆیـــــێ مـــــورادم نەکـــــەردی حاســـــڵ
قیبلەم حەســاب کــەر ســاعەتان چەنــدەن | هەر یەک ساعەتێ دڵ جە لات بەنـدەن

-٧٩-

١- ن، ک، ئێ، س، ل، ح، ع، پ، ب، ڕ، عم.
وەک لە لاپەڕەی ١٧٣ی بەرگی یەکەمی «تاریخ مشاهیر کرد»دا باس کراوە کـاتی خـۆی بێسـارانی ئەو کاتە کە لە دێی «پایگەلان» خوێندوویە دڵی بە کچێکەوە دەبێـت بـە نـاوی «ئامینـە». مـاڵی ئامینە نزیکی ئەو حوجرە بووە کە بێسارانی لێ بووە. کاتێـک دەنگـی ئامینـە لـە حەوشـەوە هـاتووە چووەتە سەر بانی حوجرەکە تا سـەیری ئامینـە بکـات بـەڵام دار «تـوو»یـەک بـەرچاوی گرتـووە و نەیهێشتووە چاوی بە ئامینەی خۆشەویستی بکەوێت بەو هۆوە هەر لەوێدا ئەم شێعرەی هۆنیوەتەوە، پاش ئەوە بایەکی هەڵکردووە و لق و پۆی تووەکەی داوە بە لادا و ئیتر بێسارانی بە بێ خەم توانیویـە سەیری یارەکەی بکات.
٢- چڵێ: چڵی دار. چوون: وێنەی، وەکوو. ڕەقیب: بـەدخواز، پاسـەوان. واتـە: دارێـک بـە وێنـەی پاسەوان بەرمی گرتووە و بووە بە پەنا و ناهێڵێ یارم ببینم.
٣- هۆرئامان: بەرزبووەتەوە، هەڵچووە. مدران: وەستاوە. تەمەنا: تکا، خواهێش، لاڵانـەوە. بـدۆش: بدا، بیدا. فەنا: لەبەین چوون، نابوود بوون. واتە: هەڵچووە و لەسەر ڕێگە وەستاوە و ناهێڵێ لە

مـــەر بـــە بـــاد بـــەد لـــەتار لـــەتار بـــۆ
نمـــازۆ بـــاڵای قیبلـــەم دیـــار بـــۆ [١]

بســـۆچۆ بـــایر بـــازەدەی ســـەحەر
ڕیشـــەش جـــە زەمـــین بـــاوەرۆ وە بـــەر [٢]

تـــا بـــاڵای قیبلـــەم چـــوون شـــەم خانـــان
بوینـــووش بـــە چـــەم جـــە بـــەرزەبانـــان [٣]

☆☆☆

☜ یار بلاڵێمەوە مەگەر دەستی قودرەت (خودا) لە نێوی ببات.

١- مەر: مەگەر. باد: با، وا. بەد: خراپ. لەتار لەتار: لەت لەت، کوت کوت. بۆ: بێ، ببێت. نمازۆ: ناهێڵێت، ئیزن نادات. واتە: بەڵکوو بە بای قاییم لەت لەت بێت چونکە ناهێڵێ باڵای یارەکەم ببینم.

٢- بسۆچۆ: بسووتێت، گڕی تێبەر بێت. بایر: بە ئاگر. بازەدە: با لێدراو، با گەش پێ کردوو. باوەرۆ: بێنێ، بهێنێ. واتە: بەڵکوو بە ئاگرێک کە بای بەیانی لێی داوە و گەشـانوویەتەوە بسـووتێت و ڕیشەی لە بێخ دەربێت.

٣- شەم: شەمع. بوینووش: ببینم، ببیینم. چەم: چاو. واتە: تا دوای ئەوە باڵای قیبلەکەم وەکوو شەمی ماڵی خانان لە بانی بەرزەوە ببینم. لە نوسخەی «پ»دا دوای ئەم بەیتە بەیتێکی دیکە هاتووە و ئەمەیش بەیتەکە:

تـــا تـــەمام ســـەیر باڵاکـــەش کـــەروون    ئـــەوا داخ وە قـــەبر قیامـــەت بـــەروون

کە ئەڵبەت دیارە بە شێعرەکەوە لکاوە و بەبێ ئەم بەیتەیش مانای شێعرەکە تەواوە.

-٨٠-[١]

چـــوون جەماڵشـــەن، چـــوون جەماڵشـــەن
«کەعبـــە»ی موعـــەززەم چـــوون جەماڵشـــەن[٢]

«حَجَرُالاَسْـــوَد» خـــەت و خاڵشـــەن
سەرچەشـــمەی «زەمـــزەم» لـــەب لاڵشـــەن[٣]

چـــین چـــین «جەمـــەرە»ش خەیاتـــەی خامـــەن
«حِصارُالاَسْـــوَد بَیْـــتُ الحَـــرام»ەن[٤]

---

-٨٠-

١- ک، س، ب، ح، ر.

٢- چوون: وێنەی، وەکوو. جەماڵ: جوانی. کەعبە: کابە، ماڵی خودا لە مەککە. موعەززەم: گەورە. واتە: کابەی گەورە بە وێنەی ڕوخساری جوانی یارە یا (کابە لە ڕوخساری جوانی یار دەچێت «وەرگێڕ»).

٣- حَجَرُالاَسْوَد: بەردی ڕەش، ناوی بەردێکە لە کابەدا کە حاجیان تەوافی دەکەن. سەرچەشمە: سەرچاوە. زەمزەم: ناوی کانیاوێکە لە نزیکی کابە. لەب: لێو، لچ. لاڵ: لەعل، بەردیکی بە نرخ و هێژا. واتە: ئەو بەردە ڕەشەی کە لە کابەدایە لە خەت و خاڵی یار دەچێت. (تەنیا ئەو بەردە ڕەشە و دیکەی بەردەکان سپین، بە وێنەی خاڵی ڕەش بە ڕوومەتی سپیەوە) و سەرچاوی زەمزەمیش لە لێوە سوورەکانی دەچێت.

٤- جەمەرە: سێ شوێن کە حاجی دەوەستن و بەردی ورد ورد دەگرنە شەیتان کە بەو کارە دەڵێن «ڕەجمی جەمەرە» یا «ڕەجمی شەیتان» کە پێشتر ئەو شوێنانە بە شێوەی کۆڵەکە بوون و ئێستە دیوارن. خەیاتە: تاڵێ بادراوی هەورێشم، مەبەستی زوڵفی یارە کە بە وێنەی تاڵی هەورێشم بادراوە و گیراوەتەوە. حِصارُالاَسْوَد: پەرژینی ڕەش، مەبەست ئەو پەردە ڕەشەیە کە وا بە دەوری کابەوە.

نەمــــەردام تـــــەواف «مَسْـــــجِدَالحَرَم»
«عـەرەفـــە» و «مێنـــا»، «بـــازار زەمـــزەم»[١]

بکـــــەردام، جـــارێو «ئێحـــرام» بپۆشــــام
جـــامێو جـــە شــــەربەت زەمـــزەم بنۆشـــام[٢]

***

بَیْتُ الحَرَام: ماڵی حەرام، کابە، لەبەر ئەوە پێی دەڵێن حەرام خودا حەرامی کردووە موشـریکی تێ بچێت. واتە: چین چین زوڵفە ڕەشە خاوەکانی لە چین چینی کۆڵەکەی جەمەرە و زوڵفە ڕەشەکەی کە پەرژینی ڕوویەتی لەو پەردە ڕەشە دەچێت کە دراوە بە دەوری کابەدا. لە بـەیتی یەکەمـدا خـۆی وتوویە مەبەستی لە کابە ڕوومەتی یارە و لێرەدا ئەو زوڵفە کە بە ڕوخساریەوە پەرێشانە شوبهێندراوە بە ئەو پەردە ڕەشەی کە دراوە بە دەوری کابەدا.

١- نەمەردام: نەمردبام، نەمردایەم. مَسْجِدَالحَرَم: مَسْجِدُالحَرام، ناوی مزگەوتێکە لە نزیکی کابە و ڕووگەی ئیماندارانە و لە دینی ئیسلامدا وتراوە هەرکەس بچێتە ئەو مزگەوتەوە هیچ ئازارێک ڕووی تێناکات، ئەڵبەت چون «مَسْجِدَالحَرَم»ی نووسیوە و حەرەمیش بە مانـای دەور و بـەرە دەتـوانێ بـە مانای «دەوروبەر»ی مزگەوتیش بێت. عەرەفە: ناوی دەشتێکە لە مەکەدا کە ڕۆژێک پێش جـەژنی قوربان حاجیان لەوێدا کۆ دەبنەوە و زۆربەی کار و باری حەج لەو ڕۆژە و لەو شوێنەدا دەکرێت و هـەر لەبەر ئەوەیش بەو ڕۆژە (ڕۆژێک پێش جەژنی قوربان) دەڵێن عەرەفە. مێنا: مینا، نـاوی شـوێنێکە لە مەکەدا کە حاجیان شەیتانی تێدا ڕەجم دەکەن. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٢- بکەردام: بمکردایە. جارێو: یەک جار، جارێک. ئێحرام: قوماشێکی سپی کە حاجیان لـە حـەج لەبەر دەکەن و دەبێ لە سەرەتا تا کۆتایی ڕێ و ڕەسمەکانی حەج لەبەریاندا بێت. جـامێو: جامێـک، یەک جام، لیوانێک. بپۆشام: لەبەرمکردایە. واتە: خۆزگە نەمردایەم تا جارێک ئێحرامم بەسـتایە و تەوافی «مَسْجِدَالحَرَام» و «عەرەفە» و «مێنا» و «زەمزەم» (ڕوومەت و زوڵـف و خـەت و خـاڵ و دەمی یار)م بکردایە، پیاڵەیەکم لە شەربەتی زەمزەم بخواردایەتەوە (نێو دەمیم ڕاموسایە).

-١-[1]

«حافێز»! باجەتی «شاخ نەبات»ت

بە نۆشیدەی جام جورعەی مەماتت[2]

بە هەوای گوڵگەشت سەیر «مُصَلا»ت

بە ئاو «روکناباد» سەرچەشمەی حەیات[3]

بە «لِسانُ الغَیب» سینەی پەڕ جە دوڕ

مایەی دڵ جە گەنج بەحر مەعنا پوڕ[4]

---

-١-

١- ک، ب، ح.

٢- حافێز: «شمس الدين محمد» حافزی شیرازی شاعێری ناوداری فارس. باجەتی: بە خاتری. شاخ نەبات: شاخەی نەبات، ئەم وشەی لە شێعری حافزدا زۆر هاتووە کە هەم مانای شاخەی نەبات ئەدات کە جۆرە شیرینیەکە و هەم بۆ ئەوەی ناوی خۆشەویستەکەی بە ئاشکرا نەبات ئەم وشەی بەکار هێناوە. کاتێک کەسێک بیەوێت فاڵێک لە دیوانی حافز بگرێتەوە ڕەسم وایە حافز بە «شاخ نەبات» قەسەم دەدات. نۆشیدە: نۆشراوە، خوراوە. جام: پیاڵە. جورعە: قوم، گوڵمیتە (لە زمانی هەورامیشدا هەر دەڵێن گوڵمیتە «وەرگێڕ»). مەمات: مردن. واتە: حافز بە شاخی نەباتت و بە نۆشراوەی قومێک لە پیاڵەی مردن قەسەمت دەدەم.

٣- گوڵگەشت: گەڕان: سەیران کردن، لێرەدا بە مانای سەیرانگا هێناویە. مُصَلا: شوێنی نوێژ کردن، ناوی سەیرانگایەکی شیرازە. ڕوکناباد: رکن آباد، ناوی قەنات و سەرچاوەیەکە لە شیراز. سەرچەشمە: سەرچاوە. حەیات: ژیان. واتە: حافز بە هەوای سەیرانگای موسەللا و ڕوکناباد کە سەرچاوەی ژیانن قەسەمت دەدەم.

٤- لِسانُ الغَیب: زمانی غەیب، کەسێک کە قسە لە غەیب و نەهێنی بکات، نازناوی حافزی ☜

یــە چەنــدێ وەختــەن قیبلــەم دوور کەفتــەن
ســـــەرتاپای بـــــالاّم ئـــــالوودەی نەفتـــــەن[1]

فـــالێ «وَصْـــفُ الحـــال» بـــاوەرە پـــەرێم
موناسـێب حـالّ جەسـتەی خەسـتەی وێـم[2]

هـەر شـەو جـە ئاسـمان قـەبرت پـەڕ نـوور بـۆ
دیـدەی بـەد جـە «شـاخ نـەبات»ت دوور بـۆ[3]

***

☜ شیرازی. پـەڕ: پـڕ. دوڕ: نـاوی جەواهێرێکـە کـە لـە لاشـەی سـەدەفدا دروست دەبێـت کـە بوونەوەرێکی دەریاییـە. بـەحر: دەریـا، زەریـا. مـەعنا: مانـا، ئـەو شـتەی پەیوەنـدی بـە دەروون و حەقێقەتەوە بێ، بەرانبەری ڕواڵەت. پوڕ: پڕ. واتە: بە زمـانی غـەیب و سـینەی پـڕ جـەواهێرت و بەوەی کە دڵت پڕ لە خەزێنەی دەریای مەعنەویەت و حەقێقەتە قەسەمت دەدەم.

١- یە چەندێ وەختەن: ئەمە چەند ماوەیە. دوور کەفتەن: دوور کەوتوەتەوە. نەفەت: نەوت. واتـە: ئەمە چەند ماوەیە قیبلەم لێم دوور کەوتوەتەوە و منیش لەبـەر دووری ئـەو سـەرتاپام نەوتاوییـە و سووتاوە یا ئامادەی گڕ گرتنە.

٢- وَصفُ الحال: نیشاندەری بارودۆخ. باوەرە: بێنە، بهێنە. پەرێم: بۆ من، بـۆم. موناسـێب: ڕێـک، گونجاو. جەستە: لاشە. خەستە: ماندوو، زامدار. وێم: خۆم. واتە: بەڵکوو فاڵێکم بۆ بگرێتەوە کـە حاڵ و وەزعم نیشان بدات و ڕێکی حاڵی ئەم لاشە زامدارەم بێت.

٣- پەڕ: پڕ. واتە: هەموو شەوێک لە ئاسمانەوە نوور بەسەر گۆڕەکەتدا ببارێت و گۆڕەکەت پڕ لە نوور و چاوی پیس لە خۆشەویستەکەت دوور بێت.

* تێبینی: لەم پارچە شێعرەدا بێسارانی بەو چەند شتە ناوبراوە حافز قەسـەم دەدات و دۆعـای بـۆ دەکات هەموو شەوێک گۆڕی پڕ بێت لە نوور و ئازیزەکەی لە چاوی پیس بە دوور بێت بەڵکوو ☜

-٢[١]-

حاڵــــداران! حاڵــــەن، حاڵــــداران! حاڵــــەن
حــــاڵێ پــــێم یــــاوان نمــــەز چ حاڵــــەن[٢]

ســــەرەم داخ کــــەران، یــــە کــــام خەیاڵــــەن؟
ســــپی ســــەنگێ دیــــم واتــــم یــــە لاڵــــەن[٣]

لاڵ خوســــــرەوان نــــــە کەمــــــەر مــــــەبۆ
ســــەنگ هــــەر گــــەدایێ پــــاش وە ســــەر مــــەبۆ[٤]

---

☜ فاڵێکی ڕێکی حاڵی خۆی بۆ بگرێتەوە. شێعرەکە قەسم دانە و دۆعا کردن و داواکاری، بەڵام لە چینی شێعرەکەدا داواکارییەکە پێش دۆعا کردنەکە کەوتووە. «وەرگێڕ».

-٢-

١- ن، ک، س، ب، ح، ڕ. لەم شێعرەدا بێسارانی گلەیی لەوە دەکا کە یار ئەوە نەبووە کە ئەم خەیاڵی کردووە.

٢- پێم یاوان: پێم گەیی، دەستی پێم دا. نمەز: نازانم. واتە: ئەی ئەوانەی ئاگاداری حاڵن، حاڵێکم هەیە نازانم چ حاڵێکە (وەرن ئێوە بزانن چییە).

٣- سەرەم داخ کەران: سەرم داخ بکەن. یە: ئەمە. سەنگ: بەرد. واتم: وتم. لاڵ: لەعل، بەردێکی بە نرخە. واتە: بەڵکوو سەرم داخ بکەن، ئەمە چ خەیاڵێکە؟ بەردی سپیم بینی و وتم ئەمە لەعلە. (لەعلێک کە بە ڕەنگی سپی بێت ئەبێت کەسێکی زۆر شارەزا لە بەردی ئاسایی و بێ نرخی سپی جیای بکاتەوە.)

٤- خوسرەوان: پاشایان، حاکمان. مەبۆ: دەبێ. واتە: لەعلی پاشایان وا بەسەر پشتێند یا کەمەربەندەکەیانەوە، بەڵام بەردی ئاسایی هەموو کەس لە ژێر پێی دەنێ. (لێرەدا گەدای تەنیا بۆ بەرانبەری لەگەڵ خوسرەوان هێناوە).

فــرێ کــەس چــوون مــن خــام خــەیاڵ مــەبۆ
کــەی ســەنگ بــە دانــەی دوڕ لاڵ مــەبۆ؟[١]

خــەیاڵش بــەد بــێ، ئەســڵش نــەبێ ســاف
نیشــانەی لاڵــیش بەرشــی بــە خــیلاف[٢]

ســپی ســەنگێ دیــم بــە لاڵــم زانــا
لاڵ بــان ئــەر هــەنیچ بــە لاڵــش وانــا[٣]

***

---

١- فرێ: زۆر. چوون: وێنەی، وەکوو. خام: خاو. مەبۆ: دەبێ. دوڕ: جەواهێر. واتە: زۆرکەس بە وێنەی من خەیاڵی خاو دەکات، ئاخر کەی بەرد دەبێتە جەواهێرێک بە وێنەی لەعل؟ (مەبەستی ئەوەیە کە هەر نابێت).

٢- ئەسڵش نەبێ ساف: بنچینەی ڕێک و پێک نەبوو. بەرشی: دەرچوو، ڕۆیی. خیلاف: ناڕاستی. واتە: (چون ئەو یارەی من دیبووم و وام دانابوو کە یارێکی ڕێک و پێکە) خەیاڵی خروا بوو و ڕیشە و بنەڕەتی ڕێک و پێک نەبوو، هێمای لەعل بوونی بە درۆ دەرچوو. (بە کوردی و کورتی: ئەوە نەبوو کە من لە سەرەتاوە چاوەڕێ بووم «وەرگێڕ»).

٣- زانا: زانی. بە لاڵم زانا: بە لەعلم زانی. لاڵ بان: لاڵ بن، نەتوانن قسە بکەن. ئەر: ئەگەر. هەنی: ئیتر، جارێکی دیکە. وانا: بخوێننەوە. بە لاڵش وانا: بە لەعلی بخوێننەوە. واتە: بەردێکی سپیم بینی و پێم وابوو لەعلە. بەڵکوو لاڵ بن ئەگەر جارێکی دیکە بە لەعلی بخوێننەوە. پوختەی مانا: کەسێک بە یەکەم چاو پێکەوتن نازانێ ئەو کەسەی کە بینیویە کەسێکی ڕێک و پێکە یا نە بەڵکوو دواتر بۆی ڕوون دەبێتەوە خاس یا خراپە. هەر وەها کەسێک بە دیتنی بەردێکی سپی نازانێ ئەمە بەردێکی سپی بێ نرخە و یا لەعلێکی بەنرخە، دەبێ کەسێکی ژیر و شارەزا یا کەسێکی جەواهێرناس بێت تا بۆی ڕوون بێتەوە کە بەردی بێ نرخە یا لەعلە.

-١-[1]

خـــار خـــەم خـــەياڵ نـــە پـــەردەی جـــەرگم
ســـــەرهۆردان، مـــــەدۆ نيشـــــانەی مـــــەرگم[2]

تـــا نـــە پـــەردەش خـــار خـــەمان پێـــوار بـــێ
نيشـــــانەی مـــــەردەی مـــــن نادیـــــار بـــــێ[3]

ئيســـــە پـــــەردەی جـــــەرگ مەشـــــكاوناوە
كـــــۆی ســـــەبرم بـــــە تـــــاو دەرد تاونـــــاوە[4]

وەخـــــت مەرگمـــــەن، شـــــادم بـــــە مـــــەردەن
مەردەن پـەيم خاسـەن سـەخت جـەفام بـەردەن[5]

***

-١-

١- ك، ن، ئێ، س، ب، ح، ر.

٢- خار: دڕوو، دڕك. سەرهۆردان: سەری هەڵداوە. مـەدۆ: دەدات. واتـە: دڕووبـەك كـە خـەياڵی هێنانی خەمە سـەری لە جەرگم هەڵداوە و نيشانەی مەرگم پێ نيشان دەدات.

٣- پێوار: ون، گوم، ناديار، نەبينراو. مەردەی: مردن. واتە: تا دڕووی خەم لە پەردەی جەرگمدا ناديار بوو نيشانەی مردنی منيش ناديار بوو.

٤- مەشكاوناوە: دەدڕێت، توێ توێ دەكات. تاوناوە: تواندیەوە، كردی بە ئاو. واتـە: ئێسـتە پـەردەی دڵم دەدڕێت و بە تاوی دەرد كێوی سەبرم دەتوێنێتەوە.

٥- وەخت مەرگمەن: كاتی مردنمە. پەيم: بۆ من، بۆم. جەفا: سەختی. واتە: وا ديارە كاتی ☜

-٢-[١]

خـــار دووری یـــار، خـــار دووری یـــار
کـــارێ پـــێم کـــەردەن خـــار دووری یـــار[٢]

خـــار نـــیمنگـــای شـــۆخ عەنبـــەربار
شـــەق کـــەردەن حەجـــەر، هـــوون بەســـتەن فـــوار[٣]

تـــاقی بزانـــان یـــاران غـــەمخوار
قـــەتع ڕۆحـــم کـــەرد زام پـــەڕ ئـــازار[٤]

---

☜ مردنمە و منیش بە مردن شاد و بە کەیفم چون بە سەختی جەفاکێش بووگم.

-٢-

١- عم، ج.

٢- خار: دڕوو، دڕک. کارێ پێم کەردەن: کارێکی پێ کردووم. واتە: دڕووی دووری یار کارێکی وای پێ کردووم.

٣- نیمنیگا: سەیر کردن بە گۆشە چاو. عەنبەر: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆش. شەق: دووکەرت کردن. حەجەر: بەرد. هوون: خوێن. بەستەن فوار: هەڵقولاوە، فوارەی کردووە. واتە: بە گۆشەچاو سەیرکردنی یار وەک دڕوویەک بەردی دووکەرت کردووە و خوێن لە بەردەکەوە هەڵقولاوە. مەبەستی ئەوەیە کاتێ یار بە گۆشەچاو سەیر دەکات بەردیش دووکەرت دەکات، ئیتر من چۆن بەرگەی بگرم؟ یا دەتوانی بڵێی کە ئەگەر ئەم دڵەی من لە بەردیش ڕەقتر بێت شەق دەبێت.

٤- تاقی: تەحقیق، بە ڕاستی. بزانان: بزانن. غەمخوار: خەمخۆر. قەتع: بڕان. پەڕ: پڕ. ئازار: ئێش. واتە: با هاوڕێ خەمخۆرەکانم بزانن کە ئەو زامە پڕ ئێش و ئازارە ڕۆحی بڕیوم و کوشتوومی.

وەسیەتم ئێدەن جە لاتان ئەمجار
ڕۆحم پەرواز کەرد شی وە خامۆش شار[١]

ورازان کەفەن بە تای زڵف یار
ئەوسە هۆرێزا بەرام وە مەزار[٢]

جە دمای تەسلیم نە سای قەبر تار
مەلەکان بە ئەمر شای پەروەردگار[٣]

ئەڵبەت مەپەرسان کەردەی ڕۆزگار
مەنمانوو پێشان من تای زڵف یار[٤]

---

١- ئێدەن: ئەمەیە. جە لاتان: لە لاتان لە لای ئێوە. پەرواز: باڵ گرتنەوە. شی: ڕۆیشت. خامۆش شار: شاری خامۆشان گۆڕستان. واتە: کاتێ کە بە هۆی زامی نیونیگای یارەوە ڕۆحم باڵی گرت و لە لاشەم جیا بووەوە و ڕۆیشت بۆ گۆڕستان وەسیەتم بۆ ئێوە ئەمەیە.... لە بەیتە دواییەکاندا وەسیەتەکەی دەڵێت.

٢- ورازان: بدروون. ئەوسە: پاشان دوای ئەوە. هۆرێزا: هەستن. بەرام: بمبەن. واتە: بە تاڵی زوڵفی یار کفنم بدوورن و پاشان هەستن هەڵمبگرن و بمبەن بۆ گۆڕستان.

٣- جە دمای تەسلیم: لە دوای تەسلیم لە دوای ناشتن. مەلەکان: فریشتان. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا دێت.

٤- ئەڵبەت: حەتمەن بە دڵنیاییەوە. مەپەرسان: دەپرسن. کەردەی: کردەوەی. مەنمانوو: دەنوێنم نیشان ئەدەم. مانای ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

سەدەق مەوانان وە بێ ئێختیار
فیدای دۆست بیەن حەیفشەن ئازار[١]

✵✵✵

-٣[٢]-

خاو جە دیدەم دوور، خاو جە دیدەم دوور
خەیاڵت کەردەن خاو جە دیدەم دوور[٣]

هەر ئەسر هوونش مەیۆ بە زەروور
تێشدا نەمەندەن زەڕێ مایەی نوور[٤]

---

١- سەدەق: ڕاستی کرد. مەوانان: دەخوێنن. بیەن: بووە. واتە: پاش ئەوەی تەسلیمی گۆڕی تاریک کرام و ناشتمیان بە ئەمری خودا فریشتە دێنە سەرم و سەبارەت بە کردەوەی سەر دنیام لێم دەپرسن و منیش ئەو تاڵە زوڵفەی یار کە کفنەکەمی پێ دووراوە پێیان نیشان دەدەم و ئەوانیش دەست بە جێ دەڵێن: ڕاست ئەکات ئەمە بە قوربانی یار بووە حەیفە ئازاری بدەین.

-٣-

٢- ن، ک، ئێ، س، ب، م، ل، ح، ڕ.

٣- خاو: خەو. واتە: خەیاڵی تۆ خەوی لە چاوانی من دوور خستوەتەوە. (خەیاڵی تۆ خەوی لە چاوانی من حەرام کردووە).

٤- ئەسر: ئەسرین، فرمێسک. هوون: خوێن. مەیۆ: دێت. زەروور: پێویست، لازم. تێشدا: تێدا، لە نێویدا. نەمەندەن: نەماوە. زەڕێ: زەڕەیەک، تۆزێک. واتە: هەر ئەسرینی خوێنی لێ دەتکێت و بە زەڕەیش مایەی ڕۆشنایی تێدا نەماوە.

وێنـــــەی تـــــازە زام ســـــەرتیێخ مـــــەودا
هوونـــاو لاو بەســـتەن مەشـــۆ بـــە ئـــەودا [١]

هـــەر مـــوژێم قـــەترەی هـــوونش کـــەردەن چـــاک
بـــە وێنـــەی ئـــەڵماس لاڵســـم حـــەککاک [٢]

دیـــدێو کـــە قـــەترەی هـــوون جـــێش نـــەوارۆ
شـــەرتەن پـــێش واچـــا مایـــەی نـــوور دارۆ [٣]

***

١- مەودا: نووک تیژ. هووناو: خوێناو. لاو بەستەن: لافاوی بەستووە. مەشۆ: دەڕوا. واتە: بە وێنەی زامی تیێخی نووک تیژ خوێن و ئاو(خوێناو) لافاویان بەستووە و لە چاوم دەتکێن.

٢- موژە: مژۆڵ، برژانگ. قەترە: دڵۆپ. چاک: دڕاو. ئەڵماس لاڵسم: ئەڵماسێک کە لەعل کون دەکا و دەسمێت. حەککاک: هەڵکەن، کەسێک کە وێنە یا نووسراوەیەک لەسەر شتێک (زۆرتر بەرد) هەڵبکەنێت. واتە: هەر مژۆڵێکم دڵۆپێک لەو خوێنە کە لە چاوم دەتکێت بە وێنەی ئەڵماسی دەستی حەکاکان کردوویە بە دوو کەرت. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «لاڵ سم حەککاک»، «لاڵ سیم حەکاک» نووسراوە.

٣- دیدێو: چاوێک، ئەو چاوەی. هوون: خوێن. جێش: لێی. نەوارۆ: نەبارێت. شەرتەن: خاس وایە. واچا: بڵێن. دارۆ: هەیەتی. واتە: چاوی من لەبەر ئەوەی خوێنی لێ دەتکێت سۆمای نەماوە کە وابوو هەر چاوێک خوێنی لێ نەبارێ دەبێت بەو چاوە بڵێی سۆمای هەیە. لە نوسخەکانی «م» و «ل»دا ئەم پارچە شێعرە تەنیا دوو بەیتی سەرەتای لەگەڵ نوسخەکانی دیکەدا هاوبەشە و لەوە بە دوای لەگەڵ پارچە شێعری «من دڵێ سوفتە» تێکەڵ بووە. هەر وەها لە سەرچاوەی «ح»دا بەیتێک لە کۆتایی شێعرەکەوە هاتووە کە بەیتی یەکەمی پارچە شێعری «خەیاڵم خاڵی نیەن جە خاڵت»ـەیە و دیارە بە هەڵە نووسراوە.

-٤[١]-

خوداوەنـــد! جەســـتەم، خوداوەنـــد! جەســـتەم
مـــالووم بـــۆ جــە لات پەشـــێوی جەســـتەم[٢]

ئـــــی ڕەنـــــگ زەردم، زوان بەســــــتەم
ئـی دوور کەوتـەی خـاڵ ئـەو ئـاوات وەسـتەم[٣]

ئـــی دیـــدەی بـــێ نـــوور نـــەم تێـــدا بڕیـــا
ئـــــی دڵـــــەی پـــــارەی بـــــایران گڕیـــــا[٤]

ئـــی تـــەن ســـفتەی ســـەد داخـــان پێـــوە
ئـــی جـــەرگ بریـــان هـــا جـــە دڵێـــوە[٥]

---

-٤-

١- ن، ک، ئێ، س، ب، ح، ر.

٢- جەستە: لاشە، بەدەن. مالووم: مەعلووم، ئاشکرا. پەشێوی: سەر لێ شێواوی. واتە: ئەی خودا! باکوو پەشێوی و سەر لێ شێواوی جستەی منت لێوە دیار و ئاشکرا بێت.

٣- ئی: ئەم. بەستە: بەستراو، داخراو، قەپات. دوورکەوتەی: دوورکەوتنەوە. ئاوات وەستەم: بە ئاوات خواستراوم. واتە: ئەی خودا! ئەم ڕەنگ زەردییە و ئەم زمانە بەستراوەم کە هیچ گلەیی لێوە نایەت و ئەم دوور کەوتنە لە خاڵانی یاری بە ئاوات خواستراوم، با بزانی و لێت مەعلووم بێت.

٤- نەم: نم، تەڕایی. بڕیا: بڕاو. بایران: بە ئاگران. واتە: ئەی خودا! ئەم چاوە کوێرەم کە تەڕایی تێدا نەماوە (هێندە گریاوم ئەسرینم وشک بووە) و ئەم دڵە کوت کوتەم کە بە ئاگر گڕی گرتووە و سووتاوە با لێتەوە دیار و ئاشکرا بێت.

٥- تەن: لاشە. سفتە: سووتاو. بریان: برژاو. ها جە دڵێوە: وا لە نێویدا. واتە: ئەی خودا! ئەم ☜

ئـــی جەســـتەی مـــەجنوون زامـــن ئـــاوارە
ئـــی پـــەڵاس بـــەرگ مـــەنزڵ مـــەغارە[1]

بـــە دۆعـــای شـــەریف شـــەو ســـوب بێـــداران
یـــا تاقـــەت یـــا مـــەرگ یـــا وەســـڵ یـــاران[2]

✶✶✶

-٥-[3]

خونچـــەگوڵ جـــە گـــڵ، خونچـــەگـــوڵ جـــە گـــڵ
زیـــاوە جـــە پـــەی نـــەووەهار جـــە گـــڵ[4]

---

☜ لاشە سووتاوەم کە لە سەد لاوە داخ کراوە و شوێنی داخ کراوی پێوەیە و ئەم جەرگە برژاوەم کە وا لە نێوی ئەم لاشەمدا و لە ناوەوە برژاوە و دیار نییە و نابینرێ با لێتەوە دیار وئاشکرا بێت.

١- زامن: زێد، نیشتمان، وڵات، وەتەن. پەڵاس: جل و بـەرگی شـڕ و دڕاو. بـەرگ: جـل و بـەرگ، لیباس. مەغار: ئەشکەوت. واتە: ئەی خودا! ئەم لاشەی منە کە بە وێنەی مەجنوون لە نیشتمانی خۆم ئاوارە بووە و جل و بەرگم پڵاسی شڕە و ماڵ و مەنزڵم ئەشکەوتە با لێتەوە دیار و ئاشکرا بێت.

٢- شەریف: پلە و پایە بەرز. سوب: بەیانی، کازیوە. بێداران: ئەوانەی کە نەخەوتوون و بە خەبەرن. وەسڵ: پێ گەیشتن. واتە: ئەی خودا! بە خـاتری دۆعـای شـەریفی ئەوانـەی لـە تاریـک و لێـڵدا هەڵدەستن بۆ پاڕانەوە و نزاکردن لە درگانەی خۆت یەکێک لە سیانەم بکە نەسیب، یا تاقەتم پێ بـدە کە بتوانم هەڵگری ئەم بارە بم یا مەرگم پێ بدە با بمرم و ڕزگارم بێت و یا بمگەیەنە بە وەسڵی یار.

-٥-

٣- ک، س، ئێ، ب، ح، ڕ، عم، ج، مج.

٤- خونچەگوڵ: گوڵخونچە. گڵ: خاک. زیاوە: دەرهات، ڕوا. واتە: بە هاتنی نەوبـەهار گوڵخونچـە لە خاک دەرهات و ڕوا.

جــــه نـــــاو چەمــــەنان وەنـــدەوە بولْبـــولْ
ئـاخ پـەی هامـدەردێ چـوون مـن داخ نـە دڵ[١]

بــە دیـــدەی پــەڕ زوخ، بــە دڵــەی پــەڕ داخ
بشـــیایمێ و ســـەیر گوڵخونچـــان بـــاخ[٢]

ناڵـــــەمان کـــــەردا چـــــەنیو بولْبـــولان
ئێمـــە پـــەی یـــاران، ئـــەوان پـــەی گـــولان[٣]

هـــــەرتا چـــاخ فەســـڵ نـــەووەهار شـــیا
دەنـــگ ناڵـــــەمان نـــــە چەمـــــەن بیـــا[٤]

مەدیەو کـەس نیـەن غـەیر جـە مـن فێشتـەر
هـــەر دەم دەرد یـــار وەنـــەش دۆ نێشـــتەر[٥]

---

١- چەمـەن: سـەوزەلانی. وەنـدەوە: خوێنـدەوە. چـوون: وێنـەی، وەکـوو. واتـە: دیسـان بولبـول لـە سەوزەلانی‌دا دەستی کرد بە خوێندن، ئاخ بۆ هاودەردێکی داخ لە دڵ وەک خۆم.

٢- پەڕ: پڕ. زوخ: زوخاو. بشیایمێ: بڕۆیشتینایە. واتە: بە چاوی پڕ زوخاو و دڵـی پـڕ لـە داخـەوە بڕۆیشتاییین و سەیری گوڵخونچەی ناو باخمان بکردایە.

٣- کەردا: بکردایە. چەنیو: لەگەڵ. پەی: بۆ. واتە: باکوو لەگـەڵ بولبـولان دەسـتمان بکردایـە بـە ناڵین، ئێمە (من و هاودەردەکەم) بۆ یار و ئەویش (بولبول) بۆ گوڵان.

٤- چاخ: کاتی خۆشی، سەردەمی خۆشی. شیا: دەڕۆیشت. بیا: بوایە. واتە: تـا سـەردەمی خۆشـی نەوبەهار دەڕۆیی با دەنگمان لە نێو سەوزەلانی‌دا بوایە.

٥- مەدیەو: دەبینم. نیەن: نییە. فێشتەر: زۆرتر، زیاتر. وەنەش: لێی، لەو. دۆ: بدات.

هــەر مــن دەردیــنم، منــیچ ســا جــارێ
مــەدیــەی جــە ناکــا جــە ســای مــەغارێ[1]

بــەی گشــت دەردەوە، بــەی دیــدەی نمنــاک
گیــانم تەسـلیم کـەرد، خـەڵتان بـیم نـە خـاک[2]

✡✡✡

-٦[3]-

خــەزانێ بــە چــاخ، خــەزانێ بــە چــاخ
ئــارۆ دیــم بــە چــەم، خــەزانێ بــە چــاخ[4]

---

نێشتەر: نەشتەر، شتێکی نووک تیژ کە بۆ خوێن گرتن لە لاشەی مرۆڤ بە کاری دەبەن. واتە: بەڵام کاتێک بە باشی سەیر دەکەم دەبینم کەسی تر نییە وێنەی من کە دەردی یار یەک دوای یەک نەشتەری لێ بدات.

١- دەردین: دەردەدار. منیچ: منیش. مەدیەی: دەبینی. جە ناکا: لە ناکاو، کوتوپڕ. مەغار: ئەشکەوت. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا دێت.

٢- بەی: بە ئەم، بەم. گشت: هەموو، سەرجەم. نمناک: تەڕ. کەرد: کرد. خەڵتان: ناوێتە. واتە: هەر من دەردەدارم و منیش کاتێکت زانی بەم هەموو دەردەوە و بەم چاوە تەڕانەوە لەبەر ئەشکەوتێکدا مردم و خەڵتانی خاک بووم.

-٦-

٣- ن، ک، ئێ، س، ب، ح، ر، عم.

٤- خەزان: گەڵای داری خەزان لێدراو یا هەڵوەریو. بە چاخ: بە کەیف، کۆک، ساز. واتە: ئەمڕۆ گەڵایەکی خەزان کردووم بینی کە وا دیار بوو بە کەیف بوو.

ڕەنگـــێش پـــێ نـــەبێ جــە دەرد نـــێش داخ
مـــن دەرســـات جـــە دڵ کێشـــام ئایرئـــاخ[١]

پەرسـام ئـــەی خـــەزان ڕەنـــگ بـــە قـــەم وێنـــە
زەڕێ داخ دەرد جـــەفای مـــن پـــێ نـــە[٢]

ســـا بواچـــە پـــێم تـــۆ جـــە چ کـــاری؟
پێســـە ڕەنـــگ ســـاف بێـــدەردان داری[٣]

واتـــش هـــەی لێـــوەی دڵ بـــە خـــەم پـــارە
مـــن هـــوون زامـــم کەفتـــەن نـــە چـــارە[٤]

---

١- ڕەنگێش: ڕەنگێکی. نێش: ئازار. دەردین: دەردەدار. دەرسات: هەر ئەو کاتە، گورج، خێرا. واتە: ڕەنگی لە ڕەنگی ئەوانە نەدەچوو کە دەردی ئاخی کێشا بێت و خۆش ڕەنگ و جوان بوو و منیش تا چاوم بە ڕەنگە جوانەکەی کەوت گورج لە دڵەوە ئاخێکی گڕینم هەڵکێشا.

٢- پەرسام: پرسیم. قەم: کۆک، ساز، بە کەیف. زەڕێ: زەڕەیەک، تۆزێک. واتە: پرسیم ئـەی گـەڵای خۆش ڕەنگ کە لە ڕەنگی کەسێکی ساز و بە کەیف و دەماخ دەچی و زەڕەیەک لە داخی دەردی منت پێوە دیار نییە.

٣- بواچە: بڵێ، بێژە. پێسە: وەها، بەم جۆرە. واتە: سا پێم بڵێ تۆ چ کارێـک دەکـەی کـە بـەم جـۆرە ڕەنگت جوان و بە وێنەی بێ دەردان ڕەنگت سافە؟

٤- واتش: وتی. لێوە: شێت. پارە: دڕاو. هوون: خوێن. کەفتەن: کەوتووە. چـارە: تـەوێڵ، لێـرەدا بـە مانای «ڕوومەت»ـە. واتە: گەڵاکە وڵامی دایەوە ئەی شێتی دڵ بە خەم کوت کوت بوو ئـەو ڕەنگـە سوور و سافە و جوانە کە تۆ پێت وایە لە خۆشی کۆک بوونمە ڕەنگی خوێنمە کە لەسـەر ڕوومـەتم ڕژاوە.

تـــۆ مـــاچی بێـــدەرد، هـــەر کـــەس بێـــدەرد بـــۆ
شـــەڵڵا چـــەنی گـــڕ بـــە زوخـــاڵ گـــەرد بـــۆ[١]

* * *

-٧[٢]-

خـــەمناکم خـــەمناک، خـــەمناکم خـــەمناک
جـــە جـــەور فەڵـــەک خـــەمناکم خـــەمناک[٣]

هەر یەند مەکەروو جامـەی جـان چـاک چـاک
پـــەی دووری یـــاران خـــاک وە ســـەرم خـــاک[٤]

مەنیشـــۆم نـــە عـــەرش دوود ئـــاه ســـەرد
وەختـــەن جەناســـەم گـــەردوون بـــۆ بـــە گـــەرد[٥]

---

١- ماچی: دەڵێی، ئەڵێی. بۆ: بێ، بێت. شەڵڵا: ئیشەڵڵا، خوابکات. زوخاڵ گەرد: بووڵ، خۆڵەکەوە. واتە: تۆ بە من ئەڵێی بێدەرد، لە خودام داوایە هەرکەس بێدەرد بێت بسـووتێ و ببێتـە خۆڵەکـەوە. مەبەستی ئەوەیە من بێدەرد نیم حەز دەکەم هەرکەس بێدەرد بێت گڕی تێبەر بێت.

-٧-

٢- ن، ک، س، ع، ب، ح، ڕ.

٣- جە: لە. ستەم: جەور. واتە: لە زوڵم و جەوری فەلەک خەمناکم.

٤- یەند: هێندە، ئەوەندە. مەکەروو: دەکەم. جامە: جل و بەرگ، لیباس. چـاک: دڕاو. پـەی: بـۆ. مانای ئەم بەیتە بەستراوە بە بەیتی دواییەوە.

٥- مەنیشۆ: دەنیشێت. عەرش: جێی خودای گەورە لە ئاسماندا. دوود: دووکەڵ. جەناسەم: لە ☜

مەگـــەر خوداوەنـــد کـــەرەم کـــەرۆوە
تەفرەقـــەی یـــاران گشـــت جـــەم دەرۆوە[١]

وەرنـــە جـــە دەروون پـــەڕ دەرد زامـــەت
ئایروارەنـــان تـــا ڕۆی قیامـــــەت[٢]

☆☆☆

---

☜ هەناسەم. گەرد: تۆز. واتە: هێندە جل و بەرگی گیانم (لاشەم) لە دووری یاران دەدڕم و خاک دەکەم بە سەردا کە دووکەڵی هەناسە سەردەکانم دەگاتە عەرش و لەوانەیە بە هەناسەم گەردوون ببێت بە تۆز. نیوە بەیتی دووهەم لە سەرچاوەی «ح»دا بەم جۆرە نووسراوە: «وەختەن هەناسەم سەنگ کەرۆ وە گەرد» و لە نوسخەی «ع»دا بەم جۆرە: «وەختەن جە ناڵەم ئاڵەم بۆ وە گەرد» و لە سەرچاوەکانی «ن»، «س»، «ب» و «ڕ»دا بەم جۆرە نووسراوە: «وەختەن جە ئاهم گەردوون بۆ وە گەرد».

١- کەرەم کەرۆوە: ڕەحم بکات. تەفرەقە: دوور کەوتنەوە، پرژ و بڵاو بوون. گشت: هەموو، سەرجەم. جەم دەرۆوە: کۆ بکاتەوە. واتە: مەگەر خودا ڕەحم بکات و هاوڕێیانی لێک دوور کەوتوو لە دەوری یەک کۆ بکاتەوە.

ئەم بەیتە لە دیوانی مەولەویدا لە پارچە شێعری «یاوان پێم نامەی شیرین خێتامەت»دا بە ناوی مەولەوییەوە هاتووە بەڵام وا دیارە مەولەوی تێهەڵکێشی کردووە.

٢- وەرنە: وەگەرنە، ئەگینا، ئەینا. پەڕ: پڕ. زامەت: ئێش، زامدار، بریندار. ئایروارەنان: بە وێنەی ئاگرم. ڕۆی قیامەت: ڕۆژی قیامەت، ڕۆژی حەشر. واتە: ئەگینا لە دەروونمدا کە پڕە لە دەردی زامان تا ڕۆژی حەشر هەر بە وێنەی ئاگرم و گڕم لێ بەرز دەبێتەوە.

-٨-[1]

خـــەیاڵم خـــاڵی نیـــەن جـــە خاڵـــت
فیـــدای خاڵـــت بـــام تـــۆ هـــەم خـــەیاڵت[2]

زلفـــت بـــە ئامـــان ئامـــان وە دامـــان
جـە دامـــان چێشـــەن پـــێش نیـــەن ئامـــان؟[3]

ئـــــەرچی دەهانـــــت نامشـــــەن دەهـــــان
هـــیچ دیـــار نیـــەن مـــن دانـــم گیـــان[4]

٭٭٭

-٨-

١- ک، س، ب، ح، ڕ.

٢- نیەن: نییە. بام: بم. واتە: بە قوربانی خاڵ و خەیاڵت بم، فکر و خەیاڵی من لە خاڵانی تۆ خـاڵی نییە.(خەیاڵ و بیری من هەر وا لە لای خاڵانی تۆ «وەرگێڕ»).

٣- زلف: زوڵف، پرچ. ئامان (یەکـەم): پـەنا خواسـتن. ئامـان (دووهـەم): هـات. دامـان: داوێـن. چێشەن: چییە. پێش: پێی. ئامان (سێهەم): ئارام و قەرار، پەنا. واتە: زوڵفت بە پەنا خواستن درێژ بووەتەوە و گەیشتووەتە لای داوێنت (دەست بە داوێنت بووە) مەگەر چی لە داوێنتدایە کـە ئـارام و قەراری لێ براوە؟ لە سەرچاوەکانی «ح»، «ڕ»، «س» و «ب»دا بە جێی «جـە دامـان چێشـەن»، «جە دمای چێشەن» نووسراوە واتە بە دوای چییەوەیە.

٤- ئەرچی: هەرچەند. دەهان: دەم. نامشەن: ناویە. نیەن: نییە. واتە: هەرچەند دەمت ناوی دەمە و دەبێت قسەی پێ بکرێت بەڵام گیانم تەسلیم کرد و مـردم و هیچـی پێـوە دیـار نییـە.(من مـردم و هێشتا تۆ نایێتـە دەنـگ). لـە سـەرچاوەکانی «ح»، «ڕ»، «س» و «ب»دا بـە جێـی «دەهانـت»، «دەهانش» نووسراوە و لە نوسخەی «ک»دا بە جێی «من دانم گیان»، «من گیانم دان» نووسراوە.

-١[1]-

دڵ زەبـــــوون وێـــــم، دڵ زەبـــــوون وێـــــم
ڕەنـــــگ زەرد و زایـــــف، دڵ زەبـــــوون وێـــــم[2]

نـــــە چـــــای بـــــێ ئامـــــان ســـــەرنگوون وێـــــم
ئـــــاوارەی وەڵات «تەنجـــــە» و «تـــــوون» وێـــــم[3]

تـــــەن خەمیـــــدەی بـــــار مەلامـــــەت وێـــــم
شـــــەرمەندەی ڕۆی حەشـــــر قیامـــــەت وێـــــم[4]

-١-

١- س، ع، ب، ح، ر.

٢- زەبوون: مل کەچ، بەسەزمان، لاواز. وێم: خۆم. واتە: ڕەنگ زەرد و زایف و بەسەزمان خۆم.

٣- چا: چاڵ بیر، چاڵاو. بێ ئامان: بێ پەنا. سەرنگوون: هەڵگەڕاوە. تەنجـە: طنجـە، یـەکێک لـە شارە گەورەکانی وڵاتی مەراکێشە کە ئەو کات لەسەر ئەو باوەڕە بـوون وا لـە نزیکـی کێـوی قافـدا و لێرەدا وەک وڵاتێکی دوور ناوی هاتووە. توون: لێرەدا بە مانای بیابانی چـۆڵ و گەرمـە، لـە بنـەمادا توون ناوی شارێکە کە ئێستە ناوی «فیردەوس»ـە و ناوەنـدی پارێزگـای خوراسـانی باشـوورییە لـە ئێراندا، ئەم وشە زیاتر لەگەڵ وەشەی «تـەوەس»دا دێـت کـە ئـەویش شـارێکە لـە نزیکـی تـوون. توونـاوتوون، بە توون، بە توون و تەوەس؛ سەرچاوەی هەمـوو ئەمانە یەکێکن کـە دیـارە بـە هـۆی زۆر گەرم بوونیانەوە کەوتوونەتە سەر زاران. واتـە: لـە چـاڵێکی بـێ پـەنادا هەڵگەڕامەتـەوە و ئـاوارەی وڵاتانی «تەنجە» و «توون» بووگم.

٤- تەن: لاشە. خەمیدە: چەمیو. تەن خەمیدە: کـۆم کـۆم بوونـەوە. مەلامـەت: لۆمـە، سـەرکۆنە کردنی کەسێک لە سەر کارێک. ڕۆی: ڕۆژی. واتە: لاشـەم لـە ژێـر بـاری لۆمـە و تانـە و تەشـەری خەڵکدا چەماوە و شەرمەندە و خەجاڵەتی ڕۆژی قیامەتم.

یانــەی دڵ ســەیلات خــەمان ڕوفتــە وێــم
کــزەی جــەرگ وە گــۆش وێ شــنەفتە وێــم[١]

بــە کــوورەی هێجــران دڵ جۆشــیا وێــم
بــاڵا بــە کــاڵای خــەم پۆشــیا وێــم[٢]

گــۆش کــەڕ، زوان لاڵ، چــەم بــێ نــوور وێــم
چوون مەجنوون شەیدا، جە لەیل دوور وێم[٣]

یــە گشــت جــە نــەدین دوور وەڵات وێــم
دووریــش ڕەســتاخێز عەرەســات وێــم[٤]

٭٭٭

---

١- یانە: ماڵ، خانوو، هێلانە. سەیلات: لافاو. ڕوفتە: ماڵیاو، گزی دراو، هەر دەتوانێ ڕەفتەیش بێت بە مانای لە دەست دەرچوو. شنەفتە: بیستوو. واتە: لافاوی خەمان ماڵی دڵی ماڵیوم و بردوویە و بە گوێی خۆم کزەی جەرگی خۆمم بیستووە (دەبیستم).

٢- هێجران: دووری. جۆشیا: کوڵاو. پۆشیا: پۆشیو، لەبەر کراو. واتە: لە نێو کوورەی دووریدا دڵم هاتووەتە کوڵ و کاڵای خەمان بە باڵام براوە.

٣- گۆش: گوێ، گوێچکە. چەم: چاو. واتە: گوێم کەڕ و زمانم لاڵ و چاوم کوێر بووە و بە وێنەی مەجنوون شێت و شەیدای لەیلی بووم و لێی دوورم.

٤- یە: ئەمە. گشت: هەموو. جە: لە. نەدین: نەدیتن. ڕەستاخێز: هەستانەوەی مردوان لە ڕۆژی قیامەتدا. عەرەسات: کۆی وشەی «عەرەسە» بە مانای دەشت کە مەبەست دەشتی مەحشەرە. واتە: ئەمانەی کە وتم و بە سەرم هاتووە هەمووی لە بەر ئەوەیە یاری دوور وڵاتی خۆمم نەدیوە و دووری یار بۆ من بە وێنەی دەشتی مەحشەر و قیامەت وایە (واتە سەختە).

-٢-[١]

دڵ زەمینـــــــــــەوە، دڵ زەمینـــــــــــەوە
مـــــەفرِیۆ، مـــــەدۆ وێـــــش زەمینـــــەوە[٢]

چـــــوون تفـــــڵان مــــاچۆ بــــە گرینـــــەوە
ئـــــەو خاڵـــــەم مـــــەبۆ بـــــەو جەمینـــــەوە[٣]

خـــــاک رووی زەمـــــین مەکـــــەرۆ بـــــە کـــــۆ
مـــــەپیمۆ بـــــە ســـــەر هـــــەرتا مـــــەتاوۆ[٤]

بـــــە زار مـــــەناڵۆ، مـــــەناڵۆ بـــــە زار
بـــە زار وێنـــەی مـــورغ زەدەی مـــەجرووح بـــار[٥]

---

-٢-

١- ک، س، ب، ر، ح.

٢- مەفرِیۆ: دەفرێت، فرەی دێت، دەس و پێ لێ دەدا. مەدۆ: دەدات. وێش: خۆی. واتە: دڵـم دەس و پێ لێ دەدات و خۆی بە زەمیندا دەکوتێت.

٣- چوون: وێنەی، وەکوو. تفلان: منداڵانی بچووک. ماچۆ: دەڵێت. گرین: گریان. مـەبۆ: دەبێـت. جەمین: نێوچاوان، لێرەدا مەبەست ڕوومەتە. واتە: بە وێنەی منداڵانی بچووک دەگری و دەڵێ ئەو خاڵی ڕووی یارەم دەوێت.

٤- مەکەرۆ بە کۆ: کۆ دەکاتەوە، جەم دەکاتەوە. مەپیمۆ: دەکات بە سەری خۆیدا. مەتاوۆ: دەتوانێت. واتە: خاک و خۆڵی ڕووی زەوی کۆ دەکاتەوە و تا دەتوانێ دەیکات بە سەر خۆیدا.

٥- زار: هەژار، داماو. مەناڵۆ: دەناڵێت. مورغ: پەلەوەر، باڵدار. زەدە: پێکراو. مەجرووح: برینـدار. زامدار. واتە: بە هەژاری بە وێنەی باڵدارێکی پێکراو و بریندار دەناڵێنێت.

مــــن واتــــم دڵـــە! قنجـــەقنجـــە بـــای

بـــە نـــێش ئـــەڵماس زار و ڕەنجـــە بـــای[١]

خـــاڵێ نـــە ڕوخســـار زلێخـــا چـــارەن

مانـــگ ڕووی زەمـــین، شـــەوق ســـتارەن[٢]

کـەی مـەیۆ بـە دەسـت چـوون تـۆ گـەدایێ

جـە گـەدا بەتـەر بـێ ڕەویـە و ڕایـێ[٣]

هەبڵـــەـــە! مەکــــەرە خـــەیاڵان خـــام

نمـــەیۆت بـــە دەســـت خـــاڵ دڵارام[٤]

---

١- واتم: وتم. قنجەقنجە: لەت لەت کراو، جنراو. بای: بیت. نێش: نووکی تیژ. زار: هەژار، دامـاو. واتە: من وتم ئەی دڵ بەڵکوو بە نووکی تیژی ئەڵماس لەت لەت و هەژار و ڕەنجراو بیت.

٢- چارە: نێو چاوان. شەوق: ڕۆشنایی. ستارە: ئەستێرە، هەسارە. واتـە: خاڵێـک وا بـە نێوچـاوانی زولەیخاوە کە مانگی ڕووی زەمین و ڕۆشنایی ئەستێرەیە.

٣- مەیۆ: دێت. چوون: وێنەی، وەکوو. بەتەر: خراوتر. بێ ڕەویە و ڕا: بێ فکر و هۆش، بێ عەقڵ و ئاوەز. واتە: ئەو خاڵە کەی بە دەستی هەژارێکی وەک تۆ دەکەوێت تازە خۆ تۆ لە هەژاریش خراوتری و بێ عەقڵ و ئاوەزی. لە سەرچاوەی «ح»دا نیوەبەیتی یەکەمی بەم جۆرەیە: «کێ مـەدۆ وە دەسـت چوون تۆ گەدایێ» و لە نوسخەی «ک»دا نیـوەبـەیتی دووهـەمی بـەم جـۆرە نووسـراوە: «گـەدای کەمتەر تەرز، بێ ڕوو و ڕیایێ».

٤- هەبڵە: ئەبلە، بێ عەقڵ. مەکەرە: مەکە. خام: خاو، بێهوودە. نمـەیۆ: نایـەت. دڵارام: کەسێک کە هێور کەرەوەی دڵە و دڵ ئۆقرەی پێ دەگرێت. واتە: ئەی بێ عەقڵ! بێهوودە خەیاڵی خاو مەکـە، چون خاڵی ئەو دڵارامە دەستیی تۆ ناکەوێت.

وێت مەدە بە دەست خوردەی خەت و خاڵ
خەیاڵ مەکەرۆت بە کۆگای زوخاڵ[1]

☆☆☆

-۳-[2]

دڵبەر نەداوە، دڵبەر نەداوە
دەلیل شی پەی دڵ، دڵبەر نەداوە[3]

ئاما بەناسەی سەرد سیاوە
ئایر نە تۆی دڵ سفتەم وەرداوە[4]

ئەر مەشۆ پەی دڵ، دڵ وێش دووساخەن
وەرنە دەروونم پەڕ دەرد و داخەن[5]

---

۱- وێت: خۆت. خوردە: وردە. مەکەرۆت: دەتکات. واتە: خۆت مەخەرە داوی وردە خەت و خاڵان چون خەیاڵی خاڵان دەتکات بە کۆی زوخاڵ.

-۳-

۲- س، ب، ڕ، ح.

۳- نەداوە: نەدایەوە. دەلیل: نێردراو بۆ لای یار، ڕێگە بەلەد، چاو ساق. شی: ڕۆیشت. واتە: دەلیل ڕۆیشت بۆ لای یار کە دڵم بێنێتەوە بەڵام پێی نەداوە.

٤- ئاما: هات، هاتەوە. بەناسەی: بە هەناسەی. سیا: ڕەش. ئایر: ئاگر، ئاور. سفتە: سووتاو. وەردا: بەردا. واتە: دەلیل بە هەناسەی سارد و ڕەشەوە هاتەوە و ئاگری نا بە دڵە سووتاوەکەمەوە.

٥- ئەر: ئەگەر. مەشۆ: دەڕوا، دەچێ. پەی: بۆ. وێش: خۆی. دووساخ: زیندانی، بەندکراو. وەرنە: ئەگینا، ئەینا. پەڕ: پڕ. واتە: ئەگەر دەلیل بە دوای دڵدا دەچێ دڵ لە بەندایە و حەز دەکات ☜

دڵ ئاست پەی دڵبەر، دەلیل پەی ئەزاب
هەر نە ئەزاب بوو تا بە ڕۆی حەساب[١]

ئەر ئارۆ تاوام ئاوێ مەڕێزوون
ئایر نە پای بەخت سیا مەخێزوون[٢]

وەگەر نەتاوام، نەبی، نەکریا
سەد کەس تالآن شی، منیچ دڵ بریا[٣]

***

---

☞ بڕوات بە دوایدا ئەگینا دەروونم شوێنی ئەوە نییە دڵی پێ بدەمەوە چون پڕە لە دەرد و داخ.

١- ئاست: هێشتەوە. دڵ ئاست پەی دڵبەر: دڵی بۆ دڵبەر بە جێ هێشت. ئەزاب: عەزاب، عەزاو. ڕۆی حەساب: ڕۆژی حەشەر. واتە: دەلیل بۆ ئەوەی تا ڕۆژی حەشەرْ من ئازار بدات دڵەکەمی لای دڵبەر بێ جێ هێشت.

٢- ئەر: ئەگەر. ئارۆ: ئەمڕۆ. تاوام: توانیم. مەڕێزوون: دەڕژێنم، دەکەم بە سەردا. ئایر: ئاگر. مەخێزوون: هەڵدەستێنم، لێرەدا بە مانای دەکوژێنمەوە هاتووە. واتە: ئەگەر ئەمڕۆ بتوانم ئاوێک دەکەم بە سەر ئەم ئاگرەدا کە بە بەختی ڕەشمەوە نراوە و دەکوژێنمەوە.

٣- نەتاوام: نەمتوانی. نەبی: نەبوو. شی: ڕۆیی. واتە: ئەگەریش نەمتوانی ئاو بە سەر ئاگرەکەدا بکەم سەد کەس بە تالآن ڕۆیشتووە با منیش دڵم بڕوات (سەد کەس دڵی بە تالآن ڕۆیشتووە دڵی منیش لە بانی «وەرگێڕ»).

-٤[1]-

دڵــــە! ئــــەر ناڵـــەت، دڵـــە! ئـــەر ناڵـــەت
واچمـــێ جـــە گـــەردوون بویـــەرۆ ناڵـــەت[2]

جـــە ئـــەزەڵ بـــەی تـــەور نویســـیان تاڵـــەت
چ ســـوودێ مـــەدۆ پێـــت ئـــی شـــفا و لاڵـــەت؟[3]

گـــەردوون کـــەی بـــە قەیـــد ئـــاە ســـەردەوەن؟
داخـــمای ســـەد داخـــش نـــە تـــۆی پـــەردەوەن[4]

---

-٤-

١- ک، ئێ، س، ئا، ڕ، ح، ب.

٢- ئەر: ئەگەر. واچمێ: بڵێین، بێژین. جە: لە. بویەرۆ: بڕوات، ڕەت بێت. واتـە، ئـەی دڵ! ئێسـتە ئەگەر بڵێین ناڵینت بچێتە ئەو لای گەردوونیشەوە (بە کاری چـی دێـت؟). لـە بەیتـە دواییەکانـدا دەڵێت لەبەر چی بە کار نایەت.

٣- جە ئەزەڵ: لە هەوەڵەوە، لە سەرەتاوە. بەی تەور: بەم جۆرە، بەم شێوە. تاڵـە: چـارەنووس. مـەدۆ: دەدات. واتە: تۆ هەر لە سەرەتاوە چارەت بـەم جـۆرە نووسـراوە ئیتـر ئـەم شـفا و لاڵـەت چ سـوود و قازانجێکی بۆت هەیە؟

٤- قەید: بە خەمی شتێکەوە بوون. داخما: شوێنی داخ کردن بە لاشەوە. واتە: گەردوون کەی گوێی لە هەناسەی سـەردەوەیە؟ ئەگەر پەردەی ڕووی گەردوون هەڵدەیتـەوە دەبینی شوێنی داخ کراوی سەد داخی پێوەیە.

ئــەر بــە لاڵــە و ئــاه یــۆش خــەلاس مەکــەرد
مەجنوون کەی نە نەجد پوست پـەڵاس مەکـەرد؟ [١]

بـــێ ســـــوودەن داوای خەلاســـــی کـــــەردەن
خـــاس ئێـــذەن وازی ئـــاوات وە مـــــەردەن [٢]

بـێ‌ڕامـێ چـوون چـەرخ غـەزەب گێرتـەن لێـت
کـەی سـوود مـەوینی جـە زێنـدەگی وێـت؟ [٣]

***

١- ئەر: ئەگەر. یۆش: یەکێکی. خەلاس: ڕزگاری. مەکەرد: دەکرد. نەجد: ناوی کێوێکە لە عەرەبستان کە دەڵێن مەجنوون بە هۆی عەشقی لەیلاوە دای بەو کێوەدا. پەڵاس: قوماشێکی ڕەش کە لە مووی بزن دروست دەکرێت، لێرەدا بە مانای جل و بەرگی شڕە. واتە: ئەگەر فەلەک بە لالانەوە و هەڵکێشانی هەناسەی سەرد کەسێکی ڕزگار بکردایە کەی مەجنوون لە نەجددا پێستی دەبوو بە پەڵاس؟ (پڵاسی لەبەر دەکرد؟)

٢- خاس ئێذەن: باش ئەمەیە. وازی: بخوازی، داوا بکەی. مەردەن: مردن. واتە: داوای ڕزگاری کردن هیچ قازانجی نییە بۆت چون ڕزگار نابیت، خاستر وایە کە ئاوات بە مردن بخوازی چون تەنیا بە مردن دەتوانی لە دەستی فەلەک ڕزگارت بێت.

٣- ڕام: ڕەحم. چوون: وێنەی، وەکوو. گێرتەن: گرتووە. مەوینی: دەبینی. زێندەگی: ژیان. وێت: خۆت. واتە: کاتێک بێ ڕەحم و بەزەییەک وێنەی چەرخی ڕۆژگار غەزەب و قینی لێ گرتووی چۆن بە هیوای ئەوەی سوود و قازانج لە ژیانت ببینی؟

-۵-[1]

دڵــــە بـــە دامـــن، دڵـــە بـــە دامـــن
چەنـدێ جـەفا و جـەور سـەرتاپای دامـن؟[2]

نــە پــای لواتـــەن نــە نیشـــتەی زامـــن
ئـاخ وەیمـەن پـەی دڵ، دڵـە هـای وەی مـن[3]

زایــــف و زەبـــوون مێحنـــەتزەدەی خـــەم
جـە تـاو هێجـران بـە بێـز کەفتـەی چـەم[4]

---

-۵-

۱- ک، ئێ.

ئەم پارچە شێعرە یەکێک لەو دوو پارچە شێعرەیە کە بێسارانی لە سەر شێواز و قاڵبێکی تایبەت هۆنیویەتەوە. ئەو پارچە شێعرەکەی دیکە «دڵـە زام نـۆ»یـە. بـۆ زانیـاری زیـاتر سـەیری بەشـی «شێوازێکی تایبەت» بکەن لە پێشەکی دیوانەکەدا.

۲- دامن: داوێن. جەفا و جەور: سەختی و ناخۆشی. واتـە: ئـەی دڵ تـا چەنـد دەبێـت سـەختی و ناخۆشی و ناڕەحەتی سەرتاپای داوێنت بگرێتەوە؟

۳- لوا: ڕۆیشتن. ڕۆیین. نیشتەی: دانیشتن، مانەوە. زامن: زێد، وەتـەن، نیشـتمان. وەیمـەن: وەی دەکەم، هاورامە. پەی: بۆ. واتە: نە پای ڕۆیشتنت هەیە و نە توانای مانەوە لـە نیشـتمانی خۆتـدا. ئاخ وەی دەکەم بۆ دڵم، دڵە وەی بۆ من.

٤- زایـف: لاواز، زەعیـف، بـێ گریـک. زەبـوون: هـەژار. مێحنـەت: ڕەنـج. هێجـران: دووری. بـە بێزکەفتەی: بێزراو. چەم: چاو. واتە: بێ گریک و هەژاری و بە مەینەتی خەم و خەفەت پێکراوی. لە تاوی دەردی دووری چاویش تۆی بێزراوە.

بــۆ وه لاو مــــەجنوون شــێت و لێــوه و جــن
ئــاخ وەیمــەن پــەی دڵ، دڵــە هــای وەی مــن[١]

بـــــارێ نـــــەتاوان زەمـــــان و زەمـــــین
تــۆ شــی واونــات جەشــق ئــەو جــەمین[٢]

ئــــایر عەشــــقت پــــەی وێــــت تاونــــا
شــــیەینە پــــەی بــــەلا، بــــەڵات واونــــا[٣]

---

١- بۆ: وەرە، بێ. لێوە: شێت، فێدار. جن: جنۆکە. وەیمەن: وەی دەکەم، هاوارمـە. پـەی: بـۆ. واتـە: ئەی دڵ! وەرە بۆ لای مەجنوون کە شێت و دێوانەیە و بە وێنەی جنۆکەیە، ئاخ وەی دەکەم بۆ دڵم، دڵە وەی بۆ من. مەبەستی لە مەجنوون خۆیەتی.

٢- نەتاوان: نەیانتوانی. تۆ شی: تـۆ ڕۆیشـتی. واونـات: بـە خۆتـەوە گـرت. جەشـق: لـە عەشـق. جەمین: نێوچاوان، ڕوخسار. واتە: بارێک کە زەمین و زەمان نەیانتوانی هەڵیبگرن تـۆ ڕۆیشـتی بـە عەشقی ڕوخساری یار بە خۆتەوە گرت (لە کۆڵت نا).

٣- ئایر: ئاگر، ئاور. پەی وێت: بۆ خۆت. تاونـا: توانـەوە. شـیەینە: ڕۆیشـتی. بـەلا: ئامـاژەیـە بـە ساتەوەختێک کە خودا بە بەندەکانی فـەرمـوو «الست بـربکم» واتـە «ئایـا مـن خـودای ئێـوەم؟» ئەوانیش وڵامیان داوە «قالوا بلی» واتە «بەڵێ». لێرەدا مەبەست ئەوەیە بۆ ئەوە ڕۆیشتی یار پێت بڵێ «بەلا» واتە «بەڵێ». واونا: لە خۆ گرتن، هێنان بە سەر خۆدا. واتە: ئاگری عەشقت بـۆ خـۆت توانەوە و ڕۆیشتی بۆ «بەلا» بەڵام «بەڵا» و ناڕەحەتیت هێنا بـە سـەر خۆتـدا. وا دیـارە مەبەسـتی ئەوەیە کە ئەی دڵ تۆ بۆ عەشقی حەقیقی ڕۆیشتی و تووشی عەشقی مەجازی هاتی.

ئـــەر بێســـتوون بـــی مـــەکنیا جـــە بـــن
ئـــاخ وەیمـــەن پـــەی دڵ، دڵـــە هـــای وەی مـــن[1]

مورغـــت پـــەرواز کـــەرد بـــێ‌پـــەروا و بـــێ‌فـــام
شـــی وە پـــەی دانـــە غافـــڵ بـــی جـــە دام[2]

خـــەیاڵ چینـــەش بـــەرد بـــە فامـــەوە
هـــەر ئەوســـەش زانـــا بـــی بـــە دامـــەوە[3]

تـــۆ وەســـتەن ئـــاداب پـــەرێ ســـەودای مـــن
ئـــاخ وەیمـــەن پـــەی دڵ، دڵـــە هـــای وەی مـــن[4]

---

۱- ئەر: ئەگەر. مەکنیا: دەکنرا، لە بن دەهات. واتە: ئەی دڵ! ئەگەر بە جێگەی تۆ کێوی بێستوون بوایە لە بن دەهات، ئاخ وەی دەکەم بۆ دڵم، دڵە وەی بۆ من.

۲- مورغ: باڵدار، پەلەوەر، لێرەدا مەبەست ڕۆحە. پەرواز: باڵگرتنەوە. بێ‌پەروا: نەترس. بێ‌فام: بـێ عەقڵانە، بێ زانایی. شی: ڕۆیشت. وە پەی: بۆ. غافڵ: بێ ئاگـا. دام: داو، تەڵـە. واتـە: ئـەی دڵ! ڕۆحت نەترسانە و بێ عەقڵانە باڵی گرتەوە و ڕۆیشت بۆ دانە بەڵام لەو داوەی کە لەوێ دانرابوو، بـێ ئاگا بوو و بە داوەکەوە بوو.

۳- چینە: خواردنەوەی تۆم و دانەوێڵەی پەلەوەر لە سەر زەوی. فـام: عـەقڵ. ئەوسـەش زانـا: دوای ئەوە زانی، پاش ئەوە زانی. واتە: لە بەر خۆیەوە و بە عەقڵی خۆی بە خەیاڵی چینە کردن بوو و بـوو بە داوەوە و پاشان زانی چی بە سەر هاتووە.

٤- تۆ وەستەن: تۆ خواستووتە، تۆ هێناوتە بە سەرمدا. پەرێ: بۆ. سەودا: مامەڵە، فکر و خـەیاڵ. وەیمەن: وەی دەکەم، هاوارمە. پەی: بۆ. واتە: ئەم فکـر و خەیاڵـە (ئـەم مامەڵـە) تـۆ هێناوتـە بـە سەرمدا، ئاخ وەی دەکەم بۆ دڵم، دڵە وەی بۆ من.

جگـــەر شـــکاوا بـــە مـــەودای ســـتەم
ژار ئـــاوەرد پـــەی زام جیـــۆتی مەرهـــەم[١]

دەیســـە بگێـــرە دەســـت بـــە زامـــەوە
دانـــەی یـــار کـــەردەن پـــات بـــە دامـــەوە[٢]

نـــە پـــای لواتـــەن نـــە نیشـــتەی زامـــن
ئـــاخ وەیمـــەن پـــەی دڵ، دڵـــە هـــای وەی مـــن[٣]

***

١- شکاوا: شەق کرد، توێ توێ کرد. مەودا: نووکی تیژ. ژار: ژەهر. ئاوەرد: هێنا. پەی: بۆ. جیۆتی: لە جیاتی، لە باتی، بە جێی. واتە: بە نووکی تیژی ستەم جەرگی یەکالا کردووە و بە جێگەی مەڵهەم ژەهری هێنا بۆی کە بە سەر زامیەوە بنێت.

٢- دەیسە: دەی ئێستە، دەی چیتر. بگێرە: بگرە. کـەردەن: کردوویـە. واتـە: دەی چیتـر دەسـت بـە زامتەوە بگرە، ئەوە دەبینی کە دانەی یار پێتی بە داوەوە کردووە. مەبەستی لە دانە خاڵ و داو زوڵفە. حافزی شیرازی دەفەرموێ:

زلف او دام است و خالش دانهٔ آن دام و مـن     بر امیـد دانـهای افتـادهام در دام دوسـت

٢- لوا: ڕۆیشتن. نیشتەی: دانیشتن، مانەوە. زامن: زێد، نیشـتمان، وەتـەن. وەیمـەن: وەی دەکـەم، هاوارمە. پەی: بۆ. واتە: نە پێی ڕۆیشتنت هەیە و نە توانای مانەوە لە نیشتمانی خـۆت. ئـاخ وەی دەکەم بۆ دڵم، دڵە وەی بۆ من.

-٦[1]-

دڵــــه بــــەزەییش ئامـــــا بـــــه وێـــــدا
شـــەوان مـــەناڵۆ چــوون نـــەی نـــه جێـــدا[2]

وەڵـــڵا حەقشـــەن ســـەخت جـــەفاش بـــەردەن
بـــه جـــەفا چەنـــد ســـاڵ وەفـــاش پـــەروەردەن[3]

دوور کەوتـــەن جـــه زێـــد قـــەومان و خوێشـــان
مەگـــەر پـــەی جـــارێ نـــازش بکێشـــان[4]

ئـــاخر نـــازش کـــەرد جـــه لای نـــازدارش
نـــازش بـــێ نـــاز بـــی، چـــوون بـــۆ قـــەرارش[5]

---

-٦-

١- ک، ئێ، س، م، ئا، ڕ، ب، ح.

٢- ئاما: هات. به وێدا: به خۆیدا. مەناڵۆ: دەناڵێت. نه جێدا: له جێگەدا. چوون: وێنـەی، وەکـوو. واته: دڵم بەزەیی به خۆیدا هات که شەوان له ناو جێگەکەیدا وەک نەی دەناڵێنێت.

٣- جەفا: ڕەنج. بەردەن: بردووە. پەروەردەن: پەروەردە کردووە، گەورە کردووە. واتـه: قەسـەم بـه خـودا ناحەقی نییە ئەگەر دەناڵێنێت چون ڕەنجی زۆری کێشاوە و چەند ساڵ به ڕەنج کێشان وەفای پەروەردە کردووە.

٤- دوورکەوتەن: دوورکەوتووە. جه: له. زێد: نیشتمان، وەتەن. پەی: بۆ. بکێشـان: بکێشـن. واتـه: وەتەن و قەوم و کەسی خۆی بەجێ هێشـتووە و لێیـان دوور کەوتووەتـەوە تـا بـەڵکوو جارێـک نـازی بکێشن.

٥- بی: بوو. چوون بۆ: چۆن بێت. واته: له ئاخریشەوە که لای نازدارەکەی نازی کرد نازی نەکێشا

بــا ناڵــەش بــەرز بــۆ ڕەنــج بــێبــەر بیــەن
بــێقــەدر و بــێنــاز دەربــەدەر بیــەن[١]

✵✵✵

-٧[٢]-

دڵــە! بەشــق حــەق مەبــە ســەرگەردان
مەشــۆ نــە جامــەی گــرۆی بێــدەردان[٣]

بێــدەردان داران دڵــێ وێنــەی ســەنگ
بــە هــیچ خــاس و گەسـت نمــەیان وە تــەنگ[٤]

---

دەبێ ئارام و قەراری چۆن بێت؟

١- بەرز بۆ: بەرز بێت. واتە: باکوو ناڵە ناڵی بەرز بێت چون هەرچی ڕەنجی کێشاوە بێ فایدە و سوود بووە و لە لای یارەکەی بێ قەدر و قیمـەت و حورمـەت بـووە و لـە وڵات و قـەوم کەسـی خـۆی دوور کەوتووەتەوە و ئاوارە و سەرگەردان بووە.

-٧-

٢- ک، ئێ، س، ڕ، عم، ب، ح.

٣- بەشق: بە عەشقی، بە خاتری، لەبەر. مەشۆ: مەڕۆ. نە: لە (فارسی: دَر). جامە: جل و بەرگ. لیباس. گرۆ: دەستە، تاقم. واتە: ئەی دڵ! وەرە و بۆ خاتری خودا سەرگەردان مەبە و جل و بەرگی بێ دەردان لە بەر مەکە. مەبەستی ئەوپە ڕێگەی بێ دەردان لەبەر مەگرە و بێ دەرد مەبە.

٤- داران: هەیانە. گەست: ناپاک، خراو. نمەیان وە تەنگ: تەنگ نابن، بە تـەنگ نایـەن، گـوێ بـە هیچ نادەن. واتە: بێ دەرد دڵێکی وەک بەردیان هەیە و گوێیان لـە هـیچ خـاس و خراوەیـەک نییـە (دڵیان بە هیچ خاس و خراوێک تەنگ نابێت).

نــــه پـــــەروای نـــــەدین دڵبەرشـــــانەن
نــــه ســــەودای کەســــێ نــــه سەرشـــــانەن[١]

هــەر شــەو تــا بــە ڕۆ، هــەر ڕۆ تــا بــە شــەو
هــیچ نمــەزانان غــەیر جــە خــورد و خــەو[٢]

بێـــزار بــــە جـــە دیــــن ئـــەو ناجەســــتانە
ئـــەو دڵ ســــەنگینان، بێــــدەرد خەســــتانە[٣]

بـــا مـــــودام جـــە دەرد دەروونـــت پـــەڕ بـــۆ
لێــوت بــە شــەربەت شــەوناڵین تــەڕ بــۆ[٤]

☆☆☆

١- پەروا: ترسان، ترس. نەدین: نەدیتن، چاو پێ نەکەوتن. سەودا: فکر و خەیاڵ، بیر و هۆش. واتە: بێ دەرد نە ترسی ئەوەی هەیە چاوی بە دڵبەر نەکەوێت و نە بیر و هۆشی کەسێکیان لە سەردایە.

٢- ڕۆ: ڕۆژ. نمەزانان: نازانن. خورد: خواردن. واتە: شەو و ڕۆژ بێجگە لە خواردن و خەوتن هیچی دیکە نازانن.

٣- دین: هەم دەتوانێ بە مانای «دین» بێت هەم بە مانای «چاو پێکەوتن». ناجەستە: کەسێک کە پێی وانییە لاشەی ببێت تا دەردی هەبێت، لێرەدا بە مانای بێ بایەخە، دڵ سەنگین، دڵ ڕەق، (بە بڕوای من ناجەستە دەتوانێت بە مانای «ناجنس»یش بێت. «وەرگێڕ»). خەستە: بریندار، ماندوو، هیلاک. واتە: ئەی دڵ! بێزار بە لە چاو پێکەوتنی (دینی) ئەو کەسانەی کە بێ بایەخ و دڵ ڕەقن و بێ دەرد ماندوون.

٤- مودام: بەردەوام، هەمیشە. پەڕ بۆ: پڕ بێ. شەوناڵین: ناڵەی شەوانە. واتە: باکوو بەردەوام دەروونت پڕ بێت لە دەرد و لێوت بە شەربەتی ناڵەی شەوان تەڕ بێت و دایمە لە شەودا دەنگی ☞

-٨-[١]

دڵــــە! بێـــدار بـــە، دڵـــە! بێـــدار بـــە
جــە خـــاو غەفڵـــەت دەیســـە بێـــدار بـــە[٢]

جــە خــەوف مــەردەن حــەق خەبــەردار بــە
بـــە دام شــــەیتان وەس گرفتـــــار بـــــە[٣]

جـــە دام شــــەیتان بەنـــدت ڕەهـــا کـــەر
حێــرس دنیـــا وەس، خــەوف جــە خــوداْ کــەر[٤]

---

نالەت بێت.

-٨-

١- ک. ئەم پارچە شێعرە لە دیوانە کۆکراوەکەی مامۆستا «عەبدوڵڵای حەبیبی»دا نییە و فەرموویان لە دوای چاپی دیوانەکە ئەم شێعرەم کەوتە بەر دەست و تەنیا لە نوسخەی «ک»یشدا هەیە. بۆ منی هەنارد و فەرموویان با لە وەرگێڕانەکەی تۆدا هەبێت، منیش بە پێی زانست و توانای خۆم شەرحم کرد. بەڵام مامۆستا «عەبدوڵڵای حەبیبی» و مامۆستا «سەعدی غەریبی» بە شەرحەکەمدا چوونەوە و هەڵە و پەڵەکانیان بۆ ڕاست کردمەوە «وەرگێڕ».

٢- بێدار بە: ئاگادار بە، هەستە. خاو: خەو. غەفڵەت: بێ ئاگاهی، نەزانی. دەیسە: ئیتر، چیدی. واتە: ئەی دڵ دەی ئیتر لە خەوی نەزانین هەستە.

٣- خەوف: ترس. مەردەن: مردن، گیان سپاردن. دام: داو. وەس: بەس. واتە: لە ترسی مردن و چوونە بەر قاپی خودا ئاگادار بە و بەسە کەم لە داوی شەیتاندا گرفتار بە.

٤- ڕەها کەر: ڕزگار بکە، ئازاد بکە. حێرس: تەماح، تەما. کەر: بکە. واتە: لە داوی شەیتان خۆت ڕزگار بکە و بەس تەماحی دنیات هەبێ و لە خودا بترسە.

بــە فێســق و فجــوور عــومرت دا بــە بــاڎ
ڕوێ نــەکــەردت گــۆڕ و مــەرگ ئــەو یــاڎ[١]

شـــۆ وە لای خواجـــات واد ســــەحەرگا
جــە حــەفت ئاســمان گوشــادەن دەرگــا[٢]

ڕوێ ســەد نەوبــەت ســوجدەی خواجــات کــەر
ئەنــدەکئــامورزەن بینــای بــاڵای ســـەر[٣]

ئە گــەر جــە بــەڕەن، وەگــەر جــە بــارەن
ئــەو جــە کــەردەی تــۆ هــەر خەبــەردارەن[٤]

---

١- فێسق و فجوور: خراپەکاری، گەندەڵکاری، کاری تاوان و حەرام و بە عەیش و نۆش ڕابواردن. ڕوێ: ڕۆژێک. نەکەردت: نەتکرد. واتە: هەموو عومرت بە خراپەکاری و عەیش و نۆش بە بادا و یەک ڕۆژیش گۆڕ و مردنت بە یاد نەهێناوە.

٢- شۆ: بڕۆ. خواجات: لە بنەڕەتدا بە مانای نێرەمووکە بەڵام لێرەدا بە مانای کەسێکی گەورە و بەڕێزە، خودا. واد: وەعدە، کات و سات. سەحەرگا: بەیانی زوو، کازیوە. گوشاد: ئاوەڵا، کراوە، باز. واتە: لە کاتی بەیانیدا کە درگانەی حەوت ئاسمان ئاوەڵایە بچۆرە درگانەی خودا و لێی بپاڕێرەوە.

٣- ڕوێ: ڕۆژێک. نەوبەت: کەڕەت، جار. کەر: بکە. ئەندەک: کەم. ئامورز: بەخشین، لێخۆشبوون. بینای باڵای سەر: خودا. واتە: ڕۆژی سەد جار سوجدە بۆ خودا ببە کە لە هەموو تاوانی گەورە و بچووک خۆش دەبێت.

٤- بەڕ: وشکانی، بیابان. بار: بەحر، دەریا، زەریا. کەردە: کردەوە. خەبەردارەن: ئاگادارە. واتە: لە هەر کوێ بێت، لە وشکانی یا لە دەریا خودا ئاگای لە کردەوەکانت هەیە.

عـــومرت ویـــاران بـــە هـــەوا و هـــەوەس
واڎەی تۆبەتـــــەن، حێـــــرس دنیـــــا وەس[١]

واڎەی تۆبەتـــــەن یاوانـــــت نۆبـــــە
نۆبـــەی تۆبەتـــەن، کەرەمـــدار تۆبـــە[٢]

بـــادا ویـــرت بـــۆ خـــەم گۆڕاوشـــار
مەنزڵگـەی خـەراب ڕای سـەخت و دشـوار[٣]

ئـەو ڕاگـەی خەتـەر تـۆ مەشـیش پێـدا
سـەد هـەزار ڕاگیـر هـا نیشـتەن تێـدا[٤]

---

١- عومرت ویاران: عومرت ڕابواردووە. هەوا و هەوەس: کەڵکەڵەی شتێک کردن (زیاتر شتی خراو). واڎە: وەعدە، کات. حێرس: تەماح، تەما. واتە: هەموو تەمەنت بە کەڵکەڵەی شتی بێ سوود و بێ کەڵک ڕابواردووە ئیتر کاتی تۆبەیە و تەماحی دنیا کەم بکە.

٢- یاوانت نۆبە: نۆبەت گەیشتووە. کەرەمدار: خاوەن بەخشین. واتە: چیتر کاتی تۆبە کردنە، ئەی خاوەنی بەخشین تۆبە. (خودایا تۆبەم لێ قبووڵ بکەی).

٣- بادا: با، با وەکوو، باکوو. ویر: بیر، هۆش. گۆڕاوشار: ئازاری قەبر بۆ مردوو. مەنزڵگە: جێگەی شەو مانەوەی کاروان، شوێن و مەکان. خەراب: خراو، وێرانە. ڕا: ڕێگە. واتە: با خەمی ئازاری ناو قەبر و شوێنی مانەوەی خراو و وێرانە و ڕێگەی دوور و درێژت لە بیر بێت.

٤- مەشی: دەڕۆی. ڕاگیر: ڕێگر، چەتە. نیشتەن: دانیشتووە، کەمینی کردووە. واتە: ئەو ڕێگە خەتەر و مەترسیدارە کە تۆی پێدا دەڕۆی سەدهەزار ڕێگر و چەتەی تێدایە و کەمینیان کردووە.

بـــا دایـــم خـــەیاڵ خـــوداْ و پیـــرت بـــۆ
کەلێمـــەی تەوحیـــد هـــەر نـــە ویـــرت بـــۆ[١]

نـــام خـــوداْ بـــەر بـــە ڕۆژ و بـــە شـــەو
هـــیچ کـــەس جـــەی دنیـــا نەبـــەردەن گـــرەو[٢]

بـە هـەر دوو دەسـتان دنیـات گێرتـەن سـەخت
کـــۆر پەشـــیمان، شـــووم ناشـــنەخت[٣]

نـــە فکـــر دنیـــای بـــێ بونیـــادەنی
سـا مـــەرگش پێـــوەن، بـــە چـێش شـادەنی؟[٤]

☆☆☆

---

١- پیر: شێخی تەریقەت، سەردەستەی تەریقەت. تەوحید: تاقانە پەرەستی، وتنی ڕستەی (لا الـه الا اللّه). نە: لە (فارسی: دَر). ویر: بیر، هۆش. واتە: باکوو داییم خەیاڵی خودا و شێخی تەریقەتت بێت و وشەی تاقانە پەرەستیت ( لاالە الا اللّه) لە بیر بێت.

٢- بەر: ببە. جەی: لە ئەم، لەم. نەبەردەن: نەبردووە. گرەو: شەرت، مەرج. گرەو بردنەوە: سەرکەوتن لە شەرت بەستندا. واتە: بە ڕۆژ و شەو ناوی خودا ببە و یادی خودا بکە چون تاکوو ئێستە کەس نەیتوانیوە گرەو لەم دنیا بباتەوە. (کەس بە سەر دنیادا زاڵ نەبووە).

٣- گێرتەن: گرتووە. کۆر: کوێر، بێ سۆمای چاو. شووم: نەگبەت، بەدبەخت. ناشەنەخت: ناشرین، ناحەز، بەو تەشک. واتە: ئەی کوێری پەشیمانی بەدبەختی ناحەز بە هەر دوو دەست دنیات لە ئامێز گرتووە.

٤- بێ بونیاد: بێ بنەما، بێ بنج و ڕیشە. پێوەن: پێوەیە. بە چێش: بە چی. شادەنی: شادی، دڵخۆشی. واتە: هەر وای لە بیری دنیای بێ ئەسڵ و هیچ و پووچەوە، خۆ ئەم دنیا مردنی لە ☜

-٩[١]-

دڵـــه بـــێ نـــازەن، دڵـــه بـــێ نـــازەن
نازپـــەروەر بیـــەن، دەیســـه بـــێ نـــازەن[٢]

کەفتـــەی بـــێقیمـــەت بێزیـــای ڕازەن
ئـــاوارە مـــەبۆ هـــەر نـــە پـــەروازەن[٣]

مـــەیۆ نـــە پـــەرواز مـــن گێرتـــەن بـــاڵش
نازپـــەروەر بیـــەن، پەشـــێوەن هـــاڵش[٤]

---

☞ دوایە ئیتر دڵت بە چی ئەم دنیا خۆشە؟

-٩-

١- ک، ن ئێ، س، ئا، ڕ، عم، ب، ح.

٢- بیەن: بووە. دەیسە: دەی ئێستە. واتە ئەو دڵەی سەرەتا بە ناز پەروەردە کراوە ئێستە بێ ناز کەوتووە.

٣- کەفتە: کەوتوو. بێزیا: بێزراو، لە بەر چاو کەوتوو. ڕاز: قسە. مەبۆ: دەبێ. پەرواز: باڵگرتنەوە. واتە: وەک شتێکی بێ قیمەت کەوتووە و لە قسە بێزراوە و کەس حازر نییە قسەی لەگەڵ بکات و خەریکە ئاوارە و دەربەدەر دەبێت و خەریکی باڵ گرتنەوەیە و ئارام و قەراری نییە. لە نوسخەی «ک»دا بە جێی «بێزیای ڕازەن»، «بێزیای نازەن» نووسراوە.

٤- مەیۆ: دێت. گێرتەن: گرتووە. بیەن: بووە. پەشێوەن: پەشێوە. واتە: سەرەتا بە ناز پەروەردە کراوە و ئێستە کە بێ نازە حاڵی پەشێوە و دەیەوێت باڵ بگرێتەوە بەڵام من باڵم گرتووە و ناهێڵم بفرێت.

مـــن ئـــەر نـــازم هـــەن وەر نـــازم نیـــەن
جـــە خـــاک پـــای دۆســـت پـــەروازم نیـــەن[١]

مـــن ڕازیـــم بـــە جـــەور جـــەفای بـــێنـــازی
دڵ نـــــازار بیـــــەن پـــــێ نیـــــەن ڕازی[٢]

⁂

-١٠-[٣]

دڵـــە! تـــۆ بـــە تیـــر، دڵـــە! تـــۆ بـــە تیـــر
ناشـــی کەمانـــدار بپێکـــۆت بـــە تیـــر[٤]

پـــەی بـــێبەینـــەتان مەنیشـــی زویـــر
هـــەرگێز بەینـــەتدار نمـــەگنۆت ئـــەو ویـــر[٥]

---

١- واتە: من ئەگەر نازم بکێشن و ئەگەر بێ ناز بم جیاوازی بۆم نییە و حازر نیم خاکی ژێر پێی یار بە جێ بێڵم و باڵ بگرمەوە بۆ شوێنێکی دیکە.

٢- جەور: ئازار، سەختی. جەفا: ئازار، دژواری. واتە: من خۆم بە ئازار و ڕەنجی بێ نازی ڕازیم بەڵام دڵم کە سەرەتا بە ناز پەروەردە بووە و ئێستە بێ نازە ڕازی نابێت (لە بەر ئەوەیە دەیەوێ باڵ بگرێتەوە).

-١٠-

٣- ک، س، ڕ، ب، ح، ی.

٤- ناشی: کەسێک کە بە جوانی و ڕێک و پێکی شارەزای کارێک نەبێت. کەماندار: تیر و کەوان بە دەست. بپێکۆت: بتپێکێت، بتنەنگاوێ. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٥- پەی: بۆ. بێبەینەت: بێوەفا. مەنیشی: دادەنیشی، چاوەڕێ ئەبی. زویر: خەمگین، دڵگیر.

ئەگـــەر تـــۆ پێتـــەن زەڕێ عـــەقڵ و فـــام
پـــەی بـــێبەینـــەتان شـێت مەبـــە سەرسـام[١]

دۆس بـــێبەینـــەت ســـزا مـــەدۆ پێـــت
بـــە زوان مـــاچۆ ســـەرەم هـــا نـــە ڕێـــت[٢]

لەعنـــەت وەنەشـــان دۆس بـــێبەینـــەت
هـــەر ڕۆ بـــە ڕەنگـــێ مـــەنمانـــا مەینـــەت[٣]

ئەگـەر تـۆ بـە ڕاسـت مـەیل دۆسـت پێـت بـۆ
یـــارێ بگێـــرە ســـەرەش نـــە ڕێـــت بـــۆ[٤]

---

☞ بەینەتدار: باوەفا، وەفادار. نمەگنۆ: ناکەوێ. واتـە: ئـەی دڵ! ئەگـەر کەماندارێکی ناشـی (دۆستێکی بێ وەفا) کوتووپڕ بە تیرێک بتپێکێت و گرفتاری خۆیت بکـات بـۆ ئـەو بێبەینەتانـە دڵگیر و خەمگین دەبیت و قەت دۆستێکی وەفادارت ناکەوێتە بیر.

١- پێتەن: هەتە، پێتە. زەڕێ: زەڕەیەک. واتە: ئەگەر زەڕەیەک عەقڵ و فامت هەیە ئاگـادار بـە و بۆ بێوەفا و بێپەیمان شێت و سەرسام نەبی و لە داویان نەکەویت.

٢- سزا: ڕەنج. مەدۆ: ئەدات. ماچۆ: دەڵێت. واتە: ئاگادار بە دۆستی بێ وەفا ڕەنج و سزات ئـەدا و بە زمان دەڵێت سەرم لە ڕێتدایە (بەڵام بە دڵ وانییە).

٣- لەعنەت وەنەشان: لەعنەتیان لێ بـێ، بـە لەعنـەت بـن. ڕۆ: ڕۆژ. مـەنمانا: دەنـوێنن. واتـە: دۆستی بێ وەفا بە لەعنەت بن چون هەر ڕۆژ بە جۆرێک مەینەت و غەزەب دەنوێنن.

٤- بگێرە: بگرە. واتە: ئەگەر تۆ بەڕاستی مەیلت لە دۆست گرتنە و دەتـەوێ دۆسـت بگـری دەبـێ دۆستێک بگری سەری لە ڕێتدا بێت. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هەیە.

ئەگـــەر بـــێ‌بەینـــەت بـــانێ هـــەزارێ
ســـەرەم بـــە قوربـــان یـــەک بەینـــەتدارێ[1]

ئەگـەر بـێ‌بەینـەت قـەبرش پـەڕ نـوور بـۆ
قـەبرمان جـە قـەبر بـێ‌بەینـەت دوور بـۆ[2]

❋❋❋

-١١-[3]

دڵـــــە! دونیــــا دەور، دڵـــــە! دونیــــا دەور
بـــۆ تـــا بـــڎەیمێ چەنـــدێ دونیــــا دەور[4]

---

١- بانێ: ببن. واتە: ئەگەر هەزار دۆستی بێ‌وەفا ببێ سەرم بەقوربانی دۆستێکی وەفادار بێت.

٢- پەڕ: پڕ. بۆ: بێ، بێت. واتە: ئەگەر گۆڕی بێ‌وەفا پڕ بێت لە نوور با گۆڕی ئێمە لە گۆڕەکەیـەوە دوور بێت تەنانەت نامەوێ گۆڕەکەیشم نزیکی گۆڕی بێ‌وەفا بێت. ئەم بەیتە لە سـەرچاوەی «ح»دا نەهاتووە.

-١١-

٣- ک.

ئەم پارچە شێعرە لە دیوانە کۆکراوەکەی مامۆستا «عەبدوڵڵای حەبیبی»دا نییـە و فـەرموویان لـە دوای چاپی دیوانەکە ئەم شێعرەم کەوتە بەر دەست و تەنیا لە نوسخەی «ک»یش دا هەیە. بۆ منی هەنارد و فەرموویان با لە وەرگێرانەکەی تۆدا هەبێت، منیش بە پێی زانست و توانای خۆم شـەرحـم کرد بەڵام مامۆستا «عەبـدوڵڵای حـەبیبی» و مامۆستا «سـەعدی غـەریبی» بـە شـەرحەکەمدا چوونەوە و هەڵە و پەڵەکانیان بۆ ڕاست کردمەوە «وەرگێڕ».

٤- دونیا دەور: دنیای دەوراندەور، دنیای سووڕاوە. بۆ: بێ، وەرە. بڎەیمێ: بدەین. واتە: ئەی دڵـە وەرە با چەند ماوەیەک لە ئەم دونیایە سووڕێک بخۆین (دەورێک بدەین).

پێســـەش نمانـــا ســـتەمنمای جـــەور
بشـــمێ وە جـــایێ ئـــاو هـــۆرگێرۆ هـــەور[١]

بویـــەرمێ جـــە ڕووی ڕۆشـــنایی وەڵات
پەشـــتان نـــە پایـــەی بـــەحر زوڵـــمات[٢]

ڕەفێـــق مـــاهی مـــەنزڵ نـــە ئـــاو بـــیم
ســـی چـــوون ماهیـــان دەروون ســـیاو بـــیم[٣]

بـــادا شـــنیا بـــۆ دانێـــو جـــە شـــنەخت
جـــەو دانـــە دانێـــو خـــەیر کـــەران وە بـــەخت[٤]

---

١- پێسەش: وەهای، وای. نمانا: نواند. ستەمنما: کەسێک یا شتێک کە ستەم بنوێنێت. جەور: سەختی. ستەمنمای جەور: دنیا، فەلەک. بشمێ: بڕۆین. ئاو هۆرگێررۆ هەور: هەور ئاو هەڵبگرێت، پێم وایە یانی هەور ئاو لە خۆی بگرێت و نەبارێت. واتە: دونیای سەختیدەر وای بۆ ئێمە نواند کە بڕۆینە شوێنێک هەور ئاو لە خۆی بگرێت و بە سەرماندا نەبارێت.

٢- بویەرمێ: تێپەڕین. پەشتان: تێکەڵ بوون لەگەڵ شتێک. بەحر: دەریا، زەریا. زوڵمات: تاریکی. واتە: لە ڕووی دنیای ڕۆشن ون ببین و تێکەڵی بەحری تاریکی ببین.

٣- ماهی: ماسی. سی: با، وا. چوون: وێنەی، وەکوو. واتە: ببین بە دۆستی ماسی ناو ئاو و با وەکوو ماسیەکان دەروونمان ڕەش ببێتەوە.

٤- بادا: با، با وەکوو، باکوو. شنیابۆ: وەشێندرابێت. شنەخت: فام. جەو: لە ئەو، لەو. خەیر کەران: خێر بکەن. واتە: باکوو دانەیەک لە فام وەشێندرابێت و لەو دانە دانەیەک خێر بە بەختی من بکەن.

وەرنــە چۆگــە نــێش هێجــران چــوون نێشــتەر
بکـــەرمێ دەریـــا بەســـرینان فێشـــتەر[١]

تـــا وەختـــێ زاهێـــر دەور مـــادی بـــۆ
خـــەم داخـــان جـــە تـــاو تـــەپڵ شـــادی بـــۆ[٢]

☆☆☆

١- وەرنە: ئەگینا، ئەینا. چۆگە: لەوێ. نـێش: ئـازار. چـوون: وێنـەی، وەکـوو. نێشـتەر: نەشـتەر، کەرەستەیەکی نووک تیژ کە بۆ خوێن گرتن لە لاشەی مـرۆڤ بـە کـار دەبرێـت. بکـەرمێ: بکـەین. بەسـرینان: بـە ئەسـرینان، بـە فرمێسـکان. فێشـتەر: زۆرتـر، زیـاتر. واتـە: ئـەگینا (چـوون دوور نەکەوینەوە) لەوێ نێش و ئازاری هێجران و دووری وەکوو نەشتەر وائەبێ و بە هۆی ئـەوەوە ئێمـەش فرمێسکی چاومان زۆرتر ئەبێ و دەریا بە ئەسرینەکانمان زۆرتر ئەکەین. مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر لەوێ (دەریا) وا نەبوو کە من چاوەڕوانی ئەکەم، دەرد و ئازاری هێجـران زۆرتـر ئـەبێت و فرمێسـکی چاوی ئێمەش دێتە خوارێ و ئاوی دەریاکە زۆرتر ئەکەین.

٢- زاهێر: ڕواڵەت. مادی: ماڵی دنیا. بۆ: ببێت. واتە: ئەگینا تـا ئـەو کاتـە کـە ڕواڵـەت دونیـای مادیی بێت و (منیش بە پێی یاسای ئەم دونیای مادییە بژیم) هەرچی تـاوی تـەپڵی شـادی زۆرتـر بێت، خەم و خەفەتی منیش زۆرترە. مەبەستی ئەوەیە لـە ئـەم دونیـای مادییـەدا خـەڵک خۆشـی ئەکەن و تەپڵی شادی لێ ئەدەن بەڵام من چوون هیچ بەستراوەیی مادیم نییە، هەرچی تـاوی تـەپڵی شادی خەڵک زۆرتر بێت، خەم و خەفەتی منیش زۆرتر ئەبێت.

-١٢[١]-

دڵـــــــــە! دەور دوون، دڵـــــــــە! دەور دوون
مـۆ بـە تـەنگ جـە جـەور جـەفای دەور دوون[٢]

وێـت مەکـەر بـە چنـگ خـار خـەم زەبـوون
بـا بـێپـەروا بـی تـا چـوون مـەبۆ چـوون[٣]

ئـەر خـەم خـەیاڵش چـوون کـۆ لێـت بـارەن
ئـەر شـادیش پـەیپـەی هـەزار هـەزارەن[٤]

ئـاخر هـیچ کـامێ پـەیش نـی مـدارا
مەویـەران چـوون بـاد بـێسـوود سـارا[٥]

---

-١٢-

١- ک، نێ، س، ڕ، ب، ح.

٢- دەور: ڕۆژگار، دنیا. دوون: بێ بایەخ، بێ ئەرزش، هیچ و پووچ. مۆ بە تـەنگ: ناڕەحـەت مەبـە، عاجز مەبە. جەور: ڕەنج. واتە: ئەی دڵ! وەرە و لە ڕەنج و مەینەتی دنیـای هـیچ و پـووچ ناڕەحـەت مەبە.

٣- وێت: خۆت. مەکەر: مەکە. زەبوون: هەژار، بێ دەسەڵات. بێپەروا: نەترس. چوون مەبۆ چوون: چی دەبێ چی، چی پێش دێت. واتە: ئەی دڵ! خۆت بە چنگی خەم کە بە وێنەی دڕوو وایە هەژار و بێدەسەڵات مەکە، نەترس بە با بزانین چی پێش دێت.

٤- چوون: وێنەی، وەکوو. کۆ: کێو، یاڵ. ئەر: ئەگەر. پەیپەی: بە دوای یەکدا. مانـای ئـەم بەیتـە لەگەڵ بەیتی دواییدا دیت.

٥- پەیش نی: بۆی نییە. مدارا: ئارام و قەرار. مەویەران: ڕادەبوورن. سارا: دەشت و دەر. واتە: ☜

سـا کـه بـێ‌مـدران خـەم و شـادی دەور
بـۆ تـا پـەی شـادیش نـەبیم بەنـد جـەور[1]

گـەردەن نـەهادەی بـار قـەزاش بـە
بـێ‌پـەروا جـە بەنـد ڕەشـتەی سـزاش بـە[2]

☆☆☆

-١٣-[3]

دڵـە زاریـش کـەرد، دڵـە زاریـش کـەرد
وەخـت مـەرگش بـێ ڕوێ زاریـش کـەرد[4]

---

ئەگەر خەیاڵی خەم و خەفەت لێت بارە و ئەگەر شادی یەک بە دوای یەکدا هەزارە لە کۆتاییدا نە خەم و نە شادی هیچ کامیان بەقایان نییە و تا سەر هاوڕێت نین و بە وێنەی «با»ی بێ قازانجی دەشت و دەر ڕادەبوورن.

١- مدران: وەستان. بۆ: وەرە، بێ. پەی: بۆ. نەبیم: نەبین. بەند: ئەسیر. واتە: کاتێک خەم و شادی ڕۆژگار ناوەستن، وەرە با بۆ شادی و خۆشییەکەی خۆمان نەخەینە زەحمەت و خۆمان ئەسیری جەور و زەحمەتی نەکەین.

٢- گەردەن نەهادە: مل کەچ، تەسلیم بوو. قەزا: هەر شتێک پێش بێت و دەسەڵاتی مرۆڤی تێدا نەبێت. بێ پەروا: نەترس. ڕەشتە: ڕیسراو. سزا: عەزاب دان. واتە: باکوو مل کەچ بکەین بۆ باری قەزا و قەدەر و تەسلیمی قەزا و قەدەر بین و لەو بەنە کە ڕیسراویەتی بۆ سزا دانمان، نەترسین.

-١٣-

٣- ک، ئێ، س، ڕ، عم، ب، ح.

٤- زاری: شیوەن. کەرد: کرد. وەخت مەرگش بێ: کاتی مەرگی بوو. ڕوێ: ڕۆژێک. واتە: دڵم کاتی مەرگی بوو و ڕۆژێک دەستی کرد بە شیوەن کردن.

ناگـــا کەســـێ لـــێش نگـــای یـــاریش کـــەرد
بـــەو نگـــا جـــە مـــەرگ نگـــاڎاریش کـــەرد [1]

جـــە پـــەی دیـــڎەی بـــەڎ نگـــاش نیـــان بـــێ
نیـــانش بـــەو تـــەور بەســـتەی گیـــان بـــێ [2]

فیـــدای نگـــاش بـــام بـــیم بـــە فـــەریادڕەس
یـــاوام بـــە فـــەریاد جـــە ئـــاخر نەفـــەس [3]

☆☆☆

١- ناگا: کوتووپڕ. نگا: سەیرکردن، چاو تێبڕین. واتە: کوتووپڕ کەسێک بە چاوی دۆستیەوە سەیری کرد و بەو سەیر کردنە لە مردن ڕزگاری کرد.

٢- جە پەی: لە بۆ. نیان: نیهان، شاراوە. بەو تەور: بەو جۆرە، بەو شێوە. واتە: لە بەر ئەوەی ئەوەک چاوی بەد پێی بزانێ لە ژێر چاوەوە بە جۆرێک کەس نەزانێت سەیری کرد، گیانم بەسترا بەو سەیر کردنە شاراوەیەوە.

٣- بام: بم. بیم: بۆم بوو بە. فەریادڕەس: کەسێک کە بە دادی کەسێکی لێ قەوماو بگات. یاوام بە فەریاد: گەیشت بە هاوارم. واتە: بە قوربانی ئەو سەیرکردنەی بم کە بە فریام گەیشت و لە ئاخر نەفەسدا بۆم بوو بە فریادڕەس.

-١٤-[١]

دڵـــــــه! زام نـــــــۆ، دڵـــــــه! زام نـــــــۆ
زایـــــــف و زەبـــــــوون، زەدەی زام نـــــــۆ[٢]

چەنـــد تیـــر کاریـــت نـــە تـــەن گێرتـــەن کـــۆ
ئـــاخ پـــەی بـــەخت وێـــم، دڵـــە! داخ پـــەی تـــۆ[٣]

مـــــن زار خـــــەمناک زەدەی هێجـــــرانبـــــار
پێکیـــــــای پـــــــەیکان تایێفـــــــەی تـــــــەتار[٤]

-١٤-

١- ک، ئێ، س، م، ئا، ڕ، ب، ح، ی. کاک حەکیم ئەم پارچە شێعرەی هـەم لـە دیـوانی بێسـارانیدا و هەم لە دیوانی «ئەحمەد بەگ کۆماسی»دا هێناوە بەڵام بە پێـی نوسـخەکانی بـەر دەسـتی ئێمـە شێعرەکە شێعری بێسارانییە و کاک حەکیم بـە هەڵـە بـە نـاوی کۆماسـییەوە نووسـیویە، هـەروەها یەکێکە لەو پارچە شێعرانەی کە لە بەشی «شێوازێکی تایبەت»دا باسمان کردووە.

٢- زایف: لاواز. زەبوون: هەژار، لاواز. زەدە: پێکراو. واتە: ئەی دڵ کە لاواز و هەژار کـەوتووی و بـە زامی نوێ پێکراوی.

٣- گێرتەن: گرتووە. وێم: خۆم. پەی: بۆ. واتـە: چەنـد تیـر کاریـت لـە خـۆ کـۆ کردوەتـەوە و وا بـە لاشەتەوە، ئەی دڵ! ئاخ بۆ بەخت و ئێقباڵی خۆم، داخەکەم بۆ تۆ.

٤- زار: زەلیل و خەفەتبار. زەدە: پێکـراو. هێجـران: دووری. پێکیـا: پێکـراو. تـەتار: تاتـار، هـەم دەتوانێت بە مانای کەسێک بێت کە چاوی لە جوانیدا بە وێنەی ئاسکی وڵاتی مـوغولسـتان بێـت و هەم دەتوانێت مەبەست لە قەومی موغول بێت کە هێرشیان کردە سەر ئێران و کوشت و کوشتارێکی زۆریان خستە ڕێ. واتە: من زەلیل و خەفەتبارم و بە تیری تایفەی تاتار پێکراوم.

دەروون سیاداخ، سۆچیای خەمان
بێ زەوق کەمچاخ خار ستەمان[١]

کەردات بە سەرمەشق زامان بێ شۆ
ئاخ پەی بەخت وێم، دڵە! داخ پەی تۆ[٢]

فرێم وات دڵە! مروەتەن ئامان
مەوزەم نە گێجاو بەحر بێ سامان[٣]

---

١- سیاداخ: داخێک کە جێگەکەی ڕەش بێتەوە. سۆچیا: سووتاو، سووتراو. کەم چاخ: ناکۆک، بێ کەیف. خار: دڕوو، دڕک. واتە: من دەروونم بە خەم و خەفەت سووتاوە و ڕەشیی داخی پێوەیە و دڕووی ستەم بێ زەوق و کەیفی کردووم.

٢- کەردات: کردمت. سەرمەشق: لە بنەڕەتدا بە ئەو نووسراوە دەڵێن کە خۆشنووس دەینووسێت تا کەسێکی تازەکار لە ڕوویەوە بنووسێت و فێری خۆشنووسی بێت بەلام بە کەس یا شتێک کە کەسێکی دیکە بە سەیر کردنی عیبرەت بگرێ یا شتێک فێر بێت دەڵێن. بێ شۆ: بێ شوێن، بێ جێگە، ئەتوانێ کورتکراوی وشەی «بێشومار»یش بێت واتە لە ڕادە بەدەر. وێم: خۆم. پەی: بۆ. واتە: کردمت بە عیبرەتی زامە بێ شوێنەکان (زامە زۆرەکان) و هەرکەس لێم دەڕوانێت زامی بێ بەر و شوێنم پێوەیە دەبینێت. ئەی دڵ! ئاخ بۆ بەخت و ئیقباڵی خۆم، داخەکەم بۆ تۆ.

٣- فرێم وات: زۆرم وت. مروەت: پیاوەتی، چاکە. ئامان: ئاگات لێ بێت. مەوزەم: مەمخە. بەحر بێ سامان: دەریای بێ ئامان. واتە: زۆرم وت ئەی دڵ! پیاوەتیت بێ و ئاگات لێ بێت نەمخەیتە نێو گێژاوی دەریای بێ ئامان.

هـــەر نـــە تـــاو عەشـــق نـــە دەروون فڕیـــای
تـــا بـــە شـــۆڵەی شـــەم چراخـــان گڕیـــای[١]

تـــەن بـــی بـــە زوخـــاڵ ســـیا ســـفتەی کـــۆ
ئـــاخ پـــەی بـــەخت وێـــم، دڵـــە! داخ پـــەی تـــۆ[٢]

ئـــــایر دەروون ســـــەر کـــــەردەن نـــــە دڵ
جـــەرگم چـــوون کـــەباب پێکیـــان وە چـــڵ[٣]

نـــازاران بـــە خەشـــم غـــەزەب گێرتـــەن لـــێم
بـــێ وەرمـــی شـــەوان بیـــەن بـــە خـــذێم[٤]

---

١- نە: لە (فارسی: دَر). تاو: تینی زۆر. فڕیا: فڕیو. شۆڵە: نووری ئاگر. گڕیا: داگرساو. واتە: ئەی دڵ! لە تاوی عەشقی دەروونم باڵت گرتەوە تا ئاخری بە نووری شەمی چراکان گڕت گرت و سووتای.

٢- تەن: لاشە. سفتە: سووتاو. وێم: خـۆم. پـەی: بـۆ. واتـە: (ئـەی دڵ!) لاشـەت بـوو بـە وێنـەی خەڵووزی کێوی سووتاو، ئەی دڵ! ئاخ بۆ بەخت و ئێقباڵی خۆم، داخەکەم بۆ تۆ.

٣- ئایر: ئاگر، ئاور. سەرکەردەن: کەلاوی کردووە، ڕژاوە. چوون: وێنـەی، وەکـوو. پێکیـان: پێکـراوە. چڵ: تووڵی باریکی دار. کاتێک ئەڵێن «شتێک چوو بە چڵدا» یا «پێکراوە بە چڵ» واتە کون بـووە و لێرەدا بە مانای «گۆشت و سیخ» هاتووە و پێکیان بە چڵدا یانی کراوە بە سیخەوە. واتـە: ئـاگری دەروونم لە دڵمەوە کەلاوی کردووە و ڕژاوە و جەرگم وەک کەباب کراوە بە سیخەوە.

٤- خەشم: تووڕەیی. گێرتەن: گرتووە. بێ وەرمی: بێ خـەوی. بیـەن: بـووە. خـذێ: عـادەت. واتـە: نازداران بە تووڕەییەوە قینیان لێم کردووە و بێ خەوی شەوان و شەونخوونی بووە بە عادەتم.

جــــه تـــاو زلّفـــان ســـیای عەنبـــەربۆ
ئـاخ پــەی بــەخت وێـم، دلّــە! داخ پــەی تـۆ[١]

حـــــەکیمان مـــــەیان مـــــەوینان ســـزام
شـــاڎەت مـــاوەران وە ســـفتەی ســـیام[٢]

دەیســـە بگێـــرە دەســـت بـــە زامـــەوە
بــــە زام خــــەدەنگ نەونەمامــــەوە[٣]

هـــەر بیێکـــە ئـــاخ شـــەوان تـــا بـــە رۆ
ئـاخ پــەی بــەخت وێـم، دلّــە! داخ پــەی تـۆ[٤]

٭٭٭

---

١- جە تاو: لە حەیبەت. سیا: ڕەش. عەنبەر: ماکێکی بۆنخۆش کە بۆ دروست کردنی عەتر بە کـار دەبرێت و ڕەنگەکەی نزیک بە ڕەشە. وێم: خۆم. پەی: بۆ. واتە: لە حەیبـەتی زوڵفـە ڕەشـەکانت کـە بۆنیان وەکوو بۆنی عەنبەر وایە، ئەی دڵ! ئاخ بۆ بەخت و ئێقبالّی خۆم، داخەکەم بۆ تۆ.

٢- مەیان: دێن. مەوینان: دەبینن. شاڎەت ماوەران: ئیمان دەهێنن، بڕوا دەکـەن. سفتە: سـووتاو. سیا: ڕەش. واتە: حەکیم و حالّ زانان دێن سزایەک کە پێم دراوە دەبینن و ئـیمان بـە لاشـە سـووتاوە ڕەشەوە بووەکەم دێنن. مەبەستی ئەوەیە کە ئیمان بەوە دێنن کە چۆن کەسێک بە زامی دڵ بەو جۆرە دەسووتێ و لاشەی دەبێتە خۆڵەمێش و ڕەش دەبێتەوە.

٣- دەیسە: دەی ئێستە. بگێرە: بگرە. خەدەنگ: تیر. نەونەمام: نمامی تازە پێگەیشتوو. واتە: دەی چیتر ئێستە دەست بگرە بە ئەو زامانەوە کە یاری تازە پێگەیشتوو کردوویە.

٤- واتە: هەموو شەوێک تا ڕۆژ دەبێتەوە هەر ئاخ و هەناسە هەڵبکێشە، ئەی دڵ! ئاخ بۆ بـەخت و ئێقبالّی خۆم، داخەکەم بۆ تۆ.

-١٥-[١]

دڵـــــه! لاڵ خاســـــەن، دڵـــــه! لاڵ خاســـــەن
زوانـــــت بەســـــته و لـــــەنگ و لاڵ خاســـــەن[٢]

جـــه بـــێ‌بەینـــەتان، بـــەین‌بـــەتاڵ خاســـەن
جـــه ســـای مـــەخاران خـــەم‌خـــەیاڵ خاســـەن[٣]

جەســـــتەی بێزیـــــات سەنگســـــار خاســـــەن
گڵکـــــۆی نەدێـــــەنت نادیـــــار خاســـــەن[٤]

دیـــدەی نـــەمینت بـــه بـــێ‌نـــوور خاســـەن
چۆتـــەق چـــۆڵان، نـــوور جـــەی دوور خاســـەن[٥]

---

-١٥-

١- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٢- زوان لەنگ: لاڵ تور، کەسێک کە نەتوانێت بە ڕێک و پێکی قسە بکات. واتە: ئەی دڵ خاستر وەهایە زمانت بەستراو و لاڵ بیت. لە بەیتە دواییەکاندا ئەڵێت لاڵی لە چی خاسترە.

٣- بێ‌بەینەت: بێ‌وەفا. بەین‌بەتاڵ: جودابوونەوە، بەین شێوان. مەخار: ئەشکەوت. واتە: ئـەی دڵ! خاستر وەهایە لەگەڵ بێ‌وەفایان بەینت نەمێنێ و بڕۆیتە ئەشکەوتێک و خۆت بـە فکـر و خـەیاڵی خەم و خەفەتەوە سەرقاڵ بکەیت (بخافڵێنی).

٤- جەستە: لاشە. بێزیا: بێزراو، لە بەر چاو کەوتوو. سەنگسار: بـەرد بـاران کـردن، بـەر بـەرد دراو. گڵکۆ: گۆڕ، قەبر. نەدێەن: نەبینراو. واتە: ئەی دڵ! لاشەی لەبەر چاو کەوتووت بۆ ئەوە خاسە بەرد باران بکرێت و گۆڕە نادیارەکەت هەر بۆ ئەوە خاسە نادیار و نەبینراو بێت.

٥- نەمین: تەڕ. چۆتەق: شوێنی تاریک کە بە پەل کوتان و تەقەی داردەست بتوانی ڕێگە ☜

ســا كــه تــۆ وێــت دی، بــەی هــاڵ وینــه
هــیچ ئەنــدام بــه قــەوڵ قــەرار وی نــه [١]

بەتەرتــەر گنــی، بــه مەینــەتێ بــی
بەنــدی بــه جــەفای بــێ بەینــەتێ بــی [٢]

❀❀❀

☜ بدۆزیتەوە. واتە ئەی دڵ چاوانی فرمێسکاویت بۆ ئەوە خاسن بێ نوور و تاریک بن و بە وێنەی تاریکایی شوێنە چۆڵەکان نووریان لێ دوور بێت. لە سەرچاوەکانی «س»، «ب»، «ح» و «ئێ»دا بە جێی «چۆتەق چۆلان»، «جە وەخت جەولان» و لە نوسخەی «ڕ»دا «جە وەڵات جەولان» نووسراوە کە دیارە لە بەر نەزانی مانای «چۆتەق» وایان گۆڕیوە.

١- وێت: خۆت. بەی هاڵ: بەم حاڵە. وینە: ببینە. وی: ئەوە. واتە: کاتێک کە خۆت چاوت بەم بارودۆخە کەوت (متمانە بە چاوت مەکە) هیچ ئەندامێکی لاشەت بە قەوڵی ئەوی‌تر ناکات. مانای ڕێکی و پێکی ئەم بەیتەمان بۆ ساق نەبووەوە. لە سەرچاوەکانی «ح»، «س»، «ڕ» و «ب»دا بە جێی «وینە»، «وێنە» و نیوەبەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «هیچ بە قەوڵ و فێعیل ئیقرار مەبینە».

٢- بەتەرتەر گنی: خراوتر دەکەوی. بەندی: ئەسیر. واتە: (ئەگەر وەها نەکەی) خراوتر بە تووشی ڕەنج و مەینەتەوە ئەبی و ئەبی بە داوی جەفای بێ وەفاوە. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هەیە و وا دیارە بوونی بۆ تەواو کردنی مانای شێعرەکە پێویستە.

-١٦-[1]

دڵـــــە!ناڵەتـــــەن، دڵـــــە! ناڵەتـــــەن
دەیســــــە بناڵـــــە، چـــــاخ ناڵەتـــــەن[2]

ســـــەرەت داخ کـــەران، یـــە کـــام زاڵەتـــەن؟
مـــــەر دنیـــــای فـــانی نـــە قەباڵەتـــەن؟[3]

دانگـــێ شـــەو مـــانۆ بێـــدار بـــەر جـــە خـــەو
دۆســـت مـــەدارۆ دۆســـت ناڵـــەی نیمەشـــەو[4]

-١٦-

١- ک، ئا، ئێ، ڕ، س، م، ب، ح.

٢- دەیسە: دەی ئێستە. چاخ: کۆک، بەرزترین بەرزی. واتە: ئەی دڵ! دەی ئێستە با ناڵەت بێت، چون ئێستە دەنگت بەرزە و دەنگت بۆ ناڵین کۆکە.

٣- داخ کەران: داخ بکەن. یە کام: ئەمە کام. زاڵە: ورە، هێز، ڕۆحیە. فانی: نەماوە، بێ مانەوە، بێ بەقا. مەر: مەگەر. قەباڵە: پارچە کاغەزێکە کە «سەنەد»ی پێ ئەڵێن و تێدا دیاری دەکرێت شتێک هی کەسێک بێت. واتە: بەڵکوو سەرت داخ بکەن، ئەمە چ جۆرە هێز و ورەیەکە؟ مەگەر سەنەدی دنیای بێ بەقا بە ناوتەوە کراوە (کە بەم جۆرە بە هێز و ورەی؟). لێرەدا مەبەست لە ناڵە کردن قسە کردن لەگەڵ خودا و عیبادەت کردنە.

٤- دانگێ: یەک لە شەشی هەر شتێک. مانۆ: بمێنێ. دۆست(یەکەم): ویستن، گەرەک بوون، خۆش لێ هاتن، پێخۆش بوون. مەدارۆ: دەیەوێ. دۆست(دووهەم): یار، لێرەدا مەبەست خودایە. واتە: هێشتا شەوی مابێت لە خەو هەستە و دەست بکە بە ناڵە و عیبادەت کردن، چون دۆست (خودا) ناڵەی نیمەشەوی پێخۆشە.

ســــــوب ســــــەحەرگاهان ئەوەلاڵـــــەوە
بەســــــرینان گـــــەرم، بـــــاھ و ناڵـــــەوە[1]

ئەگـــەر ســـۆزێو هـــەن جـــە ناڵەتـــەڎا
ســـا ڕەحمـــێش مـــەیۆ بـــە لاڵەتـــەڎا[2]

* * *

## -١٧-[3]

دڵـــــە! هـــــەزارەن، دڵـــــە! هـــــەزارەن
ئـــەر ســـەد زامـــەتت هـــەزار هـــەزارەن[4]

ئـــەر ســـەد خـــەیاڵت شـــەوان چـــوون خـــارەن
بـــێوەفـــا ئـــاخر جـــەفاش نـــە کـــارەن[5]

---

١- سوب: بەیانی. سەحەرگاهان: بەیانیانی زوو. ئەوەلاڵەوە: لالانەوە. بەسرینان: بە ئەسرینان، بە فرمێسکان. باھ: بە ئاھ. واتە: بەیانیان بە فرمێسکی گەرم و نالان دەست بکە بە عیبادەت کردن.

٢- سۆزێو: سۆزێک. مەیۆ: دێت. واتە: سا ئەگەر سۆزێک لە ناڵەتدا هەبێت خودایش بەزەیی پێتدا دێت و لالانەوەت لێ قەبووڵ دەکات.

-١٧-

٣- ک، ئێ، س، ڕ، ئا، ب، ح.

٤- ئەر سەد: هەر چەند. زامەت: زام و برین، ڕەنج و زەحمەت، لێرەدا بە مانای زام هاتووە. واتە: ئەی دڵ! هەرچەند زامانت هەزار هەزارە...

٥- خار: دڕوو، دڕک. نە کارەن: لە کاردایە. واتە: ڕاسە کە خەیاڵی شەوان بە وێنەی دڕوو پێتدا ☜

فــرێ کــەس چــوون تــۆ نــە دایــرەی دەور
کێشــان پــەرێ بــەین بــێبەینــەتان جــەور[١]

ئــاخر جەفاشــان بــێبــارە بیــەن
بــەین جــە بەختشــان ئــاوارە بیــەن[٢]

ســا بــێوەفایــان پــەرێ ئــەو یــاران
وەفــا و مەیرشــان بــە بــێمــداران[٣]

ئێمــەیچ بگێرمــێ نەبــەردیم ڕەنجــێ
نــەدێمان جــە جــەور خــەرابان گــەنجێ[٤]

☆☆☆

☜ دەچەقێت، چونکە کاری بێ وەفا هەر جەفا کردنە.

١- فرێ: زۆر. چوون: وێنەی، وەکوو. دەور: ڕۆژگار. کێشان: کێشاوە. پەرێ: بۆ. واتە: زۆر کەس بە وێنەی تۆ لە جەغزی (دایەرە) ڕۆژگاردا بۆ شەرت و وەفای بێ وەفایان ڕەنج و مەینەتیان کێشاوە.

٢- بارە: بەهرە، سوود، قازانج. بیەن: بووە. واتە: سەرنجام ئەو جەفا و جەور و ڕەنجە کە کێشاویانە بێ سوود و بەهرە بووە و بەقا و بەین لە بەختیان دوور کەوتووتەوە و ئاوارە بوون و وەفایان لە یار نەبینیوە.

٣- پەرێ: بۆ. مەیر: مێهر، خۆشەویستی. بێ مداران: مانەوەی نییە. واتە: وەفا و خۆشەویستی بێ وەفایان بۆ ئەو یارانە مانەوەیان نییە.

٤- بگێرمێ: بگرین، وا فەرز بکەین، وای دابنێین. نەبەردیم: نەمان برد. نەدێمان: نەمان بینی. واتە: ئێمەیش وای دادەنێین کە هیچ ڕەنجێکمان بۆ بێ وەفایان نەبردووە و هیچ خەزێنەیەکمان لە خراوە و چۆڵگەدا نەدیوە. لێرەدا مەبەستی لە گەنج و خەزێنە «وەفا»یە کە پاش بردنی ڕەنج بۆ ☜

-١٨[١]-

دڵــــەی دەردیـــــنم! دڵـــــەی دەردیـــــنم!
هـــەی دڵـــەی پـــەڕ داخ دایـــم دەردیـــنم![٢]

مـــــەکان کێشـــــای ئـــــاه ســـــەردینم!
بـــە بـــاد ســـتێزەی تـــەن کـــۆی گـــەردینم![٣]

تـــا کـــەی مـــەنمانی جـــەفا بـــە هـــاڵم؟
مـــەوینی بـــە کـــۆن جـــە لات زوخـــاڵم؟[٤]

☞ بێ وەفایان، بێ وەفاییت پێ ئەنوێنن و هیچ گەنجێکت دەست ناکەوێ. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ» و «ئا»دا هەیە.

-١٨-

١- ک، ئێ، ڕ، س، ب، ح.

٢- دەردین: دەردەدار. پەڕ: پڕ، لیپ. واتە: ئەی دڵەی پڕ داخ و دایم دەردەدارەکەم.

٣- بە باد ستێزەی: بە با هەستان، هەستان بە با. کۆی گەردین: کێوی تۆز. واتە: ئەی شوێنی هەڵکێشانی هەناسە ساردەکانم ئەی کە لاشەت بووە بە کێوی تۆزین و بە «با» بە وێنەی تۆز هەڵدەستێ و «با» دەیبا.

٤- مەنمانی: دەنوێنی. هاڵ: حاڵ. مەوینی: نابینی. جە لات: لە لات، لە لای تۆ. واتە: تا کەی جەفا و جەور بە حاڵم دەنوێنی؟ مەگەر نابینی سووتاوم و بووگم بە زوخاڵ و زوخاڵم بە وێنەی کێو لە لات هەڵچنراوە؟

بــــەڵێ مــــەوینوو بــــەخت ســــیای تــــۆ
ســــتارەی مەیشــــووم نــــە چــــەم زیــــای تــــۆ[1]

مننــــەت مەبــــەروون ئەوەنــــد زامــــەت جێــــت
پاســــکە بــــەخت تــــۆن هــــێمای کەمــــەن پێــــت[2]

-١٩-[3]

دڵــــەی کەمتــــەر ویــــر!، دڵــــەی کەمتــــەر ویــــر!
دڵــــەی کــــەم خــــەیاڵ! کــــەم فــــام کــــەم ویــــر![4]

---

١- مەوینوو: دەبینم. سیا: ڕەش. ستارە: ئەستێرە، هەسێرە. مەیشووم: نامویارەک، ناپیرۆز، نەحس. زیا: هەڵهات. واتە: بەڵێ، ڕاستە دەبینم کە تۆ بەختت ڕەشە و ئەستێرەی نامویارەک و نەحسی تۆ دەبینم کە لە چاوانمدا هەڵهاتووە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «مەیشووم»، «وەشووم» و بە جێی «نە چەم»، «بەختم» نووسراوە.

٢- مەبەروون: دەبەم. ئەوەند: ئەوەندە، هێندە. زامەت: زام. جێت: لە تۆدا. پاسکە: وەها کە. هێما: هێشتا. واتە: ئەوەی کە بەختی تۆیە و من دەیزانم ئەو زامە کە وا بە تۆوە مننەتی پێیە چون هێشتا کەمە بۆت. مەبەستی ئەوەیە کە تۆ هێندە بەختت ڕەشە کە دەبێت زامی زۆرترت ببێ و من مەمنوونم بۆ ئەو برە زامە، چون بە پێی بەختت هێشتا کەمە.

-١٩-

٣- ک، نێ، ن، س، ئا، ڕ، ب، عم، ح.

٤- ویر: بیر. واتە: ئەی دڵەی کەم خەیاڵ و کەم بیر و کەم فامەکەم.

شـــۆ جانفیـــدایی جـــه پەروانـــە گێـــر
پـــەروا نـــەدارۆ جـــە شـــۆڵەی ئـــایێر[١]

وێنـــەی پەروانـــەی پـــەڕ مـــەیر و وەفـــا
پـــەرێ وەســـڵ دۆســـت بکێشـــە جـــەفا[٢]

تـــا دڵ بـــە ئـــایر عەشـــق نمەســـۆزۆ
کـەی مـەبۆ سـاکن؟ دۆسـت چـوون مـەیۆزۆ؟[٣]

وێ دە نـــە ئـــایر وێنـــەی پـــەروانان
تـــا جـــە تایێفـــەی مـــەجنوونت وانـــان[٤]

***

١- شۆ: برۆ. جانفیدایی: گیان لەسەر دەست بوون. گیانفیدایی، کەسێک کە ڕێی کەس یا شتێکدا گیانی بدات. گێر: بگرە. پەروا: ترس. نەدارۆ: نیەتی. جە: لە. شۆڵە: گڕ. ئایێر: ئـاگر. واتـە: بـڕۆ گیان لەسەر دەستی لە پەپوولەوە فێر بە کە ترس و باکی لە گڕ و تینی ئاگر نییە.

٢- پەڕ: پڕ. مەیر: مێهر، خۆشەویستی. پەرێ: بۆ. وەسڵ: پێگەیشتن، بە یەکگەیشتن. واتە: بـە وێنەی پەپوولە کە پڕە لە خۆشەویستی و وەفا، بۆ گەیشتن بە دۆست جەفا و مەینەت بکێشە.

٣- ئایر: ئاگر. نمەسۆزۆ: نەسووتێت. مـەبۆ: دەبـێ. چـوون: چۆن. مـەیۆزۆ: دەدۆزێتـەوە، پەیـدا دەکات. واتە: هەتا دڵ بە ئاگری عەشق نەسووتێت کەی ئارام و قەرار دەگرێت و کەی دوست پەیـدا دەکات.

٤- وێ: خۆت. وانان: بخوێنن. واتە: خۆت بە وێنەی پەپوولە بخە نێو جەرگەی ئاگرەوە تا لە تیـرە و تایەفەی مەجنوونت بزانن و بە عاشقت ناو ببەن.

-٢٠-[1]

دڵـــەی مـــن پێتـــەن مـــەر نمـــەزانی؟
مەشـــی وە یانـــان ئـــایر مەســـتانی[2]

ئـــایرێ چـــوون دڵ مـــن بـــە دەســـتت بـــۆ
ئـــایر واســـتەنی پـــەی چـــێش قەســـتت بـــۆ؟[3]

دڵـــەی مـــن وەســـێن جیـــۆتی ئـــایر
پەنـــەش مەســـۆچۆ کـــەش و کـــۆ و بـــایر[4]

---

-٢٠-

١- ک، س، نێ، ڕ، عم، ب، ح، مج.

٢- پێتەن: بە تۆیە. مەر: مەگەر. نمەزانی: نازانی. مەشی: دەڕۆی. یانە: ماڵ خانوو. ئایر: ئـاگر. مەستانی: دەستێنی، دەسێنی. واتە: مەگەر نازانی دڵی من بە لاتەوەیە؟ ئیتر بۆچی داوای ئاگر لە ماڵان دەکەی؟ مەبەستەکەی لە بەیتە دواییەکاندا ڕوون ئەبێتەوە.

٣- چوون: وێنەی، وەکوو. ئایر: ئاگر. واستەن: خواستن. پەی چێش: بۆچی. قەست: نیـەت، نیـاز. واتە: کاتێک ئاگرێکی وەک دڵی منت بە دەستەوەیە ئیتر بـۆچی بـە نیـازی بـڕۆی داوای ئـاگر لـە مەخلووق بکەی؟

٤- وەسێن: بەسە، تەواوە. جیۆتی: لە جیاتی، لـە بـاتی، بـە جێگـەی. پەنـەش: پێـی. مەسـۆچۆ: دەسووتێ. بایر: باهێر، زەمینی نەکێڵدراو، وێرانە، ئاوەدان نەکراوە، دەشتی بێ دار. واتە: دڵی من بـە جێگەی ئاگر بەسە و کەش و کۆ و باهێری پێ دەسووتێ.

بگێـــرەش بـــە دەســـت هـــەی ئـــاوات وەســـتە
بـــەرەش وە یانـــان چـــوون گـــڕان دەســـتە[١]

بـــیلا بـــا نـــەبۆ ڕووبـــەڕووی شـــەماڵ
نـــەبا ئاڵـــەمێ پـــێش بـــۆ بـــە زوخـــاڵ[٢]

٭٭٭

١- بگێرەش: بگرە. ئاوات وەستە: ئاوات خواستراو. بەرەش وە یانان: بیبە بۆ مـاڵان. گـڕان دەسـتە: دەسە ئاگر، ئەو کات بۆ ئاگر، دەسە ئاگریان بە کـار هێنـاوە، بـۆ وێنـە وتوویانـە: «یـا خـودا دەسـە ئاگرێک بکەوێتە ماڵی». واتە: ئەی ئاوات خواستراو! دڵەکەم بگرە بە دەستەوە و وەکوو دەسە ئـاگر ماڵ بە ماڵ بیبە با ئاگری پێ بکەنەوە.

٢- بیلا: با ئاگات لێ بێت. نەبۆ: نەبێت. نەبا: نەوەک، نەکا. ئاڵەم: عالەم، دنیا. بۆ: ببێـت. واتـە: ئاگادار بە کە ڕووبەڕووی بای شەماڵ نەبێتەوە چوون شەماڵ دەیگەشێنێتەوە، نەکا دنیایەک بکا بـە زوخاڵ. کاک حەکیم لە سەرچاوەی «ح»دا پارچە شێعرێکی لـە «شـێخ شـەهاب» هێنـاوە کـە لـە ڕەدیفی ئەم پارچە شێعرەدایە. ئەمەیش پارچە شێعرەکە:

چـــراخ وە یانـــان چـــراخ وە یانـــان   پـەی ئـاهێر واسـتەن مەشـی وە یانـان
دڵـەی مـن هـا پێـت شـای نـەوجوانان   پەنـەش مەسـۆچیۆ کـەش و کـۆ و یانـان
ئـی دڵـەی ئـاهێر ئاڵـەم مەنشـوورە   بـەرزەن بڵێسـەش چـوون کـوورەی نـوورە
بگێـرەش بـە دەسـت سـەوڵ خـەرامان   بـەرەش وە یانـان ئامـان سـەد ئامـان
نـەبا ڕووبـەڕووی بـاد شـەماڵ بـۆ   بڵێسـەش نـەزداو بـەو زڵـف و خـاڵ بـۆ
زەڕەر بیـاوۆ بـەو گۆنـا و جـەمین   پەنـەش بسـۆچۆ زەمـان و زەمـین
ئـازیز جـە دووریـت گڕانـەن «شـەهاب»   ئەسـرین جـە دیـدەش ڕەوانـەن بـە تـاب

## -٢١-[١]

دڵـەی مـن جـە بـێخ، دڵـەی مـن جـە بـێخ
بـەزە دڵـەی مـن، کەندشـان جـە بـێخ[٢]

بـە گازشـان گێـرت، بڕیشـان بـە تـێخ
نمەکشـان شـانا، پێکاشـان بـە سـێخ[٣]

کوورەشـان چنـی بـە بـەرد بـایر
سـێخ چـەنی کـەباب دەردشـان بـایر[٤]

-٢١-

١- ک، ئێ، س، م ئا، ڕ، ب، ح.

٢- بەزە: بە ڕەحم، ڕەحمین. کەندشان: هەڵیان کەند، دەریان هێنا. واتە: دڵەی بە ڕەحمی منیـان لـە بێخ دەرهێنا. کاک حەکیم بە جێی «بەزە»، «بەندی» نووسیوە بەڵام لە هەموو نوسخەکاندا «بـەزە» نووسراوە.

٣- گاز: کەرەستەیەکە بە وێنەی ئەنبوردەست کە بزماری پێ دەردێـنن و تـەلی پـێ دەبـڕن. گێـرت: گرت. بڕیشان: بڕییان. نمەکشان شانا: خوێیان پێدا کرد. پێکاشان: پێکایان، هەنگاوتیان. واتـە: بـە گاز گرتیان و بە تێخ بڕیان و خوێیان پێوە کرد و کردیان بە سیخەوە.

٤- بایر(یەکەم): باهێر، دەشتی چۆڵ. چەنی: لەگەڵ. دەردشان: دایان. بایر(دووهەم): بە ئاگر. واتە: بە بەردی کەش و کۆ کوورەیان دروست کرد و دڵەکەی من کە بە وێنەی کەبابی لێ هاتووە داویانە بـە دەم ئاگرەوە.

کـــەباب چـــەنی ســـێخ گڕگـــڕ مـــەگڕیا
هێجـــران قیبلـــەم جـــێش نمـــەبڕیا[١]

***

-٢٢-[٢]

دنیـــای پـــەڕ خەتـــەر، دنیـــای پـــەڕ خەتـــەر
پەرســـام جـــە دنیـــای دایـــم پـــەڕ خەتـــەر[٣]

واتـــم ســـفڵەی شـــووم بـــەدْ جـــە بـــەدْ بەتـــەر
چێشـــەن چـــەنی کـــەس وەفـــات نـــی تـــا ســـەر؟[٤]

یـــە چێشـــەن ئـــەر شـــان وەر کەمتـــەر گـــەدان
جـــە بـــێ وەفاییـــت ســـەر وە ســـەنگ مـــەدان[٥]

---

١- مەگڕیا: دەگڕیا، گڕی گرتبوو. هێجران: دووری. نمەبڕیا: نەدەبڕا. واتە: دڵەکەم وێنـەی کـەباب لەگەڵ سیخدا گڕی گرتبوو و دەسووتا، بەڵام لەو حاڵەیشدا هێشتا دەردی دووری یاری لێ نەدەبڕا.

-٢٢-

٢- ک، س، ڕ، ب، ح.

٣- پەڕ: پڕ، لیپ، لێوانلێو. پەرسام: پرسیم. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٤- واتم: وتم. سفڵە: سپڵە، پێ نەزان. شووم: بـەو یـومن، نامویـارەک، نـەحس. چێشـەن: چییـە. چەنی: لەگەڵ. نی: نییە. واتە: لە دنیای پڕ خەتەرم پرسی وتم ئەی سپڵەی نامویارەک لە بـەر چـی وەفا و دۆستیت تا سەر بۆ کەس نییە؟

٥- یە چێشەن: ئەمە چییە. ئەر: ئەگەر. وەر: وە ئەگەر. سەنگ: بەرد. مەدان: دەدەن. واتـە: وتـم ئەمە چییە ئەگەر شا و ئەگەر گەدا بێت، لەبەر بێ وەفایی تۆ سەری خۆیان بە بەردا دەدەن.

هەرکـــەس مـــەوینی چەنـــەت نیـــەن شـــادْ
گشــت جــە دەســت داخ جــەفای تۆشــەن دادْ[١]

بـــــێوەفــــا، وەشڕەنــــگ، جـــــەفاکارەنی
دایـــــم پـــــەی یــــاران دڵئـــــازارەنی[٢]

هـــــەردەم نــــەرد دەور هێجـــران مەشــــانی
بـــــە یـــــاران جـــــەفای دووری مــــــەنمانی[٣]

چـێش مــەبۆ ســوودت شــای بــێئێقــراران؟
دوور مـــەوزی جـــە یـــەک دیــدار یــاران؟[٤]

☆☆☆

---

١- مەوینی: دەبینی. چەنەت: لە تۆ. نیەن: نییە. گشت: هەموو، سەرجەم. واتە: هەرکەس دەبینی بە دەستی تۆوە شاد و بە کەیف نییە و هەموو کەس لە دەستی داخ و دەردی بێ وەفایی تۆ داد و هاواری هەستاوە.

٢- جەفاکارەنی: جەفا کاری. پەی: بۆ. واتە: بێ وەفا و خۆش ڕەنگی و دڵیان لێت دەچێ بەڵام جەفاکاری و دایمە دڵی یار دێشێنی.

٣- نەرد: تەختە نەرد. لێرەدا مەجازە و بە مانای مۆرەی تەختە نەرد هاتووە. دەور: ڕۆژگار. مەشانی: دەوەشێنێ، هەڵدەخەی. مەنمانی: دەنوێنی، نیشان ئەدەی. واتە: هەر جارێک مۆرەی گەڕانی ڕۆژگار بۆ دووری یاران هەڵدەخەی و ڕەنجی دووری بە یاران دەنوێنی.

٤- چێش مەبۆ: چی دەبێ. بێ ئێقرار: بێ وەفا، بەد قەوڵ. مەوزی: دەخەی. واتە: ئەی شای درۆزنان و بێ وەفایان، مەگەر چ قازانجێکت پێ دەگات کە بەم شێوە دیداری یاران لێک دوور دەخەیتەوە؟

-٢٣-[١]

دوورنمای ڕەزان، دوورنمای ڕەزان
ڕەنگ زەرد و سوور دوورنمای ڕەزان[٢]

قەترەی خوردەڕێز دەور ڕووی خەزان
پەردەی دڵ چوون گاز ماران مەگەزان[٣]

یانێ های خەزان ڕەنگێ مەنمانۆ
ڕەنگش بە ڕوخسار دەردین مەمانۆ[٤]

-٢٣-

١- ک، نێ، ب، ڕ، س، عم، ح، مج.

٢- دوورنما: بەرچاوی دوور، لە دوورەوە ڕوانین. ڕەز: لە بنەڕەتدا بە مانای مێوی «ترێ» دێمیـیـە بەڵام لە دیوانی بێسارانیدا بە گشتی بە مانای «باخ» هاتووە. واتە: کاتێک لە دوورەوە سەیری باخان بکەی ڕەنگی زەرد و سوور دەبینی. مەبەستی هاتنی پاییزە کە ڕەنگی گەڵای داری باخان بە زەرد و سوور دەگۆڕێت.

٣- قەترە: دڵۆپ، تکە. خوردە ڕێزە: وردە، ورد بوو. مەگەزان: دەگەزن. واتە: ئەو دڵۆپە ئاوە بچووکانە کە لە دەوری ڕووی گەڵاکاندا دەکەونە خوارەوە وێنەی گەستەی مار پەردەی دڵم دەگەزێن.

٤- مەنمانۆ: دەنوێنێ. دەردین: دردەدار. مەمانۆ: شێوەی ئەدات، لێی دەچێت. واتە: یانی های کە بزانە گەڵای خەزان ڕەنگێ دەنوێنێ کە ئەو ڕەنگە لە ڕەنگی دەردەدار دەچێت.

دەردیـــن مـــەوینۆ ڕەنـــگ وێـــش بـــە تـــار
ئـــەو تـــارە مـــەبۆ لـــێش بـــە گـــاز مـــار[١]

وەیمـــەن پـــەرێ ڕەنـــگ ڕەشـــتەی خـــەزانان
بـــذیۆ پێشـــان دا دیـــذەی نـــەزانان[٢]

☆☆☆

-٢٤[٣]-

دوڕڕەن، مەرجانـــەن، دوڕڕەن، مەرجانـــەن
لاڵـــەن، یاقووتـــەن، دوڕڕەن، مەرجانـــەن[٤]

---

١- مەوینۆ: دەبینێ. تار: تەرح، جۆر، شێوە. مەبۆ: دەبێت. لێش: لێی. واتە: دەردەدار کاتێک ڕەنگی خۆی بەو جۆرە دەبینێت (ڕەنگی زەرد و سووری بە وێنەی خەزان) ئەو ڕەنگە بۆی دەبێت بە گەستنی مار. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا هەیە.

٢- وەیمەن: هاوارمە. پەرێ: بۆ. ڕەشتە: ڕەنگ کراو. بذیۆ: سەیر بکات. واتە: هاوارمە بۆ ڕەنگی ڕەنگ کراوی گەڵاکان، با ئەوانەی کە نازانن بە چاو بڕوانن پێیدا، واتە کاتێک من چاوم بە ڕەنگی زەرد و سووری گەڵاکان دەکەوێت هاوارم لێ بەرز دەبێتەوە و گریانم دێت بەڵام ئەوانەی کە هیچیان لێ حاڵی نییە با بێن سەیر بکەن و خۆشیان بێت. لە سەرچاوەکانی «س»، «ڕ»، «ب» و «عم»دا بە جێی «دیذەی نەزانان»، «هەواڵ نەزانان» نووسراوە.

-٢٤-

٣- ک، س، ڕ، ب، ح.

٤- دوڕڕ: ناوی جەواهێرێکە لە ناو لاشەی سەدەفدا دروست دەبێت و سەدەفیش بوونەوەرێکی دەریاییە. مەرجان: بوونەوەرێکی دەریاییە کە لە سەر بەردی بن دەریادا دەژی و جۆرێک لەو مەرجانە کاتێک لە ئاو دەری دەهێنی وەکوو بەردێکی سووری لێ دێت کە جۆرە جەواهێرێکی ☜

چ مــــەرجان؟ چ دوڕڕ؟ تــــەمام مــــەر جانـــەن
گـــــەنج پەڕمایـــــەی نابووڎخەرجانـــــەن[١]

دیـــــڎەش بـــــە دیـــــڎەی ئــــاهووان بـــــەڕ
مـــــەر نـــــەزان هـــالآن بـــوازاش بـــە کـــەڕ[٢]

قـــولاپ ئـــەڵماس مـــوژەش یەنـــد گیـــران
مـــەگێرۆ ئـــیمان جـــە دەســـت پیـــران[٣]

---

☜ لێ دروست دەکەن و بەو جەواهێرە دەڵێن مــەرجان. لاڵ: لـەعل، بـەردێکی بەنرخـە بـە ڕەنگـی سوورێکی کاڵ. یاقووت: جەواهێرێکی سوورە. واتە: بە وێنەی دوڕڕ و مەرجان و لەعل و یاقووتە.

١- مەر: مەگەر. جان: گیان. نابووڎخەرج: کەسێک کە تێکشکاوە و هیچی بۆ نەماوەتەوە. واتە: چ دوڕڕ؟ چ مەرجانێک؟ هەر یەکسەر گیانە و وەکوو گەنج و خەزێنەیکی پڕ مایـە بـۆ کەسێکە کـە تێکشکاو بێت و هیچی بۆ نەمابێتەوە و خەرجیی نییە.

٢- بەڕ: وشکانی، بیابان. بوازاش: بخوازن. کەڕ: دڵت بچێتە سەر شتێک و بە دوایدا بڕۆی. واتـە: چاوی لە چاوی ئاسکی بیابان دەچێت، مەگەر کەسێک حاڵ نەزان بێت و هیچـی حـاڵی نـەبێت کـە بیەوێ دڵی بچێتە سـەری و پێـی جـوان بێـت. لـە سـەرچاوەکانی «ح»، «س» و «ڕ»دا بـە جێـی «بوازاش وە کەڕ»، «بووزانش وە گەڕ» نووسراوە.

٣- موژە: مژۆڵ، برژانگ. یەند گیران: هێندە گیرە. مەگێرۆ: دەگرێت. واتە: قولاپی مژۆڵـی کـە لـە تیژیدا لە ئەڵماس دەچێت هێندە بە باشی لە شتێک گیر دەکات کە ئیمان لە دەستی پیریش دەگرێ و ئیمانی لێ دەستێنێت. مەبەستی ئەوەیە کە ئیمانـی پیـر زۆر پتـەو و قایمـە بـەڵام پیـریش لـە بەرانبەری مژۆڵەکانیدا بێ دەسەڵاتە و ئیمانی دەدۆڕێنێت.

چـوون واچـوو زڵفـش موشـکەن یـا عەنبـەر؟
موشـک و عەنبـەرش وسـتەن نـە چەنبـەر[١]

بـەڵێ، شـەرت ئێـذەن یـەکێش مـەجنوون بـۆ
یـەکێ پـەی دیـنش دەروون پـەڕ هـوون بـۆ[٢]

پێسـەن ڕای ڕەوشـت پـەی لـەیلێ وینـان
تـا بـان مـەجنوونی بـە چـەم بوینـان[٣]

٭٭٭

١- چوون واچوو: چۆن بڵێم. موشک: ماکێکی (مادەیەکی) ڕەشی بۆنخۆشە. وستەن: خستووە. جە: لە، (فارسی: دَر). چەنبەر: هەر شتێک کە جەغزی (دایـەرەیی) بێـت و زیـاتر بـۆ جـەغزی دەف و تەپڵ و فەلەک بە کار دەبرێت. واتە: چۆن بڵـێم کـە زوڵفـی موشـک یـا عەنبـەرە چـون موشـک و عەنبەری خستوەتە جەغزی خۆی و هەم لە ڕەشی و هەم لە بۆنخۆشیدا زۆر لەوان سەرترە.

٢- بـەڵێ: بـەڵام. شـەرت ئێـذەن: خـاس ئەمەیـە، شـەرت ئەمەیـە. دیـنش: دیتنـی، بینینـی، چاوپێکەوتنی. پەڕ هوون: پڕ خوێن. واتە: بەڵام شەرت ئەمەیە کە کەسێک ببێت بە مـەجنوونی و بۆ دیتنی دایمە دەروونی پڕ لە خوێن بێت.

٣- پێسەن: وەهایە. ڕا و ڕەوشت: ڕێگە و ڕەوشت. لەیلێ وینان: ئەوانەی کە دەیانەوێ لەیلا ببیـنن. بان: بێن. بە چەم بوینان: بە چاو ببینن. واتە: ڕێگە و ڕەوشت و دەسـوور بـۆ ئەوانـە کـە دەیانـەوێ لەیلا ببینن ئەمەیە کە بێن و مەجنوون بە چاو ببیـنن و لێـی بـڕوانن. مەبەسـتی ئەوەیـە کاتێـک چاویان بە مەجنوون بکەوێت ئیتر دەزانن لەیلا کێیە کە وەهای لـە مـەجنوون کـردووە، ئێسـتە مـن هەرچەند تاریفی یار بکەم کە شاخ و باڵی وایە و لە دوڕڕ و مـەرجان دەچێـت دەبێـت ئەوانـەی کـە دەیانەوێ چاویان بە یار بکەوێت بێن و بزانن وایە یا نە، بێن و من ببین و ئەو کاتە دەزانن ئەو چۆنە. لە سەرچاوەکانی «ح»، «س» و «ڕ»دا بە جێی «لەیلێ وینان»، «لەیلێ دینان» و لە «ح»، ☜

## -٢٥[١]-

دەرد مـــەجنوون پـــێم، دەرد مـــەجنوون پـــێم
فەڵـــەک داد و ڕۆ، دەرد مـــەجنوون پـــێم[٢]

هێجـــران دا دەســـتەی گـــڕ ئـــایر نـــە جـــێم
دیـــم بـــە عەرشـــەوە دوود ئـــاه وێـــم[٣]

دەروونـــــم بـــــایر تاوئـــــەنگێز تــــاوا
ئـــاهم ســـەدای چـــەرخ گـــەردوون شـــکاوا[٤]

ناڵـــــەم نـــــە ئاڵـــــەم ئـــــایر خێزنـــــا
ئەســـــرینم تۆفـــــان نـــــووح ئـــــەنگێزنا[٥]

---

☞ «س»، «ب» و «ڕ»دا بە جێی «تا بان مەجنوونی»، «تا کە مەجنوونێ» نووسراوە.

-٢٥-

١- س، ک، ب، ڕ، ح.

٢- واتە: ئەی هاوار دەردی مەجنوونم گرتووە.

٣- هێجران: دووری. ئایر: ئاگر. عەرش: لێرەدا بـە مانـای ئاسمانە. دوود: دووکـەڵ. واتـە: دووری دەسە ئاگرێکی نا بە جێمەوە و لە ئاسماندا چاوم بە دووکەڵی هەناسەی خۆم کەوت.

٤- بایر: بە ئاگر. تاوئەنگێز: تاودەر. شکاوا: شەق کرد. دووکەرت کرد. واتە: دەروونـم بـە ئـاگرێکی تاودەر ، تاودرا و هەناسەم دەنگی چەرخی گەردوونی شەق کرد.

٥- ئاڵەم: عالەم، دنیا. خێزنا: هەستاند. نووح: حەزرەتی نووح (س.خ) کە خودا فەرمانی پـێ دا تـا کەشتییەکی دروست کرد و خەڵک و گیان لەبەری تێ خست و پاشـان بـارانێکی زۆر بـاری و تۆفـان هەستا و وڵات بوو بە ئاو و تەنیا ئەوانەی مانەوە کە لە کەشتیەکەی حەزرەتی نووحدا بوون. ☜

مـــن وێنـــەی غـــەواس غـــەرق خەمیـــدە

گـــوم بـــیم نـــە گێجـــاو تۆفـــان دیـــدە[١]

چـــەنی ئـــاه دەرد مـــەجنوون جـــە خـــاودا

هـــەر گـــێج مـــەوەردم شـــەو نـــە گێجـــاودا[٢]

☆☆☆

ئەنگێزنا: هەڵقوڵاند. واتە:ناڵەم هەموو دنیای کرد بە ئاگر و ئەسرینم تۆفانی نووحیان دروست کرد.

١- غەواس: مەلەوان، کەسێک کە دەچێتە ژێر ئاو. غەرق: نوقم. خەمیدە: چەمیو، چەماوە، ئەڵبەت دەتوانێت بە مانای کەسێکیش بێت کە خەمی دیبێت واتە خەمدیدە. واتە: من بە وێنەی مەلەوانێک کە نوقم بووبێت لە تۆفانی ئەسرینی چاوانمدا ون بووم.

٢- چەنی: لەگەڵ. جە خاودا: لە خەودا. مەوەردم: دەمخوارد. واتە: لە خەومدا بە ئاه و دەردی مەجنوونەوە هەر لە گێژاودا گێژم دەخوارد.

-٢٦[1]-

دەردیـــن! دڵ بـــە کـــام، دەردیـــن! دڵ بـــە کـــام
مـــەر ئەوســـا وینـــی دڵـــەی وێـــت بـــە کـــام[2]

مـــەجنوون جەســـتە بـــای بـــەو دڵـــە و کـــەم فـــام
بێـــزار بـــای جـــە نـــەنگ، ڕوســـوا بـــای نـــە عـــام[3]

-٢٦-

١- ک، س، ب، ڕ، ح. بێسارانی ئەم پارچە شێعرەی لـە وڵامـی شـێعرێکی «دەردیـن»دا نووسـیوە. دەردین شاعیرێکی هاوچەرخی بێسارانی بووە. ئەمەیش شێعرەکەی «دەردین»:

| | |
|---|---|
| ئـەرێ مـەحزوونی!، ئـەرێ مـەحزوونی! | هـام سـتارەی قـەیس، وێـڵ مـەحزوونی! |
| پـــەی دەردەداران تـــۆ ڕانمـــوونی | ماچـا تـۆ نۆشـان جـام مـەجنوونی |
| ئوجـــاغ قـــەدیم، مورشـــێدزادەنی | جە سەرمەشق عەشق، تـەعلیم دادەنـی |
| دڵ سەودای کەسێش یـا کەوتـەن وە سـەر | نـوورش زیـادەن جـە شـەمع خـاوەر |
| هـا نـە جایێـدا یاگـەی دەنـگ نیـەن | دڵـە سـۆزانەن ئـەو بـە تـەنگ نیـەن |
| پیـــر دەردەدار! ڕاهـــنمای عەشـــق! | بـە کـام خەیاڵـەن دڵ مەکـەرۆ مەشـق؟ |

٢- دەردین: دەردەدار، ناوی ئەو شاعیرەی شێعری بۆ بێسارانی نووسیوە و بێسارانیش بەم پارچە شێعرە وڵامی داوەتەوە. کام: ئارەزوو. مەر: مەگەر. ئەوسا: دوای ئەو، پاشان. وێت: خۆت. واتە: ئەی دەردین! مەگەر دوای ئەو شتانەی کە ئەیڵێم دڵت بە ئارەزووی خۆی بگات. لـە بەیتـە دواییەکانـدا شەرتەکانی دەڵێت.

٣- مەجنوون جەستە: وێنەی مەجنوون. بای: بی، ببی. نەنگ: ئابڕوو، ئاوڕوو، عـەیب، شـوورەیی. ڕوسوا: بێ حەیا، بێ ئابڕوو، بێ ئاوڕوو. عام: خەڵک، هەموو کەس. واتە: ئەبێ بەو دڵتـەوە وێنـەی مەجنوون و کەم فام بی و لە شەرم و حەیا بێزار بیت و لای خەڵکی بە بەدناو بناسرێیت.

بـــە نـــاخوون کـــەنی بێســـتوون بـــە چـــەنگ
بـــڎەی بـــە ســـەردا هـــەردەم پـــارەی ســـەنگ[١]

شـــــەوان و ڕوان ئـــــاه و ناڵـــــەت بـــــۆ
وە دەرگـــــای فەڵـــــەک ئەوەلاڵـــــەت بـــــۆ[٢]

بـــە ســـۆز و ئاهـــت بـــەرد و کـــۆ تـــاوی
بـــە نـــاخوون دایـــم ســـینە بشـــکاوی[٣]

ســـا مڎیـــەی کـــەریم کارســـاز بـــێ چـــوون
زەڕێـــو مـــەیل تـــۆ وســـتش نـــەو دەروون[٤]

---

١- بە ناخوون کەنی: بە نینۆک هەڵبکەنی. بێستوون: کێوی بێستوون، ناوی کێوێکە لە ڕۆژهەڵاتی شاری کرماشاندا و ئەڵێن فەرهاد لەبەر عەشقی شیرین و لە بەر ئەوەی شیرینی پێ بدەن دەستی کرد بە تاشینی ئەو کێوە بەڵام کاتێک هەواڵی مەرگی شیرینی بیست، ئەو قوڵنگەی کە کێوەکەی پێ دەتاشی دای بە تەوقی سەری خۆیدا و مرد. پارە سەنگ: کوتە بەرد، لەتە بەرد. واتە: هەر وەک فەرهاد کە بە قوڵنگ بێستوونی تاشی دەبێ تۆ بە نینۆک هەڵیبکەنی و بیتاشی و وەک ئەو قوڵنگی دا بە سەری خۆیدا تۆیش بەرد بە سەرتدا بماڵی.

٢- ڕوان: ڕۆژان. ئەوەلاڵە: لاڵانەوە، پاڕانەوە. واتە: دەبێت شەو و ڕۆژ هەر خەریکی ئاه و ناڵە بیت و خەریکی لاڵانەوە لە درگای فەلەک بیت.

٣- تاوی: بتاوێنیتەوە. بشکاوی: شەق بکەی. واتە: دەبێت بە سۆز و هەناسەت کێو و بەرد بکەی بە ئاو و دایمە سەرقاڵی ئەوە بیت بە نینۆک سینەت شەق بکەی.

٤- مڎیەی: دەبینی. کەریم: دەهەندە، دڵاوا، دڵۆڤان، یەکێکە لە سیفەتەکانی خودا. کارساز: کار ڕێکخەر. بێ چوون: بێ وێنە، خودا. زەڕێو: زەڕەیەک. وستش: خستی. واتە: پاش ئەوەی ☜

جــه هــەر دوو لاوە مــەیل مــەبۆ حاســڵ
ئەوســا مــەوینی تــۆ وێــت بــە واســڵ[١]

***

-٢٧[٢]-

دەلیــــل! نــــەزانان، دەلیــــل! نــــەزانان
عــــەرزەم بــــەر وە لای شــــای هــــاڵنــــەزانان[٣]

ئــــەر پەرســــۆ: دەلیــــل! یــــە کــــێ کیانــــان؟
تــــۆ هــــەر بــــێ دەنــــگ بــــە چــــوون بــــێزوانــــان[٤]

---

☜ هەموو ئەم کارانەت کرد دەبینی ئەو خودا کە دەهەندە و دڵاوا و کارڕێکخەر و بێ وێنەیە ڕەحمی کرد و تۆزێک مەیلی تۆی خستە دەروونیەوە.

١- مەبۆ: دەبێ. حاسڵ: داهات، بە دەست هاتوو. ئەوسا: پاشان، دوای ئەوە. مەوینی: دەبینی. واسڵ: پێ گەیشتن. واتە: پاش ئەوەی خودا تۆزێک مەیلی تۆی خستە دڵی ئەوەوە و لە هەر دوو لاوە (تۆیش و ئەویش) مەیل پەیدا دەبێت و ئینجا بە دوایدا دەبینی کە گەیشتووی بە خۆشەویستەکەت.

-٢٧-

٢- ک، س، ب، ڕ، ح.

٣- دەلیل: کەسێک کە ڕێگە بەڵەدە و دەینێرن بۆ لای یار. عەرزە: نامەیەک کە کەسێک بۆ لە خۆی گەورەتری دەنووسێت، لێرەدا بە مانای نامەیە کە بۆ یار دنووسرێت. بەر: ببە. هاڵ: حاڵ. واتە: ئەی دەلیل عەرزەکەم ببە بۆ لای یار کە شای حاڵ نەزانانە (ئاگای لە حاڵی کەس نییە).

٤- ئەر پەرسۆ: ئەگەر بپرسێ. یە: ئەمە. کیانان: ناردوویە. چوون بێ زوانان: وەک لاڵان. واتە: ئەگەر لێی پرسیت و وتی: دەلیل ئەمە کێ ناردوویە؟ تۆ هەر بە وێنەی بێ زمانان بێ دەنگ بە☜

ئەر پەرسۆ: دەلیل! یە چ حاڵێومن؟
یە عەرزەی کام شێت وێران ماڵێومن؟ [1]

بۆ بە زواندا تا تەوانات هەن
بواچە پەرێش: هەر موددەعات هەن [2]

ئەر شی بە غەزەب، لەنجە و لارە کەرد
فەرما، تۆ جە تەخت وێش ئاوارە کەرد [3]

عەرزەی نارەوا ڕەنج بە هەبەس بیم
هەزاران بێ کەس، ئێمەیچ بێ کەس بیم [4]

***

---

و هیچ وڵام مەدەوە.

١- یە چ حاڵێومن: ئەمە چ حاڵێکە. واتە: ئەگەر پرسی ئەی دەلیل! ئەمە چ حاڵێکە و ئەمە عەرزەی کام ماڵ وێرانە؟

٢- بۆ بە زوان: بێ زمان، وڵام بدەوە. بواچە: بڵێ. پەرێش: بۆی، بۆ ئەو. هەر موددەعات هەن: هەر ئیدعات هەیە، هەر قسە ئەکەی و هیچی تر. واتە: هەتا دەتوانی بێ زمان و پێی بڵێ: تۆ هەر ئیدعات هەیە و هیچی تر.(هەر لاف لێ ئەدەی و هیچی تر((وەرگێڕ)).

٣- ئەر شی: ئەگەر ڕۆیشت. غەزەب: تووڕە بوون. کەرد: کرد. فەرما: فەرمووی، وتی. وێش: خۆی. واتە: ئەگەر قینی کرد و تووڕە بوو و تۆی لە تەختی خۆی ئاوارە کرد و نەیهێشت لەوێ بمێنیتەوە.

٤- نارەوا: نەشیاو. ڕەنج: سەختی و زەحمەت. هەبەس: عەبەس، بێ سوود، ڕوو گرژ کردن، لێرەدا واتە لە گۆترە فەوتان. واتە: ئەگەر تۆی لەوێ دەرکرد چیتر با بڵێم نامەکەم بێ ئەرزش و گۆترە بووە و ڕەنجم ئاو بردوویەتی و هەزاران کەس بێ‌کەسن و منیش بێ‌کەس کەوتم!

-٢٨-[١]

دەوای زەعـــــف دڵ، دەوای زەعـــــف دڵ
حـــەکیم نمانـــا دەوای زەعـــف دڵ[٢]

ڕێـزەی قەنـد بـووس خونچـەی دەهـەن گـوڵ
سـايەپـەروەردەی زڵفـان سـونبوڵ[٣]

جورعـەی جـە شـەربەت سـيای مەسـت يـار
قـەترەی جـە عـەرەق گوڵفـام ڕوخسـار[٤]

---

-٢٨-

١- ک، س، ب، ر، ح.

٢- زەعف دڵ: خاوبوونەوەی دڵ بێ هێزبوونی دڵ. نمانا: نواند، نیشان دا. واتە: حەکیم ئەم دەرمانەی بۆ ئەو کەسانەی کە دڵیان بێ هێزە نیشان دا. لە بەیتە دواییەکاندا دەرمانەکە دەڵێت.

٣- ڕێزەی قەند: وردە قەند. بووس: ماچ، ڕاموسان. دەهەن: دەم. سـایە: سێبەر. سونبوڵ: سمڵ، گوڵێکی جوان و بۆنخۆشە. واتە: ماچی دەمی گوڵ (یار) کە لە سێبەری زوڵفانیدا کە بە وێنەی سونبۆلە پەروەردە بێت (ماچێک کە لە سای زوڵفانیدا پەروەردە بێت).

٤- جورعە: قوم، گوڵمیتە، (بە هەورامیش هەر گوڵمیتە ئەڵێن). سیای مەستی یار: ئەمە دەبێت مەبەستی چاوی مەستی ڕەش بێت. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «سیای»، «مینای» نووسراوە کە ئەویش مانایەکی ڕێک و پێک بە دەستەوە نادا. قەترە: دڵۆپ، تکە. عەرەق: ئارەق. گوڵفام: وێنەی گوڵ. گوڵفام ڕوخسار: ڕوومەتی وەک گوڵ. واتە: قومێک لە شەربەتی چاوە ڕەشە مەستەکانی یار و دڵۆپێک لە ئارەقی ڕووی وەک گوڵی یار.

عـــەنناب لـــەبان، شـــەربەت لیمـــۆش
بـــە شـــەمع دیـــدار بـــاوەرۆ وە جـــۆش[١]

بــە گــەرمی ئــەو شــەمع بــەیان نــە قــەوام
هــەم دەفــع زەعفــەن، هــەم ڕەفــع سەرسـام[٢]

مـــاهی ســـەقەنقورِ ســـیم ســـاق ســـاف
مســقاڵێ جــە موشـک ئـاهووی خوتـەن‌نـاف[٣]

پـــەی دەردەداران هـــەر ئێـــدەن عـــەلاج
چـــووب چینیـــەن پـــەی ســـەردی مـــەزاج[٤]

---

١- عەنناب: ناوی دارێکە کە بەرەکەی لە سنجوو دەچێت و خواردنی بۆ خاوێن کردنەوەی خوێن بە سوودە. لەب: لێو. لیمۆ: ناوی میوەیەکە، لێرەدا مەبەست سینەیە (مەمک). دیدار: ڕوخسار، ڕوومەت. باوەرۆ: بهێنێ. واتە: میوەی عەننابی لێوانی (ماچ) و شەربەتی لیمۆی (سینە) لەگەڵ ئەوانەی لە بەیتە پێشووەکاندا کۆ کراوە بە گەرمی شەمی ڕوومەتی بهێنێتە کوڵ و گڕیان.

٢- بەیان: بێن. قەوام: خۆ گرتن. دەفع: دوورخستنەوە. ڕەفع: لابردن. سەرسام: نەخۆشینێک کە دەبێتە هۆی ماسینی سەر و قسەی هەڵیت پڵیت کردن. واتە: بە گەرمی شەمی ڕووی یار کۆ ببنەوە و خۆیان بگرن، هەم دەرمانی بێ هێزی دڵە و هەم دەرمانی نەخۆشی سەرسام.

٣- ماهی سەقەنقورِ: گیانلەبەرێکە وێنەی ماسی کە هەم لە ئاودا دەژی و هەم لە وشکایی و ژێر سکی ساف و سپییە. سیم: زێو. ساق ساف: پووزی ساف، پووزی سپی و سافی یاری شوبهاندووە بە ژێر سکی ئەو جۆرە ماسییە. مسقاڵ: کەمێک. ئاهووی خوتەن ناف: ئاسکێک کە بۆنی نێوکی وەک بۆنی نێوکی ئاسکی وڵاتی خوتەن خۆش بێت. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٤- پەی: بۆ. ئێدەن: ئەمەیە. عەلاج: چارە. چووب چینی: جۆرە گیایەکە کە بۆ دەرمانی ☜

نوســـــخەی ئـــــی دەوا پــــــەرێ ڕۆزگـــــار
نگـــا بـــــڎاران هــــــەم دڵ هـــــەم دڵـــــدار[١]

⁂

-٢٩-[٢]

دیـــــڎە بـــێ خـــــەوان، دیـــــڎە بـــێ خـــــەوان
هـــام دەنـــگ ناڵـــەی دیـــڎە بـــێ خـــەوان[٣]

کـــــەس نیـــــەن بێـــــدار جــــە نیمەشـــــەوان
مـــــەر بـــــاد شـــــەوخێز یـــــا تـــــاف ڕەوان[٤]

---

☜ هەندێ نەخۆشی بـە کـار دەبرێـت. واتـە: مـسـقاڵێک لـە موشـکی لەگـەڵ گۆشـتی ماسـی سەقەنقورِ تێکەڵ بکرێت و بۆ نەخۆشین هەر ئەمە مایەی شفا و چـارە کردنـە و بـە وێنـەی گیـای «چووب چینی» کە بۆ کەسانی خدە (مەزاج) سەرد دەرمانە.

١- ئی: ئەم. پەی ڕۆزگار: بۆ کاتێک کە پێویستە. نگا بڎاران: هـەڵبگرن. دڵ: لێرەدا بـە مانـای مەعشووقە. دڵدار: عاشق. واتە: هەم عاشق و هەم مەعشووق ئەم نوسخەی دەرمانە هەڵبگرن بـۆ کاتێک کە پێویستە با بەکاریان بێت.

-٢٩-

٢- ک، ئێ، ب، س، ڕ، ح.

٣- دیڎە بێ خەوان: ئەوانەی کە خەویان لێ ناکەوێت. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٤- کەس نیەن بێدار: کەس بە خەبەر نییە، کەس بە ئاگا نییە. مەر: مەگـەر. بـاد شـەوخێز: ئـەو «با» کە لە شەودا دەشنێتەوە، نەسیمی شەوان. تاف: تاڤگە، قەڵوەز، ئاوهەڵدێر، ئاوشـار، ئابشـار. واتە: بە شەودا هیچ کەس هاودەنگی ناڵەی ئەوانەی کە خەویان لێ حەرامـە نییـە مـەگـەر «بـا»ی شەوان یا تاڤگەی ڕەوان.

یـــەکێ جـــە وانـــە منـــەنان هـــاڵا
پەیوەســـتەن تـــا ســـوب ناڵـــەم وە بـــاڵا[1]

غـەیر جـە بـاد سـوب، تـاف ساف نەفـەس
نمـەگنۆم نـە گـۆش تـا سـوب دەنـگ کـەس[2]

ئومێـذ هـەر بـە تـۆن یـا شـای سـاحیب نـەرد
یـا هـامڕاز، یـا مـەرگ، یـا هـۆ دەوای دەرد[3]

☆☆☆

-٣٠-[4]

دیـــذەم! پـــەیامێ، دیـــذەم! پـــەیامێ
چـێش مـــەبۆ دیـــذەم! جـاری پـــەیامێ؟[5]

---

١- جە وانە: لەوانە. لە ئەوانە. پەیوەستە: بەردەوام بێ ئارام گرتن. واتە: یەکێک لەوانە کە شەو بێ خەوە منم و تا بەیانی بەردەوام ناڵەم دەگاتە ئاسمان.

٢- نمەگنۆم نە گۆش: نایەتە گوێم. واتە: جگە لە دەنگی «با»ی بەیان و تاڤگەی نەفەس ساف، تا بەیانی دەنگی هیچ کەسم بە گوێدا نایە.

٣- شای ساحیب نەرد: مەبەست خودایە. هامڕاز: هاوقسە، یار، دۆست. هۆ: خۆ. واتە: ئەی خـودا هیوام هەر بە تۆیە، یا هاوڕازێکم بۆ بنێرە یا مەرگم بۆ بنێرە یا دەوای دەردەکەم بنێرە باکوو ئیتر نەناڵم و خەوم لێ بکەوێت.

-٣٠-

٤- م، ر، س، ب، ح.

٥- چێش مەبۆ: چی دەبێ. واتە: چاوەکەم! چی دەبێ جارێک پەیامێکمان بۆ بنێری؟

یـــا نـــام و نیشـــان، دۆعـــا و ســــڵامێ
یـــا تـــایێ جـــه زڵـــف خەیاتـــەخـــامێ[1]

یـــا زەڕێـــو مـــەیلت بکیـــانی پـــەرێم
نـــەبا چـــوون قەقنـــەس ئـــایر بشـــۆ لـــێم[2]

وەرنـــە بـــە ئـــایر گـــڕ ســـۆزانەوە
یـــا هـــا وێـــڵ بیـــان بـــە هۆزانـــەوە[3]

* * *

١- تایێ: تاڵێک. خەیاتە: تاڵی با دراوی هەورێشم کە مەبەست زوڵفی گیراوەیە. خام: خاو. واتە: چی دەبێت یا ناو و نیشان یا دۆعا و سڵاوێک یا تاڵێک لە زوڵفە خاوەکانت بنێری بۆمان؟

٢- زەڕێو: کەمێک. بکیانی پەرێم: بنێری بۆم. قەقنەس: قوقنووس، ناوی باڵدارێکی ئەفسانەییە کە ئەڵێن هەزار ساڵ عومر ئەکات و کاتی مردنی پووش و پەڵاشی زۆر کۆ دەکاتەوە و لە سەری دەنیشێتەوە و ئەوەندە باڵ لێک دەدات هەتا ئاگر دەگرێت و خۆی دەسووتێنێت و لە خۆڵەمێشەکەی قوقنووسێکی دیکە پەیدا دەبێت. ئایر بشۆ لێم: ئاگرم تێ بەر بێت. واتە: یا کەمێک لە مەیلتم بۆ بنێرە ئەوەک ببم بە قوقنووس و ئاگرم تێ بەر بێت.

٣- وەرنە: ئەگینا، ئەینا. هۆزان: خێڵان. واتە: ئەگینا بە ئاگرێک کە هەموو شتێک دەسووتێنێت وێڵ دەبم و دەڕۆمەوە بۆ ناو خێڵان.

-٣١-[1]

دیــدەم نــەمین بــی، دیــدەم نــەمین بــی
بەسـر خــەم دیســان دیــدەم نــەمین بــی[٢]

قامــەت چــوون کــەمان چــەفت چــەمین بــی
موحتـــاج مـــاوای ژێـــر زەمـــین بـــی[٣]

دڵ بـــە تـــێغ خـــەم پـــارە پـــارە بـــی
هــەر کــۆ شــادیم بــێ گشــت ئــاوارە بــی[٤]

خـــەیاڵ شـــادیم دوور کەوتـــەن چەنـــە
هـــەر ســـەیل خەمـــەن مـــەوارۆم وەنـــە[٥]

-٣١-

١- ک، ئێ، ڕ، ب، س، ح.

٢- نەمین: تەڕ. بەسر: بە ئەسرین، بە فرمێسک. واتە: بە ئەسرینی خـەمان دیسـان چـاوانم تـەڕ بووەوە.

٣- چوون: وێنەی، وەکوو. چەمین: چەماوە. ماوای ژێر زەمین: گۆڕ، قەبر. واتە: قامەتم بە وێنـەی کەوان لار و چەماوە و پێویستیم بە گۆڕە (خەریکە دەمرم).

٤- پارە پارە: کوت کوت، لەت لەت. هەر کۆ: هەر کوێ. گشت: هەموو. واتە، دڵـم بـە تێخـی خـەم لەت لەت بوو و تلێشا و لە هەر کوێ شادیم بوو هەمووی ئاوارە و دەربەدەر بوو.

٥- چەنە: لێ. سەیل: لافاو. مەوارۆم وەنە: لێم دەبارێت. واتە: خەیاڵی شادیم لێ دوور کەوتوومتـەوە و هەر بارانی خەمە کە بە تاو لێم دەبارێت.

مـــــەر زەڕێ خـــــەمم ئەوســـــە بشـــــۆوە
ســـــەر بنیـــــەو وە قـــــەبر تـــــازە گڵکـــــۆوە[١]

***

-٣٢-[٢]

دیـــم جـــەمی گـــوڵا، دیـــم جـــەمی گـــوڵا
بـــە قـــەتارەوە دیـــم جـــەمی گـــوڵا[٣]

---

١- مەر: مەگەر. ئەوسە: دوای ئەوە. سەر بنیەو: سەر بنێم. گڵکۆ: خاکی گۆڕ. واتە: مەگەر دوای ئەوە سەرم بچێتە ژێر خاک زەڕەیەک لە خەمم کەم بێتەوە.

-٣٢-

٢- ک، نێ، ڕ، عم، ب، س، ح، مج.
ئەم شێعرە یەکێک لەو پارچە شێعرانەی بێسارانییە کە بە ڕێک و پێکی مانا بە دەستەوە نادەن. وا دیارە لەم پارچە شێعرەدا باسی شتێک دەکات. بە بڕوای ئێمە باسی «هەلاڵە برمە یا شلێرە»یە. جیاوازی زۆر لە نوسخەکاندا هەیە و لە بەر ئەوە ئێمەیش هەموو جیاوازییەکان دەنووسین تا ئەگەر ڕا و بۆچوونی ئێمە دروست نەبوو خوێنەر خۆی مانای شێعرەکە بە دەست بهێنێت.

٣- جەمی: کۆ. قەتارە: بە دوای یەکدا. واتە: چاوم کەوت بە کۆی گوڵان بە دوای یەکەوە بوون. لە نوسخە خەتیەکاندا بە جێی «گوڵا» و «تەڵا» و «جەڵا»، «گلی» و «طلی» و «جلی» نووسراوە کە وا بێت دەبێت سەروای دوو نیوە بەیتی یەکەمی «گوڵێ» بێت بەڵام لە بەر ئەوەی لەم جۆرە شێعرانەدا کە نیوە بەیتی یەکەمی بە دوو پات بوونەوەی یەک شت پێک دێت دەبێت چوار نیوە بەیتی سەرتای هاو سەروا بن. ئێمە «گوڵا»مان نووسی. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «ڕ»، «س» و «عم»دا بە جێی «جەمی»، «جەمین» نووسراوە کە ئەگەر بە وردی سەیری بەیتەکانی دیکە بکەین و هەر وەها بە پێی نوسخەکانی «ک» و «نێ»، «جەمین» دروست نییە.

دەروون پـەڕ سـەدەف چـوون بۆتـەی تـەڵا
زلـف سۆسـەن تاتـا بـە شـەونەم جـەڵا[١]

تـەڵێ سـەدەفێن جـە سـەدەفخانە
بـەرز بیـەن چـوون لـوول چوقـەی شـاهانە[٢]

---

١- پەڕ: پـڕ. سـەدەف: بوونـەوەرێکی دەریاییـە کـە ڕەنگـی سـپییە و نێـوی پـڕە لـە مرواریـد کـە جەواهێرێکی بە نرخە. چوون: وێنەی، وەکوو. بۆتە: شوێنی تاوانەوەی زێڕ (تەڵا). زڵف: زوڵف، پرچ. سۆسەن: ناوی گوڵێکی بۆنخۆشە. تاتا: تاڵ تاڵ. جەڵا: جەلا، ڕۆشن کردنەوە، ساف کردن. واتـە: ئـەو گوڵە (شلێرە) دەروونی پڕە لە سەدەف (ئەو خاڵە سپیانەی لە نێو گوڵە شلێرەدایە) و گوڵەکـەی بـە وێنەی بۆتەی زێڕە و زوڵفی (ئەو گەڵا سەوزانەی وا بە سەر گوڵـە شـلێرەوە) تـاڵ تـاڵ بوەتـەوە و بـە شەونم ڕۆشن بوەتەوە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «دەروون»، «دەهان» و لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا بە جێی «چوون»، «تەن» و لە سەرچاوەکانی «عم» و «ب»دا بە جێی «تەڵا»، «تلێ» و لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «زڵف سۆسـەن تاتا»، «زڵف شەونم تاتا» و لـە سـەرچاوەکانی «ب» و «عم»دا بە جێی «جەڵا»، «چلێ» نووسراوە.

٢- تەڵێ: تاڵێک، بنجێک لە گوڵەکە. سەدەفخانە: شوێنی هەڵگرتنی سەدەف. بەرز بیـەن: بـەرز بووە. چوون: وێنەی، وەکوو. چوقەی شاهانە: شتێک بووە لە پەڕی باڵدار دروست کـراوە و کـراوە بـە تاجی شاهانەوە. واتە: ئەو گوڵە سەدەفێکە لە سـەدەفخانە (تـۆمی شـلێرە کـە تـۆمێکی بچـووکی سپییە و کاتێک گوڵەکەی هەڵدەپێچێت تۆمەکە وا لە نێو گوڵەکەدا) کە بە وێنەی چوقەی شـاهانە بەرز بوەتەوە. لە نوسخەکاندا بە جێی «تەڵا»، «طلی» نووسراوە بەڵام ئەم «تەڵێ» کە لەم بەیتـەدا هاتووە «تلی» نووسراوە کە لەگەڵ «تەڵا» جیاوازی هەیە. لە سەرچاوەکانی «ح» و «عم» و «س»دا بە جێی «تەڵێ»، «تەڵا» نووسراوە. لە سەرچاوەی «ح» و هەندێک لە نوسخە خەتیـەکاندا بـە دوای ئەم بەیتەدا بەیتێکی دیکە هاتووە کە وا دیارە بە هەڵە لێرەدا هـاتووە و هـی پارچـە شـێعری «لێـوە لەولاوێ مەبۆ نە چەمەن»ـە. ئەمەیش بەیتەکە:

تەبـەق تەبـەق گـوڵ فیـرووزەی مـاوی    مەدرۆشـۆ چـوون بـاڵ سـۆنەی سـەراوی

قامـــەت باریـــک ســـیای تـــورک تـــەڕ
شـــەیدا و ســـەروەڵا چـــوون عـــەوداڵ بـــەڕ[١]

هـــەر یەنـــد بـــاد لێشـــان مەکـــەرۆ گـــوزار
خونـــاو جـــە ســـەدەف مـــەتکیۆ وە وار[٢]

---

١- سیا: ڕەش (ساقەی شلێرە ڕەشە). تورک تەڕ: تـازە پێگەیشـتووی جـوان. سـەروەڵا: سـەرئاوەڵا، سەرباز (گوڵە شلێرە سەرووی سـاقەکەی ئاوەڵایـە). عـەوداڵ: عەبـداڵ ئـاوارە، سـەرگەردان. بـەڕ: وشکانی، بیابان. واتە: قامەتی گوڵەکە باریک و تازە پێگەیشـتوو و جـوان و ڕەش و شـەیدا و سـەر ئاوەڵایە لە عەبداڵی دەشت و دەر دەچێت. بۆمان ڕوون نەبوەوە لە بـەرچی شـوبهێندراوە بـە ئـاوارەی دەشت و دەر. لە سەرچاوەکانی «خ»، «ب»، «س»، «ڕ»، «عـم» و «مـج»دا بـە جێـی «قامـەت باریک»، «قامەتش باریک» و لە سـەرچاوەی «ح»دا بـە جێـی «شـەیدا و سـەروەڵا»، «شـەیدای سەربەناو» و لە نوسخەی «عم»دا «شەیدای سەرئەنباز» و لە سەرچاوەکانی «ڕ»، «س» و «ب»دا «شەیدای سەر ئەنباز» و لە نوسخەی «مج»دا «شەیدایی و وەڵا» نووسراوە.

٢- هەر یەند: هەر هێندە، هەر ئەوەندە. باد: با، وا. لێشان: لێیان. مەکەرۆ گوزار: لێیان ڕادەبوورێ. خوناو: ئاونگ، شەونم. مەتێکۆ وە وار: دەتکێتە خوار. واتـە: هەر ئەوەندەی کە «با» بـە نێوانیانـدا ڕادەبوورێ شەونم لە سەدەفەکان دەتکێتـە خـوارەوە. (کاتێـک گوڵـە شـلێرە دەشـەکێتەوە ئـاوی لـێ دەتکێت کە ئەوسا وتوویانە دەگری). لە سەرچاوەی «ح» بە جێی «باد لێشـان»، «بادێشـان» و لـە سەرچاوەکانی «ح»، «س»، «ڕ»، «عم» و «ب»دا بە جێی «جە سەدەف»، «چوون سەدەف» و بە جێی «وە وار»، «بە وار» و لە نوسخەی «مج»دا بە جێی «خۆناو»، «هووناو» نووسراوە.

دایـــم سەروەشـــان شـــەیدا و مەســـتەنێ
قاشـــوونی ســـێفەت دەســـت بـــە دەســـتەنێ[1]

١- سەروەشان: سەرخۆشن. مەستەنێ: مەستن. قاشوونی: سپا. دەست بە دەستەنێ: دەستە دەستەن. واتە: ئەو گوڵانە بەردەوام سەرخۆشن و شەیدا و مەستن و بە وێنەی سەربازی سپا دەستە دەستەن. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «سەروەشان»، «سەربەشان» نووسراو

-١-[1]

ڕوێ سـپای کـوفر دیـم نـه دەور دیـن
دڵ دەرلاد بـه کـوفر پەشت بەسـت بـه یـەقین[2]

زوننار وست وە دۆش، ناقووس گێرت بـه دەست
شـی نـه خاکپـای پیـر بـوت پەرەسـت[3]

-١-

١- ک، س، ڕ، ب، ح.

٢- ڕوێ: ڕۆژێک. دەرلاد: بێ ماتڵ بوون. پەشت: پشت. یەقین: باوەڕ، ئیمان. واتە: ڕۆژێک سوپای کوفرم بینی کە دەوری دینی گرتووە و دڵ بێ ماتڵ بـوون بـاوەڕی کـرد و پشـتی پـێ بەسـت و ئـەوی قەبووڵ کرد. دەکرێت کوفر بە زوڵف و دینیش بە ڕوخسار مانا بکەینەوە چون دیـت و ڕووی ڕوخسـار دەگرێت. ئەڵبەتە چون دین دەتوانێت بە مانای دیتن و چاو پێکەوتنیش بێت دەکرێت کوفر بە مژۆڵ یا برۆ مانا بکەینەوە.

(وەفایی ئەڵێت:

پێم بڵێ وەجهی چییە زوڵفت مـوقیمی ڕوومەتـە
خۆ بە شـەرعی موستەفا جەننەت بە کافر نـادرێ

«وەرگێڕ»)

٣- زوننار: پارچە قوماشێک کە مەسیحیەکان لە دەوری خۆیان دەبەست بۆ ئەوەی لـە موسـوڵمانان جیا بکرێنەوە. وست: خست. دۆش: سەر شان. ناقووس: زەنگی کلیسا. گێرت: گرت. شی: ڕۆیشت. پیر: گەورە، زانا. بوت پەرەست: غەیرە موسـوڵمان. واتە: دڵم زوونناری خستە سـەر شـان و ناقووسـی گرت بە دەستەوە و خۆی خستە بەر پێی زانای بوت پەرەست.

جـامێ جـه شـەراب عەشـق بـوت نـۆش کـەرد
حـەرف دیـن جـه لـەوح یـاذ فـەرامۆش کـەرد [١]

ڕووم کـەرد نـه ڕووی دڵ خـەیلێم کـەرد مـەنا
کـێ بـەردەن وه سـای بـوت پەرەسـت پـەنا؟ [٢]

پێسـه بـێ پـەروا وێنـەی پەروانـه
وێـت وسـتەن نـه شـەوق سـەیر بوتخانـه [٣]

دڵ وات بـەو کـوفره بـه دیـن بەسـتەن دەور
مـن بێزارەنـان جـه دینـت بـەی تـەور [٤]

---

١- جامێ: پیاڵەیەک. نۆش کەرد: خواردەوە. حەرف: وتە، قسـە. لـەوح: شـوێنێک کـه شـتی لـێ بنووسرێت. واته: پیاڵەک له شەرابی عەشقی بوتەکەی خواردەوە و سەرمەستی عەشقی بوتەکه بوو و هەرچی واتای دینی بوو له بیری خۆی بردەوە.

٢- خەیلێم: زۆرم. مەنا: مەنع، لۆمە. کێ بەردەن: کێ بردوویه. واته: ڕووم لـه دڵ کـرد و زۆرم لۆمـه کرد و وتم ئاخر کێ پەنای به سایەی بوت پەرەست بردووە؟

٣- پێسه: وەها، بەم شێوە، بەم جۆرە. بێ پەروا: نەترس، نەترسانه. وێت وسـتەن: خـۆت خسـتووەته. واته: وەک چۆن پەپوولە خۆی ئەدا به داوی شەمەوە ئێستە تۆیش وەک ئـەو پەپوولـه بـێ تـرس و باک خۆت خستووەته نێو شەوقی سەیری بوتخانەوە.

٤- وات: وتی. بەو کوفرە: قەسەم بەو کوفرە. بەستەن: بەستووە. بێزارەنان: بێـزارم. بـەی تـەور: بـەم شێوە، بەم جۆرە. واته: دڵ وتی قەسـەم بەو کوفرە کە دەوری دینی گرتووە مـن لـەم جـۆرە دینـەی تـۆ بێزارم.

سوب نە بوتخانە دەروون پەڕجۆش
شێوەی شیرینی بادە نۆشانۆش[1]

خاستەرەن جە دین ڕیا کەردەی تۆ
ڕەنج ئاخر هیچ بەر نەوەردەی تۆ[2]

***

---

١- سوب: بەیانی. پەڕجۆش: پڕ جۆش، پڕ شەوق. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوەن.

٢- خاستەرەن: خاسترە. ڕیا: دوو ڕوویی. کەردەی تۆ: ئەوەی تۆ دەیکەی. نەوەردە: نەخواردوو. واتە: دڵ وتی بەیانی لە بوتخانە دەروونت پڕ بێت لە جۆش و شێوەی خۆشی ئەوە کە یەک لە دوای یەک شەراب بخۆیتەوە زۆر لە دینە ڕیا کارانەکەی تۆ و لەو ڕەنجە کە دەیکێشی و لێیشی ناخۆی چاکترە.

بێسارانی ئەم پارچە شێعرەی لە ڕەدیفی شێعرێکی «یۆسف یاسکە»دا هۆنیوەتەوە کە لە سەرچاوەکانی «ح»، «ڕ»، «س» و «ب»دا بە ناوی بێسارانییەوە چاپ کراوە کە دیارە هەڵەیە. ئەمەیش پارچە شێعرەکەی «یۆسف یاسکە»:

| | |
|---|---|
| ڕوێ کوفرێ دیم ئیمان مەپۆشا | دڵ ئیمان بە بوت کوففار فرۆشا |
| دین تەرسا گێرت هۆرگێلا جە گشت | پەشت بەست بە زوننار کلیسا و کەنشت |
| واتم هەی دڵە فامت شۆ جە سەر | کێ بەستەن بە بوت کوففاران کەمەر |
| گێرتەنت مەزهەب شێخ سەنعانی | ئیمان مەورەشی زوننار مەستانی |
| دڵ وات بە خوداێ کارساز کەریم | مەن جە دین تۆ بێزار و بەریم |
| حەڵقێوە جە زڵف زوننار دڵبەر | نمەدەو بە موڵک دارا و سکەندەر |
| سوب سەداێ ناقووس سەیر بوتخانە | دین تەرسایان، کلیسا یانە |
| خاستەرەن جە دین ناتەمام تۆ | سوجدەی ڕیایی سوبح و شام تۆ |

بە دوای شێعرەکەی بێسارانیدا پارچە شێعرێکی دیکە هاتووە «شیخ لطف اللّٰه در ردیف»ی لە سەر نووسراوە بەڵام لە سەرچاوەکانی «ح»، «ڕ»، «س» و «ب»دا بە ناوی بێسارانییەوە هاتووە کە ☞

-٢[1]-

رەقیـــب! ســـیا بـــۆ، رەقیـــب! ســـیا بـــۆ
رووت بـــە وێنـــەی زڵـــف قیبلـــەم ســـیا بـــۆ[2]

---

☜ دیارە شێعری بێسارانی نییە و لە ڕەدیفی ئەم شێعرەدا نووسراوە. ئەمـەیش شـێعرەکەی «شـیخ لطف اللّه»:

| | |
|---|---|
| ڕوێ کـوفرێ دیـم رووی ئـیمان مـەگرت | دڵ جـە دیـن بەرشـی دیـن تەرسـا گـرت |
| پەشت کەرد نـە مەزهـەب عالمـان دیـن | روو نـە بوتخانـە زوننـار بەسـت یـەقین |
| ناقووس گرت بە دەست ساز گـەبری ژەنـد | ئـیمان دا بـە کـوفر، دیـن تەرسـا سـەند |
| واتم هـەی دڵـەی بـێ پـەروا جـە گشـت | کێ جە دین بەرشی ڕوو کەرد نە کەنشت؟ |
| گرتـەنت بـە دەسـت سـاز نەسـرانی | هەر سوب سوجدەی بوت بە ناقووس وانی |
| دڵ وات بـە کەسـێ دانـا بـە گشـتەن | بەرشـیم جـە دینـت ڕووم نـە کەنشـتەن |
| هەر سەحەر نۆشای بـادەی سـاف مەسـت | حەڵقەی زڵف دۆس زوننار بەستەی قەست |
| خاسـتەر جـە سـوجدەی ڕیـا بەردەتـەن | ڕەنـج سـەدْ سـاڵەی جـێ نەوەردەتـەن |

ئەگەر بە وردی سەیری هەرسێ پارچە شێعرەکە بکەین بۆمان ڕوون دەبێتـەوە کـە هەرسـێ شـێعرەکە یەک ناوەرۆکیان هەیە و دیارە کە بەو شێوە لە نوسخەی «ک»دا هاتووە دروست نووسراوە و هـەرکام هی یەکێک لەو شاعیرانەن کە ناومان بردوون و لە ڕەدیفی یەکدیدا نووسراون. ئەمە هەڵەیە کە ئەم شێعرانە کە لە ڕەدیفی شێعرەکانی بێسارانیدا نووسـراون بـە نـاوی بێسـارانییەوە بنووسـرێنەوە، لـە سەرچاوەکانی «ح»، «ڕ»، «س» و «ب»دا زۆر دووپات کراوەتـەوە کـە هـەر کـام لـە جێـی خـۆیدا ئاماژەیان پێ کراوە.

-٢-

١- ک، س، ڕ، ب، ح.

٢- ڕەقیب: لە بنەڕەتدا بە مانای چاوەدێر و پاسەوانە بەڵام لێرەدا بـە مانـای کەسـێکە کـە بیـەوێت نێوانی عاشق و مەعشووق تێک بدات یا بیەوێ مەعشووق لە عاشق داگیر بکات. سیا بۆ: ☜

غەزەب جە ئاسمان پەرێت ئەو ڕا بۆ
بەند بەندت بە تیخ جە هەم جیا بۆ[١]

بە قاڵب مەردە بە سەر زێندە بای
خەریک و خەرکاو ئەرامەندە بای[٢]

خودا تۆ نەکوشۆ پەرێ خەلاسی
تا خاس خودای وێت بە حەق بناسی[٣]

بەی تەور بەیۆ پێت تۆ جە ناسازی
هەر دەم مەرگ وێت باوات بوازی[٤]

---

☜ ڕەش بێت. واتە: ئەی ڕەقیب! ڕووت وەک زوڵفی قیبلەم ڕەش بێت.

١- پەرێت ئەو ڕا بێت: بۆت تەیار کرابێت و لە ڕێگەی بەرەو تۆدا بێت. بەند: جمگە، جمیە. واتە: بەڵکوو غەزەبت لە ئاسمانەوە بۆت بێت و هەموو ئازای ئەنامت بە تیخ لە یەک جیابێتەوە.

٢- قاڵب: لاشە، جەستە. مەردە: مردوو. زێندە: زیندوو. بای: بی، ببیت. خەریک: سەرقاڵ. خەرکاو: پەشۆکاو. ئەرامەندە: سەر لێ شێواو. واتە: بە لاشە مردوو و بە سەر زیندوو بیت، دایمە سەرقاڵ و پەشۆکاو و سەر لێ شێواو بیت.

٣- نەکوشۆ: نەکوژێت. پەرێ خەلاسی: بۆ خەلاس بوون، بۆ ڕزگار بوون. واتە: خودا نەتکوژێت با ڕزگارت نەبیت بەڵکوو بتهێڵێتەوە و بتخاتە ڕەنج و ناڕەحەتییەوە تا خودای خۆت بە حەق بناسی.

٤- بەی تەور: بەم شێوە. بەیۆ پێت: بۆت بێت. ناسازی: نەخۆشی، ناساقی. وێت: خۆت. باوات: بە ئاوات. بوازی: بخوازی. واتە: نەخۆشی و ناساقی کارێکی وات پێ بکات کە بەردەوام ئاوات بە مەرگی خۆت بخوازی.

ســا کــه تــۆ هێجــران یــاران ســەڵا بــای
کــافر موتڵــەق! گیــر بــەڵا بــای[١]

✡✡✡

-٣[٢]-

ڕەنــــگ زەرد مــــەن، ڕەنــــگ زەرد مــــەن
زافــــەران وێنــــەی ڕەنــــگ زەرد مــــەن[٣]

جۆیــــایی مــــەجنوون مەینــــەت گەرد مــــەن
بێســــتوون ســــەنگێ جــــە کــــۆی دەرد مــــەن[٤]

---

١- هێجران: دووری. سەڵا: بانگ کردن. بای: بی. واتە: سا کە تۆ ئێستە دەنگی دووری یاران بیت و هەواڵی یارانم بۆ بهێنی، ئەی کافری ڕووت! خودا بکات ببی بە داوی بەڵاوە. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ڕ»، «س» و «ب»دا بە جێی «یاران سەڵا بای»، « قیبلەم سەڵا دای» نووسراوە.

-٣-

٢- ک، ڕ، س، ب، ح.

٣- زافەران: زەعفەران. بنی گوڵی گیایەکی زەردە کە بە ناوی گیاکەوە پێی دەڵـێن زەعفـەران. واتـە: زەعفەران بە وێنەی ڕەنگی من زەردە.

٤- جۆیا: کەسێک کە بە دوای شتێکدا بگەڕێت. گەرد: گەڕان. واتـە: بـە وێنـەی مـەجنوونم لـێ هاتووە و بگرە زیاتریش چون بە دوای مەینەتدا دەگەڕێم و کێوی بێستوون بەردێکە لـە کێـوی دەردی من . مەبەستی ئەوەیە من لە فەرهاد و مەجنوون عاشقترم.

چــــەنی بــــار خــــەم، خــــەم قامەتمــــەن
قیامــــەت، قامــــەت پــــەڕ زامەتمــــەن[١]

زامــــەتێ جەســـتەی مـــن کـــەردەن بـــە خـــۆ
پـــێش مـــەبۆ بـــە گـــەرد ئـــەر بگنـــۆ وەکـــۆ[٢]

☆☆☆

-٤[٣]-

ڕێحـــانی بێگـــەرد!، ڕێحـــانی بێگـــەرد!
ڕێحـــانی پـــەلدێـــز، قـــەترانی بێگـــەرد![٤]

---

١- چەنی:لەگەڵ. خەم: لار، چەماو، کۆم. پەڕ: پڕ. زامەت: هەم دەتوانێت بە مانای زام و برین بێت هەم بە مانای زەحمەت. واتە: جگە لەوەی کە بارم خەمە قامەتیشم خەم بووە و قیامەت باڵای پڕ زام و زەحمەتی منە.

٢- کەردەن: کردووە. خۆ: خوو، عادەت. پێش مەبۆ: پێی دەبێت. گەرد: تۆز. ئـەر: ئەگـەر. بگنـۆ: بکەوێت. واتە: ئەو زام (زەحمەت)ـە لاشەی منی کردووە بە عادەت و ئیتـر عـادەتی پـێ گرتـووە و گوێی لێ نییە ئەگینا لە کێو بکەوێت دەیکاتە تۆز.

-٤-

٣- ک، س، ڕ، ب، ح.

٤- بێ گەرد: بێ عـەیب، جوان. پەل: باڵ، گەڵای ڕێحانە. دێز: ڕەش. قەتران: ماکێکی ڕەنگ ڕەشـە. واتە: ئەی ڕێحانە گەڵاڕەش و ڕەشی بێ عەیب. دەیەوێ لەگەڵ «ڕەشەڕێحانە»دا قسە و گفت و گۆ بکات و لە بەیتە دواییەکاندا لەگەڵی باسەکەی ئەکات.

مزدانـــــی بـــــۆ لێـــــت وادەی شـــــەبەق زەرد
مـــــەیۆت بـــــە مـــــێمان زڵێخـــــای بێگـــــەرد [١]

هـــۆرگێرۆت نـــە خـــاک نـــە ڕووی ســـەرزەمین
مـــەپێچۆت بـــە چـــین کڵاڤـــەی موشـــکین [٢]

وێنـــەی زڵـــف وێـــش مـــەچنۆت بـــە دەســـتە
بـــۆ مـــەنیۆ نـــە بـــۆت چـــوون ئـــاوات وەســـتە [٣]

دەرێغـــــات بڕیـــــان نـــــە ڕووی ســـــەرزەمین
پێچیـــای نـــە چـــین کڵاڤـــەی موشـــکین [٤]

---

١- مزدانی: مزگانی، مزیانی. شەبەق: شەفەق. شەبەق زەرد: کاتێک هەتاو دەکەوێتە سەر کەلان و هەوا ڕوون دەبێتەوە. مەیۆت: دێ بۆ لات. مێمان: میوان، مێوان. واتە: مزگانی بێت بەیانی زوو کاتێک هەتاو هەڵدێت زڵێخای بێگەرد و بێعەیب دێ بۆ لات و دەبێتە مێوانت.

٢- هۆرگێرۆت: هەڵتدەگرێت. مەپێچۆت: دەتپێچێت. کڵاڤ: پەلکە. موشک: ماکێکی ڕەشی بۆنخۆشە. واتە: لە سەر زەمین هەڵتدەگرت و دەتپێچێتە زوڵفە ڕەشە بۆنخۆشەکانیەوە.

٣- وێش: خۆی. مەچنۆت: دەتچنێت. مەنیۆ: دەنێت. چوون: وێنەی، وەکوو. ئاوات وەستە: ئاوات خواز، ئاوات خواستراو. واتە: وێنەی زوڵفەکانی خۆی دەستە دەستە دەتچنێت و وەکوو ئاوات خوازێک بۆنت دەکات.

٤- دەرێغا: خۆزگە، وشەیەکە لە کاتی هەبوونی ئاوات و ئارەزوودا دەیڵێن. بڕیان: بڕاوە، بڕا. پێچیای: پێچراوی. واتە: ئیتر هیچ ئاواتێکت لە ڕووی سەرزەمین نەماوە چون پێچراوی بە چینی پەلکەی زوڵفە ڕەشەکانیەوە.

ڕێحـــان! بەشــق حـــەق چێـــو مەپەرســـوو جێـــت
بـــۆی ئـــەو وەشـــتەرەن یـــا بـــۆی وەڵـــگ وێـــت؟ [١]

ڕێحـــان وات: جـــە مـــن چـــوون پەرســـای هـــەواڵ
بـــــە دانـــــای داوەر بینـــــای بـــــێ زەواڵ [٢]

بـــە شـــایێ کـــە ئـــەو نـــەزا و نەمـــەردەن
منشـــان جـــە ئـــەزرەت زلْـــف ئـــەو کـــەردەن [٣]

***

١- بەشق: بە عەشق، بە خاتری. چێو: شتێک. مەپەرسوو جێت: لێت دەپرسم. وەشتەرەن: خۆشترە. وەڵگ: گەڵا، بەرگ. وێت: خۆت. واتە: ئەی ڕێحانەڕەشە! شتێکت لێ دەپرسم بیکە بە خاتری خودای مەزن ڕاستم پێ بڵێ، بۆنی ئەو خۆشترە یا بۆنی گەڵاکانی خۆت؟

٢- وات: وتی. چوون پەرسای هەواڵ: چون لە منت پرسی. دانا: زانا، سیفەتێکی خودایە. دادوەر: کەسێک کە داد و هاوار بپرسێت و بە عەدالەت هەڵسوکەوت بکات، سیفەتێکی خودایە. بێ زەواڵ: کەسێک کە هەر دەمێنێ و لە نێو چوونی نییە، سیفەتێکی خودایە. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٣- نەزا: لە کەس نەبوو، سیفەتێکی خودایە. نەمەردە: کەسێک کە نەمرێت، سیفەتێکی خودایە. منشان: منیان. ئەزرەت: حەسرەت، چاوت بە شتێک بکەوێت و دڵت پێوە بێ. واتە: ڕێحانەڕەشە وتی چونکە هەواڵت لە من پرسی قەسەم بەو خودا کە زانا و بینا و خاوەن دادە و هەر هەیە و قەسەم بەو خودایە لە کەس نەبووە و نامرێت، چاویان بە زوڵفە ڕەشەکانی ئەو کەوت و لە حەسرەتی ئەو منیان دروست کرد. لە نوسخەی «ک»دا بە دوای ئەم پارچە شێعرەدا شێعرێکی دیکە هاتووە و لە سەری نووسراوە «ملا طاهر اورامی در ردیف». ئەمەیش شێعرەکە:

☜

-٥-[1]

# ڕێحـــانێو مـــەبۆ پـــەل دێـــز بێگـــەرد
# چـــوون زڵـــف سـیای ئـــەو لـــەیل بـــووم زەرد [2]

☞

تـــەڵێو جـــە ڕێحـــان پەرێشـــان شـێوە
لاف مـــەدا بـــە بـــۆی زڵـــف کەسـێوە

مـــەواتش قـــەترەی قـــەتران بێزەنـــان
هـــام ڕەنـــگ هـــام بـــۆی زڵـــف دێزەنـــان

مـــن واتـــم ڕێحـــان! زێـــد ســـارایی
بـــە تـــۆ چ لایـــق لاف بینـــایی؟

ڕێحـــان وات شـــەرتەن ئێمـــە و تـــۆ و یـــار
بنیشـــمێ وە هـــەم جـــایێ بـــێ ئـــەغیار

ڕوو بـــە ڕووم کـــەرە چـــەنی زڵـــف دەســـتەت
چـــەنی قیبلـــەگای خـــاس ئـــاوات وەســـتەت

ئـــەر خـــەلاف بەرشـــۆم لاف بینـــایی
بماڵـــە نـــە ڕووم ڕەنـــگ ســـیایی

ئێمـــە و گـــوڵ ڕێحـــان هـــەر دوو بـــەو ڕانـــە
شـــیەیمێ کـــەردمان ســـوجدەی ئاســـتانە

بـــە ناڵـــەی دڵســـۆز لالام لاڵ وێنـــە
پەی چەندێ تـای زڵـف تـوغرای موشـکینە

واتـــم مروەتـــەن شـــای پـــەری پایـــە
با پەخش بۆ نـە ڕووت زڵـف موشـک مایـە

دا ئێمـــە و ڕێحـــان داوا و جەســـتەمان
بەرشـــۆ بـــە ڕاســـتی بـــەین بەســـتەمان

نەکـــەرد دەرێغـــا حاجـــەت کـــەرد قـــەبووڵ
وەر دا بـــە وەردا دەســـتەی زڵـــف لـــووڵ

ســـا ڕێحـــان نەشـــئەی زڵفـــش خـــاس زانـــا
پـــەی ڕووســـیاییش «ئـــەی وەڵـــلا»ش وانـــا

زامـــن بـــەرد وە زێـــد ســـایەی درختـــان
تـــا بـــە زانـــوو خـــاک، چـــوون ســـیابەختان

پـــەرێ پێکـــای لاف وەردش نەدامـــەت
ڕووســـیاییش مەنـــد تـــا ڕۆی قیامـــەت

-٥-

١- ک، س، ڕ، ب، ح.

٢- ڕێحانێو مەبۆ: ڕێحانەیەک دەبێ. پەل: باڵ، گەڵای ڕێحانە. دێز: ڕەش. بێ گەرد: بێ عەیب، جوان. چوون: وێنەی، وەکوو. سیا: ڕەش. بووم: ڕوخسار. واتە: ڕێحانەیەک هەیە گەڵای ڕەشە (ڕێحانەڕەشە) و لە زوڵفە ڕەشەکانی لەیلی ڕوومەت زەرد دەچێت. بێسارانی لە زۆر جێگەدا بە ☜

بەر مەیۆ نە خاک باڵا مەنمانۆ

بۆی عەنبەر نە ڕووی زەمین مەشانۆ[١]

هەرکۆ باخێو هەن ئانا تێشەڎا

بۆی عەنبەر مودام مەیۆ پێشەڎا[٢]

چوون باخچەی خانان قەیتوول وناران

دەستە بە دەستە چوون زڵف یاران[٣]

---

☞ جێی سیفەتی سپی، زەرد بە کار دەهێنێت. لە سەرچاوەکانی «ح» و «ڕ»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «چوون زڵف سیای لەیل عەنبەر زەرد» کە دیارە هەڵەیە و «لەیلی عەنبەر زەرد» مانای نییە. لە سەرچاوەکانی «س» و «ب»دا بەم جۆرە نووسراوە کە نووسیومانە و لە نوسخەی «ک»دا بەم جۆرە «چوون زوڵف سیای لەیل .... زەرد» کە بە داخەوە لەو بەینەدا وشەیەکی ناخوێنرێتەوە و نەمانزانی چی نووسراوە.

١- بەر مەیۆ: دەردێت، دەڕوێت. مەنمانۆ: دەنوێنێ. عەنبەر: ماکێکی ڕەشی بۆنخۆشە. مەشانۆ: دەوەشێنێ، بڵاو دەکاتەوە. واتە: ئەو ڕێحانە کە دەڕوێت و باڵا دەنوێنێ و بۆنی عەنبەر لە سەرزەمیندا بڵاو دەکاتەوە.

٢- هەرکۆ: هەر کوێ. هەن: هەیە. ئانا تێشەڎا: تێیدایە. مودام: بەردەوام، هەمیشە. مەیۆ: دێت. پێشەڎا: پێیدا. واتە: لە هەر شوێنێک باخێک هەیە ڕێحانەیشی تێدایە و بەردەوام بۆنی عەنبەریشی لێ دێت. لە سەرچاوەی «ح»دا جێگەی ئەم بەیتە و بەیتی دواییدا گۆڕاوە.

٣- قەیتوول: شوێنی حەسانەوەی لەشکەر، لێرەدا بێسارانی بە مانای لەشکەر هێناویە. وناران: تەیاری کردووە، ڕازاندوەتەوە. واتە: بە وێنەی باخچەی خانان لەشکەری ڕازاندوەتەوە و بە وێنەی زوڵفی ئازیزان دەستەدەستەیە. بە داخەوە ئەم بەیتە لە نوسخەی «ک»دا نییە.

شــــێوەی ئـــەو ڕێحــــان بــــەو کڵافـــەوەن
بــــەو کـــــڵاف ســـــەوز موشـــک نافـــەوەن[1]

***

-٦[2]-

ڕێزنـــــای جـــــەرگم، ڕێزنــــای جــــەرگم
ڕێـــــزە ڕێـــزە بــــای، ڕێزنـــای جــــەرگم[3]

دووردینــــــــی دینـــــــت، دێونــــــا دەردم
زیـــا جـــە گـــەردوون هەناســـەی ســـەردم[4]

---

١- کڵاف: پەلکە. موشک ناف: ماکێکی (مادیەکی) ڕەشی بۆنخۆشە کە وا لە کیسەی پەنا نـاوکی جۆرە ئاسکێک کە لە وڵاتی خوتەندا دەژین. واتـە: شـکڵ و شـێوەی ئـەو ڕێحانـە وا بـەو پەلکـەی زوڵفانەوە (شێوەی ئەو ڕێحانە لە ئەو پەلکەی زوڵفانە دەچێت). ئەو پەلکە سەوزە کە بۆنی موشـک ئەدات. بۆم ڕوون نەبوەوە لە بەرچی بە پەلکەی زوڵف دەڵێت «کڵافەی سەوز». ئەگەر بە «کڵافـەی سۆز»یش بیخوێنینەوە بەو جۆرە کە کاک حەکیم لە سەرچاوەی «ح»دا نووسیویە هەر مانا نادا. بـە داخەوە لە نوسـخەی «ک»دا دوو بـەیتی کۆتـایی لـە نوسـخەکە پـەڕیوە و نـەمانزانی لـەوێ چـی نووسراوە. بێسارانی لەم جۆرە تەشبیهاتانەی زۆر بە کار بردووە، سەرەتا باسی گوڵێک دەکات و دوایـی ئەڵێت ئەو گوڵە لە فلان شتی یار دەچێت.

-٦-

٢- ک، س، ڕ، ب، ح.

٣- ڕێزنای: وردت کرد، ڕێزە ڕێزەت کرد. ڕێزە ڕێزە بای: لەت لەت بیت. واتە: خوا بکات ڕێزە ڕێزە بیت چونکە جەرگی منت ڕێزە ڕێزە کرد.

٤- دووردین: لە دوورە چاو پێکەوتن، لە دوورە دیتن. دین: دیتن، بینین. زیا: بەرز بووەوە، ☜

پـــارە پـــارە جـــەرگ چـــوون کۆتـــەرەی نـــار
چـــەنی زوخ جـــە چـــەم ڕێزیـــا بـــە وار[١]

هـــەر مـــوژێم وێنـــەی کـــەلاغ کۆســـار
پـــارێ جـــە جـــەرگم گێرتـــەن بـــە مێنقـــار[٢]

ڕێـــزەی جـــەرگ وێـــم چنـــیم نـــە دامـــان
هـــەر دام بـــە ســـەردا تـــا مـــەرگ ســـامان[٣]

٭٭٭

---

☞ دەرچوو. واتە: لە دوورەوە دیتنت دەردمی دێوانە کرد و هەناسەی سەردم لە گـەردوون تێپـەڕی.

* تێبینی: بە پێی داڕژتنی ئەم جۆرە شێعرانە کە نیوە بەیتی یەکەمی بە دووپات بوونـەوەی یـەک شت پێک دێت دەبێ سەروای بەیتی دووهەمیش هاوسەروای بەیتی یەکەم بێت بەڵام ئەم چوارچێوە لەم شێعرەدا نەپارێزراوە «وەرگێڕ».

١- کۆتەرە: لا سووتاو، نیوە سووتاو. نار: ئاگر. چەنی: لەگـەڵ. چـەم: چـاو. ڕێزیـا: ڕژا، تکـا. وار: خوار. واتە: جەرگم کوت کوت بوو و لەگەڵ هەر بزوسکێک لە کۆتەرەی ئـاگرین جیـا بـووەوە و بـەو شێوە لەت لەتی جەرگم لەگەڵ زوخاودا لە چاوانم تکا و کەوتە خوارەوە.

٢- موژە: مژۆڵ، برژانگ. کەلاغ: قاڵاو، قـەل. پـارێ: لـەتێک. گێرتـەن: گرتـووە. مێنقـار: نـووک، دەنووک. واتە: هەر مژۆڵێکم بە وێنەی قەلی کۆساران لەتێک لە جەرگمی بە دەنووکەوە گرتووە.

٣- وێم: خۆم. چنـیم: چنیمەوە، هەڵمگرتەوە. دامان: داوێن. واتە: ڕێـزە ڕێـزەی جـەرگی خـۆمم لـە داوێنم چنیەوە و هەر دام بە سەردا تا مەرگ هات و ڕزگاری کردم.

-١-[1]

زامــــــدار دەردان، زامــــــدار دەردان
مـــن کۆنــە کوشـــتەی زامـــدار دەردان[2]

مــە گێڵام چـــوون چــەرخ وێــڵ ســەرگەردان
بەتـــەر خـــەزانان ســـەرگەردان کـــەردان[3]

بەتـــەر جـــە خـــەزان دەردم خێزیـــان
وە ڕووشـــان چـــوون ســـەیل ئەســـرم ڕێزیـــان[4]

خـــەزانان دێــز ڕەنــگ، ئــاڵایی گــوڵ گــوڵ
ئێشناشـــان زام ناســـۆر کەوتـــەی دڵ[5]

-١-

١- ک، س، ڕ، ب، ح.

٢- کۆنە کوشتە: پێشتر کوژراو، فێر بوون بە کوژران، وەک ئەوەی دەڵێن «کۆنە ڕاوچی» واتە لە مێژە ڕاوچییە. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا پێکەوە دێن.

٣- مەگێڵام: دەگەڕام، هەڵدەسووڕام. چوون: وێنەی، وەکوو. بەتەر: خراوتر. واتە: من کە کۆنە کوشتە و زامداری دەرد بووم و بە وێنەی چەرخی ڕۆژگار وێڵ وێڵ دەخولامەوە و کاتێک گەڵای زەردی خەزانم بینی خراوتر سەرگەردان بووم.

٤- خێزیان: هەستاوە. سەیل: لافاو، تاوە باران. ئەسر: ئەسرین. ڕێزیان: ڕژاوە. واتە: لە گەڵا خەزانەکان خراوتر دەردم هەستاوە و ئەسرینم بە وێنەی لافاو دەڕژێ بە سەریاندا.

٥- دێز: ڕەنگێکە بەرەو ڕەشی و تاریکی دەنوێنێ. ئاڵایی: ڕەنگاوڕەنگ، ڕەنگاڵە. ناسۆر: زامێک کە دێر سارێژ بێت. واتە: گەڵا خەزانەکان کە ڕەنگیان بە ڕەش گۆڕاوە و ڕەنگاوڕەنگ و گەڵا گەڵا ☜

ئینبـــار وێڵـــی مـــن وه جـــایێ یـــاوان
ئەجـــەڵ پـــەی کوشـــتم نـــەدارۆ تـــاوان[١]

☆☆☆

-٢-[٢]

زامنـــــان خـــــاڵی، زامنـــــان خـــــاڵی
دوور زامنـــــان دیـــم جـــە یـــاران خـــاڵی[٣]

دەروونـــم جـــۆش دا، دڵ بـــە دەرد نـــاڵی
گـــەرد ڕووی زەردم بـــە زوخـــاو مـــاڵی[٤]

---

بوونەتەوە، زامە سارێژ نەبووەکەی دڵمیان کولاندەوە و ئێشان.

١- ئینبار: ئەم جارە. وە جایێ یاوان: بە جێگەیەک گەیشتووە. پەی کوشتم: بۆ کوشتنم. نەدارۆ تاوان: تاوانی نییە. واتە: من کە پێشتر کۆنە کوشتەی دەرد بووم ئەمجارە (لە داخی ئەو گەڵا زەردانە) وێڵی و سەرگەردانی من بە جێیەک گەیشتووە کە ئیتر دەردی زیندوو بوون ناخۆم و ئەگەر ئەجەل بمکوژێت تاوان و خەتای نییە.

-٢-

٢- ک، ڕ، ب، س، ح.

٣- زامن: زێد، نیشتمان، وەتەن. واتە: لە دوورەوە سەیری وەتەنم کرد خاڵی بوو لە یاران.

٤- جۆشدا: هێنایە کوڵ. ماڵی: سڕی، پاک کردەوە. واتە: دەروونم هاتە کوڵ و دڵم بەو دەردەوە کەوتە ناڵە و تۆزی ڕوخساری زەردمی بە زوخاوەوە ماڵی. مەبەستی ئەوەیە کە زوخاو لە دڵم هەڵقوڵی و لەگەڵ ئەسرینمدا لە چاوانم ڕژایە سەر ڕوومەتم.

بـــەو تـــەور مـــن گـــرێم جـــە نـــاو دەروونـــەن
عەجـــەب مـــەمانوو، هـــەر ئەســـرم هوونـــەن[1]

مـــــەوازۆ ئـــــەر دڵ وە گـــــڕین بیـــــا
بیـــــا بـــــە کۆگـــــای زوخـــــاڵ ســـــیا[2]

☆☆☆

-٣-[3]

زەرگـــــوون کـــــەردەوە، زەرگـــــوون کـــــەردەوە
نـــــەووەهار زەمـــــین زەرگـــــوون کـــــەردەوە[4]

ســـــەبزەوار کێشـــــا ســـــەر جـــــە پـــــەردەوە
شـــــەو شـــــەونەم خومـــــار دیـــــدەش بـــــەردەوە[5]

---

١- بەو تەور: بەو شێوە، بەو جۆرە. گرێ: ئاگرێک. عەجەب مەمانوو: سەرم سڕ دەمێنێ. ئەسر: ئەسرین، فرمێسک. هوون: خوێن. مانای ئەم بەیتە بەستراوە بە بەیتی دواییەوە.

٢- مەوازۆ: پێویستە، لازمە. گڕین: ئاگراوی، گڕاوی، دەتوانێت «گرین»یش بێت بە مانای «گریان». بیا: ببوایە. واتە: بەو شێوە کە من گڕم گرتووە سەرم سڕ دەمێنێ کە هێشتا ئەسرینم خوێنینە، چون ئەگەر گڕاوی بوون بێت پێویستە دڵم ببێ بە کۆی زوخاڵی ڕەش.

-٣-

٣- ک، ئێ، س، ر، ب، ح، مج.

٤- زەرگوون: بە وێنەی زێڕ(تەلا)، بە ڕەنگی زێڕ(تەلایی). واتە: بەهار هات و سەرزەمینی کردەوە بە ڕەنگی زێڕ. مەبەستی ڕوانی گوڵی زەرد و چووزە گیایە کە زەردن.

٥- سەبزەوار: بە وێنەی سەوزە. خومار: بێ هێزی پاش شەراب خواردنەوە. واتە: لەگەڵ ئەوەی ☜

خێــــزا بارخانـــــەی بـــــاد ســــەبایی
کـــەرد وێنـــەی عـــەتتار نافـــە گوشـــایی [١]

چەمـــەن پـــەی مـــەجلێس گـــوڵان وەشـــبۆ
تونـــد کـــەرد تـــەنافان، هـــۆردا چـــەتر نـــۆ [٢]

داخـــل مەجلێســـان مەســـت جـــام مـــەی
فـــەرما بولبـــوڵان نـــەوای ســـاز نـــەی [٣]

---

☜ سەبزە لە ژێر خاکەوە دەروێت وەها زەمینیش سەر لە ژێر پەردە دێنێتە دەر(لە خەونی زستانی رادەچەڵەکێت) و ئاونگی شەو مەستی لە چاوی زەمین دەپەرێنێت. مەبەستی ئەوەیە کەسێک شەرابی خواردبێت و بێ هێز کەوتبێت و کەسێکی دیکە ئاوی لێ بپرژێنێت تا مەستییەکەی بپەرێنێ، زەمنیش بەو شێوە بە ئاونگ مەستیەکەی پڕی و هاتەوە سەرخۆی.

١- خێزا: هەستا. بارخانە: ئەنباری، هەمار، شوێنی هەڵگرتنی کەل و پەل. باد: با، وا. سەبایی: بایەک کە لە ڕۆژهەڵاتەوە دێت و دەڵێن خێر و بەرەکەت لەگەڵ خۆی دێنێ. عەتتار: عەتر فرۆش. ناف: نێوک، ناوک. نافە گوشایی: نێوککردنەوە، مەبەست بڵاو کردنەوەی بۆنی خۆشە و ئاماژەیە بە موشک کە وا لە پەنای نێوکی جۆرە ئاسکێکدا و کاتێ بڵاوی دەکاتەوە بۆنی خۆش دەکەوێتە وڵاتەوە. واتە: بای پڕ خێر و بەرەکەت هەڵیکرد وەک عەتر فرۆش بۆنی خۆشی خستە وڵاتەوە.

٢- پەی: بۆ. هۆردا: هەڵدا. واتە: سەوزە بۆ ڕازاندنەوەی کۆڕی گوڵە بۆن خۆشەکان تەنافی توند کردووە و چەتری نوێی هەڵدا. لێرەدا بێسارانی ڕوانی سەوزەی شوبهاندووە بەوەی کە بۆ ڕازاندنەوەی کۆڕی ڕابواردن دەواریان بە وێنەی چەتر هەڵداوە و بە تەناف بەستوویانەتەوە، مەبەستی ئەوەیە کە چەمەن ڕواوە و خۆی تەیار کردووە بۆ ڕوانی گوڵە بۆنخۆشەکان.

٣- جام: پیاڵە. مەی، شەراو. شەراب. فەرما: فەرمووی، وتی. واتە: ئەوانەی کە وان لە کۆڕەکەدا (گوڵە بۆنخۆشەکان) هەمووی بە پیاڵەی شەراب مەستن و بولبولیش دەنگی لە سازی نەیان ☜

کۆســـــار نمانــــا ڕەنـــــگ زەرگـــــوونی
شــەقایق مـــەی کـــەرد نـــە جـــام هــــوونی[١]

چنـــوور دەمـــاخ بـــەرز سۆســـەن خەیمـــەکۆ
ســـاقی شـــەقایق، شـــەو شـــەفای شـــەوبۆ[٢]

بــــەڕەزا پەخشــــەن بـــــە ڕووی تـــاوێران
تاریـــان چـــوون تـــار زڵـــف خـــاوێران[٣]

☞ هەستان (دەستیان کرد بە خوێندن بۆ گوڵان). لێرەدا بێسارانی دیسان ڕوانـی گـوڵ و خوێنـدنی بولبولی بە کۆڕی ڕابواردنی شوبهاندووە.

١- کۆسار: چیای زۆر. نمانا: نواند، نیشاندا. شەقایەق: گوڵاڵەسوورە، گوڵێکی بەهارییە کە ڕەنگـی گوڵەکەی سوورە و بە هەورامی «نان و دۆ بر»ی پێ دەڵێن. مەی کەرد نە: شەرابی کردە نێو... جام هوونی: پیاڵەی سوور بە ڕەنگی خوێن. واتە: کۆسار ڕەنگی زێڕینی نواند و (لە نێو کۆڕەکەدا) گوڵاڵە شەرابی کردە نێو پیاڵەی سوور.

٢- چنوور: گیایەکی بۆنخۆشە کە بەهاران لە کوێستاندا دەڕوێت. خەیمـەکۆ: بـە وێنـەی دەوار، بـە وێنەی چادر. واتە: چنوور دەماخ بەرز و کۆکە و گوڵە سوێسنیش گەڵاکانی بە وێنەی چەتر هـاتووە بە سەردا و گوڵاڵە ساقی و شەویش شفای شەوبۆیە.

٣- بەڕەزا: گیایەکی جوانە بە کاوانەوە دەڕوێ و بە وێنەی زوڵف شۆڕ دەبێتەوە. پەخشـەن: پەخشـە، بڵاوە. تاوێر: تاش، تاشە بەرد. تاریان: تار بووە، شێواوە، هـەر گەڵایـەکی بـۆ شـوێنێک ڕۆیشـتووە. چوون: وێنەی، وەکوو. زڵف: زوڵف. خاوێر: ئەوەی تازە لە خەو هەستا بێت، خەواڵوو. واتە: بەڕەزا بە وێنەی زوڵفی ئەو کەسانەی تازە لە خەو هەڵدەستن و شێواون بە سەر تاشەوە بڵاو بووەتەوە.

عەجـــەب فەســـڵێوەن فەســـڵ وەهـــاران
پـــەی ڕەونـــەق ســـەیر تەماشـــای یـــاران[1]

بـــەڵێ، پـــەی کەســـێ نـــە دڵ نـــەبۆش خـــار
ویـــارۆ بـــە زەوق سەرمەســـتی وەهـــار[2]

نـــەک چـــوون مـــن خـــەریک زام بـــێ دەرمـــان
تـــەن تاویـــای تـــاو ئـــایر حێرمـــان[3]

نـــێش جـــەفا و جـــەور نـــەدین یـــاران
ڕێزنـــا جـــە دیـــدەم ســـەیل وەهـــاران[4]

***

---

١- پەی: بۆ. ڕەونەق: برەو، بازاڕ گەرمی. سەیر: گەڕان. واتـە: وەرزی بـەهار وەرزێکـە کـە هـەموو کەس سەری سڕ دەمێنێ لە گەرمی گەڕان و سەیرکردنی یـاران. ئـەم بەیتـە تـەنیا لـە نوسـخەکانی «ئێ» و «ج»دا هاتووە بەڵام بۆ تەواو کردنی مانای شێعرەکە دەبێ ببـێ و بـە دروسـتی هـاتووە. لـە نوسخەی «ج»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «پەی تەماشای خاڵ سیای نازداران».

٢- بەڵێ: بەڵام، هەر دەتوانێت بە مانای «بەڵێ»یش بێـت بـۆ سـەلماندن و پێداگـری. پـەی: بـۆ. نەبۆش: نەبێت، نەیبێت. خار: دڕوو، دڕک. ویارۆ: ڕابوێرێ، بەسەر ببات. واتە: بـەڵام وەرزی بـەهار بۆ کەسێک خۆشە کە هیچ ئێش و ئازاری لە دڵدا نەبێت و بە زەوقەوە سەرمەستی بەهار ڕابوێرێ.

٣- چوون: وێنەی، وەکوو. تەن: لاشە، بەدەن. تاویای: تواوەی. ئایر: ئاگر. حێرمان: بـێ بـەش بـوون، لێرەدا بە مانای بێ بەش بوون لە دیداری یارە. واتە: نە بە وێنەی من کە سەر قاڵی زامی بێ دەرمانم و لاشەم بە ئاگری بێ بەش بوون لە دیداری یار تواوەتەوە.

٤- نێش: چزە، نووکی تیژ. نەدین: نەدیتن، نەبینین. ڕێزنا: ڕژاند. جە: لە. سەیل: لافاو. واتە: ☜

-٤[١]-

زلێخـــام! ئەســـەر، زلێخـــام! ئەســـەر

جەوســاوە دووریــت لــێم کــەردەن ئەســەر [٢]

چــوون ڕوو موردەگــان ســفتەڕوون جگــەر

دەســێم وە خاکــەن، یــەک وە بــان ســەر [٣]

وە پــەی دیــن تــۆ، جــە نائومیــدی

---

☜ جەفای نەدیتنی یاران بە وێنەی شتی نووک تیژ چووە بە دڵمدا و ئەسرین بـە وێنـەی لافـاوی بەهاری لە چاوانم دەڕژێتە خوار.

-٤-

١- ک، نێ، ح.

٢- زلێخا: بێسارانی لە چەند پارچە شێعردا ئەم ناوە دێنێ، جا بە ڕێک و پێکی دیـاری ناکرێت کـە ئایا ناوی خۆشەویستەکەی بێسارانی بووە یا ناوێک بووە بۆ ئاماژە بە خۆشەویستەکەی وەک «چراخ» و «شیرین» و .... ئەڵبەتە چەند شاعێری دیکەیش ئەم ناوەیان لە شێعرەکانیاندا هێناوە. جەوساوە: لەو کاتەوە. لێم کەردەن ئەسەر: کاریگەر بووە لە سەرم. مانـای ئـەم بەیتـە لەگـەڵ بـەیتی دوایـیدا دێت.

٣- چوون: وێنەی، وەکوو. موردەگان: ئەوانەی مردوون. سفتە: سـووتاو. دەسێم: دەستێکم. واتـە: ئەی زلێخا! لەو کاتەوە لێم دوور کەوتوویتەوە و دووریت لە سەرم کاریگـەر بـووە جـەرگم بـە وێنـەی ڕوومەتی مردووان سووتاوە و ڕەش بووەتەوە و دەستێکم لە خاکدایە و دەستەکەی دیکەم وا بـە سـەر سەرمەوە (بە هەر دوو دەست خاک بە سەر خۆمدا دەکەم.)

وێـــڵ وێـــڵ مـــه‌گێڵوو، به‌یـــدی وه‌ به‌یـــدی[1]

خـــوداْ، یـــا بـــه‌ وه‌ســـڵ تـــۆ شـــادْم کـــه‌رۆ

یـــا بـــه‌ خـــه‌یر بـــه‌ مـــه‌رگ ئـــازادْم کـــه‌رۆ[2]

✲✲✲

-٥-[3]

زلێخـــــام تـــــه‌یار، زلێخـــــام تـــــه‌یار

عـــه‌زم جـــه‌ولان کـــه‌رد، خـــاڵان کـــه‌رد تـــه‌یار[4]

ســـا کـــه‌ ڕووی جـام کـــه‌رد نـــه‌ دیـــدْه‌ی خومـــار

داش بـــه‌ ســـه‌نگدا مینـــای جـام بـــه‌ قـــار[5]

---

١- وه‌ په‌ی دین تۆ: بۆ دیتنی تۆ. مه‌گێڵوو: ده‌گه‌ڕێم. به‌یدی: بیابان، ده‌شتی وشک و بێ ئاو. واته: بۆ دیتنی تۆ به‌ نائومێدیه‌وه‌ وێڵ وێڵ به‌ بیاباندا ده‌گه‌ڕێم.

٢- که‌رۆ: بکات. واته: به‌ڵکوو خودا یا به‌ وه‌سڵی تۆم بگه‌یێنێ و شادم بکات یا مه‌رگم بۆ بنێـرێ و له‌م ده‌رد و مه‌ینه‌ته‌ ڕزگارم بکات.

-٥-

٣- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٤- ته‌یار: ئاماده‌، حازر، ڕێک خراو. عه‌زم: نیه‌ت، قه‌ست کردن. جه‌ولان: گه‌ڕان. واته: زلێخام خۆی ئاماده‌ کرد و خاڵی ڕازانده‌وه‌ بچێ بۆ گه‌ڕان.

٥- جام: ئاوێنه‌. مینا: شووشه‌، شیشه‌. قار: تووڕه‌یی. واته: کاتێک ڕووی ئاوێنه‌که‌ی له‌ خۆی کرد و چاوه‌ خوماره‌کانی له‌ ئاوێنه‌دا بینی به‌ تووڕه‌ییه‌وه‌ ئاوێنـه‌ی بـه‌ بـه‌ردا مـاڵی و شـکانی. لـه‌ به‌یتـه‌ دواییه‌کاندا ئه‌ڵێت له‌ به‌رچی وای کردووه‌.

وات چ بەڵاتەن لێڵاو بامەنی؟
جەی لێڵاوتەر بای، چ خاس جامەنی؟ [١]

جام لاڵا بە زار بە زگارەوە
بە مینای شکەست پارە پارەوە [٢]

واتش چێشتەن، چوون بەی تەورەنی؟
پێسە نائێنساف، چمان گەورەنی؟ [٣]

جامان نە جەمین تۆ لێڵاوبامەن
نائێنساف تۆنی، چێش گونای جامەن؟ [٤]

✡✡✡

---

١- وات: وتی. بام: بان، سەربان، لێرەدا بە مانای ڕووە. جەی: لە ئەمە، لەمە. بای: بی. واتە: بە ئاوێنەکەی وت مەگەر چێت لێ قەوماوە و چ بەڵایەکت بە سەرهاتووە کە ڕووت لێڵ بووە و لێڵ دەنوێنی؟ بەڵکوو لەمە زیاتر لێڵاویت دابێت، تۆ چ خاسە ئاوێنەیەکی؟

٢- لاڵا: لاڵاوە، لاڵیاوە. زگار: کزی، کزۆڵی. مینا: شووشە، شیشە. واتە: ئاوێنە بە کزی و بە شووشەی لەت لەتەوە لاڵاوە.

٣- واتش چێشتەن: وتی چیتە. چوون بەی تەورەنی: چۆن بەم جۆرەی. پێسە: وەها. چمان: پێت وایە، لات وایە. گەور: گاور، لێرەدا یانی ناموسوڵمان. واتە: ئاوێنەکە وتی ئەمە چ حاڵێکە و لە بەرچی وات بە سەرهاتووە و هێندە بێ ئینسافی ئەڵێی ناموسوڵمانی.

٤- جامان: کۆی «جام»ـە بە مانای ئاوێنەکان. جەمین: تەوێڵ، نێوچاوان، ڕوخسار. بام: بان، سەربان، ڕوو. چێش: چی. گونا: تاوان. واتە: ئاوێنەکان لە بەرانبەری ڕوخساری تۆدا لێڵن (ڕوخسارت هێندە سافە ئاوێنە لە بەرانبەریدا لێڵ دەنوێنێ) ئیتر تۆ خۆت بێ ئینسافی تاوانی ☜

-٦-[1]

# زلێخــــام چەنبـــــەر، زلێخــــام چەنبـــــەر
# زلفــش پـــەی شـــینم خـــاس بەســـتەن چەنبـــەر[2]

☜ ئاوێنەی چییە؟ لە سەرچاوەی «ح»دا پارچە شێعرێک بە ناوی بێسارانییەوە هاتووە، دیارە بە شێوازی شێعری بێسارانی دەخوا بەڵام لە هیچ کام لە نوسخەخەتیەکاندا نییە و بە بڕوای من لە ڕەدیفی ئەم شێعرەی بێسارانیدا نووسراوە. شاعێرەکەیشی هەرکەس بووە شێعرەکەی زۆر بە هێز و بە قووەت نییە. ئەمەیش پارچە شێعرەکە کە لێرەدا بۆ هەڵسەنگاندن دەیهێنین:

ئاهووی وەحش تـار، ئـاهووی وەحـش تـار     جەیران سوب خێـز ئـاهووی وەحـش تـار
شـــۆخ لارە و لـــەنج دیـــدە پـــەڕخومار     ســـپەردیم وە دیـــن ڕەســـوول نـــازدار
ڕوێ هـــۆرێزا عـــەزم ســـەحرا کـــەرد     پەی جەلای جەمین دەست پەرێ جام بـەرد
بـــە پێشـــی ئـــاورد دیـــا نـــە پێشـــدا     دەســـت ئـــاورد وە بـــان زلفـــان وێشـــدا
دەســـت ئـــاورد وە بـــان زلـــف خامـــەدا     لـــێلاویش ئـــاورد وە ڕووی جامـــەدا
ئـــەو دیـــا وە جـــام ڕەنـــگ زەرد و زگـــار     جـــام دا وە ســـەنگدا، گـــرەوا بـــە زار
واتـــش ئـــەرێ جـــام تـــۆ چ جامـــەنی؟     وێـران بـۆ ئـەو شـار تـۆ لـێش ئامـەنی
جـــــام ئامـــــا زوان فـــــراوان لالا     واتـــش تەقســـیرم بـــێ عـەیبـەن وەڵـــلا
تەقســیرم چێشــەن مــەدەریم وە ســەنگ     شۆڵەی جەمینت من گـێلان جـە ڕەنـگ
تـــەمام ســـەرافان جـــە ڕووی ســـەرزەمین     بـــەیان بوینـــان ئاینـــەی جـــەمین
ئـــەر تـــۆ ئاینـــەت نـــەگێلان جـــە ڕەنـــگ     من بێجـام واتـەن سـەرەم دان وە سـەنگ

-٦-

١- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٢- چەنبەر: حەڵقە، لێرەدا بە مانای حەڵقە و کۆڕی شیوەن و گریان بۆ مردووە. پـەی: بـۆ. شـین: گریان، شیوەن. بەستەن: بەستووە. واتە: زوڵفی زلێخا بۆ شیوەنم حەڵقەیان (کۆڕیـان) بەسـتووە. لـە نوسخەی «ئێ»دا بە جێی «زلفش»، «زلفت» نووسراوە.

پۆشان بەرگ ساف سیای موشک نەوەر
کەردەن بە سەردا پەیم گەرد عەنبەر[١]

مووژانش دڵ دان بە ماتەمەوە
تەن بەندەن بە چنگ خار خەمەوە[٢]

یانێ دوو دیدەش خومماری داران
وەرنە پەیم داران جەستەی بیماران[٣]

١- پۆشان: پۆشیوە، لەبەری کردووە. سیا: ڕەش. موشک: ماکێکی ڕەشی بۆنخۆش. کەردەن: کردووە. پەیم: بۆ من، بۆم. گەرد: تۆز. عەنبەر: ماکێکی (مادەیەکی) ڕەشی بۆنخۆشە. واتە: جل و بەرگی سافی ڕەشی بۆنخۆشی وەک موشکی لەبەر کردووە و تۆزی عەنبەری بۆ من کردووە بە سەردا. لە سەرچاوەکانی «ب»، «س»، «ح» و «ڕ»دا بە جێی «نە وەر»، «پەروەر» و بە جێی «پەیم گەرد عەنبەر»، «پیاڵەی عەنبەر» و لە نوسخەی «ک»دا «پەیم کەردەن عەنبەر» نووسراوە.

٢- موژە: مژۆڵ، برژانگ. دڵ دان: دڵیان دا. تەن: لاشە. بەندەن: بەندە، ئەسیرە. خار: دڕوو، دڕک. واتە: مژۆڵی، دڵی منیان ماتەمین و خەفەتبار کردووە و لاشەم بە چنگی دڕووی خەم و خەفەتەوە ئەسیر بووە. لە سەرچاوەکانی «ئێ»، «ب»، «س»، «ح» و «ڕ»دا بە جێی «موژانش»، «زڵفانش» نووسراوە و لە سەرچاوەکانی «ب»، «س»، «ح» و «ڕ»دا بە جێی «دڵ دان»، «لوول دان» نووسراوە.

٣- داران (یەکەم): هەیانە. وەرنە: ئەگینا، ئەینا. پەیم: بۆ من، بۆم. داران (دووهەم): هێژایە، بە نرخە، ئەرزشی هەیە. واتە: یانی چاوانی خوماریان هەیە و مەستن ئەگینا خۆ بە جەستە نەخۆش بم و جەستەم نەخۆش بکەوێ ئەوە لای من بە نرخە و بە دەوڵەمەندی دەزانم کە جەستەم بە برژانگی ئەو بپێکرێت و بیمار بێت. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «س» و «ڕ»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «وەرنە پەیم دەران دەوای بیماران».

کەسێ زلفْ ئەو پەیش چەمەرگیرەن
ماوای بەهەشتش جە کۆ جە ویرەن؟ [١]

✫✫✫

-٧- [٢]

زلێخام خاودا، زلێخام خاودا
بە چ نازکی کاراستەی خاودا [٣]

دەستە دەستە زلف ژەند بە گولاودا
ئاورد بە ڕوخسار بووم ئافتاودا [٤]

---

١- پەیش: بۆ ئەو، بۆی. چەمەر: شین و شەپۆڕ. ماوا: شوێن، جێگە و مەکان. جە کۆ: لە کوێ. جە ویرەن: لە بیرە. واتە: کەسێک کە زوڵفی ئەو (یار) شیوەنی بۆ بگێڕن و شیوەنی بۆ بکەن ئیتر بەهەشتی لە کوێ لەبیرە؟

-٧-

٢- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٣- خاو: خەو. نازکی: وردی، جوانی، ڕێک و پێکی. کاراستە: کە ئاراستە، ڕازاندنەوەی جێگە خەو. واتە: زلێخا چەند بە ڕێک و پێکی جێگەی خەوی ڕازاندنەوە. لە بەیتە دواییەکاندا دەردەکەوێت مەبەستی چییە. لە سەرچاوەکانی «ح»، «س»، «ڕ» و «ب»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «بە پەنجەی نازک ئاراستەی خاودا».

٤- ئاورد: هێنا. بووم: ڕوومەت. ئافتاو: هەتاو، خۆر. واتە: دەستە دەستە زوڵفەکانی بە گوڵاودا ژەند و هێنای و دای بە مل ڕوومەتی وەک هەتاویدا.

بـــه چ خـــاس خێـــزا خـــەرامان مەســـت
نیـــا نازبـــاڵش چارگۆشـــەی ڕەنـــگبەســـت[1]

بـــــاڵا کــــــەردەوە شــــــی بــــــە نــــــاوڎا
کێشـــــا بــــــاڵاپۆش بــــــە ئافتــــــاوڎا[2]

خــــاوێ خــــەیرش بـــۆ ئـــی گــــوڵئەندامــــە
هــــیچ کــــەس نەڎیــــەنش بەنـــدە پـــی تامـــە[3]

---

١- خێزا: هەستا. خەرامان: کەسێک کە بە لار و لەنجە بـە ڕێـدا بـڕوا. نازبـاڵش: سـەرینی نـەرم. چارگۆشە: چوارگۆشە، وا دیارە ئەبێ شتێک بێ وەک مەوج ڕایدەخەن و لـە سـەری دەنـوون. ڕەنـگ بەست: ڕەنگ کراو. واتە: چ خۆش هەستا و بە لار و لەنجەی مەستانەوە سەرینی نـەرمی لـە سـەر چوارگۆشەیەکی ڕەنگین دانـا و لـە سـەری ڕاکشـا. لـە نوسـخەی «ئـێ»دا ئـەم بەیتـە نییـە. لـە سەرچاوەکانی «ب»، «ح»، «س» و «ڕ»دا ئەم بەیتە بەم جۆرە نووسراوە:

پەنجەی خـاس خێـزان خـەرامان مەسـت     پا نیا بـە نـاز چارگۆشـەی ڕەنـگ بەسـت

٢- شی: ڕۆیشت. بە ناوڎا: نێو، تۆی. باڵا پۆش: شتێک کە باڵا داپۆشێت. ئافتـاو: هـەتاو، خـۆر. واتە: ڕاکشا و چووە نێو جێگەکەی و باڵاپۆشەکەی بە سەر ڕووی وەک هەتاوی دا. لـە سـەرچاوەکانی «ب»، «ح»، «س»، «ڕ» و «ئێ»دا نیوە بەیتی یەکەمی بەم جۆرە نووسراوە: «باڵا گیر داوە شی بە ناوڎا».

٣- خاو: خەو. خەیرش بۆ: خێری بێ. ئی: ئەم. گوڵ ئەندام: کەسێک کە ئەندامی بە وێنـەی گـوڵ بێت. نەڎیەنش: نەیدیوە، نەیبینیوە. پی تامە: بـەم تامـە، بـەم تامـەوە. واتـە: بـەڵکوو ئـەم گـوڵ ئەندامە خەوی خێری بێ. تا ئێستە هیچ کەس بەشەرێکی نەبینیوە کە ئـەم تامـەی هـەبێت (بـەم جۆرە بێت).

عـــــەجایێبێم دی بــــــەی فریشـــــتەوە
ئافتــــــاوێ بـــــێ، زیـــــا و نیشـــــتەوە[١]

⁂

-٨[٢]-

زلێخـــــــــام! دارۆ، زلێخـــــــــام! دارۆ
شەســـــت تـــۆ مایـــــەی زێنـــــدەگی دارۆ[٣]

بــــا بـــــەیۆ فێشــــتەر جــــە هێـــزی ئـــارۆ
نــــــەبا دڵ جــــــە داخ گیــــــان بســــــپارۆ[٤]

---

١- عەجایێب: شتێک کە کەسێک سەری لێ سڕ دەمێنێ. بەی: بەم. ئافتـاو: هـەتاو، خـۆر. زیـا: هەڵهات. واتە: شتێکم بەم فریشتەوە بینی کە سەرم لێی سڕ مـاوە، بـە وێنـەی هـەتاو هـەڵهات و دیسان کەوتەوە بەو دیودا .(بە وێنەی هەتاو هەڵهات و دیسان ئاوا بوو «وەرگێڕ»). لە سـەرچاوەکانی «ک» و «ئێ»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «بافتابێ ماە نۆ زیا و نیشتەوە».

-٣-

٢- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٣- دارۆ: هەیەتی. شەست: جۆرە کلکەوانەیەکە لە شاخ یا ئێسقانی ئاژەڵ دروستیان دەکرد و لە کاتی ڕاودا دەیانکردە قامکیان بۆ ئەوەی «ژێ»ی کەوانەکە قامکیان برینداد نەکات، لێرەدا واتە ئەو تیرەی بە دەستی تۆ دەهاوێژرێت. زێندەگی: ژیان. واتە: ئـەی زلێخاکـەم! ئـەو تیـرەی کـە بـە دەسـتی تـۆ دەهاوێژرێت بۆ من مایەی ژیانی پێوەیە.

٤- با بەیۆ: با بێت. فێشتەر: زیاتر، زۆرتر. هێزی: دوێنێ، دوێکە. ئـارۆ: ئـەمڕۆ، ئیمـڕۆ. بسـپارۆ: بسپێرێت. واتە: باکوو ئەمڕۆ لە دوێنێ زیاتر تیر لە لایەن تۆوە بێـت نـەوەکوو دڵ لـە داخـدا گیـان بسپێرێت.

پــەی چــی؟ بــە پــەیکان تــۆوەن ژیــانم
وەرنـــە نەمەنـــدەن نـــە تـــەن گیـــانم[١]

بــا بــەیۆ بــەیۆ خــەدەنگان خــاس خــاس
پەیاپــەی پــۆل پــۆل ژاراودای ئــەڵماس[٢]

هــەم بشــۆ بشــۆ نــە ڕیشــەی جــەرگم
تــا بەرشــۆ بەرشــۆ خــۆف ڕۆی مــەرگم[٣]

نیشــتەبێم نــە دڵ جــەی وەر پــەیکانێ
جەوپــەی پــێم مەنــدەن نیمــە گیــانێ[٤]

---

١- پەی چی: بۆچی. پەیکان: نووکی تیژی تیر. وەرنـە: ئـەگینا، ئـەینا. نەمەنـدەن: نـەماوە. تـەن: لاشە. واتە: لە بەرچی؟ لە بەر ئەوەی کە ژیانی من بەستراوە بە تیـری تـۆوە ئـەگینا مـن گیـان لـە لاشەمدا نەماوە.

٢- بەیۆ بەیۆ: بێ بێ. خەدەنگ: تیر. پەیاپەی: بە دوای یەکدا. ژاراودای: ئاوێتە بە ژەهر. واتە: بـا تیرەکانت کە وەک ئەڵماسی ژەهراوین پۆل پۆل و بە دوای یەکدا بێن.

٣- بشۆ: بڕوا. بەرشۆ: دەربچێت. واتە: با بڕوات بدات لـە ڕیشـەی جـەرگم تـا ترسـی ڕۆژی مـردنم نەمێنێ.

٤- نیشتەبێم نە دڵ: لە دڵم نیشتبوو. جەی وەر: پێشتر. جەو پـەی: لەبـەر ئـەوە. مەنـدەن: مـاوە. واتە: پێشتر تیرێک لە دڵم چەقیبوو و لەبەر ئەوەیە هەتا ئێستا نیوە گیانێکم ماوە.

فیــدات بــام جــه شەســت مــدارات نــەبۆ
زێنــدەگی بەخشــەن نــیم جــۆی تیــر تــۆ[١]

☆☆☆

-٩-[٢]

زلێخـــام! زوننـــار، زلێخـــام! زوننـــار
پــەرێ دیــن تــۆ یــا بەســتم زوننــار[٣]

بــێ خــۆف جــه تانــەی ڕەقیــب بــەدکار
هــا شــیم نــە مەزهــەب کلیســای کوففــار[٤]

---

١- فیدات بام: بە قوربانت بم. مدارات نەبۆ: ئارامت نەبێ. زێندەگی: ژیان. نیم جۆ: کەمێک، بە ئەندازەی نیوە جۆیەک. واتە: بە قوربانت بم با لە تیر هاویشتندا ئارامت نەبێ، چون کەمێک لە تیری دەستی تۆ ژیان بە من ئەبەخشێت و گیانم بە بەردا دێنێتەوە. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «س» و «ڕ»دا بە جێی «نیم جۆی»، «مەودای» نووسراوە.

-٩-

٢- ک، ئێ، ح

٣- زوننار: قوماشێکە کە ئەوسا مەسیحیەکان دەیانبەستە کەمەریان تا لە موسوڵمانان جیا بکرێنەوە. یا: ئەوە ها. پەرێ: بۆ. دین: هەم دەتوانێ بە مانای دین و ئایین بێ و هەم دەتوانێ بە مانای دیتن بێ. واتە: ئەی زلێخاکەم! ئەوە بە هۆی دینی تۆوە (دیتنی تۆوە) زوننارم بەست (بووم بە مەسیحی).

٤- بێ خۆف: بێ ترس. ڕەقیب: لە بنەڕەتدا بە مانای پاسەوان و چاوەدێرە بەڵام لێرەدا بە مانای دوژمن یا کەسێکە کە بیەوێ نێوان دوو دڵدار تێک بدا یا یاری کەسێک داگیر بکا. شیم: ڕۆیشتم. کلیسای کوففار: لێرەدا مەبەست لە کوففار مەسیحییە بەڵام لە دینی ئیسلامدا مەسیحی بە ☞

چـــوون شـــێخ ســـەنعان بەرشـــیام جـــە دیـــن
پۆشـــام خێرقـــەی خـــزر تەرســـای ئـــایرین[١]

بەرشـــیام جـــە دیـــن خـــوداٚ و پێغەمبـــەر
نـــە ڕای دیـــن تـــۆ هـــا بەســـتم کەمـــەر[٢]

---

کافر دانانرێت، بەڵام لێرەدا وەها هاتووە. واتە: ئەوە بێ ترس لەوەی ڕەقیبی بەدکار تانە و تەشەرم لێ بدات چوومە سەر مەزهەبی مەسیحیان.

١- چوون: وێنەی، وەکوو. شێخ سەنعان: ناوی کەسێکە کە لە عەشقی کچێکی مەسیحی لـە دیـن وەرگەڕا و چووە سەر دینی مەسیحی. بەرشیام: دەرچووم. پۆشام: لەبەرم کرد. خێرقەی خـزر: جـل و بەرگێکی شڕە کە سۆفیان لە بەری دەکەن و لە سەر ئەو باوەڕەن یەکەم جار لە حەزرەتی خزرەوە هاتووە و بەمان گەیشتووە. خزر: خضر، خدری زیندە، نـاوی پێغەمبەرێکـە (پیاوچاکێـک) کـە بـە بـڕوای موسوڵمانان پێش لە حەزرەتی مووساوە تا ئێستا هەر بووە و ئێستەیش زیندووە و لە نێـو خەڵکـدا دەژی، لەبەر ئەوە پێی ئەڵێن خزر (خضر). بە عـەرەبی «خضر» واتە سەوز و ئەم باوەڕە هەیە کە ئەو پیاوە لە هەر زەمینێکی وشک و بێ ئاو و بیاباندا بژی ئەبێتە سەوزەڵانی. تەرسا: مەسیحی، گـاور. ئایرین: ئاماژەیە بە عەشقێکی ئاگرین کە ئەو کچە گاورە بۆ شێخی سەنعانی هـەبووە و ئـاگری لـە دین و ئیمانی بەرداوە. واتە: ئەوە منیش بە وێنەی شێخی سەنعان لە دینم وەرگەڕام و بۆ کچە گاور (مەسیحی) جل و بەرگی حەزرەتی خزرم لەبەرکرد.

(مامۆستا هێمن دەفەرموێ:

شێخی سەنعان بۆ کچی گاور لە ئیسلام وەرگـەڕا     من خەریکم بۆ کچە شـێخێ پـەژیوان ببمـەوە

«وەرگێڕ»)

لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «خزر»، «کوفر» و بە جێی «ئایرین»، «ئایین» نووسراوە.

٢- بەرشیام: دەرچووم. نە ڕای: لە ڕێی، لە ڕێگەی. بەستم کەمەر: چاکم بە کەمەردا کرد، قـۆڵم لـێ هەڵماڵی، مەبەست ئامادە بوون بۆ کارێکە. واتە: لە دینی خودا و پێغەمبەر دەرچووم و لە ڕێگەی دینی تۆدا ئامادە بووم و چاکم بە کەمەردا کرد.

پەی چێش؟ پەی دەستەی زڵف چین چینت
تاریکی کوففار دەور جەمینت[1]

تا کە بواچان نە ڕووی سەرزەمین
کەسێو پەی کەسێ بەرشیەن جە دین[2]

***

١- پەی چێش: بۆچی. پەی: بۆ. زڵف: زوڵف، قژ. جەمین: ڕوخسار، نێوچاوان. تاریکی کوففار دەور جەمینت: زوڵفت، قژت. واتە: بۆچی لە دینی خۆم وەرگەڕام؟ بۆ زوڵفە چین چینەکانت کە وەکوو تاریکی کوفر دەوری ڕۆشنایی ڕووتی گرتووە.

٢- بواچان: بڵێین، بێژن. کەسێو: کەسێک. پەی: بۆ. بەرشیەن: دەرچووە. واتە: تا بڵێین لە سەر ئەم سەرزەمینەدا کەسێک بۆ کەسێکی دیکە لە دینی خۆی وەرگەڕاوە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە دوای ئەم بەیتەدا چوار بەیتی دیکە هاتووە کە دیارە هیچ پەیوەندیان بەم شێعرەوە نییە و لە نوسخە نووسینەوەدا بە شێعرەکەوە لکاوە و لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا نەنووسراوە. ئەمەیش چوار بەیتەکە بۆ هەڵسەنگاندن:

هیچ نەداروون باک تۆم قەبووڵ کەردەن    هەر تۆم خەیاڵەن تا وە ڕۆی مەردەن
وەگەرنە تۆ هیچ حاڵم نەزانی    بە وێنەی مەجنوون داخ پێم مەنمانی
ئەوسا جەودما وەسیەتم خاکەن    تا مەرگ سامان دیدەم نمناکەن
تا ئەو ڕۆ خاکم بشۆ نە دیدە    ئەراگێڵی تۆم لەب بەرگوزیدە

-١٠-[١]

زڵێخـــام ســـاوان، زڵێخـــام ســـاوان
دوو دیـــدەش وێنـــەی وەڵـــەدەی ســـاوان[٢]

کـــام وەڵـــەد؟ ئانـــە خوتـــەن پـــێش ئـــاوان
هـــەر ســـاڵ نـــاف مـــەوزۆ ســـوب جـــە ســـەراوان[٣]

جـــــەیران دوور دەو، دەلیلـــــەی باڵـــــدار
لەنجـــە و ســـمکۆ کـــەر، خـــاوێر خاڵـــدار[٤]

-١٠-

١- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٢- ساوا: تازە پێگەیشتوو، زیاتر بۆ کاژەڵە و گوێلک و کاوڕ بە کاری دەبەن. وەڵەدە: بێچـووی ئـاژەڵ. واتە: چاوانی زلێخاکەم بە وێنەی چاوی کاژەڵەی تازە پێگەیشـتوو وایـە یـا لـە چـاوی کاژەڵـەی تـازە پێگەیشتوو دەچێت.

٣- خوتەن: ناوچەیەکە لە تورکستان کە ئاسکی ئەو ناوچە کیسەیەک لە پەنای نێوکیاندا هەیـە کـە ماکێکی (مادە) بۆنخۆشی تێدایە و هەموو ساڵێک لە بەهاردا لای نێوکی بـە بـەرددا دەهێنـی بـۆ ئەوەی ئەو کیسە داکەوێت و لەو ماکە موشک دروست ئەکەن. ناف: نێوک، ناوک، لێرەدا مەبەست کیسەی موشکە. مەوزۆ: دەخات. واتە: کام بێچوو (کام کاژەڵە؟) ئەوە کە وڵاتی خوتەنی پێ ناوەدان بووەتەوە و هەموو ساڵێک بەیانیان لە سەر سەراوان کیسەی موشکی دەخات.

٤- جەیران: ئاسک. دوور دەو: لە دوورە هەڵهاتوو. دەلیلە: ئەو ئاژەڵە کە شارەزای ڕێگایە و دەکەوێتە پێش گەلەڕانەوە. سمکۆ: سمکۆڵ کردن، سم بە زەویدا کوتان. خاوێر: خەواڵوو، تازە لە خەو هەستاو. واتە: ئاسکێک کە لە دوورەوە هەڵـدێت و وەکـوو باڵـدار دەکەوێتـە پـێش گەلەڕانـەوە و بـە وێنـەی خەواڵوویەک خاڵی پێوە بێت لەنجە و سمکۆڵ دەکات. (لەوانەیە مەبەست لە خەواڵوو چاو

خـــەرامان مەســـت حوققـــەی نـــاف بـــە دۆش
قنیـــات بـــە ســـونبوڵ، چـــووزەی نـــەرگس نـــۆش[١]

وەڵـــگ گـــوڵ جـــە بـــێخ بـــە هونـــەر کەنـــدە
ســـاڎار سەرســـام، ســـای وێـــش ســـڵ ســـەندە[٢]

زامـــن نـــە جەبـــەڵ ســـەیاڎ ســـەندە خـــەو
گۆمەتـــە و گـــورێز، پـــاکێش تیـــز دەو[٣]

---

☞ خومار بێت. «وەرگێڕ»).

١- خەرامان: لەنجە و لارە کەر. حوققە: دەفرێکی بچووک کە زێڕ و جەواهێراتی تێدا هەڵدەگرن. دۆش: سەرشان. قنیات: خواردنێک کە پێی بژیت. سونبوڵ: سمڵ، ناوی گوڵێکی جوان و بۆنخۆشە. نەرگس: گوڵە نەرگس. واتە: مەستە و لار و لەنجە دەکا و دەفری موشکی بە سەر شانەوەیە و بە خواردنی سمڵ دەژێت و چووزەی گوڵەنەرگس دەخواتەوە.

٢- وەڵگ: گەڵا. ساڎار: کەسێک کە جنۆکە دەستی لێ وەشاندبێت و شێت بووبێت. سەرسام: جۆرە نەخۆشینێکە هەرکەس تووشی بێت سەری دەماسێ و قسەی هەڵیت و پڵیت دەکات و لە دوو وشەی «سەر» + «سام» بە مانای سەر ماسین پێک هاتووە. سای: سێبەر. سڵ: ترسان و وەستان و گەڕانەوە، زیاتر بۆ ئاژەڵ بە کاری دەبەن کاتێک لە شتێک بترسێت و ئیتر نەچێتە نێو گەلەڕان و بگەڕێتەوە. واتە: بە هونەرمەندی گەڵای گوڵی پەڕاند و وەک کەسێک کە شێت بێ و سەرسامی گرتبێت سڵ لە سێبەری خۆی دەکات. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «س» و «ڕ»دا بە جێی «هونەر»، «هەرە» و بە جێی «سای وێش سڵ سەندە»، «سایەی وێش مەندە» نووسراوە.

٣- زامن: زێد، نیشتمان، شوێنی ژیان. جەبەڵ: کێو. سەیاڎ: ڕاوچی. گۆمەتە: بازدانی ئاژەڵ. گورێز: هەڵهاتن. پاکێش: ئاژەڵی سمدار. تیزدەو: بە گورجی هەڵهاتن. واتە: زێدی وا بە کێوەوە و خەوی لە ڕاوچی حەرام کردووە و ئاسکێکە باز نەدات و بە توندی هەڵدێت. لە سەرچاوەی ☜

دەیــــری دیـــــدەوان ڕەوێڵـــــەی خوتـــــەن
بێــــزار جـــە زامـــــن، دوورکەوتـــەی وەتـــەن[١]

ســـــەرســـــام بـــێ‌هـــۆش، خـــاوێر مـــــەلوول
شـــەوخاوگە و مـــەکۆش پـــای بارگـــەی بـــالوول[٢]

قـــودرەت بـــە کـــەرەم تـــای بـــێ‌هـــەمتاییت
بـــە دایـــرەی چـــەرخ هـــەفتوم ســـەماییت[٣]

☞ «ح»دا بە جێی «سەیاڎ سەندە»، «سەیاد توندخوو» و بە جێی «گۆمەتە»، «کەمتەر» و بە جێی «تیزدەو»، «تیز دوو» و لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا «نەوا دەو» نووسراوە.

١- دەیری: دەهری، گوێ پێ نەداو، لە دین دەرچوو، شێت، کەسێک کە لە کەش و کێودا دەژی. دیدەوان: چاوەدێر. ڕەوێڵە: سەرکێش، دەستەمۆ نەکراو، سرک، بە مانای تاقم و دەستەیش دێت. زامن: زێد، نیشتمان. دوورکەوتەی وەتەن: لە وەتەن دوور کەوتوو. واتە: وا بە کەش و کێوەوە و چاوەدێری تاقمی ئاسکانی وڵاتی خوتەنە و لە زێدی خۆی بێزارە و لە وەتەن دوور کەوتووتەوە.

٢- خاوێر: خەواڵوو، تازە لە خەو هەستاو. مەلوول: کز، بێ نەشە، بێ کەیف. شەوخاوگە: شوێنی نووستنی شەو. مەکۆ: کۆگا، شوێنی کۆبوونەوە. بارگەی بالوول: کێوی دالاهۆ کە ئەڵێن گۆڕی بالوول (بهلول) لەوێدایە. واتە: سەرسامی گرتووە و بێ هۆش و خەواڵوو و مەلوولە و جێگەی نوستنی شەوانی وا لە پای کێوی دالاهۆدا.

٣- کەرەم: بەخشین. تای بێ هەمتا: کەسێک کە کەسی تر لە وێنەی نییە، خودا. سەما: ئاسمان. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا پێکەوەن.

# ئـەو وەڵـەدەی وەحـش، شـۆخ خـەیاڵ خـام
# پـەی سـاکنی دڵ گیـرش دەی نـە دام[١]

☆☆☆

١- وەلەدە: بێچووی ئاژەڵ. پەی: بۆ. ساکنی: ئارامی. گیرش دەی نە دام: بیخەیتە داوەوە. واتە: ئی خودا هاوار، بیکەی بە خاتری کەرەم و بێ وێنەیی و چەرخ ڕۆژگار و ئاسمانی حەوتەمینت ئەو شۆخە خەیاڵ خاوە کە لە کاژەڵەی وەحشی و دەستەمۆ نەکراو دەچێت بۆ ئارامی دڵم بخەیتە داومەوە. مەبەستی ئەوەیە بیکەی بە نەسیبی من.

لە نوسخەی «ک»دا بە دوای ئەم پارچە شێعرەدا شێعری «زڵێخام تەتار» هاتووە و لەسەری نووسراوە «میرزا ابراهیم در ردیف» بەڵام پارچە شێعری «زڵێخام تەتار» لە سەرچاوەکانی «ح»، «ڕ»، «ب» و «س»دا بە ناوی بێسارانییەوە چاپ کراوە. هەروەها کە لە پێشەکی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان پێ کردووە سەرچاوەی ئەم چوار نوسخە بۆ زۆربەی شێعرەکان یەک سەرچاوە بووە و لەوێ هەر هەڵەیەک هەبێت لەم چوار نوسخەیەشدا دووپات بووەتەوە، بەڵام ئەگەر بە وردی سەیری هەر دوو پارچە شێعرەکە بکەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ناوەڕۆک و مەزموونی شێعرەکان یەکێکن و ئەوە دروستە کە لە نوسخەی «ک»دا نووسراوە، واتە شێعری میرزا ئیبراهیمە و لە ڕەدیفی ئەم شێعرەی بێسارانیدا نووسراوە. لە نوسخەی «ئێ»یشدا شتێکی لە سەر نووسراوە و دواتری سڕاوەتەوە کە بە داخەوە ناخوێنرێتەوە. ئەمەیش شێعرەکە کە لێرەدا دەیهێنین:

زڵێخام تەتار، زڵێخام تەتار ... دوو دیدەش وێنەی وەڵەدەی تەتار
جەیران دوور دەو جیا جە قەتار ... دوورکەوتە سارا، ماوا خوتەن شار
مەرغوزار ماوا، دەلیلەی ڕەوێڵ ... وەڵگ گوڵ بە دەم نە پای هەردان گێڵ
زامن جە سەر تیپ بەند مێشیاو ... خۆف سەیاد پێش، شەو نەکەردە خاو
دەیری دیدەوان، دەوەندەی دوور پەڕ ... کلاف بە شەونەم خونچەی گوڵان تەڕ

☞

-١١-[١]

زێنهار سەد زێنهار، زێنهار سەد زێنهار
دڵە! پێم واتی زێنهار سەد زێنهار[٢]

بێوەفا هەرگیز مەگێرە بە یار
بە بێوەفایان مەبینە ئێقرار[٣]

کەسێ بگێرە تۆ بە یار وێت
ئەو جە تۆ فێشتەر بسۆچۆ پەرێت[٤]

---

☞

| | |
|---|---|
| لانەجین، لانخێز، ئارەزووی سەیران | مودبیرەی دانا، جاسووس جەیران |
| قنیات کەردەی گوڵ خونچەی سۆسەنان | شەو خاوگەش نە پای بارگەی چل تەنان |
| قودرەت بە کەرەم بێ هەمتایی وێت | بە حەرف ئەوەڵ «ئەلف لام و هـ»یێت |
| ئەو وەلەدەی وەحش نە پای هەردان گێڵ | حوققەی ناف پەڕموشک، حەمایێل نە پێڵ |
| پەی ساکنی دڵ گیرش دەی نە دام | تا چەندێو بنیۆ مەرهەم نە ڕووی زام |

-١١-

١- ک، س، ڕ، ب، ح.

٢- زێنهار: ئاگات لێ بێت، ئاگادار بە. پێم واتی: پێم وتی، پێتم وت. واتە: ئەی دڵ سەد جار پێم وتی ئاگات لێ بێت.

٣- مەگێرە: مەگرە. ئێقرار: وەفا و بەین. واتە: قەت بێ وەفا مەگرە بە یار و لەگەڵ بێ وەفایان بەین مەبەستە.

٤- وێت: خۆت. فێشتەر: زیاتر، زۆرتر. بسۆچۆ: بسووتێت. پەرێت: بۆ تۆ. واتە: کەسێک بگرە بە یار ئەو زیاتر لە تۆ بۆت بسووتێت.

زێنهــار کــه ســەودای کەسێت نــه ســەر بــۆ
ئــەو جۆیــای عەشــق بــۆ، جــه تــۆ بەتــەر بــۆ[1]

بــێبەینـــەت شــێوەی شــێویان دارۆ
کەســێ ســەر نــه ڕای بــێبــەین نەسپارۆ[2]

ڕەفێــق ناهــاڵ، دۆســت بــێبەینـــەت
مەگنەشــان نــه وەنــد، مەینەتــەن مەینــەت[3]

* * *

---

١- زێنهار: ئاگات لێ بێت، ئاگاداری بی. سەودا: فکر و خەیاڵ مامەڵە. نە سەر بۆ: لە سەردا بێت. جۆیا: دواکەوتوو. بەتەر: خراوتر. واتە: ئاگادار بە با فکر و خەیاڵی کەسێکت لە سەردا بێت ئەو لە تۆ خراوتر (زیاتر) دڵی پێوە بێت و بە دوای عەشقەوە بێت.

٢- بێبەینەت: بێ وەفا. شێویان: کەسانێک کە شێواو بن، شێتان. دارۆ: هەیەتی. سەر نەسپارای: دواکەوتن، شوێن کەوتن. بێبەین: بێ وەفا. نەسپارۆ: ناسپێرێت. واتە: هەرکەس بێ وەفابێت شێوەی شێتانی هەیە و هیچ کەسیش دوای بێ وەفا ناکەوێت.

٣- ناهاڵ: حاڵ نەزان. مەگنەشان: مەکەوە. وەند: نزیک. واتە: نزیکی هاوڕێی حاڵ نەزان و دۆستی بێ وەفا مەکەوە چون هەر مەینەت و عەزاب و ڕەنجە.

-١-[١]

ساقی! مەی داریم، ساقی! مەی داریم
ئارەزووی نۆشای جام مەی داریم[٢]

هەر شەو تا سەحەر ناڵەی نەی داریم
پەی نۆشای جامێ، ڕەنگ چوون بەی داریم[٣]

مەترسە جە تەعن حەسوودان بەد
جام مەی مەکەر جە عاشقان ڕەد[٤]

سەحەر سوراحی وە سوجدەی جام بەر
جەوپەی عارفان جە عەقڵ و فام بەر[٥]

-١-

١- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٢- ساقی: مەیگێڕ، کەسێ کە شەراب لە ناو شەراب خۆراندا دەگێڕێ. مەی: شەراب. داریم: وشەکە فارسییە بە مانای هەمانە. نۆشای: خواردنەوە. جام: پیاڵە. واتە: ئەی مەیگێڕ ئاواتی خواردنەوەی پیاڵەی شەرابمان هەیە.

٣- پەی نۆشای: بۆ خواردنەوە. چوون: وێنەی، وەکوو. بەی: بەهێ، مەبەست زەرد بوونە. واتە: هەموو شەوێ تا بەیانی وەک نەی دەناڵین و بۆ خواردنەوەی پیالەیەک شەراب ڕەنگمان وەک بەهێ زەردە.

٤- جە: لە. تەعن: تانە و تەشەر. حەسوود: چاو چنۆک، بەرچاو تەنگ. مەکەر: مەکە. واتە: لە تانە و تەشەری چاوچنۆکانی خراپ مەترسە و پیاڵەی شەراب لە عاشقان مەگێڕەوە و پێیان بدە.

٥- سەحەر: بەیانی. سوراحی: تۆنگ یا پارچێکی شووشەیی ملباریک کە شەرابی تێ دەکەن. ☜

مـــەی عـــەقیق ئاســـا نـــە جـــام تـــەڵا

پـــەی ئاینـــەی دڵ مـــەبۆ بـــە جـــەڵا[1]

ئەوسـە دەور مـــەڎەی ســـاقی جـــام نــە جـــەم

بـــا جـــە زڵفـــت دا زەرێـــو نـــەبۆ خـــەم[2]

پـــەی چـــی؟ ئـــی مـــەجلێس شـــادی نـــام دارۆ

هـــەر کـــەس خەمینـــەن هەبـــەس مـــەویارۆ[3]

---

بەر: ببە. جەوپەی: لەبەر ئەوە. واتە: بەیانی پارچی شەراب ببە بۆ لای پیاڵە با سـوجدەی بـۆ بەرێ (لار بێتەوە و شەرابی تێ بکا) و هەر بەو پیاڵە شەرابە عەقڵ و فام لـە عارفـان بسێنە(پیاڵە شەرابەکە بدە بە عارفان با سەرخۆش ببن و عەقڵ و فامیان نەمێنێ).

١- عەقیق: عاقێق، جەواهێرێکی هێژا بە ڕەنگی سوور. پەی: بۆ. مەبۆ: دەبـێ. جـەڵا: جـەلا دان، ڕۆشن کردنەوە. واتە: شەراب بە وێنەی عاقێقی نێو پیاڵەی زەردی تەڵایی بۆ پیاڵـەی دڵ ئـەبێ بـە ڕۆشن کەرەوە و تۆز و گەردی جامی دڵ لادەبات.

٢- مەڎەی: دەدی، ئەدەی. ساقی: مەیگێڕ. جام: پیاڵەی شەراب. جـەم: کۆمـەڵی خـەڵک. زڵـف: زوڵف، قژ. زەرێو: کەمێک. خەم: لار، چەمیو، حەڵقەی زوڵف. واتـە: ئـەی مـەیگێڕ کـاتێ لـە نـاو خەڵکدا دەگەڕێی و پیاڵەی شەراب پڕ دەکەی بـا زوڵفەکـەت حەڵقـەیان نـەبێ و سـاف بـن. لێـرەدا «خەم» دەتوانێ بە مانی خەم و ناڕەحەتیش بێ وەک لە بەیتی دوایی‌دا ئاماژەی پێ کراوە.

٣- پەی چی: بۆچی. ئی: ئەم. مەجلێس: کۆڕ، مەجلیس. دارۆ: هەیە. شادی نام دارۆ: شادی ناوە، ناوی شادییە. هەبەس: عەبەس، بێهوودە، گۆترە. مەویارۆ: ڕادەبوورێ. واتە: لەبەرچی؟ لەبەر ئـەوە کە ئەم کۆڕە، کۆڕی شادی و خۆشییە و هەرکەس خەمگین بێـت بێهـوودە کـاتی خـۆی ڕادەبـورێ و ئەمە جێگەی ئەو نییە.

بامانــــت ســــاقی! پــــێمان دەر جــــامێ
تــــا مــــەر جــــە تــــۆوە بــــوینمێ کــــامێ [1]

بەشــق دیــدەی وێــت هــەر یەنــد سـەحەر بــۆ
بــا جۆشــش نــۆش مــەیمان نــە ســەر بــۆ [2]

✡✡✡

---

١ بامانت: بە ئەمانەت، ئاگات لێ بێت. پێمان دەر: پێمان بدە. مەر: مەگەر. بوینمێ: ببینین. کام: ئاوات، ئارەزوو، خۆشی. واتە: ئەی مەیگێڕ ئاگات لێ بێت پیاڵەیەک شەرابمان پێ بدە تا بەڵکوو بە هۆی تۆوە خۆشییەک ببینین و بە ئاواتی دڵی خۆمان بگەین.

٢- بەشق: بە عەشق، بە خاتری. وێت: خۆت. هەر یەند: هەر ئەوەندە، هەر هێندە. واتە: مەیگێڕ بیکە بە خاتری چاوانی خۆت! با کاتێک ڕۆژ دەبێتەوە جۆشی شەراب خواردنەوەمان هەر لە سەردا بێ و هەر مەست بین.

لە نوسخەی «ک»دا بە دوای ئەم پارچە شێعرەدا سێ پارچە شێعری دیکە هاتووە کە لە ڕەدیفی ئەم شێعرەدا نووسراوە بەڵام لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «ڕ» و «س»دا هەرسێ پارچە شێعرەکە بە ناوی بێسارانییەوە نووسراوە. هەر وەها کە لە بەشی «نوسخە خەتیەکان»دا باسمان کردووە سەرچاوەی هەر چوار نوسخەکە یەک سەرچاوە بووە. ئەگەر بە وردی سەیری هەر سێ پارچە شێعرەکە بکەین و لەگەڵ شێعرەکەی بێسارانیدا بەراوەردیان بکەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەم سێ پارچە شێعرە لە ڕەدیفی شێعرکەی بێسارانیدا نووسراوە. هەر وەها لە نوسخەی «ک»دا ئاماژە بە ناوی شاعێرەکان کراوە و لە سەری نووسراوە. لە سەر پارچە شێعری «ساقی کەی بۆ کەی» نووسراوە «الیاس بیگ در ردیف» کە نەمانزانی ئەم «ئەلیاس بەگ»ـە کێ بووە. ئەمەیش شێعرەکەی ئەلیاس بەگ:

ساقی!کەی بۆ کەی؟ ساقی!کەی بۆ کەی؟ بەشق دیدەی وێت، سا کەی مەبۆ کەی؟
جەرگم بی کەباب، ڕەنگم بی بە بەی ئینتێزارەنــــان مــــەی بــــاوەری مــــەی

بامانــت هــەر یەنــد مەکــەروو لاڵــە     بــا مینــا بنیــۆ دەم نــە پیاڵــە

مەی یـاقووتی ڕەنگ دورد جەی ستادە     ســاقی شــەربەتی، کــوڵاو ئوفتــادە

دەور بــدە بــە جــەم، پــێم دەرە جــامێ     تــا مــەر جــە دەروون بــەر بــەروو فــامێ

ڕەهــا بــوو جــە دام دنیاپەرەســتی     مەر پێم نـەمانۆ یـەک زەرێـو مەستی

داخڵ بـوو نـە جـەم مـەجلێس مەستان     بویــەروو جــە دیــن دنیــا پەرەســتان

بـا منـیچ چەنـدێ دەور بـە کـامم بـۆ     سـوراحی لـەبرێز، مـەی نـە جـامم بـۆ

هەر وەها پارچە شێعری «ساقی ناڵەی نەی» کە لە سەرچاوەکانی «ب»، «ح»، «ڕ» و «س»دا بە ناوی بێسارانییەوە نووسراوە لە نوسخەی «ک»دا لە سەری نووسراوە «ملا فضل الله در ردیف».

ئەمەیش پارچە شێعرەکە بە پێی نوسخەی «ک»:

سـاقی! ناڵـەی نـەی، سـاقی! ناڵـەی نـەی     ناڵــەم زگــارەن وێنــەی ناڵــەی نــەی

جـەرگم کەبابـەن ڕەنگ زایـف چـوون بـەی     پەی چێش؟ پەی نۆشای جورعەی جام مەی

تــا وەس بنــاڵۆ دڵ جــە جــەفای زام     بــا ســەرنگوون بــۆ ســوراحی نــە جــام

مەی گوڵخونچە ڕەنگ حەمرا چوون شەفەق     ساقی بێ مەی مەست، جەمین پەڕ عەرەق

پــێم دەرە جــامێ وێنــەی جــام جــەم     تــا مــەر ســاکن بــۆ دڵ جــە بــار خــەم

جـام مــەی بــە دەســت، نۆشانۆشــم بــۆ     قەهقەهــەی مینــا بــا نــە گۆشــم بــۆ

بنۆشــوو جــامێ پــێم یــاوۆ مەســتی     بێــزار بــوو جــە دیــن دنیــا پەرەســتی

بـا پـەڕ بـۆ جـە مـەی سـوراحی و جـامم     چەنــدێو بگێڵــۆ دەوران بــە کــامم

دیسان لە نوسخەی «ک»دا پارچە شێعری «موترێب نەوای چەنگ» هاتووە و لە سەری نووسراوە «حاجی علی محمد بیگ تیلەکو» و لە ڕەدیفی «ساقی مەی داریم»ی بێسارانیدا نووسراوە بەڵام لە سەرچاوەکانی «ب»، «ح»، «س» و «ڕ»دا بە ناوی بێسارانییەوە هاتووە. ئەمەیش پارچە شێعرەکە:

موترێب نەوای چەنگ، موترێب نەوای چەنگ     ســەخــت بێنــەوانان پــەرێ نــەوای چــەنگ

ســاقی! مروەتــەن شــەراب گوڵڕەنــگ     دەوران دەرەنگــەن، مەکــەرە دەرەنــگ

موترێــب بکێشــە نــاڵە ناڵــەی نــەی     کەیکاووس کۆ شی؟ دارا کەی بی کەی؟

-٢[١]-

سای سەهەند سەنگ، سای سەهەند سەنگ
سوبحدەم وەشەن سای سەهەند سەنگ[٢]

بەڵام بە شەرتێ ڕەقیب بەدڕەنگ
نەگنۆ نە وەندت سەدهەزار فەرسەنگ[٣]

چەنی دۆست وێت بنیشی بە شاد
وێەردەیساڵان باوەری وە یاد[٤]

---

☞

| | |
|---|---|
| کەمانچەی شادی بگێرە بە دەست | مەست کەرە هۆشیار، هۆشیار کەرە مەست |
| با بە قانوون بۆ نەغمەی سازانت | چوون ئێمشەو چەنی ساقی سازانت |
| تا وەی مەجلیسە بویارمێ بە شاد | شادی و ناشادی مەویەران چوون باد |

-٢-

١- ک، س، ڕ، ب، ح.

٢- سای سەهەند: سێبەری پۆڕ، سێبەری چڕ و پڕ، سێبەرێک کە هەتاوی تێنەکەوێ و دایم سێبەر بێ. سەنگ: بەرد، تەوەن. سوبحدەم: بەیانی زوو، کازیوە. وەشەن: خۆشە، بەچێژە. واتە: بەیانی زوو سێبەری پۆڕی بن بەرد خۆشە.

٣- ڕقیب: پاسەوان، چاوەدێر، کەسێک کە بیەوێ یاری کەسێک زەوت و داگیر بکات بۆ خۆی. نەگنۆ: نەکەوێ. وەند: نزیک. نەگنۆ نە وەندت: نزیکت نەکەوێ. فەرسەنگ: یەکەی پێوانەی ڕێگە بووە کە پێشتر بە کاریان بردووە و بەرانبەری شەش هەزار و دووسەد و چل میترە. واتە: بە شەرتێک ڕەقیبی ناحەز و بەد تەشک سەد هەزار فەرسەنگ لێت دوور بێ و نزیکت نەکەوێ.

٤- چەنی: لەگەڵ. وێت: خۆت. وێەردە: ڕابردوو، ئەوەی ڕۆیشتووە. باوەری: بهێنی. واتە: لەگەڵ☜

گـا نیـاز جـه تـۆ، گـا نـاز جـه دڵبـەر
تـۆ پـەی ئـەو سـۆزان، ئـەو جـه تـۆ بەتـەر [١]

هـەرتا کـە عـومرت یـاوۆ بـە ئـەنجام
نـە سـای ئـەو سـەنگدا بویـاری بـە کـام [٢]

ئێـڎەن سـەرمایەی ئـی دنیـای فـانی
مابـاقی پووچـەن هـەرچێو مـەزانی [٣]

☆☆☆

☞ یاری خۆتدا دابنیشی و جار و بارێک ڕابردووی ساڵانی پێشوو بە یاد بێنێتەوە. بە کوردی و کورتی واتە: لەگەڵی دابنیشی و باسی ڕابردوو بکەی.

١- نیاز: خوزراو، ویستنی شتێک. پەی ئەو: بۆ ئەو. واتە: جارێک تۆ شتێک لە یار بخوازی و جارێک ئەو ناز بکا و تۆ بۆ ئەو سووتا بی و ئەو لە تۆ خراپتر بێت.

٢- یاوۆ: بگا. ئەنجام: کۆتایی، ئاخر. بویاری: ڕابوێری. بە کام: بە ئاوات، بە دڵ. واتە: تا کۆتایی تەمەنت لە سێبەری ئەو بەرەدا بە دڵی خۆت ڕابوێری.

٣- ئێڎەن: ئەمەیە. ئی: ئەم. فانی: شتێک بۆ تاهەتایی لە نێو بچێت. ماباقی: ئەوەی بمێنێتەوە. مەزانی: دەزانی. واتە: سەرمایەی ئەم دنیا فانییە ئەمە بوو کە وتم، ئیتر جگە لەمە هەر شتێ هەبێ هیچ و پووچە.

-٣[١]-

ســــتارەی ســــەحەر! ســــتارەی ســــەحەر!

ســتارەی شــەریف وادەی ســوب ســەحەر![٢]

خوزگە پێت هەر یەند جە بورج مەی وە بەر

شــۆڵەت ئاســتانەی کەســێو منیــۆ ســەر[٣]

هــــەر ڕۆ تەماتــــەن وەخــــت ســــویحدەم

ئــەو زێــد و مــاوا بــوینی بــە چــەم[٤]

نــەک بــە جەســتەی مــن ســتارەســیا

دوورکەوتــەی زامــن جــە یــاران جیــا[٥]

-٣-

١- ک، ئێ، س، ڕ، م، ب، ح.

٢- ستارە: ئەستێرە، هەسارە. سەحەر: بەیانی زوو، کازیوە. شەریف: پلە و پایە بەرز. وادە: وەعدە، کات و سات. سوب: بەیانی. واتە: ئەی ئەستێرە پلە و پایە بەرزەکە بەیانیان زوو هەڵدێیت.

٣- هەر یەند: هەر ئەوەندە، هەر هێندە. بورج: شوێنێک لە ئاسمان کە ئەستێرە یا تاقمە ئەستێرەیەک لەوێوە هەڵدێن. مەی وە بەر: دێیتە دەر، هەڵدی. شۆڵەت: نوورت. ئاستانە: ئە ئاستانە، لە ئاستانە. ئاستانە: بەر درگا. سەر منیۆ: سەر دەنێیت. واتە: خۆزگەم بە تۆ کە لە ئاسمانەوە هەڵدێیت و ڕۆشنایی و نوورت سەر بە درگای کەسێکەوە دەنێیت.

٤- ڕۆ: ڕۆژ. تەماتەن: بە هیوای. سویحدەم: بەیانی. بوینی بە چەم: ببینی بە چاو، بە چاو ببینی. واتە: هەموو ڕۆژێک بەیانی زوو کاتێ هەڵدێیت بە هیوای ببینی ئەو شوێن و مەکانەی

٥- بە جەستەی من: بە وێنەی من، وەکوو من. ستارەسیا: چارە ڕەش. واتە: نەوەک بە وێنەی ☜

نــه پــەی دیــن ئــەو پــەیم هــەن تــەمایێ

نـــەو زێـــد و مـــاوا مـــەوینوو گـــایێ [١]

یـــە خـــەیلێ وەختـــەن، شـــەڵڵا نـــەمانوو

زەدەی هێجـــــرانم، هـــــیچ نمـــــەزانوو [٢]

خوزگـــە پێـــت شـــەریف، ڕۆشـــن ســـتارە!

چـــوون مـــن هێجرانـــت نیـــەن نـــە چـــارە [٣]

☆☆☆

---

☜ من کە چارە ڕەشم و لە زێد و نیشتمانی خۆم دوور کەوتوومەتەوە و لە یاران جودام.

١- پەی: بۆ. دین: دیتن، بینین، چاو پێکەوتن. پەیم: بۆمن، بۆم. تەما: هیوا. مەوینوو: دەبینم. واتە: نە بە هیوای ئەوەم ئەو ببینم و نە جارجار ئەو شوێن و مەکانە دەبینم. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هاتووە.

٢- یە: ئەمە. خەیلێ وەختەن: لە مێژە، دەمێکەیە. شەڵڵا: ئیشەڵڵا، بەڵکوو، بەشکەم. نەمانوو: نەمێنم. زەدە: پێکراو. نمەزانوو: نازانم. واتە: بەڵکوو نەمێنم تا ئەمە بڵێم کە لە مێژە پێکراوی دەردی دووریم و هیچ نازانم.

٣- ڕۆشن ستارە: چارە ڕۆشن. چوون: وێنەی، وەکوو. چارە: ئەو شتەی بۆ کەسێک نووسراوە و دەبێ هەرواى بۆ پێش بێت. واتە: ئەی ئەستێرەی ڕۆشنی پایەبەرز خۆزگەم بە خۆت کە وەک من دووری و دوورکەوتنەوەت لە چارەدا نەنووسراوە و یار دەبینی.

-٤[١]-

ســــتارێو مـــەبۆ واڎەی ســــوب ســــەحەر
بــەر مــەیۆ جــە بــورج بــەرز کەڵەیــڎەر[٢]

نــوورش پــەخش مــەبۆ نــە ڕووی ســەرزەمین
ڕەهنومــــان پــــەرێ دینــــداران دیــــن[٣]

وەختــێ کــە دیــڎەم مــەنمانۆ جــەمین
مەکــەرۆ تــەیار ســپای زەنــگ و چــین[٤]

---

-٤-

١- ک، ڕ، س، ب، ح.

٢- ستارێو: ئەستێرەیەک. مەبۆ: دەبێ، هەیە. بەرمەیۆ: هەڵدێت. بورج: شوێنێک کە ئەستێرە لەوێوە هەڵدێت. کەڵەیڎەر: ناوی کەشێکە لە بێساران کە ئێستە «کەڵەیەر»ی پێ دەڵێن. واتە: ئەستێرەیەک هەیە کە لە کازیوەدا لە کەڵەیدەرەوە هەڵدێت. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «س» و «ڕ»دا بە جێی «کەڵەیڎەر»، «کەڵەڎەر» نووسراوە.

٣- بەخش مەبۆ: بڵاو دەبێتەوە. ڕەهنوما: ڕێ نیشاندەر. پەرێ: بۆ. واتە: نوور و ڕۆشنایی ئەو ئەستێرە بە سەر سەرزەمیندا بڵاو دەبێتەوە و ڕێ نیشاندەری دیندارانە (وا دیارە ئەو ئەستێرە لە کاتی بانگی بەیانیدا هەڵدێت، چونکە دەڵێت ڕەهنومان پەرێ دیداران دین).

٤- مەنمانۆ: دەنوێنێ، نیشان دەدا. جەمین: ڕۆخسار، ڕوو. مەکەرۆ تەیار: تەیار دەکا، ئامادە دەکا. زەنگ: خەڵکی وڵاتی حەبەش کە ڕەنگی پێستیان ڕەشە، لێرەدا مەبەست زوڵفی یارە. چین: خەڵکی وڵاتی چین کە ڕەنگی پێستیان زەرد و سپییە، لێرەدا مەبەست ڕوخساری یارە. واتە: کاتێ دیدەم (یارەکەم) ڕوخساری دەنوێنێ و زوڵف و ڕوخساری حازر دەکات.

ســـتارەی شـــەریف جـــەمین مایـــەی خـــوەر
چـــوون شـــەرمداران ســـەر مـــەوزۆ نـــە وەر[١]

پـــەی چـــێش؟ کـــە شـــۆڵەی ڕوخســـار لـــەیلێ
مـــــەزانۆ پایـــــەش بوڵەنـــــدەن خـــــەیلێ[٢]

جـــە بـــێ نـــووری وێـــش یەکســـان مـــەبۆ مـــات
بـــەو تـــەور مـــەمانۆ تـــا بـــە خۆرهـــەڵات[٣]

کەســـێو ســـتارەی ســـەحەر نـــوور ســـەندەن
فیـــداش بـــام عەجـــەب پایـــە بوڵەنـــدەن[٤]

☆☆☆

---

١- ستارە: ئەستێرە، هەسارە. شەریف: پلـە و پایـە بـەرز. خـوەر: هـەتاو، خـۆر. سـەر مـەوزۆ: سەردادەخات. واتە: ئەو ئەستێرە پایە بەرزە کە ڕۆخساری مایـەی هـەتاوی پێوەیـە و وەکـوو هـەتاو دەگرێت کاتێ چاوی دەکەوێ بە زوڵف و ڕووی یار وەک کەسێ کە شەرم بکات سەر دادەخا.

٢- پەی چێش: بۆچی. مەزانۆ: دەزانێ. بوڵەند: بەرز. خەیلێ: زۆر. واتە: لەبەرچی؟ لەبەر ئـەوەی کە دەبینێ نوور و ڕۆشنایی ڕوخساری لەیلێ زۆر لەو پایە بـەرزترە. ئـەم بەیتـە تـەنیا لـە نوسـخەی «ک»دا و لە نوسخەکانی دیکەدا نییە و بە بێ ئەم بەیتە مانای شێعرەکە ناتەواوە و بەیتی کۆتـایی مانا نادات.

٣- وێش: خۆی. مەبۆ: دەبێ. بەوتەور: بەو جۆرە، بەو شێوە. مـەمانۆ: دەمێنـێ. واتـە: لەبـەر بـێ نووری خۆی (لە بەرانبەر ڕوخساری یاردا) بێ نوور ئەبێ و هـەتا خۆرهـەڵات هـەروا بـە بـێ نـووری دەمێنێتەوە. ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هاتوون.

٤- واتە: کەسێک کە نووری لە ئەستێرەی بەیان سەندووە و ئەستێرەی بەیانی بێ نوور کردووە.

-٥[1]-

سۆز جە سۆز مـن سفتە زار بیـەن
دەرد جە پەی دەردم بێ قەرار بیـەن[2]

زامەت زویرەن جە پەی زامەتم
خەم خجڵ مەندەن جە پەی قامەتم[3]

وێڵی جە وێڵیم شێت و وێڵ بیـەن
چوون مـن کۆ بە کۆ ئەراگێڵ بیـەن[4]

سا کەسێ چوون من بەی تەور بی پەیدا
زامەت دەردش گشت دا بە وەیدا[5]

---

☞ بە قوربانی بم هەر زۆر پایە بەرزە.

-٥-

١- ک، س، ر، ب، ح.

٢- سفتە: سووتاو. زار: مەلوول، کز. جە پەی: لە بۆ. واتە: سۆز لە سۆزی مـن سووتاوە و مەلوول کەوتووە و دەردیش لە دەردی من بێقەرار بووە.

٣- زامەت: زەحمەت. زویر: خەمگین. خەم: لاری، چەماوی. مەندەن: ماوە. واتە: زەحمەت لەبەر زەحمەتی من خەمگین بووە و لاری و چەماوی لە بەرانبەری قامەتی مندا خەجاڵەتی دەکێشێ. (قامەتم هێندە لار بووە کە چەماوی بە بینینی خەجاڵەتی دەکێشێ).

٤- ئەراگێڵ: عاشقی شەیدا و سەرلێ شێواو کە دابێتی بە کێودا. واتە: وێڵی لە بەر وێڵ بوونی من تەواو وێڵ بووە و ئەویش بە وێنەی من داویە بە کەش و کێودا.

٥- چوون: وێنەی، وەکوو. بەی تەور: بەم جۆرە، بەم شێوە. وەی: ئازار. واتە: دەی سا کەسێکی ☞

تــا وەختـــێ گـــەردوون گـــەردم دۆ بـــە بـــاڎ
شـــەرتەن جـەفای مـــن کـەس نـە گنۆش وە یـاڎ [١]

☆☆☆

-٦- [٢]

سۆسەن گـولێ دیـم بـۆش چـوون عەنبـەر بـێ
دەهـــەن شکەســـتەی بـــاد ســـەحەر بـــێ [٣]

یـــەقین هـــۆ نـــەوخێز خونچـــەی ســـاوا بـــێ
جـــە وەش‌بـــۆش مـــاوای خوتـــەن ئـــاوا بـــێ [٤]

---

☜ وەک من کە بەم جۆرە پەیدا بووە و زەحمەتی دەردی هەموو داوە بە ئـازار و مەینـەت (ئـازار و مەینەت دەردیان لە من گرتووە).

١- گەرد: تۆز. دۆ: بدا. نەگنۆ: نەکەوێ. واتە: تا کاتێک بمرم و لاشـەم ببـێ بـە تـۆز و گـەردوون تۆزەکەم نەدا بە دەم باوە، شەرتە ئەو جەفا کە من کێشـاومە کـەس نایهێنێتـەوە بیـر. لـە نوسـخەی «ک»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «شـەرتەن کەس نە گنۆش جەفای ئەو وە یاڎ».

-٦-

٢- ک، ئێ، ب، ڕ، س، عم، ح.

٣- سۆسـەن: سووسـەن، سوێسـن، گـولێکی جـوان. عەنبـەر: مـاکێکی بۆنخـۆش. دەهـەن: دەم. شکەستە: شکاو. باد: با، وا. واتە: گوڵە سوێسنێکم بینی وەک عەنبەر بۆنخۆش بوو و دەمـی بـە «با»ی بەیانی شکا بوو. خونچەی گوڵە سوێسن کاتێ دەشکۆفێتەوە پـەنج شـەش گـەڵای لـێ بـاز دەبێت، لێرەدا بێسارانی وای داناوە کە گوڵی سوێسن بە دەستی «با» دەمی شکاوە.

٤- یـەقین: پتـەوی بـاوەڕ، بەڕاسـتی. هـۆ: خـۆ. نـەوخێز: تـازە دەرهـاتوو، تـازە ڕواو. سـاوا: تـازە پێگەیشتوو. ماوا: شوێن، جێگە. واتە: شکی تێدا نییە کە تازە ڕواوە و خونچەی تازە ☜

بەڵێ، سوب سەحەر پێکابێش لافێ

وە زڵف لوول دێز موشکین کڵافێ [١]

واتەبێش منیچ بۆم چوون ئەو زڵفەن

وەلێ ئەو چین چین سەرتاپا کڵفەن [٢]

تمەز بای شەماڵ جاڕووی زڵف دەستە

مەژنەووش چەنە لافێ بەی جەستە [٣]

---

☜ پێگەیشتووە و لە بۆنخۆشی ئەو وڵاتی خوتەن ئاوەدان بووەتەوە. مەبەستی ئەوەیە زۆر بۆنی خۆشە و وڵاتی خوتەن کە کانگای موشکە و موشک لەوێوە دێت، بە بۆنخۆشی ئەو ئاوەدان بووەتەوە. لە نوسخەی «ک»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «جە وەش بۆش، پەڕ عەتر سەهەند ئاوا بێ» و لە نوسخەی «ئێ»دا بەم جۆرە: «جە وەش بۆش، پەڕ عەتر سەربەند ئاوا بێ». دەکرێت «سەهەند» یا «سەربەند» ناوی شوێنێک بێت.

١- بەڵێ: بەڵام. پێکابێش: پێکابووی. کڵاف: پەلکە. دێز: ڕەش. واتە: بەڵام ئەو خونچە تازە پێگەیشتووە بەیانیانی زوو قسەی زلی کردبوو و خۆی لە پەلکەی زوڵفە لوولە بۆنخۆشەکانی بە بۆنخۆشتر زانی بوو.

٢- واتەبێش: وتبووی. چوون: وێنەی، وەکوو. کڵف: کڵافە، پەلکە. واتە: وتبووی بۆنی منیش بە وێنەی ئەو زوڵفانە وایە بەڵام ئەوان چین چین و سەرتاپا پەلکەن.

٣- تمەز: تۆ مەڵێ. جاڕوو: گزی، گسک. مەژنەووش چەنە: لێی دەبیسێ. بەی جەستە: بەم جۆرە، بەم شێوە. واتە: تۆ مەڵێ بای شەماڵ کە بە وێنەی گزی دەستەی زوڵفانی وایە و دایم بە ناویاندا هات و چوویە ئەم لاف و قسەی زلەی لە دەمی ئەو خونچەی سوێسنە دەبیسێ.

بــێ حەســاب قــارێ نـــە دڵ مەبـــەرۆ
بێجـــا دەهـــانش، شکەســـت مــــەدەرۆ[۱]

جــە پــەی پێکــای لاف بێجــای بــێ مــەوزوون
هــێمای دەهــانش نەشوســتەن جــە هــوون[۲]

☆☆☆

۱- بێ حەساب: بێ ئەندازە. قارێ، قینێ، رقێ. مەبەرۆ: دەبا. بێجا دەهـان: دەمێـک کـە بـێ جـێ بکرێتەوە. مەدەرۆ: نەدات. واتە: بێ ئەندازە رقی لێ دەباتـە دڵـەوە (رقـی لـێ هەڵنەسـێ) و ئـەو دەمەی کە بێ جێ دەکرێتەوە دەشکێنێ.

۲- جە پەی: لەبۆ. پێکـای: پێکـران. بـێ مـەوزوون: نارێـک. هـێما: هێشـتا. دەهـانش: دەمـی. نەشوستەن: نەشۆردووە. هوون: خوێن. واتە: لەبەر ئەو لافە نارێک و بێ جێ کە لێی دابـوو هێشـتا دەمی لە خوێن پاک نەبوەتەوە. مەبەستی ئەوەیە کە ئەو گوڵە سوێسنە کە ڕەنگی سوورە هـەر ئـەو خونچە تازە پێگەیشتوویە کە شـەماڵ دەمی شەکاندووە و هێشتا خوێنەکەی پێوەیە و لەبـەر ئەوەیـە سوورە. لە سەرچاوەکانی «س»، «ڕ»، «ب»، «عم» و «ح»دا بەیتی کۆتایی ئەم پارچە شـێعرە بـەم جۆرە نووسراوە:

جــە پێکــای ئــەو لاف بــێ مەوزوونــەوە هــێمای دەهــانش هــا بــەو هوونــەوە

بەڵام ئەم بەیتە، بەیتی کۆتایی پارچە شێعرێکە لە ڕەدیفی ئەم پارچە شێعرەی بێسارانیدا نووسراوە و لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا بە دوای شێعرەکەی بێسارانیدا هاتووە و لە سەری نووسراوە «مولانا زین العابدین در ردیف». «مولانا زین العابدین» شاعیرێکی پاڵنگانی و هاوچەرخی بێسارانی بووە. ئەمەیش پارچە شێعرەکەی «مولانا زین العابدین»:

مــەولام! سۆســەن گــوڵ نەشــکاویا دەم ســاوای ســپی ســاق، شــۆریای شــەونەم
وەڵــی هــا نــازک فــرە ســاوا بــێ دەمــاخش بــە بــاد ســەحەر یــاوا بــێ

-٧[١]-

سۆسـەنێ مـەبۆ، سۆسـەنێ وەش وەخـت
بەرمـەیۆ نـە پـای تەختـەی وەفـر سـەخت[٢]

گـا لاو شـێوان مـەماڵۆش جـەمین
گـا پـەل مەکـەرۆ بـە خونـاو نـەمین[٣]

گـا گـا گومەتـەن چـوون زەڕیـن کـوڵاو
گـا بـاد مەکـەرۆش پـەل جـە پـەل وڵاو[٤]

---

☞

سـارایی وێنـەی کـەم فامـان ڕۆیـێ لاف مـەدا وە خـاڵ زڵـف ئەشـەدبۆیێ
ناگـا بـاد بـە قـار لـێش مەشـانۆ دەسـت دەهـان بەسـتەش مەکـەرۆ شکەسـت
جـە پێکـای نـەو لاف بـێ مەوزوونـەوە هـێمای دەهـانش هـا بـەو هوونـەوە

-٧-

١- ک، ئێ، س، ر، ب، عم، ح، مج.

٢- سۆسەن: سووسەن، سوێسن، ناوی گوڵێکی جوان. وەخت وەش: وەختی خۆش، کاتی خۆش، مەبەست بەهارە. بەرمەیۆ: دەردێ، دەڕوێ. وەفر: بەفر. واتە: گوڵە سوێسنێک هەیە لە وەختێکی خۆشدا (بەهار) لە لای تەختە بەفرێکی سەختدا دەڕوێ.

٣- لاو: لافاو. شێوان: تێکدەر، شێوێنەر، شێوێنکە، ئاڵۆزکەر. مەماڵۆش: دەماڵێ، دەیماڵێ. جەمین: ڕوو، ڕوخسار. پەل: گەڵا. مەکەرۆ: دەکات. خوناو: شەونم، ئاونگ. نەمین: تەڕ. واتە: جارجار تاوە بارانی بە ڕوودا ئەدات و ئاڵۆزی ئەکا و جارجاریش گەڵاکانی خۆی بە ئاونگ تەڕ ئەکات.

٤- گاگا: جارجار. گومەت: گۆ، قوبە، گومبەز، گونبە، مەبەست خونچەی گوڵە سوێسنەکەیە. چوون: وێنەی. زەڕین کوڵاو: کڵاو زێڕین. مەکەرۆش: دەیکا. پەل: گەڵا. وڵاو: بڵاو. واتە: ☜

هــــەردان مەکـــــەرۆ بـــــە دەشـــــتان چـــــین
جـــە ڕەشـــک دیـــدەی مـــەحبووب مـــاچین[١]

شـــێوەی ئـــەو سۆســـەن هـــا بـــەو دیـــدەوە
بـــــەو گۆنـــــای گوڵڕەنـــــگ بەرگوزیـــــدەوە[٢]

***

---

جارجار قوبەیە (خونچەیە) وێنەی کڵاوی زێڕین کە نرابێت بە سەرەوە و جارجاریش «با» لێـی ئەدا و گەڵاکانی بڵاو دەکاتەوە (دەشەکێنێتەوە). لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «گا گا گومـمەتەن»، «گا لوول کرژەن» و لە سەرچاوەکانی «ب» و «ڕ»دا «گا کـاکوڵ کـرژەن» و لـە نوسـخەکانی «س» و «عم»دا «گا گا کەمەننەن» و لە نوسخەی «ئێ»دا «کاکوڵ گومـمەتەن» نووسراوە.

١- هەرد: کـەش و کێـو. مەکـەرۆ: دەکـات. چـین: وڵاتـی چـین. ڕەشـک: بـەخێڵی. مـەحبووب: خۆشەویست. ماچین: چینی گەورە، ئەوسا بە وڵاتی تورکستانیان وتووە چین و بە چینـی ئێسـتایان وتووە ماچین. واتە: لە بەخێڵی چاوانی یار کەش و کێو پڕ دەکات لـە گوڵـە سوێسـنە. (ئـەو گوڵـە سوێسنە بە تەمایە بڵێ منیش بە وێنەی دیدەی یارم و لەبەر ئەوەیە کەش و کێو پڕ دەکات لە گوڵی سوێسن).

٢- دیدە: لێرەدا بە مانای «ڕوومەت»ـە. گۆنای گوڵڕەنـگ: گۆنـا یـا ڕوومـەتێک لـە ڕەنگـی گـوڵ بچێت. بەرگوزیدەوە: هەڵبژێراو، تاقانە. واتە: شێوەی ئەو گوڵە سوێسنە لە ڕوومەتی یـار دەچێـت، لەو گۆنا گوڵڕەنگەی یار کە هیچ کەس وەک ئەو نییە.

-٨[١]-

سەرزەمینانەن، سەرزەمینانەن

وەهار جەلابەخش سەرزەمینانەن[٢]

مەکان گوڵگەشت جام جەمینانەن

فەسڵ ئاخ و داخ دڵ خەمینانەن[٣]

نازداران بە زەوق گوڵان ئاڵا

شاذی و زەوقشان مەگێرۆ باڵا[٤]

دەردینان جە سەیر شکۆفەی باخان

ئاخشان مەبۆ بە داخمای داخان[٥]

---

-٨-

١- ک، نێ، ڕ، ب، عم، س، ح، مج.

٢- وەهار: بەهار. جەلا بەخش: ڕۆشن کەرەوە، تۆز لابەر. واتە: بەهار تۆزی سەر زەمین لادەبات و وڵات ڕۆشن دەکاتەوە.

٣- گوڵگەشت: سەیران. گەڕان. جام جەمین: ئەوانەی کە نێوچاویان بە وێنەی ئاوێنەیە. خەمین: دڵتەنگ. واتە: شوێنی سەیرانی ئەو کەسانەیە کە ڕوخساریان لە ئاوێنە دەچێت و وەرزی ئاخ و داخ هەڵکێشانی دڵ خەمگینانە.

٤- زەوق: خۆشی، چێژ بردن. ئاڵا: لە ئاڵەوە گیراوە بە مانای سووری کاڵە بەڵام لێرەدا بە مانای ڕەنگاڵەیە، ڕەنگاوڕەنگ. باڵا مەگێرۆ: باڵا ئەکا، هەڵدەسێ، گەشە ئەکا. واتە: نازداران کاتێ زەوقی گوڵە ڕەنگاوڕەنگەکان دەبینن لە خۆشی ئەوان شادی و زەوقی خۆشیان باڵا و گەشە ئەکات.

٥- دەردین: دەردەدار. شکۆفە: هەڵاڵەی دار. مەبۆ: دەبێ. داخما: شوێنی مانەوەی داخ کردن ☜

هــەر دڵ بــێ‌دەردەن وێنــەی ســەنگ خــار
بــێ‌بــارەن جــە نــەخش ڕەشــتەی نــەووەهار[١]

❊❊❊

-٩[٢]-

ســـەیر نـــەمامان، ســـەیر نـــەمامان
ڕوێ شـــیم وە ســـەیر نـــەوتووڵ نـــەمامان[٣]

دیـــم عوریـــان بـــەدەن، زار خـــەرامان
وەڵـــگ باڵاشـــان ڕێـــزان نـــە دامـــان[٤]

---

☞ بە سەر لاشەوە. واتە: دەردەداران بە سەیرکردنی هەڵاڵەی باخان داخیان ئەبێ بە داخما (کاتێ ناخ هەڵدەکێشن، ناخەکەیان هێندە گەرمە کە شوێنی داخەکەیان بە سەر لاشەوە دەمێنێ).

١- سەنگ خار: سەنگی خارا، بەردی خارا، جۆرە بەردێکی ڕەق کە وادیارە «هارە»یش کە بۆ ئاسیاو دروست کراوە هەر لەو جنسە بێت و وشەی «هارە»یش هەر «خارا» بێت. بار: بەر، سەمەر. ڕەشتە: ڕەنگکراو. واتە: هەر دڵێک کە دەردی نییە لە بەردی ڕەق دەچێت و لەو نەخشانەی کە بەهار ڕەژتوویە هیچ سەمەرێکیان پێ ناگات. مەبەستی ئەوەیە خۆشی بەهار بۆ ئەو کەسەیە دەردەداری دەردی عەشق بێت.

-٩-

٢- ئا، ک، ئێ، ڕ، عم، ب، ح، مج.

٣- ڕوێ: ڕۆژێ. شیم: ڕۆیشتم. نەوتووڵ: تازە پێگەیشتوو. واتە: ڕۆژێ ڕۆیشتم بۆ سەیری نمامە تازە پێگەیشتووەکان.

٤- عوریان: ڕووت. زار: مەلوول. خەرامان: لەنجە و لارە کەر. وەڵگ: گەڵا. ڕێزان: ڕژاندووە. واتە: بینیم کە لاشەیان ڕووت بووەتەوە و مەلوولن و لەرەیان دێ و گەڵاکانیان ڕژاوەتە بنیان.

بـێ زەوق و کـەم چـاخ وێنـەی خـەم کێشـان
زەلیـل و زەبـوون، زار و پەرێشـان[١]

پەرسـام نـەمامان خـاتر جـە خـەم کـەیل!
کـۆن وەشـی وەریـن، زەوق نەوسـوەیل؟[٢]

واتشـان پەنـەم ئـەرێ بـێ خەبـەر!
بـە کـەس نمـەدان وەشـی تـا وە سـەر[٣]

ڕەشـتەبێش سـوەیل وەڵـگ باڵامـان
کـەردەبێش ئـەرزان ئـاڵ و واڵامـان[٤]

---

١- کەم چاخ: ناکۆک، بێ کەیف. واتە: بە وێنەی ئەو کەسانەی کاریان خەم خواردنە بێ زەوق و ناکۆک و زەلیل و لارەمل و مەلوول و سەر لێ شێواو بوون.

٢- پەرسام: پرسیم. کەیل: پڕ. کۆن: کوا. وەرین: پێشوو. واتە: لێیانم پرسی و وتم ئەی نمامەکان کە خاترتان پڕە لە خەم و کەلاوی کردووە، کوا ئەو کەیف و خۆشییەی کە پێشتر بە هەڵهاتنی نەوسوەیل دەتانکرد؟

٣- واتشان پەنەم: پێیان وتم. نمەدان: نادەن. وەشی: خۆشی. واتە: وڵامیان داوە و وتیان ئەی بێ خەبەر! تا سەر خۆشی بەکەس نادەن.

٤- ڕەشتەبێش: ڕژتبووی، ڕەنگی کردبوو. وەڵگ: گەڵا. کەردەبێش: کردبووی. ئاڵ: سووری کاڵ. واڵا: بەرزی. واتە: سوەیل گەڵاکانمانی ڕژتبوو و هێندە ڕەنگی زۆر بوو کە ئیتر گەڵا و باڵای بەرزمان هەرزان ببوون.

ناگـــا غـــەزەب بـــاد، ســـەرد ســـتەمناک
وەڵــگ باڵامـــان ڕێـــزان کـــەرد نـــە خـــاک[1]

ئیســـــە نەمەنـــــدەن چـــاخ وەشـــــیمان
وەشـــی فەســـڵێو بـــی دیـــمان نـــەدیمان[2]

✡✡✡

-١٠-[3]

ســـیای بـــۆ عەنبـــەر، ســـیای بـــۆ عەنبـــەر
دوو دەســـتە جـــە زڵـــف ســـیای بـــۆ عەنبـــەر[4]

---

١- ناگا: کوتووپڕ. غەزەب: قین، ڕق. باد غەزەب: بای تـووڕە. سـتەمناک: تێکـەڵ لەگـەڵ زۆر و ستەم. ڕێزان کەرد: ڕژاندی، وەراندی. واتە: کوتووپڕ بایەکی تووڕەی سەردی ستەمکار (بای سـەردی پاییزی) گەڵای باڵامانی ڕژاندە نێو خاک.

٢- نەمەندەن: نەماوە. چاخ: کەیف. فەسڵێو: وەرزێک، فەسڵێک. واتـە: ئێسـتە کـەیف کۆکیمـان نەماوە و خۆشی ماوەیەک بوو دیمان و تەواو بوو. لە زۆربـەی نوسـخەکاندا بـە دوای ئـەم بەیتـەدا بەیتێکی دیکە هاتووە کە بە بڕوای من لە شێعری بێسارانی ناچێت و لە نوسخەی «ک»یشدا نییە. ئەمەیش بەیتەکە بە پێی سەرچاوەی «ح»:

وەشـــی چ وەش بـــێ وەشـــی هـــای وەشـــی     وەشی وەش وەش بێ وەش جە دەس بەرشـی

-١٠-

٣- ک، س، ڕ، ب، ح.

٤- سیا: ڕەش. عەنبەر: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆشە. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بـەیتی دوایـیدا دێت.

چـــەفت چەمیـــدە، پـــەڕ چـــین چەنبـــەر
بـــەرئامان جـــە بـــێخ شـــەوبەند دڵبـــەر [١]

وەختـــێ بـــای شـــەماڵ مەگنۆشـــان نـــە وەنـــد
دەور مـــەڎان نـــە دەور دایـــرەی شـــەوبەند [٢]

جـــە تـــاو هجـــووم بـــاد بـــێ ئاهـــەنگ
دامـــان شـــەوبەند مـــەگێران بـــە چـــەنگ [٣]

هـــەر وەخـــت جـــە جەورشـــان بـــاد ببـــۆ بـــەتاڵ
ئـــەودی پـــەخش مـــەبان نـــە دەوران خـــاڵ [٤]

---

١- چەفت: چەوت، لار بوو، چەماو. چەمیدە: چەمیو، چەماو، لوول. پەڕ چین: پڕلـە چـین، چـین چین. چەنبەر: حەڵقە. بەرئامان: دەر کەوتووە. شەوبەند: سەرپۆشـێک کـە ڕوخسـاریش بپۆشـێت. واتە: دوو دەستە لە زوڵفە ڕەشە بۆنخۆشەکانی یار کە لـوولن و حەڵقـەیان خـواردووە و لارەوە بـوون و چینیان تێ کەوتووە، لە ژێر شەوبەندەوە دەر کەوتوون.

٢- مەگنۆ: دەکەوێ. وەند: نزیک. مەڎان: ئەدەن. واتە: کـاتێ بـای شـەماڵ نزیکیـان دەکـەوێ لـە دەوری شەوبەندەکە هەڵدەخولێن.

٣- هجووم: پەلامار. بێ ئاهەنگ: ناساز، ناڕێک. مەگێران: دەگرن. واتە: لەبـەر پـەلاماری «بـا»ی ناسازی پاییز شەوبەندەکە دەگرن تا «با» نەیانبات.

٤- ببۆ: ببێ. ئەودی: دیسان. پەخش مەبان: بڵاو دەبنەوە. واتە: کاتێ کە «بـا» دەسـت لـە جـەور دانیان هەڵبگرێ دیسان لە دەوری خاڵەکان بڵاو دەبنەوە.

نەشـــیم نـــە گـــەردەن جـــەو زڵفـــە تـــایێ
هـــەر تـــایێ بیـــەن لـــێم بـــە ســـەودایێ[١]

٭٭٭

-١١-[٢]

ســــیمین بەرانـــــەن، ســــیمین بەرانــــەن
قیبلـــەم ســـەر ڕەوێـــڵ ســـیمین بەرانـــەن[٣]

نـــازەنین شـــێوەی لـــەب شـــەکەرانەن
بـــۆی موشـــکین کـــڵاف زڵـــف عەنبەرانـــەن[٤]

---

١- نەشی: نەڕۆیی، نەچوو. گەردەن: مل. نەشیم نە گەردەن: نەچووە ملم. تـایێ: تاڵێـک. سـەودا: فکر و خەیاڵ. واتە: تاڵێک لە زوڵفانە هەر نەکەوتە ملم و هەر تاڵێکی لێم بوو بە خەیاڵێک. (دایـم وام بە فکر و خەیاڵی ئەو زوڵفانەوە کە لەبەرچی تاڵێکیان نەکەوتـە ملـم و بمخنکێنـێ و بـە تـاڵی زوڵفی یار گیانم لە دەس بدەم).

-١١-

٢- ک.

٣- سیمین: لە جنسی زێو (نوقرە)، لێرەدا واتە سپی. بەر: ڕوو، سینە. ڕەوێڵ: دەستە. سەر ڕەوێـڵ: سەر دەستە. واتە: قیبلەم سەر دەستەی سینە (ڕوو، ڕوومەت) سپیانە.

٤- لەب: لێو. لەب شـەکەر: ئەوانەی کە لێویان وەک شەکەر شیرینە، قسە خۆش. موشکین: ڕەش و بۆنخۆش بە وێنەی موشک. کڵاف: پەلکە. واتە: نازەنینە و شێوەی لە لێو شەکەران دەچێ و بۆنی زوڵفە ڕەشەکانی بۆنی پەلکەی ئەوانە دەدات کە زوڵفیان لە عەنبەر دەچێت.

ئــــەبرووش قیبلـــەگای حـــەق پەرەســـتانەن
قامـــــەت قیامـــــەت ئـــیمان ئەســـتانەن[١]

پادشـــــای ســـــەرتەخت دیدەمەســـــتانەن
بـــێ‌ڕەحمتـــەر جـــە قـــەوم کافرســـتانەن[٢]

زڵـــف وێنـــەی ســـونبوڵ جـــە گوڵســـتانەن
گونـــا گـــوڵ تەبـــەق هەزاردەســـتانەن[٣]

گـــەردەن ســـوراحی بـــاغ ڕێزوانـــەن
ڕازیـــم بـــە ڕەزا ســـونع یەزدانـــەن[٤]

١- ئەستان: سێنەر. واتە: بڕۆی قیبلەگای حەق پەرەستان و قامەتی قیامەتێکە کە ئیمان لە ئیمانداران ئەسێنێ.

٢- واتە: پاشای چاو مەستانە و لە خەڵکی کافرستانی بێ ڕەحمترە.

٣- زڵف: زوڵف. سونبوڵ: سمڵ، گوڵێکی جوان و بۆنخۆش. گوڵ تەبەق: دەستە گوڵ، گەڵای گوڵ. هەزاردەستان: بولبول. واتە: زوڵفی بە وێنەی گوڵی سونبوڵی ناو گوڵستانە و ڕوومەتی دەستەگوڵە بۆ بولبولێکی وەک من.

٤- گەردەن: مل. سوراحی: تۆنگ یا پارچێکی شووشەیی ملبارێک کە شەرابی تێدەکەن. باغ ڕێزوان: باخی بەهەشت. سونع: دەستکرد. یەزدان: خودا. واتە: ملی هێندە بەرزە کە لە ملی سوراحی باخی بەهەشت دەچێ و ڕازیم بە ڕەزای خودا چونکە دەستکردی خۆیەتی.

سـەرتاپا بـێ عـەیب لـەب خەندەرانـەن
سـپەردەی تـۆم کـەرد یـا حـەق ئامانـەن[1]

***

١- لەب خەندەران: لێو بە پێکەنین. واتە: سەرتاپا بێ عەیبە و دایم لێو بە پێکەنینە، خودایا ئەوە دام بە دەستی خۆت، ئاگات لێ بێت.

-١[١]-

شـــای سۆســـەن خـــاڵان، شـــای سۆســـەن خـــاڵان
مایـــەی ڕێحانـــان، شـــای سۆســـەن خـــاڵان[٢]

کـــــەردەنش بـــــە زێـــــد بـــــورج کۆســـــاڵان
دیـــــنش ســـــەرمایەی دڵ کـــــەردەن تـــــاڵان[٣]

جـــــە زڵفـــــش دەســـــتەی بـــــەڕەزا وەســـــتەن
جـــــە دیـــــدەش دیـــــدەی نەرگســـــان مەســـــتەن[٤]

-١-

١- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٢- سۆسەن: سووسەن، سوێسنە، گوڵێکی جوان و بۆنخۆش. ڕێحان: لێرەدا واتە هەر گوڵێک بـۆنی خۆش بێت. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا پێکەوە دێن.

٣- کەردەنش: کردوویە. زێد: شوێنی لە دایک بوون، نیشتمان، وەتەن. بورج: شوێنێک لـە ئاسـمان کە ئەستێرە لەوێوە هەڵدێت، لێرەدا بە مانای بەرزە. کۆساڵان: کەشێکی بـەرز لـە هـەورامان. دیـن: دیتن، بینین، چاوپێکەوتن. واتە: شای ئەوانەی کە خاڵیان لە سوێسنە دەچێ و ئەوەی کـە ڕێحانـان بۆنخۆشی لەوەوە دەگرن، بەرزی کۆساڵانی کردووە بە شوێنی خۆی و دیتنی سەرمایەی دڵی بـە تـاڵان بردووە.

٤- وەستەن: خوازراوە. نەرگس: گوڵێکی جوان. واتە: بەڕەزا زوڵفانی ئەوی دیتووە کە وەها بـووە بـە دەستە و نەرگس چاوانی بەو کەوتووە مەست بووە.

سـولْتان سۆسـەن، تـەخت سـولْتانی
شـیەن نـە مەزهـەب خـاڵ مولْتـانی[١]

گـوڵان ڕەنـگ ڕەنـگ نـازار دڵگیـر
وەفـراوان نیـان وە پاشـان زەنجیـر[٢]

نـەبا جـە ناگـا دوور گنـان جـە لاش
نـەبا وەخـت سـەیر فـەرش قـەدەمگاش[٣]

گـاهێ مـەیرش بـۆ وە سـەیران گـوڵ
پـا نـەنیۆ وە بـووم، بنیـۆ بـان گـوڵ[٤]

---

١- سولْتان: پادشا. شیەن: ڕۆیشتووە. مولْتـان: نـاوی شـارێکە لـە وڵاتـی پاکسـتان کـە ئـەو کـات حاکمەکەی «ابوالفتح» ناوێک بووە و لە سەر مەزهەبی «باتنی» بووە و پەیڕەوی بەو مەزهەبـە داوە و سولْتان مەحموودی غەزنەوەی هێرشی بردووەتە سەری و لەوێ هەڵیکەندووە. واتە: گوڵـە سوێسـنە کە خۆی پاشای گوڵانە و وا بە سەر تەختی پاشـایەتییەوە و خـاڵانی یـاری بـۆ خـۆی هـەڵبژاردووە و دەستی لە سولْتان بوون کێشاوە. لێرەدا بێسـارانی گـوڵی سوێسـنی بـە سـولْتان مـەحموود و خـاڵی یاریشی بەو حاکمە مولْتانییە شوبهاندووە و دەڵێت سولْتان ڕۆیشتووە و مەزهەبی مولْتانی بۆ خـۆی گرتووە.

٢- وەفراو: بەفراو. نیان: ناوە. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٣- نەبا: نەکا، نەوەکوو. دوورگنان: دووریکەونەوە. قەدەمگا: شوێنی هەنگاو. واتە: بەفراو زنجیـری بەستووە بە پێی گوڵی جوان و ڕەنگاوڕەنگ و دڵگیرانەوە نەوەکوو لە ناکاو لێی دوور بکەونەوە و کاتێ ئەو دێت بۆ سەیران گوڵەکان لەوێ نەبن و نەبن بە فەرشی ژێر پێی.

٤- مەیر: مەیل. بووم: گۆی زەوی، خاک. نەنیۆ: نەنێت. بنیۆ: بنێت. واتە: ئەگەر جارێک ☞

شـــیرین لـــەیلێوەن، ســـپەردەی وەیـــس بـــۆ
چـوون لـەیلێ ڕەنگـەن بـا یـەکێش قـەیس بـۆ[1]

✲✲✲

-٢[2]-

شـــای کەمـــەرلاڵان، شـــای کەمـــەرلاڵان
ڕوێ ئـــاخێز کـــەرد شـــای کەمـــەرلاڵان[3]

---

☜ دڵی پێوە بێ بێت بۆ سەیرانی گوڵان با پێ لە سەر خاک دانەنێت و پێ لە سەر گوڵان دابنێت. لە زۆربەی نوسخەکاندا بە جێی «بان گوڵ»، «وە ڕووی گـوڵ» نووسـراوە بـەڵام بـەو جـۆرە شـێعرەکە سەروای نییە.

١- وەیس: پیاوچاکێـک بـووە. چـوون: چونکـە، لـە بـەر ئـەوە. قـەیس: خۆشەویستەکەی لـەیلی، مەجنوون. واتە: لەیلێکی شیرینە، بسپێردرێ بە وەیس باشە با ئـەو ئاگـای لـێ بێـت. چونکـە بـە وێنەی لەیلایە و با کەسێکی (وەک من بێ و) بۆی ببێ بە مەجنوون.

-٢-

٢- ئەم پارچە شێعرە تەنیا لە نوسخەی «ل»دا و لە نێـو شـێعرەکانی بێسـارانیدا هـاتووە و شـێوازی شێعرەکەیش بە شێوازی بێسـارانی دەخـوات. هـەر وەهـا لـە لاپـەڕەی ١٩٩ی کتێبـی «کەشـکۆڵی هەورامان»ی مامۆستا «موحەممەد ڕەشید ئەمینی»دا هەر بە پێی نوسخەی «ل» هاتووە.

٣- لاڵ: لـەعل، بـەردێکی سـووری بـە نـرخ. کەمـەرلاڵ: هـەم دەتـوانێ بـە مانـای ئـەوە بـێ کـە کەمەربەندێکی وەک لەعلی بەستووە و هەم دەتوانێ بە مانای ئەوە بێ کەمەری بـە وێنـەی لـەعل سوور و جوانە. ئاخێز کەرد: هەستا. واتە: یـارم کـە لـە شـای کەمـەرلاڵان دەچـێ ڕۆژێـک هەسـتا. (هەستا پێ.)

بـــه عـــــەزم تـــــەواف چـــــەنی نـــــەوهاڵان
ڕووش کـــەرد نـــە بارگـــەی بـــەرز عەبـــداڵان[١]

حازر کەرد پــەی وێـش چەنـد مـەتای سـەنگی
ئەتڵـــــەس و کیمخـــــا، دیبـــــای فـــــەرەنگی[٢]

١- چەنی: لەگەڵ. نەوهاڵان: تازە پێگەیشتووان. بارگە: بارەگای خاسانی خـودا. ڕووش کـەرد: ڕووی کرد. عەبداڵان: کۆی «عەبداڵ» بە مانای کەسانێک کە ئەولیای خودان و حەوت یا حەفتا کەسـن و دایم لە سەر زەمیـنن و کـەم نابنـەوە و ئەگـەر کەسێکیان لـێ بمرێـت کەسێکی دیکـە جێگـای دەگرێتەوە. هەر وەها ناوی کێوێکە لە هەورامان کە دەکەوێتە پشتی دێی «دەرەوکیێ» و هەروەها کە «سـەیدی هـەورامی» لـە پارچـە شـێعری «چـوون کـۆی عـەوداڵان»دا باسـی دەکـات، ئـەو کێـوە ئەشکەوتێکی تێدایە کە بارەگای حـەوت عـەوداڵانی تێدایـە و خـەڵک بـۆ گەیشـتن بـە مـوراد و ئاواتەکانیان دەچنە ئەوێ و لێیان دەپاڕێنەوە. هەر وەها ناوی شوێنێکە لە «کۆساڵان»دا کە «حـەوت عەوداڵان»ی پێی ئەڵێن و بە پێی بەیتە دواییەکان مەبەستی بێسارانی هەر ئەو شـوێنەیە. واتـە: یارم لەگەڵ تازە پێ گەیشتوان هەستا کە بڕوا بۆ تەواف و ڕووی کردە بارەگای بەرزی عەوداڵان.

٢- پەی وێش: بۆ خۆی. مەتا: مەتاع، کاڵا، کەل و پـەل. لێـرەدا بـە واتـای جـل و بەرگـە (لیبـاس). سەنگی: وا دیارە جۆرێک دروستکراوی پارچە بووبێت، دەکرێ کورت کراوەی «سەنگین»یش بێت بـە مانای گران. ئەتڵەس: پارچەیەکی تـووک دارە کـە لـە هەورێشـم دروسـت دەکرێـت. کیمخـا: جـۆرە پارچەیەکی هەورێشمییە کـە پوولەکـەی زێـڕی لـێ دەدەن. دیبـا: پارچـە، قوماش. فـەرەنگی: لـە فەرەنگەوە هاتووە، غەربی، بیانی. واتە: هەندێ جل و بەرگی بۆ خۆی حازر کـرد کـە ئەمانـە بـوون: ئەتڵەس، کیمخا، و پارچەی فەرەنگی.

دیــدەش بــە ســورمەی ســوبحان ســیا کــەرد
دوو زڵفــش تاتــا جــە هــەم جیــا کــەرد [١]

پەخشان کەرد نە دۆش سەد گیسووی موشکین
کــەش و کــۆ تــەمام بــی بــە ســەحرای چــین [٢]

پــەی دیــدەی بــەدان نــە قــۆڵ بەســت قۆڵبەنــد
ئایــەی «یــەکادوو» هــەم پــەرێ وێــش وەنــد [٣]

چــەنی نــازداران، قیبلــەی مایــەفــەڕ
ڕووش کــەرد نــە بارگــەی عەبــدالان بــەڕ [٤]

---

١- سورمە: کلە. سورمەی سوبحان: کلەی کێوی توور. سیا: ڕەش. واتە: چاوانی بە کلەی کێوی توور ڕەشت و دوو پەلکەکەی لێک جودا کردەوە (هەر کامی خست بە لایەکدا).

٢- دۆش: پشت مل تا سەر پشت. پەخشان کەرد: بڵاو کردەوە. گیسوو: زوڵف. موشکین: ڕەش و بۆنخۆش بە وێنەی موشک. سەحرای چین: دەشتی وڵاتی چین کە ئاسکی موشکیان هەیە. واتە: سەد پەلکەی ڕەش و بۆنخۆشی خستە نێوشانی و لە بۆنخۆشیدا کەش و کێوی کرد بە دەشتی وڵاتی چین.

٣- پەی دیدەی بەدان: بۆ ئەوەی لە چاوی پیس بە دوور بێ. قۆڵبەند: چاوەزارێک کە دەیبەستن بە باڵەوە بۆ ئەوە نەبن بە چاوەوە. یەکادوو: مەبەست ئایەکانی ٥١ و ٥٢ی سوورەی «قەڵەم»ـە: «وَإِن يَكادُ الَّذِينَ كفَرُوا لَيُزْلِقُونك بِأَبْصَارِهِمْ لَماَّ سَمِعُوا الذِّكرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾ وَمَا هُوَ إِلاَّ ذِكرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٥٢﴾». پەرێ وێش وەند: بۆ خۆی خوێندەوە. واتە: لە بەر چاوپیسان چاوەزاری بە قۆڵیەوە بەست و ئایەی چاوەزاری بۆ خۆی خوێندەوە تا نەبێت بە چاوەوە

٤- چەنی: لەگەڵ. مایە: هۆ. فەڕ: پلە و پایە بەرز. بەڕ: وشکانی، کەش و کێو. واتە: قیبلەم ☜

یـــا هـــەفت عەبـــدالان بـــەرز پەڕســـتەم
مـــەحبوویان شـــای بـــێتـــەناف حـــەرەم[١]

نـــە ئاســـانەتان قیبلـــەی موشـــکمایـــە
ئامـــــان بلاڵـــۆ ئـــەو پـــەرێ وایـــــە[٢]

هـــەر ســـاعەت جـــە نـــۆ پایـــەتان بـــەرز بـــۆ
مەتڵـــەبتان جـــە لای خوداوەنـــد عـــەرز بـــۆ[٣]

حـــەرفتان چـــوون ســـەیف قـــاتع بـــڕان بـــۆ
نوورتـــان چـــوون نـــار گـــڕان گـــڕان بـــۆ[٤]

---

که هۆی پله و پایه بەرزییه لەگەڵ نازداران ڕووی کرده بارەگای عەودالانی کەش و کێو.

١- پەڕستەم: لێرەدا واته سەخت. مەحبووب: خۆشەویست. حەرەم: بارەگا. شای بێتەناف حەرەم: پاشایەک که بارەگای بێتەناف و کۆڵەکه وەستاوە، خودا. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا پێکەوە دێن.

٢- ئاسانه: بەردرگا. موشک مایه: کەسێ که مایەی موشکی پێیه بۆ بۆنخۆشی. بلاڵۆ: بلاڵێتەوە، بپاڕێتەوە. پەرێ: بۆ. وایه: ئاوات، ئارەزوو. واته: ئەی حەوت عەودالان کە بارەگاتان وا بەو کەشە بەرز و سەختەوە (کۆسالان) و خۆشەویستی درگانەی خودان، ئەوە قیبلەم کە مایەی موشکی پێوەیە هاتووەتە درگاتان تا بۆ گەیشتن بە ئاوات و ئارەزووی لێتان بپاڕێتەوە.

٣- جە نۆ: لە نوێ، لە هەوەڵەوە. بەرز بۆ: بەرز بێت. مەتڵەب: تکا، داواکراو. عەرز: دیار، نیشان دراو، بە برەو، قەبووڵ کراو. واته: سەعات بە سەعات پله و پایەتان بەرز بێت و تکاتان لە لای خودا بە برەو بێ و بگاتە جێ.

٤- حەرفتان: قسەتان. چوون: وێنەی، وەکوو. سەیف: شمشێر. قاتع: تیژ. بڕان: تیژ. نار: ئاگر.

چوونکـــــه نەوهاڵـــــەن تـــــازە ڕەســـــیدەن
تـــــاڵی ڕۆزگـــــار هـــــێما نەدیـــــدەن[١]

بڎەیـــــدێ مـــــوراد شـــــای نۆنـــــەمامان
دڵشـــــاد کیانـــــدێش ئامـــــان ســـــەد ئامـــــان[٢]

***

-٣[٣]-

شـــــکۆفیان گـــــوڵ، شـــــکۆفیان گـــــوڵ
خـــــاس ئامـــــان وەهـــــار، شـــــکۆفیان گـــــوڵ[٤]

---

☜ گڕان: بە گڕی زۆرەوە. واتە: قسەتان بە وێنەی شمشێری تیژ بە بڕشت بێ و نوورتان بـە وێنـەی ئاگر دایمە گڕی بەرز بێت و خامۆش نەبێت.

١- نەوهاڵ: تازە پێ گەیشتوو. تازە ڕەسیدە: تازە پێ گەیشتوو. هـێما: هێشـتا. نەدیـدەن: نـەدیوە. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دواییدا پێکەوە دێن.

٢- بڎەیدێ: بدەن. کیاندێش: بنێرن، بنێرنەوە. واتە: چونکە تازە پێگەیشتووە و هێشتا تاڵی ڕۆژگاری نەچێشتووە موورادی شای نۆنمانان بدەن (مورادی بـە جـێ بێـنن) و ئامـان سـەد ئامـان بـە دڵشـاد بینێرنەوە. لە نوسخەی «ل»دا بە جێی «کیاندێش»، «کیاندێ» نووسراوە کە دیـارە هەڵـەی نوسـخە نووسینەوەیە و ئەبێ «کیاندێش» بێت.

-٣-

٣- ک، ئێ ، س، ڕ، ب، ح.

٤- شکۆفیان: هەڵاڵەی کردووە، پشکووتووە. ئامان: هاتووە. واتە: بڕوانـە بـەهار چ خـاس هـاتووە و گوڵان ڕواون و پشکووتوون.

هــەر یــەک بــە ڕەنگــێ بــەرئامان جــە گــڵ
بــــــەڵێ مــــــەخێزۆ جێشــــــان دەرد دڵ[١]

وەلــێ بــە بــێ یــار مەذیــەو پێشــاندا
چــــمان دڵ مــــەذان وە ســــەر نێشــــاندا[٢]

یــانێ هــەر پێســەن دایــم گەشــت دڵ
یــار بــێ گــوڵ وەشــەن، بــێ یــار وەش نــی گــوڵ[٣]

⁂

-٤[٤]-

شــــەراب گوڵڕەنــــگ، شــــەراب گوڵڕەنــــگ
شــــەرابێم دەرخــــوان یــــاقووتی و گوڵڕەنــــگ[٥]

---

١- بەرئامان: دەرهاتووە، ڕواوە. بەڵێ: بەڵام. مەخێزۆ: هەڵدەستێ. جێشان: لێیان. واتە: هەر یەکیان بە ڕەنگێ لە خاک دەرهاتووە، بەڵام دەردی دڵیان لەگەڵ هەڵدەستێ.

٢- وەلێ: بەڵام. مەذیەو: دەڕوانم، سەیردەکەم. پێشان: لێیان. چمان: پێم وایە، لام وایە، وابزانم. مەذان: ئەدەن. نێش: نووکی تیژ، چزە. واتە: بەڵام چونکە یارم لەگەڵیاندا نییە ئەگەر سەیریان ئەکەم وا ئەزانم دڵم ئەدەن بە سەر دڕوودا.

٣- یانێ: واتە. هەر پێسەن: هەروایە. گەشت: سەیران. نی: نییە. واتە: یانی دایمە سەیرانی دڵ وەهایە و ئەگەر یار ببێ و گوڵیش نەبێ هەر خۆشە بەڵام بەبێ یار سەیرانی گوڵیش خۆش نییە.

-٤-

٤- ک، نێ، س، ڕ، ب، ح.

٥- گوڵڕەنگ: بە ڕەنگی گوڵ سوور. شەرابێم: شەرابێکم. دەرخوان: دەوێ، گەرەکە، هەرەکە. ☜

ئەگــەر قــەترێو جــێش بتکیــۆ وە ســەنگ
ســەنگ دەردەدار بــۆ پــێش بــەیۆ وە دەنــگ[١]

نــەک ئــەو شــەرابی فــام جــە ســەر بــەر بــۆ
شــەرابێ دڵ پــێش مووشــکافکــەر بــۆ[٢]

ســـاقییێم دەرخـــوان ئـــەر بـــدۆ شـــەراب
غــەیر جــە پــارەی جــەرگ هــیچ نــەبۆ کــەباب[٣]

کــەی بــۆ دۆڵــی بــۆ جــەی شــەراب جــامێ؟
بـــدەرۆ بـــە کـــام، بوینـــوو کـــامێ[٤]

☆☆☆

یاقووتی: بە ڕەنگی یاقووت، سوور. واتە: شەرابێکم دەوێ بە ڕەنگی گوڵ و یاقووت بێت.

١- قەترێو: دڵۆپێک. بتکیۆ: بتکێت، برژێت. جێش: لێی، لەو. بەیۆ: بێت. واتە: ئەگەر دڵۆپێک لەو شەرابە بتکێتە سەر بەرد، دەردەدار بێت و پێی بێتە دەنگ.

٢- فام: زانایی. مووشکاف: وردبین. واتە: نە ئەو شەرابە بێت کە فام و هۆش لە سەر ببات بەڵکوو ئەو شەرابە بێت کە دڵ وردبین بکات.

٣- ساقی: مەیگێڕ. دەرخوان: دەوێ، گەرەکە، هەرەکە. بدۆ: بدا. پارە: لەت لەت. واتە: مەیگێڕێکم دەوێ کاتێ شەرابێکم پێ بدات بێجگە لە لەتی جەرگی خۆم هیچی دیکە نەبێ بە کەباب بۆ مەزەی شەراب.

٤- دۆڵی: پڕ، دەتوانێ بە مانای جامی گەورەیش بێت. کام: ئارەزوو. واتە: کەی بێ جامێ لەم شەرابە پڕ بێت و بە ئارەزوو پێم بدات و بە ئارەزووی خۆم بگەم.

-٥-[١]

شـــەماڵ! بـــە حـــاڵم، شـــەماڵ! بـــە حـــاڵم
شـــەماڵ بـــێ مـــروەت، بـــزان بـــە حـــاڵم[٢]

شـــۆ وە ئاســـتانەی شـــای بوڵەنـــد مـــاڵم
مـــەعلووم کـــەر جـــە لاش زەلیلـــی حـــاڵم[٣]

واچـــە دیـــم بەنـــدەی جـــە وەتـــەن بڕیـــا
بـــــاهر هێجـــــران ســـــۆچیا و گڕیـــــا[٤]

ئەگـــەر جێـــت پەرســـۆ چ تـــەورەن حـــاڵش
واچـــە دوور جـــە تـــۆ وێرانـــەن مـــاڵش[٥]

---

-٥-

١- ئەم پارچە شێعرە تەنیا لە نوسخەی «ل»دا هاتووە. لە «کەشکۆڵی هەورامان»یش دا هەر بە پێی ئەو نوسخە هاتووە.

٢- مروەت: پیاوەتی، لێرەدا واتە ڕەحم. بزان: بزانە. واتە: ئەی شەماڵی بێ ڕەحم وەرە بزانە حاڵم چۆنە.

٣- شۆ: برۆ، بچۆ. ئاستانە: بەردرگای ماڵ. بوڵەند ماڵ: لێرەدا واتە پایەبەرز. مەعلووم کەر: ئاشکرا بکە، پێی بڵێ. واتە: برۆ بۆ بەر درگای ئەو یارە پایەبەرزە و زەلیلی منی پێ بڵێ.

٤- واچە: بڵێ، بێژە. بڕیا: براو. باهر: بە ئاگر. هێجران: دووری یار. سۆچیا: سووتا. واتە: بڵێ ئەو بەندەتم بینی کە لە زێد و نیشتمانی خۆی دابڕاوە و بە ئاگری دووری یار گڕی گرتووە و دەسووتێ.

٥- جێت پەرسۆ: لێت بپرسێت. واچە: بڵێ، بێژە. وێرانەن ماڵش: ماڵی وێرانە. واتە: ئەگەر لێتی پرسی حاڵی چۆنە بڵێ لە دووری تۆ ماڵی وێران و کاولە.

ئــــەر وەش هــــەواڵێ ئــــاوەردی وە یــــاڎ
وەرنــە تــۆ وەش بــی عــومرش شــی وە بــاڎ[١]

***

-٦[٢]-

شــەماڵ! ڕەزای حــەق، شــەماڵ! ڕەزای حــەق
شــــەماڵ شــــەریف، وە ڕووی ڕەزای حــــەق[٣]

ئێمشــەو تــا پــەردەی شــەبەق مــەبۆ شــەق
شــۆ وە ئاســـتانەی جــەمین گــوڵ تەبــەق[٤]

---

١- ئەر: ئەگەر. وەش هەواڵێ: هەواڵێکی خۆش. ئاوەردی: هێنـات. وەرنـە: ئـەگینا، ئـەینا. شـی: ڕۆیشت. شی وە باڎ: با بردی، چوو بە بادا، فەوتا. واتە: بڵێ ئەگەر تۆ هـەواڵێکی خۆشـی بێنیتـەوە بیر و من بۆی ببەم ئەوە باشە ئەگینا تۆ خۆش بی، عومری با بردوویە و نەماوە.

-٦-

٢- ج.

٣- شەریف: پلە و پایە بەرز. وە ڕووی ڕەزای حەق: لە بەر ڕەزای خـودا. مانـای ئـەم بەیتـە لەگـەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٤- شەبەق: شەفەق، ڕوون بوونەوەی قەراخی ئاسمان (کاتی نوێژی بەیانی). مەبۆ: دەبێ. شەق: دوو کەرت، تەرەکین. شۆ: برۆ، بچۆ. ئاستانە: بەر درگا. جـەمین: ڕوومـەت، تـەوێڵ، نێـو چـاوان. گـوڵ تەبەق: دەستە گوڵ. واتە: ئەی شەماڵی پلە و پایە بەرز لە بەر ڕەزای خـودا ئێمشـەو پـێش هـەتاو کەوتن و ڕوون بوونەوەی هەوا برۆ بۆ خزمەتی ئەو یارەی کە ڕووی بە وێنەی دەستە گوڵە.

سوب، هێمای سۆمای شەمس خاوەری
بەرنەشۆ نە بورج تاق ئەخزەری [١]

نەخێزۆ نە فەرق زەمین ڕەنگ شەو
نەبا بێدار بان بەدکاران نە خەو [٢]

دەخیلم شەماڵ با کەس نەزانۆ
وەر جەوەی سۆفی سەڵای سوب وانۆ [٣]

حازر بای نە پای شای وەفاداران
زار زار بگرەوە زەلیل زاران [٤]

---

١- سوب: بەیانی زوو. هێما: هێشتا. سۆما: نوور، ڕۆشنایی. شەمس، هەتاو. خاوەر: ڕۆژهەڵات. بەر نەشۆ: هەڵنەیەت. بورج: شوێنی هەڵهاتنی ئەستێرە لە ئاسماندا. ئەخزەر: سەوز. تاق ئەخزەری: ئاسمان. واتە: بەیانی زوو پێش ئەوەی کە هەتاو هەڵبێت و لە ئاسمان دیاری بدات.

٢- نەخێزۆ: هەڵنەیەت. فەرق: سەر. نەبا: نە وەک. بێدار بان: لە خەو هەستن. واتە: هێشتا ڕەنگی ڕەشی شەو لە سەر زەوی هەڵنەگیرابێ (ڕۆژ نەبووبێتەوە) نە وەک بەدکاران لە خەو هەستن.

٣- دەخیلم: دەستم بە دامانت. نەزانۆ: نەزانێت. وەر جە وەی: پێش ئەوەی. سەڵای سوب: بانگی بەیانی. واتە: شەماڵ دەستم بە دامانت باکەس نەزانێ و پێش ئەوەی سۆفی بانگی بەیانی بدات برۆ بۆ لای یار.

٤- حازر بای: حازر بیت. زار: لارەمل. بگرەوە: بگری. واتە: لە بەر قاپی شای وەفاداراندا بە وێنەی لارەمل‌ترین لارەمل بگریت.

شـــەماڵ شـــەريف! ئامانـــەت فـــەرز بـــۆ
جاســـتانەی قيبلـــەم فـــەغانت بـــەرز بـــۆ [١]

لازم، ئەگـــەر شـــەرت ئێقـــراری پێشـــەن
مەپەرســـۆ شـــەماڵ زاری تـــۆ چێشـــەن؟ [٢]

واچـــە ســـەوڵ ســـاف! ســـاوای بـــەر ئـــاوان
شـــۆخ چـــەم ســـيای نـــازار بـــاوان [٣]

ئـــەو مەجنوونەكـــەی وێـــڵ خـــاڵ تـــۆ
ئـــەو دێوانەكـــەی لێـــو لاڵ تـــۆ [٤]

---

١- ئامان: ئاگات لێ بێت. جاستانە: لە بەر درگای. فەغان: هاوار و ناڵە لە كاتی گریاندا. بەرز بۆ: بەرز بێت. واتە: ئەی شەماڵی پلە و پایە بەرز، ئاگادار بە باوەكوو ئەمەت لە لا فەرز بێت و لە بـەر درگای قيبلەمدا دەنگی گريانت بەرز بێت.

٢- ئێقرار: قەوڵ و قەرار. پێشەن: پێیەتی. مەپەرسۆ: دەپرسێت. چێشەن: چییە. واتـە: پێویسـتە ئەگەر شەرت و وەفای مابێت دەپرسێ و ئەڵێ ئەی شەماڵ ئەم گريان و شيوەنەت لە بەر چییە.

٣- واچە: بڵێ، بێژە. سەوڵ: گیایەكی جوانە كە گـوڵی زەرد و سـوور و وەنەوشـی هەیـە. سـاوا: تـازە پێگەیشتوو. شۆخ: جوان. چەم سیا: چاو ڕەش. باوان: ماڵی باوک. واتە: بڵێ ئـەی ئـەو یـارەی كـە باڵات لە وێنەی سەوڵی تازە پێ گەیشتووی بەر ئاوە، ئەی جوانی چاو ڕەشی نازداری ماڵە باوان.

٤- لاڵ: لەعل، بەردێكی بە ڕەنگی سووری كاڵ. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا پێكەوە دێن.

چـــەنی مەینـــەتان دەرد و داغ نـــە دڵ
تـۆ سـەلامەت بـای، حەسـرەت بـەرد وە گـڵ[١]

☆☆☆

-٧-[٢]

شـــەماڵ! مـــوداران، شـــەماڵ! مـــوداران
شـەماڵ! بـێ مـروەت، چوونـت مـوداران؟[٣]

بشـــۆ وە زامـــن وە لای گشـــت یـــاران
واچـــە پـــەرێمان هێممـــەت بـــڎاران[٤]

---

١- چەنی: لەگەڵ. بای: بی. واتە: بڵێ ئـەو مەجنوونـەی کـە وێڵـی خـاڵی تـۆ بـوو و شـێتی لێـوە لەعلەکانت بوو تۆ خۆش بی حەسرەت و داخی خاڵ و لێوەکـانتی لەگـەڵ ئـازار و مەینـەت و دەرد و داخی دڵدا بردە ژێر خاک.

-٧-

٢- ک، ئێ، س، م، ڕ، ب، ح.

٣- مودارا: ئارام بوون، ئۆقرە گرتن. بێ مروەت: بێ ڕەحم. چوونت: چۆنت. واتە: ئەی شـەماڵی بـێ ڕەحم و بەزەیی چۆن دەتوانی هێندە ئارام و بێ خەیاڵ بی؟

٤- بشۆ: برۆ. زامن: زێد، نیشتمان، وەتەن. گشت: هەموو، سەرجەم. واچە: بڵێ. پەرێمان: بۆمـان، بۆ ئێمە. هێممەت: خوداحافزی. بڎاران: بهێڵن، لێرەدا یانی خواستن. واتە: ئـەی شـەماڵ! بـرۆ بـۆ وەتەن بۆ لای هەموو دۆست و یاران و پێیان بڵێ خوداحافیزیمان لێ بخوازن. لە بەیتی دواییەکانـدا دەڵێ مەبەستی چییە.

هـــەر دەم بكـــەران دۆعـــای خـــەيرمان
كۆتـــا نەكـــەران دڵ جـــە مـــەيرمان[١]

جـــە دەســـت بـــەدڵان ڕەقيـــب كـــار گەســـت
جـــەو زێـــد و زامـــن دەســـتووريمان وەســـت[٢]

جـــە جـــەور و جـــەفای دنيـــای بـــێ بونيـــاد
ڕوومـــان كـــەرد نـــە چـــۆڵ هـــەرچی بادابـــاد[٣]

چوونكـــە نـــەگێلا چـــەرخمان بـــە كـــام
شـــەرتەن بنيـــەيمێ ســـەر وە موڵـــك شـــام[٤]

⁂

---

١- بكەران: بكەن. نەكەران: نەكەن. مەير: مێهر، خۆشەويستی. واتە: بڵێ هـەموو كـات دۆعـای خێرمان بۆ بكەن و دڵ لە خۆشەويستی ئێمە هەڵنەگرن و دايمە خۆشەويستی ئێمەيان لە دڵدا بێت.

٢- ڕەقيب: پاسەوان، چاوەدێر، لێرەدا بە واتای بەدخواز و دوژمن هاتووە. گەسـت: ناشـرين، ناحـەز، ناپاك. دەستووری: ئيزنی بە جێ هێشتن. وەست: خواست. واتە: لە بەر خراپەكاران و ڕەقيبی ناحەز و ناپاك ئيزنی بە جێ هێشتنمان خواست و بە جێمان هێشتن.

٣- جەور: ستەم. جەفا: سەختی و مەينەت. بێ بونياد: بێ بنەڕەت، بێ تان و پۆ. هەرچی بادابـاد: هەرچی ئەبێ با ببێ. واتە: لە بەر ستەم و سەختی و مەينەتی ئەم دنيا بێ بنەڕەت و هيچ و پووچە ڕوومان لە چۆڵ و بيابان كرد و وتمان هەرچی دەبێ با ببێ.

٤- نەگێلا: نەگەڕا، هەڵنەسووڕا. بە كام: بە دڵ بە ئارەزوو. بنيەيمێ: بنێين. شام: وڵاتـی شـام كـە دەكاتە سووريەی ئێستە. واتە: چونكە چەرخی ڕۆژگار بە ئارەزووی ئێمـە نەگـەڕا شـەرتە سـەرمان هەڵگرين و بڕۆين بۆ وڵاتی شام. مەبەست لە هێنانی وشەی «شام» دوور بوونی ئەو وڵاتەيە و ☜

-٨-[1]

شـــــەوان بێـــــداری، شـــــەوان بێـــــداری
دەرد بـــــێهامــــدەرد، شـــــەوان بێـــــداری[2]

ســـەیل ئەســـر هـــوون دیـــدەم بـــە زاری
مـــــەنمانۆ نـــــە ڕووم ڕەنـــــگ وەهـــــاری[3]

هەناســـــەم چـــوون بـــاد وەخـــت ســـوبحدەم
خـــــەیاڵ گوڵخونچـــــان مـــــاوەرۆ وە هـــــەم[4]

---

مەبەستی بێسارانی ئەوەیە دەبێ زۆر لە وڵاتی خۆم دوور بکەومەوە.

-٨-

١- ک، س، ئێ، ڕ، ب، ح.

٢- شەاوان بێداری: شەو نەنووستن، شەو نەخەوتن. واتە: لە بەر دەردی بێ هاودەردی شـەوان خـەوم نییە.

٣- سەیل: لافاو. ئەسر: ئەسرین، فرمێسک. هوون: خوێن. مەنمانۆ: دەنوێنێ. واتە: لـە بـەر ئـەو لافاوی فرمێسکانە کە لە چاوانم بە گریان دەڕژێ ڕەنگی ڕوخسـارم بـە وێنـەی ڕەنگی بـەهاری لـێ هاتووە. مەبەستی ئەوەیە کە فرمێسـکەکانم خـوێنین و کـاتێ دەڕژێن بـە سـەر ڕوخسـارمدا ڕەنگـی ڕوخسارم سوور ئەکەن.

٤- چوون: وێنەی، وەکوو. باد: با، وا. سوبحدەم: بەیانی زوو. گوڵخونچان: خونچەی گوڵان. ماوەرۆ وە هەم: کۆ دەکاتەوە. واتە: هەناسەم بە وێنەی «با»ی بەیانی خەیاڵی خونچەی گـوڵان کـۆ دەکاتـەوە و دەیهێنێ بۆ لام.

خـــەیاڵ گوڵخونچـــان مـــاوەرۆ نـــە دڵ
چـــمان دەروونـــم مـــەپێکان وە چـــڵ[1]

مەشـــــکاونۆوە نـــــە دیدەمــــەڎا
مـــەیان بـــە موژگـــان نەمیدەمـــەڎا[2]

بـــە روخســـارمدا مـــەپێکان تەبـــەق
جەوپـــەی وە دامـــان مەشـــانان وەرەق[3]

١ ماوەرۆ: دەهێنێ. چمان: لات وایە، وا دەزانی. مەپێکان: دەپێکن. چڵ: داری سەر تاشراو و تیـژ، لێرەدا مەبەست شتی تیژە. ئـەم وشـە لـە کاتێـکدا بـە کـار دەبرێـت کـە بیانـەوێ بڵـێن «درا» یـا «تڵیشیا» ئەڵێن «چوو بە چڵ دا». واتە: هەناسەم ئەو خەیاڵی گوڵخونچانەی کـە کـۆی کردوەتـەوە دەهێنێتە نێو دڵم. وەک ئەوەی دەروونمی پێ تڵیشا بێت. لە نوسخەکانی «ک» و «ئـێ» و «ر»دا ئەم بەیتە نییە.

٢- مەشکاونۆوە: شەق دەکا. مەیان: دێن. موژگـان: مـژۆڵ برژانـگ. نەمیـدە: لار بـوو. چـەماو. دەتوانێ بە مانای نەم دیدەیش بێ بە مانای تەڕ. واتە: خەیاڵی گوڵخونچەکان لە چاوم دا شەق دەبێ (دەتەقێت) و ئەبێ بە گوڵ و بە مژۆڵەکانمدا دێنە خوار.

٣- مـەپێکان: دەپێکن. تەبەق: دەستە. جـەو پـەی: لـە بـەر ئـەوەی. مەشـانان: دەوەشـێنن، بـڵاو دەکەنەوە. وەرەق: پەلی گوڵ، گەڵای گوڵ. واتە: کاتێ گوڵـەکان بـە مـژۆڵانمدا دێنـە خـوار لـە سـەر ڕوومەتم کۆ دەبنەوە پەل پەل دەبنەوە و دەرژنە داوێنم.

پـــەڕ وەرەق دامـــان، گوڵـــەن دەروونـــم

گـــوڵچین باخچـــەی دەرد مـــەجنوونم[١]

✵✵✵

-٩[٢]-

شـــەوق شـــەم بـــە وێـــش پەروانـــەیـــۆزەن

جەوپـــەی پەروانـــە پـــەڕ نـــە بەســـۆزەن[٣]

تـــا پـــەی پەروانـــە نمەســـۆزۆ شـــەم

پـــەروای پەروانـــە هـــیچ نمـــەبۆ کـــەم[٤]

---

١- واتە: داوێنم پڕە لە گەڵای گوڵ و دەروونم لە گوڵ و من گوڵچنی باخچەی دەردی مەجنوونم. ئەو دەردەی مەجنوون چاندی بە وێنەی باخچەیە و ئێستە من خەریکم گوڵەکانی دەچنمەوە. (بە کوردی و کورتی واتە من میراتگری دەردی مەجنوونم. «وەرگێڕ»).

-٩-

٢- ک، ئێ، س، ب، ڕ، ح.

٣- شەوق: ڕۆشنایی، نوور. بەوێش: زاتەن، بە سرووشتی خۆی. یۆز: دۆزینەوە، دۆز، خواز، ڕاکێش. جەو پەی: لە بەر ئەوە. پەڕ نە بەسۆزەن: پڕە لە سۆز. واتە: شەوقی شەم لە خۆیەوە ئەوەی هەیە کە پەپوولە دەدۆزێتەوە، بۆیە پەپوولە سۆزی بۆی هەیە و دەڕوا بۆ دەوری. لێرەدا بێسارانی باسی عاشق و مەعشووق دەکا کە شەم هێمای مەعشووقە و پەپوولەیش هێمای عاشق و دەیەوێ بڵێت کاتێک عاشق دەڕوات بۆ لای مەعشووق کە مەعشووق خۆی عەشق لە ناخیدا بێت و عاشق خواز بێت. لە سەرچاوەکانی«ح»، «ڕ»، «س» و «ب»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «چوون بێ پەروانە پەڕ نە بەسۆزەن».

٤- نمەسۆزۆ: ناسووتێ. پەروا: ترس، خۆف. نمەبۆ: نابێ. واتە: تا کاتێ شەم بۆ پەپوولە ☜

سـۆزای شـەم پـەریٚ پەروانـە بـیٚ شـۆن
وەرنـە پەروانـەی بـیٚ شـەم سـۆز جـە کـۆن[1]

وێـش بـە پەروانـەی ئـەو سۆزانشـەن
بـیٚ پـەروا پـەریٚ ئـەو یۆزانشـەن[2]

☆☆☆

☞ ناسووتێت، ترسی پەپوولە کەم نابێتەوە.

١- سۆزای: سووتان. بیٚ شۆ: بێ ئەندازە، بێ حەد و حەساب. وەرنە: ئەگینا، ئەینا. واتە: سووتانی شەم بۆ پەپولە بێ حەد و حەسابە ئەگینا ئەگەر شەم نەبێت تا بسووتێ بۆ پەپوولە، ئیتر پەپوولەیەک لە ئارادا نییە. (ئەگەر جەزب و ڕاکێشانێک لە لای مەعشووقەوە نەبێت ئیتر عاشقێک بوونی نییە).

٢- وێش: خۆی. سۆزان: سووتان. بیٚ پەروا: بێ ترس. پەریٚ: بۆ. یۆزان: خواستن، دۆزینەوە. واتە: شەوقی شەمەکە خۆی بە وێنەی پەروانەیە و شەمەکە بە گڕ بۆی دەگرێت بێ ترس و خۆف وا بە شوێنی ئەوەوە کە بیدۆزێتەوە. (عاشق خۆی بووە بە مەعشووق). (بە لای ئێمەوە ئەم بەیتە بە ڕێک و پێکی مانا بە دەستەوە نادا «حەبیبی»). لە نوسخەی «ئێ»دا ئەم بەیتە بەم جۆرە نووسراوە:

وێـش بـە پەروانـەی شـەم سۆزانشـەن　　بـیٚ پـەروا پـەروای ئـەو یۆزانشـەن

و لە سەرچاوەکانی «ح»، «ڕ»، «س» و «ب»دا بەم جۆرە نووسراوە:

دیـش کـە پەروانـە ئاوێزانشـەن　　بـیٚ پـەروا پـەریٚ ئـەو سۆزانشـەن

-١٠-[١]

شــــەوەن، خەڵوەتـــــەن، مـــــاڵ بــــێ ئـــەغیارەن
ئاڵـــــەم گــــــرد وتــــــەن، دۆس خەبــــەردارەن[٢]

☆☆☆

-١١-[٣]

شـــیرین بـــەڵا کـــەرد، شـــیرین بـــەڵا کـــەرد
ڕۆێ بــــەزم جـــــەزم، شــــوور بــــەڵا کـــەرد[٤]

ســـپای ســـام نــــە دەور دیـــدەش وەڵا کــــەرد
نەبــــەرد یەزیـــــد ڕۆی کەڵبـــــەڵا کـــــەرد[٥]

---

-١٠-

١- ئەم تاکە بەیتە لە سەرچاوەی «ب»دا هەیە و مەولەویش لە پارچە شێعری «بەزم هام فەردان یار مۆبەت کێش»دا تێهەڵکێشی کردووە.

٢- ئەغیار: کۆی «غەیر»ە بە مانای بێگانە، نامۆ. ئاڵەم: عالەم، دنیا. وتەن: خەوتووە. خەبەردارەن: بە ئاگایە. واتە: شەوە و دنیا چۆڵە و هیچ بێگانە و غەریبەیەک لە ماڵدا نییە و هەموو خەوتوون و تەنیا دۆست بە ئاگایە.

-١١-

٣- ک، ئێ، س، م، ڕ، ب، ح.

٤- بەڵا: موسیبەت، ناڕەحەتی، لێرەدا بە مانای شەڕە. ڕۆێ: ڕۆژێک. بەزم: بە عەزم. عەزم: نیەت کردن بۆ ئەنجامی کارێک. جەزم: بێ شک کارێک کردن، حەتمەن کارێک کردن. شوور: ئاژاوە. واتە: ڕۆژێک شیرین نیەتی کرد کە بە بێ شک شەڕ و ئاژاوە بکات.

٥- سام: هەیبەت، دەتوانێ بە مانای سامی کوڕی نەریمانی باوەگەورەی ڕۆستەمیش بێ کە لە☜

پۆشـــا بـــەرگ ســـاف ســـيای غـــەزەبناک
دڵ جـــە ڕەحـــم ڕای ڕەزای خـــوڎا پـــاک[1]

فـــەرمان دا بـــە قـــەتڵ ديـــڎە بـــێخـــاوان
نەفـــەس ناڵينـــان، چـــەم چـــوون ســـەراوان[2]

ئاســـتانەی وێـــش کـــەرد بـــە کەڵبـــەڵا جـــێ
چەنـــد شـــەهيد ســـاف خـــەڵتان خـــاک بـــێ[3]

---

☜ شاهنامەدا ناوی هاتووە. سپای سام: مەبەست مژۆڵەکانی یارە. وەڵا کەرد: بڵاو کردەوە. نەبەرد: شەڕ. یەزید: یەزیدی کوڕی موعاویە کە لە دەشتی کەربەلادا چوو بە گژ ئیمام حسەیندا و شەهیدی کرد. کەڵبەڵا: کەربەلا. واتە: لەشکری هەیبەتی (سام) بە دەوری چاوانیدا بڵاو کردەوە (مژۆڵانی) و شەڕێکی وەک ئەو شەڕەی یەزید لە کەربەلادا سازی کرد خستە ڕێ. لە سەرچاوەی «ب»دا بە جێی «سام»، «شام» نووسراوە کە بە بڕوای من بە هۆی هاتنی ناوی «یەزید» و «کەربەلا»ـەوە ئەوە دروستترە بەڵام لە بەر ئەوەی لە هەموو نوسخەکانی دیکەدا «سام» نووسراوە ئێمەیش هەر «سام»مان نووسی.

١- پۆشا: پۆشای، لە بەری کرد. سیا: ڕەش. غەزەبناک: تووڕەیی پێوە دیارە. ڕا: ڕێگە. واتە: جل و بەرگی سافی ڕەشی لە بەر کردووە و دڵی لە ڕەحم و ڕێگەی ڕەزای خودا پاک کردوەتەوە و ڕەحمی نەماوە.

٢- دیڎە بێ خاوان: ئەوانەی کە بێ خەون. واتە: دەستووری کوشتنی ئەوانەی دا کە بێ خەون و هەناسە کێشانیان ناڵەناڵە و ئەوانەی کە لە تاوی ئەسرین چاویان بووە بە سەراو (عاشقان). ئەم بەیتە لە نوسخەی «ک»دا نییە و لە نوسخەی «س»دا بە جێی «سەراوان»، «شتاوان» نووسراوە

٣- ئاستانە: بەردرگا. وێش: خۆی. کەرد: کرد. کەڵبەڵا: کەربەلا. خەڵتان: ئاوێتە، تێکەڵ، قاتی. واتە: بەردرگای خۆی بە وێنەی شوێنێکی وەک دەشتی کەربەلا لێ کرد و چەند شەهید ئاوێتە ☜

یەکێشان من بیم بە یەک دیانێ
نیشتەبێم نە دڵ هەزار پەیکانێ[١]

کەسێ سپای سام دیدەش بەی تەور بۆ
ئەر زڵفش پەخش بۆ، سا چوونش جەور بۆ؟[٢]

☆☆☆

-١٢-[٣]

شیرین! بەین نۆ، شیرین! بەین نۆ
مەر چەنی بەدان بەستت بەین نۆ؟[٤]

---

☜ و خەڵتانی خاک و خۆڵ بوون. ئەم بەیتە لە سەرچاوەکانی «ح» و «ڕ»دا نییە و لە سەرچاوەکانی «س» و «ب»دا بە جێی «کەڵبەڵا جێ»، «کەربەلای حسەین» و بە جێی «خاک بێ»، «خاک بین» نووسراوە.

١- یەک دیانێ: یەک دیتن، یەک چاو پێ کەوتن. پەیکان: نووکی تیژ. واتە: یەکێک لەو شەهیدانە من بووم کە تا چاوێکی لێ کردم هەزار تیری بە دڵمدا چەقاند.

٢- سام: هەیبەت. بەی تەور: بەم جۆرە. ئەر: ئەگەر. پەخش بۆ: بڵاو بێ، بڵاو بێتەوە. جەور: ستەم. واتە: کەسێ کە سپای سامی دەوری چاوانی بەم جۆرە بێ (مژۆڵەکانی وەها بکەن) ئەگەر زوڵفی بڵاو بێتەوە ئەبێ جەور و ستەمی چۆن بێت. لە سەرچاوەکانی «ح»، «س»، «ب»، «ڕ» و «م»دا بە جێی «سا چوونش جەور بۆ» نووسراوە «مەبۆ چ تەور بۆ».

-١٢-

٣- ک، س، م، ڕ، ب، ح.

٤- بەین نۆ: قەوڵ و قەراری نوێ. مەر: مەگەر. چەنی: لەگەڵ. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی ☜

زڵف ئەشەد کڵاف، خاڵان عەنبەربۆ
من بێبەینەتیم نەپنداشت جە تۆ [١]

ئەو ڕۆ ئێبتێدای عەهد و پەیمان بێ
پەیمانت بە عەهد لەیلێ وینان بێ [٢]

بە لەفز شیرین ئێقرارت مەکەرد
لاف بەین مەڎای، سەوگەندت مەوەرد [٣]

---

☞ دوایی دا پێکەوە دێن. لە نوسخەی «م»دا ئەم بەیتە بەم جۆرە نووسراوە:

ئازیزا! بیەن تۆ، ئازیزا! بیەن تۆ هەر چەنی بەڎان بەینت بیەن تۆ

١- زڵف: زوڵف، قژ، کەزیە. ئەشەد: ناوی گوڵێکی بۆنخۆشە. کڵاف: پەلکە. عەنبەر: ماکێکی (مادەیەکی) ڕەشی بۆنخۆش. بێ بەینەتی: بێ وەفایی. نەپنداشت: بیرم لێ نەکردبووە، چاوەڕێی ئەوە نەبووم، بە هیوای ئەوە نەبووم. واتە: ئەی ئەو شیرینەی کە پرچت بە وێنەی دەستەگوڵی ئەشەدە و خاڵانت لە عەنبەر دەچێت مەگەر لەگەڵ خرابەکاران بەینی نوێت بەستووە کە بەم شێوە لەگەڵ من بێ وەفای؟ من چاوەڕێی ئەوەم لە تۆ نەدەکرد. لە سەرچاوەکانی «ح»، «س»، «ڕ» و «ب»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «چوون بێ بەینەت بیت بێزیام جە تۆ».

٢- ئەو ڕۆ: ئەو ڕۆژە. ئێبتێدا: هەوەڵ، ئەوەڵ، سەرەتا، دەست پێ کردن. وینان بێ: دەبینرا، دیار بوو. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی دا پێکەوە دێن. لە سەرچاوەکانی «س»، «ڕ» و «ب»دا بە جێی «لەیلێ وینان»، «لەیلێ زەمان» و لە سەرچاوەی «ح»دا «لەیلای زەمان» نووسراوە.

٣- لەفز: قسە، وتە، بە دەم وتن، ئێقرار کردن، پێ هاتن. مەکەرد: دەکرد. لاف: قسەی زل کردن، خۆ هەڵکێشان. مەڎای: نەتدا، دەتدا. سەوگەند: قەسەم. واتە: ڕۆژی ئەوەڵی بەین بەستن، پەیمانی تۆم وەکوو ئەو پەیمانە هاتە بەر چاو کە لەیلا لەگەڵ مەجنوون بەستی، تۆ بە قسەی خۆش ئێقرارت دەکرد و لافی بەین بەستنت دەدا و سوێندی وەفاداریت دەخوارد.

مـــەواتت هـــەی قـــەیس! زام زەدەی مەینـــەت
کـــەس چـــوون مـــن نیـــەن بـــە وەفـــا و بەینـــەت [١]

منـــیچ بـــەو گوفتـــار خـــەیلێ بـــەردم ڕەنـــج
واتـــم مـــەر جـــە ڕەنـــج حاســـڵ ببـــۆم گـــەنج [٢]

ئـــاخر نـــە گـــەنج دیـــم، نـــە ســـوود نـــە مایـــە
ڕەقیـــب جاســـتانەت یـــاوا بـــە وایـــە [٣]

حاشـــا جـــە ئـــەلتاف لوتـــف خوداوەنـــد
ڕەنجبـــەر بـــێبـــەش بـــۆ، ڕەقیـــب وایەمەنـــد [٤]

***

---

١- مـەواتت: دەتکوت، دەتوت. قەیس: ناوی مەجنوون، (مەجنوون سیفەتی قەیس بـووە). کـەس چوون من نیەن: کەس بە وێنەی من نییە. واتە: دەتکوت ئەی قەیس! ئەی ئەو کەسـەی زامـدار و پێکراوی مەینەتی، هیچ کەس لە وەفاداریدا بە وێنەی من نییە و لە هەموو کەس وەفادارترم.

٢- واتم: کوتم، وتم. مەر: مەگەر، بەڵکوو، بەشکەم. حاسڵ ببۆم: بـە دەسـتم بێـت، بێتـە دەسـتم. واتە: منیش لەبەر ئەو قسانەی تۆ ڕەنجم زۆر کێشا و وتم بەڵکوو لە سـای ڕەنـج کێشـانەوە گـەنجم دەست بکەوێ (بە تۆ بگەم).

٣- ئاخر: لە کۆتاییدا، عاقیبەت. سوود: قازانج، بەهرە. مایە: دەس مایە، سامان. ڕەقیب: دوژمـن. جاستانەت: لە بەر درگات. یاوا: گەیشت. وایە: ئاوات، ئارەزوو. واتە: لە کۆتاییدا مـن نـە گـەنجم بینی نە قازانج و نە مایەکەی خۆیشم، ڕەقیب و دوژمـن لـە درگـات بـە ئـاوات و ئـارەزووی خـۆی گەیشت.

٤- حاشا: نینکار کردن. ئەلتاف: کۆی «لوتف»ـە بە مانای خۆشەویستی. ڕەنجبەر: نۆکەر، ☜

-١٣-[1]

شیرین! بەینت بەست، شیرین! بەینت بەست
بە یاذت مەیۆ ئەو ڕۆ بەینت بەست؟[2]

دەست ڕاست نیای نە ڕووی دیذەی مەست
تەبەسسومت کەرد، لێو لەعلت گەست[3]

مـن بە شەرت و بەین بەستەی جاناجان
تۆم کەرد بە سەنەم، وێم بیم بە ڕەهبان[4]

---

☜ کەسێک کە کار و بار و ئەرکی ماڵێکی بە سەرەوە بێت، لێرەدا بە گشتی واتە کەسێک کە ڕەنج بکێشێت. وایەمەند: بە ئاوات گەیشتوو، بە موراد گەیشتوو. واتە: حاشا، لە لوتف و گەورەیی خوداوە دوورە کە ڕەنجبەر بێ بەش بێ و دوژمن بە ئاوات بگات.

-١٣-

١- ک، س، ڕ، ب، ح.

٢- بە یاذت مەیۆ: دێتە بیرت، لە بیرتە. ئەو ڕۆ: ئەو ڕۆژە. واتە: شیرین ئەو ڕۆژەت لە بیرە بەینت بەست؟

٣- نیای: داتنا. تەبەسسوم: زەردە خەنە. لەعل: بەردێکی بە نرخی سووری کاڵە. واتە: دەستی ڕاستت لە سەر چاوی مەستت دانا و زەردە خەنەیەکت کرد و لێوی وەک لەعلت گەست.

٤- جاناجان: گیان گیانی. سەنەم: بوت. وێم بیم: خۆم بووم. ڕەهبان: عابیدی مەسیحی. واتە: من بە شەرت و بەینێکی گیانی تۆم کرد بە بوت و خۆیشم بە ڕاهیب. لە سەرچاوەکانی «ب»، «ڕ»، «ح» و «س»دا بە جێی «جاناجان»، «هەر جاران» نووسراوە کە بە بڕوای من دروست نییە چون ئەگەر وەها بێت واتە زۆر جار ئەو شەرت و بەینە بەستراوە لە حاڵێکدا مانای شێعرەکە ئەوە ناگەیەنێ.

مەزهەب مللەت مەسیحای مەریەم
دەردەم، دەرساعەت، ئاوەردم وە هەم[١]

زاهێدان زانان، زاهێر بی نە عام
شیرین بەندێوش سەندەن پەی غولام[٢]

ئیسە یە چێشەن موژەت شەڕ دارۆ؟
جە چارەت غەزەب غەزا مەوارۆ[٣]

بێزاریت واستەن جەی کەمتەر بەندە
غولام جە خدمەت وێت کەرد ڕەهەندە[٤]

---

١- مەسیحای مەریەم: حەزرەتی عیسا (د.خ). دەردەم: هەر ئەو کاتە، گورج، زوو. دەرساعەت: هەر ئەو ساعەتە، گورج. ئاوەردم وە هەم: ڕێکم خست. واتە: هەر لەو کاتەدا بووم بە مەسیحی.

٢- زاهێدان: ئەوانەی کە تەرکە دنیان و هەر خەریکی عیبادەتن. زانان: زانیان. زاهێربی: ئاشکرا بوو. عام: خەڵک بە گشتی. بەندێوش: بەندەیەکی. سەندەن: سەندووە، کڕیوە. پەی: بۆ. غولام: نۆکەر. واتە: زاهیدان زانیان و بۆ خەڵکیش ئاشکرا بوو کە شیرین بەندەیەکی کڕیوە و کردوویە بە غولام و نۆکەری خۆی. لە نوسخەی «ک»دا بە جێی «نە عام»، «نەیام» نووسراوە بە مانای «نە ئەیام» واتە «لە ڕۆژگاردا».

٣- یە چێشەن: ئەمە چییە. موژە: مژۆڵ، برژانگ. شەڕدارۆ: شەڕی هەیە، مەیلی لە شەڕە. چارە: تەوێڵ، نێوچاوان. غەزەب: ڕق، تووڕەیی. غەزا: شەڕ، لێرەدا بە مانای ئەو شەڕانەیە کە پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ کافران کردوویە. مەوارۆ: دەبارێ. واتە: ئێستە ئەمە چییە کە مژۆڵانت مەیلیان لە شەڕە و نێو چاوانت غەزەبی شەڕی لێ دەبارێت.

٤- واستەن: خواستووە. جەی: لەم، لە ئەم. وێت: خۆت. ڕەهەندە: دوور خراوە، فڕدراو. واتە: لە☞

داخـــم هـــەر ئێـــدەن حـــوور حوورلـــەقا!
شـــەرتداران وانـــا تـــۆ بـــە بـــێ‌بـــەقا[١]

☆☆☆

-١٤[٢]-

شـــيرين تـــار كـــەردەن، شـــيرين تـــار كـــەردەن
يـــەک تـــايێ جـــە زڵـــف ســـياش تـــار كـــەردەن[٣]

بـــە تـــارش عـــەقڵم تـــار و مـــار كـــەردەن
بـــە پـــێچش كـــۆی خـــەم وەنـــەم بـــار كـــەردەن[٤]

---

☞ من كە لە بەندەيەكيش كەمتر بووم بێزاری و ئەم نۆكەر و غوڵامەت لە خزمەت كردن فـرێ داوە و ئازادت كردووە.

١- هەر ئێدەن: هەر ئەمەيە. لەقا: ديدار، ڕوومەت. وانا: خوێندەوە. بێ بەقا: بێ وەفا. واتـە: ئـەی كەسێک كە ڕوومەتت بە وێنەی حۆرييە، من خەفەتی ئەوەم نييە منت فڕێ داوە و لـە خـۆت دوور خستووەتەوە خەفەتی ئەوەمە كە شەرت و بەين داران تۆ بە بێ وەفا و بـێ بـەقا نـاو ببـەن و بێننـە ئەژمار.

-١٤-

٢- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٣- تار: جيا بوونەوە. كەردەن: كردووە. تايێ: تاڵێ، تاڵێک. سيا: ڕەش. واتە: شيرين تاڵێک لە زوڵفە ڕەشەكانی جيا كردووە.

٤- تار و مار: بڵاو، پەشێو. وەنەم: لێم لە من. واتـە: بە جـودا بوونـەوەی ئـەو تاڵـە لـە زوڵفـەكانی عەقڵم پەشێو و بە پێچی تاڵە زوڵفەكەی كۆی خەمانم لێ بار بووە.

بــه وەشــبۆش پــەڕ عــەتر دەمــاخم کــەردەن
بـە ڕەنگـش ڕەنـگبەسـت ڕووی داخـم کـەردەن[١]

بــــه بــــاریکیش کــــەرد تــــەنم بــــه ئــــەودا
ئــەوداش بــەرد نــه بــەرگ بافتــەیی ســەودا[٢]

بــــــه درازیــــــش عــــــومر کۆتــــــام درازەن
تــــا بــــەو ڕۆ حێجــــاب نــــه ڕووی ڕاز بــــازەن[٣]

ئــــەو بــــه تــــایێ زڵــــف ســــیای بۆعەنبــــەر
مەکـــــەرۆ گیــــــانم بەنــــــد ڕۆی مەحشـــــەر[٤]

---

١- پەڕ: پڕ. دەماخ: لووت. ڕەنگبەست: ڕەنگ کراو. واتە: بە بۆنی خۆشی ئەو تاڵە زوڵفـەی لـووتم پڕ بوو لە عەتر و بە ڕەنگە ڕەشەکەی داخی منی بە ڕەنگی خۆی (ڕەش) ڕەنگ کردووە.

٢- ئەودا: هەودا، بەنی باریکی بادراو. بەرگ: جل و بەرگ، لیباس. بافتە: چنراو. سەودا: فکر و خەیاڵ. واتە: ئەو تاڵە زوڵفە بە باریکی لاشەمی کردووە بە هەودا و بردوویەتە نێو ئەو جل و بەرگەی کە چنراوی فکر و خەیاڵە.

٣- درازی: درێژی. دارز: درێژ. تا بەو ڕۆ: تا ئەو ڕۆژە. ڕاز: قسـەیەکی شـاراوە، داسـتانێکی درێـژ، لێرەدا مەبەست لە ڕاز زوڵفی یارە کە درێژە و لە ژێر ڕووسەریدا شاراوەتەوە. واتە: تـا ئـەو ڕۆژەی کـە حیجاب لە ڕووی زوڵفانی یار ئاوەڵایە بە درێژی زوڵفانی یار عومری کۆتای منـیش درێـژە. (تـا ئـەو ڕۆژەی زوڵفانی یارم لێوە دیارە منیش دەژیم. «وەرگێڕ»).

٤- تایێ: تاڵێک، تاڵێ. عەنبەر: ماکێکی (مادەیەکی) ڕەشی بۆنخۆشە. مەکـەرۆ: دەکـات. مانـای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا دێت.

ئـــەر دەســـــتەی زلفـــش شــــەماڵ بشـــانۆ
گشـــت ئالـــەم زێنـــدەی جاویـــد مـــەمانۆ [١]

٭٭٭

-١٥- [٢]

شـــیرین جـــە خـــاودا، شـــیرین جـــە خـــاودا
ڕوێ دیـــم شـــیرین جـــە شـــیرین خـــاودا [٣]

ڕای ڕەزای گـــەردوون نـــەدێ جـــە نـــاودا
حومریـــان خـــاو کـــەرد وە ڕووی ئافتـــاودا [٤]

---

١- ئەر: ئەگەر. بشانۆ: بشەکێنێ. ئالەم: عالەم، دنیا. جاوید: دایم، بەردەوامی، هەمیشەیی، ئەبەدی. واتە: ئەو بە تاڵە ڕەشە بۆنخۆشەکەی وەها تا مەحشەر گیانمی بەستووەتەوە و ناهێڵێ بمرم و ئەگەر بێت و شەماڵ دەستە زوڵفەکانی بشەکێنێ هەموو دنیا تا هەتایە بە زیندووی دەمێنێتەوە.

-١٥-

٢- ک، ح.

٣- جە خاودا: لە خەودا. ڕوێ: ڕۆژێک. واتە: ڕۆژێک شیرینم لە شیرین خەودا بینی. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی ئەم بەیتە و بەیتی دوایی، بەیتی یەکەمی پارچە شێعری «شیرین وە تاڵی» هاتووە کە دیارە هەڵەی ڕاست کردنەوەیە.

٤- ڕای: ڕێگەی، ڕێی. حومری: لە عەرەبیدا بە مانای «قیر»ـە بەڵام لێرەدا بە مانای پەلکەی ڕەش هاتووە. ئافتاو: هەتاو، خۆر، لێرەدا بە مانای ڕوومەتە. واتە: ڕێی ڕەزای گەردوونی لە نێواندا نەدیت و دوو پەلکە ڕەشەکەی خاو (بڵاو) کردەوە بە سەر ڕوومەتیدا. (نەیزانی بە خاو کردنەوەی پەلکەکانی چ بەڵایەک بۆ عاشقاندا دێنێت).

وەڵا کــــەرد بـــە نـــاز شـــابازان مەســـت
ســەنعــانیئاســا ســەد کــەس کەمــەر بەســت[١]

قــاپی دیــن شکەســت، مەزهــەب دا بــە بــاد
دونیـــا کـــافر کـــەرد، شـــۆخ بـــێبونیـــاد[٢]

شـــی نـــە ڕای مەزهـــەب عارەبـــان بـــەڕ
پەی غەزای ئومـمەت پەشت بەستەن بە شـەڕ[٣]

---

١- وەڵا کەرد: بڵاو کردەوە. سەنعانی ئاسا: بە وێنەی شێخی سەنعان کە بۆ کچە گاورێـک لـە دینـی خۆی وەرگەڕا. کەمـەر بەسـت: زوننـاری بەسـتە پشـت، زوننـار پارچەیـەک بـووە کـە مەسـیحیان دەیانبەستە پشتیان بۆ ئەوەی لە موسوڵمانان جیا بکرێنەوە. واتـە: زوڵفـەکانی بـە وێنـەی شـابازی مەست کە وان لە ڕاوەکردندا بڵاو کردەوە بۆ عاشقان و هەر لەبەر ئەوەیش سەدان کەس عاشقی بوون و بە وێنەی شێخی سەنعان زونناریان لە کەمەر بەسـتب. (سـەدان کـەس بـۆی لـە دیـن وەرگـەڕان «وەرگێڕ»). لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «شاباز»، «شامار» و بە جێی «سەدکەس»، «سەد باز» و بە جێی «کەمەر بەست»، «زوننار بەسـت» نووسراوە.

٢- قاپی: درگا. بێ بونیاد: بێ بنەڕەت، بێ ئەسـاس، کەسـێک کـە هـەر سـاتێ لەسـەر بەزمێکـە، حولحولی مەزەو. واتە: ئەو شۆخە کە هەر ساتێ لەسەر بەزمێکە درگای دینی شکاند و مەزهـەبی دا بە دەم باوە و دنیای کافر کرد.

٣- شی: ڕۆیشت. نە ڕای: لە ڕێگەی. عارەبان: کۆی «عـەرەب»ـە. بەڕ: وشکایی، بیابان. پەی: بۆ. غەزا: ئەو شەڕانەی کە لە زەمانی پێغەمبەردا (د.خ) لەگەڵ کافران کراوە و پێغەمبەر تێیدا بەشدار بووە. واتە: کەوتە ڕێگەی دینی عەرەبانی بیابان (مەبەست کافرە کە لەگەڵ موسوڵماناندا چوون بـە گژی یەکدا) و شەڕ و داوا کردن و لەگەڵ موسوڵمانان پشتی بە شەڕ بەست.

یـــا شـــا! باجـــەتی ڕەســـوول ســـەروەر
بـــاوەریش نـــە دیـــن پـــاک پێغەمـــەر[١]

تـا شـاد بـوو بـە شـەوق شۆڵەی ئـەو جـەمین
نـەبوو چـوون کـافر، بێـزار بـوو جـە دیـن[٢]

☆☆☆

-١٦-[٣]

شـیرین! زڵـف لـوول، شـیرین! زڵـف لـوول
فیـدای زڵفـت بـام گـا کـرژەن گـا لـوول[٤]

١- یاشا: ئەی خودا. باجەتی: بە خاتری. باوەریش: بیهێنی. واتـە: یـا خـوا بـە خـاتری پێغەمبـەر (س.خ) بیهێنیتە سەر دینی پاکی پێغەمبەر (س.خ). لە بەیتە دواییەکانـدا ئـەڵێ لەبـەرچی ئـەو دۆعا دەکا.

٢- شەوق: نوور. جەمین: تەوێڵ، نێوچاوان. نەبوو: نەبم. چوون: وێنەی، وەکوو. بێزار بوو: بێزار بم. واتە: (بەڵکوو بیهێنیتە سـەر دینی ئیسلام) با منیش بە نووری شۆڵەی ئەو نێوچاوانەی شـاد بـم و مەجبوور نەبم بە وێنەی کافر لە دینم بێزار بم. دەیەوێ بڵێت ئەگەر ئەو نەیەتە سەر دینی ئیسـلام ناچارم من بچمە سەر دینی ئەو.

-١٦-

٣- ک، ئێ، س، م، ر، عم، ب، ج، ح.

٤- فیدای بام: بە قوربانی بم. کرژ: هەر شتێ خاو نەبێ، با دراو. واتـە: ئـەی شـیرین! بـە قوربـانی زوڵفەکانت بم کە جارجار گرژە و جارجار لوول.

گـــا چـــوون ســـیامار پەشـــێوەن مـــەلوول
گـــا وێنـــەی لـــەولاو مـــەپێچیۆ نـــە تـــوول[١]

گـــا گـــا پـــەخش مـــەبۆ نـــە دەور جـــەمین
گـــا گـــا لـــوول وەردەن چـــین وە بـــان چـــین[٢]

گـــایێ چـــەم وەردەن چـــوون چەمـــەرەی چـــین
گـــا پـــەی جـــەمینت بیـــەن بـــە پـــەڕچین[٣]

---

١- پەشێو: شێواو. مەلوول: کز، داماو. توول: تووڵ، باڵای بەرز و باریک بە وێنـەی تـووڵ. لـەولاو: لاولاو، گیایەکی گەڵا پانە تەرز دەهاویّ و بە قەت شتدا هەڵدەگەڕیّ. مەپێچیۆ: دەپێچرێت. واتـە: جارجار بە وێنەی ڕەش مـار کـز و شـێواوە و جارجـاریش بـە وێنـەی لاولاو بـە بـاڵای وەک تووڵتـدا دەپێچرێت.

٢- پەخش مەبۆ: بڵاو دەبێتەوە. جەمین: ڕوخسار. لوول وەردەن: لوولی خواردووە. واتە: جارجـار بـە سـەر ڕووتدا بڵاو دەبێتەوە و جارجاریش چین چین لوول دەخوات. ئەم بەیتە لـە نوسـخەکانی «ک»، «ئێ»، «ج» و «عم»دا هەیە و لە دیکەی سەرچاوەکاندا نەهاتووە.

٣ چەم وەردەن: چەماوە، چەمیوەتەوە. چوون: بە وێنەی، وەکوو. چەمەرە: وەکـوو حەڵقـە، جـەغزیی، دایەرەیی. چین: وڵاتی چین، چینی زوڵفان. چەمەرەی چین: حەڵقەی چینی زوڵفی یار یا بۆی هەیـە شتێکی وەک حەڵقە بێت و لە وڵاتی چین دروست کرابێت، (ئەم بۆچوونی دووهەمە لـە ڕاسـتییەوە دوورە و هەر مەبەست حەڵقەی چینی زوڵفە «وەرگێڕ»). جـەمین: ڕوخسـار. پـەڕچین: پـەرژین. واتە: زوڵفانت جار جار بە وێنەی حەڵقەی چین دەچەمێتـەوە و جـار جـاریش دەبێـت بـە پـەرژینی ڕوخسارت.

گـــاهێ پەشــــێوەن، گـــاهێ گرنجـــەن
گاگـــا گـــرێبەنـــد مولـــەممای زنجـــەن[١]

گـــا تاتـــا جـــە تـــاو گەردشـــت شـــەماڵ
گـــا خوفتـــە و ســـاکن نـــە دەوران خـــاڵ[٢]

دیـــدەم چـــێش مـــەبۆ تـــایێ جـــەو زلفـــە
جـــەو زلـــف وەشـــبۆی لـــوول ســـەرکلفە[٣]

بـــدەی بـــە دەســـتم، هـــەی بەرگوزیـــدەم!
چـــوون تـــەوافچیان مـــالووش نـــە دیـــدەم[٤]

---

١- پەشێو: شێواو. گرنج: چین چین. مولەمما: پێچراو بە دەوری شتێکدا، ناوێتە. زنج: چەناکە، چناکە. واتە: جاری وایە زوڵفانت شێواوە و جاریش هەیە چین چینن و جاری وایشە بە وێنەی گرێی ژێر چناکە لەگەڵ چناکەتدا تێکەڵن.

٢- تاتا: تاڵ تاڵ. گەردشت: گەڕان. خوفتە: خەوتوو. ساکن: نیشتەجێ. واتە: شەماڵ جارجار دەگەڕێ و لێیان دەدا و تاڵ تاڵیان دەکاتەوە و جاری وایش هەیە بە وێنەی مار لە دەوری خاڵەکانتدا پەپکەیان خواردووە و خەوتوون.

٣- چێش مەبۆ: چی دەبێ. تایێ: تاڵێک، تاڵێ. جەو: لەو، لە ئەو. کلف: کلافە، پەلکە. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا پێکەوە دێن. لە نوسخەکانی «ک»، «ئێ»، «عم» و «ج»دا بە جێی «وەش بۆ»، «وەنەوش» نووسراوە.

٤- بەرگوزیدە: تاقانە، هەڵبژێراو. تەوافچی: ئەوانەی کە تەواف دەکەن. مالووش: بمالم. واتە: چاوەکانم! چی دەبێ تاڵێک لە زوڵفە بۆنخۆشەکانت کە پەلکە کراوە بدەی بە دەستمەوە تا بە وێنەی تەوافچیان بە سەر چاوانمیدا بهێنم ئەی تاقانەکەم. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «ڕ» و «س»

بماڵــووش نــە چــەم ســاکن بــۆ جــە دەرد
دڵ بــی بــە زوخــاڵ، بــا نــەبۆ وە گــەرد[1]

❋❋❋

-١٧-[2]

شــیرین ســەرەوە، شــیرین ســەرەوە
شــیرین بــە شــەدەی موختەســەرەوە[3]

ئامــا بــەزم ســەیر ســارا و دەرەوە
دیــا، دەســتش گێــرت بــە ڕووی خــوەرەوە[4]

---

☜ دا بە جێی ئەم بەیتە بەیتێکی دیکە هاتووە و لە نوسخەکانی «م» و «ئێ»دا هەر دوو بەیتەکە هاتووە و ئەمەیش بەیتەکە:

شای شیرین پەیکەرا جەمین جام ساف!　　پەرێم بکیانی تایێ جەو کلاف

١- بماڵووش نە چەم: بە چاومیدا بماڵم. ساکن: ئارام. نەبۆ: نەبێ، نەبێت. گەرد: تۆز. واتە: تاڵێ لە زوڵفانت بە سەر چاومدا بماڵم تا دەردەکەی ئارام بگرێ و ئەو دڵە کە بووە بە زوخاڵ بە تەواوی نەبێ بە تۆز.

-١٧-

٢- ک، ئێ، ح.

٣- شەدە: پارچەیەکی ڕەش یا سووری ئاوریشمی بۆ سەرپێچ و مێزەری ژنان. موختەسەر: کۆتا، کورت. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا دێت.

٤- ئاما: هات. بەزم: بە عەزم، بە نیەت. سەیر: سەیر کردن، سەیران. سارا و دەر: کەش و کۆ. دیا: ڕوانی. خوەر: هەتاو، خۆر. واتە: شیرین بە شەدەیەکی کۆتاوە هاتە سەیرانی کەش و کێو و سەیری کرد و دەستی گرت بە سەر چاوانیەوە تا تیشکی هەتاو لە چاوانی نەدا. لە سەرچاوەی «ح»دا ☜

جـــەمینش چـــوون جـــام جـــەهان دا جـــەڵا
گێرتـــەبێش نـــە دەور تـــەن بۆتـــەی تـــەڵا[١]

زلـــف تـــەل و حـــەڵق مـــار، چوققـــەیی کـــاووس
قـــەترانتـــەر جـــە پـــەڕ ژێـــر بـــاڵ تـــاووس[٢]

دیـــدە تـــای نـــەرگس بـــە کـــام نـــەیاوا
ڕەوا و ڕەفـــت وێنـــەی وەلـــەدەی ســـاوا[٣]

---

☜ بە جێی «دیا دەستش گێرت»، «دیاردا وێش گێرت» نووسراوە.

١- جەمین: تەوێڵ، نێوچاوان. چوون: وێنەی. جام: ئاوێنە. جەڵا: جەلا، ڕۆشن کردنـەوە، جـەلادان. گێرتەبێش: گرتبووی. بۆتەی تەڵا: جێگەیەک کە زێڕ(تـەڵا)ی تێدا دەتوێننەوە. واتـە: تـەوێڵی دنیای ڕۆشن کردەوە و بە شەوقی تەوێڵی دەوری لاشەی بە وێنەی بۆتەی تەڵا لێ هاتبوو. واتـە وڵات شەوقی گرتبوو. دەتوانین بەم جۆرەیش مانـای کەینـەوە کراسێکی زەردی لەبـەر کردبـوو، یـا کـاتێ بەرانبەری هەتاو وەستا بوو پێشی هەتاوەکەی گرتبوو و لە دەوری (ئـەم لاو لای) هـاتبووە دەرەوە کـە پێت وابوو زێڕی لە دەوری خـۆی گرتـووە. لـە سـەرچاوەی «ح»دا نیـوە بـەیتی دووهـەم بـەم جـۆرە نووسراوە: «پێکا بێ وە سەر دوو حوققەی تەڵا».

٢- حەڵق: قوڕگ، لێرەدا بە مانی «مل»ـە. چوققە: جوققە، تۆپەڵەیەکی بچووک لە پـەڕی مـەل دروست کراوە و بە سەر تاجی شاهانی ئێرانەوە کراوە. کاووس: کەیکاوس، ناوی یەکێکە لـە پاشـاکانی ئێران. قەتران: ماکێکی (مادەیەکی) ڕەشە. واتە: زوڵفەکانی لە تەلی باریک و درێژ دەچێت و ملـی بە وێنەی مارە (یا دەکرێت بڵێین زوڵفەکانی بە وێنەی مار حەڵقەیان خواردووە) و لە بەر سینەوە بـە پرچە ڕەشەکانی کە لە پەڕی ژێر باڵی تاوس ڕەشترە تۆپەڵەیەک دروس کراوە کـە لـە تۆپەڵـەی سـەر تاجی کەیکاوس دەچێت.

٣- تا: تاڵ، چڵ. نەرگس: نەرگس، ناوی گوڵێکی جوانە. بە کام نەیاوا: بە ئارەزوو نەگەیشتوو،☜

حـەق حـافێز حوسـن جـە عـەیب بـەریش بـۆ

شـــەوبەند شـــەدەی موختەســـەریش بـــۆ[١]

-١٨-[٢]

شـــیرین ســـەندە بـــێ، شـــیرین ســـەندە بـــێ

جـــە دامیـــاران، دامـــێ ســـەندە بـــێ[٣]

دام نـــە دایـــرەی جـــەمین تەنـــدە بـــێ

نـــە پـــای دامـــدا دانێـــو شـــەندە بـــێ[٤]

---

☜ نەپشکووتوو. ڕەوا و ڕەفت: ڕەفتار. وەلەد: بێچووی ئاژەڵ، بزنی نەچیر. ساوا: تازە پێ گەیشتوو. واتە: چاوانی بە وێنەی چڵی نەرگسە کە هێشتا بە جوانی نەپشکووتووە و هات و چوو و ڕەفتاریشی لە بزنی نەچیری ساوا دەچێت. ئەم بەیتە لە سەرچاوەی «ح»دا نییە.

١- حوسن: جوانی، زەریفی. جە عەیب بەری: بێ عەیب. شەوبەند: سەرپۆشێک کە ڕوخساریش داپۆشێت. شەدە: پارچەیەکی ڕەش یا سووری ئاوریشمی بۆ سەرپێچ و مێزەری ژنان. واتە: خودا ئاگاداری جوانیی و بێ عەیبیی بێت و شەوبەندێکی بە سەر شەدەکەیدا بکێشێت بۆ ئەوەی ڕوخساری نەبینرێت و نەبێت بە چاوەوە. ئەم بەیتە لە سەرچاوەی «ح»دا نییە.

-١٨-

٢- ک، ئێ. لە سەرچاوەی «ح»یشدا ئەم پارچە شێعرە بە نێوە و نێوەچڵی لە شەرحی شێعری «شیرین نیاوە»دا هاتووە.

٣- دامیار: ئەو کەسەی کاری داو نانەوەیە. دام: داو، تەڵە. واتە: شیرین داوی لە ساحێب داوان سەندبوو. (داوی لایان هێنابوو).

٤- دایرەی جەمین: ڕوخسار، ڕوومەت. تەندە بێ: تەنیبوو. دانێو: دانەیەک، مەبەست خاڵە، ☜

مـــورغ دڵ چـــوون تـــەیر گوســـنەی پەشـــێو هـــاڵ
بەرشـــی، هـــەوا ســـەند، بـــەزم دانـــەی لاڵ[1]

لـــوولش بەســـت چـــوون زڵـــف، ئامـــا نـــە بـــاڵا
بـــاڵ دا وە هەمـــدا، ڕووی زەمـــین مـــاڵا[2]

چەنگ وست وە زەمین، دانەش وست وە چـەنگ
گیـــر ئـــاورد بـــە دام قـــەترانی شـــەوڕەنگ[3]

---

☜ هەروەها مەبەست لە داویش زوڵفە. شەندە بێ: وەشاندبوو، چاندبوو. واتە: لە ڕووی ڕوومـەتی داوی تەنیبوو(زوڵفی) و دانەیشی کردبووە پای داوەکە (خاڵ).

١- مورغ: باڵدار، پەلەوەر. چوون: بە وێنەی، وەکوو. تەیر: باڵدار، پەلەوەر. گوسنە: برسـی. پەشـێو هاڵ: پەشێوحاڵ. بەرشی: ڕۆیشت. هەواسەند: باڵی گرتەوە. بەزم: بە عەزم. لاڵ: لەعل، بەردێکی بە نرخی سووری کاڵ، مەبەست لێوە. دانەی لاڵ: خاڵی سەر لێو. واتە: دڵم بە وێنەی باڵدارێکی برسـی کە حاڵی پەشێوە بە عەزمی دانەی لەعل (خاڵی سەر لێوانی یار) باڵی گرتەوە و ڕۆیشت.

٢- ئاما نە باڵا: هاتە سەرەوە. ماڵا: ماڵی، گزی دا. واتە: وەک زوڵف چۆن لوول دەبـێ و لـە سـەرەوە بەردەبێتەوە بۆ سەر زەوی و زەوی دەماڵی، دڵیشم بەو جۆرە لوولی خوارد و بە پێچەوانەی زوڵفـەکانی، ئەم بەرەو سەر هـات و باڵـەکانی بـە یەکـدا دا و بـە هـەوای باڵـەکانی زەوی ماڵـدرا. (باڵـدار کـاتێ هەڵدەفڕێ بە هەوای باڵی زەوی ئەماڵدرێ و تۆز دەکات.)

٣- وست: خست. قەترانی: بە ڕەنگی قەتران، زۆر ڕەش. شـەوڕەنگ: بـە ڕەنگـی شـەو، ڕەش. واتـە: پەنجەی خستە زەوی و دانەکەی بە دەس هێنا بەڵام لە نێوە داوی زوڵفە ڕەشەکاندا گیری کرد. (بوو بە داوەوە).

هــــەر یەنـــدە فڕیـــا تـــا جـــە دام وەر بـــۆ
دام نــە پڕچــەی قەیــد هــۆ ســەختتــەر بــۆ[١]

☆☆☆

-١٩-[٢]

شـــــیرین! شناســـــان، شـــــیرین! شناســـــان
یـــە چ ڕۆی بـــەذ بـــی مـــن تـــۆم شناســـان؟[٣]

نـــە خـــوذا مـــەذۆ مـــەرگێو بـــە ئاســـان
نـــە دڵ جـــە لای تـــۆ مـــەبۆ هەراســـان[٤]

---

١- هەر یەندە: هەر هێندە، هەر ئەوەندە. فڕیا: فڕی. وەربۆ: بەر بێ، ئـازاد بـێ. پڕچـە: دەس و پـێ لێدان، باڵەتەپێ کردن. قەید: بەند، لێرەدا واتە ئەو کەسەی بووە بە بەندەوە، ئەسیر. هۆ: خـۆ. واتـە: دڵم زۆر باڵەتەپێی کرد تا لە داوەکە ڕزگاری بێت بەڵام ئەوەی وا بووە بـە داوەوە تـا زیـاتر باڵەتـەپێ و باڵەفڕێ بکات داوەکە توندتر ئەبێت. (زیاتر دەبێ بە داوەوە).

-١٩-

٢- ک، س، م ر، ب، ح.

٣- واتە: شیرین ئەمە چ ڕۆژێکی نەگبەت بوو من تۆم تێدا ناسی. لە بەیتە دواییەکاندا ئەڵێ ئەو ڕۆژە بۆچی نەگبەت بووە.

٤- مەذۆ: ئەدات. مەرگێو: مەرگێک، مردنێک. جە لای تۆ: لە لای تۆ، لای تـۆ. هەراسـان: یـاس بوون، بێتاقەت، ترساو. واتە: نە خودا مەرگێکی ئاسانم پێ ئەدات کە ڕزگارم بێت و نـە دڵیشـم لای تۆ بێتاقەت و هەراسان دەبێت کە لەوێ نەنیشێت و بێتەوە بۆ لای خۆم. مەبەستی ئەوەیـە کـە دڵـم نایەوێ تۆ بە جێ بێڵێت و ئەوەی پێ خۆشە لە لای تۆ بمێنێتەوە.

نـــــه پـــــام راڕەوەن بشــــــوون وه جـــــایێ
نـــــه هــــەن حـــــەکیمێو بــــەرۆم دەوایــــێ[١]

دەســــــت و پـــــا بەســـــــتەی خەجاڵاتــــەنان
چـــــوون شـــــاه شـــــاترەنج کــــش و ماتـــــەنان[٢]

☆☆☆

-٢٠[٣]-

شیرین! شەرت و بەین، شیرین! شــەرت و بــەین
قــات بیــەن جــە لات ڕەویــەی شــەرت و بــەین[٤]

---

١- ڕاڕەو: کەسێ کە بتوانێ بە ڕێدا بڕوات، ڕێبوار. بشوون: بڕۆم، بچم. حەکیمێو: حەکیمێک. بەرۆم دەوایێ: دەوام بکات، چارەم بکـات. واتـه: نـه پێـی ئـەوەم هەیـه بـڕۆم بـۆ شـوێنێکی دیکـه و نـه حەکیمێکیش هەیه دەردم چارە بکات.

٢- چوون: بە وێنەی. شاترەنج: یاری شەترەنج کە بە دوو کەس دەکرێت. کش و مات: کیش و مـات، ئارام و بێ جووڵە، دەستەواژەیەکی یاری شەترەنجە کاتێ شای شـەترەنج نـەتوانێ هـیچ حەرەکەیـەک بکات ئەڵێن کابرا کیش و مات بوو واتە یاریەکەی دۆڕاند. واتە: دەس و پێم بەستراوە و خەجاڵەتم و بە وێنەی شای شەترەنج کیش و مات بووگم.

-٢٠-

٣- س، ڕ، ب، ح. ئەم پارچە شێعرە لە هیچ کام لە نوسخە بنەڕەتیەکاندا نییە و ڕەنگ و بۆی شـێعری بێسـارانیش نـادات. لـه نـاوەڕۆکی شـێعرەکەدا هەنـدێ دەسـتەواژە هـاتووە کـه لـه زمـانی شـێعری بێسارانییەوە دوورە. بە لای منـەوە شێعری بێسارانی نییە بەڵام هیچ بەڵگەیـەک بۆ سـەلماندنی نییـه و منیش لەبەر ئەوەی لەو چوار سەرچاوەدا هاتووە لێرەدا دەینووسمەوە.

٤- قات بیەن: بڕاوە، نەماوە. ڕەویە: ڕێگەی لەبەر گیراو بۆ ئەنجام دانی کارێ. ئاوەز: فکر.

چـوون خۆفـت نیـەن تـۆ جـە مـەنا و مـەین
قـــەتڵت واجبـــەن، وە گـــەردەنم دەیـــن[١]

پەی چێش؟ کـە جـە لای شـەرت و شـۆن داران
ســـاحیب وەفـــا و بـــەین ڕۆی ڕۆزگـــاران[٢]

هەرکـەس بـێ شـەرتەن، جـە بەینـەت دوورەن
واجبولقەتڵـــەن، ئەرســـەد کـــە حـــوورەن[٣]

تـــۆ خـــوداْ خـــەیرەت دۆ، ڕاز ڕێـــزەی نـــەبات
چـمان شـەرت و بـەین قـات بیـەن جـە لات[٤]

---

☞ واتە: ئەی شیرین ڕەویەی شەرت و وەفاکەت لە لا نەماوە.

١- چوون: چونکە. خۆف: ترس. مەنا و مەین: مەنع و لۆمە کردن. گەردەن: مل. دەین: وام، قەرز. واتە: چون تۆ ترست لە مەنع و لۆمە کردن نییە کوشتنت واجبە و دەینت بە ملم. (دەینـی کوشـتنت بە گەردن دەگرم).

٢- پەی چێش: بۆچی. شۆن: قەوڵ و پەیمان. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٣- بەینەت: وەفا. واجبولقەتڵ: واجب القتل، کەسێ کە کوشتنی فەرز بێ. ئەرسـەد: هـەر چەنـد. واتە: لەبەر چی؟ لەبەر ئەوەی لای ئەوانەی کە شەرت وپەیمانیان هەیە و لە ڕۆژگاردا خاوەن وەفـا و بەینن. هەرکەس بێ شەرتە و لە وەفا و بەین دوورە ئەگەر حۆریش بێت کوشتنی فەرزە.

٤- ڕاز ڕێزەی نەبات: کەسێ کە قسەی لە شیرینی‌دا لە وردە نەبات دەچێ. چمان: وا دیـارە، وابـزانم، لام وایە. واتە: ئەی کەسێک کە قسەت لە شیرینی دا لە نەبات دەچێت وا دیارە کە شەرت و وەفـا و بەین لای تۆ نەماوە و قاتە.

ئەگەر مەزانی، زلفان عەنبەربۆ!
کەمشەرتی خاسەن تۆ کەردەن بە خۆ[١]

تەقسیرم مەگێر، من بێزارم جێت
چەنی بێ شەرتی وێت مەزانی وێت[٢]

***

-٢١-[٣]

شیرین! شەرم نیەن، شیرین! شەرم نیەن
شیرین! پەی خاسان، شەرتەن شەرم نیەن[٤]

---

١- مەزانی: دەزانی. عەنبەر: ماکێکی (مادمیەکی) ڕەشی بۆنخۆشە. خۆ: خوو، عادەت. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا دێت.

٢- تەقسیر: خەتا، تاوان، کۆتایی کردن. مەگێر: مەگرە. جێت: لێت، لە تۆ. چەنی: لەگەڵ. وێت: خۆت. واتە: ئەی ئەو کەسەی کە بۆنی زولفەکانت لە بۆنی عەنبەر دەچێت ئەگەر دەزانی ئەو بێ شەرتیەی لە بەرت گرتووە و کردووتە بە عادەت کارێکی باشە ئیتر کۆتایی کردن لە منەوە نەزانیت و نەڵێی تۆ کۆتاییت کردووە چون من لێت بێزارم و ئیتر ئەوە لەگەڵ بێ شەرتی و بێ وەفاییت هەر خۆت دەزانی و خۆت. (من ئیتر تۆم ناوێ و کارم بە سەرتەوە نییە.)

-٢١-

٣- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٤- شەرم نیەن: شەرم نییە، عەیب نییە. پەی: بۆ. خاسان: لێرەدا بە مانای «جوان»ـە. واتە: ئەی شیرین! شەرت وەهایە بۆ جوانان شەرم نەبێ.

چــێش بــی مـــەواچا حێجــاب خـــاس بیـــەن؟
خاســـتەر جــە ئافتــاب کەســێ کــێ دیـــەن؟ [١]

ئەگــەر پــەی خاســان حێجــاب خـــاس مــەبی
ئافتــــاب و مـــــەهتاب کەســــێ نمـــەدی [٢]

کەســـێ وێنـــەی تـــۆ، شـــەوقەن جـــەمینش
لازم پـــــــەروانان مــــــــەیان وە دیـــــــنش [٣]

کەســێ وێنــەی تــۆ، شــەوق شــۆڵەی شــەمەن
لازم پــــــەروانان چۆگەشـــــان جەمـــــــەن [٤]

---

١- چێش بی: چی بوو. مەواچا: دەڵـێن. حێجـاب: ڕوو پۆشـین. ئافتـاب: هـەتاو، خـۆر، ئەڵبـەت ئافتاب واتە خۆرەتاو بەڵام بێسارانی لێرەدا بە مانای هەتاو هێناویەتی. کێ دیەن: کێ بینیویـە، کـێ دیویە. واتە: ئەمە چییە دەڵێن ڕوو پۆشین خاسە؟ ئەگەر وەها بێت خۆ هەتاو ڕووی نەپۆشیوە، کێ لەو خاستری دیوە؟ (کێ لە هەتاو جوانتر و خاستری دیوە؟ ئەگەر ڕووپۆشین خاس بوایە هـەتاویش ڕووی خۆی دەگرت و دەرنەدەکەوت. «وەرگێر»).

٢- ئافتاب: خۆرەتاو، لێرەدا خۆر. مەهتاب: مانگەشەو، لێرەدا مانگ. نمەدی: نەدەدی، نـەدەبینی. واتە: ئەگەر ڕوو پۆشین بۆ جوانان خاس بوایە دەبوو کەس ڕووی هەتاو و مانگی نەبینیایە.

٣- شەوق: ڕۆشنایی. جەمین: تەوێڵ، نێوچاوان. لازم: وەها پێویستە، بـێ گومـان وایـە. پەروانـە: پەپوولە. مەیان: دێن. دینش: دیتنی، بینینی. واتە: کەسێک کە بـە وێنـەی تـۆ نێوچـاوانی وەک شەم ڕۆشنایی هەیە بێ گومان پەپوولە (عاشق) دێن بۆ سەیر کردنی.

٤- لازم: وەها پێویستە، بێ گومان وایە. چۆگە: لەو جێگە، لەوێ. واتە: کەسێک کە بە وێنەی ☜

ئێمــــەیچ پەروانـــەی شـــەم شناســـانیم
پـــەڕ و بـــاڵ ســـفتەی دیـــن خاســـانیم [١]

مللـــەت پـــاک دیـــن پێغەمبـــەرانیم
نـــەک جـــە تایێفـــەی کـــەچ نـــەزەرانیم [٢]

بنمانــــە جـــــەمین نـــــوور پاکتــــەن
ئـــەر تـــۆ پاکـــەنی، جـــە کـــێ باکتـــەن؟ [٣]

☆☆☆

---

تۆ خۆی ڕۆشنایی بەخشی شۆڵەی شەمە بێ گومان دایم پەپوولە لە دەوری جەمە. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هەیە.

١- ئێمەیچ: ئێمەیش. شەم شناس: شەم ناس، مەعشووق ناس. سفتە: سووتاو. دین: دیتن، چاوپێکەوتن. خاسان: جوانان. واتە: ئێمەیش ئەو پەپوولە (عاشق)ـەین کە شەم (مەعشووق)ی خۆمان دەناسین و پەڕ و باڵمان سووتاوی دیتنی جوانانە.

٢- مللەت: میللەت، نەتەوە. کەج نەزەر: ئەوەی کە بە چاوی خراو سەیری نامووسی کەسێکی دیکە بکات. واتە: ئێمەیش لە تایفەی دین پاکی پێغەمبەرانین و لە تایفەی کەج نەزەران نین. (لە تایفەی داوێن پیس و بێ نامووسان نین «وەرگێڕ»).

٣- بنمانە: بنوێنە. جەمین: ڕوخسار، نێوچاوان. پاکەنی: پاکی. جە کێ باکتەن: لە کێ دەترسیت، باکت لە کێیە. واتە: ڕووی خۆت بنوێنە چون نووری تۆ پاکە. کاتێ تۆ خۆت پاکی ئیتر لە کێ دەترسیت؟

-٢٢[١]-

شـــــیرین مــــــەوانا، شــــــیرین مــــــەوانا
ئایــــــەت شــــــەریف قورئــــــان مــــــەوانا[٢]

گــا جــەمین چــوون قــورس قەمــەر مــەنمانا
مــــن بــــە فرشــــتەی پــــای عەرشــــم زانــــا[٣]

تەبارەکــــــەڵڵا، ئــــــەو ڕۆ جــــــەو دەمــــــدا
زڵــف چــوون بــاڵ تــەیر، مــەدۆاش بــە هەمــدا[٤]

-٢٢-

١- ک، ئێ، ح.

٢- مەوانا: دەخوێند، دەخوێندەوە. شریف: پلە و پایە بەرز. واتــە: شــیرین خــەریکی خوێندنــەوەی ئایەتی قورئانی پیرۆز بوو.

٣- جەمین: ڕوخسار، نێوچاوان. قورس: جەغز، دایەرە. قەمەر: مانــگ. مــەنمانا: دەنوانــد، نیشــان دەدا. فرشتە: فریشتە، مەلایکە. زانـا: زانــی. واتــە: جارجــار ڕوخســاری دەتکــوت مــانگی شــەوی چواردەیە و من بە فریشتەی عەرشی خودام زانی.

٤- تەبارەکەڵڵا: خودا پاک و بێ وێنەیە، کاتێ کەسێک دەستکردێکی خودا دەبینێ کە لە جــوانیدا جێی سەر سوڕمانە ئەو وشە بە کار دەبـات. جــەو دەم: لــەو کاتــەدا، لــەو وەختــەدا. تــەیر: باڵــدار، پەلەوەر. مەدۆاش: دەیدا، ئەیدا. واتە: تەبارەکەڵڵا لەو ڕۆژە و لەو کاتە زوڵفــی وەک بــاڵی باڵــدار بــە یەکدا دەماڵی.

دوو دەستەی کلاف مەونارا بە سەف
پەخش مەبی وە بان «بسم اللە»ی موسحەف[١]

ئەر بە دەنگ نەرم، ڕێزەی ڕازەوە
بە مەدد تەشدید، خۆش ئاوازەوە[٢]

جە وەخت مەمات، ئادەم نەناسین
ئەر شیرین پەرێت بوانۆ یاسین[٣]

سەدای دەنگ ئەو بژنەوی بە وێت
ئیشەڵڵا بەهەشت باقی مەبۆ جێت[٤]

☆☆☆

---

١- کلاف: پەلکە. مەونارا: دەیڕازاندەوە، ڕەدیفی دەکرد، ڕێکی دەخست. مەبی: دەبوو. موسحەف: قورئانی پیرۆز. واتە: دوو دەستەی پەلکەی زولفەکانی دەڕازاندەوە و بە سەر «بسم اللە»ی قورئانەکەدا بڵاو دەبوونەوە.

٢- ڕێزەی ڕاز: وردە قسە. مەدد: کێشانەوی پیتێک لە قورئاندا. تەشدید: دووجار خوێندنەوەی پیتێک. خۆش ئاواز: دەنگی خۆش. مانای ئەم بەیتە و دوو بەیتی داویی پێکەوە دێن.

٣- جە وەخت مەمات، ئادەم نەناسین: لە کاتی مردندا کە کەس کەس ناناسێت. یاسین: سوورەتی یاسین کە زیاتر لەسەر کەسانێک کە لە سەرەمەرگدان دەیخوێنن. مانای ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

٤- بژنەوی بە وێت: بە گوێی خۆت ببیستی. باقی: هەتاهەتایی، هەمیشەیی، ئەوەی کە بۆ تاهەتایە دەمێنێتەوە. مەبۆ: دەبێ. واتە: ئەگەر لە کاتی مردندا، ئەو کاتەی کە کەس، کەس ناناسێت شیرین بەو دەنگە خۆشە کە قورئان بە دەنگی نەرم و مەد و تەشدیدەوە دەخوێنێ ☜

-٢٣[١]-

شـــــیرین! نگــــــایێ، شـــــیرین! نگـــــایێ
کـــەرەم کـــەم مەکـــەر، جـــە نـــیم نگـــایێ[٢]

جـە پـەی واتـەی عـام، نـە جـە گشـت جـایێ
جـــایێ بـــێ رەقیـــب، ئـــەویچ هـــەم گـــایێ[٣]

نـــە تـــۆ تـــازە زەیـــن، بـــەدکاران بـــێ زەیـــن
مەتەرســـــوو وزات دوور جـــە وەفـــا و بـــەین[٤]

---

☜ بێت و یاسینت بخوێنێ و تۆیش بە گوێی خۆت بیبیستی ئیشەڵڵا دوای ئەوەی کە مردی دەچیتە بەهەشت و بەهەشت دەبێتە جێگەی تاهەتاییت.

-٢٣-

١- ک، ئێ ، س، ڕ، ب، ح.

٢- کەرەم: بەخشین، دڵاوایی. کەم مەکەر: کەم مەکە. نیم نگا: بە گۆشە چاو سەیر کردن. واتە: ئەی شیرین! کەرەم و بەخشینی خۆت لە سەیری کردنی ئێمە کەم مەکە و بە گۆشە چاوێک لێمان بڕوانە.

٣- جە پەی واتەی عام: لەبەر قسەی خەڵک. نە جە گشت جایێ: لـە هـەموو شـوێنێکیش نـە. ئەویچ هەم گایێ: جارجار. واتە: ئەویش لە هەموو شـوێنێک نـە (سـەیرکردن) بـا خـەڵک باسـمان نەکەن، لە شوێنێک لێم بڕوانە کە ڕەقیب و دوژمنی لێ نەبێت، ئەویش هەموو کات نە جارجـار لـێم بڕوانە.

٤- زەین: بیر و هۆش، ئـاوەز. مـەتەرسـوو: دەترسم. وزات دوور: دوورت بخەنـەوە. واتـە: چـون تـۆ منداڵی و بیر و هۆشت تازەیە و بەدکاریش بێ بیر و هۆش و ئـاوەزە دەترسـم بـە گۆشـە چـاو سـەیر کردنت ببینن و کارێک بکەن تۆ لە وەفا و بەین دوور بخەنەوە.

جــەفات نەکێشــان پــەی کەســێ جــارێ

بــێ وەفــا مــەبی بــە یــەک ئــازارێ[١]

جــە پــەی واتەشــان خاترگــەرد مــەبی

وێنــەی بــێ‌مــەیلان، مــەیلان سـەرد مــەبی[٢]

نــەبا ڕازشــان پــەیمان زیــان بــۆ

فیــدای نگــات بــام بــا بــە نیــان بــۆ[٣]

☆☆☆

١- مەبی: دەبی. واتە: چون تا ئێستە عاشقی کەس نەبوویت و جەفا و سەختی عەشقت لە ڕێی کەسدا نەکێشاوە و بە بچووکترین ئازار و ناڕەحەتی لە ڕێی وەفا لا ئەدیت و بێ وەفا دەبیت.

٢- جە پەی: لەبەر، بە خاتری. واتەشان: وتەیان، قسەیان. خاترگەرد: خاتر تۆزین، ناڕەحەت، عاجز، دڵگیر. مەبی: دەبی. واتە: لەبەر وتەی بەدکاران خاترت گەرد دەگرێ و ناڕەحەت و عاجز ئەبی و بە وێنەی بێ مەیلان مەیلت سارد دەبێتەوە.

٣- نەبا: نەوەک. ڕازشان: قسەیان. پەیمان: بۆ ئێمە. زیان: زەرەر. فیدای نگات بام: بە قوربانی سەیر کردنت بم. نیان: شاراوە، نەهان. بۆ: بێت. واتە: بە قوربانی سەیر کردنت بم نەوەک قسەی بەدکاران زەرەر و زیانی بۆمان هەبێ بە جۆرێ سەیرم بکە با کەس نەزانێ و کەس نەبینێت.

-٢٤[١]-

شـــــیرین نیـــــاوه، شـــــیرین نیـــــاوه
پـــــەی ســــفتەدڵان، پڕشـــــنگ نیـــــاوه[٢]

پـــــەردەی ســـــیاماڵ هـــــۆردا، دیـــــاوه
چـــوون مانـــگ نـــه گۆشـــەی هـــەور ســـیاوه[٣]

-٢٤-

١- ک، ئێ ، س، ڕ، عم، ب، ج، ح.

٢- نیاوه: نایەوه، بڵاو کردەوه. پەی: بۆ. سفته: سووتاو. پڕشنگ: پزووسکی ئـاگر، تیشـک. واتـه: شیرین بۆ ئەوانەی دڵیـان سـووتاوه تیشـکی بـڵاو کـردەوه. لـه سـەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «س» و «ڕ»دا به جێی «پڕشنگ»، «دامش» و له نوسخەی «ئێ»دا «دامێ» و لـه نوسـخەی «عـم»دا «ناهێر» و له نوسخەی «ج»دا «ئایر» نووسراوه که به پێی مانای بەیته دواییەکان «پڕشـنگ» لـه هەمووی دروستره.

٣- سیاماڵ: دەوار، ئەو چادره ڕەشەی که هەوارنشینی تێدا دەژی. هۆردا: هەڵدا. دیاوه: سەیری کرد. چوون: وێنەی، وەکوو. سیا: ڕەش. واته: پەردەی دەوارەکەی هەڵدایەوه و سەیری کرد هەر وەک مانگ چۆن له ژێر هەوری ڕەشەوه دێته دەر. لێرەدا دەردەکەوێ که له بەیتی پێشوودا «پڕشنگ» دروستتره چون کاتێک مانگ له ژێر هەورەوه بێته دەر تیشک دەهاوێژێت. حەزرەتی مەولەویش ئەم بەیتەی له شێعرێکدا به جوانی و نەزاکەت بەم جۆره تێهەڵکێش کردووه:

«گۆشـــەی ســـیاماڵ هـــۆردا و دیـــاوه    چوون مانگ نه گۆشـەی هـەور سـیاوه»
بـــه خـــودا قەســـەم پاســـەم ئومێـــدەن    (حـور مَقصـورات فـی الخَیـام) ئێـدەن

ئەرسەد مانگ دارۆ شۆڵەی شەوق نوور
کەسێش پەی نیەن پەروانە دەستوور [١]

ئێذ چەند پەروانەی جانفیدا دارۆ
پەی دینش جە دوور گیان مەسپارۆ [٢]

یەکێ جە وانە، منەنان هاڵا
بڵێسەم بەردەن ناڵەم وە باڵا [٣]

هەر شەمێ کەسێش پەی سۆزان نەبۆ
سی ئەو شەم هەرگێز فرۆزان نەبۆ [٤]

***

---

١- ئەرسەد: هەرچەند. دارۆ: هەیەتی. پەی نیەن: بۆ نییە. پەروانە دەستوور: وێنەی پەپوولە. واتە: هەرچەند کە مانگ شەوقی شۆڵەی نووری هەیە بەڵام کەسی نییە بە وێنەی پەپوولە عاشقی بێ و بۆی بسووتێ.

٢- ئێذ: ئەم. جانفیدا: گیان‌فیدا، گیان لە سەر دەست، کەسێک کە حازرە گیانی بە قوربانی کەس یا شتێک بکات. پەی دینش: بۆ دیتنی، بۆ بینینی، بۆ چاوپێکەوتنی. گیان مەسپارۆ: گیان دەسپێرێ، دەمرێ. واتە: بەڵام شیرین چەند پەپوولە (عاشق)ی گیان لە سەر دەستی هەیە کە حازرن بۆ دیتنی لە دوورەوە گیانی بۆ لە دەس بدەن و بمرن.

٣- جەوانە: لەوانە. منەنان: منم. هاڵا: ئێستە، بە هەر شێوە. باڵا: سەر. واتە: یەکێک لەو گیان لە سەر دەستانە منم و بڵێسەی ئاگر گرتنم و سووتانم ناڵەمی بردووە بە ئاسماندا.

٤- سۆزان: سووتاو، ئاگرگرتوو. سی: با، (لە دیوانەکەی مامۆستا «حەبیبی»دا بە جێی «سی»، «سەی» نووسراوە بە مانای «تاریکایی» بەڵام دواتر خۆیان فەرموویان «سەی» هەڵەیە و ☜

-٢٥-[١]

شـــیرین نێشـــتەرەن، شـــیرین نێشـــتەرەن
نـــە دەور دیـــدەش هـــەزار نێشـــتەرەن[٢]

مـــوژانش جـــە تـــێخ ئـــەڵماس تێشـــتەرەن
زامـــەتش جـــە زام ئـــەفعی فێشـــتەرەن[٣]

دەســـت دا نـــە دیـــدە، خێـــزا کـــەرد ئـــاخێز
ساو دا بـە سـەوهان مێـڵ مـوژەی هـوون ڕێـز[٤]

---

☜ «سی» بە مانای «با» دروستە. «وەرگێڕ»). فرۆزان: ڕۆشن بوون، ڕۆشنایی دەر. واتە: هەر شەمێک کە کەسێکی نەبێت بۆی بسوتێت خاستر ئەوەیە ئەو شەمە بە «با» بکوژێتەوە و ڕۆشن نەبێت. (یاخوا ئەو شەمە هەر نەگرێت و تاریک بێت. «وەرگێڕ»). ئەم بەیتە لە نوسخەی «ئێ»دا نییە.

-٢٥-

١- ک، ئێ، س، م، ر، ب، ح.

٢- نێشتەر: نەشتەر، کەرەستەیەکی نووک تیژ بۆ خوێن گرتن لە لاشەی ئینسان بە کار دەبرێت، لێرەدا مەبەست مژۆڵە. واتە: لە دەوری چاوانی شیرین هەزار نەشتەر هەیە.

٣- تێشتەر: تیژتر. زامەت: زام، برین. ئەفعی: جۆرە مارێکی ژەهراوییە کە دوو ددانی قولابی هەیە. فێشتەر: زیاتر، زۆرتر. واتە: مژۆڵی لە تێخی دروستکراوی ئەڵماس تیژترە و زامی لە زامی ئەفعی زیاترە.

٤- دەست دا نە دیدە: دەستی لە سەر چاوی دانا. خێزا: هەستا. ئاخێز: هەستان. ساو: ساف کردن. سەوهان: هەسان. مێڵ: مێلی چاو ڕەشتن، مێلی چاوڕەشتنی بە هەسان شوبهاندووە. موژە: مژۆڵ. هوون ڕێز: خوێنڕێژ. واتە: دەستی لە سەر چاوی دانا و هەستا و چاوی ڕەشت و بە مێلی چاو ☜

نــه هــێلال قــەوس ســیا کــەرد پەیوەســت
فاقــە نــە گیرگــاز، شەســت ســەرپەل بەســت[١]

پای چەپ وست وە پێش، ڕاست نە جا موحکەم
چەپ کەرد وە ستوون، ڕاست ئاوەرد ئــەو خــەم[٢]

هـــەر ئەوســـام زانـــا، دڵ جـــە دەروون دا
پەخشـــیا و پـــەخش بـــی ڕێـــزا وە هـــوون دا[٣]

---

ڕەشتن مژۆڵەکانی لە هەساندا و سافی کرد.

١- نە: نە ئەوەی کە، تا. قەوس: هیلال، کەمان. سیا کەرد: ڕەش کرد. پەیوەست: بە یەک گەیشتنی دوو شت. فاقە: ئەو چڵە دارەی کە کەوانی لێ دروست دەکرێت. گیرگاز: دەبێ ئەو جێگە بێت کە ژێی کەوانەکەی پێوە دەبستن. شەست: جۆرە کلکەوانەیەکە لە قامکیان کردووە تا ژێی کەوان قامکیان زامدار نەکات. سەرپەل: ئەو پەڕە کە دەیکەنە ئاخری تیرەوە. واتە: تا کەوانی ئەبرۆ ڕەشەکانی بە یەک گەیاند، فاقەی لە کەوانی ئەبرۆ ڕەشەکانی دروست کرد و ئەبرۆی کردە بە کەوان و تیر و کەوانی حازر کرد. بە داخەوە ئەو دەستەواژانەی لەم بەیتەدا بە کار هاتووە ئێستە وای پێ ناڵێن و هەر ئەوە بووە هۆی ئەوەی بە ڕێک و پێکی مانای ئەم بەیتەمان بۆ ڕاست نەبێتەوە.

٢- وست: خست. ستوون: کۆڵەکە. ئاوەرد: هێنا. واتە: پێی چەپی خستە پێش و پێی ڕاستی لە جێی خۆیدا پتەو کردەوە و پێی چەپی بە وێنەی کۆڵەکە لێکرد و پێی ڕاستی چەماندەوە. (شێوەی هاویشتنی تیر بە تیر و کەوان).

٣- ئەوسام زانا: پاش ئەوە زانیم. پەخشیا: بڵاو بووەوە. ڕێزا: ڕژا. واتە: پاش ئەوەی کە وەهای کرد زانیم کە دڵم لە دەروونمدا بڵاو بووەتەوە و ڕژایە نێو خوێنمەوە.

پێکیــــای پــــەیکان مــــوژەی نەمیــــذەم
شــــەهێذ شــــەیدای شــــاباز دیــــذەم[1]

☆☆☆

-٢٦[2]-

شــــیرین وە تــــاڵی، شــــیرین وە تــــاڵی
خــــەم ڕێزنــــا نــــە دڵ، شــــیرین وە تــــاڵی[3]

تــــەخت دڵ جــــە گــــرد شــــادیان مــــاڵی
کــــەردش پــــەی ســــپای تاڵیــــان خــــاڵی[4]

١- پێکیا: پێکراو. پەیکان: نووکی تیژ. نەمیذە: تەڕ. شەهێذ: کوژراو. شەیدا: عاشق. شاباز: جۆرە باڵدارێکی ڕاوکەرە کە چاوی جوانە. واتە: من پێکراوی نووکی تیری برژانگە تەڕەکانیم و عاشق و کوژراوی ئەو چاوانەم کە لە چاوی شاباز دەچێت، یا کوشتەی ئەو چاوانەم کە بە وێنەی شاباز کەسێک ڕاو دەکات.

-٢٦-

٢- ک، ئێ، ع، ح.

٣- ڕێزنا: ڕژاند. واتە: شیرین بە تاڵی خەمی ڕژاندە دڵ.

٤- گرد: هەموو. کەردش: کردی. پەی: بۆ. واتە: تەختی دڵی لە هەموو خۆشییەک پاک کردەوە و بۆ سپای تاڵی خاڵی کرد. لە نوسخەی «ک»دا بە جێی «ماڵی»، «تاڵی» نووسراوە بە مانای تالانی کرد.

هەرکۆ خەمێ بێ یا ئاما نە دڵ
نە زێد و ماوای دڵ کەردش مەنزڵ[1]

عەهدێ کەرد چەنی سپای دڵ، تاڵی
تا دڵ بۆ نەبۆ جە تاڵی خاڵی[2]

دڵ موقەددەمەن، تاڵیش تاڵیەن
جەزای دڵ سزای دەرد ناڵیەن[3]

❀❀❀

## -٢٧-[4]

شیم نە خەیاڵان، سەیر دنیام کەرد
واتم مەر وینوو یەکێ ساحیب دەرد[5]

---

١- هەرکۆ: هەرکوێ. یا ئاما: ئەوە هات. نە: لە. زێد: نیشتمان. ماوا: جێگە، شوێن. واتە: لە هەر شوێنێک خەمێک هەبێ ئەوە هاتە نێو دڵ و لە دڵدا جێگەی گرت و کردی بە هێلانەی خۆی.

٢- عەهد: پەیمان بەستن، قەوڵ و قەرار دانان. چەنی: لەگەڵ. بۆ: هەبێ، ببێت. نەبۆ: نەبێ. واتە: تاڵی لەگەڵ سپای دڵ پەیمان و قەرارێکی بەستووە تا دڵ هەبێت لە تاڵی خاڵی نەبێت.

٣- موقەددەم: سەرەتا، پێشین. تاڵی: دوایی، کۆتایی، ئەوەی بە دوادا دێت. جەزا: پاداش. سزا: جەزا بە خراپە. واتە: دڵ لە سەرەتایە و بە دوای ئەودا تاڵی دێت و جەزای دڵ سزایە کە دەردێک بێت لەگەڵ هاوار و ناڵە.

-٢٧-

٤- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٥- شیم: ڕۆیشتم. واتم: وتم، کوتم. مەر: مەگەر. وینوو: ببینم. واتە: خەیاڵ بردمیەوە و بە ☜

ببــــوو بـــه ڕێـــزەی خـــاک وەر یانـــەش

بـــاروو پـــەی شـــەفا، مەرهـــەم جاســـتانەش[١]

شـــار بـــە شـــار شـــیام، گـــێڵام دەربـــەدەر

پەرســـام، کـــەس جـــە دەرد نـــەدارۆ خەبـــەر[٢]

هـــەر دام بـــە ســـەردا پـــەرێ جەســـتەی وێـــم

پـــەرێ داروی دەرد جـــێ نەڕەســـتەی وێـــم[٣]

☆☆☆

---

☜ خەیاڵ ڕۆیشتم و سەیری دنیام کرد و وتم بەڵکوو کەسێک بدۆزمەوە کە ساحێب دەرد بێ.

١- ببوو: ببم. ڕێزەی خاک: تۆز. وەریانەش: بەر ماڵی، بەر درگای. باروو پەی شفام: بێنم بۆ سارێژ. مەرهەم: مەڵهەم، دەوا. جاستانەش: لەبەر درگای. واتە: ببم بـە تـۆزی بـەر مـاڵی ئـەو دەردەدارە و لەبەر درگای ماڵی ئەو مەڵهەمی سارێژ بوون بهێنم.

٢- شیم: ڕۆیشتم. گێڵام: گەڕام. پەرسام: پرسیم. نەدارۆ خەبەر: خەبەری نییە. واتە: شار بـە شـار ڕۆیشتم و دەربەدەر گەڕام و وڵاتم پشکنی و پرسیارم کرد بەڵام کەس هەواڵی دەردی نـەدەزانی، واتـە کەس دەردەدار نەبوو.

٣- پەرێ: بۆ. جەستە: لاشە، بەدەن. وێم: خۆم. داروو: دەوا، مەڵهـەم. جێ نەڕەسـتە: لـێ خـەلاس نەبوو. واتە: بۆ حاڵی لاشەم و بۆ نەبوونی دەرمانی ئەم دەردەم کە خەلاسیم لە دەس نییە هەر دام بـە سـەری خۆمدا. دەکرێت نیوە بەیتی یەکـەمی بـەم جـۆرە بخوێنینـەوە: «هـەڕ دام بـە سـەردا پـەرێ جەستەی وێم» واتە: قوڕم دا بە سەری خۆمدا...

-٢٨-[1]

شــــینم کـــەرۆ نـــەرم، شـــینم کـــەرۆ نـــەرم
واچــدێ بــە قیبلــەیم شــینم کــەرۆ نــەرم[2]

بــــە ڕەشــــتەی چــــاوان، بەســــرینان گــــەرم
بانگ هۆردۆم جە سەر، بێ پـەروا و بـێ شـەرم[3]

زێنهــــار چــۆی تــــەرمم بــــا نۆنـــەمام بـــۆ
وێنــــەی بــــاڵای ئـــەو نــــازک ئەنـــدام بـــۆ[4]

یــــە بـــەڵای بــــاڵای ئـــەو پـــێ کـــەردەنان
عەشـــق دیـــن ئـــەو وە خـــاک بـــەردەنان[5]

---

-٢٨-

١- ک، ئێ، س، م، ر، عم، ب، ج، ح.

٢- شین: گریان، لێرەدا واتە شیوەن و گریان بۆ مردوو. کەرۆ: بکات. واچدێ: بڵێن، بێژن. واتـە: بـە قیبلەم بڵێن بە نەرمی بۆم بگری.

٣- بەسرینان: بە ئەسرینان، بە فرمێسکان. هۆردۆ: هەڵبدا. بێ پەروا: بێ ترس، بێ خۆف، بێ باک. واتە: بڵێن چاوی برەشێ و بە ئەسرینی گەرم بێتە سەرینم و بێ ترس و خۆف بـە دەنگـی بـەرز بـۆم بگری.

٤- زێنهار: ئامان، ئاگات لێ بێت. چـۆی تـەرم: دارە مـەیت. نۆنـەمام: شـلک و ناسـک، تـازە پـێ گەیشتوو. واتە: ئاگادار بن با داری تەرمم لە دارێکی شلک و تازە پێ گەیشتوو بێت با بـە وێنـەی باڵای ئەو (یار) باریک و ناسک بێت.

٥- یە: ئەمە. ئەو پێ کەردەنان: ئەو پێمی کردووە، ئەو پێی کردووم. دین: دیتن، بینین. واتە:

ئەوسە دووچوەی تەرمم سوار کەن
جەو دەرەنگەدا لەیل خەبەردار کەن[1]

نیم نگای نازش چەنیم بکیانۆ
خەمزەش نە باڵین گۆڕم بشانۆ[2]

☞ ئەمە بەڵایەکە کە باڵای ئەو (یار) بە سەری هێناوم و عەشقی دیتنی ئەو کوشتوومی و بۆ گۆڕی بردووم.

١- ئەوسە: پاشان، دوای ئەوە. دوو چووە: دارە مەیت. جەو: لەو. درەنگ: دێر. واتە: پاش ئەوەی دارە مەیتتان خستە ژێر تەرمەکەم ئینجا لەو کاتە دێرەدا لەیل خەبەردار بکەن. (هەرچەند کاتیش دێر و ناوەخت بوو لەیلەکەم خەبەردار بکەن. «وەرگێڕ»).

٢- نیم نگا: بە گۆشە چاو سەیر کردن. چەنیم: لەگەڵم. بکیانۆ: بنێرێ. خەمزە: ناز کردن بە چاو. باڵین: سەرین، سەنیا. بشانۆ: بوەشێنێت، بچێنێت. واتە: با لەیلی بێت و بە گۆشە چاو سەیرم بکات و ئەو بە گۆشە چاو سەیرکردنەی لەگەڵم بنێرێ (بیکا بە تووشەی قیامەتم «وەرگێڕ») و خەمزە و نازی بە سەر گۆڕەکەمدا ببارێنێ.

-١[1]-

قیبلـــەم! جـــەفای تـــۆ، قیبلـــەم! جـــەفای تـــۆ
داڎ، بێـــداڎ، جـــە دەس جـــەور و جـــەفای تـــۆ[2]

ئامـــان جـــە پڕشـــنگ ئامـــا و لـــوای تـــۆ
فـــەریاد جـــە خـــەدەنگ مـــوژەی ســـیای تـــۆ[3]

هـــاوار جـــە ئامـــای شـــەققەی شەســـت تـــۆ
داخ داخ جـــە قـــەتران دیـــڎەی مەســـت تـــۆ[4]

واوەیـــلا پـــەی بـــەژن ســـەوڵ ئەنـــدام تـــۆ
ســـەرتاپا بـــێ عـــەیب، گـــوڵئەنـــدام تـــۆ[5]

---

-١-

١- ک، ئێ، س، ع، ڕ، م، ب، بر، ح.

٢- واتە: ئەی قیبلەم داد و بێداد لە دەس جەور و جەفای تۆ.

٣- پڕشنگ: پرشەی ئاو، تیشک. ئاما و لوا: هات و چوو. فەریاد: هـاوار. خـەدەنگ: تیـر. مـوژە: مژۆڵ، برژانگ. سیا: ڕەش. واتە: ئامان لە دەس پرشەی هات و چووت و هاوار لە دەس تیری مژۆڵـە ڕەشەکانت.

٤- ئامای: هاتنی. شەققە: دەنگـی تەقانـدنی تیـر. شەسـت: جـۆرە کلکەواتەیەکـە لـە کـاتی تیـر هاویشتن بە کەوان لە قامکی دەکەن بۆ ئەوەی ژێی کەوانەکـە قامکیـان برینـدار نـەکات. قـەتران: ماکێکی (مادەیەکی) ڕەشە. واتە: هاوار لە هاتنی دەنگی شەسـتی تـۆ لـە کـاتی تیرئەنـدازی دا و داخەکەم بۆ چاوە ڕەشە قەترانیەکانت.

٥- واوەیلا: هاوار: داخەکەم. پەی: بۆ. بەژن: باڵا. سەوڵ: گیایەکی جوانە کە گوڵی سوور و ☜

قیبلـــەم! ئـــەر مـــەیلت مەنـــدەن نـــە دڵـــدا

ســـا وەس پـــەردەی دڵ بـــڎەر بـــە چڵـــدا [١]

بتەرســـە جـــە ئـــاھ وەخـــت بـــێوەخـــتم

بکیانـــــە مەرھـــــەم پـــەی زام ســـــەختم [٢]

-٢- [٣]

قیبلـەم! چێـو مـاچوو ئەگـەر ھـەن سـەڵات

بـــاڵات بنمانـــــە واڎەی ســـــوب ســـــەڵات [٤]

---

وەنەوشەی ھەیە. گوڵئەندام: ئەندامی وەک گوڵ. واتە: داخەکەم بۆ قەد و باڵای تۆ کە لە سەوڵ دەچێت و سەرتا پا بە وێنەی گوڵ بێ عەیبە.

١- ئەر مەیلت مەندەن: ئەگەر مەیلت ماوە. وەس: بەس. بڎەر: بدە. واتە: قیبلەم! ئەگەر دەزانی مەیلت لە دڵدا ماوە ئیتر بەس دڵم بکە بە چڵەوە و کون کونی بکە.

٢- بکیانە: بنێرە. مەرھەم: مەڵهەم، دەوا. پەی: بۆ. واتە: لە هەناسەی سەردی وەخت و بێ وەختم بترسە و مەڵهەمی زامە سەختەکانم بنێرە.

-٢-

٣- ک، م، ب.

٤- چێو: شتێک. ماچوو: ئەڵێم، ئێژم. سەڵا: سەلاح، بە باش زانین. بنمانە: بنوێنە. واڎەی سوب سەڵات: کاتی نوێژی بەیانی. سەڵات: نوێژ. بانگی نوێژ. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن. لە سەرچاوەی «ب»دا بە جێی «چێو ماچوو»، «جەی دما» نووسراوە.

تـــا ســـۆفی وینـــۆ ئـــەو قـــەد و قامـــەت
قەدقامـــەت واچـــۆ تـــا ڕۆی قیامـــەت[١]

☆☆☆

-٣-[٢]

قیبلـــەم! داخـــەوە، قیبلـــەم! داخـــەوە
تـــۆ وەش بـــای، مـــەردان مـــن بـــە داخـــەوە[٣]

داخـــۆ بـــۆ تـــۆ بـــەی وە بەیداخـــەوە؟
مـــەیل کـــەی وە جەســـتەم بـــە دەماخـــەوە؟[٤]

---

١- وینۆ: ببینێت. قەدقامەت: قَد قامَت الصَلاة، بەشێکە لە قامەتی پێش نـوێژ خوێنـدن. واتـە: قیبلەم! شتێک ئەڵێم ئەگەر بە باشت زانی وەها بکە، پێش لە بانگی بەیانی باڵات بنوێنە تا سۆفی چاوی بە قەد و باڵات بکەوێت و هەتا ڕۆژی قیامەت هەر «قەدقامەت» بڵێت.

-٣-

٢- ب، ڕ، س، ح.

٣- تۆ وەش بای: تۆ خۆش بی. مەردان: مردم. واتە: قیبلەم تۆ خۆش بی (تۆ سلامەت بی) من بـە داخەوە مردم.

٤- بەی: بێی. بەیداخ: پەرچەم، ئاڵا، لێرەدا مەبەست زوڵفی یارە. دەماخ: کۆک، بـە کـەیف. واتـە: داخۆم ئەو ڕۆژە بێ کە تۆ بە دەماخەوە بێی بۆ لای من و پەرچەم (زوڵف)یشت بێنی. لێرەدا شـاعیر لاشەی خۆی بە وڵاتێک دەشوبهێنێ کە بە سپای خەم گیراوە و داوا لە قیبلەکەی (یارەکـەی) دەکـات بە سـپای شـادی و دەماخـەوە بـێ و بـە پەرچـەمی دەمـاخ (زوڵفـەکانی) وڵاتەکـە لـە سـپای خـەم بسێنێتەوە. ئەم مانا لە بەیتە دواییەکاندا زیاتر دەردەکەوێت.

بەیـــذاخان پـــەخش کـــەی وە ســـەر بـــاڵادا
لـــەرزان بـــان نـــە پـــای کـــاڵای ئـــاڵادا [١]

پـــەی چـــێش؟ وە بـــێ تـــۆ بینـــایی دیـــذەم!
ســـپای خـــەم نـــە دڵ وەنـــەم بیـــەن جـــەم [٢]

ســـا بـــە فیـــدات بـــام جـــە بەیـــذاخان بـــۆ
بـــا داخـــان ســـارێش، خـــەم پـــەی داخـــان بـــۆ [٣]

***

---

١- بەیذاخ: پەرچەم، هەندێ جاری بە مانای دەوار و چادریش دێت، لێرەدا مەبەست زوڵفی یارە. پەخش کەی: بڵاو بکەیتەوە. ئاڵا: پەرچەم، هەر شتێک لە دوورە دیار بێت، دەتوانێ بە مانای «ئەعلا»یش بێت بە مانای «نەخت»، زۆر چاک. واتە: زوڵفەکانت بە سەر باڵاتدا بڵاو بکەیتەوە و با لەرزان بێت و بگاتە بەر پێت.

٢- پەی چێش: بۆچی. وەنەم: لێم، لە من. بیەن جەم: کۆ بووەتەوە. واتە: ئەمە لەبەرچی ئەڵێم؟ بێنایی چاوەکانم! لەبەر ئەوە لە کاتێکەوە لە مـن دوور کەوتوویتـەوە، سپای خـەم هـاتووە و دڵمی گرتووە.

٣- بە فیدات بام: بە قوربانت بم. جە بەیذاخان بۆ: بۆنێک لە زوڵفانت، بەیذاخان دەتوانێ شوێنێکی بەرز لە کەش و کێویش بێت. سارێش: سارێژ، خۆش بوونەوە. پەی: بۆ. بۆ: بێ، وەرە. واتە: سـا مـن بە قوربانی تۆ بم بەڵکوو بۆنی زوڵفەکانتم بۆ بهێنی تا ئەو داخەی خەم لـە دڵمـدا دروسـتی کـردووە سارێژ بێت و خەم و خەفەت بۆ داخەکان بمێنێتەوە. بە داخەوە ئەم پارچـە شـێعرە لـە هـیچ کـام لـە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا نییە و ئەم بەیتی کۆتاییشە بە ڕێک و پێکی بۆمان ڕوون نەکرایـەوە. بۆی هەیە بە جێی «جە بەیذاخان بۆ»، «جە پەی داخان بۆ» بێت بە مانای «وەرە بۆ داخەکانم» بەڵام هیچ بەڵگەیەک بۆ سەلماندنی ئەمە نییە.

-٤[١]-

قیبلەم! دڵ تاسە، قیبلەم! دڵ تاسە
دڵ ئێمشەو خەیاڵ تۆش کەردەن تاسە[٢]

تاسەی پەڕ ئەندێش، ویر و وەسواسە
وەسواسەت بڕی جە من هەناسە[٣]

شادیم دا بە تاف دەریای ستەمدا
دڵ مەند نە گێجاو قەڵوەزەی خەمدا[٤]

خەم نیشت وێنەی نێش عەقرەب نە جەرگم
جەرگم بی کەباب، تکیا وە بەرگم[٥]

---

-٤-

١- ل، ب.

٢- تاسە: تامەزرۆیی، ئارەزوو، ئیشتیا. ئێمشەو: ئەمشەو، ئیمشەو. کەردەن: کردووە. واتە: قیبلەم! ئەمشەو دڵ ئارەزووی خەیاڵی تۆی کردووە.

٣- پەڕ ئەندێش: پڕ فکر و خەیاڵ. ویر: بیر. وەسواسە: فکر و خەیاڵی گوماناوی. واتە: ئارەزوویەکە پڕ لە فکر و خەیاڵ و وەسواسە و وەسواسەی تۆ هەناسەی لێ بڕیم .

٤- تاف: تاڤگە، قەڵوەزەی بەرز. ئابشار، کاتێ تاشە بەردێک لە نێو ڕووباردا بێت و لە سەریەوە ئاو بڕژێتە خوار وێنە تاڤگەیەک دروست دەکات کە پێی دەڵێن تاف. مەند: ماوە، مایەوە. واتە: فکر و خەیاڵت شادیمی دا بە زەریای ستەمدا و دڵم لە گێژاوی قەڵوەزەی خەمدا مایەوە.

٥- نێش: چزە. عەقرەب: دووپشک. بێ: بوو. بەرگ: جل و بەرگ، لیباس. واتە: خەم بە وێنەی چزەی دووپشک چوو بە جەرگمدا و جەرگمی کرد بە کەباب و ڕژا بە سەر جل و بەرگمدا. لێرەدا ☜

بــەرگم چــوون ســفتەی مەنــدەی هــەواران
شــەماڵ داش نــە بــورج بــەرزەدیــاران[١]

بــــەو دیــــارەوە دوود ئــــەنگێزنا
ڕۆشــــنی نــە ڕووی ســــەما بێزنــــا[٢]

بێزنــــا شــــادی و زەوقــــم جــە نــۆوە
دڵ بەنــدەن نــە فــەوق کــۆی «داڵــەهۆ»وە[٣]

☆☆☆

☞ مەبەست لە بوون بە کەباب بە خوێن بوونە واتە جەرگم بوو بە خوێن و ڕژا بە سەر جل و بەرگمدا.

١- چوون: وێنەی، وەکوو. سفتە: سووتاو. مەندەی: ماوەی، ئەوەی کە ماوەتەوە. بورج: شوێنێکی بەرز، برزترین شوێن. واتە: جل و بەرگم بە وێنەی خۆڵەمێشی دوای کۆچی هەوارنشینان لە هەوار ماوەتەوە و شەماڵ هەڵیگرت و بردی بۆ شوێنە بەرزەکان.

٢- دوود: دووکەڵ. ئەنگێزنا: هەستاند. سەما: ئاسمان. بێزنا: بێزاری کرد. واتە: بەو شوێنە بەرزانەوە دووکەڵی هەستاند و ڕۆشنایی لە ئاسمان بێزار کرد (ئاسمانی تاریک کرد).

٣- زەوق: کەیف. جە نۆوە: لە نوێوە، لە هەوەڵەوە، دیسان. فەوق: سەر. واتە: دیسان شادی و زەوقم لەبەر چاو کەوت و دڵ لە سەر کێوی داڵاهۆوە ئەسیر و بەندە.

-٥-[١]

قیبلەم دڵگیرەن، قیبلەم دڵگیرەن
جە نازداری وێش ئەوەند دڵگیرەن[٢]

موژەش چوون پەیکان، خەمزەش چوون تیرەن
جە دەروونم دا دایم دڵ گیرەن[٣]

دیدەش چوون جەلاد، داو وازەن پەی قەتڵ
هیچ ڕەحمش نیەن، مەعلوومەن، جە دڵ[٤]

-٥-

١- ب، ڕ، س، ح.

٢- قیبلەم: خۆشەویستم، ئازیزەکەم. دڵگیر: ناڕەحەت، عاجز. ئەوەند: ئەوەندە، هێندە. وێش: خۆی. واتە: قیبلەم لەبەر نازداری خۆی ئەوەندە ناڕەحەتە.

٣- موژە: مژۆڵ، برژانگ. چوون: وەکوو، بە وێنەی. پەیکان: نووکی تیژ. خەمزە: بە نازەوە سەیر کردن. گیر: گرفتار، گیرۆدە. واتە: مژۆڵی لە نووکی تیر و خەمزەی لە تیر دەچێت و دایمە دڵ لە دەروونمدا گرفتارە و بەو تیرانە پێکراوە.

٤- جەلاد: قاتڵ، بکوژی ئەو دیلانەی کە حاکم دەسووری کوشتنی داون. داو: نۆبەت، حەریف. واز: خواز. داو واز: حەریفخواز بۆ شەڕ و پەیکار. واتە: چاوی بە وێنەی قاتڵە و بۆ قەتڵ حەریفخوازی دەکات و دیارە هیچ ڕەحمێکی لە دڵدا نییە.

خـــوداوەنـــد ڕەحمــــێ بکــــەرۆ پەنــــەش
ئــــی بــــێمروەتــــی بســــتانۆ چەنــــەش[1]

☆☆☆

-٦[2]-

قیبلــەم! دووریــت بــام، قیبلــەم! دووریــت بــام
قیبلــەم! بــە فیــدای وەتــەن دووریــت بــام[3]

تاســەی ئێنتێــزار ســەخت زەروریــت بــام
لــــوای نــــارەزای بــــێ دەســــتووریت بــــام[4]

---

١- بکەرۆ پەنەش: پێ بکا. بێمروەتی: بێ ڕەحمی. بستانۆ چەنەش: لێ بسێنێت. واتە: بەڵکوو خودا ڕەحمێکی پێ بکات و ئەم بێ ڕەحمییەی لێ بسێنێت. لەو چوار سەر چاوەدا بە دوای ئەم بەیتەدا چوار بەیتی دیکە هاتووە کە دیارە هیچ پەیوەندیان بە شێعرەکەوە نییە و ئەم چوار سەرچاوەیش یەک سەرچاوەیان هەبووە. ئەمەیش چوار بەیتەکە:

تــۆ مەبــە وە تــەنگ جــە واتــەی بــەدان    ئەر هەی بینابیم سەر وە سەنگ مەدان
بــەد هــەر بــەد بیــەن، خاســی حەســابەن    بــا مــەیلت بــەیۆ، خــەیلێ ســەوابەن
نــیم نگــای نــازت نەزاکــەتدار کــەر    ئــی هــوونڕێزیــە جــە دەروون بــار کــەر
تــا چەنــدێ دنیــا بویــارمێ بــە کــام    نەک نەزاو بۆ مەرگ جەی دنیای بێڕام

-٦-

٢- ک، ب، عم.

٣- بام: بم. واتە: قیبلەم! بە قوربانی دوورە وڵاتیت بم.

٤- تاسە: تامەزرۆیی، نارەزوو، ئیشتیا. ئێنتێزار: چاوەڕوانی. زەرووری: پێویستی. لــوای: ڕۆیشــتن. بێ دەستووری: بێ ئیزن، بێ ئیجازە. بام: بم. واتە: بە قوربانی چاوەڕوانی پێویست و بە نارەزا و ☜

یەنــد واتــت ملــوو، ئــاخر کــەردت ڕاســت
جــە کــەم لــوتفی وێــت هێمـمــەتت نەواسـت[١]

قیبلــــەم! بـــە لـــوات، دڵــم نمەواســـت
قســمەت و نەســیب هــا کــەردش بــە ڕاســت[٢]

دەروونـــــم بـــــایر گـــــڕان مـــــەگڕیۆ
عـــەزاب ســـەختەن یـــار جـــە یـــار بڕیـــۆ[٣]

قیامـــــەت ئەوســـــان بـــــە ڕووی دنیـــــاوە
یـــــاران جـــــە یـــــاران جیـــــا مـــــەباوە[٤]

---

☞ بۆ ئێزن ڕۆیشتنت بم.

١- یەند: هێندە، ئەوندە. واتت: وتت. ملوو: دەڕۆم. وێت: خۆت. نەواست: نەخواست. واتە: هێندە وتت دەڕۆم تا عاقیبەت کردت بە ڕاست و ڕۆشتی و کەم لوتفی و بێ ڕەحمیت کرد و خوداحافزیت نەکرد و بێ ماڵاوایی ڕۆیشتی.

«هەر کۆچ کۆچت بوو کۆچت کرد بە ڕاست     بارگەکـەت لێنـا مـاڵاوات نەخواسـت

فولکلۆری سۆرانی». «وەرگێر»

٢- بە لوات: بە ڕۆیشتنت. نمەواست: نەخوازی، وەهای نەدەزانی. کەردش: کردی. واتە: قیبلەم! دڵم قەت لەسەر ئەو باوەڕە نەبوو کە دەڕۆی بەڵام قسمەت ڕۆیشتنتی کرد بە ڕاست و ڕۆیشتی.

٣- بایر: بە ئایر، بە ئاگر. گڕان: ئاگرێک کە بڵێسەی بەرز بێت. مەگڕیۆ: دەگڕێت. بڕیۆ: ببڕێت. واتە: دەروونم بە ئاگرێکی بڵێسەدار دەسووتێ، دابڕانی یار لە یار چ عەزابێکی سەخت و گرانە.

٤- ئەوسان: ئەوکاتەیە، ئەو وەختەیە. جیا مەباوە: جیا دەبنەوە. واتە: قیامەت ئەو وەختەیە کە یاران لە یەک جودا دەبنەوە.

جــه «لــەوح ئەلمــەحفووز» نویســیان پــەرێم
یــە گشــت دووری تــۆ ســزا مــەدۆ پــێم[١]

***

-٧[٢]-

قیبلــەم! دیــم نــەدێم، قیبلــەم! دیــم نــەدێم
خاڵــت خــاوێ بــێ، ئــەمن دیــم نــەدێم[٣]

بــە ئــێخلاس نــە ڕای عەشــقت شــیم نەشــیم
پەشــتان بــالآت جــارێ بــیم نــەبیم[٤]

---

١- لەوح ئەلمەحفووز: لوح المحفوظ، شوێنی نووسرانی چارە نووس، نویسیان پەرێم: بۆم نووسراوە. سزا: عەزاب. مەدۆ: ئەدات. واتە: لە لەوح ئەلمەحفووزدا لە چارەم نووسـراوە کـە دەبـێ دووری تـۆ ئەوەندە زۆر سزام بدات.

-٧-

٢- ک، ئێ، س، ع، ر، عم، ج، ح.

٣- خاو: خەو. بێ: بوو. واتە: قیبلـەم! خـاڵی تـۆ خـەوێک بـوو بینـیم و نـەمبینی. (وەسـڵی تـۆ ماوەیەکی کەم بوو.).

٤- ئێخلاس: دڵپاکی. نە ڕای: لە ڕێی، لە ڕێگەی. شـیم: ڕۆیشـتم. نەشـیم: نەڕۆیشـتم. پەشـتان: پەخشان، ئاوێتە، تێکەڵ، پێچراوە بە دەوری شتێکدا. واتە: بە دڵپاکی بە ڕێی عەشقی تۆدا ڕۆیشتم و نەڕۆیشتم و جارێک ئاوێتەی بالآت بووم و نەبووم. (ڕۆیشتم و ئاوێتە بووم و پێچرام بەڵام ماوەیەکی کەم بوو).

شـــوکرانەی وەســـڵت وانـــام نـــەوانام
تـــۆ بـــە دۆســـت وێـــم زانـــام نـــەزانام[1]

قیبلـــەم چـــوون وەفـــات بـــێ وەفـــایی بـــێ
ڕەوایـــیم جـــە لات نـــاڕەوایی بـــێ[2]

یـــا شـــا هـــەر کەســـێ بـــێ وەفـــا و بـــەین بـــۆ
گیـــروودەی غـــەزەب ئـــێمام حوســـەیـــن بـــۆ[3]

✡ ✡ ✡

١- وەسڵ: بە یەک گەیشتن. وانام: خوێندم. نەوانام: نەمخوێند. وێم: خۆم. زانام: زانیم. نـەزانام: نەمزانی. واتە: شوکرانەی بە تۆ گەیشـتنم کـرد و نـەکرد و تـۆم بـە دۆسـتی خـۆم زانـی و نـەزانی. (ماوەکەی کەم بوو).

٢- ڕەوایی: بە برەو بوون، شیاو. ناڕەوا: نەشیاو. واتە: قیبلەم! چون تۆ دڵت پێوە نەبوو وەفات لەگەڵ من ببێ و دڵت بە بێ وەفاییەوە بوو شیاوی و بە برەوی (بەناوبانگی) منت لە لا نەشیاو و ناڕەوا بوو. لە نوسخەی «ع»دا بە دوای ئەم بەیتەدا بەیتێکی دیکە هاتووە و ئەمەیش بەیتەکە:

گشـــت عالـــەم زانـــۆ دۆس مـــن تـــۆنی    جـــارێ نەپەرســـای ســـیابەخت کـــۆنی؟

٣- یا شا: ئەی خودا. گیروودە: گێرۆدە، گرفتار. غەزەب: تووڕەیی. ئیمام حوسەین: کوڕی حەزرەتی عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) کە لە دەشـتی کەربـەلادا بـە دەسـتی لەشـکەریەکانی یەزیـدی کـوڕی موعاویە شەهید کرا. واتە: یا خوا هەرکەسێ بێ وەفا و بێ شەرت و بەینە گرفتاری تووڕەیی ئـیمام حوسەین بێت.

-٨[١]-

قیبلـــەم! ســـەردەنی، قیبلـــەم! ســـەردەنی
دیـــارەن بـــە ڕاســـت موبـــەت ســـەردەنی[٢]

یـــام خـــەیاڵ نـــە جـــای هـــەنی بـــەردەنی
یـــان دەســـت جـــە بەینـــەت کۆتـــا کـــەردەنی[٣]

یـــا بـــەدی بـــەدان، بـــەد نـــە ڕات بـــەردەن
یـــا هـــۆ بـــێ مـــەیلی، دەســـت کۆتـــات کـــەردەن[٤]

وەرنـــە یـــانێ چـــێش بینـــایی چـــاوان!
وســـتەنت وە بێـــز بەنـــدەی بـــێ تـــاوان[٥]

-٨-

١- ک، ب، س، م، ع، عم، ن، ر، ل، ن، بر، ح، مج.

٢- سـەردەنی: ساردی، بـێ مـەیلی. دیـارەن: دیـارە، ئاشـکرایە، ڕوونـە. موبـەت: مەحەبـەت، خۆشەویستی. واتە: قیبلەم! دیارە بە ڕاستی لـە خۆشەیسـتیدا سارد و سڕ و بـێ مـەیلی. لـە سەرچاوەکانی «ن»، «ح»، «ر» و «مج»دا بە جێی «قیبلەم»، «چراخ» نووسراوە.

٣- جای هەنی: جێگەیەکی دیکە. بەردەنی: بردووتـە. بەینـەت: بـەین، شـەرت و وەفـا. کـەردەنی: کردووتە. واتە: یا خەیاڵت بردووە بۆ شوێنێکی دیکە (لەگەڵ کەسێکی دیکەدا بەینت بەستووە) یـا هەر بە یەکجاری دەست لە بەین بەستن کێشاوە.

٤- ڕات: ڕێگەت، ڕێت. بەردەن: بردووە. هۆ: خۆ. کەردەن: کردووە. واتە: یـا خـراوی خراپـەکاران لـە خشتەی بردووی یا بێ مەیلی دەستی تۆی کۆتا کردووە.

٥- وەرنە: ئەگینا، ئەینا. یانێ چێش: یانی چی. وستنەت وە بێز: لە بەر چاوت کەوتووە. واتە: ☜

گونـــای تـــۆ نیـــەن دەوڵـــەتم چەفتـــەن
ســـــتارەم جـــە نـــاو ســـــتاران کەفتـــەن[1]

☆☆☆

-٩[2]-

قیبلـــەم! ســـەفای تـــۆ، قیبلـــەم! ســـەفای تـــۆ
چـــێش بـــی نـــەیاوا دڵ بـــە ســـەفای تـــۆ؟[3]

مـــن چـــوون لـــەیلێ دیـــم مێهـــر و وەفـــای تـــۆ
جەوپـــەی نـــەپێچام دڵ جـــە جـــەفای تـــۆ[4]

---

☜ بینایی دیدەکانم! ئەگینا یانی چی لەم بەندە بێ تاوانە بێزراوی؟ لە هەندێک لە نوسخەکاندا بە دوای ئەم بەیتـەدا دوو بـەیتی دیکـە هـاتووە کـە لـە نوسـخەکانی دیکـەدا نییـە و پەیوەنـدی بـە شێعرەکەیشەوە نییە، ئێمەیش تەنیا بۆ هەڵسەنگاندن لێرەدا دەیهێنین:

قیبلـــەم! ئـــەر وەفـــات ئێـــدەن چـەنیمان    موێـــەت ســـەردی مـــەنمانی پـــێمان
پـــەس قەســـەم وەرمـــێ بـــە دیـــدارتان    هـــەنی نـــەوەرمێ ئـــاو جـــە شـــارتان

١- گونا: گوناح، تاوان، خەتا. چەفت: لار. ستارە: ئەستێرە، هەسارە. کەفتەن: کەوتووە. واتە: تاوان و خەتای تۆ نییە کە مەیلت لەگەڵ مندا سارد و سڕە، مـن هـەر خـۆم بـێ شـانس و بـێ ئێقبـاڵم و ئەستێرەم لە نێو ئەستێران کەوتووەتە خوار و بێ ئەستێرە ماوم.

-٩-

٢- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٣- سەفا: شادی و خۆشی. چێش بی: چی بوو. نەیاوا: نەگەیشت. واتە: قیبلەم! ئەمە چی بوو دڵم بە شادی و خۆشی تۆ نەگەیشت.

٤- چوون: وێنەی، وەکوو. جەو پەی: لەبەر ئەوە. واتە: من لەبەر ئەوە دڵم لە جەفای تۆ ☜

وێنــــەی مـــەجنوون دام ســـەر بـــە جـــەفاوە
قـــانع بـــیم بـــە قەیـــد بەســـتەی وەفـــاوە[1]

چەنـــد تـــۆ نمانـــای جـــەور و جـــەفا پـــێم
مـــن هـــەر جـــەفای تـــۆ واونـــام بـــە وێـــم[2]

زڵـــف تـــۆم ســـەوگەند، شـــای ســـاحیب وەفـــا
ئەرســـەد جـــەی بەتـــەر مـــەنمانی جـــەفا[3]

مـــن خـــۆ هـــەر مـــەجنوون جۆیـــای جـــەفانان
جانفیـــدای لـــەیلێ ســـاحیب وەفانـــان[4]

***

---

☜ نەپێچایەوە و هەر دڵم پێت دا، خۆشەویستی و وەفاتم بە وێنەی خۆشەویستی و وەفای لـەیلی زانی.

١- قەید: بەند، زنجیر. واتە: بە وێنەی مەجنوون جەفا و جەورم قەبووڵ کرد و قەناعەتم بەو شـەرت و پەیمانە کرد کە بە وەفاوە بەستبووم.

٢- نمانای: نواندت، نیشانت دا. واونام: لە خۆم گرت، گرتمە خۆم. وێم: خۆم. واتە: تۆ چەند جەور و جەفات بۆم نواند من بە پێچەوانەی تۆوە هەر جەفاتم گرتە خۆم و پێی دڵخۆش بووم.

٣- سەوگەند: قەسەم. ئەرسەد: هەرچەند. جەی بەتەر: لەمە خراپتر. مـەنمانی: دەنـوێنی. مانـای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا پێکەوە دێن.

٤- جۆیا: بە دواوە بوو، دۆزەر. جانفیدا: گیانفیدا، گیان لەسەر دەست. واتە: ئەی شای خـاوەن وەفـا، قەسەم بە زوڵفەکانت هەرچەند دەزانم لەمە زیاتر و خراپتر جەفام بـۆ ئـەنوێنی بـەڵام مـن هـەر بـە وێنەی مەجنوون هەر وام بە دوای جەفاوە و بۆ لەیلای ساحێب وەفا گیان لەسەر دەستم.

-١٠[1]-

قیبلـەم! كـێ نـازوو؟ قیبلـەم! كـێ نـازوو؟
هـەنیچ بـە تـەمای وەسـڵ كـێ نـازوو؟[2]

داروو جـە شـەربەت ڕاز كـێ وازوو؟
بـەی گشـت دەردەوە چـەنیو كـێ سـازوو؟[3]

هـەنیچ كـێ بـە مـەیر بـڎیۆ بـە جەسـتەم؟
كـێ كـەرۆ گوشـاد زوان بەسـتەم؟[4]

كـێ بـۆ بزانـۆ دەروونـم ڕێشـەن؟
كـێ مەرهـەم زام ئـێش مـن پێشـەن؟[5]

---

-١٠-

١- ك.

٢- قیبلەم: خۆشەویستم، ئازیزەكەم. نازوو: بنازم. هەنی: ئیتر، چیتر. واتـە: قیبلـەم ئیتـر مـن بـە تەمای كێ بم و بە وەسڵی كێ بنازم؟

٣- شەربەت ڕاز: قسەی شیرین، قسەی خۆش. بەی: بەم، بە ئەم. گشت: هەموو. چەنی: لەگـەڵ. سازوو: بسازم. واتە: ئیتر قسەی شیرینی كێم بۆ ببێت بە مەڵهەم و بەم هەموو دەردەوە لەگەڵ كـێ بسازم؟

٤- هەنی: ئیتر، چیتر. مەیر: مێهر، خۆشەویستی. بڎیۆ: ببینێـت، سـەیربكات. كـەرۆ: بكـات. گوشاد: باز، ئاوەڵا. واتە: ئیتر كێ بە خۆشەویستیەوە بە لاشەمدا بڕوانێ و كێ بمهێنێتە قسە؟

٥- كێ بۆ: كێ بێت. بزانۆ: بزانێت. ڕێش: بریندار. پێشـەن: پێیـە. واتـە: ئیتـر كـێ هەیـە بزانـێ دەروونی من بریندارە و مەڵهەمی زامەكانم وا بە لای كێوە؟

غـــەیر جــە تـــۆ فێشـــتەر دووروەتـــەن کەســـم!
نیـــــەن، نـــــەداروو، کـــــەس فەریادڕەســــم[١]

☆☆☆

-١١-[٢]

قیبلـــــەم! گرفتــــار، قیبلـــــەم! گرفتـــــار
دڵ بـــــە جـــــەفای تـــــۆ بیـــــەن گرفتـــــار[٣]

هێجرانــت بــەو تــەور وەنــەم کــەردەن کــار
مـــات و بێـــدەنگم چـــوون نـــەخش دیـــوار[٤]

نـــــە زوان یـــــاران چـــــەنیت کـــــەرۆ ڕاز
نـــە هـــەن دەلیلێـــو عـــەرز کـــەرۆ نیـــاز[٥]

---

١- فێشتەر: زیاتر، زۆرتر. نەداروو: نیمە. واتە: ئەی کەسە دوور وڵاتەکەم! جگە لە تۆ کەسم نییە بە هاوارم بگات و فریام بکەوێت.

-١١-

٢- ک، س، م، ڕ، ب، ح.

٣- بیەن: بووە. واتە: قیبلەم هەرچەند دەزانم تۆ جەفام لەگەڵ دەکەی بەڵام من دڵم گیرۆدەی جەفای تۆ بووە.

٤- بەو تەور: بەو جۆرە. وەنەم: لێم، لە من. واتە: دەردی دووری تۆ بە جۆرێ کاری لێ کردووم کە بە وێنەی نەخشی ڕووی دیوار مات و بێدەنگم.

٥- یارا: توانین. چەنیت: لەگەڵت. نە هەن: نە هەیە. دەلیل: ڕێگە بەڵەد، ڕێ نیشان دەر. کەرۆ: بکات. واتە: نە زمانم توانای ئەوەی هەیە قسەت لەگەڵ بکات و نە دەلیلێکیش هەیە تا بینێرم ☜

نــــە گـــۆش نـــەزداوەن بژنــــەوۆ دەنگـــت
نــــە چـــەم نـــوورش هـــەن بوینـــۆ ڕەنگـــت[١]

نــــە كۆتــــا مـــــەبۆ هەناســــەی ســــەردم
نــــــە تـــــۆ مـــــەزانی بــــــە حـــــاڵ دەردم[٢]

خـــەریکم بـــەی تـــەور جـــەفای ســـەختەوە
بـــەی تاڵـــەی بەدْبـــەخت مـــەجنوون ڕەختـــەوە[٣]

☆☆☆

---

☞ بۆ لات نیازی دڵمت پێ بڵێت.

١- نەزداو: نزیک. بژنەوۆ: ببیسێت. چەم: چاو. بوینـۆ: ببینێـت. واتـە: نـە گـوێم لێتـەوە نزیکـە دەنگت ببیستێ و نە چاوم نووری ماوە بتوانم شێوە و ڕەنگت ببینم.

٢- مەبۆ: دەبێ. مەزانی: دەزانی. واتە: نە هەناسەی سەردم كۆتا دەبێت (دەمرم) و نە تۆ بـە حـاڵی دەردم دەزانی.

٣- بەی تەور: بەم جۆرە. تاڵە: تالێع، چارەنووس. ڕەخت: جل و بەرگ، لیباس. واتە: بـەم جـۆرە بـەم دەردە سەختەوە سەرقاڵم و چارەنووسم بەدبەختی و جل و بەرگم بە وێنـەی مەجنوونـە. (جلـی شـڕم لەبەردایە).

-١٢-[١]

قیبلـــــەم نمانـــــا، قیبلـــــەم نمانـــــا
تـــایێ جـــە گیســـووش پەنـــەم نمانـــا[٢]

دیـــن جـــە دەســـتم ســـەند، ئـــیمان ســـتانا
وەشـــی ئـــی دنیـــا هـــیچ پـــێم نـــەمانا[٣]

هەی داڵ، هەی بێداڵ، هـەی هـای، هـەی هانـا
تـــاییێو بـــی بـــەی تـــەور ســـتەم نمانـــا[٤]

ئـــەر وەردۆ زڵفـــان دوو دەســـتەی کـــڵاف
شـــێخان کـــەبیر، ســـۆفیان ســـاف[٥]

---

-١٢-

١-ک، ئێ، ح.

٢- نمانا: نواند، نیشان دا، دەرخست. تایێ: تاڵێک. جە: لە. گیسوو: زوڵف. پەنەم: پێم، بۆ مـن. واتە: قیبلەم تاڵێک لە زوڵفەکانی بۆم دەرخست.

٣- ستانا: ستاند، سەند. پێم نەمانا: پێم نەما. واتە: دین و ئیمانی لێم ستاند و خۆشی ئـەم دنیـام هیچ پێ نەماوە.

٤- های: هاوار. هانا: بە فریام بکەون. نمانا: نواند. واتە: هەی داد و بێداد و ئەی هـاوار بـە فریـام بکەون تاڵێک لەو زوڵفانە بوو بەم جۆرە جەور و ستەمی نواند و وەهای پێ کردم.

٥- ئەر وەردۆ: ئەگەر بەر داتەوە. دوو دەستەی کڵاف: دوو پەلکـە. کـەبیر: گـەورە. سـاف: پـاک. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

مەشـــان نـــە مەزهـــەب تـــەمام بـــێ دینـــان
ئـــــیمان مەورەشـــــان، زوننـــــار مـــــەبینان[١]

✯✯✯

-١٣-[٢]

قیبلـــەم! نـــە خـــاوم، قیبلـــەم! نـــە خـــاوم
قیبلـــەم! چ خەیرتـــەن نمـــەی نـــە خـــاوم؟[٣]

یـــا شـــوومی منـــەن، ڕەنـــج بـــەردەی لاوم
یـــا تـــۆ ڕەنجیـــدەی، ســـۆی هـــەر دوو چـــاوم[٤]

مەگـــەر خـــاترت چێمـــە ڕەنجیـــدەن؟
نـــە شـــەو مـــەی نـــە خـــاو، نـــە ڕۆ نـــە دیـــدەن[٥]

---

١- مەشان: درۆن. مەورەشان: دەفرۆشن. زوننار: پارچەیەکە کە ئەو کات مەسیحیان دەیانبەستە کەمەر بۆ ئەوەی لە موسوڵمانان جیا بکرێنەوە. مەبینان: دەبەستن. واتە: ئەگەر زوڵفەکانی کە کردوویە بە دوو پەلکە بەرداتەوە هەموو شێخانی گەورە و سۆفیانی پاک دەچنە سەر مەزهەبی بێ دینان و ئیمان دەفرۆشن و زوننار لە کەمەر دەبەستن.

-١٣-

٢- ک، س، ڕ، ع، ب، ح.

٣- نە: لە، نێو، (فارسی: دَر). خاو: خەو. نمەی: نایەی. واتە: قیبلەم! بۆچی نایەیتە خەوم؟

٤- شووم: نەحس. منەن: منە. لاو: لافاو. سۆ: سۆما، نوور. واتە: ئەی نووری چاوەکانم! یا نەحسی منە و ڕەنجم بردەی لافاوە یا تۆ ڕەنجاوی کە ئیتر نایەیتە خەوم.

٥- چێمە: لە ئێمە. ڕەنجیدە: عاجزبوو. مەی: دێی، دێیت. خاو: خەو. ڕۆ: ڕۆژ. واتە: مەگەر ☜

بەشــق دیــدەی وێــت شــەوێ جــە شــەوان
بــۆرێ نــە خــاوم چــوون پــەیک دەوان[1]

تــا ســێر تەماشــای بــاڵات بکــەروون
نــەبا داخ وە قــەبر قیامــەت بــەروون[2]

قیبلــەم مەتەرســوون تــۆرت یــەکجار بــۆ
ئــاهێر دووریــت لــێم ئێختیــار بــۆ[3]

☆☆☆

خاترت لە ئێمە ڕەنجاوە کە نە شەو دێیتە خەوم و نە ڕۆژ دێیت کە چاومان پێت بکەوێت.

١- بەشق: بە عەشق، بە خاتری، لەبەر. وێت: خۆت. بۆرێ: وەرە، بێ. چوون: وێنەی، وەکوو. پەیک: نێردراو، نامەبەر. دەوان: تیژ، گورج. واتە: بە خاتری چاوەکانی خۆت شەوێک وەکوو نامەبەرێکی توند و تیژ وەرە خەونم.

٢- سێر: پڕ بە دڵ. بکەروون: بکەم. نەبا: نەوەک. بەروون: ببەم: واتە: (وەرە خەونم) با پڕ بە دڵ سەیری باڵات بکەم نەوەک داخی دیتنت بەرمە گۆڕ و قیامەت.

٣- مەتەرسوون: دەترسم. تۆرت: تۆرانت. ئاهێر: ئاگر. ئێختیار: هەڵبژاردن. واتە: قیبلەم دەترسم بە یەکجاری بتۆرێی و ئاگری دووریت بۆ ئێمە هەڵبژێرا بێت و ناچار بین هەر لێت دوور بین.

-١٤-[1]

قیبلـــەم! نەکێشـــۆ، قیبلـــەم! نەکێشـــۆ
ســـەرێ کـــە ســـەودای خاڵـــت نەکێشـــۆ[2]

خـــاترێ وە غـــەم تـــۆ نەیەندێشـــۆ
وە زام نـــاوەک ســـوب ســـەحەر ئێشـــۆ[3]

ســـەرێ وە لای تـــۆ ســـەر نـــەدۆ شـــەوان
پـــایێ کـــە نـــەیۆ وە لات وە دەوان[4]

ئـــەو ســـەر ســـەرنگوون گڵکـــۆی تـــازە بـــۆ
ئـــەو پـــا گەســـتەی مـــار بـــێ ئیجـــازە بـــۆ[5]

-١٤-

١- س، م، ل، ح. ئەم پارچە شێعرە لە هیچ کام لە نوسخە بنەڕەتیەکانی («ک» و «ئـێ») لای ئێمـە نەهاتووە ئێمەیش بە پێی ئەو سەرچاوانە هێنامان.

٢- نەکێشۆ: نەکێشێت. سەودا: فکر و خەیاڵ. مانای ئەم بەیتە بە بەیتی دواییەوە بەستراوە.

٣- نەیەندێشۆ: لە فکردا نەبێ. ناوەک: تیر. سوب: بەیانی. ئێشۆ: بێشێت. واتە: قیبلەم! سەرێک کە خەیاڵی تۆی نەبێت و خاترێک کە بیری خەمی تۆی نەبێت بەڵکوو بە تیری بەیانی زامدار بێت و بێشێت.

٤- نەدۆ: نەدا. نەیۆ: نەیەت. دەوان: تیژ، گورج. مانای ئەم بەیتە بە بەیتی دواییـەوە بەسـتراوە.

٥- سەرنگوون: ژێرە و بان. هەڵگەڕاوە. گڵکۆ: خاکی گۆڕ. مـاری بـێ ئیجـازە: مارێـک کـە ئیزنـی پێوەدانی نەبێ، ئەڵێن ئەوسا پیاو چاکان بە ماریان وتووە ئیزنت نییە بە کەسەوە بدەی و ئیتر کەسـی نەگەستووە. واتە: سەرێک کە شەوانە سەرت لێ نەدا و پێیەک کە بە خێرایی ناگاتە لات، ☜

دیـــدێو نـــەوینۆ هـــەر ســـەحەر ڕەنگـــت
زوانێـــو نـــەبۆ شـــەو بـــە هـــام دەنگـــت[1]

ئـــەو دیـــدە ئەســـرش بـــێ مـــدارا بـــۆ
ئـــەو زوان بـــە ســـەنگ ســـیای ســـارا بـــۆ[2]

دەســـــتێو نەکـــــەرۆ ســـــەیرانی باخـــــت
نەکـــــەرۆ خزمـــــەت بـــــەرزی دەماخـــــت[3]

ئـــەو دەســـتە بەســـتەی جـــەلادی گـــەور بـــۆ
هـــەر ڕۆ جـــە نـــۆوە ســـزاش بـــەی تـــەور بـــۆ[4]

---

☜ بەڵکوو ئەو سەرە بچێتە ژێر خاک و ئەو پێ گەستەی ماری بێ ئیجازە بێت.

١- دیدێو: چاوێک. نەوینۆ: نەبینێت. زوانێو: زمانێک. نەبۆ: نەبێ. مانای ئـەم بەیتـە بـە بـەیتی دواییەوە بەستراوە.

٢- ئەسر: ئەسرین، فرمێسک. بێ مدارا: بێ ئارام، بێ وەستانەوە. سەنگ: بەرد. سیا: ڕەش. سـارا: دەشت و دەر. واتە: چاوێک کە هەموو بەیانی ڕەنگـی تـۆ نـەبینێ و زمانێـک شـەوانە هاودەنـگ و هاوقسەی تۆ نەبێت بەڵکوو ئەم چاوە بێ ئارام و بێ وچان ئەسرین بڕێژێت و ئـەو زمانـەیش ببێتـە بەردی ڕەشی دەشت و دەر.

٣- دەستێو: دەستێک. نەکەرۆ: نەکات. باخ: مەبەست ناو سینەیە. بەرزی دەماخ: دەمـاخ بـەرزی، کۆکی، سازبوون. مانای ئەم بەیتە بە بەیتی دواییەوە بەستراوە.

٤- بەستە: بەستراو. جەلاد: بکوژی زیندوو. گەور: گاور، ئاگر پەرەست، لێرەدا مەبەست کافری بـێ ڕەحمە. هەر ڕۆ: هەر ڕۆژ. جە نۆوە: لە نوێـوە، سـەر لـە هەوەڵـەوە. بـەی تـەور: بـەم جـۆرە. واتـە: دەستێک کە سەیرانی ناو سینەت نەکا و لە خزمەتی خۆشی و بەرزە دەماخی تۆدا نەبێت ☜

چـــێش مـــەبۆ دیـــدەم جـــە ســـاڵێ جـــارێ
بــــــاوەریم وە یـــــــاذ وە یادگـــــــارێ؟[١]

تاتـــایێ جـــە تـــای زڵـــف موشـــکینت
یـــا دانـــەی جـــە خـــاڵ دەور جـــەمینت[٢]

ئـازیز! ئـەر بـۆ مـەیل، ئـاخر مـەبۆ چـێش؟
بکیـــانی پـــەرێم پـــەی ســـاکنی ئـــێش[٣]

---

☜ بەڵکوو ئەو دەستە بەستەی جەلادی کـافری بـێ ڕەحـم بـێ و هـەموو ڕۆژێـک سـەر لـە نـوێ ببەسرێت و سزای بەم جۆرە بێت. لە نوسخەی «ل»دا لێرەدا شێعرەکە تەواو دەبێت و لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «ر» و «س»دا بە دوای ئەم بەیتەدا بەیتێکی دیکە هاتووە و ئەمەیش بەیتەکە:

قیبلەم! دووری تۆ یەکجار مـنش کوشـت     بـیللا بـەی تـەور بـۆ بێـزارم جـە گشـت

بەڵام دیارە ئەم بەیتە لە باری ماناوە لە ناوەرۆکی شێعرەکەوە دوورە و ئێمەیش تەنیا بۆ هەڵسـەنگاندن لێرەدا هێنامان. لە نوسخەی «م» و هەروا لە شەرحی سەرچاوەی «ح»دا ئـەو چـوار بەیتـە کـە بـە دوای ئەم بەیتەدا هێناومانە هاتووە و دیارە کە پەیوەندی ماناییان بە شێعرەکەوە هەیە.

١- چێش مەبۆ: چی دەبێ. باوەریم وە یاذ: بە یادم بهێنیتەوە، یادم بکەی. واتە: چاوەکەم! چی دەبێ ساڵێ کەرەتێک یادی من بکەی؟ لە بەیتە دواییەکاندا ئەڵێ مەبەستی لە یادگاری چییە.

٢- تا: تاڵی موو. زڵف: زوڵف، قژ، کەزیە. موشکین: ڕەش و بۆنخۆش بە وێنەی موشک. جەمین: تەوێڵ، نێو چاوان. مانای ئەم بەیتە لە گەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٣- ئەر: ئەگەر. بۆ: بێ، هەبێ. مەبۆ چێش: چی دەبـێ. بکیـانی پـەرێم: بـۆم بنێـری. پـەی: بـۆ. ساکنی: ئارام بوونەوە. واتە: ئازیز! ئەگەر مەیلت هەبێ چـی دەبـێ تاڵێـک لـە تـاڵی زوڵفـە ڕەشـە بۆنخۆشەکانت یا خاڵێک لە خاڵی دەوری ڕوومەتت بۆ ئارام بوونەوەی ئێشەکانم بۆ بنێری؟

وەرنـــە هـــا مـــەردم ســـپی ســـەوڵ قامـــەت
داوای مـــن و تـــۆ کـــەفت ئـــەو قیامـــەت[١]

⁂

-١٥-[٢]

قیبلـــەم! وە شـــەو بـــۆ، قیبلـــەم! وە شـــەو بـــۆ
مـــەیل کـــەر وە جەســـتەم، شـــەوێ وە شـــەو بـــۆ[٣]

بـــڎەم نـــە دەمـــاخ شـــەوبۆت چـــوون شـــەوبۆ
تـــا دڵـــم ســـاکن وە بـــۆی شـــەوبۆت بـــۆ[٤]

---

١- وەرنە: ئەگینا، ئەینا. ها مەردم: ئەوە مردم. سەوڵ: گیایـەکی جوانـە کـە گـوڵی زەرد و سـوور و وەنەوشی هەیە. داوا: شەرع. کەفت: کەوت. واتە: ئەی ئەو کەسەی باڵات لە سەوڵی سپی دەچێـت ئەگینا ئەوە من مردم و شەرعی من و تۆ کەوتە قیامەت.

-١٥-

٢- ک، س، ڕ، عم، ح.

٣- بۆ: بێ، وەرە. واتە: قیبلەم! شەوێک مەیلی لاشەم بکە و وەرە بۆ لام.

٤- بڎەم نە دەماخ: بدە بە لووتمدا. شەوبۆ: گیایەکە گوڵی وەنەشی هەیە و لە کوێستاندا دەڕوێ و لە فێنکایی شەودا بـۆنی هەیـە هـەر لەبـەر ئـەوە پێـی ئـەڵێن شـەوبۆ، بـۆ دەرمـانی هەنـدێ دەرد و نەخۆشیش بە کەڵکە، گوڵەکەی وشک دەکرێ و دەکرێتە نێو ئـاوە کـوڵ و سـەری بـە سـەردا دەگـرن، لێرەدا مەبەست زوڵفی یارە کە بە وێنەی شەوبۆ بۆنی خۆشە. چوون: وێنـەی، وەکـوو. سـاکن: ئـارام، ئۆقرە. واتە: زوڵفەکانت بە وێنەی شەوبۆ بدە بە لووتمدا تا دڵم بە بۆنی زوڵفەکانت ئۆقرە بگرێت.

نــــه ماچـــان شـــەوبۆ جـــه ســـەر نســـاران

شـــەو بـــۆش مەبەخشـــۆ پـــەی دەردەداران؟ [١]

قیبلـــەم! تـــۆیچ بـــەو ڕەنـــگ شـــەوبۆ بنمانـــە

شـــەوێ بـــە شـــەماڵ شـــەوبۆت بكیانـــە [٢]

شـــــەماڵ بـــــۆی شـــــەوبۆ بـــــە دەوان دەو

بـــــــاوەرۆ پـــــــەرێ دەردەدار شـــــــــەو [٣]

⁂

١- نه ماچان: مەگەر ناڵێن. مەبەخشۆ: دەبەخشێت، بڵاو دەكاتەوە. واتە: مەگەر ناڵێن گوڵی شەوبۆی نساران شەوانە بۆنی خۆی بڵاو دەكاتەوە و بۆ دەردەدارانی دەنێرێ.

٢- بنمانه: بنوێنه. بكیانه: بنێره. واته: قیبلەم! تۆیش بە وێنەی ئەو شەوبۆ شەوێک بە شەماڵدا زوڵفەكانت بنێرە بۆم.

٣- دەوان: بە هەڵهاتن، بە خێرایی. دەو: هەڵهاتن. باوەرۆ: بهێنێ. پەرێ: بۆ. واتە: با شەماڵیش بە خێرایی و هەڵاتن بۆنی زوڵفەكانت كە بە وێنەی بۆنی شەوبۆ وایە بۆ من بهێنێ كە شەوانە دەردەدارم.

ئەم شێعرەی بێسارانی كاریگەری زۆری لەسەر شاعێرانی پاش خۆی هەبووە و ئەوانیش بە شێعر زوڵفی یاریان بە شەوبۆ شوبهاندووە و یا بە پێچەوانەوە شەوبۆیان لەگەڵ زوڵفی یار هەڵسەنگاندووە. بۆ وێنەی هەندێک لەو شێعرانە لێرەدا دەهێنین.

ڕەنجووری:

چـراخم! بـه شـەو، چـراخم! بـه شـەو شەوێ چوون شەوبۆ با بۆت بـۆ بـه شـەو
شـەو بـۆت نـه دەمـاخ شـەوبۆ دەورێ دۆ تا شەوبۆ جه بۆی ئەو شەو بۆن خۆش بـۆ
شەو بۆی شەوبۆوان جەوپەی وەش شێوەن شەو بۆیێش جه بۆی شەوبۆی تـۆ پێـوەن
ڕۆ ڕەنگـت مـەدۆ شـەوق وە نـوور چـەم شەو شـەوبۆت نـه دڵ هـیچ نمـازۆ خـەم
ئـەر شـەوێ شـەوبۆت بـەیۆم نـه دەمـاخ پەی بۆی شەوبۆوان کەی مەکێشام داخ؟
ئـەر شـەوبۆت بـدۆ وە مـن بـۆی شـەوبۆ شەڵڵا ڕۆی ڕۆشن جه لام چوون شـەو بـۆ
ڕەنجووری هەر شەو ئـارەزووش بـۆی تـۆن جەوپەی دەمـاخش پـەڕ عـەتر شـەوبۆن

* چوار بەیتی سـەرەتای شـێعرەکە سـەروای نییـە بـەڵام لـە دیوانەکەیشـیدا هـەروا نووسـراوە کـە هێناومانە.

ئەحمەد بەگ کۆماسی:

چـــراخم! شـــەوبۆ، چـــراخم! شـــەوبۆ شـەوێ جـه شـەوان شـیم پـەرێ شـەوبۆ
هەراس بـیم جـه داخ شـەوبۆی زڵـف تـۆ لاعـەلاج چنـیم دەسـتەی شـەوبۆی کـۆ
شـایەد بـۆی زڵفـت کـەمێ بـەیۆ لـێش بەڵکـه زامـانم کەمتـەر کـەران ئـێش
چەنـدێ بـۆ نیـام بـۆ وە بـۆی شـەوبۆ بۆش مـەدا ئـەمما نـه چـوون زڵـف تـۆ
فیدای ئەو شـا بـام تـۆش ئیجـاد کـەردەن زڵفانـــت گـــرەو جـــه شـــەوبۆ بـــەردەن
ئـەر شـەو بـۆی زڵفـت بـدەم بـه شـەوبۆ دەیـــری بـــام نـــه جـــەمع دەیریـــان کـــۆ
«ئەحمەد» تا زێندەن هەر سـەرگەردانەن پـــەی شـــەوبۆی زڵفـــت وێـــڵ هەردانـــەن

ئەحمەد بەگ کۆماسی:

چـراخم! شـەو بـۆ، چـراخم! شـەو بـۆ مەیل کەر وە جەستەم، شەوێ جه شەو بۆ
شەوبۆ جـه شـەوبۆی شـەوبۆت گێرتـەن بـۆ جه شەو بۆی شەوبۆت شەوبۆ بۆش چوون تۆ
شەو بۆی شەوبۆوان هەم جه شەوبۆی تۆن شەوبۆی تۆ نەبۆ، شەوبۆ بۆش جـه کـۆن؟
شـەو بـۆ وە نـاز بـۆ شـەوبۆت وە نـاز بـۆ شـەو چـەنی شـەوبۆت بـدەر پـێم تـا ڕۆ
ئەر شەو بۆت بدەون مـن بـه شـەوبۆوان چـەنی شـەوبۆوان بگنـوو ئـەو کـۆوان

☞

«ئەحمەد» خۆ شەیدای شەوبۆی نازتەن شێویای کرێشمەی شەوئەندازتەن

میرزا ئەحمەد داواشی:

ئازیزم! شەوبۆ، ئازیزم! شەوبۆ ئارەزووم ئەکرد بوینم شەوبۆ

بگێروون وە دەس بکەروون وە بو بزانم چوونەن چەنی زڵف تۆ

زار و زویر و زەدە و زام بە سۆ غەمین و غەمبار، خار و غەم وە کۆ

پەشێو بیم چوون زڵف پەڕ پەشێو تۆ چوون مەجنوون وە یاد لەیلێ دام وە کۆ

دیم نیشتەن جەمع یاران خۆشخۆ جەم کەردەن خەرمان گوڵاڵان کۆ کۆ

یەکێ وە لێشان نەونەمام نۆ دەس بەرد یەک دەستەی شەوبۆی شاهۆکۆ

بەخشا پێم و وات ئی دەستەی شەوبۆ باو تۆن ئێمشەو بۆش کەر تا وە ڕۆ

زام کۆنە و نۆم کول ئاورد وە سۆ کەفتم وە خەیاڵ خاڵ و زڵف تۆ

ئەو کە دەس ئاوەرد، من هەم دەس بەردم ئەو دەستەی شەوبۆ جە دەستش گەرتم

هەرتا بۆش کەردم، تەواسام، مەردم بۆی زڵفت سەوزەم وە یاد ئاوەردم

ئێستێشمامم کەرد وە ئارەزووی وێم مەزەی فەزای زڵف تۆ نەبەخشا پێم

وە تەشخیس وێم، شەوبۆ و زڵف تۆ فەرقش زیاد بی ئێد کۆ ئەو جە کۆ

شەوبۆ فەقەت هەر وە شەو مەدۆ بۆ چوون قیاس کەروو چەنی زڵف تۆ

زڵف تۆ شەوبۆن وە شەو تا سەحەر سوب مەبۆ وە عوود، نیمەڕۆ عەنبەر

وە عەسرەو مەبۆ وە دەستەی عەبیر گیان بدەی جە ڕاش نمەیۆ وە گیر

مەغریب عادەتش ئێدەن چوون ئەژدەر مەپیچیۆ وە تووڵ باڵات چوون عەرعەر

یە کێ بۆ جە ڕاش گیان سپەردە بۆ؟ چوون من ناغافڵ دەس پەیش بەردە بۆ

دێوانە بە مەرگ وێش نیەن ڕازی چوون «ئەحمەد» بە مار بکەرۆ بازی؟

-١٦[١]-

قیبلـــەم! ویـــەردەن، قیبلـــەم! ویـــەردەن
حـــەرفێوم جـــە شەســـت زوان ویـــەردەن[٢]

گۆیـــا جـــاش نـــە دڵ نازکـــت کـــەردەن
زوانـــم لاڵ بـــۆ غەڵـــەت ویـــەردەن[٣]

مـــن حـــەرفم پـــەرێو نەســـیحەت وانـــا
تـــۆ نەســـیحەتت بـــە بێجـــا زانـــا[٤]

خجـــڵ مەنـــدەنان جـــە واتـــەی بێجـــام
جـەی بێجـای بـێ حـەد هێجـران سـەرئەنجام[٥]

-١٦-

١- ک. ئەم پارچە شێعرە لە نوسخەی «ع»یشدا بە کەم و کورتی‌یەوە هەیە.

٢- ویەردەن: ڕابورد، گوزەرا. حەرفێو: قەسەیەک. شەست: ئـەو کلکەوانـەی لـە کـاتی ڕاو کردنـدا دەیانکردە قامکیان بۆ ئەوەی ژێی کەوانەکە قامکیان نەبڕێت. واتە: قیبلەم! قەسـەیەک لـە زمـانم ترازا و لە دەمم دەرچوو.

٣- گۆیا: وادیارە. جـاش: جێـی. کـەردەن: کـردووە. لاڵ بـۆ: لاڵ بـێ. غەڵـەت ویـەردەن: بـە هەڵـە هاتووەتەدەر. واتە: وا دیارە کە دڵی ناسکت لێی ئێشاوە و لە دڵتدا جێگیر بـووە، بـەڵکوو زمـانم لاڵ بێت بۆ ئەو قسەی کە بە هەڵە لە دەمم دەرچووە.

٤- پەرێو: بۆ. نەسیحەت: ئامۆژگاری. وانا: خوێند. بێجا: بێ جێ. زانا: زانی. واتە: من قسەم بـۆ ئامۆژگاری کردبوو بەڵام تۆ ئامۆژگاریەکەت بە بێ جێ و هەڵە زانی.

٥- خجڵ مەندەنان: خەجاڵەت ماوم. واتە: وتە، قسە. جەی: لە ئەم، لەم. هێجران: دووری.

ئیسە مەن پەرێو عوزر تەقسیرات
شمشێر وە گەردەن ئامام وە دەرگات[١]

چوونکە مەن بێجای بێ حەدم کەردەن
بفەرما جەللاب بدۆم وە گەردەن[٢]

وەگەرنە حەیفەن هەی بەرگوزیدە
بدیەی وە بێجای گەدای گەردیدە[٣]

تۆبە بۆ بە دەست پادشای شاهان
هەنیچ نەواچوو بێجای جە حەرفان[٤]

☆☆☆

سەرئەنجام: عاقیبەت. واتە: لەم وتە بێ جێیمە کە عاقیبەتی بوو بە دووری تۆ خەجاڵەت و پەشیمانم.

١- پەرێو: بۆ. عوزر: داوای لێوردن. تەقسیرات: کۆی «تەقسیر»ـە بە مانای کۆتایی کردن و خەتابار بوون. ئامام: هاتم. واتە: ئێستە من بۆ داوای لێبووردن کردن مل بە شمشێرەوە هاتوومەتە درگات یا بەم شمشێرە بمکوژە یا بمبوورە.

٢- بفەرما: فەرموو، دەسوور بدە. جەللاب: جەلاد، کەسێک کە کاری کوشتنی تاوانبارانە. بدۆ: بدات. واتە: چونکە من قسەیێکی زۆر بێ جێم کرد ئەمر بکە جەلاد لە سەرم بدات.

٣- وەگەرنە: ئەگینا، ئینا. بەرگوزیدە: هەڵبژێراو، تاقانە. بدیەی: ببینی، سەیربکەی. گەدا: هەژار، فەقیر، نەدار. گەردیدە: گەڕیدە، کەسێ کە زۆر بگەڕێت. واتە: ئەگینا تاقانەکەم حەیفە قسەیێکی بێ جێی هەژارێکی گەڕیدە لەبەر چاو بگری و دڵت لێی بێشێ.

٤- تۆبە بۆ: تۆبە بێت. پادشای شاهان: خودا. هەنیچ: ئیتر، چیتر، چیدی. نەواچوو: نەڵێم.

-١٧-[١]

قیبلـــەم! هـــا مـــەردم، قیبلـــەم! هـــا مـــەردم
قیبلـــەم! جـــە دووریـــت بـــیللا هـــا مـــەردم[٢]

هـــەر شـــەو تـــا وە ســـوب هـــامراز دەردم
هـــەی داڎ، هـــەی بێـــداڎ، هـــەی رۆی نەبـــەردم[٣]

هێجرانـــت وەی تـــەور کـــار کـــەردەن وەنـــەم
هـــەر ســـاتێ مـــەرگێ مـــەنمانۆ پەنـــەم[٤]

---

حەرف: قسە. واتە: تۆبە بێت لە سەر دەستی خودا (بە شایەتی خودا) کە چیتر قسەی بێ جێ نەکەم. بە داخەوە ئەم بەیتە سەروای نییە («ان» نیشانەی کۆکردنەوەیە و «شاه» و «حەرف» نابنە سەروا) و لە نوسخە خەتیەکانیشدا هەروا نووسراوە کە نووسیومانە.

-١٧-

١- م، بر، ح.
ئەم پارچە شێعرە لە شێعری بێسارانی ناچێت بەڵام بە پێی ئەوەی لە سەرچاوەی «ح»دا و هـەر وەهـا لە نوسخەکانی «م» و «بر»دا لە نێو شێعرەکانی بێسارانیدا هاتووە ئێمەیش لێرەدا دەینووسینەوە.
٢- ها مەردم: ئەوە مردم. بیللا: قەسەم بە خوا. واتە: قیبلەم! قەسـەم بـەخوا ئـەوە لـە دووری تـۆ مردم.
٣- سوب: بەیانی. هامراز: هاو دەنگ، هاورێ. نەبەرد: شەڕ، داوا. رۆی نەبـەرد: ڕۆژی سـەخڵەت. واتە: هەموو شەوێک تا بەیانی هاورێ و هاوڕازم دەردە، هەی داد و بێداد لە ڕۆژی سـەخڵەت و پـڕ مەینەتم.
٤- هێجران: دووری. وەی تەور: بەو جۆرە. کەردەن: کردووە. وەنەم: لێم، لە من. مـەنمانۆ: دەنـوێنێ. پەنەم: پێم، بە من. واتە: دووری تۆ بە جۆرێ کاری لێم کردووە کە هەر ساتێ مەرگێکم پێ ئەنوێنێ.

مەگەر خوداوەند بکەرۆ کاریٚ

شاد بوون بە دیدار ئەو دڵبەر جاریٚ[١]

وەرنە من پەی تۆ یاری دووروەتەن

گیان شیرینم بەرمەشۆ جە تەن[٢]

***

١- بکەرۆ: بکات. شاد بوون: شاد بم. مانای ئەم بەتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت. لە سەرچاوەی «بر»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «شاد ببوون بە دین دیدار یاریٚ».

٢- وەرنە: ئەگینا، ئەینا. پەی: بۆ. بەرمەشۆ: دەرنەچیٚ. تەن: لاشە. واتە: مەگەر خودا خۆی کارێک بکات من جارێکی دیکە بتبینم و شاد ببمەوە ئەگینا ئەی یارە دوورولاتەکەم من بۆ تۆ گیانم دەرنەچیٚ.

-١-[١]

کــۆی خــەم بــار وێــم، کــۆی خــەم بــار وێــم
زەلیـــل و زەبـــوون، کــۆی خــەم بـــار وێــم[٢]

ئەســـیر و خەســـتە، کەفتـــەکار وێـــم
بـــە دەرد هێجـــران گرفتـــار وێـــم[٣]

شـــەیدای خاکســـار، خـــەم خـــەیاڵ وێـــم
پـــا جـــە دۆســـت بڕیـــا، وێـــران مـــاڵ وێـــم[٤]

نـــارەزا جـــە لای یـــاران بڕیـــای وێـــم
جـــە خـــەم یـــاران، دڵ نەســـرەویای وێـــم[٥]

---

-١-

١- ئێ، ح.

٢- زەبوون: کز و لاواز. وێم: خـۆم. واتـە: زەلیـل و لاوازم و بـە قورسـایی کێوێـک خـەم بارمـە. لـە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «کۆی خەم بار»، «کۆی خەمبار» نووسراوە کـە دروسـت نییـە و مانـای شێعرەکە دەگۆڕێت.

٣- خەستە: ماندوو، هیلاک، زامدار. کەفتەکار: لێ قەوماو، کەسێ کە کاری سەر نەگرێ. هێجران: دووری. واتە: ئەسیر و زامدار و لێ قەوماوم و گرفتاری دەردی دووریم.

٤- شەیدا: عاشق، گیرۆدەی عەشق. خاکسار: بێ قەدر و قیمەت بە وێنەی خاک. بڕیا: بڕاو. واتە: گیرۆدەی عەشق بووم و بە وێنەی خاک بێ قەدر و قیمەت ماوم، پێم لـە دۆسـت بـڕاوە و نـاتوانم سەردانی بکەم و ماڵ وێرانم. (ماڵ وێران خۆم.)

٥- نەسرەو: نەسرەوتوو، بێ ئارام. واتە: بە نارەزایی لە یاران بڕاوم و لێیان دوور کەوتوومەتەوە ☜

ئاشــــوفتە و ڕەنجـــوور، ڕەنـــج بـــە بـــاد وێـــم
بـــــە کـــــام نـــــەیاوا، نـــــاموراد وێـــــم[1]

شـــەڵڵا کـــەس نـــەبۆ بـــەی تـــەورە جەســـتەش
پێســـــە دوور نـــەبۆ جـــە ئـــاوات وەســـتەش[2]

☆☆☆

-٢-[3]

کەســـم! کەســـان بـــە، کەســـم! کەســـان بـــە
کەســـم! کەســێ بـــە، دوور جـــە کەســـان بـــە[4]

---

☜ و دڵم لە خەمی یاران ئاسرەوێت. (نەسرەوتوو خۆم). لە سەرچاوەی «ح»دا نیوە بەیتی دووهەمی بەم جۆرە نووسراوە: «جە زەخمی یاران نە سەر و پای وێم»!.

١- ئاشوفتە: پەرێشـان. ڕەنجـوور: ڕەنـج کـێش، مانـدوو، هـیلاک. کـام: ئـاوات، ئـارەزوو. نـەیاوا: نەگەیشتوو. ناموراد: بە موراد نەگەیشتوو. واتە: پەرێشان و ڕەنج کێش و هیلاکم و ڕەنجم بووە بـە هیچ و بە ئاوات و ئارەزووی خۆم نەگەیشتووم.

٢- شەڵڵا: ئیشەڵڵا، بەشکەم، بەڵکوو. نـەبۆ: نـەبێ. پێسـە: وەهـا، ئـاوا. ئـاوات وەسـتە: ئـاوات خوازراو. واتە: لە خوام داوایە هیچ کەس وەهای بە سەر نەیەت و لە یارە بە ئاوات خوازراوەکەی دوور نەکەوێتەوە.

-٢-

٣- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٤- کەسان: کەسی نزیک، کەسێ کە بە دڵ کەس بێت. واتە: ئەی کەسم! بە دڵ کەسم بە و بە وێنەی خەڵک مەبە و لەوانەوە دوور بە.

بێــزار جــه هامســـای خــار و خەســان بــه

تیــــر نـــاو دیـــدەی بەدنەفەســـان بـــه [١]

کەســـی کەســـانیم تـــۆش پـــەی کەســـەنی

چێش کەرۆ بـه کـەس؟ کـەس تـۆش وەسـەنی [٢]

ســـپەردەی پاشـــای بـــێ کـــەس بـــۆ کەســـت

بـــا هـــەر بـــێ کـــەس بـــۆ تـــۆ فەریادڕەســـت [٣]

☆☆☆

-٣- [٤]

کەم خدمەتیم چێش؟ کـەم خدمـەتیم چێش؟

درێـــخ بزانـــام کـــەم خدمـــەتیم چـــێش؟ [٥]

---

١- هامســـا: دراوســـێ، هاوســـا، هاوســـێ. خـار: دڕوو، دڕک. خـەس: وردە گیـای وشـکەوە بـوو. بەدنەفەس: کەسێ کە بەردەوام شتی خراپ و بەڵا بە زاریدا دێت. واتـە: لـە دراوسـێیەتی دڕوو و خشڵ و گیای وشک بێزار و بە تیری چاوی بەدنەفەسان بە ( وەک تیر بچۆ بە چاوی بەدنەفەساندا ).

٢- کەسی کەسانیم: کەسی نزیک. چێش کەرۆ: چی بکات. وەسەنی: بەسی، تەواوی. واتە: تـۆ بـۆ کەسی نزیکم کەسی، ئیتر ئەو کەسی بۆ چییە؟ چونکە لە جێی هەموو کەس تۆی بەسە.

٣- سپەردە: سپێردراو: پاشای بێ کەس: خودا. فەریادڕەس: نەجات دەر، کەسێ بە هاواری کەسـێک بگات. واتە: خودای بێ کەس ئاگاداری کەسی تۆ بێ و بە فریای بگات.

-٣-

٤- ک، س، ئێ، ڕ، ج، ب، ح.

٥- چێش: چی. درێخ: ئاخ، خۆزگە. بزانام: بمزانیبا، زانیبام. واتە: ئاخ بمزانیبا کەم خزمەتی ☜

جـه چـێش خـاترت جـه مـن کـەردەن ڕێـش؟
ئەگـەر دیـدەم بـۆ کـۆر کـەروو بـە نـێش[1]

درێـــخ بزانـــام عـــوزروو تەقســـیری
حەقـــەن یـــا ناحـــەق خەشـــم و زویـــری[2]

وەرنـــە چ لایێـــق وێنـــەی تـــۆ شـــایێ
بگێـــرۆ نـــە دڵ خەشـــم گـــەدایێ[3]

☞ من چی بووە؟

١- جە چێش: لەچی. کەردەن: کردووە. ڕێش: بریندار، ئێشان. کۆر، کوێر. کەروو: دەکەم. نێش: نووکی تیژ. واتە: لەبەر چی خاترت لە من ئێشاوە؟ ئەگەر چاویشم خەتای کردبێت بە نووکی تیژ کوێری دەکەم.

٢- درێخ: خۆزگە. بزانام: بمزانیبا، زانیبام. عوزر: دەلیل و بەهانە. تەقسیر: کۆتاهی کردن، خەتابار بوون. خەشم: تووڕەیی. زویری: عاجزی و نارەحەتی. واتە: خۆزگە بمزانیبا خەتای من چی بووە و تووڕەیی و عاجزی تۆ حەقە یا ناحەق.

٣- وەرنە: ئەگینا. بگێرۆ: بگرێت. گەدا: هەژار، فەقیر. واتە: ئەگینا ئەمە کەی لە تۆ جوانە کە تووڕە بوونی هەژارێکی وەک من لە دڵ بگری؟ لە نوسخەکانی «س» و «ڕ»دا ئەم بەیتە نییە. لە نوسەی «ح»دا بە جێی «وەرنە چ لایێق»، «قیبلەم یە حەیفەن» و لە نوسخەی «ک»دا ئەم بەیتە بە دوای بەیتی دواییدا هاتووە.

ئەگـــەر گونـــاهێ وەنــــەم کـــەری بـــــار
یــە ســەر، یــە شمشــێر، یــە تــەناف، یــە دار[1]

---

١- وەنەم: لێم، لە من. کەری: بکەی. یە: ئەمە. واتە: ئەگەر ئەڵێی تاوانێکم هەیە و تاوانێکم لێ بار دەکەی (ئەگەر تاوانێکم دەدەیتە پاڵ) ئەوە سەری من و ئەمە شمشێر و ئەمە تەناف و ئەمەیش دار فەرموو یا بە شمشێر سەرم ببڕە یا بە تەناف لە دارم بدە. دەتوانێ مەبەستی لە شمشێر ئەبرۆ و تەناف زوڵف و داریش باڵای یار بێت.

لە نوسخەی «ک»دا بە جێی «ئەگەر گوناهێ»، «پەرسە ئەر گونا» نووسراوە. لە سەرچاوەی «ح» و «ب»دا بە دوای ئەم بەیتەدا بەیتێکی دیکە هاتووە کە بە پێی نوسخەکانی دیکە دروست نییە و پەیوەندی بە شێعرەکەیشەوە نییە. ئەمەیش بەیتەکە:

وەگەرنــە چوونـــەن بــە واتـــەی بــەدگۆ    مـــانۆ نـــە پـــەردە ڕاز مـــن و تـــۆ

-١-[1]

گوڵ تەبەقێو هەن، پێش ماچان شەست پەڕ
زەرد بووم بێ عەیب، جەمین قورس زەڕ[2]

بەرمەیۆ نە دەور ڕێحانان شەم
گۆناش بە خۆناو سەحەر مەدۆ نەم[3]

دەور مەدۆ نە دەور باغچەی ئەمیران
وێنەی قەتارەی قاشوونی گیران[4]

---

-١-

١- ک، س، ڕ، ب، ح.

٢- گوڵ تەبەق: دەستە گوڵ. پێش ماچان: پێی ئەڵێن. شەست پەڕ: گوڵی شەست پەڕ. بووم: ڕوومەت. جەمین: تەوێڵ، نێوچاوان. قورس: هەر شتێ جەغزی (دایەرەیی) بێت. زەڕ: زێڕ، تەلا. قورس زەڕ: هەتاو. واتە: دەستە گوڵێک هەیە پێی ئەڵێن شەست پەڕ و ڕوومەتی زەردە و ڕوخساری بە وێنەی هەتاوە (خڕ و زەردە).

٣- بەرمەیۆ: دەرتێ، دەڕوێ. شەم: شوێنی سێبەر. خۆناو: ئاونگ، شەونم. سەحەر: بەیانی. مەدۆ: ئەدات. واتە: گوڵە شەست پەڕەکە لە دەوری ڕێحانە و لە شوێنی سێبەردا دەڕوێ و کوڵمی بە ئاونگی بەیانی تەڕ دەبێ.

٤- دەور مەدۆ: هەڵدەسووڕێ. ئەمیر: کەسێکی پلە و پایە بەرز لە سەربازیدا. قەتارە: ڕێکخراو، سەف. قاشوون: لەشکەر، سپا. قاشوونی گیران: هەم دەتوانێ بە مانای سەربازگیری بێت هەم کاتێک لەشکەرێک گەمارۆی شتێکیان داوە. واتە: لە دەوری باخچەی ئەمیران بە وێنەی سپای لەشکەرگیری دەڕوێ.

ســـــالار ســـــپای گشـــــتین گوڵانـــــەن
مـــودام جـــاش نـــە پـــای تـــیم ســـوڵانەن[١]

٭٭٭

-٢-[٢]

گوڵخونچێـــــوە دیـــــم وەرەق نەشـــــکوفتە
جـــە نەشـــکوفتەگیش یانـــەی دڵ ڕوفتـــە[٣]

نـــە ئـــی گوڵخونچـــەی بـــە خـــار هەمســـایە
گوڵخونچـــەی وەش بـــۆی موشـــک چـــین مایـــە[٤]

---

١ سالار: فەرماندە. گشتین: هەمووی. مودام: بەردەوام، هەمیشە. جاش: جێـی، جێگـەی. سـوڵ: سمڵ، ناوی گیایەکی جوانە. واتە: گوڵی شەست پەڕ فەرماندەی هەموو گوڵانـە و دایمـە لـە پـێش تاقمی سمڵانەوەیە.

-٢-

٢- ک، ئێ، س، ر، ح.

٣- گوڵخونچە: خونچەی گوڵ لێرەدا مەبەست یاری تازە پێ گەیشتووە. وەرەق: گـەڵا. نەشـکوفتە: نەپشکوتوو. یانە: ماڵ، خانوو. ڕوفتە: گزی دراو، ماڵیاو، تاڵان کراو. واتە: خونچە گوڵێکم بینی کە هێشتا بە جوانی نەپشکوتبوو و لە نەپشکوتنی ماڵی دڵم تاڵان کرا.

٤- ئـی: ئـەم. خـار: دڕوو، دڕک. هەمسـایە: دراوسـێ. وەش بـۆ: بۆنخـۆش. موشـک: مـاکێکی (مادەیەکی) ڕەشی بۆنخۆشە کە وا لە کیسەیەکی بچووکی پەنای نێوکی جۆرە ئاسکێکی وڵاتی چین. مایە: دارایی. واتە: نە ئەو خونچە گوڵە کە دراوسێی دڕووە، بەڵکوو خونچە گوڵێکی بۆنخۆش کـە هەوێنی موشکی چینە (ئەوەندەی موشک بۆنخۆشە).

هێمای بوڵبوڵێ نه ڕووش نه‌ناڵان

مه‌كه‌رۆ یانه‌ی هه‌زار دڵ تاڵان[١]

ئه‌گه‌ر بوڵبوڵێ نه ڕووش بوانۆ

بیللا نه‌رد قه‌تڵ ناڵه‌م مه‌شانۆ[٢]

***

١- هێما: هێشتا. نه‌ناڵان: نه‌یناڵاندووه، نه‌یخوێندووه. مه‌كه‌رۆ: ده‌كات. واته: هێشتا بولبولێک بۆی نه‌ناڵاندووه (كه‌س عاشقی نه‌بووه) ماڵی هه‌زار دڵ تاڵان ده‌كات.

٢- بوانۆ: بخوێنێ. نه‌رد: مۆره‌ی ته‌خته. ناڵه‌م: له عاله‌م، له دنیادا. مه‌شانۆ: ده‌وه‌شێنێ، هه‌ڵده‌خا. واته: ئه‌گه‌ر بولبولێک عاشقی ببێ و بۆی بخوێنێ قه‌سه‌م به خوا مۆره‌ی قه‌تڵی هه‌موو دنیا هه‌ڵده‌خات. له نوسخه‌ی «ک»دا به دوای ئه‌م پارچه شێعره، شێعرێک هاتووه و له سه‌ری نووسراوه «استاد میكائیل در ردیف» كه دیاره له ڕه‌دیفی ئه‌م پارچه شێعره‌ی بێسارانیدا نووسراوه به‌ڵام له سه‌رچاوه‌كانی «ح»، «ڕ»، «س» و «ب»دا به ناوی بێسارانییه‌وه هاتووه. ئه‌مه‌یش پارچه شێعره‌كه:

مه‌ولام! گوڵخونچه‌ی ساوای نه‌شكوفته ... سه‌ودای چه‌ند بوڵبوڵ تێدا نه‌هوفته

هێمای نه‌بڕیان نامش به گوڵێ ... نه‌ژنه‌وان به گۆش ناڵه‌ی بوڵبوڵێ

به نیم نگای وێش هیچ نمه‌زانۆ ... جه شێخ سه‌نعان ئیمان مه‌ستانۆ

ئه‌ر بوڵبوڵ نه ڕووش نه‌غمێو بوانۆ ... دین دینداران باتڵ مه‌مانۆ

ئانه گوڵێوه‌ن نه‌شكوفته و ساوا ... داخۆ یانه‌ی كێش پێ مه‌بۆ ئاوا؟

-٣-[١]

گـــەردوون! بـــەردەنم، گـــەردوون! بـــەردەنم
ڕاســـەن ســـوجدەی دەیـــر تەرســـا بـــەردەنم[٢]

مـــەی نـــە پـــای مێنبـــەر مەســـجێد وەردەنـــم
تەجدیـــــد مەزهـــــەب عیســــا کـــــەردەنم[٣]

فتـــــوای بەرەهمـــــەن گێرتـــــەنم بـــــە دۆش
دیـــنم دان بـــە مـــەی جـــە لای مـــەی فـــرۆش[٤]

-٣-

١- ک، ئێ، ن، ڕ، س، پ، ب، عم، ح.

٢- بەردەنم: بردوومە. ڕاسەن: ڕاستە، دروستە. دەیـر: شـوێنی عیبـادەت و ڕاز و نیـازی ڕاهیبـان. تەرسا: مەسیحی. واتە: ئەی فەلەک! ڕاستە من لە دەیری مەسیحیان سوجدەم بردووە و وەک ئەوان عیبادەتم کردووە. لـە سـەرچاوەکانی «ن»، «ح» و «ب»دا بـە جێـی «گـەردوون»، «تەرسـا» و لـە نوسخەی «عم»دا «قیبلەم» نووسراوە.

٣- مەی: شەراب. مەسجێد: مزگەوت. وەردەن: خواردنەوە. تەجدید: تازە کردنەوە. کەردەن: کـردووە. واتە: ڕاستە لە پای مینبەری مزگەوتدا شەرابم خواردووەتـەوە و مـەزهـەبی حـەزرەتی عیسـام تـازە کردوەتەوە.

٤- بەرەهمەن: پێشەوا (ڕۆحانی) گەورەی دینی هیندوان کە لە چاوی ئیسـلامەوە کـافرن. گێرتـەنم: گرتوومە. دۆش: کۆڵ، شانە، گەردەن. واتە: ئەو فتوایە کە بۆ بەرەهمەن دراوە (کافر بوونیان) منـیش لە ئەستۆم گرتووە و کافر بوونی خۆمم قەبووڵ کردووە، دینم لە لای مەی فرۆش داوە بە شەراب.

گێرتــــەنم نـــە دۆش خێرقـــەی ڕوهبانـــان
کێشـــانم جـــاڕووی دەور بوتخانـــان[١]

ئانـــە گشـــت جـــە وەخـــت نـــاذانیم بیـــەن
فەســـڵ سەرمەســـتی و جـــەوانیم بیـــەن[٢]

ئیســـە هـــا جـــە گشـــت پەشـیمانیم بـــەرد
فەســـڵ پیریمـــەن، جـــەوانیم ویـــەرد[٣]

---

١- خێرقە: جل و بەرگێکی سەرتاپا کە لە تێکەی پارچەی شڕ و شڕۆڵ دروست دەکرێ و زاهێدانی گۆشەگیر و تەرکە دنیا لە بەری دەکەن. ڕوهبان: پارسا، عیبادەت کەری گۆشەگیر لە دینی مەسیحیدا. کێشانم جاڕوو: گزیم داوە. بوتخانە: شوێنی بوت. واتە: جل و بەرگی شڕی پارسایانم لە بەر کردووە و دەوری بوتخانەم گزی داوە. (دەوری بوتخانەم خاوێن کردوەتەوە).

٢- ئانە: ئەوە. گشت: هەموو. بیەن: بووە. سەرمەستی: سەرخۆشی. جوانی: لاوی. واتە: ئەوەی کە وتم هەمووی هی کاتی نەزان کاری و سەرخۆشیم بووە. لە هەندێک لە نوسخەکاندا بە جێی «ئانە»، «ئینە» و لە نوسخەی «ک»دا بە جێی «سەرمەستی»، «مەستی و عەشق» و لە نوسخەی «س»دا «مەستی و عەیش» نووسراوە.

٣- ویەرد: ڕابورد. واتە: کاتی لاویم بە سەر چووە و وەرزی پیریم هاتووە و لە هەموو ئەو کارانەی کە کردوومە پەشیمانم. لە نوسخەی «ک»دا نیوە بەیتی دووهەم بەم جۆرە نووسراوە: «فەسڵ سەرمەستی و جوانیم ویەرد» و لە نوسخەی «ئێ»یشدا بەم جۆرەیە: «وادەی پیریمەن جوانیم ویەرد».

# وادەی پیریمـــــــەن یـــــــاوانم نۆبـــــــە
# نۆبـــــەی تۆبەمـــــەن کەرەمـــــدار تۆبـــــە [١]

---

١- یاوانم نۆبە: نۆبەی مردنم گەیشتووە، کاتی مردنمە. کەرەمدار: خـاوەن کـەرەم، خـاوەن بەخشـین.
واتە: وەرزی پیریمە و کاتی مردنم نزیک بووەتەوە، ئەی خودای خاوەن کەرەم و بەخشـین ئـەوە تۆبـەم کرد.

مەولەوی لە پارچە شێعری «پێشانیم هەوەس زانووش جازمەن»دا زۆر بـە جـوانی ئـەم سـێ بەیتـە شێعرەی بێسارانی بەم جۆرە تێهەڵکێش دەکات:

| | |
|---|---|
| پێشـــانیم هـــەوەس زانـــووش جازمـــەن | تـــەعزیم جـــەناب پیـــری لازمـــەن |
| بـــاڵاکـــەردەوە مـــەیل نـــەو لای پەســـتی | وردیکڵاتـــــــەن دەروازەی هەســـــتی |
| مەعدوومی کـەردەی بـەذی هـەزار تـەرز | زانـــووی نومێـــذت نـــاوەرۆ ئـــەو لـــەرز |
| ئـــەو کـــەس مـــەزانوو ســـەتتارەن ئـــارۆ | جـەو بوزورگتـەرەن شـەو ئـەو ڕۆت ئـارۆ |
| سـفیدیت قـەڵغان پـەی ڕووی سـیات بـۆ | کـــەمانیت شـــەفێع تیـــر دیـــات بـــۆ |
| نمـــەبۆ پیـــری و تـــەن ناتـــەوانیت | وەی دوو فـــەردەوە ئـــاودەس جـــەوانیت: |
| عـــەزابم ئەرســـەد جـە حـەد بەرشـیەن | جـــە ڕووســـیاییم گرانتـــەر نیـــەن |
| مـــن کـە خەجاڵـەت خزمـەت ئامـا پـێم | جەهەننەم سـەذ سـاڵ دۆزەخ بـۆ وە جـێم |
| موترێـــب بـــۆ وە داد دڵگیریمـــەوە | پیـــری هـــا ئامـــا وە پیریمـــەوە |
| نـــەوات وێرانـــەی دڵ کـــەرۆ ئـــاوا | چەنی بەستەی فـەرد «بێسـاران مـاوا»: |
| «ئانـە گـرد جـە وەخـت نـاذانیم بیـەن | فەسـڵ سەرمەسـتی و جـەوانیم بیـەن |
| ئیسـە هـا جـە گشـت پەشـیمانیم بـەرد | فەسـڵ پیریمـەن جـەوانیم وبـەرد |
| وادەی پیریمـــەن یـــاوانم نۆبـــە | نۆبـەی تۆبەمـەن کەرەمـدار تۆبـە» |

ئومێـــدم بـــه تـــۆن وەنـــەم نـــەگیری
بویـــەری جـــە جـــورم وەخـــت کـــەم ویـــری [١]

***

١- ئومێدم بە تۆن: هیوام بە تۆیە. وەنەم نەگیری: لێم نەگری، لێم ببووری. بویەری: ببووری، ڕابووری. جورم: خەتا، تاوان، گوناح. کەم ویری: کەم بیری. واتە: ئەی خودای خاوەن کەرەم! من هیوام بە تۆیە کە لە خەتا و تاوانی کاتی کەم بیر و هۆشیم (هەرزەکاریم) ببووری.

-١[1]-

لادێ خـــاڵی بـــۆ، لادێ خـــاڵی بـــۆ
ئـــەر دڵ جـــە یـــادت لادێ خـــاڵی بـــۆ[2]

ڕووی نیـاز نـە خـاک کـۆی گـەس مـاڵی بـۆ
شـــەڵڵا بـــە نێشـــتەر دەردان نـــاڵی بـــۆ[3]

پـــەی چـــی؟ ئومێـدم هـــەر بـــە دیـــن تـــۆن
غـــەیر جـــە تـــۆ دیـــدەم هـــەنی کەسم کـــۆن؟[4]

دینـــــــت بەشـــــــارەت زێندەگانیمـــــــەن
نـــــــەدینت بـــــــەڵای ئاســـــــمانیمەن[5]

***

---

-١-

١- عم، ج.

٢- لادێ: ساتێک، تاوێک. ئەر: ئەگەر. بۆ: بێ. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دایە.

٣- نیاز: پێویستی. کۆ: گەڕەک. گەس: ناپاک، ناحەز. شەڵڵا: ئیشەڵڵا. نێشتەر: نەشتەر. ناڵی بۆ: بناڵێنێ. واتە: ئەگەر تاوێ دڵم لە یادی تۆ خاڵی بێ (غافڵ بێ) و لە ڕووی نەدارییەوە ڕێی بکەوێتە گەڕەکی ناپاکان، یاخوا بە نەشتەری دەرد دایمە بناڵێنێت.

٤- پەی چی: بۆچی. دین: دیتن، چاوپێکەوتن. هەنی: ئیتر. کۆن: کوا. واتە: بۆچی؟ لەبەر ئەوەی من هەر هیوام بە چاوپێکەوتنی تۆیە، جگە لە تۆ ئیتر کەسم کوا؟ (هەموو کەسم تۆی).

٥- دینت: دیتنت، بینینت. بەشارەت: مزگانی، هەواڵی خۆش. واتە: دیتنی تۆ هەواڵی خۆشی ☜

-٢-[1]

لێـــت دیـــار مـــەبی، لێـــت دیـــار مـــەبی
قیبلـــەم! ئـــەر دەروون لێـــت دیـــار مـــەبی[2]

بـــیللا ئـــەر دڵـــت ســـەنگ خـــار مـــەبی
ســـفتەی دڵ مـــەدیت، بـــێقـــەرار مـــەبی[3]

مـــــەواتت شـــــاباش، جـــــەی ســـــیابەختە
چـــوون دارۆ تاقـــەت ئـــی زام ســـەختە؟[4]

---

☞ ژیانمە و نەبینینت بەڵای ئاسمانییە بۆ من.

-٢-

١- ک، ب، ح.

٢- دیار مەبی: دیار دەبوو. ئەر: ئەگەر. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٣- بیللا: قەسەم بەخوا. سەنگ خار: جۆرە بەردێکی ڕەقە. مەبی: دەبوو. سفتە: سووتاو. مـەدیت: دەتبینی. واتە: قیبلەم ئەگەر دەروونی منت لێوە دیار نەبوو قەسەم بەخوا ئەگەر دڵیشت بە وێنەی سەنگی خار ڕەق دەبوو بە دیتنی دڵە سووتاوەکەی من ئارام و قەرارت لێ دەبڕا.

٤- مەواتت: دەتکوت، دەتوت. شاباش: کاتێک کەسێک کارێکی جـوان یـا کارێـک کـە لـە توانـای هەمووس کەسدا نییە بکات ئەو خەڵات و دیاریەی کە پێی ئەدەن پێی ئەڵێن شاباش. چوون: چۆن. جەی، لەم، لە ئەم. دارۆ: هەیەتی. ئی: ئەم. واتـە: دەتکـوت شـاباش و دیـاری هـەر بـۆ ئـەم چارە ڕەشەیە، چۆن تاقەت و توانای ئەم زامە سەختەی هەیە؟ ئەم بەیتە لە سەرچاوەی «ح»دا نییە.

بـــەڵێ ســــفتەی دڵ نمــــەوینی وێــــت
بـــاوەر نـــەداری، مـــن واچـــوو پـــەرێت[١]

تـــۆ خـــوڎا نەتـــەرس، پەنـــەت نیـــەن ڕام
مـــن ســـفتە دەروون، نـــەداروو ئـــارام[٢]

جـــە دوور مەڎیەینـــە ســـفیدەن بـــەرگم
ســـەر نـــە دەروون دەر، لـــت لتـــەن جـــەرگم[٣]

مـــەر هـــەر خوڎاوەنـــد کـــەرەم بـــێ شـــومار
یـــا ڕام بـــە تـــۆ دۆ، یـــا بـــە مـــن قـــەرار[٤]

***

---

١- بەڵێ: بەڵام. سفتە: سووتاو. نمەوینی: نابینی. وێت: خۆت. واچوو پەرێت: پێت بڵێم. واتە: بەڵام خۆ تۆ خۆت دڵی سووتاو نابینی و بڕوات نییە با من خۆم پێتی بڵێم.

٢- نەتەرس: نەترس، بێباک. پەنەت نیەن: پێت نییە. ڕام: ڕەحم. نەداروو: نیمە. واتە: تۆ لە خوا نەترسی و ڕەحمت نییە و منیش دەروونم سووتاوە و ئارام و قەرارم لێ بڕاوە. لە سەرچاوەکانی «ب» و «ح»دا ئەم بەیتە نییە.

٣- مەڎیەینە: دەڕوانی، سەیردەکەی. سفید: سپی، چەرموو. بەرگ: جل و بەرگ، لیباس. واتە: لە دوورەوە دەمبینی جل و بەرگم سپییە، پێت وایە خۆشحاڵ و بەختەوەرم، وەرە سەرێکی دەروونم بدە با بزانی جەرگم لەت لەت بووە.

٤- کەرەم: بەخشین. بێ شومار: بێ ئەندازە. ڕام: ڕەحم. دۆ: بدات. واتە: مەگەر هەر خوای خاوەن کەرەم و بەخشینی بێ ئەندازە یا ڕەحم بە تۆ بدات یا ئارام و قەرار بە من. لە سەرچاوەی «ح»دا ئەم بەیتە نییە.

-٣[1]-

لێـــوه لـــەولاوێ مـــەبۆ نـــه چەمـــەن
نـــه دەور ڕێحـــان، چـــووزەی یاســـەمەن[2]

دەســـت ڕەنـــج شـــیرین، جـــەمین قـــورس زەڕ
خـــاس کـــەوت بـــە خـــاتر لـــەیلێ خـــاتر تـــەڕ[3]

مـــەخێزۆ جـــه خـــاک مـــەنمانۆ بـــاڵا
مـــەبۆ بـــه پەشـــتان نـــەوتووڵ ئـــاڵا[4]

-٣-

١- ک، ئێ، س، ر، ب، عم، ح.

٢- لێوە: شێت. لەولاو: لاولاو. مەبۆ: دەبێ، هەیە. چەمەن: سەوزەڵانی. واتە: لاولاوێکی شێت لە نێو سەوزەڵانیدا هەیە کە بە دەوری چووزەی یاسەمەندا پێچراوە. لە سەرچاوەکانی «س»، «ر»، «ب»، «عم» و «ج»دا بە جێی «لێوە»، «شێوە» نووسراوە. دیارە کە باسی لاولاو دەکات کەوا بێت دەکرێ بڵێین «شێوە لەولاو» واتە بە وێنەی لاولاو. لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا بەو جۆرە نووسراوە کە هێناومانە. ئەگەر «شێوە لەولاو» بێت دەبێ ئەم پارچە شێعرە لە بەشی «شین»دا بنووسرێت.

٣- دەست ڕەنج: ڕەنجی دەست. جەمین: ڕوخسار. قورس زەڕ: مەبەست هەتاوە. خاترتەڕ: خۆشحاڵ بەختەوەر، سەرمەس، کەیف ساز. واتە: ئەو لاولاوە کە دەس ڕەنجی ئەو شیرینەیە کە ڕوخساری بە وێنەی هەتاوە جوان هاتووەتە خاتری لەیلای خۆشحاڵ و سەرمەس.

٤- مەخێزۆ: هەڵدەستێ، دەڕوێ. مەنمانۆ: دەنوێنێ، نیشان ئەدا. مەبۆ: دەبێ. پەشتان: تێکەڵ ئاوێتە. ئاڵا: بەرز و باریک، دەتوانێ «ئەعلا»یش بێت بە مانای نەخت یا چاک. واتە: لە خاک دێتە دەر و باڵا دەنوێنێ و بە باڵای بەرز و باریکدا دەئاڵێت.

تەبـــەق تەبـــەق گـــوڵ پیـــرووزە و مـــاوی

مەدرۆشـــۆ چـــوون بـــاڵ ســـۆنەی ســـەراوی[1]

شـــێوەی ئـــەو لـــەولاو هـــا بـــەو بـــاڵاوە

بـــــەو بـــــاڵای شـــــیرین ســـــەرەواڵاوە[2]

***

١- تەبەق تەبەق: دەستە دەستە. پیرووزە: فیرووزە، فیرووزەیی، شینی کەم ڕەنگ. ماوی: ئاوی، شین، کەوۆ. مەدرۆشۆ: دەدرەوشێتەوە. چوون: وێنەی، وەکوو. واتە: دەستە دەستە گوڵی فیرووزەیی و شین بە وێنەی باڵی مراوی سەرئاو دەدرەوشێتەوە. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ڕ» و «عم»دا ئەم بەیتە نییە.

٢- سەرەواڵا: سەری بەرز، باڵا بەرز، دەتوانێ بە مانای «سەربەرز»یش بێت. واتە: شێوەی ئەو لاولاوەی بە تووڵدا پێچراوە لەو باڵا شیرینە دەچێ کە بە وێنەی سەرو بەرزە یا باڵای ئەو شیرینە باڵا بەرزەیە. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «ڕ» و «س»دا بە جێی «سەرەواڵا»، «سەرو ئاڵا» نووسراوە.

-١-[١]

مــــالووم بـــۆ جـــە لای دوور وەتـــەنانم
بـــیللا جـــە گـــرۆی گـــڕ وە تـــەنانم[٢]

یەکسـان زوخـاڵ نـیم سـاکن بـوو جـە ئـێش
هـەر زامـەن بـە ئـێش زوخ مـەتکیۆ جـێش[٣]

بڵێســـەی گـــرم بـــەرزەن وە بـــاڵا
ڕۆشــن چــوون گڕکــۆی شــەو هــەور ئــاڵا[٤]

---

-١-

١- ک، ئێ، س، ر، ب.

٢- مالووم: مەعلووم، ئاشکرا، دیار. بیللا: قەسەم بە خوا. گرۆ: تاقم، دەستە. واتە: با دیار بێ کە وام بە لای دوورە وڵاتانەوە (یا با دوور وڵاتەکانم بزانن) و قەسەم بە خوا لە تاقمی ئاگر لە جەستە بەر بوانم. دەکرێت «جەلا» بە ڕۆشنایی دەر مانا بکرێتەوە یا مەبەستی «جەلای وەتەن» بێ بە مانای کۆچ کردە لە وەتەن.

٣- مەتکیۆ: دەتکێ. جێش: لێی، لەو. واتە: تەواو نەبووم بە خەڵووز کە چیتر ئێشم نەمێنێ و بە دەست ئێشەوە ڕزگارم بێت. هەر زامە و بە ئێشەوە زوخاوی لێ دەتکێت. ئەگەر کەسێ بە تەواوی بسووتێت ئێشی نامێنێ بەڵام سووتانی کەم ئێشی زۆرە.

٤- باڵا: سەر. چوون: وێنەی، وەکوو. گڕکۆ: گڕی زۆر و بەرز، لێرەدا بە مانای برقی هەورە تریشقەیە. ئاڵا: بەرز. واتە: گڕم گرتووە و بڵێسەی بە وێنەی برقی هەورە تریشقە لە شەودا بەرزە. مەبەستی ئەوەیە کە هەر وەک ئەو هەورە تریشقە باران بە هەور دەبارێنێ ئەو گڕیشە لە زامەکانی من زوخاو دەتکێنێت.

جـــه تـــاو گـــرِ زوخ مـــەزیۆم جـــه زامـــان
جـــه زام ســـۆڵ بەســـتەن وە دەور دامـــان[1]

فیـــدای کەســـێ بـــام دووریـــش نـــاو دڵ
کـــەردەن بـــە زوخـــاڵ شـــەندەن وە ڕووی گـــڵ[2]

☆☆☆

-٢-[3]

مـــن دڵـــێ ســـوفتە، مـــن دڵـــێ ســـوفتە
مـــن دڵـــێ داروون، زوخـــاڵ ســـوفتە[4]

---

١- مەزیۆ: دەرتێ، دەرژێت، دەتکێت. سۆڵ: قـەڵوەز، قەڵبـەزە. واتـە: لـە تـاوی ئـەو گـڕە زوخ لـە زامەکانم دەتکێ و لە دەوری داوێنم قەڵوەزەی بەستووە. دەکرێ بە جێی «سۆڵ»، «سەوڵ» بێـت بـە مانای دەوری داوێنم ڕەنگین بووە و پێت وایە گوڵی سەوڵی لێ ڕواوە. ئـەم بەیتـە لـە سـەرچاوەکانی «س»، «ب» و «ڕ»دا نییە.

٢- کەردەن: کردووە. شەندەن: وەشـاندووە، پژانـدووە. واتـە: بـە قوربـانی کەسـێ بـم کـە تـاوی گـڕی دووریەکەی دڵی کردووم بە خەڵووز و بە سەر خاکی پژاندووە.

-٢-

٣- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٤- سوفتە: سووتاو، لە هەموو دیوانەکەدا «سفتە» نووسراوە بەڵام لێرەدا لە بەر سـەروای شـێعرەکە «سوفتە»مان نووسی. داروون: هەمـە. واتـە: مـن دڵێکـی سـووتاوی وەک خـەڵووزم هەیـە. لـە سەرچاوەکانی «ئێ»، «ڕ» و «ب»دا بە جێی «زوخاڵ»، «بـە زوخـاڵ» و لـە نووسـخەکانی «س» و «ح»دا «چوون زوخاڵ» نووسراوە.

بــــه ســــەنگ ســــزا، هارِیــــا و کوفتــــه
گشــــت نــــه کــــوڵ زوخ دەروونــــم رِوفتــــه[١]

ئەوەنــــد ســــۆزیان چــــەنی ئــــاخ و ئــــوخ
تێــــدا نەمەنــــدەن زەرێ نــــم جــــه زوخ[٢]

کەمتــــەر زوخــــاوێ دەروونــــم دارۆ
ئــــەویچ جــــه دیــــدەم چــــوون ســــەیل مــــەوارۆ[٣]

٭٭٭

١- سەنگ: بەرد، تەوەن. هارِیا: هارِیاو، ورد بوو. کوفتە: کوتراو. گشت: هەموو. کوڵ: هەڵاتن، هەڵچوون، هاتنە کوڵ. رِوفتە: سەرچوون، رِۆیشتن. واتە: (دڵم) بە بەردی سزا هارِیاو و کوتراوە هەموو زوخاوی دەروونم لە بەر هاتنە کوڵ هەڵچووە و رِژاوە.

٢- ئەوەند: ئەوەندە، هێندە. سۆزیان: سووتاوە. چەنی: لەگەڵ. ئاه و ئوخ: هاوار کردن لەبەر ئێش و ژان. نەمەندەن: نەماوە. واتە: هێندە بە دەم ئاخ و ئوخەوە سووتاوە بە زەرِەیش نمی زوخاوی تێدا نەماوە.

٣- دارۆ: هەیەتی. ئەویچ: ئەویش. چوون: وێنەی. سەیل: لافاو. مەوارۆ: دەبارێ. واتە: دەروونم زوخاوی کەمی تێدا ماوە کە ئەویش بە وێنەی لافاو (تاوە باران) بە چاوانمدا دێنە خوار. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «س» و «ر»دا ئەم شێعرە درێژەی هەیە و پارچە شێعری «مــن دەردێم پێوەن جە دووری خێزان»ی بە دوادا هاتووە کە بە هەڵە بەم شێعرەوە لکاوە و ئەویش شێعرێکی جیاواز و سەربەخۆیە و بە دوای ئەم شێعرەدا هێناومانە.

-٣[1]-

مـــن دەردێـــم پێـــوەن جـــە دووری خێـــزان
ســەد بــار جــەفای دەرد ڕۆی مــەرگش بێــزان[2]

دەرد مــــەرگ ســـاتێ جـــەفاش مــــەمانۆ
ئێــذ هــەر ســات مــەرگێم پەنــە مــەنمانۆ[3]

فیــدای کەســێ بــام دووریــش دەرد مــەرگ
بێزنـــان، کـــەردەن ڕێـــزە ڕێـــزە جـــەرگ[4]

٭٭٭

---

-٣-

١- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «ڕ» و «س»دا ئەم پارچە شێعرە بە «من دلێ سوفتە»وە لکاوە بەڵام لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا شێعرێکی جیاواز و سەربەخۆیە و دیارە ئەبێ جیاوازیش بێت.

٢- دەردێم پێوەن: دەردێکم پێوەیە، دەردێکم هەیە. جە: لە. خێـزان: هەسـتاوە. ڕۆی: ڕۆژی. بێـزان: لەبەر چاوە خستووە، بێزاندووە. واتە: من لە دووری دەردێک سـەری لـێ داوم کـە سـەد جـار دەردی مەرگی بەزاندووە. مەبەستی ئەوەیە دەردی دووری لە دەردی مردن زۆرترە. لە سـەرچاوەی «ح»دا بـە جێی «خێزان»، «خەزان» نووسراوە.

٣- مەمانۆ:دەمێنێ. ئێذ: ئەم. پەنە: پێم، بەمن. مەنمانۆ: دەنوێنێ. واتە: سـەختی دەردی مـردن هەر ساتێکە بەڵام دەردی دووری هەر ساتێکی مەرگێکە. مەولەویش دەفەرموێ:

مەردەن یـەک سـاتەن ئەرواحەکـەی وێـم     دووریت هەر ساتێ سەد مەرگـەن پـەرێم

٤- بێزنان: بەزاندوو، بێزاندووە. کەردەن: کردووە. واتە: من بە قوربانی کەسێک بم کە دەردی ☜

-٤[١]-

مـــن کـــۆی نـــەفتینم، تـــۆ ئـــایر بـــە دەســـت
هـــەر کاتێـــت زانـــا گـــڕ بڵێســـەش بەســـت[٢]

گـــڕ بڵێســـەش بەســـت، هانـــام کـــەرد وە شـــار
دیـــم کـــە پەیـــدا بـــی هـــەزار گیانـــدار[٣]

هەریـــەک جـــە لایـــێ ئـــاو لـــێم مەشـــانا
گـــڕ هەرچەنـــد ئامـــا، پڕشـــنگ نمانـــا[٤]

---

☞ بەزاندووە و جەرگی لەت لەت کردووە.

-٤-

١- ب، ڕ، س، ح. ئەم پارچە شێعرە لە نوسخەکانی «ک» و «ئـێ»دا نییـە بـەڵام زۆر لـە شـێعری بێسارنییەوە نزیکە. لە هەندێ شوێنیشدا پەیوەندی مانایی لە نێوان بەیتەکاندا نییە بەڵام لـە هـەر چوار سەرچاوەکەدا وەها نووسراوە.

٢- نەفتین: نەوتاوی، تێکەڵ بە نەوت. ئایر: ئاگر. زانا: زانیت، ئاگادار بوویتەوە. واتە: مـن کێـوی نەوتاویم و تۆیش ئاگرت بە دەستەوەیە، کاتێکت زانی ئاگرم گرت و گڕ بڵێسەی سەند و بەرز بووەوە.

٣- هانا: بە دادگەیشتن. گیاندار: لێرەدا مەبەست مرۆڤە. واتە: گڕ بڵێسەی سەند و بەرز بـووەوە و منیش هاوارم بردە ئەو شارە کە فریام بکەون و بینیم هەزار مرۆڤ هاتن.

٤- مەشانا: دەوەشاند، دەپژاند. ئاما: هات. پڕشنگ: پریشکەی ئاو و ئاگر. واتە: هەر یەکـەیان لـە لایەکەوە ئاوی لێم دەپژاند بەڵام تا دەهات گڕەکە زیاتر بڵێسەی دەکێشا و دەگەشایەوە.

ناگــا پەیــڎا بــی قیبلــەی وێــم جــە دوور
مــەڎا بــە ســەردا، غــوڵام بــی وە نــوور[١]

ســا کــە پەیــڎا بــی قیبلــەم جــە لاوە
دەس دا بــە ئــاودا ســفتەم کوشــناوە[٢]

زڵــف کــەرد وە مەرهــەم نیــا نــە زامــم
هانــا هاناشــەن ســفتەن غــوڵامم[٣]

☆☆☆

-٥-[٤]

مــەبۆ نــەبۆش ژەنــگ، مــەبۆ نــەبۆش ژەنــگ
ئاینــەی عاشــق، مــەبۆ نــەبۆش ژەنــگ[٥]

---

١- وێم: خۆم. مەڎا: ئەدا، ئەیدا. غوڵام: نۆکەر. نوور: ئاهەکی سووتاو. واتە: لە ناکاو قیبلەکەی خۆم لە دوورەوە دەرکەوت و ئەیدا بە سەری خۆیدا و دەیکوت غوڵامەکەم سووتا و بوو بە خەڵووز.

٢- سفتە: سووتاو. کوشناوە: کوژاندیەوە، خامۆشی کرد. واتە: کاتێ قیبلەم هات دەستی دایە ئاو (ئاوی بە سەر ئاگرەکەمدا کرد) و ئاگرەکەمی کوژاندەوە.

٣- زڵف: زوڵف، قژ، کەزیە. مەرهەم: مەڵهەم، دەوا. هانا: بە داد گەیشتن، بە فریا کەوتن. سفتە: سووتاو. واتە: زوڵفی کرد بە مەڵهەم و بە سەر زامەکانمیەوە نا و دەستی کرد بە هاوار کردن کە فریام بکەون غوڵامەکەم سووتاوە.

-٥-

٤- ک، ئێ، س، ر، ب، ح.

٥- مەبۆ نەبۆش: دەبێ نەیبێ. ژەنگ: تۆخێکی ناسک و سوور بە سەر کانزاوە بە تایبەت بە ☜

هەم نەبۆ مایەی یەک ڕەنگیش، دوو ڕەنگ
هەم نەیۆ جە جەور جەفای نەنگ بە تەنگ[١]

بە وێنەی مەجنوون یەکتا بەندە بۆ
نەقشێو نیش نە ڕووی دڵ نەکەندەبۆ[٢]

تا بۆ شەو و ڕۆ هەر ئێذ بۆ کارش
شەو بە زلف زانۆ، ڕۆ بە ڕووی یارش[٣]

هەر کەس دەور عەشق بەی تەور مەویارۆ
شەرتەن پێش واچان مایەی نوور دارۆ[٤]

☆☆☆

---

☜ سەر ئاسنەوە بە هۆی تەڕ بوونەوە. ئاینە: ئاوێنە، جام. واتە: عاشق دەبێ بە وێنەی ئاوێنە بێ و ئاوێنەکەش بێ ژەنگ و تۆز بێت. مەبەستی ئەوەیە دڵی عاشق لە هەموو شتێک پاک بێت.

١ نەیۆ: نەیەت. نەنگ: ئابروو چوون، بەد ناوی، ناو دەرچوون بە خراپە. تەنگ: زۆر بۆ هاتن، گوێ پێ نەدان. واتە: عاشق دەبێ یەک ڕەنگ بێت و دوو ڕوو نەبێ و گوێی لە قسەی خەڵک کە بە خراپە ناوی دەبەن نەبێت.

٢- یەکتا: تەنیا. نەقشێو:نەخشێکی. نیش: هەنیش، دیکەی. واتە: عاشق دەبێ بە وێنەی مەجنوون یەکە ناس بێت و هەر کەسێکی خۆش بوێ و بە وێنەی فەرهاد تەنیا نەخشی شیرینی لە دڵا هەڵکەندبێت.

٣- ڕۆ: ڕۆژ. ئێذ: ئەمە. زانۆ: بزانێ. واتە: تا مابێ کار و پیشەی هەر ئەمە بێ شەو (کە ڕەنگی لە ڕەنگی زوڵف دەچێت) بە زوڵفی یار و هەتاویش (کە ڕۆشنە) بە ڕوومەتی یار بزانێ.

٤- دەور: ڕۆژگار. بەی تەور: بەم جۆرە. مەویارۆ: ڕادەبوێرێ، تێدەپەڕێنێ. پێش واچان: پێی ☜

-٦[1]-

مـــــــــەخێزنۆ وەی، مـــــــــەخێزنۆ وەی
نـــــیم نگـــــای نـــــازش مـــــەخێزنۆ وەی[2]

مـــوژەش مەکـــەرۆ ڕیشـــەی گیـــان پـــەی پـــەی
دیـــدەش مـــەواچۆ بـــە مەســـتان، مـــەی مـــەی[3]

زڵفـــــش ســـــونبوڵان جـــــە یـــــەک تۆرنـــــان
ڕەنگـــــش ڕووی گـــــوڵان تـــــەمام شـــــۆرنان[4]

---

☞ بڵێن. واتە: هەرکەس ڕۆژگاری عەشق بەم جۆرە کە وترا ڕادەبوێرێ شەرتە پێی بڵێن مایەی ڕۆشنایی هەیە و عاشقە. لە سەرچاوەی «ب»دا بە هەڵە پارچە شێعری «مالووم بۆ جە لای دوور وەتەنانم» لە درێژەی ئەم شێعرەدا هاتووە.

-٦-

١- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٢- مەخێزنۆ: هەڵدەستێنێ، بەر پا دەکا. وەی: بەڵا. نیم نگا: بە گۆشە چاو سەیر کردن. واتە: بە گۆشە چاو سەیرکردنی بەڵا و ئاژاوە بەرپا دەکات.

٣- موژە: بەژانگ، مژۆڵ. مەکەرۆ: دەکات. پەی(یەکەم): بن، بێخ. پەی (دووهەم): بڕان، پێکان، لە بێخ هێنان. مەواچۆ: ئەڵێ، ئێژێ. واتە: مژۆڵی ڕیشەی گیان لە بێخ دەردێنێ و چاوانی هێندە مەستە بە سەرخۆشان ئەڵێ شەراب شەراب. واتە چاوانی سەرخۆشان مەستتر دەکات.

٤- زڵف: زوڵف، قژ، کەزیە. سونبوڵ: سمڵ، ناوی گوڵێکی جوان و بۆنخۆشە. تۆرنان: تۆراندووە. تەمام: تەواو. شۆرنان: شۆردووە. واتە: زوڵفی گوڵانی سمڵی لە یەک تۆراندووە ( ئەمیان ئەڵێ من لە زوڵفی دەچم و ئەویان ئەڵێ من لە زوڵفی دەچم) و ڕەنگی ئەوەندە جوانە ڕووی گوڵانی شۆردوەتەوە (بە لای ڕەنگی ئەمەوە بێ ڕەنگن).

مـــــەزانۆ بــــە ڕەنـــگ، لاڵ بەدەخشـــــان
لـــەبانش جـــارێ ڕەنگـــش پـــێ بەخشـــان[١]

ئـــەر پەرســـوو خـــەمزەش بـــە چ تـــارێوەن
ســـا ماچـــا بـــە تـــار گـــاز مـــارێوەن[٢]

خـەمزەی ئێـدْ بـە گـاز مـار کـەی مـەمانۆ؟
ئێـدْ گیـان مەبەخشـۆ، ئـەو گیـان مەسـتانۆ[٣]

---

١- مەزانۆ: دەزانێ. لاڵ: لەعل، بەردێکی بە نرخی سووری کاڵ. بەدەخشان: ناوچەیەکی ئەفغانستان کە لەعلی ئەوێ لە جوانی و خۆش ڕەنگیدا بە ناو بانگن. لەبانش: لێوەکانی. واتە: لەعلی بەدەخشان بە ڕەنگی لێوەکانی دەزانێ (ئەزانێ چۆنە) چون کەڕەتێک لێوەکانی ڕەنگی پێ بەخشیون.

٢- ئەر: ئەگەر. پەرسوو: بپرسم. ماچا: ئەڵێن، ئێژن. تار: تەرح، شێوە. گازمار: گەستنی مار، قەپ گرتنی مار. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٣- ئێدْ: ئەم. مەمانۆ: دەمێنێ. مەبەخشۆ: دەبەخشێت. مەستانۆ: دەستێنێ. واتە: ئەگەر لە خەڵک بپرسم خەمزەی چاوی لە چی دەچێت ئەڵێن خەمزەی چاوی بە وێنەی گەستنی مارە (خەمزەی بە وێنەی مار کەسێک دەگەزێ)، بەڵام نازانن! ئاخر خەمزەی ئەو کەی لە گەستنی مار دەچێت؟ ئەم بە خەمزەی گیان دەبەخشێ و ئەو (گەستنی مار) گیان دەستێنێ.

-٧-[1]

مەســـت خـــەرامان، مەســـت خـــەرامان
مەســـت نازپـــەروەر، شـــۆخ خـــەرامان[2]

چـــەرخ تـــەور پـــەڕان، زێـــد جـــە ئـــەورامان
نـــام کێـــت نەوســـت جـــە نـــام نامـــان[3]

پۆســـە بەنـــدت بەســـت بـــە لەنجـــە و لارە
کێـــت نەکـــەرد جـــە زێـــد زامـــن ئـــاوارە؟[4]

-٧-

١- ل، بر. ئەم پارچە شێعرە تەنیا لەو دوو نوسخەدا هەیە و لە نێو شێعرەکانی بێسارانیدا نووسراوە و چون لە شێعری بێسارانییەوە نزیکە ئێمەیش لێرەدا هێنامان.

٢- خەرامان: بە لارە و لەنجە بە ڕێدا ڕۆیشتن. نازپەروەر: بە ناز گەورە کراو. شـۆخ: خۆشحاڵ، بە کەیف. واتە: ئەی شۆخی بە ناز گەورەکراو و مەست و لەنجە و لارەکەر.

٣- چەرخ: واشە. تەور: وەکوو. پەڕان: باڵ گیر. زێد: نیشتمان، وەتەن. نەوست: نەخست. نامان: ئەوانەی ناویان لە نێو ناواندا ڕۆیشتووە. واتە: ئەی ئەو کەسەی بە وێنەی واشە باڵ دەگریتەوە و وای لە هەورامان، ناوی کێت لە ناو ناوداران لا نەبردووە؟ (هەر وەک واشە باڵداری بچووک دەگرێ تۆیش هەموو کەسێکت عاشقی خۆت کردووە و گرتووتن.)

٤- پۆسە: وەها، ئاوا. بەند: داو. زێد: نیشتمان. زامن: وەتەن، نیشتمان. واتە: بەوجۆرە کە بە لەنجە و لار داوت ناوەتەوە کێت لە نیشتمانی خۆی ئاوارە نەکردووە. (هەموو کەست ئاوارە کردووە).

بەو تاق ئەبرووت وێنەی کاف و نوون
جە سەودای عەشقت کێ نەبی مەجنوون؟[1]

بەو موژەی ئەڵماس سەرمایە نێشان
بڎیە جەرگ کێت قیمە نەکێشان؟[2]

قیبلەم! بۆ بە عەشق دیڎەی بێ ڕامت
مەیل کەر وە جەستەی خەستەی غوڵامت[3]

---

١- ئەبروو: برۆ. کاف و نوون: «کُن»، ئاماژەیە بەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان کە دەفەرموێ: «کُن فَیَکون» واتە «هەر شتێک کە خوا ئیرادەی لەسەر بکات و پێی بڵێ ببە، دەبێت.» سەودا: فکر و خەیاڵ. نەبی: نەبوو. واتە: بە ئەو تاقی برۆیانەت کە بە وێنەی «کاف و نوون»ـە لە فکر و خەیاڵی تۆوە کێ نەبوو مەجنوون؟ (هەموو کەست بە مەجنوون کرد).

٢- موژە: مژۆڵ، برژانگ. سەرمایە: دارایی. نێشان: کۆی وشەی «نـێش»ە بە مانای چزە. بڎیە: ببینە، سەیرکە، بڕوانە. قیمە: جنراو، جن جن کردن. واتە: بەو مژۆڵانەت کە بە وێنەی ئەڵماس تیژە و سەرمایە و داراییان نێشە وەرە و بڕوانە بزانە جەرگی کێت نەجنیوە؟ (جەرگی هەموو کەست جنیوە). لە نوسخەی «ل»دا بە جێی «نێشان»، «لە شان» نووسراوە.

٣- بۆ بە عەشق: وەرە بە عەشقی، وەرە بە خاتری. بێ ڕام: بێ ڕەحم، (دەتوانێ بە مانای ڕام نەکراویش بێت واتە دەستەمۆ نەکراو «وەرگێڕ»). کەر: بکە. خەستە: ماندوو، هیلاک، بریندار. واتە: قیبلەم وەرە و بە خاتری چاوە بێ ڕەحمەکانت (دەستەمۆنەکراوەکانت) مەیلی لای لاشەی هیلاکی غوڵامت بکە.

مەبـــە تاییفـــەی ئـــەحواڵ نـــەزانان
بـــا وەس بـــێ ڕامـــان بـــێ ڕامـــت وانـــان[١]

☆☆☆

-٨[٢]-

میـــرزام! خێزایـــێ، میـــرزام! خێزایـــێ
بـــە کەمانـــەوە، ســـەحەر خێزایـــێ[٣]

ئوســـتادی «ســـەعد وەقـــاس» بێزایـــێ
پڕشـــنگ ئـــایر جـــە شەســـت ڕێزایـــێ[٤]

---

١- وەس بۆ: بەس بێت. ڕام: ڕەحم. وانان: بخوێننەوە. واتە: لە تیرە و تایفەی حاڵ نـەزانان مەبـە و هەواڵم بپرسە با بەس بێڕەحمان بە بێ ڕەحمت ناو ببەن.

-٨-

٢- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٣- میرزا: ئەمیر زادە، ئەسڵ زادە. نووسەر، مونشی. خێزایێ: هەستایێ. سەحەر: بـەیانی. مانـای ئەم بەیبەیتە و دوو بەیتی دوایی پێکەوە دێن. لـە سـەرچاوەکانی «ب»، «ڕ»، «س» و «ح»دا بـە جێی «خێزایێ»، «خێزانی» نووسراوە.

٤- ئوستاد: مامۆستا. سـەعد وەقـاس: نـاوی ئەسـحابەیەکی پێغەمبـەر «س.خ» بـووە. بێزایـێ: بێزراوێک. پڕشنگ ئایر: پریسـکەی ئـاگر. شەسـت: جـۆرە کلکەوانەیەکـە لـە کـاتی ڕاوکردنـدا لـە قامکیان کردووە تا ژێی کەوانەکە قامکیان برینددار نەکات. ڕێزایێ: ڕژایـەک. مانـای ئـەم بەیتـە و بەیتی پێشوو و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

هــەر تیــرێ یــەک جــار ســەد زامــم کــەردە
هــەزار کــەس چــوون مــن بــەو زامــە مــەردە[١]

ئەرســەد گیــان تەســلیم خــاک پــاش کــەردیم
خــاس بــی یادگــار پــەیکانێ بــەردیم[٢]

☆☆☆

-٩[٣]-

میــرزام! نــەووەهار، میــرزام! نــەووەهــار
هــەنیچ نــەیۆوە ئێمســاڵ نــەووەهار[٤]

---

١- کەردە: کردووە. مەردە: مردووە. واتە: میرزام! یارێک کە بەیانی زوو بە کەوانەوە هەستێ و لە تیر هاویشتندا مامۆستایی سەعدی وەقاسی بێزراندبێت و لەو چاکتر تیر بهاوێ و تیر هاویشتنی پریسکەی ئاگری پێوە بێت، بە هەر تیرێکی سەد زامی لێم کردووە و هەزار کەس وەک من بە زامی ئەو تیرە مردوون.

٢- ئەرسەد: هەرچەند. پەیکان: نووکی تیژ. واتە: هەرچەند گیانمان بە خاکی ژێر پێی بەخشی بەڵام هەر باش بوو پەیکانێکمان بە یادگاری برد. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ر»، «ب» و «س»دا ئەم بەیتە نییە بەڵام پارچە شێعری «ناواک نیانان ئەوەند پێکانان» بە جێی ئەم بەیتە هاتووە کە لە نوسخەی «ک» و «ئێ»دا وەک پارچە شێعرێکی سەربەخۆ هاتووە و ئێمەیش بە شێعرێکی سەربەخۆی دەزانین و لە جێی خۆیدا هێناومانە.

-٩-

٣- ک، ئێ، س، ر، ب، عم، ح، مج.

٤- میرزا: ئەمیر زادە، ئەسڵ زادە، نووسەر، مونشی. هەنیچ: ئیتر، چیتر. نەیۆوە: نەیەتەوە. واتە: میرزام! خوا بکات ئیمساڵ ئیتر بەهار نەیەتەوە.

وەنەوشـــەی شـــیوان، بـــە خـــەم نگوونســـار
بەرنـــەیان وە بـــەر سۆســـەنان جـــە خـــار[١]

ژەرەژ نـــــەوانۆ جـــــە ســــــەر نســـــاران
شـــــەماڵ نەشـــــانۆ شـــــەونم وە داران[٢]

گـــوڵان بەرنـــەیان نـــە ســـەوز و نـــە زەرد
خـــاتر خـــەمین بـــان چـــەنی تـــۆز و گـــەرد[٣]

---

١- نگوونسار: سەرنگوون، ژێرە و بان. بەرنەیان: دەرنەیەن، نەڕوێن. خار: کەمەر (دەشت و کۆ و کەمەر). واتە: وەنەوشەی ناو شیوان بە خەم و خەفەت ژێرە و بان بن و چیتر گوڵە سوێسنە لە کەش و کۆ و کەمەردا نەڕوێن.

٢- ژەرەژ: کەو. نەوانۆ: نەخوێنێ. نەشانۆ: نەوەشێنێ، بڵاو نەکاتەوە. واتە: بەڵکوو ئیتر کەو لە سەر نساران نەخوێنێ و شەماڵیش ئاونگ بە سەر داراندا بڵاو نەکاتەوە. لە سەرچاوەکانی «ئێ»، «س»، «ڕ»، «ب»، «عم» و «ح»دا جێگەی ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا گۆڕاوە.

٣- بەرنەیان: نەڕوێن، سەوز نەبن. خەمین: خەمگین، دڵتەنگ. چەنی: لەگەڵ. واتە: بەڵکوو ئیتر گوڵی نە سەوز و نە زەرد نەڕوێن و خاتریان بە تۆز و گەردەوە خەمگین بێت. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ڕ»، «س»، «ب» و «عم»دا بە دوای ئەم بەیتەدا سێ بەیتی دیکە هاتووە کە لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا نییە. دیارە هی ئەم شێعرە نییە چون باسی پاییز دەکات و ئەم شێعرە باسی بەهارە. ئەمەیش سێ بەیتەکە بۆ هەڵسەنگاندن:

نـە دەنـگ سـاز بـۆ، نـە عـەیش بولبـوڵ   نـە ڕەنـگ گـوڵ بـۆ، نـە کارخانـەی دڵ
سـوەیل بـەر نـەیۆ ئێمسـاڵ جـە یەمـەن   ڕەنگـرەژ نەکـەرۆ خـەزان نـە چەمـەن
پـەی چێش؟ بـێ قیبلـەم نمـەدۆ دیـار   بێـزارم جـە سـەیر گـوڵان وەهـار

مــــەولام بـــۆ ڕایـــێم بـــدەرە تــــەدبیر
زێنــــدەگیم شـــیەن نــــە بەنـــد زەنجیـــر[1]

☆☆☆

١- مەولا: گەورە، سەروەر، خاوەن. بۆ: وەرە، بێ. ڕا: نەزەر، بیر و بۆچوون. بدەر: بدە. تەدبیر: تـەکبیر کردن، تەویرکردن. زێندەگیم: ژیانم. شیەن: ڕۆیشتووە. بەنـد: داو. واتـە: گـەورەم، وەرە و بـە نـەزەری خۆت تەکبیرێکم بۆ بکە چون ژیانم بووە بە داوی زنجیرەوە. (هەرچی هێنام و بردم نـەمتوانی مانـای ئەم بەیتە بەرمەوە سەر بەیتە پێشوەکان «وەرگێـر»). لـە نوسـخەی «ک»دا بـە دوای ئـەم پارچـە شێعرەدا شێعرێکی دیکە هاتووە کە لە سەری نووسراوە «شیخ احمد تختی» و هەروەها لە نوسخەی «ئێ»دا لە سەری نووسراوە «شیخ محمد» بەڵام لە سەرچاوەکانی «س»، «ڕ»، «ح» و «عم»دا بە ناوی بێسارانییەوە لە قەڵەم دراوە. هەروەها لە «تاریخ مشاهیر کرد»یشدا بـە نـاوی «شـیخ احمـد مردوخ» نووسـراوە. ئێمـەیش بـە شـێعری بێسـارانیمان نـەزانی و لێـرەدا تـەنیا بـۆ هەڵسـەنگاندن دەیهێنین. ئەمەیش پارچە شێعرەکە بە پێی نوسخەی «ک»:

| | |
|---|---|
| تـەرزێو خـەزان دیـم جـە فەسـڵ هـامن | بـە گـڕ مەسـۆچیا بەتەرتـەر جـە مـن |
| واتـم هـەی خـەزان یـە فەسـڵ تـۆ بـی | ئـی گـڕ ئـایرە پـەی تـۆ جـە کـۆ بـی؟ |
| واتـــش تـــۆ حـــاڵزان تـــەرز خـــەزانی | چ خـەیرەن بـەی هـاڵ هـەواڵ مـەزانی؟ |
| هــەر خــەزان ڕەشـتـەی فەسـڵ سـومیلەن | ئـەو بـە خودنـازی ئەنـدەکێش مەیلـەن |
| بــۆ بدێیــە وە بــێخ بــەرگ و باڵامـــان | مـــن دڵ ســـفتەنان نەویشـــان دامـــان |
| ئـەوان نـە ڕای دۆسـت بـەرگێو ڕێزنـان | مـن بـەرگ و بـێخم پـەی ئـەو بێزنـان |
| هەوای شەوق دۆست، گەرمی ڕۆی هـامن | بـێ ئێختیـار سـەند، ئێختیـار جـە مـن |
| هەر کـەس بـێ تـاوەن جـە شـەوق ئـازیز | کـــەی قـــەرار دارۆ تـــا وەخـــت پـــاییز |
| مـەولام هـەر کەسێو دەروون پـەڕ دەردەن | جـــە هـــەر فەســـڵێدا زایـــف و زەردەن |

-١٠-[١]

میـــــرزام! وەهـــــاران، میـــــرزام! وەهـــــاران
ســـــوبحدەم وەشـــــەن، فەســـــڵ وەهـــــاران[٢]

تەماشـــــای قـــــەترەی دوڕ وێنـــــەی واران
ئـــــاوێز بـــــۆ جـــــە وەڵـــــگ نـــــەونمای داران[٣]

خەنـــــدەی شـــــکۆفان نـــــە ڕووی بوڵبـــــوڵان
جـــــە بـــــێ پـــــەروایی نازپـــــەروەر گـــــوڵان[٤]

ســـــەیر چەمـــــەنان، بـــــاڵای نـــــەمامان
چـــــەنی بـــــاد نـــــەرم بـــــە نـــــاز خـــــەرامان[٥]

---

-١٠-

١- ک، ئێ، مج.

٢- میرزا: ئەمیر زادە، ئەسڵ زادە، نووسەر، مونشی. سوبحدەم: بەیانی زوو. وەشەن: خۆشە. فەسڵ: وەرز. واتە: میرزام! لە بەیانی وەرزی بەهاراندا ئەم شتە خۆشە. لە بەیتە دواییەکاندا ئەڵێ چی خۆشە.

٣- قەترە: دڵۆپ. دوڕ: ناوی جەواهێرێکە لە لاشەی سەدەفدا کە بوونەوەرێکی زەریاییە دروست دەبێت. واران: باران. ئاوێز: هەڵواسراو. جە: لە. وەڵگ: گەڵا. نەونما: تازە دیاری داو. واتە: سەیر کردنی دڵۆپەی باران کە لە گەڵا تازە ڕواوەکان هەڵواسراون و لە دەنکە دوڕ دەچن خۆشە.

٤- خەندەی شکۆفان: پێکەنینی هەڵاڵە. بێ پەروایی: گوێ پێ نەدان. واتە: پێکەنینی هەڵاڵەکان بە دەمی بولبولانەوە لە بەر گوێ پێ نەدانی ئەو گوڵە نازپەروەرانە خۆشە.

٥- چەمەن: سەوزەڵانی. چەنی: لەگەڵ. باد: با. خەرامان: بە لەنجە و لار. واتە: سەیر کردنی ☜

دیــــدەی نەرگســــان، خــــاڵ نــــەورۆزان

چ خــاس وێنــەی داخ دەروون پــەڕ ســۆزان[١]

پــەرێ تەماشــای بــەور بــەرز دەمــاخ

دەمــاخ جــە نەوبــەت جـام مــەی بــە چـاخ[٢]

بــەڵێ، هــەر وەختــێ خەســرەو دارا

مــەیل کــەرۆ وە مــەی، ســەیر کــەرۆ ســارا[٣]

قــەدەم بــە دەوڵــەت بــاوەرۆ بــە خــەیر

فــەرش چەمــەنان ســەیر کــەرۆ بــە مــەیر[٤]

---

☜ باڵای نەمامان کە بە دەم باوە لەنجە و لار دەکەن خۆشە. ئەم بەیتە لە نوسخەی «ک»دا نییە.

١- پەڕ: پڕ. واتە: سەیر کردنی چاوی گوڵە نەرگس و خاڵی گوڵە نەورۆزە کە چەند بە باشی وێنەی داخی دەروون پڕە لە سۆز خۆشە.

٢- پەرێ: بۆ. بەور: بەفر. بەرزە دەماخ: بە کەیف، خۆشحاڵ. چاخ: خۆشی، کاتی خۆشی. واتە: بۆ سەیرکردنی بەفری بەرزە دەماخ سەرم لە نۆبەتی جامی شەراب بە کەیفە.

٣- خەسرەو: پاشا، نازناوی پاشایەکی ئێرانییە. دارا: پاشا، دارێوشی سێهەم کە یەکێک لە پاشاکانی ئێران بووە، لێرەدا مەبەست لە «خەسرەو دارا» یارە. واتە: بەڵێ هەر کاتێک یار دڵی بە شەرابەوە بوو بێت بۆ سەیرانی کەش و کێو.

٤- قەدەم: لاق، پێ. دەوڵەت: ماڵ و دارایی، گەورەیی. سەیر کەرۆ: سەیر بکات. مەیر: مێهر، خۆشەویستی. واتە: بە گەورەیی و سەروەری پێ لە سەوزەلانی بنێت کە بە وێنەی فەرش ڕاخراوە و بە چاوی خۆشەویستییەوە لێی بڕوانێت.

مـــەوازۆ ئەوســـا خـــەم بـــڎۆ بـــە بـــاڎ
کەمتـــــەر خـــــەمگینان، بـــاوەرۆ وە یـــاڎ[١]

✡✡✡

١- مەوازۆ: پێویستە، لازمە. ئەوسا: دوای ئەوە، ئەوکات. بڎۆ: بدات. باوەرۆ: بهێنێ. واتە: پێویستە ئەوکاتە یار خەم بە با بدات و خەمگینێکی وەکوو من کە زۆر لەو کەمترم، بە یاد بهێنێ و یادم بکات.

-١-[1]

نالـــەی دەردەدار بـــێ ئـــاخ نمـــەبۆ
دەروون عاشـــق بـــێ داخ نمـــەبۆ[2]

عاشـــق تـــا دەمـــێ جـــەفاش نمـــەبۆ
بـــێ جـــەفا هـــەرگێز سـەفاش نمـــەبۆ[3]

گـــوڵ جـــە گوڵســـتان بـــێ خـــار نمـــەبۆ
بوڵبـــوڵ جـــە عەشـــقش بێـــزار نمـــەبۆ[4]

هـــەر کەســـێ عەشـــقش ڕەفیـــق نمـــەبۆ
واســـڵ تـــەریق حـــەقیق نمـــەبۆ[5]

-١-

١- ک، ئێ، س، ع، م، ل، ر، ب، ح.

٢- نمەبۆ: نابێت. واتە: ناکرێت ناڵەی دەردەدار ئاوێتەی ئاخ نەبێت.

٣- جەفا: سەختی. سەفا: خۆشی. واتە: عاشق تا سەختی و جەفا نەکێشێت بە خۆشی ناگات.

٤- خار: دڕوو، دڕک. واتە: گوڵ لە گوڵستان بێ دڕوو نییە بەڵام بولبول هەر عاشقیەتی و لێی بێزار نابێت.

٥- واسڵ: گەیشتوو. تەریق: ڕێگە، ڕێ. حەقیق: ڕاستی. واتە: هەرکەسێک عەشق نەبێ بە هاوڕێی، سەر ڕێگەی ڕاست ناکەوێت.

«مــــەحزوونی» عاشـــق، بـــێ یـــار نمـــەبۆ
عاشـــقان بـــێ یـــار، مـــەدار نمـــەبۆ [١]

تـــا مـــەجاز نـــەبۆ حـــەقیق نمـــەبۆ
بـــێ مـــەجاز، حـــەقیق تـــەحقیق نمـــەبۆ [٢]

لێـــوەیی مـــەجنوون، بـــێ لـــەیل نمـــەبۆ
کۆکـــەنی فـــەرهاد، بـــێ مـــەیل نمـــەبۆ [٣]

هـــەر کەســـێ بـــە عەشـــق دڵشـــاد نمـــەبۆ
دەر خـــەیر پـــەرێش گوشـــاد نمـــەبۆ [٤]

***

---

١- مەحزوونی: خەفەتبار، بێسارانی لە سەردەمی خۆیدا بە «مەحزوونی» ناسراوە، هەرچەند خۆی لە شێعرەکانیدا نازناوی خۆی نەهێناوە بەڵام لە نوسخەی «ک»دا لە سەر شێعرەکانی نووسراوە «ولە محزونی» کە وابێ ئەم وشە دەتوانێ نازناوی بێسارانی بێت. مەدار: ئارام و قەرار. واتە: مرۆڤی عاشقی خەفەتبار (من) ناکرێ بێ یار بێ و عاشقی بێ یار ئارام و قەراری نییە.

٢- مەجاز: هەرشتێ ڕاست نەبێت، لێرەدا بە مانی عەشقی زەمینیە. حەقیق: ڕاستەقینە، لێرەدا واتە عەشق بە خودا. تەحقیق: ڕێک کەوتن. واتە: تا عەشقی مەجازی نەبێت، عەشق بە خودا لە مرۆڤدا نایەتە ئاراوە و بێ عەشقی مەجازی عەشقی ڕاستەقینە ڕێک ناکەوێت.

٣- لێوەیی: شێتی. کۆکەنی: کێو کەندن. واتە: تا لەیلا و عەشق بە ئەو نەبێت مەجنوون لە کوێ شێت و لێوە دەبێ و تا عەشق و خۆشەویستی شیرین نەبێ چی ئەبێتە هۆی ئەوەی فەرهاد کێو بتاشێت؟

٤- دەر: درگا. خەیر: خێر. گوشاد: ئاوەڵا. واتە: هەرکەس عاشق و بە عەشق دڵخۆش نەبێت

-٢[١]-

نـــــاواک نیانـــــان ئەوەنـــــد پێکانـــــان
خـــەریک مەنـــدەنان پـــەی جـــای پـــەیکانان[٢]

هـــەلا، زەبـــوون دڵ، مەدێـــەو پێشـــەدا
پـــەیکان بـــە پـــەیکان مـــدران تێشـــەدا[٣]

جگـــەر، هـــۆ جەســـتەش تـــەمام هوونـــاوەن
هوونـــاوش نـــە چـــەم جـــاگیر خـــاوەن[٤]

---

☜ درگای خێری لێ ناکرێتەوە.

-٢-

١- ک، ئێ. ئەم پارچە شێعرە لە «ح»، «س» و «ڕ»یشدا هەیە بەڵام لە درێژەی پارچە شێعری «میرزام خێزاین»دا هاتووە و شێعرێکی سەربەخۆ نییە، بەڵام لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا شێعرێکی سەربەخۆیە و ئێمەیش وەک شێعرێکی سەربەخۆ لێرەدا هێنامان.

٢- ناواک: کۆی «ناوەک»ـە بە مانای تیر. نیان: شاراوە، داپۆشراو، نادیار، نەهان. ئەوەند: ئەوەندە، هێندە. مەندەنان: ماوم. پەی: بۆ. جا: جێگە، جێ. پەیکان: نووکی تیژی تیر. واتە: ئەوەندە بە تیری نادیار و شاراوە پێکراوم خەریکی دۆزینەوەی جێگە بۆ نووکی تیری دیکەم. مەبەستی ئەوەیە ئەوەندە پێکراوم کە ئیتر جێگە بە لاشەمەوە نەماوە تیری پێوە نەبێت.

٣- هەلا: وشەیەکە بۆ دەنگ دانی کەسێک بۆ ئەنجامی کار، لێرەدا بە مانای «ئاگادار بە و بزانە»یە. زەبوون: بێچارە، لاواز. مەدێەو: سەیر دەکەم، دەڕوانم. پێشەدا: پێیدا. مدران: وەستاوە. تێشەدا: تێیدا. واتە: کاتێ سەیری دڵی لاواز و بێچارەم دەکەم یەک یەک نووکی تیری تێدا وەستاوە.

٤- هۆ: خۆ. جەستە، لاشە. هووناو: خوێناو. نە چەم: لە چاو. جاگیر: جێگر. واتە: خۆ لاشەی جگەرم تەواو خوێناوییە و خوێنی جگەرم هاتووەتە چاوانم و جێی خەوی گرتووە و خەوم نەماوە.

دادگیر نیەنان چوون نەزان حاڵان
جە زام ناواک دڵبەر مەناڵان[١]

ئەرسەد جەی بەتەر وە گیانم زامەن
شیرینتەر جە گیان شیرین جە لامەن[٢]

***

-٣[٣]-

نەداروو تانە، نەداروو تانە
نەداروو تاقەت، تەوانای تانە[٤]

بە وێنەی مەجنوون وێڵ دێوانە
مەشوون وە چۆڵی، مەسازوو یانە[٥]

---

١- دادگیر: ماف سێنەر، پارێزەر. نیەنان: نیم. چوون: وێنەی، وەکوو. ناواک: کۆی «ناوەک»ـە بە مانای تیر. مەناڵان: دەناڵێن. واتە: بە وێنەی نەزان حاڵان نیم کە لە زامی تیری یار بناڵێم و بمەوێت وەک ئەوان داوای مافم بکەم و مافم بسێنم.

٢- ئەرسەد: هەرچەند. جەی بەتەر: لەمە خراپتر. واتە: هەرچەند لەمە خراپتر گیانم زامدارە، بەڵام کێشە نییە چون شیرینتر لە گیانی شیرین (تیری دڵبەر) وا بە لامەوە. دەکرێت وەهایش مانا بکرێتەوە کە ئەو شیرینەی لە گیانم شیرینتر وا بە لامەوە.

-٣-

٣- ک، س، ع، ر، ب، ح.

٤- نەداروو: نیمە. واتە: تاقەت و توانای تانە و تەشەرم نییە.

٥- دێوانە: شێت، بێ عەقڵ. مەشوون: دەڕۆم. مەسازوو: دروست دەکەم. یانە: ماڵ. واتە: بە

بـــەرگ تـــەن جـــە وەڵـــگ درەختـــان چـــۆڵ
پـــەی وێـــم مـــەورازوو، مـــەگێروو نـــە کـــۆڵ[١]

یـــەک سیاســـەنگێ مەنیـــەو نـــە بـــاڵین
تـــەک مـــەدەو پێـــوە، پـــەرێو شـــەوناڵین[٢]

پـــەی وێـــم مـــەگێڵوو ســـەروەش نـــە کـــاوان
مـــەر مـــەلان مـــەردەن، بەیدیشـــان مـــاوان؟[٣]

---

☜ وێنەی مەجنوونی وێڵ و شێت دەچمە شوێنێکی چۆڵ و هۆڵ و ماڵێک بۆ خۆم دروست دەکەم.

١- بەرگ: جل و بەرگ، لیباس. تەن: لاشە، بەدەن. وەڵگ: گەڵا. درەخت: دار. پەی وێم: بۆ خۆم. مەورازوو: دەدوورم، دروست دەکەم. مەگێروو: دەگرم. واتە: لە گەڵای داران جل و بەرگێک بۆ خۆم دەرازێنمەوە و دەیدەم بە شانمدا (لەبەری دەکەم).

٢- سیاسەنگ: بەردی ڕەش. مەنیەو: دەنێم، دەنم. باڵین: ژێر سەر، سەرینگە. مەدەو: ئەدەم. پەرێو: بۆ، لەبۆ. واتە: بەردێکی ڕەش دەنێمە ژێر سەرم و پاڵی پێوە ئەدەم بۆ گریان و شەوناڵین.

٣- پەی وێم: بۆ خۆم. مەگێڵوو: دەگەڕێم. سەروەش: سەرخۆش، سەرمەس، مەست. کاوان: کەشی بەرز، ملە. مەر: مەگەر. مەلان: باڵداران. بەیدی: بیابان، کەش و کێوی چۆڵ. ماوا: شوێن و مەکان. واتە: بە سەرخۆشی لە سەر کەشان دەگەڕێم، مەگەر باڵداران مردوون کە شوێن و مەکانیان وا بە کەش و کێو و شوێنی چۆڵەوە؟ (پەیوەندی دانی ئەو دوو نیوە بەیتە بۆ خوێنەری ئاسایی برێک ئەستەمە، بە کورتی دەبێتە: خۆ باڵدارانیش نەمردوون وان بە سەر کەش و کێو و چۆڵگەوە با منیش ڕوو بکەمە کەش و کێو، خۆ بە مانای مردنم نییە. «وەرگێڕ»).

خـــاوم بـــه ڕاحـــەت، گەشـــتم بـــە دڵـــواز
نـــە نـــەزان ڕەفێـــق، نـــە ڕەقیـــب هـــامڕاز[١]

***

-٤[٢]-

نەرگســـێو مـــەبۆ ســـاق ســـەوز و جـــام زەرد
شەو بە شـەونەم کـەیل، پـەل سـپی و بێگـەرد[٣]

شـــەوان بـــە شـــەونەم خـــاڵ مـــەدۆ جـــەلا
جـــام زەرد پێـــوەن چـــوون چوقـــەی تـــەلا[٤]

---

١- خاو: خەو. گەشت: گەڕان. دڵواز: دڵخواز، ویستی دڵ. ڕەقیب: دوژمـن، خراپـەخواز. هـامڕاز: هاوقسە، هاودەم، هاوڕێ. واتە: بە ڕاحەتی و ئاسوودەیی دەنووم و بە ویستی دڵـی خـۆم دەگـەڕێم و ئیتر نە نەزان هاوڕێمە و نە ڕەقیب هاوقسەم. لـە نوسـخەی «ک»دا بـە جێـی «نـەزان»، «ڕازی» نووسراوە.

-٤-

٢- ک، نێ، س، ڕ، عم، ب، ح، مج.

٣- نەرگسێو مەبۆ: نەرگسێک دەبێ، نەرگسێک هەیە. جام: جامی گوڵ کاتێ گـوڵێ دەپشـکوێت ئەوەی کە لە دەرەوە دیارە پێی ئەڵێن جام. شەونم: ئاونگ. کەیل: پڕ. پەل: پەڕەی گوڵ. بێگـەرد: بـێ وێنە، بێ تۆز. واتە: گوڵە نەرگسێک هەیە ساقەکەی سەوزە و جامەکەی زەردە و شـەوان جامەکـەی پڕ ئەبێ لە ئاونگ و پەڕەکانی سپی و بێ گەرد و بێ وێنەن.

٤- مەدۆ: ئەدا. جەلا: جەلا، ڕۆشن کردنەوە، پاک کردنەوە. پێوەن: پێوەیە. چـوون: وێنـەی، وەکـوو. چوقە: جوقە، جێقە، تۆپەڵەیەکی لە پەل و پۆ دروست کراوە کە بە سـەر تـاجی شـاهانەوە کـراوە. واتە: شەوان خاڵی بە ئاونگ دەسڕێ و جامێکی زەردی هەیە کە بە وێنەی جوقەی زێڕە.

چــــەنی بــــاد ســــوبح بــــاڵا مــــەنمانۆ
شــــکۆفەش بــــە شــــەوق ئافتــــاب مــــەمانۆ[١]

تــــەن لــــەرزان بــــە جــــەور بــــاد ســــوب تۆفــــان
پێشــــڕەو قوشــــەن، شــــەوق شــــکۆفان[٢]

شــــێوەی ئــــەو نــــەرگس بــــەو شــــەوبەندەوەن
بــــەو شــــای شــــکۆفان شاپەســــەندەوەن[٣]

☆☆☆

---

١- چەنی: لەگەڵ. باد سوبح: بای بەیانی. مەنمانۆ: دەنوێنێ، نیشان دەدا. شکۆفە: هەڵاڵـەی دار. ئافتاب: هەتاو، خۆر. مەمانۆ: شێوەی ئەدات. واتە: لەگەڵ بای بەیانیدا باڵا دەنوێنێ و هەڵاڵەی لە شەوقی هەتاو دەچێت.

٢- تەن: لاشە، جەستە، بەدەن. جەور: زەحمەت. سوب: بەیانی. تۆفان: با و باران پێکەوە. پێشـڕەو: ئەو سەربازەی دەکەوێتە پێش لەشکەرەوە. قوشەن: لەشکەر. واتە: بە زەحمەتی تۆفانی بای بـەیانی لاشەی دەلەرزێ و پێشڕەوی سپای شەوقی هەڵاڵانە.

٣- شەوبەند: ئەو سەرپۆشەی کە بە سەریا ئەدەن و ڕوخساریش دەپۆشێ و تەنیا چاو بـە دەرەوەیـە. لێرەدا مەبەست ئەو جێگەیە کە لە ژێر شەوبەندەوە دیارە واتە چاو. شاپەسەند: هەرچی بە دڵـی شـا بێت، ناوی گوڵێکە کە گوڵی شین و وەنەوش و سووری هەیە. واتـە: ئـەو نەرگسـە لـە چـاوانی یـار دەچێت کە لە ژێر شەوبەندەوە دیارە و لەو شای هەڵاڵانە دەچێت کە بە دڵی شایە (چاوانی یار).

-٥-[١]

نـــه ســـــەربەندانەن، نـــــه ســـــەربەندانەن

چەنـــد گـــوڵ خەنـــدانێ نـــه ســـەربەندانەن[٢]

یەنـــد خەنـــدەی شـــیرین بـــه گشـــت ئەندانـــەن

خەندەشـــــان وەپــــەی خەنـــــدەی خەندانـــــەن[٣]

خەنـــدەی گشـــت گـــوڵان بـــه بـــای ســـەحەرەن

خەنـــدانی خەنـــدەش چـــوون کـــۆی شـــەکەرەن[٤]

یـــا شـــا! تانـــەی بـــەد دوور بـــۆ جـــه خەنـــدەش

یـــەکێو بـــۆ توفـــەیل، یـــەکێو بـــۆ بەنـــدەش[٥]

❀ ❀ ❀

-٥-

١- ک، ئا.

٢- سەربەندان: سەر کێوان. گوڵ خەندان: جۆرێک گوڵ، گوڵ خەندەران. واتە: چەند گوڵ خەنـدەران وا بە سەر کێوانەوە.

٣- یەند: هێندە، ئەوەندە. خەندە: پێکەنین. گشـت: هـەموو. ئەنـدان: جـۆر. وەپـەی: لـەبۆ، بـۆ. خەندان: کەسێک کە دایم پێبکەنێت. واتە: ئەم هەموو پێکەنینە شیرینە کـە بـە هـەموو جـۆرێ پێنەکنێت لەبەر دیتنی پێکەنینی یارە.

٤- باد: با، وا. سەحەر: بەیانی زوو، کازیوە. واتە: پێکەنینی هەموو گوڵان بـە بـای بەیانییـە بـەڵام پێکەنینی گوڵ خەندەران بە وێنەی کێوی شەکەر شیرینە.

٥- دوور بۆ: دووربێ. یەکێو: یەکێک. توفەیل: لە بنەڕەتدا ناوێکی عەرەبییە و بە مانای ☞

-٦[1]-

نـــــەوپاییز بێـــــدەرد، نـــــەوپاییز بێـــــدەرد
ئێمـــــە دەردەدار، نـــــەوپاییز بێـــــدەرد[2]

بێـــدەرد، بـــە ڕێـــزەی ڕاز هـــەوای ســـەرد
تـــاراج دووکـــان چەمـــەنانش کـــەرد[3]

چەنـــد پارچـــەی ڕەنـــگڕەنـــگ خـــەزان ئـــاڵا
ڕەنـــگ ئاڵاشـــان نـــە ڕووی خـــاک مـــاڵا[4]

---

☜ کەسێکە بێ ئەوەی بانگهێشت کرابێت ببێتە میوانی ماڵێک، بەڵام لێرەدا بە مانای «نانەخۆر»ە. واتە: یاخوا پێکەنینی لە تانەی خراپان دوور بێت و یەکێکی ببێتە نانەخۆری و یەکێکیش ببێتە بەندەی.

-٦-

١- ک، ئێ، س، ڕ، ئا، عم، ب، ح، مج.

٢- واتە: ئێمە دەردەدارین و پاییز بێدەردە. لە سەرچاوەکانی «ح»، «ب»، «س»، «ڕ»، «عم» و «مج»دا بە جێی «نەوپاییز»، «نەوسومیل» نووسراوە.

٣- ڕێزەی ڕاز: وردە ڕاز کردن، هەوای سەرد بە وردە ڕازان شوبهێندراوە. تاراج: تاڵان. چەمەن: سەوزەڵانی. واتە: پاییزی بێدەرد هێدی هێدی هەوای سەردی هێنا و دووکان و بازاڕی سەوزەڵانی و باخی تاڵان کرد.

٤- ئاڵا: لێرەدا واتە ڕەنگی زەرد و سوور. ماڵا: ماڵی. واتە: چەند پارچەی ڕەنگاوڕەنگی بە ڕەنگی زەرد و سوور بە سەر خاکدا ماڵی (وەرینی گەڵای دارەکان لە پاییزدا).

دیبـــای فـــەرەنگی جـــە بـــەرگ تـــەرزان
کـــەردەن هـــەوای ســـەرد نـــەوپاییز ئـــەرزان[١]

ئێمـــە بـــار خـــەم، بـــەی جەســـتە زویـــر
مەشـــیمان بـــە دیـــن خـــەزانان جـــە ویـــر[٢]

ئەرســـەد ژەنـــگ خـــەم مەپۆشـــا خـــەیاڵ
مەخســـــەڵماڵ مەکـــــەرد خـــــەزانان لاڵ[٣]

هـــەوای نـــەوپاییز جـــە هـــاڵنـــەزانی
خـــەزان ڕێـــزان کـــەرد، داران خـــەزانی[٤]

---

١- دیبا: پارچەی هەورێشمی ڕەنگاوڕەنگ. فەرەنگی: غەربی. بەرگ: گەڵا. تـەرز: لقـی ناسـکی دار. کەردەن: کردووە. واتە: هەوای سەردی نەو پاییز دیبای فـەرەنگی لـە گـەڵا و لقـی دار هـەرزان کردووە. (گەڵای لقە ناسکەکانی ڕەنگاوڕەنگ کردووە و کاتێ سەیری گەڵاکان بکەی پێت وایە دیبایە و بەو بۆنەوە وا نیشان ئەدات کە دیبا زۆر و هەرزان بووە.)

٢- بەی جەستە: بەم جۆرە. زویر: خەمگین. مەشی: دەچوو. دین: دیتن. ویر: بیر. واتە: ئێمە بـە دیتنی گەڵا ڕژاوەکان باری خەم و لاوازی خۆمان لە بیر دەچووەوە.

٣- ئەرسەد: هەرچەند. مەپۆشا: دەپۆشی. مەخسـەڵماڵ: پـاک کردنـەوە. مەکـەرد: دەکـرد. لاڵ: لەعل، بە ڕەنگی سوور. واتە: هەرچەند ژەنگی خەم و خەفەت خەیاڵی پۆشـیوین بـەلام بـە دیتنـی گەڵا سوورەکان کە خەزانیان کردووە ئەو ژەنگە پاک و خەیاڵ ڕۆشن دەبووەوە.

٤- هاڵنەزانی: نەزان حاڵی، بێ عەقڵی. ڕێزان کەرد: ڕژا، وەراند. داران خـەزانی: ئـەو دارانـەی کـە خەزان دەکەن و گەڵاکانیان دەوەرێن. واتە: هەوای نەوپاییز لە بـەر بـێ عـەقڵی گـەڵای دارە خـەزان لێدراوەکانی ڕژانە سەر زەوی.

ئیسه ئێمه و دەرد جەفای ڕۆزگار
دەست نە گەردەنیم تا وەخت وەهار[1]

٭٭٭

-٧-[2]

نەورۆزگوڵێ هەن، زیبای سەرکاوان
بەرمەیۆ نە پای ڕێزەی وەفراوان[3]

سەرتاپا نیلی وێ بە خوم ڕەشتە
بۆی موشک و عەنبەر بە خاڵدا وەشتە[4]

پەل پەل نوختەی نوور، ڕێز مرواری
بە نوختەی خاڵان، وێ کەرد دیاری[5]

---

١- گەردەن: مل. واتە: ئێستە ئێمە و دەرد و جەفا و سەختی ڕۆژگار تا هاتنەوەی بەهار (و گەڵا کردنەوەی داران) دەس لە ملانی یەکترین.

-٧-

٢- ک، س، ڕ، عم، ب، ح.

٣- نەورۆزگوڵ: گوڵاڵە گەزیزە. هەن: هەیە. زیبا: جوان. بەرمەیۆ: دەرتێ، دەڕوێ. وەفراوان: بەفراوان. واتە: گوڵاڵەگەزیزەیەک کە هۆی جوانی کەش و کێوە لە بەر بەفراواندا دەڕوێ.

٤- نیلی: شینی ئاسمانی. خوم: ڕەنگێکی شین کە «جاو»یان پێ ڕەنگ کردووە. ڕەشتە: ڕەنگ کراو. موشک و عەنبەر: دوو ماکی (مادەی) بۆنخۆش. وەشتە: باریوە. واتە: سەرتاپای ڕەنگی شینە و ئەڵێی بە خوم ڕەنگ کراوە و بۆی موشک و عەنبەری بە سەر خاڵدا باریوە.

٥- پەل پەل: دەستە دەستە، دەتوانێ بە مانای گەڵا گەڵاش بێت. ڕێز: تاقم، دەستە، ڕەدیف. ☜

دەستە بە دەستە چوون زڵف وەشبۆ
بەرئامان، مدران، کۆکۆ نە پای کۆ[١]

شێوەی نەورۆزگوڵ ها بەو نەخشەوە
بەو نەخش خاڵان وەشبۆ بەخشەوە[٢]

☆☆☆

-٨-[٣]

نەوسوەیل باخان، نەوسوەیل باخان
دیسان مایەی ڕەنگ ئاورد وە باخان[٤]

---

☞ مرواری: جۆرە جەواهێرێکە لە لاشەی سەدەفدا دروست دەبێ و زۆر بەنرخە. وێ: خۆی. دیاری: نیشان کردن. واتە: دەستە دەستە (گەڵا گەڵا) خاڵی ڕۆشن و نوورانی وەکوو ڕیزی مرواری پێوەیە و بە ئەو وردەخاڵانە خۆی دیاری کردووە.

١- چوون: وێنەی، وەکوو. زڵف: زوڵف، قژ. وەشبۆ: بۆنخۆش. بەرئامان: ڕواوە. مدران: وەستاوە. کۆکۆ: بە کۆمەڵ. واتە: گوڵاڵە گەزیزە دەستە دەستە بە وێنەی زوڵفی بۆنخۆش لە پای کێوانەوە بە کۆمەڵ وەستاون.

٢- واتە: ئەو گوڵاڵە گەزیزە لەو نەخشی خاڵانە دەچێت کە بۆنی خۆش بە یەک دەبەخشن.

-٨-

٣- ک، ئێ، س، ر، ئا، عم، ب، ح، مج.

٤- سوهیل: ئەستێرەیەکی ئاسمانییە لە پاییزدا هەڵدێت و پێشینیان باوەڕیان وابووە کە هەڵهاتنی ئەو ئەستێرە ئەبێتە هۆی زەرد و سوور بوونی گەڵای داران. مایە: ئامیان، هەوێن. واتە: دیسان نەوسوەیل هەوێنی زەردی بۆ باخان هێنا.

فــــرووزا جــــه وەڵــــگ وەزان چراخــــان
ســــۆچنا پێشــــان پەروانــــه داخــــان[١]

ڕەنــگبەســت کــەرد ســەرتەرز بــاڵای بلــەرمان
چــوون بــەرگ زوخــین زام بــێ دەرمــان[٢]

وەڵــــگ وەنداران وەخــــت ئافتــــاوخێز
کــــەردەن وێنــــەی لاڵ نگــــین پــــەروێز[٣]

---

١- فرووزا: هەڵگرسا، ڕۆشن بوو، وا دیـارە ئـەو کـات گـەڵای گوێزیـان کـۆ کردوەتـەوە و چرایـان پـێ داگرساندووە یا دەتوانێ بەو مانا بێت کە گەڵای گوێزەکان وەکوو چـرای داگرسـاو زەرد بـوون. وەڵـگ: گەڵا. وەز: گوێز. سۆچنا: سووتان. پێشان: پێیان. پەروانە: پەپوولە. واتـە: چراکـان بـە گـەڵاڕێزانی گوێزەکان داگرسان (گەڵای گوێزەکان بە وێنەی چرای داگرساو زەرد بـوون) و پەپوولـە بـە ئـەو چرانـە داخیان سووتاند.

٢- ڕەنگبەست: ڕەنگ کراو. کەرد: کرد. بلەرم: بە ڕێک و پێکی ماناکەیمان بۆ ڕاست نەکرایەوە بەڵام بە پێی مانای شێعرەکە و بە پێی ئەوەی لە دوو شوێنی دیکەیشدا هاتووە وا دیارە یا بە مانای «داری بەرز»ـە یا ناوی جۆرە دارێکە کە ئێستە وەهای پێ ناڵێن. ئێمە بە مانـای «داری بـەرز» هێنامـان، هەروەها لە پارچە شێعرەکانی «پاییز ئاماوە» و « چراخ وە ڕەزان»یشدا هاتووە. چوون: وێنەی، وەکوو. بەرگ: لێرەدا بە مانای پارچە یا پەڕۆ کۆن هاتووە. واتە: نەوسومیل سەرتەرزی دارە بەرزەکانی وەکـوو پەڕۆیەکی لە سەر زامی خوێن و زوخاو لێ هاتوو گوڵ گوڵ و ڕەنگ (سوور) کرد.

٣- وەڵگ: گـەڵا. وەندار: داری وەن. ئافتـاوخێز: هـەتاو هـەڵاتن. لاڵ: لـەعل، بـەردێکی بـەنرخی سووری کاڵ. نگین: جەواهێر یا بەردێکی بەنرخە کە بە سەر کلکەوانەوەی دەنێن. پـەروێز: خەسـرەو پەروێز پاشای ئێران. واتە: گەڵای دارە وەنەکان کاتێ بـەیانی زوو تـاو هەڵـدێت ڕەنگیـان لـە ڕەنگـی نگینی کلکەوانەی خەسرەوی پەروێز دەچێت.

جـــه عـــه‌کس خـــه‌زان جـــام گـــۆلاوان
هه‌ریـــه‌ک چـــمان قـــورس تـــه‌ڵا تـــێ تـــاوان[١]

پـــه‌ی که‌ســێ شـێوه‌ی ســه‌وداش نــه‌ ســه‌ر بـۆ
جۆیـــای جانفیـــدای وه‌ســـڵ دڵبـــه‌ر بـــۆ[٢]

خـــه‌زان جه‌لابـــه‌خش خـــه‌م خه‌یاڵشـــه‌ن
پامـــاڵکـــه‌ر گـــه‌نج شـــادی و ماڵشـــه‌ن[٣]

* * *

١- جام: ئاوێنه. گۆلاو: گۆلی ئاو. چـمان: ئـه‌ڵێی، لات وایـه، پێـت وایـه. تـاوان: توانـه‌وه. واتـه: گۆلاوه‌کان که به وێنه‌ی ئاوێنه‌ن له به‌ر که‌وتنی وێنه‌ی گه‌ڵا زه‌رده‌کان له نێویاندا وه‌هـا زه‌رد بـوون کـه پێت وایه زێڕیان تێدا تواوه‌ته‌وه.

٢- سه‌ودا: فکر و خه‌یاڵ. جۆیا: به دواوه بوو. جانفیدا: گیانفیدا، گیان له سه‌ر ده‌ست. وه‌سـڵ: بـه یار گه‌یشتن. مانای ئه‌م به‌یته له‌گه‌ڵ به‌یتی دوایی‌دا دێت.

٣- جه‌لابه‌خش: ڕۆشن که‌ره‌وه، ژه‌نگ لا به‌ر. پاماڵکه‌ر: گێره که‌ر، گێره شێل کردن. گـه‌نج: خه‌زێنـه. واته: بۆ که‌سێک که فکر و خه‌یاڵی له سه‌ردا بێت و بۆ وه‌سڵی دڵبه‌ر گیان له سه‌ر ده‌ست بێت پاییز تۆز و ژه‌نگ له سه‌ر خه‌م و خه‌یاڵی ده‌سڕێ و خه‌زێنه‌ی شـادی و مـاڵی گێـره شـێل ده‌کـا و لـه نێـو ده‌بات. (پاییز وه‌رزی عاشقان و خه‌فه‌تباران).

-٩[١]-

نـــەووەهار جـــەمین، نـــەووەهار جـــەمین
شـــاهێذ شـــاذیش نمانـــا جـــەمین[٢]

پۆشـــنا ڕەنـــگڕەنـــگ، ســـارا و ســـەرزەمین
چەمـــەن جـــە گـوڵ کـەرد بـە بوتخانـەی چـین[٣]

ســـۆز بولبـــولان جـــە نـــاو گـــوڵزاران
ســـۆچنا نێشـــتەر پەڕجـــەفای خـــاران[٤]

جـــام نەرگســـان هـــەوای بـــۆی بەهەشـــت
جـە بـادەی مینـا، تـەم ڕێـزان کـەرد مەشـت[٥]

-٩-

١- ک، نێ، مج.

٢- جەمین: تەوێڵ، ڕوخسار، ڕوومەت. شاهێذ: لێرەدا یانی نیشان دەر، بە مانـای جـوانیش هەیـە. نمانا: نواند. واتە: نیشانەی شادی نەو بەهار ڕوخساری وەدەر خست. (بەهار هات)

٣- پۆشنا: پۆشی، داپۆشی. بوتخانەی چین: شوێنی عیبادەتی چینیان کە بە جوانی دەیانڕازانـدەوە، بە مانای بەهاری دەشتەکانی چینیش هاتووە کە ئەو دەشتانە پڕ ئەبێ لە گوڵی جوان. واتـە: بـەهار کەش و کێو و سارای بە ڕەنگی جۆراوجۆر پۆشیوە و بە گوڵ سەوزەڵانی کردووە بە بوتخانەی چین.

٤- سۆچنا: سووتاند. نێشتەر: نەشتەر، شتی نووک تیژ. خار: دڕوو، دڕک. واتە: سۆزی بولبـولانی ناو گوڵزار نووکی تیژ و پڕ جەفای دڕوانی سووتاندووە.

٥- جام: پیاڵەی شەراب. نەرگس: گوڵە نەرگس. بادە: شەراب. مینا: شووشە، شیشە. مەشت: پڕ، لیپ. واتە: هەوای بەهار کە بۆنی بەهەشت ئەدات جامی گوڵە نەرگسەکانی لە شەرابی ☜

زەنجیـــرەی ســـیمین، ســـاف ســـەر شـــەتان
ئـــەودی بەســـت نـــە دەور پـــای ســـپی بـــەتان[١]

غونچـــەی سۆســـەنان جـــە ســـای مـــەخاران
مانـــــا نـــــە شـــێوەی خـــاڵ تـــــەتاران[٢]

***

-١٠-[٣]

نـــەووەهار ســـیان، نـــەووەهـــار ســـیان
ئێمســـــاڵ وە تاڵـــــەم نـــەووەهار ســـیان[٤]

---

☞ شووشەی تەم ڕێزان پڕ کرد. وا دیارە مەبەستی ئەوەیە کە هەوای بەهار کە نمناکە، بە ئاونگ جامی گوڵانی پڕ کرد.

١- زەنجیر: زنجیرێک کە دەیکەنە پاوانە یا دەسبەند یا ملوانکە. سیمین: زیوی، نۆقرەیی. شەت: شەتاو، بەفراو. ئەودی: دیسان، پاشان، دوای ئەوە. بەت: مراوی، سۆنە. واتە: دیسان بەهار لە ئاوی ساف و بێگەردی بەفراو زنجیری زیوی بۆ پاوانی پێی مراوی سپی دروست کرد.

٢- مەخار: غار، ئەشکەوت، لێرەدا بە مانای کەمەرە. مانا: لێ چوون. تەتار: ناوی وڵاتێکە کە ئاسکی ئەو وڵاتە بە ناوبانگە، کەسێک کە چاوی لە جوانیدا لە ئاسک بچێت. واتە: خونچەی گوڵە سوێسنەکان لە سێبەری کەمەردا ئەڵێی خاڵی چاو جوانانە.

-١٠-

٣- ک، ئێ، س، عم، ڕ، ئا، ب، ح.

٤- نەو وەهار: بەهاری نوێ. سیان: ڕەشە. تاڵەم: بەختم. واتە: ئەمساڵ لە بەختم بەهاری نوێ ڕەشە.

نـــوور بینـــائیم جـــه دیـــدە جیـــان
بـــە هـــیچ ڕەنگێـــدا نمـــەتاوو دیـــان[١]

مـــن هـــەر یەنـد مـەگنۆم چـەم بـە دیـن گـوڵ
چـوون خونچـەی نـەوخێز لـت لـت مـەبۆم دڵ[٢]

هـــەر گـــوڵ نێشـــتەرێن، هـــەر سۆســـەن خـــارێ
هـــەر چەمـــەن زینـــدان، هـــەر شـــەتاو مـــارێ[٣]

وە بـــەختم بدێـــە چ تـــەور شـــێویان
ســـپای مەینـــەتان وەنـــەم دێویـــان[٤]

☆☆☆

١- نوور بینائی: ڕۆشنایی چاوان. جە دیدە جیان: لـە چـاو دوورە. نمـەتاوو: نـاتوانم. دیـان: دیـتن، بینین. واتە: چاوانم ڕۆشنایی نەماوە و ناتوانم سەیری هچ ڕەنگێک بکەم یا بە هـیچ جـۆرێ نـاتوانم ببینم.

٢- یەند: ئەوەندە، هێندە. مەگنۆم چەم: چاوم دەکەوێ. دین: دیدار. چوون: وێنەی، وەکوو. نەوخێز: تازە ڕواو، تازە پێگەیشتوو. مەبۆ: دەبێ. واتە: تا چاوم بە دیداری گوڵ دەکـەوێ لـە گـەڵ پشـکوتنی خونچەی تازە ڕواو دڵی منیش دەپشکوێ و لەت لەت دەبێت.

٣- نێشتەر: نەشتەر، شتی نووک تیژ. خار: دڕوو، درک. شەتاو: بەفراو. واتە: بۆ من هەر گوڵێک نەشتەرێکە و بـە چاومـدا دەچـێ و هـەر گوڵـە سوێسـنێکیش دڕوویەکـە و هـەر سـەوزەڵانییەک زیندانێکە و هەر بەفراوێکیش مارێکە.

٤- بدێە: بڕوانە، سەیریکە. شێویان: شێواوە. وەنەم: لێم، لە من. دێویان: دێوانە بووە. واتە: سەیری ئەو بەختەم بکە بزانە چۆن شێواوە و لەشکەری مەینەت و تاڵی خۆیان لێم دێوانە کردووە.

-١[1]-

وە بـــــان دیـــــدەم، وە بـــــان دیـــــدەم
عـەلەیکەســـــــەلام، وە بـــــان دیـــــدەم[2]

وەش ئامـــای بـــە خـــەیر هـــەی بەرگوزیـــدەم
جـــاڕووی جـــای پاتـــەن مـــوژەی نەمیـــدەم[3]

بـــــەڵێ، دا واچـــــوون چـــــراخم! دڵبـــــەر!
تـــۆ مـــەعنای ســـڵام وێـــت وانـــە وە بـــەر[4]

-١-

١- ک، ئێ، س، ر، ب، ح.

٢- وە بان دیدەم: سەر چاوم. واتە: عەلەیکەسەڵام بەخێر هاتی سەر چاوم.

٣- وەش ئامای: خۆش هاتی، بە خێر هاتی. بەرگوزیدە: هەڵبژێراو، تاقانە. جاڕوو: گـزی، کسـک. موژە: مژۆڵ، برژانگ. نەمیدە: چەماو، نەم دیدە، تەڕ. واتە: تاقانەکەم! بە خێـر هـاتی و مژۆڵـەکانم گزی دەری جێ پێ کانتن.

٤- بەڵێ: بەڵام. دا: تا. واچوون: بڵێم، بێژم. وێت: خۆت. وانە وە بەر: لە بەر بکە. واتە: ئەی دڵبەر! ئێستە کە هاتوویت و سڵاوت کردووە بـا مـن چـەن شـتێکت پـێ بڵـێم ئینجـا ئیتـر خـۆت مانـای سڵاوەکەت لەبەر بکە و وەها بیت کە لە بیـرت نەچێتـەوە. لـە نوسـخەکانی «ک» و «ئـێ»دا ئـەم بەیتە نییە و وا دیارە لە نوسخەکانی دیکەیشدا بە دروستی نەنووسـراوە و ئێمـەیش بـەو جـۆرە کـە نووسرابوو هێنامان و شەرحمان کرد.

سـڵام یـانێ هـای ئـیمن بـه جـه مـن
چـه‌نی ئـیمن بـوو، مـوژەت متـاش ون؟[1]

زڵفـت بـه نـاواک کوشـه‌نده‌ی دیـده
پابه‌سـتش کـه‌ردا هـه‌ی به‌رگوزیـده[2]

یـا جـه تـه‌رس شه‌سـت کـه‌مان ئـه‌برووت
بـیللا بیـه‌نان زایـفتـه‌ر جـه مـووت[3]

١- ئیمن: پارێزراو، له نه‌ماندا بوون. چه‌نی: چۆن. موژه: مژۆڵ برژانگ. متاش ون: خوێنمی ڕژاند، کوشتمی. واته: مانای سڵاو ئه‌وه‌یه ئیتر تۆ له لایه‌نی منه‌وه پارێزاوی و هیچ ئازارێکت پێ ناگات به‌ڵام چۆن پارێزراو بم کاتێ مژۆڵت خوێنمی ڕژاند؟ له نوسخه‌ی «س»دا له سه‌ر «متاش ون» نووسراوه «معنی متاش ون را ندانستم» و هه‌روه‌ها کاک حه‌کیمیش له سه‌رچاوه‌ی «ح»دا نووسیویه «ماناکه‌یمان نه‌زانی».

٢- ناواک کوشه‌نده‌ی دیده: مژۆڵ برژانگ. که‌ردا: کردی. واته: (کاتێ ده‌ستم بۆ زوڵفه‌کانت برد) تیری مژۆڵت تێم گرت و که‌وتمه سه‌رخوێن و به زوڵفه‌کانیشت پێم به‌ستراوه و ناتوانم بجووڵم.

٣- جه ته‌رس: له‌ترس. شه‌ست: له بنه‌ڕه‌تدا واته قامکی گه‌وره‌ی ده‌ست به‌ڵام لێره‌دا به مانای کلکه‌وانه‌یه‌که له شاخ یا ئێسقانی ئاژەڵ دروستیان ده‌کرد و له کاتی ڕاو کردندا دەیان کرده ده‌ستیان بۆ ئه‌وه‌ی ژێی که‌وانه‌که قامکیان برینداڕ نه‌کات. بیللا: قه‌سه‌م به خوا. بیه‌نان: بووم، بووگم. واته: یا ئه‌وه‌ی له ترسی تیر هاوێشتنی که‌وانی ئه‌برۆت قه‌سه‌م به‌خوا ئه‌وه‌نده لاواز و بێ گریک بووم له موووت باریکترم.

ئـــارۆ ســـا هـــەر پـــەی قـــەیرانم، بـــە قەســـت
ســـا ئامـــای ئامـــان هـــەم بگێـــرەم دەســـت[1]

موشـــــەڕەفت کـــــەرد هـــــەی بەرگوزیـــــدە
وەش ئامـــــای بـــــە خـــــەیر وە بـــــان دیـــــدە[2]

☆☆☆

-٢-[3]

وەشـــــــی ویـــــــەردەم، وەشـــــــی ویـــــــەردەم
ئـــاخ کـــۆن وەشـــی وەخـــت، ســـاڵ ویـــەردەم؟[4]

---

١- ئارۆ: ئیمرۆ، ئەمڕۆ. پەی: بۆ. قەیران: قەوڵ و قـەرار. بـە قەسـت: لەبـەر شـتێک، بـە خـاتری شتێک. ئامای: هاتی. بگێرەم دەست: دەستم بگرە. واتە: دەسا ئـەمڕۆ لـە بـەر قـەوڵ و قـەرارمان (مانای سڵاوەکەت کە ئەبێ لێت پارێزراو بم) کاتێ هاتی دەستم بگرە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «قەیران»، «قورئان» و لە سەرچاوەکانی «س»، «ڕ» و «ب»دا «قران» و لە نوسخەی «ک»دا ئەم نیوە بەیتە پەڕیوە و دیار نییە و ئەوەی کە لێرەدا نووسراوە بە پێی نوسخەی «ئێ»یە و بە پێی مانای شێعرەکەیش لە هەمووی دروستتر دیارە.

٢- موشەڕفت کەرد: گەورەت کردم. وەش ئامای: بە خێر هاتی. واتە: تاقانەکەم! بە هاتنت گـەورەت کردم بە خێر هاتی سەر چاوم.

-٢-

٣- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح.

٤- وەشی: خۆشی. ویەردە: ڕابردوو. کۆن: کوا. واتە: ئاخ بۆ خۆشیساڵی ڕابردووم. لە سـەرچاوەکانی «ب»، «س»، «ڕ» و «ح»دا بە جێی «کۆن»، «پەی» نووسراوە.

کــۆن ئــەو دڵ بـــە ســـپەڕ ناوەکـــان کـــەردەم؟
کۆن هووناو جـەرگ، چـوون شـەربەت وەردەم؟ [١]

کـــۆن بێـــداری شـــەو تـــا ســـوب مـــەنمانا؟
دڵ زوخـــــاو مــــــەدا، موژگـــــان مەســـــتانا [٢]

کـون ئـەو سـەودا و سـەبر، بـە سـاڵ و مـاهێ
قنیـــاتم مەکــــەرد بـــــە نـــــیم نگـــاهێ؟ [٣]

١- کۆن: کوا. سپەڕ: سپەر، قەڵغان، پەڕەیەکی پتەوی ئاسنی دەسکدارە کە شەڕکەران بۆ خۆ پاراستن لە تیر و شمشێر بە کاری دێنن. ناوەک: تیر. کەردەم: کردووم. هووناو: خوێناو. چوون: وێنەی، وەکوو. وەردەم: خواردووم. واتە: کوا ئەو دڵەی کردبوومە سپەری تیران و کوا ئەو خوێناوەی جەرگم کە وەک شەربەت خواردبووم؟ لە سەرچاوەکانی «ح»، «ڕ» و «س»دا بە جێی «سپەڕ»، «وە ئەسر» و لە سەرچاوەی «ب»دا «وا سەر» نووسراوە.
٢- کۆن: کوا. سوب: بەیانی. مەنمانا: دیاری ئەدا. مەدا: ئەدا. موژە: مژۆڵ برژانگ. مەستانا: دەستاند. واتە: کوا ئەو کاتە تا ڕۆژ دەبوەوە من بە خەبەر بووم و دڵم زوخاوی بە مژۆڵدا دەدا و مژۆڵیشم لێی دەستاند. (تا ڕۆژ دەبوەوە ئەسرینی خۆێنم دەڕژاند).
٣- کۆن: کوا. سەودا: فکر و خەیاڵ. ماهێ: مانگێک، یەک مانگ. قنیات: ئەو شتەی پێی بژی. مەکەرد: دەکرد. نیم نگا: بە گۆشە چاو سەیر کردن. واتە: کوا ئەو فکر و خەیاڵە و ئەو سەبر و تاقەتەی کە ساڵان و مانگان بە گۆشەی چاو سەیر کردنی یار دەژیام.

بیــــەنان بـــــە ســـــەنگ کۆنـــــەهـــــەواران

پـــــەی تـــــەمای ســـــایەی چـــــەتر چنـــــاران[١]

✡✡✡

-٣[٢]-

وەڵـــگ گـــوڵ ڕێـــزەن، وەڵـــگ گـــوڵ ڕێـــزەن

جـــەمین جـــە ســـافی، وەڵـــگ گـــوڵ ڕێـــزەن[٣]

زڵـــف وەنەوشـــەی دێـــز، بۆعەنبـــەر بێـــزەن

مـــــــوژان وەی ئـــــــالود، دەرد دڵ خێـــــــزەن[٤]

---

١- بیەنان: بووم. سەنگ: بەرد، تەوەن. پەی: بۆ. تەما: چاوەڕوانی. سایە: سێبەر. چەتر: گەڵای چڕ و پڕ و پۆڕی داران کە وەک چەتر سێبەر دروست دەکات. واتە: بە هیوای ئەوە کە داری چنار سێبەرم بۆ بکەن، وەکوو بەردی ئەو کۆنەهەوارەم لێ هاتووە کە بە تەمای ئەوەیە دار چنار سێبەری بۆ بکـەن. دیارە کە ئیتر هەوارنشینان کۆنەهەواریان لەبیر کردووە و چیتر چناری لێ ناڕوێ تا سێبەر بۆ بەردە بە جێ ماوەکان بکەن. یا دەکرێ بڵێی وەک هەوارنشینان بەردی کۆنەهەواریان لە بیر کـردووە یـاری بـاڵا چناریش منی لە بیر بردووەتەوە. لە نوسخەی «ئێ»دا بە جێی «چەتر چناران»، «چەتر نازداران» و لە سەرچاوەکانی «ب»، «ڕ»، «س» و «ح»دا «وەسڵ نازاران» نووسراوە.

-٣-

٢- ک، ئێ، س، م، ڕ، ح.

٣- وەڵگ: گەڵا. گوڵ ڕێز: گوڵ ڕێژ. جەمین: نێوچاوان، تەوێڵ. واتە: تەوێڵی یار هێندە سافە کاتێ گوڵ دەیبینێ گەڵاکانی دەوەرێت. لە نوسخەی «ک»دا بە جێی «سافی»، «خاسی» نووسراوە.

٤- دێز: ڕەنگێک کە بە ڕەش گۆڕا بێت. بۆ: بۆن. عەنبەر: ماکێکی (مادەیەکی) ڕەشی بۆنخۆش. موژان: مژۆڵان. وەی ئالود: ئازار پێوە، بەڵا پێوە. واتە: زوڵفی بە وێنەی وەنەوشەی ڕەش ☜

لــــەب لاڵ وەی ڕەنـــگ، ســـاحیب ڕاز تـــەڕ
دەهــەن ســەدەفێن جــە ســاف شــەربەت پــەڕ [١]

بـــاڵا وێنـــەی ســـەڵو مـــەجنوون خەریـــدە
تـــێخ باخــــەوان نـــــەزان نەدیــــدە [٢]

ســـپەردەی وەیـــس بـــۆ خـــاس مایـــە دارۆ
مـــەجنوونێ چـــوون مـــن نـــە ســـایە دارۆ [٣]

☆☆☆

ئەوەندە بۆنی خۆشە کە بۆنی عەنبەر لە بەر چاوی مرۆڤ دەخات و مژۆڵەکانی بە وێنەی تیـرن کە ئازار و بەڵایان پێوەیە و کاتێ لە دڵ بدەن ئەبن بە هۆی دەردەدار بوونی دڵ.

١- لەب: لێو. لاڵ: لەعل، بەردێکی بەنرخ بە ڕەنگی سووری کـاڵ. ڕاز تـەڕ: قسـەی تـەڕ، قسـەی خۆش. دەهەن: دەم. سەدەفێن: سـەدەفێکە. پەڕ: پڕ. واتە: لێوی لەعلی بەو ڕەنگـەوە (سـوور) کـە هەیەتی خاوەنی قسەی خۆش و قسەی تەڕە و دەمی وەک سەدەفێکە کە پڕە لە شەربەتی ساف.

٢- سەڵو: گیایەکی جوان کە گوڵی زەرد و سوور و وەنەوشـی هەیـە. خەریـدە: سـەندراو. باخـەوان نەزان: باخەوانی گێل و نەزان. نەدیدە: نـەدیو. واتـە: بـاڵای بـە وێنـەی سـەڵوێکە کـە مـەجنوون سەندبێتی (لە سێبەریدا بژی) و ئەو سەڵویشە بە تێخی باخەوانی نەزان هەڵنەپاچرابێت.

٣- سپەردە: سپێردراو. سەرمایە: مەبەست ئەو زوڵف و مـژۆڵ و برۆیـە کـە بـۆ کوشـتنی عاشـقان بەکاری دێنێ. دارۆ: هەیەتی. چوون: وێنەی، وەکوو. سایە: سێبەر. واتە: سەرمایەکی چاکی هەیـە بەڵکوو وەیس ئاگاداری بێت تا مەجنوونێکی وەک منیش بتوانێ لە سێبەریدا بێت.

-٤[١]-

وەنەوشـــێو مـــەبۆ جـــەوەڵ وەهـــاران
بەرمـــەیۆ نـــە ســـای چـــەتر چنـــاران[٢]

وەنەوشـــەی وەش وەخـــت، خـــاوێر خـــاو نـــەرم
ســـاوای ســـەر نـــە پـــێچ، مەســـت نـــاز شـــەرم[٣]

بـــە خۆنـــاو نـــەرم، خـــاو خـــەرامان
مـــەبۆ بـــە بـــووم دۆز فـــەرش نـــەمامان[٤]

---

-٤-

١- ک، نێ، س، ر، ب،ح، مج.

٢- وەنەوشێو مەبۆ: وەنەوشەیەک دەبێ، وەنەوشەیەک هەیە. جەوەڵ: جە ئەوەڵ، لە هەوەڵ. بەرمەیۆ: سەوز دەبێ، دەڕوێ. سای: سێبەر. چەتر چناران: گەڵای چنارە بەرزەکان کە بە وێنەی چەترن. واتە: وەنەوشەیەک هەیە لە سەرەتای بەهاراندا لە سێبەری چناراندا دەڕوێ.

٣- وەش وەخت: وەخت خۆش. خاوێر: خەواڵوو، کەسێ کە تازە لە خەو هەستاوە و هێشتا خەو بەری نەداوە. خاو: خەو. ساوا: تازە پێگەیشتوو. واتە: وەنەوشەیەک کە لە وەختێکی خۆشا دەڕوێ و خەواڵووی خەوێکی نەرمە و سەری پێچراوە (وەنەوشە ملی کەچە) و لەبەر شەرمی ناز کردنی مەستە. (بە شەرمەوە ناز دەکا).

٤- خۆناو: ئاونگ، شەونم. خاو: هێواش، هێدی. خەرامان: لار و لەنجە. مەبۆ: دەبێ. بووم: زەمین. بووم دۆز: زەوی چن. فەرش: هەر شتێک بخرێتە ژێر پێ. واتە: بە ئاونگی نەرم و هێدی و بە لەنجە و لار وەکوو کەسێ کە تەون بکات ئەویش تەونێک بۆ ژێر پێی نەمامەکان دەچنێت. (زەمینی ژێر نەمامەکان پڕ بێ لە وەنەوشە، لات وایە قاڵی ڕاخراوە.)

بـــاد بـــۆش مـــاوەرۆ وە ســـەرزەمین دا
بـۆڕ مـاچۆ وە بـان بـۆی موشـک چـین دا [١]

شـــێوەی وەنەوشـــە هـــا بـــەو خاڵـــەوە
بـەو گۆنـای گـوڵ ڕەنـگ بـووم لاڵـەوە [٢]

☆☆☆

-٥- [٣]

وەهـــار ئامـــەوە، وەهـــار ئامـــەوە
گـــوڵ شـــکاویا، وەهـــار ئامـــەوە [٤]

---

١- باد: با، وا. بۆش: بۆنی، بـۆی. مـاوەرۆ: دەهێنـێ. بـۆڕ: فـەوتان، دۆڕان. مـاچۆ: ئـەڵێ، ئێـژێ. موشک: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆش. واتە: بـا بـۆنی دەهێنـێ بـە سـەر سـەرزەمیندا و بـڵاوی دەکاتەوە و بۆنی ئەو وەنەوشەیە لە بۆنی موشـکی چـین خۆشـترە و بـە موشـکی چـین ئـەڵێت تـۆ دۆڕاندووتە.

٢- بووم: زەمین، هەندێ جار بە مانای ڕوخساریش دێت. لاڵ: لەعل، بەردێکی بەنرخی سوور. واتە: شێوەی ئەو وەنەوشە لەو خاڵە دەچێت کە وا بە سەر گۆنای گوڵ ڕەنگەوە کە ڕوخساری ئەڵێی لەعلە.

-٥-

٣- ک، ئێ، مج.

٤- وەهار ئامەوە: بەهار هاتەوە. شکاویا: پشکووت. واتە: بەهار هاتەوە و گوڵ پشکووت.

سـونبوڵ بـە زەنجیـر زڵـف خامـەوە
دڵـەی دەردینـان کـەرد بـە دامـەوە[١]

بوڵبـوڵ بـە ناڵـەی سـەحەرخێز بـاخ
ئـاوەرد جـە دەروون زوخ ئـالوودەی ئـاخ[٢]

دەسـت ئامانـەت، وە دامـان گـوڵ
خـار پێکـا، نـەبۆ غافـڵ جـە بوڵبـوڵ[٣]

یـا شـا! واذەی وەسـڵ دڵبـەران ئامـان
نەسـتانان جـە دەسـت، بێـدڵان دامـان[٤]

***

---

١- سونبوڵ: سمڵ، ناوی گوڵێکی جوان و بۆنخۆش. خام: خاو. دەردینان: دەردەداران. کەرد: کرد. دام: داو، تەڵە. واتە: سمڵ بە زنجیری زوڵفە خاوەکانیەوە دڵی دەردەدارانی بە داوەوە کرد.

٢- سەحەرخێز: کەسێ کە بەیانیان زوو لە خەو هەستێ. ئاوەرد: هێنای. زوخ: زوخاو. ئالوودە: تێکەڵ پێوە تلاو. واتە: بولبول بە ناڵەی زووی لە نێو باخدا ئاخی تێکەڵ بە زوخاوی لە دەروونەوە هەڵکێشا.

٣- ئامانەت: ئاگاداری، ئاگا لێ بوون. دامان: داوێن. خار: دڕوو، دڕک. نەبۆ: نەبێ. واتە: دەستی ئاگاداری (خودا) دڕووی لە داوێنی گوڵدا ڕوان تا لە بولبول غافڵ نەبێت.

٤- یا شا: ئەی خودا. واذە: وەعدە، کات. وەسڵ: بە یەک گەیشتن. نەستانان: نەسێنن. بێدڵان: لێرەدا واتە ئەو کەسانەی کە عاشق نین. دامان: داوێن. واتە: ئەی خودا بەهارە و کاتی بە یەک گەیشتنی دڵداران گەیشتووە ئاگات لە عاشقان بێت و بێدڵان داوێنی وەسڵ لە دەستی عاشقان نەسێنن (نەڕفێنن).

-٦-[1]

وەهـــار خـــەمین، وەهـــار خـــەمین
عەجـــەب وەهـــارێن، دڵگیـــر و خـــەمین[2]

هـــەور مـــەگێرۆ ئـــاو بـــە دیـــدەی نـــەمین
مـــەوارۆ بـــە تـــاو وە ڕووی ســـەرزەمین[3]

شـــەتاوان چـــوون مـــار پـــێچ مـــەڎان وە هـــەم
بـــەنای وەفـــراوان پێشـــان مـــەبۆ کـــەم[4]

---

-٦-

١- ک، ئێ، عم، ح.

٢- واتە: سەرم سڕ ماوە لەم بەهارە کە ئەوەندە دڵگیر و خەمبارە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «وەهار خەمین»، «ئەو وەهار خەمین» و لە نوسخەی «عم»دا «ئەو وهار خەمگین» و لە نوسخەی «ئێ»یشدا «وەهار تەمین» نووسراوە.

٣- مەگێرۆ: دەگرێ. مەوارۆ: دەبارێ. واتە: هەور بە چاوی ئەسریناوییەوە ئاو دەگرێ و بە تاو بە سەرزەمیندا دەبارێنێ.

٤- شەتاو: ئەو ئاوەی لە بەهاراندا لە کوێستانەوە دێتە خوار، بەفراو. مەڎان: ئەدەن. وەفراو: بەفراو. پێشان: پێیان. مەبۆ: دەبێ. واتە: هەر وەک چۆن ماری ئاشقە و ماشقە بە یەکدا دەئاڵێن شەتاو و ئاوی بارانیش بەو جۆرە بە یەکدا دەئاڵێن و بە بارینی باران بەفراوەکان کەم دەبنەوە. مەبەستی ئەوەیە بارانی بەهاران هێدی هێدی بەفر دەتوێنێتەوە و بەفراو کەم دەبێتەوە. لە سەرچاوەکانی «ئێ»، «ح» و «عم»دا بە جێی «بەنای»، «ئەپای» و لە سەرچاوەی «ح» و «عم»دا بە جێی «مەبۆ کەم»، «مەبۆ جەم» نووسراوە.

بـــەڵێ پـــەی کەســـێ خەبـــەردار جـــە دەرد
بگێـــرۆ دامـــان تـــاک تـــەنیای فـــەرد [١]

جـــە مـــەعـــدەن خـــار گـــوڵ بـــەرماوەرۆ
هەریـــەک بـــە ڕەنگـــێ پەیـــدا مەکـــەرۆ [٢]

ســـەرکوان تـــەمین، دەشـــتان زەڕگـــوون
بوڵبـــوڵ مـــەژەنۆ ســـاز ئەرغـــەنوون [٣]

مـــەژەنۆ بـــە ســـۆز، مـــەگرەوۆ بـــە زار
بـــە وێنـــەی عاشـــق دەروون پـــەڕ جـــە خـــار [٤]

---

١- بەڵێ: بەڵام. پەی: بۆ. جە: لە. بگێرۆ: بگرێ. دامان: داوێن. تاک تەنیای فـەرد: خـودا. واتـە: بەڵام ئەم بەهارە بۆ کەسێک باشە دابنیشێت و دەست بکا بە دۆعـا کـردن و داوێنـی خـودا بگرێـت (بلاڵێتەوە). ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک» و «ئێ»دا هەیە.

٢- مەعدەن: کان. خار: دڕوو، دڕک. بەرماوەرۆ: دەردێنێ، سەوز دەکات، دەڕوێنێ. مەکەرۆ: دەکات. واتە: ئەو خودای لە نێو دڕواندا گوڵ دەڕوێنێ و هەر کامیان بە ڕەنگێ دەخوڵقێنێ.

٣- سەرکوان: سەرکێوان. زەڕگوون: وەک زێڕ. مەژەنۆ: لێ ئەدات، دەژەنێ، بۆ کەسێک کە ئامێرێکی مووسیقایی لێ بدات بەکار دەبرێت. ئەرغەنوون: جۆرە سازێکی بادیی قەدیمییـە. واتـە: سـەرکێوان تەم و تەمەلووولە و تەمیان هێناوە، لە پێدەشتەکانیشدا گوڵاڵـە ڕواوە و وڵاتیـان پۆشـیوە و دەنگـی بولبولیش دێت و ئەڵێی سازی ئەرغەنوون دەژەنێت.

٤- مەژەنۆ: دەژەنێت. مەگرەوۆ: دەگری. زار: کزۆڵ. پەڕ جە خـار: پـڕ لـە دڕوو. واتـە: بولبـول وەک عاشقێک کە دڵ و دەروونی پڕ بێت لە دڕوو بە سۆزەوە دەژەنێت و بە کزەوە دەگری.

گا شادەن بە سەیر شکۆفەی گوڵان
گاهێ زەلیلەن چوون سفتەدڵان[١]

هەرتا نە چەمەن گوڵان بە چاخەن
ئەویچ چوون خانان، بوڵەند دەماخەن[٢]

ئەوسە کەم مەبۆ شەوق شۆڵەی گوڵ
وێنەی دەردەدار لەت لەت مەبۆش دڵ[٣]

دەردەدار مەبۆ وێنەی بولبول بۆ
دایم ئێنتێزار بە دین گوڵ بۆ[٤]

١- شکۆفە: هەڵاڵە، چرۆ. سفتەدڵ: دڵ سووتاو. واتە: بولبول کاتێک چاوی بە چرۆی گوڵان دەکەوێ شاد و خۆشحاڵە و جاری وایشە بە وێنەی دڵ سووتاوان زەلیل و داماوە.

٢- هەرتا: هەتا، هەتاکوو. چەمەن: سەوزەڵانی. بە چاخ: شاد و خۆشحاڵ. ئەویچ: ئەویش. بوڵەند: بەرز. واتە: هەتا گوڵ لە سەوزەڵانیدا شاد و سەرحاڵ و بەکەیف بێ ئەویش (بولبول) بە وێنەی خانان (ئاغا) دەماخی بەرزە. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هەیە.

٣- ئەوسە: پاشان، دوای ئەوە. کەم مەبۆ: کەم دبێت. مەبۆش دڵ: دڵی دەبێ بە. واتە: دوای ئەوە شەوقی شۆڵەی گوڵ کەم دەبێتەوە و ئەویش وەک دەردەدارێک دڵی لەت لەت دەبێ.

٤- بۆ: بێ. ئێنتێزار: چاوەڕوانی. دین: دیتن، بینین، چاوپێ کەوتن. واتە: کەسێک دەتوانێ بڵێ من دەردەدار و عاشقم کە وەک بولبول دایمە چاوەڕوانی دیتنی گوڵ بێت.

وەی پـــــەی حـــــەکیمێو، دانشـــــمەند دڵ
ناســـتاش حەســـرەتمەند، داخ بـــەروو وە گـــڵ[١]

☆☆☆

-٧[٢]-

وەهـــــار نمانـــــا، وەهـــــار نمانـــــا
وەهـــار ڕەنـــگ ســـەوز، زەڕگـــوون نمانـــا[٣]

بوڵبـــــوڵان نەغمـــــەی زگـــــارین وانـــــا
عاشـــقان جـــە چـــەم هوونـــاوان شـــانا[٤]

---

١- پەی: بۆ. حەکیمێو: حەکیمێک. دانشمەند: پسپۆڕ. ناستاش: نەیهێشتبا، ئیزنی نەدابا. حەسرەتمەند: داخ لە دڵ. گڵ: خاکی گۆڕ. واتە: ئاخ بۆ حەکیمێک کە پسپۆڕی دڵ بوایە و نەیهێشتبا ئەم داخی دڵەم ببمە ژێر گڵ.

-٧-

٢- ک، ئێ، ب، ح، مج. ئەم پارچە شێعرە لە سەرچاوەی «ح»دا ١٠ بەیتی سەرەتای هەیە و لە سەرچاوەی «ب»دا لە بەیتی «سۆسەن ساق سەوز جە سەرنساران»ەوە وەک شێعرێکی جیاواز و سەربەخۆ هاتووە.

٣- وەهار: بەهار. نمانا: نواند، نیشان دا. زەڕگوون: وەک زێڕ، بە وێنەی زێڕ. واتە: بەهار ڕەنگی سەوز و زەردی نیشان دا (نواند).

٤- نەغمە: گۆرانی، ئاوازی خۆش. زگارین: مەلوولی، خەفەتباری. وانا: خوێند. هووناو: خوێناو. شانا: ڕژاند، وەشاند، هەڵوەراند. واتە: بولبولان گۆرانی خەمگینیان خوێند و عاشقان ئەسرینی خوێنیان هەڵوەراند.

واراوە ڕێـــــزەی خۆنـــــاو وە زەمـــــین
پـــــۆل نـــــازداران جـــــەلا دا جـــــەمین[١]

ســـــەیلات هـــــۆرێزا، شـــــەتاوان مـــــاڵا
وەفـــــر نســـــاران بـــــەردەن وە بـــــاڵا[٢]

وەفـــــراو هـــــۆرێزا، شـــــەتاوان جۆشـــــا
عـەرســـەی ســـەرزەمین بـــەرگ ســـەوز پۆشـــا[٣]

شـــاخەی شـــەتاوان، ســـەدای ســـاز تـــەرز
خـــەمان کـــەرد جیـــا، دەماخـــان کـــەرد بـــەرز[٤]

---

١- واراوە: بارییەوە. خۆناو: ئاونگ، شەونم. پۆل: دەستە، تاقم. جەلا دا: ڕۆشن کردەوە، پاک کـردەوە. جەمین: نێوچاوان، ڕوخسار، ڕوومەت. واتە: دیسان ئاونگ بە سـەر سـەرزەمیندا بـاری و دەسـتەی نازداران ڕوخساریان جەلا دا.

٢- شەتاو: ئەو جۆگە بەفراوەی لە کوێستانەوە دێتە خـوارەوە. سـەیلات: لافـاو، تاوەبـاران. هـۆرێزا: هەستا، کەوتە ڕێگە. ماڵا: ماڵی، گزی دا، پاکی کردەوە. وەفر: بەفر. بەردەن: بردووە. واتە: باران باری و لافاو هەستا و شەتاوەکانی ماڵی و بە بارینی باران بەفری نساران کەم کەم چووەوە و بەرەو سەر چوو. مەبەستی ئەوەیە لە بەهاردا بە بارینی باران لافاو هەڵدەستێ و بەفر دەچێتەوە.

٣- وەفراو: بەفراو. هۆرێزا: هەستا. شەتاو: ئەو جۆگە بەفراوەی لە کوێستانەوە دێتە خـوار. جۆشـا: هاتە جۆش. عەرسە: مەیدان، گۆڕەپان، دەشت. بەرگ: جل و بەرگ، (لێرەدا مەبەست سەوزەڵانییە «وەرگێڕ»). پۆشا: لەبـەری کـرد، پۆشـی. واتـە: بـەفراو هەسـتا و شـەتاو هاتـە جـۆش و هـەموو سەرزەمین بەرگی سەوزی لەبەر کرد.

٤- شاخە: لق. سەدا: دەنگ. تەرز: جۆر، شکڵ و شێوە. کەرد: کرد. واتە: دەنگی شەتاوان کە ☜

داران بەرگ سەوز پەیدا کەردەوە
ژەنگ سیاتار جە وێ بەردەوە[١]

سەنگەرچەی گوڵان، جە نۆ پەیدا بی
عاشقان بێ هۆش، بەتەر شەیدا بی[٢]

ئەوەڵ، وەنەوشە جە خاک هۆردا سەر
بۆی عەنبەر مەدۆ چوون زڵف دڵبەر[٣]

---

☜ کەوتوونەتە ڕێگە بە وێنەی دەنگی سازە و خەمی لابردووە و کەیف و دەماخی بەرز کردووە. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا هەیە و لە نوسخەی «ک»دا لە دوای بەیتی دوایی هاتووە.

١- بەرگ: گەڵا، دەتوانێ بە مانای جل و بەرگیش بێت. ژەنگ: تۆخێکی ناسکی سوور لە سەر کانزا بە تایبەت ئاسن کە بە هۆی تەڕ بوونەوە دروست دەبێ. سیاتار: ڕەش. جە وێ: لە خۆ. واتە: داران گەڵای سەوزیان لێ ڕوایەوە و ژەنگی ڕەشیان لە خۆیان داماڵاند. مەبەستی ژیانەوەی دارانە.

٢- سەنگەرچە: شوێنێکی وەک پلە لە دەشت و کێودا، تاقی بچووک. جە نۆ پەیدا بی: سەری هەڵدایەوە. بەتەر: خراپتر. واتە: لە تاقە بچووکەکاندا وردە وردە گوڵ دیاریان دا و عاشقان بێ هۆش و خراپتر شەیدا بوون.

٣- هۆرداسەر: سەری هەڵداوە. عەنبەر: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆش. مەدۆ: ئەدات. چوون: وێنەی، وەکوو. زڵف: زوڵف. واتە: پێش هەموو گوڵان وەنەوشە سەری هەڵدا و ڕوا و بە وێنەی زوڵفی یار بۆنی عەنبەر ئەدات.

بـــــەڕەزا پەخشـــــەن بـــــە ســــەراندەردا
ئـــــاوێزان بیـــــەن وە ڕووی کەمـــــەردا [١]

نـــەورۆزگوڵ کریـــاش تاســـەی ســـەراوان
بـــەرزیا نـــە پـــای ڕێـــزەی وەفـــراوان [٢]

چنـــوور کۆنـــەزێـــد لـــەیلاخان کـــەرد مـــەیل
تەوق تەوق جـەم بەسـتەن وێنـەی زڵـف لـەیل [٣]

سۆســـەن ســـاق ســـەوز، جـــە سەرنســـاران
چـــوون تـــەوافچیان قـــەیتوول ونـــاران [٤]

---

١- بەڕەزا: گیایەکی گەڵا وردی زۆر جوان کە لە کوێستاندا دەڕوێت. پەخشـەن: بـڵاوە. سـەراندەر: شوێنێک کە سەری مرۆڤ لێی ئەدات، شوێنێکە بە قەد کەمـەرەوە کـە مـرۆڤ لـەو جێگـە زیـاتر ناتوانێ سەرکەوێ و ئەگەر بیهەوێ لەوە زیاتر بڕواتـە سـەر، سـەری لـەو جێگـە ئـەدات. ئـاوێزان: هەڵواسراو. بیەن: بووە. واتە: بەڕەزا لە «سەراندەر»دا بـڵاو بووەتـەوە و بـە ڕووی کـەش و کەمـەردا هەڵواسراوە. ئەم بەیتە لە سەرچاوەکانی «ح» و «ب»دا نییە.

٢- نەورۆزگوڵ: گوڵاڵە گەزیزە. کریاش تاسە: تاسـەی کـرا. بـەرزیا: دەرهـات، ڕوا. ڕێـزەی وەفـراوان: دڵۆپی بەفراو. واتە: گوڵاڵە گەزیزە لەبەر ئەوەی تاسەی سەرچاوەی کرابوو لەبەردەم دڵـۆپی بـەفراودا ڕوا.

٣- چنوور: گیایەکی بۆنخۆشە کە گەڵاکەی لە شـویت دەچێـت. زێـد: نیشـتمان، وڵـەن. لـەیلاخ: هاوینە هەوار، هەوارگە. تەوق تەوق: حەڵقە حەڵقە. جەم بەستەن: کۆ بوونەتەوە. واتە: چنـووریش مـەیلی کۆنە هەواری کردووە و لە هەوارگە بە وێنەی زوڵفی لەیلا حەڵقە حەڵقە کۆ بوونەتەوە.

٤- سۆسەن: سوێسنە. چوون: وێنەی، وەکوو. تەوافچی: ئەوانەی کە دەچن بۆ تەواف. قەیتوول:☜

عاشـــــق گـــــوڵاڵان مەلەرزانـــــەوە
سـەف سـەف جـەم بەسـتەن جـە بەرزانـەوە[١]

شـــــەقایق مـــــدران جـــــە لانســـــاران
زار زار مـــــەگرەوۆ پـــــەی دووری یـــــاران[٢]

خـەم گێرتـەن نـە دڵ، دەروون کـەردەن کـەیل
مـەوارۆش جـە چـەم ئەسـرین وێنـەی سـەیل[٣]

---

☜ شوێنی حەسانەوەی لەشکەریان، لەشکەرگا، وادیارە بێسارانی بە مانای «قەتار» هێناویـەتی. وناران: ڕازاندوەتەوە. واتە: سوێسنی ساق سەوز لـە سـەر نساران بـە وێنـەی تـەوافچیان قـەتاریان بەستووە.

١- عاشق گوڵاڵان: گوڵاڵانی عاشق. مەلەرزانەوە: دەلەرێنەوە. جەم بەستەن: کۆ بوونەتـەوە. واتـە: گوڵاڵە عاشقەکان بە وێنەی ئەوانەی دەست دەگرن بۆ هەڵپەڕین سەفیان بەستووە و لـەرەیان دێـت. لەم بەیتەوە هەتا کۆتایی شێعرەکە لـە سـەرچاوەی «ح»دا نییـە و لـە سـەرچاوەی «ب»یشـدا وەک شێعرێکی جیاواز و سەربەخۆ هاتووە.

٢- شەقایەق: گوڵاڵە سوورە، بە هەورامی «نان و دۆ بـڕ»ی پـێ ئـەڵێن. مـدارن: وەسـتاوە. نسـار: شوێنێک کە هەتاو یا نایگرێت یا کەم دەیگرێت. زارزار: بە زەلیلیەو گریان. مەگرەوۆ: دەگری. پەی: بۆ. واتە: گوڵاڵە سوورە لە لانساراندا ڕاوەو و بە زەلیلیەوە بۆ دووری یاران دەگری.

٣- گێرتەن: گرتووە. کەردەن کەیل: پڕی کردووە. مەوارۆش جە چەم: لە چاوی دەبارێت. سەیل: لافاو، تاوە باران. واتە: خەفەتی لە دڵ گرتووە و خەم لە دەروونیدا کەڵاو دەکات و بە وێنەی لافاو ئەسرین لە چاوانی دەبارێت.

گــوڵان جــه ســـەد ڕەنــگ زەمـــین پۆشـــنا
عاشـــــقان ســــــەدای دەروون جۆشـــــنا[١]

فەســــڵ کەســـێوەن جـــه خـــەم بێـــزار بـــۆ
جـــه کارخانـــەی زەوق وەهـــار بێـــدار بـــۆ[٢]

کەمـــەر ببینـــۆ هـــەر ســـوب چـــەنیو یـــار
بـــێ خـــەم بگێڵـــۆ دیـــار بـــه دیـــار[٣]

نـــەک چـوون مــن خــەریک، پــەڕ دەرد زامــەت
هـــەر ئـــاخ ئاخمـــەن تـــا ڕۆی قیامـــەت[٤]

---

١- پۆشنا: دایپۆشی، پۆشی. جۆشنا: هێنایه جۆش. واته: گوڵان به هەزار ڕەنگ زەمینیان پۆشیوه و عاشقان دەنگی دەروونیان هاته جۆش و دەنگیان بەرز بووەوه.

٢- فەسڵ: وەرز. کەسێوەن: کەسێکه. بێزار بۆ: بێزار بێت. زەوق: خۆشـی و شـادی. بێـدار بـۆ: بـه ئاگا بێت. واته: (بەهار) وەرزی کەسێکه له خەم و خەفەت دوور و بێزار بـێ و ئاگـاداری کارخانـەی خۆشی و شادی بێت و چاوی کرابێتەوه. (به کوردی و کورتی: بەهار وەرزی کەسێکه شاد و به کـەیف بێت).

٣- کەمەر ببینۆ: کەمەر ببەستێ، خۆی ئاماده بکات. سـوب: بـەیانی. چـەنیو یـار: لەگـەڵ یـار. بگێڵێو: بگەڕێت. دیار: وڵات. واته: بەهار وەرزی کەسێکه زەوقی هەبێ و هەموو بەیانیـەک خـۆی ئەیار بکات و لەگەڵ یاری به بێ خەم و خەفەت وڵات به وڵات بگەڕێت.

٤- چوون من: وەک من. پەڕ: پڕ. زامەت: زەحمـەت، ڕەنـج و سـەختی، دەتـوانێ بـه مانـای زام و برینیش بێت. ڕۆی: ڕۆژی. واته: نەوەک به وێنەی من به ئێش و ئـازارەوه پەشـۆکاوم و هـەتا ڕۆژی قیامەت هەر ئاخ ئاخ دەکەم.

پــەی چــێش؟ پــەی قیبلــەم، نمــەدۆ دیــار
بێـــــزارم جـــه ســـــەیر گـــــوڵان وەهــــار[١]

جـــه دووری قامــــەت زلْـــف ئەشـــــەدبۆوان
بێـــزارم جـــه گەشـــت، ســـەیر ســـەرکۆوان[٢]

☆☆☆

-٨-[٣]

وەهــــــار یـــــــاواوە، وەهـــــــار یـــــــاواوە
فـــەرش ســـەوز نـــه ڕووی چەمـــەن یـــاواوە[٤]

بـــاد پێچیـــا وە بـــەژن خونچـــەی ســـاواوە
خونچـــەی ســـاوا پـــێش، پـــەل شـــکاواوە[٥]

---

١- پەی چێش: بۆچی. نمەدۆ دیار: دیار نییە. واتە: بۆچی؟ بۆ ئەوەی قیبلەم دیار نییە و خۆی نیشان نادا و ئیتر منیش لە سەیری گوڵانی بەهار بێزارم.

٢- ئەشەدبۆ: گیایەکی بۆنخۆش کە بە فارسی «علف گربە» و بە سۆرانیش «گیا کتک»ی پێ ئەڵێن. گەشت: گەڕان. واتە: لە دووری باڵای ئەوانەی کە زوڵفیان بە وێنەی ئەشەدبۆ (گیا کتک) بۆنخۆشە لە گەڕان و سەیرانی کەش و کۆ بێزارم.

-٨-

٣- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح، مج.

٤- یاواوە: ڕاخستەوە. چەمەن: سەوزەڵانی. واتە: بەهار فەرشی سەوزی لەسەر زەمین ڕاخست. (بە هاتنی بەهار وڵات سەوز بوو.)

٥- بەژن: باڵا، قەد و قامەت. ساوا: تازە پێ گەیشتوو. پێش: پێی. پەل شکاواوە: پشکووت، باز

وێنــــەی ســــپی بــــاز، قـــەترە دوڕ وە شــــان
جــا بــــەرد نـــە پـــەردەی زڵــف مەهوەشـــان[١]

جــــــەلا دا جـــــەمین خــــــاڵ نــــــەورۆزان
مەجیۆش ساحیب خـاڵ، خـاس داخ نەسـۆزان[٢]

ســــــونبوڵان ســــــەوز، زڵـــف چەنبــــەرینان
دەور بەســـتەن نـــە کــۆڵ زڵــف عەنبــەرینان[٣]

---

☜ بوو. واتە: بای بەهاری لە قەد و باڵای خونچەی تازە پێگەیشتوو ئـاڵا و خونچـەیش بـەو بایـە پشکووت.

١- سپی باز: شاباز. قەترە: دڵۆپ. دوڕ: ناوی جەواهێرێکە لە لاشـەی سـەدەفدا دروسـت دەبـێ و سەدەفیش بوونەوەرێکی زەریاییە. جا بەرد: جێی گرت. مەهوەش: بە وێنەی مانگ. واتە: بەهار بە وێنەی شابازێک دوڕ بە سەر باڵیەوە بێت (باڵی خاڵ خاڵ بێت.) چووە خەڵوەتخانەی زوڵفی ئەوانـەوە کە بە وێنەی مانگن. (وەک مانگ جوانن).

٢- جەلا دا: ڕۆشن کردەوە، پـاک کـردەوە. جـەمین: ڕۆخسـار، نێوچـاوان، تـەوێڵ. نـەورۆزان: گوڵـە نەورۆزە، گوڵاڵەگەزیزە. مەجیۆش: پێی وایە، وا دەزانێ. نەسۆزان: نەسـووتاوە. واتـە: ڕووی گوڵاڵـە گەزیزەی بە جۆرێک ڕوون کردەوە ئەوانەی کە خاڵدار و ساحێب خـاڵن پێیـان وایـە خاڵەکـەیان جێـی داخێکە کە بە باشی نەسووتاوە. مەبەستی ئەوەیە کە گوڵاڵەگەزیزە تەنیا خاڵی خۆیان بە خاڵ دەزانن و خاڵی خاڵداران بە شوێنی داخێک دەزانن کە بە باشی نەسووتاوە و بووە بە خاڵ.

٣- سونبوڵ: سمڵ، گیایەکی جوان و بۆنخۆشە. زڵف: زوڵف، قژ. چەنبەر: حەڵقـە، جـەغز، دایـەرە. دەور بەستەن: دەوریان داوە. عەنبەر: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆشە. واتـە: سـمڵە سـەوزەکان بـە دەوری زوڵفانی یار کە بۆنی عـەنبـەر دەدەن حەڵقەیان بەستووە. مەبەستی ئەوەیە یار سمڵی کردووە بە لای زوڵفیدا.

فەسڵێوەن ئێمە و بوڵبوڵان هەر شەو
چەند فەرسەخ دووریم جە مەنزڵگای خەو[١]

ئەوان بەناڵین، من بە سۆز زار
مەکەرمێ جەستەی سیاسەنگ بێدار[٢]

تا ئاخر چوون بۆ سەرئەنجاممان
مەردەن بۆ یا وەسڵ دڵبەر کاممان؟[٣]

***

١- فەسڵێوەن: وەرزێکە. فەرسەخ: فەرسەنگ، یەکەی پێوانەی ڕێگا کە پێشتر بە کاریان بردووە و بەرانبەری شەش هەزار و دووسەد و چل (٦٢٤٠) میترە. دووریم: دوورین. واتە: وەرزی بەهار وەرزێکە هەموو شەوێ ئێمە و بولبول چەند فەرسەخ لە خەو دوورین. مەبەستی ئەوەیە من و بولبول کە عاشقین لە بەهاردا خەومان نییە (خەومان لێ حەرامە).

٢- مەکەرمێ: دەکەین. جەستە: لاشە. سیاسەنگ: بەردی ڕەش. واتە: بولبولان بە ناڵە و من بە گریانی سۆزدار لاشەی بەردی ڕەشیش بە ئاگا دێنینەوە. مەبەستی ئەوەیە ئەوەندە بە سۆزەوە دەناڵێنین و دەگرین تەنانەت بەردیش دەنگمان دەبیستێ و بە ئاگا دێتەوە.

٣- چوون بۆ: چۆن بێت. سەرئەنجام: ئاخر و عاقیبەت. مەردەن: مردن. وەسڵ: بە یار گەیشتن. واتە: با بزانین ئاخر و عاقیبەتمان ئەبێ بە چی و ئەم شیوەن و ناڵەمان چی بە سەر دێت؟ دەمرین یا بە وەسڵی یار دەگەین؟

-٩[1]-

وەیس سایەفەڕ! وەیس سایەفەڕ!
وەیس قەرەنی! سایەدار فەڕ![2]

ساحیب موعجێزات! شاە نیلووفەڕ!
دارووی گشت دەردان، ئەشیای بەحر و بەڕ![3]

نوورت نە ئاڵەم حەق کەردەن سابێق
ئاشکرا بیەن چوون سوبح سادێق[4]

---

-٩-

١- ک، نێ، ح.

٢- وەیس: خەزرەتی وەیس کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ) ژیاوە و خەڵکی «قەرەن»ی یەمەنە، دەنگۆیەک هەیە کە گۆڕەکەی وا لە ڕوانسەر. سایە: سێبەر. فەڕ: شکۆ، گەورەیی. قەرەن: ناوی دێهاتێکە لە یەمەن کە وەیس خەڵکی ئەوێ بووە. واتە: ئەی وەیسی گەورە و شکۆدار کە سێبەری شکۆدارت هەیە.

٣- موعجێزات: کارێک کە تەنیا پێغەمبەران و ئەولیای خوا توانای کردنیان هەیە و بە خەڵکی ئاسایی ناکرێت. نیلووفەڕ: گیایەکی جوان بە گوڵی زەرد و سوورە و زیاتر لە زەلکاودا دەڕوێت، (لاولاوی ئاویشی پێ ئەڵێن). گشت: هەموو. ئەشیا: هەموو شتێک. بەحر: زەریا. بەڕ: وشکانی، دەشتی بێ ئاو. واتە: ئەی وەیسی خاوەن مۆعجیزە و شای نیلووفەڕان و مەڵهەمی دەردی هەموو دەردی گیاندارانی بەحر و بەڕ. لێرەدا بێسارانی «شای نیلووفەڕ»ی بە کار بردووە کە بە ڕێک و پێکی مانای دیار نییە. بۆی هەیە مەبەستی ئەوە بێ عەشق و خۆشەویستی حەزرەتی وەیس وەک لاولاو بە خەڵکدا پێچراوە. لە سەرچاوەی «ح»دا بە جێی «موعجێزات»، «کەرامات» نووسراوە.

٤- ئاڵەم: عالەم، دنیا. حەق: خودا. سابێق: پێشوو. بیەن: بووە. چوون: وێنەی، وەکوو. ☜

خەیاتــــە خـــاوان، فرێشـــتە ڕەنگـــان
ئەشـــەد پـــەروەران، خـــاتر بـــە تـــەنگان[1]

وەنەوشـــە بـــۆوان، عەنبـــەرین خـــاڵان
تـــەمام ناســـتانەت، گشـــت ســـەرەواڵان[2]

---

☜ سوبحی سادێق: بەیانی زوو پێش هەتاو هەڵاتن و بەر لە بانگی بـەیانی کـەش و هـەوا ڕۆشـن دەبێتە کە بەو ڕۆشن بووەنەوە ئەڵێن «سـوبحی کازب» واتە بەیانی درۆزن ئینجـا بـۆ جـاری دووهـەم هەوا ڕۆشن دەبێتەوە و وردە وردە هەتاو هەڵدێت و ئەدا لە سـەر کـەش و کـۆ بـەوە ئـەڵێن سـوبحی سادێق واتە بەیانی ڕاستگۆ یا بەیانی ڕاستەقینە. واتە: ئەی وەیس! خودا نووری تۆی پێش خستووە و وەک سوبحی سادێق ئاشکرا بووە بۆ ئەوەی شوێن کەوتووت بن.

١- خەیاتە: بەنی بادراوی هەورێشم، لێرەدا مەبەست زوڵفی یارە کە بە وێنەی بەنی هەورێشم بادراوە و وەستاوە. فرێشتە ڕەنگ: بە وێنەی فریشتە. ئەشەد: گیایەکی بۆنخۆشە کە بـە فارسـی «علـف گربە» و بە سۆرانی «گیا کتک»ی پێ ئەڵێن. خاتر تـەنگ: ناڕەحـەت، عـاجز. مانـای ئـەم بەیتـە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٢- وەنەوشە: گیایەکی بۆنخۆشە. عەنبەرین خاڵ: خاڵی ڕەش. ناسـتانەت: لەبـەر درگـات. گشـت: هەموو، سەرجەم. سەرەواڵا: سەربەرز. واتە: ئەوانەی کـە زوڵفیـان بـە وێنـەی هەورێشـمی خـاوە و ئەوانەی کە وەکوو فریشتە وان و ئەوانەی کـە زوڵفیـان بـە وێنـەی ئەشـەدبۆوان پـەروەردە کـردووە و ئەوانەی کە عاجز و نارەحەتن و ئەوانەی بە وێنەی وەنەوشە بۆنخۆشن و ئەوانەی خاڵیان بـە وێنـەی عەنبەر ڕەشە و هەموو باڵا بەرزان لە بەر درگات کۆ بوونەتەوە. بۆی هەیـە «سـەرەواڵا» بـە مانـای کەسێک بێ چووبێتە سوجدە بەڵام لە دوو جێی دیکەدا هاتووە کە ئەو مانا ناگرێتەوە.

پـــەی وایـــە و مـــوراد هـــەر تۆشـــانەن لاف
جـەو بۆنـەو مـەیان یـەک یـەک وە تـەواف[١]

وایەشـــان تـــۆنی، تۆشـــان هێممەتـــەن
دایـــم زلْفشـــان جـــاڕووی گومـمەتـــەن[٢]

شـــەو وە موناجـــات بـــە مـــەیر دۆعـــا کـــە
مـــوراد گشـــتین بـــە خـــەیر ڕەوا کـــە[٣]

بـــە فیـــدای مشـــکۆی بـــەرز ســـایەت بـــام
خـــاک ئاســـتانەی گـــران مایـــەت بـــام[٤]

***

١- پەی: بۆ. وایە: ئاوات، ئارەزوو، ئامانج. لاف: قسەی زل کردن، لێرەدا واتە لە سەر حەساو کردن. جەو بۆنەو: بەو هۆوە، لەبەر ئەوە. مەیان: دێن. واتە: بۆ ئاوات و ئارەزوو و مورادیان هەر باسی تۆ دەکەن و لە قسە کردنیاندا بە گەورەیییەوە ناوی تۆ دەبەن و ئەڵێن ئەو (وەیس) بە مورادی خۆمان دەگەیەنێ و هەر لەبەر ئەوەیە یەک یەک دێنە تەوافت.

٢- تۆنی: تۆی. هێممەت: نیەت، ئیرادە. جاڕوو: گزی، کسک. گوممەت: گومەز، گونبەد. واتە: ئاوات و ئارەزوویان تۆی و نیەتیان ئەوەیە تۆ مورادیان بدەیت و دایمە بە زوڵفیان گومەزەکەت گزی ئەدەن (پاک و خاوێنی دەکەنەوە).

٣- موناجات: پاڕانەوە لە خودا. مەیر: مێهر، خۆشەویستی. گشتین: هەمووی. خەیر: خێر. ڕەوا: بە جێ. واتە: شەوان بە پاڕانەوە لای خودا بە خۆشەویستیەوە دۆعایان بۆ بکە و مورادی هەموویان بە جێ بگەیەنە. مەبەستی ئەوەیە لە خودا بپاڕێرەوە با مورادی هەموویان بدات.

٤- بە فیدای: بە قوربانی. مشکۆ: باڵاخانە، لێرەدا واتە بارەگا. سای: سێبەر. بام: ببم، بم. ☜

-١٠-[١]

وەیمـــــــەن دەردەدار، وەیمـــــــەن دەردەدار
وەیمـــەن پـــەی کەســـێ چـــوون مـــن دەردەدار[٢]

بـــــذیا وە شـــــێوەی نــــەخش نــــەووەهار
هۆرگێرتـــــا مایـــــەی گـــــوڵان ســـــەدهەزار[٣]

جـــە زەردگـــوڵان ڕەنـــگ، جـــە نـــەورۆزان داخ
جـــە شـــەونم ئەســـرین، جـــە دوود تـــەم ئـــاخ[٤]

---

ئاستانە: بەردرگا. گران مایە: هێژا، بەنرخ. واتە: بەقوربانی ئەو باڵاخانەت بم کە سێبەری بەرزە (لای خودا زۆر بە نرخە) و بە خاکی بەردرگای بە نرخ و هێژات بم.

-١٠-

١- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح، مج.

٢- وەیمەن: وەی وەی دەکەم، بەداخەوەم. پەی: بۆ. چوون: وێنـەی، وەکـوو. واتـە: بـە داخـەوەم بـۆ کەسێک کە وەک من دەردەدار بێت.

٣- بذیا: بدیایە، سەیربکردایە. هۆرگێرتـا: هەڵبگرتایـە. مایـە: سـەرمایە، دارایـی. واتـە: بـا ئـەو دەردەدارە سەیری نەخش و نگاری بەهاری بکردایە و لەو هەزاران سەرمایەی گوڵانە شتێکی بۆ خۆی هەڵبگرتایە. لە بەیتە دواییەکاندا ئەڵێ مەبەستی لە سەرمایەی گوڵان چییە.

٤- زەردگوڵ: گوڵە زەردە. نەورۆز: گوڵە نـەورۆزە، گوڵاڵە گـەزیزە، گوڵاڵە گـەزیزە لـە نێـو گوڵەکەیـدا خاڵێکی ڕەشی هەیە کە بێسارانی ئەو خاڵەی بە داخ شوبهاندووە. شـەونم: ئاونـگ. دوود: دووکـەڵ. واتە: لە گوڵە زەردەکان ڕەنگی زەرد و لە گوڵاڵە گەزیزەکان داخ و لە ئاونگ فرمێسـک و لـە دووکـەڵی تەم ئاخی هەڵبگرتایە.

جــه وەنەوشــە خــوم، جــه نــەرگس خومــار
جــه گــوڵاڵان، هــوون دیــدەی شــەوبێدار [١]

جــه غونچــە پــەیکان، جــه ســەوزە خــارێ
خــارێ نــە دڵ بــۆ جــه زەخــم یــارێ [٢]

جــه بــاڵای نــەمام، تیــر خــار جــەرگ
جه گوڵگەز هووناو، گــوڵ گــوڵ کــەرۆ بــەرگ [٣]

جــــه دەردەداران هــــەر منــــەنان، وەس
مەدێــەو مــەوینوو هــەنیچ نیــەن کــەس [٤]

---

١- خوم: ڕەنگێکی شین کە «چاو»یان پێ ڕەنگ کردووە. هوون: خوێن. واتــە: لــە وەنەوشــە ڕەنگــی شین و لە نەرگس خوماری چاو و لە گوڵاڵە سوورەیش خوێنی چاوێک کە شەوان خەوی نییــە و بــە جێی ئەسرین خوێن دەڕژێنی، بگرێت.

٢- پەیکان: نووکی تیر. خار: دڕوو، دڕک. نە دڵ بۆ: لە دڵدا بێت. زەخم: زام، برین. واتە: لە خونچە نووکی تیر بگرێ و لە سەوزەیش دڕوو، دڕوویەک کە لە زامی یارێک، لە دڵدا بێت.

٣- خار: دڕوو، دڕک. گوڵگەز: گوڵی داری گەز کە سوورە. هووناو: خوێناو. کەرۆ: بکات. بــەرگ: جل و بەرگ، لیباس. واتە: لە باڵای نمامان تیرێک کە وەک دڕوو بــە دڵــدا چــەقابێت و لــە گــوڵی گەزیش خوێن کە جل و بەرگ سوور بکات.

٤- منەنان: منم. وەس: بەس، تەنیا. مەدێەو: سەیردەکەم، دەڕوانم. مەوینوو: دەبینم. هــەنیچ: ئیتر، چیتر. نیەن کەس: کەس نییە. واتە: لە دەردەداران ئەوەی کە بتوانێ لە نەخش و نگاری بەهار هەڵبگرێت تەنیا منم و هەرچی سەیر دەکەم و دەڕوانم کەسی دیکــە نــابینم کــە وەک مــن دەردەدار بێت.

تـــەن بـــە داخ دەرد خـــەمان مەســـپاروو
چـــەنی بـــێ دەردان هـــیچ کـــار نـــەداروو[١]

***

-١١[٢]-

ویـــاران جـــە بـــەی، ویـــاران جـــە بـــەی
ڕوخســـارم زەردیـــش ویـــاران جـــە بـــەی[٣]

پیاڵـــەی دیـــدەم پـــەڕ کـــەردەن جـــە مـــەی
ناڵـــەی ئێنتیـــزار مەکێشـــوون چـــوون نـــەی[٤]

---

١- تەن: لاشە. مەسپاروو: دەسپێرم. چەنی: لەگەڵ. نەداروو: نیمە. واتە: حازرم لاشە بە دەستی دەردی خەمانەوە بسپێرم تا داخی بکەن بەڵام هیچ کارێکم بە بێ دەردان نییە و حازز نیم لەگەڵیاندا بم. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا هاتووە

-١١-

٢- ک، س، ڕ، ع، م، ل، ب، ح.

٣- ویاران: تێپەڕاندووە. بەی: بەهێ. واتە: ڕەنگی ڕوخسارم لە ڕەنگی بەهێ زەردترە.

٤- پیاڵەی دیدەم: چاوی بە وێنەی پیاڵەم. مەی: شەراب، چاوی بە پیاڵە و ئەسرینی بە شەراب شوبهاندووە. ئێنتێزار: چاوەڕوانی. مەکێشوون: دەکێشم. چوون: وێنەی، وەکوو. نەی: ئامێری نەی. واتە: پیاڵەی چاوم پڕ بووە لە شەراب (ئەسرین) و ناڵەی چاوەڕوانیم بۆ دووری یار بە وێنەی دەنگی ئامێری نەیە.

ڕێـــزەی جـــەرگ وێـــم، کـــەردەن بـــە کـــەباب
یـــە کـــەباب، یـــە بـــەی، یـــە نـــەی، یـــە شـــەراب[١]

گەرمـــــەن مەجلێســـــم ســـــەڵو خـــــەرامان
قـــــەدەم ڕەنجـــــە کـــــەر، مروەتـــــەن ئامـــــان[٢]

ســـــا بـــــاوەر تەشـــــریف، بـــــۆرێ وە یانـــــەم
ئـــــاوا کـــــەر یانـــــەی ســـــەد ســـــاڵ وێرانـــــەم[٣]

---

١- ڕێزە: تیکەی بچووک. وێم: خۆم. کەردەن: کردووە. یە: ئەمە. واتە: جەرگم کوت کـوت کـردووە و کردوومە بە کەباب. ئەمە کەباب (جەرگم) و ئەمە بەهێ (ڕەنگی ڕوخسـارم) و ئەمـە نـەی (ناڵـەی چاوەڕوانیم) و ئەمەیش شەراب (فرمێسکم).

٢- گەرمەن مەجلێسم: کۆڕم گەرمە. سەڵو: گیایەکی جوانـە کـە گـوڵی زەرد و سـوور و وەنەوشـی و بە فارسی «تاج خروس» و «زلف عروسان»ی پێ ئەڵێن (بە سـۆرانی «پۆپەکەڵەشێر» و «گـوڵی عاشقان»ی پێ ئەڵێن. «وەرگێڕ»). خەرامان: بە لار و لەنجە بە ڕێدا ڕۆیشتن. قەدەم ڕەنجـە کـەر: زەحمەتی ڕێگە بکێشە، تەشریف بێنە. مروەتەن: پیاوەتیت بێ، ڕەحمت هەبێ. واتە: ئەی ئەو یارەی باڵات بە وێنەی گوڵی عاشقانە و بە لار و لەنجە بە ڕێدا دەڕۆی، کۆڕم گەرمـە و بـەو جـۆرە کـە وتـم تەیارە و ئامادەیە، سا زەحمەتی ڕێگە بدە بەر خۆت و تەشریف بێنە.

٣- باوەر تەشریف: تەشریف بێنە. بۆرێ: وەرە. یانە: ماڵ، خانوو. ئاواکەر: ئاوەدان بکەوە. واتـە: سـا تەشریف بێنە بۆ ماڵم و ئەم ماڵە کە سەدان ساڵە وێرانەیە ئاوەدانی بکەوە. ئەم بەیتە لە نوسـخەی «ک»دا نەهاتووە.

ئــەر نــاری تەشــریف، ســزام ســەختەن ســەخت

ئــەویچ دوور نیــەن جــە بەدبــەختی بــەخت[1]

☆☆☆

١- ئەر: ئەگەر. ناری تەشریف: تەشریف نەهێنی. سزا: ئازار، جەزای کار بە خراپە، عــەزاب. دوور نیەن: دوور نییە. واتە: ئەگەر تەشریف نەهێنی عەزابم سەختە و بە هۆی بەدبەختیمەوە ئــەوەیش دوور نییە کە تەشریف نەهێنی. (هێندە بەدبەختم ئەگەری ئەوە هەیە کە تەشریف نەهێنی یا لــەوە ناچێ تەشریف بێنی. ((وەرگێر)).

-١-[١]

هامســــــەران وە ژان، هامســــــەران وە ژان

ئێمشـــەو جـــە ناکـــاو دیـــدەم شـــی وە ژان[٢]

بەتـــەر جـــە ئێشـــان زام گیـــان کێشـــان

تـــا ســـوب زەڕێ خـــاو نەکـــەردم پێشـــان[٣]

جـــە تاوشـــت ئـــێش دەرد شـــەونالێن

ســـەرزانووی ئـــەدەب کـــەردم وە بـــالێن[٤]

---

-١-

١- عم، ج. ئەم پارچە شێعرە تەنیا لەم دووسەرچاوەدا هاتووە. هەرچەند ڕەوتی شێعرەکە لە شێعری بێسارانی دەچێت بەڵام ئەگەری ئەوەی کە هی بێسارانیش نەبێت هەیە و ئێمەیش بە پێی ئەو دوو سەرچاوە هێنامان.

٢- هامسەر: لێرەدا واتە هاوڕێ، دۆست، ڕەفێق. ژان: ئێش. ئێمشەو: ئەمشەو، ئیمشەو. جە ناکاو: لە خۆیەوە، کوتووپڕ. شی: ڕۆیشت. واتە: ئەی هاوڕێیان! ئەمشەو لە خۆیەوە چاوانم دەستیان کرد بە ئێشان (ژان کردن).

٣- بەتەر: خراپتر. سوب: بەیانی. زەڕە: کەمێک، تۆزێک. خاو: خەو. نەکەردم: نەمکرد. پێشان: پێیان. واتە: (ئەمشەو) ئێشی چاوانم لە ئێشی گیان کێشان خراپتر بوو(سەخت تر بوو) و تا بەیان نەمتوانی بنووم و تۆزێک خەویان پێ بکەم.

٤- تاوشت: تاو. زانوو: چۆک، ئەژنۆ، ڕەنگۆڵ. زانووی ئەدەب: بە ئەدەبەوە لە سەر چۆک دانیشتن. باڵین: سەرین، ئەو شوێنەی سەری لەسەر دادەنێن بۆ خەوتن. واتە: لە تاوی دەردی شەونالێن (ناڵەی شەوان) دانیشتم و سەرم لەسەر ئەژنۆم دانا و ئەژنۆی خۆمم کرد بە سەرین. مەبەستی ئەوەیە نەمتوانی ڕابکێشم و بنووم.

یەنــــد جــــە تــــاو ئــــێش لاحــــەولم وانــــا

ئــــەو بەتــــەر جــــە ئــــێش قــــووەت مەســــتانا[١]

تــــا ســــوب ســــپی بــــی هــــەر نــــاڵام جــــە ڕێــــش

دڵ چــــوون نــــێش‌زەدەی عــــەقرەب مــــەدۆ ئــــێش[٢]

دیــــم ســــەحەر قیبلــــەی دنیــــا و دیــــن مــــن

ئامــــا و دەرلاد نیشــــت نــــە بــــاڵین مــــن[٣]

دیــــا وە دیــــدەم خــــەیلێ زاری کــــەرد

داش وە ســــینەدا بــــێ‌قــــەراری کــــەرد[٤]

---

١- یەند: هێندە، ئەوەندە. لاحەول: لا حول و لا قوە الا باللّٰە، زکرێک کە لە کاتی بێ دەسەڵاتیدا دەیخوێنن. وانا: خوێندم. بەتەر: خراپتر. مەستانا: دەستاند. واتە: من لە تاوی ئێش و لەبەر ئەوەی بۆ کەم کردنەوەی ئێشی چاوانم هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو هەر لاحەولم دەخوێند بەڵام ئێشی چاوانم تا دەهات قوەتی دەستاند و زیاتر دەبوو.

٢- سوب: بەیانی. ناڵام: ناڵاندم. ڕێش: زام. عەقرەب: دووپشک. مەدۆ: ئەدات، ئەکات. واتە: تا ڕۆژ بووەوە من هەر لەبەر زام (ئێش)ی چاوانم ناڵاندم و دڵیش وەک گەستەی دووپشک ئێشی دەکرد (دەهاتە ئێش).

٣- سەحەر: بەیانی. ئاما: هات. دەرلاد: زوو، گورج، بێ ماتڵ بوون. نیشت: دانیشت. باڵین: ژوورسەر. واتە: بەیانی زوو بینیم قیبلەی دنیا و دینم (یار) هات و لە ژوورسەرم دانیشت.

٤- دیا: ڕوانی، سەیری کرد. خەیلێ: زۆر. زاری: گریان. واتە: لە چاوانمی ڕوانی زۆر بۆم گریا و بە سینەیدا کوتا و بێ قەراری کرد.

جـای نوختـەی ڕەنگـین وە نـاخوون کـەرد ڕێـش
تـا کێشـا تـا وە تـای زڵـف وێـش [١]

وات یـە دیـدەی تـۆن نەمەنـدەن نگـاش؟
نگـای دووراودوور کـەم بیـەن جـە لاش؟ [٢]

یـە پـەی چـێش بیـەن جـە دیـن تەواسـان؟
نگـای دووراودوور خـاڵ خاڵخاسـان؟ [٣]

یەنـد جـە تـاو ئـێش ئـالوودەی دەردەن
کـەم بیـەن جـە لاش ئیشـارە کـەردەن [٤]

---

١- جا: جێگە. نوختەی ڕەنگین: خاڵ. ڕێش: بریندار. تا: تاڵی زوڵف. وێش: خۆی. واتە: جێی خاڵانی (سەرگۆنای) بە نینۆک ڕنی و برینداری کرد و تاڵ تاڵی زوڵفەکانی تاڵ کێش کرد.

٢- وات: وتی. یە: ئەمە. نەمەندەن: نەماوە. نگا: دیتن، سەیرکردن. دووراودوور: لە دوورەوە. کەم بیەن: کەم بووە. واتە: وتی ئەمە چاوانی تۆیە سۆیان نەماوە و لە دوورەوە هیچ نابینێ ؟

٣- یە: ئەمە. پەی چێش: بۆچی. دین: دیتن، بینین. تەواسان: تاسیان، گێژبوون. واتە: وتی ئەمە لەبەر چی چاوانت لە دیتن تاسیاوە و لە دوورەوە خاڵی خاڵخاسان نابینێ؟

٤- یەند: هێندە، ئەوەندە. ئالوودە: پێوە تلا، تێکەڵ بوون. ئیشارە: ئاماژە. بیەن: بووە. واتە: لە تاوی ئێش و ئازار هێندە بە دەردەوە تلاوە کە چیتر ئاماژە کردنیان بۆ نەماوە. مەبەستی ئەوەیە کە ئیتر چاوانت توانای ئیما و ئیشارەیان نەماوە.

مـــن ئـــەژنیم وە گـــۆش تـــۆ زاریـــت مەکـــەرد
تـــۆ مـــەواتی ئـــای، مـــن ڕۆحـــم ســـپەرد [١]

دیـــم جـــە ئەنـــدووی دڵ گـــرەوا بـــە ســـۆز
دەســـت بـــەرد پـــەرێ جیـــب خـــەفتان گوڵـــدۆز [٢]

بـــەرئاورد گوڵـــدان کیمخـــای گوڵنـــاری
مـــەملۆ جـــە داروی خاســـەی عـــەتتاری [٣]

تووتیـــای ئـــەزرەق، مـــرواری بـــە هـــەم
دانـــەی فـــەرەنگی، زەنگـــاری قەڵـــەم [٤]

---

١- ئەژنیم: بیستم. گۆش: گوێ، گوێچکە. مەکـەرد: دەکـرد. مـەواتی: دەتکـوت، دەتـوت. ڕۆحـم سپەرد: ڕۆحم سپارد، مردم. واتە: من گوێم لێ بوو کە دەگریای و دەتوت ئای، من دەمردم (زۆرم پـێ سەخت بوو).

٢- ئەندوو: ناڕەحەتی. گرەوا: گریا. پەرێ: بۆ. جیب: گیرفان، کیسە. خەفتان: لە بنەڕەتدا بە مانـای جل و بەرگی ڕەشە بەڵام لێرەدا هەر مانای جل و بەرگی هەیە. گوڵدۆز: جل و بەرگێک گـوڵی پێـوە دوورا بێت. واتە: دیتم بە دڵی ناڕەحەتییەوە بە سۆزەوە دەگریا و دەستی برد بۆ گیرفانی جل و بەرگـە گوڵدۆزەکەی.

٣- بەرئاوەرد: دەرهێنا. گوڵدان: جێی گوڵ لێـرەدا بـە مانـای جێـی دەوا و دەرمانـە. کیمخـا: جـۆرە پارچەیەکی هەورێشمیە پووڵەکەی زێڕی پێوە دەدوورن. گوڵناری: بە ڕەنگی گوڵی هـەناری وەحشـی، سوور. مەملۆ: پڕ، لیپ. خاسە: تایبەت. عەتتار: عەتر فرۆش، دەوا فرۆش. واتە: گوڵدانێکی لـە جنسی کیمخای ڕەنگ سوور لە گیرفانی دەرهێنا کە پڕ بوو لە دەوا و دەرمانی تایبەتی دەوا فرۆش.

٤- تووتیا: ئۆکسیدی سروشتی کانزای ڕۆحە کە پاککەرەوەیەکی زۆر بە هێزە و پێشتر وەک ☜

نیم دانگێ شەربەت لیمۆی گوڵنار فام
وە ئاب دەهەن مەعجوون کەرد تەمام[١]

ماڵا نە دیدەم ساکن بی جە ئێش
ئێش کۆنە و نۆ یەکسان بی سارێش[٢]

---

دەرمانی چاو بە کار دەبرا. ئەرزەق: شین، کەوۆ. تووتیای ئەرزەق: دەرمانێکی شین ڕەنگ کە بۆ چاوئێشە بەکار براوە. بە هەم: تێکەڵ. فەرەنگی: لە فەرەنگەوە هاتوو، لە وڵاتە خۆرهەڵاتەکانەوە هاتوو، نامۆ، بێگانە، شتێ کە خۆ جێی نییە، غەربی، نەمانزانی مەبەستی لە دانەی فەرەنگی چییە. زەنگار: ژەنگ. زەنگاری قەڵەم: وادیارە مەبەستی کلەیە. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

١- دانگ: یەک لە شەشی هەر شتێک. نیم دانگ: کەمێک، تۆزێک. گوڵنار: گوڵی هەناری وەحشی، سوور. فام: ڕەنگ. شەربەت لیمۆی گوڵنار فام: وا دیار لێرەدا هەڵەی نوسخە نووسینەوە هەبێت چون «شەربەتی لیمۆی سوور» یا «شەربەتی سووری لیمۆ» هیچ مانایەکی نییە. ئاب: ئاو. دەهەن: دەم. مەعجوون: تێکەڵ کردنی دوو یا چەن شت بۆ دروست کردنی داروو یا خواردەمەنییەک. واتە: ئوکسیدی شین و مرواری هاڕیاو و دانەی فەرەنگی و ژەنگی قەڵەم (کلە) و کەمێک شەربەتی لیمۆی لەگەڵ ئاوی دەمی تێکەڵ کرد و کردی بە مەعجوونێک. (وای بۆ دەچم مەبەستی لە شەربەتی لیمۆ ئارەقی ناو سینە بێت، لەوانەیە وایش نەبێت. «وەرگێڕ»).

٢- ماڵا نە دیدەم: لە چاومی ساوی، کردیە چاوم. ساکن: ئارام، ئێش شکان. سارێش: سارێژ. واتە: مەعجوونەکەی لە چاوم ساوی و ئێشی چاوانم شکا و ئارام بوونەوە و زامی کۆنە و تازەم وەک یەک سارێژ بوو.

کــافی ئــەو شــەوە دیــدەم بەتــەر بــی
شــەفام بــە مــەعجوون دەســت دڵبــەر بــی [1]

✯✯✯

-٢-[2]

هــەبڵی جــام جــەم، هــەبڵی جــام جــەم
ڕەونــەق نمانــا وێنــەی جــام جــەم [3]

ئایێنــەی ســافش وەختــێ دیــم بــە چــەم
شــادیم بــێ حــەد بــی ، خــەمان جــە لام کــەم [4]

دەور وا دەورش بــاڵای نــەمامان
بــە ڕەقســان مــەبۆ خــەزان وە دامــان [5]

---

١- کافی: بەس. بەتەر: خراپتر. شەفا: خۆش بوونەوە. واتە: ئەوەم بەس بوو کە ئەو شەوە بەو جۆرە ئێشی چاوانم خراپتر بوو، چونکە خۆش بوونەوەم بە مەعجوونی دروستکراوی دەستی یار بوو.

-٢-

٢- ک.

٣- هەبڵی: هەوڵی، ناوی کانی و ئاوێکە لە شاری پاوە. جام جم: پیاڵەکەی جەمشید پاشای ئێران، وەک بەناوبانگە دنیای تێدا دیار بووە هەر بۆیە پێی وتراوە «جام جهان نما». نمانا: نواند، نیشان دا. واتە: سەرچاوەی هەوڵی وەک جامی جەم ڕەونەق و گەشەی نیشان دا.

٤- چەم: چاو. واتە: کاتێ ئاوی وەک ئاوێنەم بینی لە ڕادە بەدەر خۆشحاڵ بووم و خەم کەم بووەوە.

٥- دەور وا دەور: دەور و پشت. مەبۆ: دەبێ. واتە: دەور و پشتی پڕە لە نمامی باڵا بەرز و کاتێ خەزان دەکەن، گەڵاکانیان بە سەما کردن دەکەونە بنی نمامەکان.

[بـــاڵای] نـــەمامان جـــەلا دانـــەوە
[چـــوون] توویـــای بەهەشـــت مەڕەقسـانەوە[١]

خـــەزان چـــەنی تـــووڵ تـــەرک نەونـــەمام
دیـــارەن نـــە گـــۆڵ، چـــوون دڵبـــەر نـــە جـام[٢]

جـــە دوور وەتـــەنیش گـــوڵاو مـــەنمانۆ
تـــافش مـــرواری کۆکـــۆ مەشـــانۆ[٣]

قـــەترە مـــەپێکۆ نـــە پـــای پـــاوە شـــار
داخ مـــەنیۆ نـــە تـــاف سەرچەشـــمەی کـــەنار[٤]

---

١- جەلا دانەوە: تۆزی لەسەر سڕیوە، ڕۆشنی کردەوە. توویا: ناوی دارێکی بەهەشتیە. مەڕەقسانەوە: سەما دەکەن. واتە: ئاوەکە باڵای نەمامەکانی ڕۆشـن کردوتـەوە و ئـەوانیش بـە وێنـەی داری توویـای بەهەشتی خەریکی سەما و خۆشی کردنن. (بە داخەوە لە نوسخە خەتیەکەدا ئـەو دوو وشـەی نـاو کەوانەکە [ ] پەڕیوە و من بە پێی مانای شێعرەکە ئەو دوو وشەم بە نزیک زانی و نووسیومە.)

٢- خەزان: گەڵای زەردی دار. چەنی: لەگەڵ. تـەرک: خـەڵفی یەکسـاڵەی دار. گـۆڵ: گـۆلی ئـاو، گۆلاو. چوون: وێنەی، وەکوو. واتە: وەک چۆن ڕووی یار لە نێو ئاوێنەدا دیـارە هـەروەهایش وێنـەی گەڵای زەردی خەڵفی تازەی دارەکانیش لە نێو گۆلاوەکەدا دیارە.

٣- دووروەتەنی: دوور بوون لە زێد و نیشتمان. مەنمانۆ: نیشـان ئـەدات، دەنـوێنێ. تـاف: تاڤگـە، قەڵوەز. مرواری: مروارید، جۆرە جەواهێرێکی بە نرخـە، لێـرەدا مـەبەسـتی دڵـۆپی ئـاوە. مەشـانۆ: دەپرژێنێ. واتـە: بە هۆی لە وەتەن دوور بوونیـەوە، ئاوەکـەی ئـەڵێی گـوڵاوە و قـەڵوەزەی بـە وێنـەی مرواری کۆکۆ دڵۆپە ئاو دەپرژێنێ.

٤- قەترە: دڵۆپە ئاو، بە پەلە ڕۆیشتن. قەترە مەپێکۆ: دەکەوێتە ڕێ، بە خۆڕ دێتە خوار. ☜

مەیـــــــدان وەراوەر، گوڵباخچـــــــەی ڕەزان
تـــــاف لـــــەب ڕەوان، تەماشـــــای خـــــەزان[١]

یەنـــد ئـــاهووی تـــەتار موشـــک نافشـــەن
ســـــەحەر عـــەزم ســــەیر لێـــو تافشـــەن[٢]

مەشـــان مەکـــەران پـــەرێ مەخســـەڵ مـــەیل
هـــەر گۆلـــەن مـــەبۆ جـــە موشـــکناف کـــەیل[٣]

---

☜ مەنیۆ: دەنێت. کەنار: پاڵ، قەراخ، وادیارە مەبەست سەرچاوەیەکە لە پـاڵی هـەوڵی دا تاڤگـە (ئابشار)ی هەبووە، یا بۆی هەیە سەرچاوەی کەنار ناوی سـەرچاوەیەکی دیکـە لـە شـوێنێکی دیکـە بووبێت. واتە: بەرەو شاری پاوە دەکەوێتە ڕێ و داخ بە سەر دڵی سەرچاوەکەی پاڵی‌دا دەنێت.

١- مەیدان: مەیان، گۆڕەپان. وەراوەر: بەرانبەر. ڕەز: لە بنەڕەتدا «ڕەز» بـە مانـای مێـوی دێمییـە بەڵام لە دیوانی بێسارانی دا بە گشتی بە مانای «باخ» هاتووە. تاف: تاڤگـە، ئابشـار. لـەب: لێـو، کەنار، قەراخ، لێوار. واتە: لە مەیدانی پـاوە و ئـەو باخـەی وا لـە بەرانبـەری‌دا و لـە قـەراخی ئـاوە ڕەوانەکەدا دابنیشی و سەیری خەزان بکەی.

٢- یەند: هێندە، ئەوەندە. ئاهوو: ئاسک. تەتار: تاتار، موغولستان، ناوی وڵاتێکە ئاسکی بۆ جوانی بەناوبانگە. ئاهووی تەتار: کەسێک کە چاوی لە جوانیدا لە چـاوی ئاسـک بچێـت. موشـک نـاف: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆش کە وا لە کیسەی پەنا ناوکی جۆرە ئاسکێکدا. سەحەر: بـەیانی زوو، کازیوە. عەزم: ئیرادە کردن. لێو: کەنار، قەراخ، لێوار. تاف: تاڤگە، ئابشار. مانای ئەم بەیتە لەگـەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٣- مەشان: دەڕۆن. مەکەران: دەکەن. پەرێ: بۆ. مەخسەڵ: شۆردن، ڕۆشن کردنەوە، جەلادان، شوێنی خۆ شۆردن. گۆل: گۆلاو، گۆلی ئاو. مەبۆ: دەبێ. کەیل: پڕ، لیپ. واتە: ئەوەندە جوانی هەیە کە لە جوانیدا لە ئاسکی تەتار و لە بۆنخۆشیدا لە موشک دەچن و بەیانیان زوو دەکەونە ڕێ کە بڕۆن ☜

هەبڵـــە کەســـێوەن ئەرســـەد خـــەم دارۆ
گشـــت بـــە دیـــن تـــاف هـــەبڵی نـــەویارۆ[١]

***

-٣[٢]-

هەمســـــــــایەمانەن، هەمســـــــــایەمانەن
تووڵـــــــەنـــــــەمامێ هەمســـــــایەمانەن[٣]

ڕێـــــزەی ڕازش گـــــەنج پەڕمایەمانـــــەن
ســـای تووبـــای بـــاڵاش سەرســـایەمانەن[٤]

---

☜ بۆ گەڕان لە قەراخی ئەو تاڤگەی ئاوە، دەڕۆن و مەیلی شۆردنی خاڵ و جوانکاری خۆیان دەکەن و بەو بۆنەوە هەر گۆلە ئاوە و پڕ دەبێ لە موشک. مەبەستی ئەوەیە بۆنی خۆشی ئەوان تێکەڵی ئاوەکە بووە و هەموو وڵاتی گرتووە.

١- هەبڵە: ئەبلە، بێ عەقڵ، نەفام، گەوج. ئەرسەد: هەرچەند. دارۆ: هەیەتی، هەیە. گشت: هەموو، سەرجەم. دین: دیتن، بینین، سەیر کردن. نەویارۆ: لە بیر نەکات. واتە: بێ عەقڵ ئەو کەسەیە هەرچەند خەمیشی زۆر بێت بە سەیرکردنی سەرچاوەی هەوڵی لە بیریان نەکا و نەیاندات بە دەم ئاوەوە.

-٣-

٢- ک.

٣- هەمسایە: دراوسێ، هاوسێ، هاوسا. تووڵە نەمام: کەسێک کە باڵای بەرز و ڕێک و پێک و تازە پێ گەیشتوو بێت. واتە: کچێکی باڵا بەرزی تازە پێ گەیشتوو دراوسێمانە.

٤- ڕێزەی ڕاز: وردە قسە، قسەی خۆش و شیرینی وەک شەکەر. پەڕمایە: پڕبەرەکەت. سای: سێبەر. تووبا: دارێکی بەهەشتی. سەرسایە: هەرشتێک سێبەر بۆ سەر بکات. واتە: وردە ☜

هـــێمای نەوتوولـــەن، نـــەوخێز نـــەمام
هــیچ کــەس جــە ســایەش نــەیاوان بــە کــام[١]

نشـــاندەی ئێعجـــاز دەســـت قودرەتـــەن
جــە نــوور سرشـــتەن، حــووری جەننەتــەن[٢]

دێهقـــان ســـەنعەتەن جـــە سەرچەشـــمەی نـــاز
ســـاختەی ســـەراوەن دوور بـــۆ جـــە بـــەدۆاز[٣]

---

☞ قسه و قسەی خۆشی بۆ من وەک خەزێنەیەکی پڕبەرەکەت و سێبەری باڵای بە وێنەی داری تووبا سێبەری سەرمە.

١- هێما: هێشتا. نەوخێز نەمام: نمامی تازە پێ گەیشتو. نەیاوان بە کام: بە ئاوات نەگەیشتووە. واتە: ئەو نمامە تازە ڕواوە هێشتا تووڵێکی تازەیە و گەورە نەبووە و هیچ کەس لە سێبەریدا بە ئاوات نەگەیشتووە. مەبەستی ئەوەیە کچێکی منداڵە و تا ئێستە کەس عاشقی نەبووە (شووی نەکردووە).

٢- نشاندە: نراو، چاندراو. ئێعجاز: کاری سەیر و سەمەرە، مۆعجیزە بوون. سرشتە: دروست کراو. حووری: حۆری. جەننەت: بەهەشت. واتە: ئەم نمامە بە دەستی قودرەتی خودا نراوە و لە نوور دروست کراوە و حۆرییەکی بەهەشتییە.

٣- دێهقان: جووتیار، وەرزێر. سەنعەت: کاری دەست. سەرچەشمە: سەرچاوە. ساختە: دروست کراو. بەدۆاز: ئینسانی خراپە خواز، ئینسانێ کە خراپەی کەسێکی دیکەی بوێت. واتە: لە نمامی دەس نراوی دەستی جووتیار و ئاودراوی سەرچاوەی ناز دەچێت، پەروەردەی سەرچاوەیە و بەڵکوو لە چاوی بەخێڵ و خراپە خواز دوور بێت.

یــا شــا! ئــی نــەمام دوور جــە ئافــەت بــۆ
بــاڵاش ســـپەردەی ئایـــەی ڕەحمـــەت بـــۆ[١]

ســـای لوتـــف حـــەقش بـــۆ بـــە سەرســـایە
ئێمـــەیچ بـــوینمێ جـــە ســـایەش وایـــە[٢]

✻✻✻

-٤[٣]-

هـــەور نـــۆ ئامـــا، خـــەم پـــۆش نـــەمین
مـــن دووریـــن وەڵات، دەروون مەهتـــەمین[٤]

---

١- یا شا: ئەی خودا. ئافەت: هەر گیاندارێک زەرەر و زیانی بۆ دار و گیا هەبێ، لێرەدا واتە ئازار و موسیبەت و بەڵا. سپەردە: سپێردراو. واتە: ئەی خودا بەڵکوو ئەم نەمامە لە ئافەتەوە دوور بێ (لە خراپە کاران دووربێت) و باڵای سپێردراوی ئایەتی ڕەحمەتی قورئان بێ و ئەو ئایەتی قورئانە ئاگاداری بێت.

٢- سای: سێبەر. بۆ: ببێ. سەرسایە: هەر شتێک سێبەر بۆ سەر بکات. بوینمێ: ببینین. وایە: ئاوات و ئارەزوو. واتە: با سێبەری لوتفی خودا سێبەری سەری (نمامەکە) بێت تا ئێمەیش لە سێبەری ئەوەوە بە ئاوات ئارەزووی خۆمان بگەین.

-٤-

٣- ک، ئێ، س، ڕ، ئا، عم، ب، ح.

٤- نۆ: نوێ، تازە. ئاما: هات. خەم پۆش: بە جل و بەرگی خەمینەوە. نەمین: نمدار، بارانی. دوورین وەڵات: دوورە وڵات، دوورە وەتەن. مەهتەمین: ماتەمین. واتە: بەهار بە جل و بەرگی خەمین و بارانەوە هات و منیش دوورە وڵاتێکی خەمبارم.

تــا جــە هــەور مــەبۆ یــەک قــەترە ڕێــزان
مــن جــە دیــدەم ســەیل هوونــاو هــۆڕێزان[١]

تــەم نۆپــاییز، خــەم هێجــران بــەخت
مەکەران بە گەرد، جەستەی سەنگ سەخت[٢]

-٥-[٣]

هــەور نــۆ! ئامــان، هــەور نــۆ! ئامــان
باجــەتی ڕەســوولْ، مروەتــەن ئامــان[٤]

---

١- مەبۆ: دەبێ. قەترە: دڵۆپ، تکە. ڕێـژان: ڕێـژراو، بڕژێـت. سـەیل: لافـاو، تاوەبـاران. هوونـاو: خوێنـاو. هـۆڕێزان: هەڵـدەڕژێت، هەڵدەسـتێت. واتـە: تـا دڵۆپـە بارانێـک لـە هـەورەوە بکەوێتـە خوار(ببارێت) لە چاوانی منیش لافاوی خوێن هەڵدەستێت.

٢- هێجران: دووری. مەکەران: دەکەن. گەرد: تۆز. جەستە: لاشـە، بـەدەن. واتـە: تـەمی سـەرەتای پاییز (لە هەورەکەوە) و خەمی دووری بەخت ( لـە دڵـە خەمبارەکـەی منـەوە) پێکـەوە بـەردی ڕەق دەهاڕن و دەیکەن بە تۆز.

-٥-

٣- ک، ئێ، س، ڕ، ع، ، عم، ب، ح، مج.

٤- نۆ: نوێ، تازە. ئامان: دەخیلم. باجەتی: بە خاتری، لەبـەر. مروەتـەن: پیاوەتیـت هـەبێ، ڕەحمـت هەبێ. واتە: ئەی هەوری تازە! بە خاتری پێغەمبەر (س.خ) دەخیلم ڕەحمت هەبێ.

وەسێ دەر ڕێزەی سەیلات وە دامان
ها جە گەشتدا، سەڵو خەرامان[١]

لادێو جە سەیلات ببۆت مودارا
بادا بەیۆوە قیبلەم جە سارا[٢]

باجەتی پیران، شای سەرەواڵا
بە سەیل تەڕ مەکەر ئەو بەژن و باڵا[٣]

❋❋❋

١- وەسێ دەر: بەس بدە. ڕێزە: وردە. سەیلات: لافاو، تاوە باران. دامان: کەش و کێو. گەشت: گەڕان. سەڵو: گوڵی پۆپەکەڵەشێر. خەرامان: بە لار و لەنجە بە ڕێدا ڕۆیشتن. سەڵو خەرامان: مەبەست یارە کە بە وێنەی سەڵو جوانە و بە لار و لەنجە بە ڕێدا دەڕوا. واتە: دەسا کەم تاوە باران بەسەر کەش و کێودا ببارێنە یارم لە گەڕانی کەش و کێودایە. ئەم بەیتە لە نوسخەی «ک»دا نییە.

٢- لادێو: تاوێک، ساتێک. سەیلات: لافاو، تاوە باران. ببۆت: بتبێ، هەتبێ. مودارا: نەرمی نواندن، نەرمی نیشان دان، لێرەدا واتە ئارام و ئۆقرە گرتن. بادا: با، باکوو. بەیۆوە: بێتەوە. سارا: دەشت و دەر. واتە: تاوێک باران مەبارێنە (ئارام بگرە) با قیبلەکەم (یارەکەم) لە کەش و کێو بێتەوە.

٣- باجەتی: بە خاتری، لەبەر. سەرەواڵا: باڵا بەرز. شای سەرەواڵا: مەبەست «مەحموودی سەرەواڵا»یە کە وا دیارە بە یەکێک لە پیرانی خودا ناسراوە، لە زۆربەی ناوچەکانی هەورامان گۆڕستانەکانیان بە ناوی «مەحموودی سەرەواڵا»وە ناو نراوە. سەیل: لافاو، تاوە باران. تەڕمەکەر: تەڕمەکە. واتە: بیکە بە خاتری پیران و شای سەرەواڵا بە تاوە باران ئەو بەژن و باڵا تەڕ مەکە.

-٦[١]-

هوونـــاو وەشـــتانەن، هوونـــاو وەشـــتانەن
بـــێ تـــۆ جـــە دیـــدەم هوونـــاو وەشـــتانەن[٢]

وە بـــالاَم کـــالاَی هێجـــران پەشـــتانەن
نـــە یـــە وادەی وەخـــت سەرگوزەشـــتانەن[٣]

ئەوەنـــد نەمـــەردام، حەســـرەتا جـــارێ
بکـــەرداش گەردشـــت گـــەردوون وە کـــارێ[٤]

ئێمـــە و تـــۆ هـــامڕاز، شـــەوێ تـــا بـــە ڕۆ
جـــە شـــەودا نـــەبیام خـــاوێ خـــەیر جـــە تـــۆ[٥]

---

-٦-

١- ک، ئێ، ڕ، س، ب، ح.

٢- هووناو: خوێناو. وەشتان: بارین. واتـە: بـە بـێ تـۆ خوێنـاو لـە چاوانم دەبارێـت. (فرمێسـکم خوێناوییە).

٣- هێجران: دووری، دەردی دووری. پەشتان: ناوێتە بوون، پێچران بە دەوری.... . یـە: ئەمـە. وادە: کات، وەخت. سەرگوزەشت: ڕابردوو، ئەو شتەی لـە ڕابـردوودا بـە سـەر کەسـێکدا هاتبێـت. واتـە: پارچەی دووری بە بالاَی من بڕاوە، ئەمە کەی کاتی ئەوەیە بەینی من و تۆ ببـێ بـە سەرگوزەشـت و وەک ڕابردوو باسی بکرێت.

٤- ئەوەند: ئەوندە. نەمەردام: نەمردایەم، نـەمردبام. حەسـرەتا: بەداخـەوەم. بکـەرداش: بکردایـە. گەردشت: گەڕان، هەڵسووڕان. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دواییدا دێت.

٥- هامڕاز: هاوقسە، هاودەم. ڕۆ: ڕۆژ. نەبیام: نەمبوایە. خەیر جە تۆ: جگە لە تۆ. واتە: ☜

گـــایێو سەرگوزەشـــت، گـــایێ شـــیرین ڕاز
گاگـــا جـــە تـــۆ نـــاز، گـــا جـــە مـــن نیـــاز[1]

ئـــەوســـە ئـــەر مامـــا مـــەرگێ جـــەو دەمـــدا
بووڵـــــەم مەشـــــانا وە یانـــــەی خەمـــــدا[2]

***

☞ بە داخەوەم! ئەوەنـدە نەمردایـەم جـارێ گـەڕانی ڕۆژگـار کـارێکی بکردایـە مـن و تـۆ یـەک بکەوتایین و شەو تا ڕۆژ دەبووەوە هاوڕاز و هاودەم بوایین و ئەو شەوە لە باتی خەو هەر تۆم بدیایە.

١- گایێو: جارێک. سەرگوزەشت: ڕابردوو. ڕاز: قسە. گاگا: جـار جـار. نیـاز: پێویسـتی، گـەرەک بوونی شتێک. واتە: جارێک باسی ڕابردوومان بکردایە و جارێک قسەی خۆش و شیرین و جارجار تۆ نازت بکردایە و جارێکیش من بم وتایە کە پێویستم بە تۆیە و خۆشەویستیم لە تۆ بخواستایە.

٢- ئەوسە: دوای ئەوە، پاشان. ئەر: ئەگەر. ماما: دەهات. جەو دەمدا: لەو کاتەدا، لـەو وەختـەدا. بووڵ: خۆڵەمێش. مەشانا: دەپرژان، بڵاو دەکردەوە. یانە: ماڵ، خانوو. واتە: دوای ئەوە ئەگەر مـەرگ یەخەی دەگرتم لەو کاتەدا خۆڵەمێشم بە سەر ماڵی خەمدا دەپـرژان و مـاڵی خـەمم وێـران دەکـرد. مەبەستی ئەوەیە دوای ئەوەی تۆم بدیبا ئەگەر دەیشمردم من هەر بە کـەیف و خۆشـحاڵ بـووم. لـە کاتێکدا ئەڵێن خۆڵەمێشم بە سەر ماڵدا دەپرژان ئەو ماڵە کەسی نەمابێت و وێـران بووبێـت. واتـە منیش ماڵی خەم وێران دەکەم و کەسی (خەم) تێدا ناهێڵم.

-٧[١]-

هێجرانـــدار وێـــم، هێجرانـــدار وێـــم

دایـــم تـــەن زوخـــاڵ، هێجرانـــدار وێـــم[٢]

ڕەنـــگ زەرد زەبـــوون، دڵ ئـــازار وێـــم

چـــوون زامەتـــداران زەدەی مـــار وێـــم[٣]

بـــە نـــێش نێشـــتەر دەروون ڕێـــش وێـــم

تـــا بـــە ڕۆی مـــەردەن جـــەفاکێش وێـــم[٤]

بـــە زوخ زامـــان دەروون کـــەیل وێـــم

سـۆزان چـوون مـەجنوون پـەرێ لـەیل وێـم[٥]

-٧-

١- ک، ئێ، س، ڕ، م، ب، ح.

٢- هێجران: دووری، دەردی دووری. تەن: لاشە. وێم: خۆم. واتە: دایم لاشەم سووتاوە و بووە بە زوخاڵ و دەردەداری دەردی دووری خۆم.

٣- زەبوون: لارەمل. ئازار: ئێش. چوون: وێنەی، وەکوو. زامەت: زام برین. زەدە: پێکراو. وێم: خۆم. واتە: ڕەنگ زەرد و لارەمل و دڵ بە ئازارم و بە وێنەی برینداران مار گەستە خۆم

٤- نێش: نووکی تیژ. نێشتەر: نەشتەر، کەرەستەیەکی تیژ بۆ خوێن گرتن لە لاشەی مرۆڤ بە کار دەبرێت. ڕێش: بریندار. ڕۆی: ڕۆژی. مەردەن: مردن. وێم: خۆم. واتە: بە نووکی تیژی نەشتەر دەروونم بریندار و زامدار بووە، هەتا ڕۆژی مردن جەفاکێش خۆم.

٥- زوخ: زوخاو. کەیل: پڕ، لیپ. سۆزان: سووتاو. چوون: وێنەی، وەکوو. پەرێ: بۆ. وێم: خۆم.

دەیــــری ئەربـــەدگێڵ، مـــەنزڵ بـــەڕ وێـــم
بەســـــر غـــەم دایـــم دیـــدە تـــەڕ وێـــم[١]

☆☆☆

-٨-[٢]

هێجـــران زام کـــەردەن، هێجـــران زام کـــەردەن
هێجـــران وە گیـــانم هـــەزار زام کـــەردەن[٣]

ڕەنگـــم چـــوون خـــەزان، زایـــف و زەردەن
هـــەر دەم جـــە نـــۆوە، ڕۆم ڕۆی نەبـــەردەن[٤]

---

☜ واتە: دەروونم بە زوخاوی زامان پڕ بووە و بە وێنەی مەجنوون بۆ لەیلا سووتاو خۆم.

١- دەیری: لە دین دەرچوو، مەنسووب بە دەیر کە شوێنی عیبادەتی مەسیحیانە و زیاتر لە شوێنی چۆڵ و هۆڵ و دوور لە ئاوەدانییە، کەسێک کە جێگەی چۆڵ و بیابان بێت. ئەربەد: شوێنی چۆڵ و هۆڵ بیابان. ئەربەدگێڵ: بیابان گەڕ. بەڕ: وشکانی، دەشتی چۆڵ و بێ ئاو و ئاوەدانی، بیابان. بەسر: بە ئەسر، بە ئەسرین، بە فرمێسک. وێم: خۆم. واتە: لە دین دەرچووم و بیابان گەڕ و جێگە و مەکانم بووە بە چۆڵ و وشکانی (داومە بە کێودا)، بە فرمێسکی خەم دایمە چاو تەڕ خۆم. (دایمە چاوم فرمێسکی پێوەیە و تەڕە «وەرگێڕ»).

-٨-

٢- ک، نێ، ڕ، س، ب، ح.

٣- هێجران: دەردی دوورکەوتنەوە لە یار. کەردەن: کردووە. واتە: دەردی دووری یار هەزار زامی کردوەتە گیانم (گیانمی کون کون کردووە).

٤- چوون: وێنەی، وەکوو. خەزان: گەڵای خەزان لێدراو، گەڵای زەرد. جە نۆوە، لە هەوەڵەوە. ڕۆم: ڕۆژم. ڕۆی: ڕۆژی. نەبەرد: شەڕ. واتە: ڕەنگم وەک گەڵای خەزان لێدراو زەردە و لاوازە و هەموو ☜

جـــە دوود ئـــاهم ئاڵـــەم تەمینـــەن
بەســـر خـــەم دایـــم، دیـــدەم نەمینـــەن[١]

چـــوون هێجرانیـــان خەمیـــدەن بـــەژنم
شـــادیم هـــەر شـــینەن، ســـیاوەن ڕەژنـــم[٢]

چوونکـــە بـــەی تـــەورەن جـــەفا کێشـــانم
بـــا مـــەرگ بـــۆ مەرهـــەم، پـــەرێ ئێشـــانم[٣]

***

☜ ڕۆژێ لە هەوەڵەوە هەر شەڕ و ناڵینە.

١- دوود: دووکەڵ. ناڵەم: عالەم، دنیا. تەمین: تەماوی. بەسر: بە ئەسر، بە ئەسرین، بە فرمێسک. نەمین: تەڕ. واتە: بە هەناسەی وەک دووکەڵم دنیا تەمی گرتووە و تەماوییە و بە فرمێسکی خەمان دایمە چاوم تەڕە.

٢- چوون: وێنەی، وەکوو. هێجرانیان: ئەوانەی دوورە یارن. خەمیدە: چەماوە. بەژن: قەد و باڵا. شین: شیوەن، گریان. سیا: ڕەش. ڕەژن: بەخت، شانس. واتە: منیش بە وێنەی ئەوانەی کە دوورە یارن باڵام چەماوە و شادیم هەر شیوەنە و بەختم ڕەش و بێ شانس و ئێقباڵم.

٣- بەی تەورەن: بەم جۆرەیە، ئاوایە. بۆ: بێت، بێ. مەرهەم: مەڵهەم، دەوا. پەرێ: بۆ. واتە: کاتێ ڕەنج و جەفا کێشانی من بەم جۆرەیە، خاستر ئەوەیە مەرگ ببێتە مەڵهەمی دەرد و ئێشم. مەبەستی ئەوەیە کە تەنیا بە مردن ڕزگارم دەبێت.

-٩[١]-

هێجـــران نێشـــش دا، هێجـــران نێشـــش دا
هێجـــران وه گیـــانم هـــەزار نێشـــش دا[٢]

نـــێش زامـــەتش ئەوەنـــد ئێشـــش دا
ئـــێش وەخـــت مـــەرگ، گیـــان کێشـــش دا[٣]

هێجـــرانش بـــەو تـــەور جـــا گێرتـــەن نـــە تـــەن
مـــەکۆش گیـــان کـــەرۆ جـــە تـــەن دووروەتـــەن[٤]

-٩-

١- ک، ئێ، ڕ، س، ب، ح.

٢- هێجران: دووری، دەردی دووری. نێش: نووکی تیژ. واتە: دەردی دووری هەموو گیانمی کون کـون کردووە.

٣- زامەت: زام، برین. ئەوەند: ئەوەندە، هێندە. واتە: ئێش و ئازاری ئەو زامە هێندە زۆرە لە ئێشـی کاتی گیان کێشان زۆرترە.

٤- بەو تەور: بەو جۆرە. جاگێرتەن: جێی گرتووە. تەن: لاشە، جەستە. مەکۆ: شـوێنی کـۆ بوونـەوە. کەرۆ: دەکات. دوورەوەتەن: ئاوارە. واتە: دەردی دووری (یار) بە جۆرێک لە لاشەمدا جێی گرتووە کـە کۆبوونـەوەی ئـەو لـە لاشـەمدا ڕێگەیـەکی بـۆ گیـانم نەهێشـتووەتەوە و گیـانی لـە لاشـەم دوور خستووەتەوە و ئاوارەی کردووە.

مــن هــەم پــێ ڕازیــم گیــانم شــۆ بــە بــاد
گیان هێجـران کـێش، کـێش پـێ مـەبۆ شـاد؟[١]

***

١- شۆ: بڕوا. مەبۆ: دەبێ. واتە: منیش بەوە ڕازیم کە گیانم بڕوا و لە لاشەمدا نەمێنێ، ئـاخر کـێ بە گیانێک کە دایمە دەردی دووری دەکێشێت شادە؟ مەبەسـتی ئەوەیـە هـیچ کـەس بـە هـەبوونی گیانی وەها شاد نییە و ئەو گیانە نەبوونی باشترە.

-١-[١]

یـــا بیـــەن پەیـــدا، یـــا بیـــەن پەیـــدا

نیشـــانەی وەهـــار، یـــا بیـــەن پەیـــدا[٢]

بولْبـــولْ مـــەوانۆ، بـــە ئـــاواز شـــەیدا

دڵـــەی دەردینـــان مـــەدۆ بـــە وەیـــدا[٣]

هـــەر مـــورغ ســـەحەر نەغمەســـازێوەن

پـــــەی دەردەداران دڵنـــــــەوازێوەن[٤]

-١-

١- ک، ئێ، س، ڕ، عم، ج، ب، ح، مج.

٢- یا: ها، ئەوە. بیەن: بووە. واتە: ئەوە نیشانەی بەهار دیاریان دا. لە سەرچاوەکانی «ب»، «ج»، «عم»، «ڕ» و «س»دا بە جێی «یا»، «ها» نووسراوە کە بە پێی ئەوە ئەم پارچە شێعرە لەو سەرچاوانەدا لە بەشی «هێ»دا نووسراوە.

٣- مەوانۆ: دەخوێنێ. ئاواز: گۆرانی. شەیدا: عاشق. دەردینان: دەردەداران. مەدۆ: ئەدات. وەی: ئازار، بەڵا. واتە: بولبول بە دەنگی عاشقانە گۆرانی دەچڕێ و دڵی عاشقە دەردەدارەکان ئەدا بە داوی بەڵا و ئازارەوە.

٤- مورغ: باڵدار، پەلەوەر. مورغ سەحەر: بولبول. نەغمە: گۆرانی شاد. نەغمەساز: گۆرانی دانەر، ئاواز دانەر. پەی: بۆ. دڵنەواز: دڵ خۆش کەر، دڵ لاوێن. واتە: هەر بولبوێک کە دەخوێنێ گۆرانییەک دادەنێ و ئەو گۆرانییە دڵی دەردەدار دەلاوێنێ.

جــه ســاز مێنقــار، ســەدای دەروون جــۆش
خوفتـــه بێـــدەردان مـــاوەرۆ وه هـــۆش[١]

ســـەرزەمین تـــەمام بـــەرگ نـــەو پۆشـــان
عاشـــقان دیســـان هوونـــاوان نۆشـــان[٢]

ژەرەژ مـــــەژەنۆ تـــــەپڵ بـــــێ خـــــەمی
ئـــارەزووش یـــارەن پـــەرێو هامـــدەمی[٣]

گـــوڵان وەشـــبۆ بـــەرئامان جـــه خـــاک
عـــەتر عـــەبیرین، غونچـــەی دەهـــەن چـــاک[٤]

---

١- ساز: ئامێری مووسیقایی. مێنقار: دەنووک. ساز مێنقار: دەنووکی بولبول بە ئامێری مووسیقایی شوبهێندراوه. خوفته: خەوتوو. ماوەرۆ: دەهێنێ. واته: دەنگی بولبول که له دەروونیەوه دەجۆشێت و له ئامێری دەنووکیەوه دێته دەر ئەو بێدەرده خەوتووانەش به هۆش دێنێتەوه (خەبەر دەکاتەوه).

٢- تەمام: تەواو، یەکسەر. بەرگ: جل و بەرگ. نەو: نوێ، تازه. پۆشان: لەبەر کردووه. هوونـاو: خوێناو. نۆشان: خواردەوه. واته: به هاتنی بەهار سەرزەمین یەکسەر جل و بەرگی نوێی لەبەر کردووه و دیسان عاشقان خوێنی دڵیان خواردەوه. ئەم بەیته تەنیا له نوسخەی «ک»دا هەیە.

٣- ژەرەژ: کەو. مەژەنۆ: دەژەنێت، لێ دەدات. پەرێو: بۆ. واته: کەو به خوێندنی، تەپڵی بێ خەمی لێ دەدات و ئاوات و ئارەزووی ئەوەیە یار ببێ به هاودەمی.

٤- وەشبۆ: بۆنخۆش. بەرئامان: ڕواوه، سەوز بووه. عەبیر: ماکێکی (مادەیەکی) بۆنخۆش که له سەندەل (دارێکی بۆنخۆشه) و موشک و زەعفەران دروست دەبێت و بۆ بۆنخۆشی دەیکەن به جل و بەرگەوه. دەهەن: دەم. چاک: دڕاو، تلیشاو. واته: گوڵانی بۆنخۆش ڕوان و خونچەی دەم دڕاو

هـــــەر يــــــەكێ مايــــــەی عـــــەتارێ داران
نيشــــــــانەی گۆنــــــــای تــــــــەتارێ داران[١]

عەجـــــەب فەســــــڵێوەن، فەســــــڵ وەهـــــــاران
پـــــەی ڕەونـــــەق ســــــەير، تەماشــــای يــــاران[٢]

☆☆☆

-٢-[٣]

يـــــاران! بەختێمـــــەن، ئـــــەر ســــــەنگم يـــــار بـــــۆ
شـــــەرتەن ئـــــەو جـــــە مـــــەيل وەفـــام بێــــزار بـــــۆ[٤]

---

☜ (دەمی کردوەتوە و هێشتا بە جوانی نەپشکووتووە) بۆنی عەتر و عەبیر نەدات.

١- مایە: سەرمایە، دارایی. عەتار: عـەتر فـرۆش. تـەتار: تاتـار، قـەومی موغـوول کـە ئاسـکی وڵاتەکەیان بۆ جوانی بە ناو بانگن، جوان، چاوجوان. داران: هەیانە. واتە: هـەر کـام لـەو گوڵانـە کـە ڕواون خۆیان مایەی عەتر فرۆشیان پێیـە و بۆنیـان خۆشـە و هـەرکامیان هـێما و نیشـانەی گۆنـای یارێکی جوانن.

٢- فەسڵێوەن: وەرزێکە. پەی: بۆ. ڕەونەق: گەشە، برەو. واتە: وەرزی بەهاران عەجەب وەرزێکە بـۆ گەشەی سەیر کردنی یاران. مەبەستی ئەوەیە کە وەرزی بەهاران وەرزێکی خۆشە بۆ سەیر کردنی یار.

-٢-

٣- ک، س، ر، عم، ب، ح.

٤- بەختێمەن: بەختێکم هەیە، بەختم جۆرێکە. ئەر: ئەگەر. یار بۆ: یار بێ. شەرتەن: شەرتە، بـێ شک وایە. واتە: یاران! بەختێکم هەیە ئەگەر بەردیش ببێ بە یارم بێ شک ئەو بەردەیش لە مـەیل و وەفای من بێزار ئەبێ و لەگەڵم بێ وەفا ئەبێت.

ئەگـــەر هـــەزار ســـاڵ نازپـــەروەرم بـــۆ
چـــوون گیـــان، دایـــم بـــە یـــاوەرم بـــۆ [١]

مـــەکان تـــەختش بـــان دیـــدەم بـــۆ
جـــە گیـــان ئازیزتـــەر، بەرگوزیـــدەم بـــۆ [٢]

ئـــاخر هـــەر ئێـــدەن جـــەفا مـــەنمانۆ
نێشـــتەر ســـەردیم نـــە دڵ مەشـــانۆ [٣]

***

١- نازپەروەرم بۆ: بە ناز پەروەردەی بکەم. چوون: وێنەی، وەکوو. واتە: ئەگەر ئەو بەردە هـەزار سـاڵ (ماوەیەکی زۆر) بە ناز پەروەردە بکەم و دایمە وەک گیان لەگەڵمدا بێت.... لە بەیتـە دواییەکانـدا درێژەکەی دەڵێت.

٢- مەکان: جێگە. بان: سەر. بەرگوزیدەم: هەڵبژێراو، تاقانە. واتە: ئەگەر لە لام وەک پاشا بێـت و جێی تەختەکەی سەر چاوانم بێت، تاقانە و لە گیان ئازیزتر بێت...

٣- هەر ئێدەن: هەر ئەمەیە. مـەنمانۆ: دەنـوێنێ، نیشـان ئـەدات. نێشـتەر: نەشـتر. مەشـانۆ: دەهاوێژێ. واتە: (پاش ئەم هەمووە کە وتم) ئاخری هەر ئەمەیە کە جەفا ئـەنوێنێ و نەشـتەری دڵ سەردی لە دڵم ئەدات و لە خۆی دڵ ساردم دەکات.

-٣[1]-

یـــاران! بـــە ڕووی حـــەق بوینـــدێ ڕەزان
ڕەنـــگ مـــن زەردتـــەر یـــا وەڵـــگ خـــەزان؟[2]

خـــەزان کـــەی چـــوون مـــن زافەرانیشـــەن؟
کـــەی چـــوون مـــن خـــەریک زێندەگانیشـــەن؟[3]

ئەرســـەد کـــە لـــێش بـــاد هێجـــران مـــەخێزۆ
ئـــاخر هـــەم نـــە پـــای نـــەمام مـــەڕێزۆ[4]

---

-٣-

١- ک، ئا، ڕ، س، عم، ب، ح.

٢- حەق: ڕاستی. بوێندێ: ببینن. ڕەز: لە بنەڕەتدا ڕەز بە مانای مێوی دێمییە بەڵام بە گشتی لە دێوانی بێسارانی دا بە مانای «باخ» هاتووە. ڕەزان: باخان. وەڵگ: گەڵا. واتە: ئەی یاران! لە ڕووی ڕاستییەوە سەیری باخان بکەن. بزانن ڕەنگی من زەردترە یا ڕەنگی گەڵا خەزان کردووەکان؟

٣- چوون: وەکوو، وێنەی. زافەران: زەعفەران. بنی گوڵی گیایەکی زەردە کە هەر بە ناوی گوڵەکەوە زەعفەرانی پێ ئەڵێن. لێرەدا مەبەست ڕەنگی زەردە. زێندەگانی: ژیان. واتە: خەزان کەی بە وێنەی من ڕەنگی وەک زەعفەران زەردە و کەی وەک من دەژی؟

٤- ئەرسەد: هەرچەند. لێش: لێی. باد: با، وا. هێجران: دوورکەوتنەوە لە یار. مەخێزۆ: هەڵدەستێ، هەڵدەکات. مەڕێزۆ: دەڕژێ. واتە، هەرچەند ئەویش (گەڵاکە) وەک من بای دوورکەوتنەوە لە یار لێی ئەدا بەڵام لە ئاخردا دەڕژێتە بنی ئەو نەمامەی لێی دەکەنرێتەوە. لێرەدا بێسارانی بە ناسک خەیاڵییەکی تەواو بای پاییز کە ئەبێتە هۆی دوور کەوتنەوەی گەڵا لە دارەکەی بە بای هێجران ناو دەبات.

نـــەک بـــە وێنـــەی مـــن بـــاهـ ئایرنـــاک
دوور جە پای قیبلـەم سـەر مەنیـەو وە خـاک[١]

✲✲✲

-٤[٢]-

یـــــاران! دێوانـــــــە، یـــــاران! دێوانـــــە
ئـــــەمن ئایرنـــــاک، وێـــــڵ دێوانـــــە[٣]

کـــــەردەنم بـــــە زێـــــد، چـــــۆڵ وێرانـــــە
ســـــازانم چـــــەنی بایـــــەقوش یانـــــە[٤]

---

١- باهـ: بە ئاهـ، بە هەناسەی. ئایرناک: ئاگرین، ئاگراوی. مەنیەو: دەنێم. واتە: نەوەک بـە وێنـەی من بە هەناسەی ئاگراوییەوە دوور لە پای قیبلەم سەر دەنێمە سەر خاک و دەمرم. مەبەستی ئەوەیە هەرچەند گەڵاکە خەزان دەکات و دەرژێتە سەر خاک بەڵام چاکیەکەی ئەوەیـە لـە پـای دارەکـە دوور ناکەوێتەوە بەڵام مـن دوور لە یار سەر دەنێمەوە و دەمرم و دەچمە ژێر گڵ.

-٤-

٢- ک، س، ر، م، عم، ب، ح.

٣- دێوانە: شێت. ئایرناک: ئاگرین، ئاگراوی، گڕ تێبەربوو. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

٤- کەردەنم: کردوومە. زێد: وەتەن، نیشتمان، شـوێنی ژیـان. سـازانم: دروسـتم کـردووە. بایـەقوش: کوندەبوو، کونە بوو، بووبوو، باڵدارێکە زیاتر لە چۆڵ و وێرانەدا دەژی و بە شـەودا دەخوێنی و پێشـتر لەسەر ئەو باوەڕە بوون کوندەبوو لە هەر شـوێنێکـدا بخوێنێـت خێـر و بەرەکـەتی نـامێنێ و بـەڵا و موسیبەتی بە سەردا دەبارێت. یانە: ماڵ خانوو، هێلانە. واتە: ئەی یاران! مـنی شێتی گڕ تێبەربوو شوێنی چۆڵ و وێرانەم کردووە بە هێلانە و لەگەڵ کوندەبوودا لانەم دروست کردووە.

ئــەو بــە ناڵــەی وێــش، مــن بــە ناڵــەی دەرد
بێــداریم هــەر شــەو، تــا بــە شــەبەق زەرد [١]

بــەڵێ مــن هــەر دەم، هــەر ســات جــە نــۆوە
جـــە دوود ئـــاهم، ئـــایر مـــەبۆوە [٢]

مەتەرســـوو ناکـــا، بایـــەقوش بـــاڵش
بســـۆچۆ بـــاهم، پەشـــێو بـــۆ هـــاڵش [٣]

واچـدێ بایـەقوش، ئـەر فـامێ هـەن پـێش
جە هامســایی مــن، گــڕ بــە دەســتش چێش؟ [٤]

---

١- وێش: خۆی. بێداریم: بەخەبەرین، بە ئاگاین. شەبەق: شەفەق. شەبەق زەرد: کاتێ هەڵاتنی خۆر و ڕوون بوونەوەی هەوا. واتە: ئەو بە ناڵەی خۆی و من بە ناڵەی ئێش و دەردەوە هەموو شەوێ تا بەیانی بە خەبەرین و دەناڵێنین.

٢- بەڵێ: بەڵام. جە نۆوە: دیسانەوە، سەر لە هەوەڵەوە. دوود: دووکەڵ. ئایر: ئاگر. مەبۆوە: دەبێتەوە. واتە: بەڵام جیاوازی ناڵەی ئەو و ناڵەی من ئەوەیە کە لە دووکەڵی هەناسەی من هەرساتێک ئاگرێک هەڵدەگرسێت.

٣- مەتەرسوو: دەترسم. ناکا: لە خۆوە، لە ناکاو، کوتووپڕ. بسۆچۆ: بسووتێت. باهم: بە ئاهم، بە هەناسەی من. بۆ: بێ. هاڵ: حاڵ. واتە: من لەوە دەترسم باڵی کوندەبووەکە بە هەناسەی من گڕی تێبەربێت و باڵی بسووتێت و حاڵی پەشێو ببێت.

٤- واچدێ: بڵێین، بێژن. فام: عەقڵ. پێش: پێی. هامسایە: دراوسێ، هاوسێ، هاوسا. چێش: چی. واتە: بە کوندە بڵێین ئەگەر عەقڵی هەیە و شتێک ئەفامێت ئاخر بۆچی هاتووەتە دراوسێیەتی منی ئاگر بە دەستەوە؟ (لە دراوسێیەتی منی ئاگر بە دەستی چی؟«وەرگێڕ»).

بشـــۆ خـــۆ بـــدۆ بـــه ئـــاواى يانـــه
مـــن بـــازۆ چـــه‌نى جـــه‌فاى وێرانـــه [١]

✡✡✡

-٥-[٢]

يـــاران! دڵ بـــه كـــام، يـــاران! دڵ بـــه كـــام
كـــه‌ى بـــۆ بيـــاوۆ، ئێمســـاڵ دڵ بـــه كـــام؟ [٣]

كه‌فتـــه‌نم وه ســـه‌ر هـــه‌واى موڵـــك شـــام
ته‌كيـــه‌گاى ڕه‌ســـووڵ (عليه‌الســـلام) [٤]

---

١- بشۆ: بڕوات. خۆ: خۆى. بدۆ: بدات. ئاواى يانه: ماڵى ئاوه‌دان. بازۆ: بهێڵێ. چه‌نى: له‌گه‌ڵ. واته: پێى بڵێن بڕوات و خۆى بخاته ماڵێكى ئاوه‌دانه‌وه و من له‌گه‌ڵ جه‌فاى ئه‌م وێرانه‌یه به جێ بهێڵێت.

-٥-

٢- س، ڕ، ب، ح.
ئه‌م پارچه شێعره ته‌نيا له‌و چوار سه‌رچاوه‌دا هاتووه و ئه‌وانيش هه‌موويان يه‌ك سه‌رچاوه‌يان هه‌بووه. به لاى ئێمه‌وه شێعرى بێسارانى نييه به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ى له‌و چوار سه‌رچاوه‌دا هاتووه ئێمه‌يش لێره‌دا ده‌ينووسينه‌وه. هه‌ڵه‌ى زۆريشى تێدايه به تايبه‌ت به‌يتى كۆتايى.
٣- كام: ئاوات، ئاره‌زوو. كه‌ى بۆ بياوۆ: كه‌ى بێ بگات. واته: ئه‌ى ياران! داخۆ ده‌كرێت ئه‌مساڵ دڵ به ئاواتى خۆى بگات؟ له به‌يته دواييه‌كاندا ئه‌ڵێ ئاواتى دڵ چييه.
٤- كه‌فته‌نم وه سه‌ر: كه‌وتووه‌ته سه‌رم. موڵك: وڵات، مه‌مله‌كه‌ت. شام: وڵاتى شام كه ئه‌وسا به سووريه و ئوردون و فه‌له‌ستين و لوبنانيان وتووه، لێره‌دا شاعێر عه‌ره‌بستانيش هه‌ر به شام ده‌زانێ. ته‌كيه‌گا: جێى پاڵ دانه‌وه. ڕه‌سووڵ: حه‌زره‌تى موحه‌ممه‌د «س.خ». عليه‌السلام: سڵاوى خواى ☜

دەرێـــغ پـــەی بـــاڵێ، بشـــيام بـــە ئـــەو جـــا
بکـــــەفتام نـــــە زێـــــد، زامـــــن بـــــەتحا[١]

مەککـــــەی موبـــــارەک، بـــــدیایام وە چـــــەم
تێـــدا بنیشـــتام، بـــێ پـــەروا و بـــێ خـــەم[٢]

(مَسْــــجِدُالحَرام) تــــــەواف بکـــــەردام
حەســـرەت نەمەنـــدا، ئەوســـا بمـــەردام[٣]

یـــا موشـــکێڵ گوشـــای کولـــل موشـــکێڵان
مـــوراد حاســـڵ کـــەی، پـــەی زەوق دڵان[٤]

☆☆☆

☜ لێ بێت. واتە: هەوای وڵاتی شامم کەوتووەتە سەر کە جێی پاڵ دانەوەی پێغەمبەرە «س.خ».

١- درێغ: حەیف، ئاخ، بە داخەوەم. پەی: بۆ. نە: لە، نێو. زێد: نیشتمان، وەتەن، شوێن، جێگە. زامن: نیشتمان، شوێنی ژیان. بەتحا: بە مەککە و دەوروبەری مەککەیان وتووە. واتە: خۆزگە باڵم هەبوایە و بڕۆشتایەم بۆ ئەو جێگە و بەکەوتایەمە ئەو سەرزەمین و دەوروبەرە (ئەوبەتحایە).

٢- بدیایام: بمدیبا، چاوم پێ بکەوتایە. چەم: چاو. بنیشتام: دانیشتایەم. بێ پەروا: بێ ترس. واتە: مەککەی پیرۆزم بە چاو بدیبا و بێ ترس و باک تێدا دانیشتایەم.

٣- مَسْجِدُالحَرام: ناوی مزگەوتێکە لە پەنای کەعبەدا و وەک لە ئایینی ئیسلامدا وتراوە هەرکەس بچێتە ئەو مزگەوتە دەبێ لە هەموو ئازار و بەڵایەک دوور بێت. بکەردام: بمکردایە، بکردبام. حەسرەت: ئاوات. نەمەندا: نەمایە. ئەوسا: پاشان، دوای ئەوە. بمەردا: بمردایەم. واتە: تەوافی (مَسْجِدُالحَرام)م بکردایە و ئەگەر دوای ئەوەیش بمردایەم ئیتر هیچ ئاواتێکم نەدەما.

٤- موشکێڵ گوشا: کەسێک کە سەختی و دژواری کارێک ئاسان بکاتەوە، کەسێک کە توانای ☜

-٦[١]-

یـــاران! دیـــم مـــاهێ، یـــاران! دیـــم مـــاهێ
ئـــارۆ دیـــم بـــە چـــەم، مویـــارەک مـــاهێ[٢]

دیـــا بـــە لاوە، بـــە وێنـــەی شـــاهێ
دیـــن جـــە دەســـتم ســـەند، بـــە نـــیم نگـــاهێ[٣]

مـــن ســـۆفی مەزهـــەب، تـــەرک دڵ کـــەردە
ســـۆفی تۆبـــەکار، جـــە گشـــت ویـــەردە[٤]

---

☞ کردنی هەموو کارێکی هەبێت، مەبەست خودایە. کولل: هەموو. موشکێلان: دژوارییەکان. موراد: ئاوات، نیازی دڵ. حاسڵ: بە دەست هێنان. موراد حاسڵ کەی: بە ئاوات بگەیەنی. پەی: بۆ. زەوق: شادی و خۆشحاڵی. واتە: ئەی خودای گەورە کە هەموو کارێکی دژوارت پێ دەکرێت، بەڵکوو بۆ خۆشی و زەوقی دڵان بە مورادمان بگەیەنی.

-٦-

١- ڕ، س، ب، ح.

٢- ماە: مانگ. ئارۆ: ئەمڕۆ. چەم: چاو. مویارەک: پیرۆز. واتە: ئەی یاران! ئەمڕۆ بە چاوی خۆم مانگێکی پیرۆزم بینی. مەبەستی ئەوەیە کەسێکم بینی ڕوخساری وەک مانگ جوان بوو.

٣- دیا بە لاوە: لای کردەوە. نیم نگا: بە گۆشە چاو سەیر کردن. واتە: بە وێنەی پاشا لای کردەوە و بە گۆشە چاو لێی ڕوانیم و ئیمانی لێ سەندم.

٤- واتە: منی سۆفی مەزهەبی تەرکی دڵ کردوو و دوای دڵ نەکەوتوو کە لە هەموو ڕابردوو تۆبەم کردبوو.

مەشـــغووڵ بـــە تەســـبێح حـــەیێ تـــەوانا
ناگـــا ئـــەو جـــەمین پەنـــەم نمانـــا[١]

تەســـبێح لـێم سـەندش، تۆبـەم دا شـکەست
دەرلاد کـــافر بـــیم، ڕووم کـــەرد نـــە کنشـــت[٢]

قیبلـــەم چـــوون تۆبـــە و تەســـبێحت بـــەردا
ســـا نـــیم نگـــاهێ، ئەگـــەر نەمـــەردا[٣]

٭٭٭

١- مەشغووڵ: خەریک، سەرقاڵ. تەسبێح: زیکری خودا کردن. حەیی: زیندوو، یەکێک لە سیفەتەکانی خودا. تەوانا: کەسێک کە توانای کردنی هەموو کارێکی هەبێت، یەکێک لە سیفەتەکانی خودا. ناگا: کوتووپڕ، لە ناکاو. جەمین: ڕوخسار. نمانا: نیشان دا، دەرخست. واتە: من خەریکی زیکری خودای زیندوو و بە توانا بووم کە ئەو (یار) ڕوخساری پێم نیشان دا.

٢- تۆبەم دا شکەست: تۆبەمی شکاند. دەرلاد: بێ ماتڵ بوون، هەر ئەو کاتە. بیم: بووم. کنشت: عیبادەتگای یەهوودی، بە مانای ئاگردان (ئاتشگا)یش دێت. واتە: تەسبێحەکەی لە دەستم سەند و تۆبەمی شکاند و هەر ئەو کاتە کافر بووم و ڕووم لە کنشت کرد.

٣- چوون: چونکە. بەردا: بردی. نەمەردا: نەمردم. واتە: ئەی قیبلەم! ئێستە کە تۆبەت شکاندم و تەسبێحەکەت بردم، دا بە گۆشە چاوێک لێم بڕوانە ئینجا بزانە نامرم (بێ شک دەمرم).

-۷[۱]-

یــــاران! ڕای تــــەواف، یــــاران! ڕای تــــەواف
ڕوێ دڵ کــــەردش، عــــەزم ڕای تــــەواف[۲]

نۆشــا جــام شــەوق، گــێڵا قــاف بــە قــاف
پەی کەعبــەی مەقســوود، ڕەوزەی نــوور ســاف[۳]

چەنــد گــێڵا جــە کــۆ، ســەر بــە پــا کــەردە
خــار خــەم نــە تــەخت ســینە جــا کــەردە[٤]

---

-۷-

۱- ک، س، ڕ، عم، ب، ح.

۲- ڕا: ڕێگە. ڕوێ: ڕۆژێک. کەردش: کردی. عەزم: نیەت کردن. واتە: ئەی یاران! ڕۆژێک دڵ نیەتی کرد بڕوا بۆ تەواف.

۳- نۆشا: خواردەوە. جام: پیاڵە. شەوق: مەیل. گێڵا: گەڕا. قاف: ناوی کێوێکی خەیاڵییە کە پێشتر لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە هێلانەی سیمورغ بە سەر ئەو کێوەوەیە. قاف بە قاف: لێرەدا مەبەست هەموو دنیایە. پەی: بۆ. مەقسوود: مەبەست، ویست. کەعبەی مەقسوود: لێرەدا مەبەست ئەو شوێنەیە کە دڵ نیەتی کردووە بچێ بۆ تەوافی. ڕەوزە: باخ. واتە: دڵ پیاڵەی مەیلی خواردەوە و بە هەموو وڵاتدا گەڕا بە دوای ئەو شوێنەدا کە ویستی بوو تا تەوافی بکات و هەر وەها بە دووی باخی نووری سافدا گەڕا.

٤- چەند گێڵا: چەند گەڕا. کۆ: کێو. سەر بە پا کەردە: سەری کردووە بە پێ، بە سەر نە بە پێ. خار: دڕوو، دڕک. جا کەردە: جێ کردنەوە. واتە: دڵ بە شەوقەوە، بە سەر نەوەک بە پێ لە حاڵێکدا دڕووی خەمی لە تەختی سینەیدا جێ کردبووەوە، چەند کێو گەڕا. مەبەستی ئەوەیە هەرچەند دڵی پڕ لە خەم و خەفەت بوو بەڵام بە شەوقەوە دەگەڕا. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هەیە.

چەنـد تـەی کـەرد چـۆڵان، شـەو بـە بـێ ڕابـەر
بـارکێش مەینــەت، پـەڕ جـە سـەودا سـەر [١]

چەنـــد جـــە کلیســـا، چەنـــد جـــە خانـــەقا
چەنـــد جـــە مەیخانـــەی مەســـتان مـــەیخـا [٢]

وێش موجەڕەد کەرد، پەی مەقسوود، جە غـەیر
تـا هـەفت تەبەقـەی زەمـین کـەردش سـەیر [٣]

چەنـــدێ وێنـــەی فکـــر هەیئـــەتی پـــەروەر
گـێڵا هـەفت گـەردوون گـەردان، سەراسـەر [٤]

---

١- تەی کەرد: بڕی، پێوا، پێدا ڕۆیی. ڕابەر: ڕێ نیشان دەر، چاو ساق. بارکێش: بار هەڵگر، هەڵگر. مەینەت: ڕەنج و سەختی. سەودا: فکر و خەیاڵ. واتە: چەند شوێنی چۆڵ و هۆڵی شەوانەی بە بێ چاو ساق بڕی و باری ڕەنج و سەختی هەڵگرت لە حاڵێکدا سەری پڕ لە فکر و خەیاڵ بوو.

٢- جە: لە. کلیسا: شوێنی عیبادەت کردنی مەسیحیان. خانەقا: شوێنی عیبادەتی سۆفییان. مەیخانە: شوێنی شەراب خواردنەوە و شەراب فرۆشتن. مەیخا: کەسێک کە داوای مەی دەکات. واتە: هەرچی کلیسا و خانەقا و مەیخانەیە بە سەرمەستی گەڕا.

٣- وێش: خۆی. موجەڕەد: لە هەموو شت بەری، لە هەموو شت بە دوور. پەی مەقسوود: بۆ مەبەست. هەفت تەبەقەی زەمین: لە ئایەتی ١٢ی سوورەی «طلاق»دا خودا دەفەرموێ: «اللّٰهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَماواتٍ وَ مِنَ الأرْضِ مِثْلَهُنَّ...» واتە: «خودا کەسێکە کە حەوت تەبەقەی ئاسمانی خەڵق کرد و زەمینیش هەر وەک ئەو». واتە: بۆ گەیشتن بە مەبەستی دیاری کردووی خۆی لە هەموو شتێک خۆی بەری کرد و بە هەر حەوت تەبەقەی زەمیندا گەڕا.

٤- هەیئەت: زانستی جم و جوولی ئەستێرەکان لە ئاسماندا. فکر هەیئەتی پەروەر: فکرێک ☜

هــەر چــی مــەوجوود بــی نــە کــان عــەدەم
دڵـــەی مـــوراد جـــۆ لـــێش نیـــا قـــەدەم[1]

ئـــاخر یەنـــد گـــێڵا، نـــەدێش جـــە جـــایێ
پەیـــدا بـــۆ پـــەی دیـــن مەقســـوودش ڕایـــێ[2]

مانـا بـە جەسـتەی خەسـتەی کەفتـەی وێـش
ئەو جـە دەرد عەشـق شـەو نەسـرەفتەی وێـش[3]

---

کە بە زانستی هەیئەت پەروەردە کرابێت. گەردان: هەر شتێک هەڵبخولێت. واتـە: چەنـدێک وەک فکرێک کە بە زانستی هەیئەت پەروەردە کرابێت هەر حەوت گەردوون (ئاسمان) گەڕا.

۱- مەوجوود: هەرچی خەڵق کرابێت. عەدەم: نەبوون. کان عـەدەم: شـوێنێک کـە کـانی نەبوونـە و خودا هەموو مەخڵووقاتی لەوێوە هێنابێتە بوون. مورادجۆ: بە دوای ئاوات و مورادەوە بوون. لێش: لێی. نیا: نا، دانا. قەدەم: هەنگاو. واتە: دڵم کە بە دوای گەیشتنی ئاواتی خۆیەوە بـوو بـە هـەموو ئەو شتانەی کە لە کانی نەبوونەوە خەڵق کرابوون و بوونیان هەبوو گەڕا و پێی لە سەر هەموویان نا.

۲- یەند گێڵا: ئەوەندە گەڕا. نەدێش: نەیبینی، نەیدی. جە جایێ: لە جێگەیەک. پەیدا بۆ: پەیدا بێت. پەی دین: بۆ دیتن. مەقسوود: مەبەست، ویسـت. ڕایـێ: ڕێگەیـەک. واتـە: ئـەم هـەموو شوێنە گەڕا بەڵام لە هیچ کوێدا ڕێگەیەکی بۆ گەیشتن بە مەبەستی خۆی نەدۆزیەوە.

۳- مانا: لە یەک چوون، بە وێکچوون. جەسـتە: لاشە. خەسـتە: ماندوو، هیلاک. کەفتە: کـەوتوو. نەسرەفتە: نەسرەوتوو، ئارام نەگرتوو. وێش: خۆی. واتە: پاش هـەموو ئـەو گەڕانـە، وەکـوو لاشـەی ماندوو و کەوتەی خۆی پێ هات کە شەوانە لە تـاوی دەردی عەشـق هـەر ئـارامی نـەبوو و ئێشـی هەبوو.

بە سینەی پەڕ دەرد، بە دڵەی پەڕ هوون
بە فکر تەمام، سەر بەرد نە دەروون[١]

تەماشاییش کەرد، دیا دیش ناگاه
جە لای وێش ئەو نوور، شەوقنما چوون ماه[٢]

نووریٚ گشت ئاڵەم جوویای دینش بیٚ
دیا دیش بە وێش، نە جەمینش بیٚ[٣]

سا کە دڵ زاناش مایەش جە چێش بیٚ
جۆیای جانفیدای قیبلەگای وێش بیٚ[٤]

***

١- پەڕ: پڕ. هوون: خوێن. تەمام: تەواو. بەرد: برد. واتە: بە سینەی پڕ دەردەوە و دڵی پڕ خوێنەوە لە خۆیدا نوقوم بوو و دەستی کرد بە بیر کردنەوە.

٢- کەرد: کرد. دیا: ڕوانی. دیش: بینی، دیتی. ناگاه: کوتووپڕ. وێش: خۆی. شەوقنما: شەوق دەر، ڕۆشنایی بەخش. چوون: وەک، وێنەی. ماه: مانگ. واتە: سەیری کرد و ڕوانی و کوتووپڕ بینی کە ئەو شەوقەی بە دوایدا دەگەڕا وەک مانگێک لای خۆی ڕۆشنایی هەیە.

٣- گشت ئاڵەم: هەموو دنیا. جوویا: بە دواوە بوو. دین: دیتن، چاو پێکەوتن. بیٚ: بوو. جەمین: تەوێڵ، ڕۆخسار. واتە: ئەو نوورەی هەموو دنیا بە دوایدا دەگەڕا تا بیبینێت، کاتێ بە دڵ ڕوانی وا لە ڕوخساری خۆیدایە. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هاتووە.

٤- زاناش: زانی، تێگەیی، بۆی دەرکەوت. چێش: چی. جۆیا: بە دواوە بوو، شوێن کەوتوو. جانفیدا: گیانفیدا، گیان لە سەر دەست. وێش: خۆی. واتە: پاش ئەوە دڵ تێگەیی چی هەیە و مایەی (نامیانی) لە چییە، تێگەیی ئەو قیبلەگایە کە بە دوایدا دەگەڕا هەر خۆیەتی و هەتا ئێستە ☜

-٨-[١]

یـــاران! سەرســـامم، یـــاران! سەرســـامم
ســـاڎار کۆگـــەرد، لێـــوە و سەرســـامم[٢]

بیابـــان مەســـکەن، وێـــڵ کـــەم فـــامم
قـــەیس ئاســـا شـــەیدای شـــای گـــوڵئەنـــدامم[٣]

---

☜ دواکەوتووی گیان لەسەر دەستی خۆی (دڵ) بووە.

-٨-

١- ک، س، م، ل، ر، ئا، ب، ح.

٢- سەرسام: جۆرە نەخۆشینێکە هەر کەس بیگرێت سەری دەماسێ و قسەی هەڵیت پڵیت دەکـات. لە دوو وشەی «سەر» هەر بە مانای سەر و «سام» بە مانای ماسین پێک هاتووە واتە سەرماسین. ساڎار: شێت، کەسێک کە جنۆکە دەستی لێ وەشاندبێت. کۆگەرد: کەسێک کە شێت بـووە و داویـە بە کەش و کێودا. لێوە: شێت. واتە: ئەی یاران! سەرسامم گرتووە و شێت و ئاوارەی کەش و کێوانم و لێوە بووم.

٣- بیابان مەسکەن: کەسێک کە شوێنی و مەکانی دەشت و دەر و چۆڵگەیە. فام: عەقڵ. قـەیس: ناوی مەجنوون کە لە تاوی عەشقی لەیلا دای بە کەش و کێودا و بە مەجنوون ناوی دەرکرد. شەیدا: عاشق. گوڵئەندام: کەسێک کە ئەندامی لە جوانی و ناسکیدا لە گوڵ بچێت. هەر وەها «بـارام» و «گوڵ ئەندام»یش دوو عاشق و مەعشووق بوون کە لە ئەدەبیاتدا ناویـان هـاتووە. واتـە: شـوێن و مەکانم بووە بە بیابان و دەشت و دەر و وێڵ و بێ عەقڵ وەکوو مەجنوونی عاشقی شای گـوڵ ئەنـدام (لەیلا) داومە بە کەش و کێودا. لێرەدا بێسارانی زۆر بە جوانی ئاماژە بـە دوو چیرۆکـی عاشـقانەی مێژوویی دەکات کە یکەیان «لەیلا و مەجنوون»ـە و ئەوی دیکەیان «بارام و گوڵ ئەندام»ـە.

مـــەجنوون کـــەی چـــوون مـــن بـــار دەرد تـــاوا؟
کـــەی دووی دەمـــاخش بـــە گـــەردوون یـــاوا؟ [1]

مـــەجنوون ئـــەر لادێ جـــە لـــەیل مـــەبی تـــاق
بـــە بانـــگ بوڵەنـــد، ئـــەلوەدای فێـــراق [2]

شیشـــەی بـــەدنامیش مـــەپێکا وە ســـەنگ
وێش ڕوسوا مەکـەرد، لـەیل مـەدا بـە نـەنگ [3]

شـــاباش جـــەی تاقـــەت، مـــن بـــەی دەردەوە
بـــەی دەرد دەروون، ســـڕ جـــە پـــەردەوە [4]

---

١- چوون من: وەک من. تاوا: توانی. دوو: دووکەڵ. دەماخ: مێشکی سەر. یـاوا: گەیشت. واتـە: (ڕاستە ئەڵێم وەکوو مەجنوون شەیدا بووم بەڵام من لەویش خراپترم)، مـەجنوون کـەی تـوانی وەک من هەڵگری ئەم باری دەردە بێت و کەی وەک من دووکەڵی سەری گەیشتە لای گەردوون؟

٢- ئەر: ئەگەر. لادێ: تاوێک، ساتێک. مەبی: دەبوو. تاق: جیا، جودا. بانگ بوڵەند: هاواری بەرز. ئەلوەدا: خودا حافیزی. فێراق: جیا بوونەوە، دوور کەوتنەوە. مانای ئەم بەیتـە بەسـتراوە بـە بـەیتی دواییەوە.

٣- بەدنامی: بەوناوی، ناوزڕان بە خراپە. مەپێکا: دەپێکا. سەنگ: بەرد. وێش: خۆی. ڕوسـوا: بـێ ئابڕوویی. مەدا: دەدا. نەنگ: بێ شەرم، بێ ئابڕوویی. واتە: ئەگـەر مـەجنوون سـاتێک لـە لـەیلا جودا دەبووەوە بە دەنگی بەرز و ناڵەی خودا حافیزی دووری، شیشەی بەوناوی خـۆی دەشـکاند (خـۆی بەوناو دەکرد) و ئابڕووی لەیلایشی دەبرد.

٤- شاباش: ئافەرین. جەی: لەم، لە ئەم. بەی: بەم، بە ئـەم. سـڕ: ڕاز، نهێنـی. مانـای ئـەم بەیتـە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت.

غـــەیر جـــە ســـوبحدەم، شـــنۆی بـــاد ســـەرد
کـــەس جـــێم نەشـــنەفتەن ناڵـــەی داخ و دەرد [١]

٭٭٭

-٩[٢]-

یـــاران! شـــکاف کـــەرد، یـــاران! شـــکاف کـــەرد
نـــێش غـــەم غونچـــەی دڵـــم شـــکاف کـــەرد [٣]

دەروونـــم ســـەررێژ، هوونـــاوان ســـاف کـــەرد
دوو دیدەم جە هوون، سەرچەشمەی تـاف کـەرد [٤]

---

١- غەیر جە: جگە لـە. سـوبحدەم: بـەیانی زوو. شـنۆ: شـنـە. بـاد: بـا، وا. جـێم: لـێم، لـە مـن. نەشنەفتەن: نەبیستووە. واتە: ئافەرین بۆ ئەم سەبر و تاقەتەی کە مـن هەمـە، چـون بـەم هـەموو دەردەوە کە لە دڵمایە و بەم سر و نهێنیەوە کە وا لە پەردەدا (هێشتا نهێنیەکـەم نەکەوتووەتـە دەر و کەس پێی نەزانیوە) جگە لە شنەی بای سەردی بەیانی کەس ناڵەی ئاە و دەردی لە من نەبیستووە. مەبەستی ئەوەیە من تاقەتم لە مەجنوون زیاترە چون ئەو تا لەیلای لێ دوور ئەبوو دەستی دەکرد بە هاوار کردن بەڵام من بەم هەموو دەردەوە مەگەر لە لای بای بەیان ناڵاندبێتم.

-٩-

٢- ک، ئێ، س، ر، عم، ب، ح.

٣- شکاف کەرد: شەق کرد، دووکەرت کرد. نێش: نووکی تیژ. واتە: نووکی تیژی خەم خونچـەی دڵـی دووکەرت کردم و وەک چۆن خونچە دەپشکوێ ئاوا دڵی شەق کردم.

٤- هوون: خوێن. هووناو: خوێناو. سەرچەشمە: سەرچاوە. تاف: تاڤگە. واتە: کارێکی کرد کـە دڵـم سەررێژی خوێن بکا و چاوانمی کرد بە سەرچاوەی خوێن و خـوێن وەک تاڤگەیـەک هـات بـە سـەر رووما.

درەخــت شــادیم جــە بێخــدا پــەی کــەرد
وە جــاش دەســت نشــان، نــەمام وەی کــەرد [١]

بــە ســەنگ بــەڵا، لــێم ســتێزە بــی
مینــای ئــەرواحم رێــزە رێــزە بــی [٢]

یەنــدە بــەڵای خــەم وەنــەم بیــەن بــار
گشــت نــە پێــواران، یــەکێ نــی دیــار [٣]

ئــەر زەرێ جــەی خــەم ئاشــکارا بــی
ســا ئاڵــەم تــەمام رووش نــە ســارا بــی [٤]

* * *

---

١- درەخت: دار. پەی کەرد: بڕی. دەست نشان: دەستنراو، دارنان بە دەست. وەی: بەڵا و موسیبەت. واتە: داری شادیمی لە بێخ هێناو و بە جێی ئەو (داری شادی) نمامی بەڵا و موسیبەتی چاند.

٢- سەنگ: بەرد، تەوەن. ستێزە: شەڕ. مینا: شووشە، شیشە. ڕێزە ڕێزە: ورد. واتە: بە بەردی بەڵا و نەگبەتی لەگەڵم بە شەڕ هات و شیشەی ڕۆحی شکاندم و وردی کرد.

٣- یەندە: هێندە. وەنەم: لێم. بیەن بار: بار بووە. گشت: هەموو. پێوار: ون، گوم، نادیار، نەبینراو. نی دیار: دیار نییە. واتە: بەڵای خەم و نەگبەتی زۆرم لێ بار بووە بەڵام ئێستە هەمووی نادیار و نەبینراوە.

٤- ئەر: ئەگەر. زەرێ: زەڕەیەک، کەمێک. جەی: لەم، لە ئەم. ئاشکارا: ئاشکرا. ئاڵەم: عالەم دنیا، هەموو خەڵکی. سارا: دەشت و دەر، کەش و کێو. واتە: ئەگەر زەڕەیەک لەم خەمە کە بە سەر مندا هاتووە بکەوێتە دەر و ئاشکرا بێت لە تاو و حەیبەتدا هەموو خەڵکی ئەدەن بە کەش و کێودا.

-۱۰-[1]

یــاران! کــێ دیــەن؟، یــاران! کــێ دیــەن؟
سەرڕەشتەی خـەمان، چـوون مـن کـێ دیـەن؟[2]

قــالْبم جــە خــەم، ڕێــزەی خــەم بیــەن
ڕۆحــم بــە خــەمناک نــە قالْــب شــیەن[3]

ئەســلْم جــە خەمــەن، جــە خــەم بیــەنان
بــابۆی مــن خەمــەن، خــەمان دیــەنان[4]

---

-۱۰-

۱- ک، س، ئا، ب، ح.
ئەم پارچە شێعرە لە دیوانی «سەیدی هەورامی»یشدا هاتووە کە دیارە بە هەڵە چووەتە نێـو دیـوانی ئەوەوە. بە پێی ئەو سەرچاوانە و بە پێی ئـەوەی مەولـەوی بـەیتی کۆتـایی ئـەم شـێعرەی بـە نـاوی بێسارانییەوە تێهەڵکێش کردووە، شێعری بێسارانییە.

۲- کێ دیەن: کێ بینیویە، کێ دیویە. سەرڕەشتەی خەمان: مەکۆی خەمان، کەسێک کـە خـەمی زۆر ڕووی تێ بکات. واتە: ئەی یاران! کێیترتـان وەک مـن دیـوە کـە هـەموو خـەمێک ڕووی تـێ بکات؟

۳- قاڵب: لاشە، جەستە. ڕێزە: ورد بوو. بیەن: بووە. شیەن: ڕۆیشتووە. واتە: لاشەم لە خەم درووست بووە و بە خەم ورد و خاش بووە و ڕۆژی ئەوەڵ ڕۆحم بـە خـەمگینی و خەفەتبارییـەوە چووەتـە نێـو لاشەمەوە.

٤- ئەسڵ: بنەڕەت، بنچینە. بیەنان: بووم، بووگم. بابۆ: بابـە، بـاوک. دیـەنان: دیومـە. واتـە: مـن بنەڕەتم خەمە و خۆیشم لە خەم بووم و دایک و باوکیشم هەر خەم بوون.

سـەرتاپام خەمـەن، جـە مەدرەسـەی خـەم
دەرس خـەم وانـان، جـە لام نیـەن کـەم[١]

دەرسـم هـەر خەمـەن، هـەر خـەم مـەوانوو
غـەیر جـە خـەم فێشـتەر هـیچ نمـەزانوو[٢]

هەرکـەس خەمینـەن بـەیۆ وە لاو مـن
خـەم چـەنیو خـەمان زوو مـەبۆ سـاکن[٣]

***

---

١- مەدرەسە: قوتابخانە. دەرس خەم وانان: خوێنەرانی دەرسی خەم، ئەوانەی دەرسی خەم دەخوێنن. نیەن کەم: کەم نییە. واتە: سەرتاپام هەر خەمە و خاوەنی قوتابخانەی خەمم و شاگرد و قوتابی دەرسی خەم خوێنم کەم نییە (زۆرە).

٢- مەوانوو: دەخوێنم. غەیر جە: جگە لە، بێجگە لە. فێشتەر: زیاتر، زۆرتر. نمەزانوو: نازانم. واتە: دەرس و وانەم هەر خەمە و هەر خەم ئەخوێنم و لە خەم زیاتر هیچ نازانم.

٣- بەیۆ: بێت، بێ. چەنیو: لەگەڵ. مەبۆ: دەبێ. ساکن: ئارام گرتن، ئۆقرە گرتن. واتە: هەرکەس خەمگینە و خەمی هەیە با بێت بۆ لای من، چوون خەم لەگەڵ خەمدا زوو ئارام و ئۆقرە دەگرن. مەولەوی لە پارچە شێعری «نامەکەت یاوا کۆسم کەفتەوە»دا نیوە بەیتی دووهەمی ئەم بەیتەی بەم جۆرە تێهەڵکێش کردووە:

«بێسـارانی»یـەن نـە تـۆی فـەرد مـن «خەم چەنی خـەمان زوو مـەبۆ سـاکن»

هەر وەها «میرزا عەبدولقادر پاوەیی»یش لە پارچە شێعری «دارای خەمانم»دا ئەم نیوە بەیتە و دوو بەیتی دیکەی ئەم شێعرەی تێهەڵکێش دەکات کە لە بەشی «کاریگەری بێسارانی لە سەر شاعێران» لە پێشەکی ئەم دیوانەدا زیاتر باسمان لەسەر کردووە.

-١١-[1]

یـــاران! لاڵـــێ دیـــم، یـــاران! لاڵـــێ دیـــم
ئـــارۆ جـــە لاڵان، عەجـــەب لاڵـــێ دیـــم[2]

وە لاڵان لاڵان هـــــــــۆرێزام و شـــــــــیم
جـە پـــەی ئـــەو لاڵـــە، چـــوون لاڵان لاڵ بـــیم[3]

کەنـــدەبێ لاڵـــێ حـــەککاکان جـــە ســـەنگ
لاڵ گۆنـــا و لاڵ بـــووم، لالـــە و لالـــەڕەنـــگ[4]

-١١-

١- ک، ل، ر، ح.

٢- لاڵ: لەعل، بەردێکی بەنرخ بە ڕەنگی سووری کاڵ. ئارۆ: ئەمڕۆ. واتە: ئەی یاران ئەمڕۆ لەعلێک لە لەعلانم بینی. (ئەوەی لە جوانی و هێژاییدا وەکوو لەعلە).

٣- لاڵان لاڵان: لاڵانەوە، پاڕانەوە. هۆرێزام: هەستام. شیم: ڕۆیشتم. جە پەی: لە بۆ. لاڵان: ئەوانەی کە ناتوانن قسە بکەن. واتە: بە پاڕانەوە و زمانی لاڵیانەوەوە هەستام و ڕۆیشتم بۆ لای ئەو لەعلە (ئەو کەسەی بە وێنەی لەعلە) بەڵام کاتێک گەیشتمە لای ئەو لە تاوی جوانی ئەو وەک کەسێک کە لاڵ بێت و نەتوانێت قسە بکات منیش لاڵ بووم.

٤- کەندە بێ: هەڵکەندە بوو، تاشی بوو. حەککاک: بەردتاش، کەسێک کە لە سەر بەرد نووسراوە یا نەخشێک هەڵبکەنێت. سەنگ: بەرد. لاڵ گۆنا: گۆنای وەک لەعل. بووم: ڕۆخسار، ڕوومەت. لالە: گوڵاڵە سوورە. واتە: ئەو لەعلە ئەڵێی بەرد تاش لە بەردی تاشیوە و گۆنا و ڕوومەتی سوور بوو، و هەر لە گوڵاڵە سوورە دەچوو و وەک گوڵاڵە سوورەیش سوور و جوان بوو.

هـــەر چەنـــدە نیشـــتم بـــە مەلاڵـــەوە
چـــوون لاڵان لاڵ بـــیم وە لای لاڵـــەوە[١]

وە لاڵان لاڵان لاڵیـــــــــــــــــام لاڵام
ڕوخســـارم وە گـــەرد خـــاک پـــاش مـــاڵام[٢]

***

-١٢-[٣]

یـــاران! مـــن نەفـــەس، یـــاران! مـــن نەفـــەس
بـــە دیـــن کەســـێ، پـــێم مەنـــدەن نەفـــەس[٤]

ئـــەر ڕوێ ســـەد بـــار بوینـــوو ئـــەو کـــەس
نـــە چـــەم مـــەبۆ ســـێر، نـــە دڵ مـــاچۆ وەس[٥]

---

١- نیشتم: دانیشتم. مەلاڵ: مەلوولی، ناڕەحەتی. لاڵ بیم: لاڵ بووم، زمـانم لـە گـۆ کـەوت. واتـە: هەرچەندە بە لای ئەو لەعلەوە بە مەلوولی و ناڕەحەتیەوە دانیشـتم بـە وێنـەی لاڵان (ئەوانـەی کـە ناتوانن قسە بکەن) لاڵ بووم و زمانم لە گۆ کەوت.

٢- لاڵان لاڵان: پاڕانەوە. لاڵیام: لاڵامەوە، پاڕامەوە. لاڵام: پاڕامەوە. گەرد: تۆز. پاش: پێـی. مـاڵام: ماڵیم، ساویم. واتە: بە لاڵە لاڵەوە لێی پاڕامەوە و ڕوخسارم بە تۆزی خاکی ژێر پێی ماڵی (ساوی).

-١٢-

٣- ک، س، م ر، عم، ب، ح.

٤- نەفەس: هەناسە. دین: دیتن، بینین، چاوپێکەوتن. مەندەن: ماوە. واتـە: ئـەی یـاران! مـن بـە دیتنی کەسێک هەناسەم ماوە. (ئەگەر ئەو کەسە نەبینم هەناسەم نامێنێ و دەمرم).

٥- ئەر: ئەگەر. ڕوێ: ڕۆژێک. بوینوو: ببینم. چەم: چاو. سێر: تێر. ماچۆ: ئەڵێ، ئێژێ. وەس:

ئەوسا کە مەلۆ، مەشۆ گیانم
مەیۆوە مەدۆ بە تەن ژیانم[1]

سا با دوور نەبۆ جە دیدەم ساتێ
تا باهم نەبۆ سۆزان وەلاتێ[2]

☆☆☆

-١٣-[3]

یاران! وە دیدەم ئێمساڵ نەو وەهار
چوون دەروونمەن، سیا و سفتەکار[4]

---

☜ بەس. واتە: ئەگەر رۆژێک سەد کەرەت ئەو کەسە ببینم نە چاوم تێر دەبێ و نە لە دڵیشم ئەڵێ بەس.

١- ئەوسا: پاشان، دوای ئەوە. مەلۆ: دەڕوا. مەشۆ: دەڕوا. مەیۆوە: دێتەوە. مەدۆ: دەدات. تەن: لاشە. واتە: کاتێ ئەو کەسە دەڕوا و ئیتر نایبینم، بە ڕۆیشتنی، گیانم دەرئەچێ و کاتێک دێتەوە ژیان ئەدات بە لاشەم. (زیندوو دەبمەوە)

٢- نەبۆ: نەبێ. باهم: بە ئاهم، بە هەناسەم. سۆزان: سووتاو. واتە: کەوایە سا با ساتێک لە بەر چاوانم ون نەبێ با بە هەناسەم گڕ لە وڵاتێک بەر نەبێت. نیوە بەیتی دووهەمی ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا بەم جۆرەیە کە ئێمە نووسیومانە و لە نوسخەکانی دیکەدا بەم جۆرە نووسراوە: «نەبا بە ئاهم سۆچۆ وەلاتێ».

-١٣-

٣- ک، س، ر، عم، ب، ح.

٤- چوون: وێنەی، وەکوو. سیا: رەش. سفتەکار: کاری سووتان، ئەوەی لە پاش سووتان بە جێ بمێنێ، خۆڵەمێش. واتە: ئەی یاران! بەهاری ئەمساڵ لە چاوانی مندا وەکوو دەروونم رەش و سووتاو ☜

مەشـــوو وە چەمـــەن، گـــوڵان بەســـتەن جـــەم
تـــــەوانام نیـــــەن وینووشـــــان بـــــە چـــــەم[١]

ئـــەر کەســـێ واچـــۆ ئینـــا خونچـــەی گـــوڵ
مـــــن دوود ئـــــاهم بەرمەشـــــۆ جـــــە دڵ[٢]

یـــانێ هـــا جـــە خـــەم تـــەمام دارانـــان
نـــێش خـــەم چـــوون خـــار جـــەرگش خارانـــان[٣]

وەیمـــەن، ســـا ئەجـــەڵ بـــەرداش گیـــانم
تـــا نـــەبیا چەنـــدێ بـــەی تـــەور ژیـــانم[٤]

☆☆☆

---

دەنوێنێ.

١- مەشوو: دەڕۆم. بەستەن جەم: کۆ بوونەتەوە. تەوانا: توانا، هێز. نیەن: نییە. وینووشان: بیانبینم. چەم: چاو. واتە: دەڕۆمە نێو سەوزەڵانی و دەبینم گوڵان کۆبوونەتەوە بەڵام من هێز و توانای ئەوەم نییە پێیاندا بڕوانم و بیانبینم. ئەم بەیتە تەنیا لە نوسخەی «ک»دا هاتووە.

٢- ئەر: ئەگەر. واچۆ: بڵێ، بێژێ. ئینا: ئەمەیە، ئەمەتە. دوود: دووکەڵ. بەرمەشۆ: دەرتێ، هەڵدەستێ. واتە: ئەگەر کەسێک بێت و پێم بڵێ ئەمە خونچەی گوڵە و بیەوێ خونچەم نیشان بدات من دووکەڵی هەناسەم لە دڵ هەڵدەستێ.

٣- یانێ ها: واتە ئەها، یانی ئەها. تەمام: تەواو. دارا: دەوڵەمەند. نێش: نووکی تیژ. خار: دڕوو، دڕک. خارا: برینداربوو. واتە: ئەمەی کە وتم یانی ها من لە خەمدا تەواو دەوڵەمەندم و نووکی تیژی خەم وەک دڕوو جەرگی بریندار و دووکەرت کردووم.

٤- وەیمەن: هاوارمە. بەرداش: ببەردایە. نەبیا: نەبوایە. بەی تەور: بەم جۆرە. واتە: ئێستە بۆ

-۱٤-[1]

## یۆســــف! دارایــــی، یۆســــف! دارایــــی
## جــــە خەزێنـــەی خـــەم، تـــەمام دارایـــی[2]

☜ ئەوە هاوارمە کە شەڵڵایە ئەجەل گیانی ببەردایەم با چیتر بەم جۆرە نەژیابام. مەبەستی ئەوەیە مردن لەم ژیانە باشترە.

-۱٤-

۱- ک، ئێ، ح.

ئەم پارچە شێعرە لەو سێ نوسخەدا هاتووە بەڵام لە سەرچاوەی «ح»دا تەنیا پێنج بەیتی هاتووە و زۆریش بە هەڵە نووسراوە و لە ژێر شێعرەکەیشدا نووسراوە: «ئەم شێعرە بۆمان روون نەبوویەوە کە هی بێسارانی بێت، لەوە ئەچێت شێعری شاعێرێ بە ناوی «سارایی» بێت»!... لە نوسخەکانی «ک» و «ئێ»دا وا دیارە بێسارانی ئەم پارچە شێعرەی بۆ «یۆسف یاسکە» نووسیبێت و ئەویش بە پارچە شێعری «مەولام پەڕ جە دەرد» وڵامی داوەتەوە کە لە کۆتایی شەرحی شێعرەکەدا شێعرەکەی «یۆسف یاسکە»یشمان هێناوە. لە بەرانبەرگرتن و هەڵسەنگاندنی دوو پارچە شێعرەکەدا وا دەردەکەوێت یەکەم جار «یۆسف یاسکە» نامەی بۆ بێسارانی نووسیبێت و لە نامەکەیدا باسی دڵدارەکەی کردبێت کە ناوی «سارا» بووبێت و یا شوێن و مەکانی دوورە دێ بووە و لە بەر ئەوە بە «سارایی» ناوی بردووە. پاشان بێسارانی ئەم پارچە شێعرە دەنووسێ و دەینێرێ بۆ یۆسف یاسکە و یۆسفیش بە «مەولام پەڕ جە دەرد» وڵامی داوەتەوە. جێگەی ئاماژەیە کە لە کتێبەکانی «سیرالاکراد» و «تاریخ اردلان»دا یۆسف یاسکە وەکوو شاعێری دەرباری «خان ئەحمەد خانی یەکەم» ناسراوە و هەر بە دەستی ئەویش کوژراوە. خان ئەحمەد خان تا ساڵی ۱۰٤٦ کۆچی ژیاوە و بێسارانیش ساڵی ۱۰۵۳ کۆچی بە دونیا هاتووە و بەم پێیە ئەم یۆسفە ناتوانێ یۆسف یاسکە بێت، بەڵام لە نوسخەی «ک»دا لە سەری ئەم پارچە شێعرە نووسراوە «و لە در سوال» و لە سەر پارچە شێعری «مەولام پەڕ جە دەرد»یش کە بە دوای ئەم پارچە شێعرەدا هاتووە، نووسراوە «یوسف یاسکە در جواب». ئەشکرێ ئەو یۆسفەی دەرباری خان ئەحمەد خان، یۆسفێکی تر بووبێت.

۲- دارایی: دەوڵەمەندی. واتە: ئەی یۆسف! تۆ لە خەزێنەی خەمدا تەواو دەوڵەمەندی.

پەردەی دڵ بە گاز ستەم خارایی
پەی چێش؟ پەی نەدین دیدەی سارایی [١]

سارایی، بێ هۆش، سارابیت کەردەن
داخ دەوای مەرگ وە پێوار بەردەن [٢]

نەکەوتەن بە کەس، بە هیچ زەمانێ
حاڵزان مەزانۆ، نە گشت حاڵزانێ [٣]

حاڵزانێ، بدیۆ بە جەستە و حاڵت
زوخاو بە کۆ بۆ، چوون کۆی زوخاڵت [٤]

---

١- گاز: تیر. خارایی: برینداررت کردووە. پەی چێش: بۆچی. نەدین: نەبینین. واتە: پەردەی دڵت بە تیری ستەم بریندار کردووە، بۆچی؟ بۆ ئەوەی چاوانی «سارایی»یت نەدیوە.

٢- سارایی «یەکەم»: سەحرایی، کێوی، ئەو کەسەی قسەی سەبارەت دەکات. سارایی «دووهەم»: کێوی، لە دین دەرچوو. کەسێ کە لە بەر دەردی عەشق دابێتیە کەش و کێودا. کەردەن: کردووە. پێوار: ون، گوم، نادیار، نەبینراو. دەوای مەرگ: وا دیارە مەبەستی دیتنی یارە کە دەوای مەرگە و عەشقی ئەو ژیانێکی نەبڕاوەیە بۆ یارەکەی. واتە: «سارایی» بێ هۆشی کردووی، کارێکی کردووە ئاوارەی کەش و کێو بووی، داخەکەم دەوای مەرگت لێ شاراوەتەوە. (ناتوانی بیبینی و بە نەدیتنی دەمری).

٣- نەکەوتەن: نەکەوتووە. حاڵزان: ئاگاداری حاڵ. مەزانۆ: دەزانێ. گشت: هەموو. واتە: ڕابواردن لەگەڵ یار تا سەر بۆ کەس نییە و ئەمەیش حاڵزان دەیزانێ ئەویش نە هەموو حاڵزانێک. مەبەستی ئەوەیە تا کەسێک وای بە سەر نەهاتبێت لە حاڵی تۆ تێناگات.

٤- بدیۆ: ببینێت، سەیربکات. کۆ: کێو. بۆ: بێ. چوون: وێنەی، وەکوو. واتە: دەبێ ئەو حاڵزانە☞

بـێ دەرد چـێش زانـۆ چـێش بـە تـۆ ئامـان؟
چـێش بـەردەن جـە لات، سـارایی سـامان؟ [١]

ئومێـد هـەن بـەو کـەس بـانی کارانـەن
سـەرمایەی سـەودای دەردەدارانـەن [٢]

سـارایی بـێ تـۆ سـاراگەرد نـەبۆ
جـە گـەرمی مـەیلت مـەیلش سـەرد نـەبۆ [٣]

ئـەر سـاحیب وەفـان چـەنیت تـا بـە سـەر
زامـەت رۆ بـە رۆ نمـەبۆ بەتـەر [٤]

---

☜ حاڵزانێک بێت کاتێ سەیری حاڵی تۆ بکات، بە لایەوە وەکوو کـۆی زوخاڵەکـەی تـۆ زوخـاڵ کـۆ ببێتەوە. (ئەویش ئەو دەردەی کێشابێت و سووتابێ و بوویێت بە کۆی زووخاڵ.) ئەم بەیتە تـەنیا لـە نوسخەی «ک»دا هاتووە.

١- چێش: چی. زانۆ: دەزانێ. ئامان: هاتوو. بەردەن: بردووە. سامان: دارایی، کـەل و پـەلی ناومـاڵ. واتە: کەسێکی بێ دەرد چووزانێ تۆ چێت بە سەر هاتووە و «سارایی» چەند سامانی تـۆی بـردووە. (ئارام و قەراری بۆ نەهێشتووی.)

٢- ئومێد هەن: هیوا هەیە، ئومێد هەیە. بانی: کار ڕێکخـەر. سـەودا: مامەڵـە، فکـر و خـەیاڵ. مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت. ئەم بەیتە لە سەرچاوەی «ح»دا نییە.

٣- ساراگەرد: ئاوارەی کەش و کێو. نەبۆ: نەبێت. نەبێ: نابێ. جە: لە. واتە: هیوام بەو کەسەیە کـە ڕێکخەری کارانە، ئەو کەسەی سەرمایەی مامەڵەی دەردەدارانە (هیوام بە خودایە) کە «سارایی» بە بێ تۆ لە کەش و کێودا نەگەڕێت و لە گەرمی مەیلی تۆ مەیلی سەرد نەبێتەوە.

٤- چەنیت: لەگەڵت. ڕۆ بە ڕۆ: ڕۆژ بە ڕۆژ. نمەبۆ: نابێ. بەتەر: خراپتر. مانای ئەم بەیتە ☜

هــــەر دەرد دووریـــــش مـــــەدۆ ئــــازاری

هــــەم خاســـەن ئـــازار پـــەی بەینەتـــداری[1]

☜ لەگەڵ بەیتی دوایی‌دا دێت. ئەم بەیتە لە سەرچاوەی «ح»دا نییە.

١- مەدۆ: ئەدات. خاسەن: خاسە، باشە. پەی: بۆ. بەینـەت دار: وەفـادار. واتـە: ئەگـەر تـا سـەر وەفای لەگەڵت هەیە ئیتر ڕۆژ بە ڕۆژ زام و برینت خراپتر نابێت. تـەنیا دەردی دووریەکـەی ئـازارت دەدات کە ئەو ئێش و ئازارەیش بۆ کەسێکی وەفادار هەر باشە. ئەم بەیتـە لـە سـەرچاوەی «ح»دا نییە.

هەروەها کە لە سـەرەتای شێعرەکەوە ئاماژەمان پێ کرد کاتێ بێسارانی ئەم پارچـە شـێعرە دەنێـرێ بـۆ یۆسف یاسکە ئەویش بە پارچە شێعرێک وڵامی داوەتـەوە. ئەمـەیش پارچـە شـێعرەکەی «یۆسـف یاسکە» بە پێی نوسخەی «ک»:

مەولام! پەڕ جە دەرد، مەولام! پەڕ جـە دەرد — نـــەوازش نـــامێو پـــەڕ جـــە داخ دەرد

بـــاد ئـــاوەرد چـــەنی هەناســـان ســـەرد — پەی من بی بـە کـۆی گـەنج بـاد ئـاوەرد

تێـــدا بـــێ دەرمـــان، بـــێ دەرمـــانیو مـــن — تاونـــا ئەســـرین بـــێ ســـامانیو مـــن

بۆســـــام و مــــــاڵام نــــــە دەوران زام — زام کەچگـــــەردی چـــــەرخ مینافــــام

بـــەڵێ تـــۆ ســـوڵتان تـــەخت هێجرانـــی — قـــەدێم دەردەدار، دوور جـــە دەرمـــانی

پـــەی ئازمـــایێش ســـارایی بەینـــەت — چ عەجەب جە کۆی کان کۆی مەینـەت؟

ئەو جە مـن بەتـەر پـەڕ مـەوج هوونـەن — سوودش سەرمایەی لەیل و مەجنوونـەن

مـــەر نەشـــنەفتەنت ئـــەوداڵان وێـــڵ — پەی دۆست مەگێلان یەکتاپۆست وە پێڵ

ئـەر نـەبۆ کەشـش جـە کـۆی دۆسـتەوە — کـەی مـەبۆ کۆشـش وە کەڵپۆسـتەوە؟

یـە دوو کـوورەی گـەرم، بـەرز سـۆزانەن — جەوپـەی دڵ مەشـخەڵ گـر فرۆزانـەن

وەرنـە یـەک ئـایر بڵێســەش چێشـەن؟ — ئەو هەر دەسەڵات سفتەی وێش پێشـەن

لە دوو بەیتی کۆتایی شێعرەکەی یۆسف یاسکەدا وا دەردەکەوێت کە وتوویە یار ئێستەیش وەفا ☜

-١٥-[1]

☜ و مەیلی هەر ماوە و بە تەواوی بێ وەفا نییە و ئاماژە بەوە دەکات ئەم پەیوەندییە کە هەمانە بە وێنەی دوو کوورەی ئاگرە و لە هەر دوو لاوە ڕۆشنە و بڵێسەدارە، ئەگینا ئەگەر یەک لایەنە و تەنیا لە لایەنی منەوە بێت و یار مەیلی نەبێ ئەم ئاگری عەشقە کە لە دڵمدایە دەکوژێتەوە و نامێنێ.

-١٥-

١- ک، ئێ، عم، ب، ح. لە نوسخەی «ئێ» (سید اسماعیل) پارچە شێعری «جە بێساران ماڵ» هاتووە و لە سەری نووسراوە «یۆسف یاسکە» و دوای ئەو پارچە شێعرە، ئەم پارچە شێعرە (یۆسف کەم نیەن) هاتووە و لە سەری نووسراوە «و لە مولانا در جواب». وەک لە «سیرالاکراد»دا هاتووە یۆسف یاسکە دەنگی زۆر خۆش بووە و شێعریشی وتووە و لە دەرباری «خان ئەحمەد خان»دا بووە. بە پێی ئەو سەرچاوە دڵی بە «زەڕین کوڵاو»ی ژنی خان ئەحمەد خانەوە بووە و وەک لەو دوو پارچە شێعرەدا دەردەکەوێت ئەو خاتوونە نەخۆشینی «سای» هەبووە و بۆ خۆش بوونەوە بۆ سەر گۆڕی «باباشێخ»»یان ناردووە بەڵام خۆش نەبوەتەوە و بە دوای ئەوەدا یۆسف یاسکە پارچە شێعرێک دەنێرێ بۆ بێسارانی و بەردەنگی شێعرەکە «باباشێخ»ـە و بێسارانیش لە زمانی «باباشێخ»ـەوە ئەم پارچە شێعرە دەنووسێ و دەینێرێ بۆ یۆسف یاسکە. لە سەرچاوەی «ح»دا نووسراوە ژنەکە ناوی «پەریزاد» بووە لە سەرچاوەی «ب»یشدا شێعرەکەی یۆسف یاسکە بە ناوی بێسارانییەوە نووسراوە. جێگەی ئاماژەیە کە لە کتێبەکانی «سیرالاکراد» و «تاریخ اردلان»دا یۆسف یاسکە وەکوو گۆرانی بێژ و شاعێری دەرباری «خان ئەحمەد خانی یەکەم» ناسراوە و هەر بە دەستی ئەویش کوژراوە. خان ئەحمەد خان تا ساڵی ١٠٤٦ کۆچی ژیاوە و بێسارانیش ساڵی ١٠٥٣ کۆچی هاتووەتە دونیا و ئەم دوو مێژووە یەک ناگرنەوە و ئەوەش کە ئەم شێعرە بۆ یۆسف یاسکە و لە وەڵامی پارچە شێعرێ «جە بێساران ماڵ»دا نووسراوە، شک و گومانی تێدا نییە و بەم پێیە ئەگەری ئەوە دێتە ئاراوە کە ساڵەکانی لە دایکبوون و کۆچی دوایی مامۆستا بێسارانی (١٠٥٣-١١١٣) دروست تۆمار نەکرابن. (والله اعلم).

* تێبینی: لە دیوانەکەی مامۆستا «حەبیبی»دا ئەم زانیاریانەی کە لەسەر «یۆسف یاسکە» نووسراوە بە کەم و کورتی نووسراوە و مامۆستا «حەبیبی» فەرمووی ئەم زانیاریە تازانەم پاش ☜

یۆسف! کەم نیەن، یۆسف! کەم نیەن
بیللا جە بارگەم هێممەت کەم نیەن[١]

نە زەدەی دێوەن، نە سای پەرییەن
لەیلێ جە جام دا زڵف وێش دیەن[٢]

---

☜ چاپی دیوانەکە بە دەست هێنا و بە دروستتریشی دەزانم. منیش ئەو زانیاریە تازەی مامۆستام لێرەدا پێ زیاد کرد. «وەرگێر»

ئەمەیش شێعرەکەی «یۆسف یاسکە» بە پێی نوسخەکانی «ک» و «نێ»:

| | |
|---|---|
| جە بێساران ماڵ! جە بێساران ماڵ! | یا پیر بابا شێخ جە بێساران ماڵ! |
| ئاما واستانەت، لەیلێ بە مەلاڵ | نەزانات قیمەت گەوهەر دانەی لاڵ |
| لاڵ بام جاستانەت نەگێرتش وایە | سورمە و سەندەلش گشت دا بە زایە |
| لەیلێ بە ناخوون، مەکەندش خالان | جۆی ئەسر هوونش سەندەل تێ مالان |
| ئەسرینان مەیان وە جای تیخەدا | مەتکیان وە قەبر «بابا شێخ»ەدا |
| یا خۆ زەمانەی ئاخر ئەندەن | یا هۆ جە بارگەت هێممەت نەمەندەن |

١- بیللا: قەسەم بەخوا. بارگە: بارەگا، ئەو ماڵەی بەسەر گۆڕی شەخسێکەوە دروستی دەکەن. هێممەت: گەورەیی، کەرەم. کەم نیەن: کەم نییە. واتە: ئەی یۆسف! قەسەم بە خوا لە بارەگەی مندا گەورەیی و کەرەم کەم نییە. لە هەندێک لە سەرچاوەکاندا بە جێی «بیللا جە بارگەم»، «جە بارگەی بابا» نووسراوە بەڵام دیارە «بیللا جە بارگەم» دروستە چونکە بێسارانی لە زمانی «بابا شێخ»ـەوە وەڵامی داوەتەوە. ئەگەر تا کۆتایی شێعرەکە بخوێننەوە زیاتر روون دەبێتەوە.

٢- زەدە: پێکراو. سای: جۆرە نەخۆشینێکە پێی ئەڵێن «ئازار» و زیاتر لە سەر ئەو باوەڕەن کە «جن» دەستی لێ وەشاندوون، دەتوانێ بە مانای «سێبەر»یش بێت. جام: ئاوێنە. زڵف: زوڵف، قژ. وێش: خۆی. دیەن: دیوە. واتە: نە دێو دەستی لێ وەشاندووە و نە سێبەری پەریانی کەوتووەتە سەر (نە پەریان دەستیان لێ وەشاندووە). لەیلا لە ئاوێنەدا چاوی بە پرچی خۆی کەوتووە بۆیە ☜

زڵــف وێـــش دیـــەن شـــنیان وە ڕووی خـــاڵ
جــە ســای زڵـف وێـش پـێش یـاوان ئـەو حـاڵ [١]

جـــاڕ دام بـــە دێـــوان تـــەمام ســـەرزەمین
یـــە ســـای کێتانـــەن یـــاوان بـــەو جـــەمین؟ [٢]

دێـــوان حاشـــا کـــەرد ئێمـــە بـــێ تـــاوان
چێمـــــە زەرەرێ بـــــەو خـــــاڵ نـــــەیاوان [٣]

---

☜ نەخۆش کەوتووە و هاتووەتە سەر گۆڕی من و خۆش نەبوەتەوە. لە بەیتە دواییەکاندا ئەڵێ بۆچی بە دیتنی پرچی خۆی نەخۆش کەوتووە.

١- شنیان: بڵاوە، پەخشانە. یاوان: گەیشتووە. واتە: پرچی خۆی دیوە کە بە سەر خاڵانیدا پەخش و بڵاوە، بۆیە ناڕەحەت بووە و نەخۆش کەوتووە.

٢- جاڕ: بانگ کردن بە دەنگی بەرز، هاوار کردن. یە: ئەمە. سای: سێبەر. کێتانەن: کامتانە. یاوان: گەیشتووە. جەمین: ڕوخسار. واتە: بە دەنگی بەرز دێوانی سەرزەمینم بانگ کرد و وتم ئەمە سێبەری کام یەک لە ئێوەیە کەوتووەتە سەر ئەو ڕوخسارە و نەخۆش کەوتووە؟

٣- چێمە: لە ئێمە. زەرەرێ: زەرەرێک. زیانێک. نەیاوان: نەگەیشتووە. واتە: دێوان حاشایان کرد و وتیان لە لایەن ئێمەوە هیچ زەرەر و زیانێک بەو خاڵانە (بەو ساحێب خاڵانە) نەگەیشتووە و ئێمە بێ تاوانین. لە نوسخەی «م»دا بە دوای ئەم بەیتەدا دوو بەیتی دیکە هاتووە کە لە نوسخەکانی دیکەدا نییە و ئێمەیش بۆمان ڕوون نییە کە هی بێسارانی بێ یا نە، لەبەر ئەوە لێرەدا تەنیا بۆ هەڵسەنگاندن دەیهێنین. ئەمەیش دوو بەیتەکە:

ئێــوار ئـارایێش وێـش کـەردەن تـەمام    سای ئەژدەهای زڵف وێش دیـەن نـە جـام
سایەی زڵـف وێـش دیـەن نـە ڕووی خـاڵ    دوور وا لـێش بیـەن وە نموونـەی هـاڵ

لـــەیلێ ســـاڎاریش جـــە زڵـــف وێشـــەن
گونـــای «بابـــا شـــێخ» بێســـاران چێشـــەن؟[1]

٭٭٭

-١٦[2]-

یـــەک ڕەنـــگ زەنگـــی، یـــەک ڕەنـــگ زەنگـــی
موژگـــان هـــەزار نـــێش، یـــەک ڕەنـــگ زەنگـــی[3]

هـــەر یـــەک ڕیشـــەی دڵ بـــە چـــەنگ جـــەنگی
مەکێشـــان، مـــاران، نـــە ڕووم دووڕەنگـــی[4]

---

١- ساڎار: شێت. جە: لە. زڵف: زوڵف، قژ، پرچ. وێش: خۆی. گونا: تاوان. چێشـەن: چییـە. واتـە: لەیلا لە سایەی پرچی خۆیەوە شێت بووە تاوانی بابا شێخ چییە؟ لە سەرچاوەی «ح»دا بە دوای ئـەم بەیتەدا بەیتێکی دیکە هاتووە کە دیارە بە هەڵە نووسراوە و ئەمەیش بەیتەکە:

هیمـــەتت بـــەو کـــەس بینـــا کارانـــەن ســـەرمایەی ســـەودای دەردەدارانـــەن

هەر وەها کە ئاماژە کرا ئەم بەیتە پەیوەندی بەم شێعرەوە نییە و بە هەڵە لێرەدا نووسـراوە و بەیتێکـە لە پارچە شێعری «یۆسف دارایی»

-١٦-

٢- ک، ئێ، ح.

٣- زەنگی: ڕەش، مەنسووب بە «زەنگبـار» کـە یـەکێک لـە قەبیلـە ڕەش پێسـتەکانی ئەفریقایـە. موژگان: مژۆڵان. نێش: چزە، نووکی تیژ. واتە: مژۆڵـەکانی بـە وێنـەی هـەزار نێشـی نـووک تیـژی یەکڕەنگ و ڕەشن.

٤- چەنگ: قـولاپ، قـولاو. مەکێشـان: دەکێشـن. مـاران: دەهێـنن. واتـە: هـەرکام لـەو مژۆڵانـە قولاپێکی شەڕن کە لە ڕیشەی دڵم گیر دەکەن و دەری دێنن و ڕوخسارم دەکەن بە دوو ڕەنگ.

میحــراب ئــەبرووی دووتــاش تــاق بەســتەن
پەشت چەند میحراب مەسجید شکەستەن؟[١]

هــەر کــۆ میحرابــێ نــە ســەرزەمینەن
گشــت پەشــت نــە قیبلــە، ڕوو نــە جەمینــەن[٢]

بــە دیــدەی بــیمار شــەفا پەیمانــە
تــاق ئــەبرووش کــەردەن بــە بیمارخانــە[٣]

---

(ڕەنگی خۆم زەردە و ئەوانیش خوێنی دڵم کە سوورە دەهێنن بە سەر ڕوومدا و ئەبێتە دوو ڕەنگ).

١- دووتا: چەماوە، لار بوو. بەستەن: بەستووە. مەسجید: مزگەوت. شکەستەن: شکاندووە. واتە: بە میحرابی برۆکانی کە وەک کەوان چەماونەتەوە و وەک تاقیان لێ هاتووە پشتی چەند میحرابی مزگەوتیان شکاندبێت باشە؟

٢- هەرکۆ: هەرکوێ. گشت: هەموو. جەمین: ڕوخسار، تەوێڵ، نێوچاوان. واتە: لە هەر کوێیەکی سەرزەمیندا میحرابێک هەیە هەمووی پشتی کردووەتە قیبلە و ڕووی لەو ڕوخسارە (ڕوخساری یار) کردووە. هەڵبەت پێویستە ئاماژە بکەین کە میحراب هەر پشت بە قیبلەیە و ڕوو لە نێو مزگەوت.

٣- دیدەی بیمار: چاوی مەست، چاوی خومار. شەفا پەیمانە: کاسە یا پیاڵەیەک کە دەوای تێ دەکەن بۆ نەخۆش. کەردەن: کردووە. بیمارخانە: نەخۆشخانە، جێی نەخۆشان. واتە: بە چاوانی مەست و خوماری کە لە پەیمانەی شەفای نەخۆشان دەچێت تاقی برۆکانی کردووە بە نەخۆشخانەی نەخۆش و نەخۆشی تێدا خۆش دەکاتەوە. بە چاوە نەخۆشەکانی (مەست و خومار) بیمار و نەخۆش، خۆش دەکاتەوە.

زڵفــانش هــەر یەنــد بــە بــاد مەڵەخشــان

عــومرێ مەســتانان، عــومرێ مەبەخشــان[١]

کەســێن کەســێوە شــیرین گیــان وێــش

نــە پــاش وێنــەی زڵــف وێــش بســپارۆ پــێش[٢]

***

١- زڵف: زوڵف، قژ، پرچ. هەر یەند: هەر ئەوەندە. مەڵەخشان: دەڵەرێنەوە. مەستانان: دەستێنن. مەبەخشان: دەبەخشن. واتە: هەر ئەوەندە با لە زوڵفەکانی دەدا و زوڵفەکانی دەلەرێنەوە و بە شێواوی زوڵفەکانی یەکێک دەکوشێ و یەکێک زیندوو دەکاتەوە.

٢- کەسێن کەسێوە: ئەو کەسە کەسە، ئەو کەسە مەردە، ئەو کەسە ئازایە. وێش: خۆی. بسپارۆ: بسپێرێ. پێش: پێی. واتە: ئەو کەسە مەردە کە گیانی شیرینی خۆی بە وێنەی زوڵفەکانی بخاتە ژێر پێی و لە ژێر پێی‌دا گیان بسپێرێ. ئەم بەیتە لە سەرچاوەی «ح»دا نییە.

-١٧-[١]

یـــەک گوڵدەســـتەیێ، یـــەک گوڵدەســـتەیێ
ئامـــان جـــە بەهەشـــت، یـــەک گوڵدەســـتەیێ[٢]

بـــە کڵافـــەی ســـەوز نمنـــاک بەســـتەیێ
بیـــەن بـــە جـــەمین، ئـــاوات وەســـتەیێ[٣]

ئاڵـــەم ڕۆشـــن کـــەرد، شـــەوق ڕووی گـــوڵش
نـــم دا بـــە هـــەوا، دەســـتەی ســـونبوڵش[٤]

-١٧-

١- ک، ئێ، س، ڕ، ب، ح، مج.

وەک لە پارچە شێعرەکەدا بۆمان روون دەبێتەوە بێسارانی باسی ڕوخسار و زوڵفی یار دەکات کە بە دەستە گوڵێکیان دەشوبهێنێ کە لە بەهەشتەوە هاتووە، بۆیشی هەیە وا نەبێت و هەر باسی جۆرە گوڵێک بکات.

٢- ئامان: هاتووە. جە: لە. واتە: دەستە گوڵێک هەیە کە لە بەهەشتەوە هاتووە.

٣- کڵافە: باقە، باخە، دەستە. بیەن: بووە. جەمین: ڕوخسار، ڕوومەت. ئاوات وەستە: ئاوات خوازراو. واتە: ئەو دەستە گوڵە کراوە بە باقەیەکی سەوز و نمناک و بەستراوە و بە وێنەی ڕوخساری یاری بە ئاوات خوازراوی لێ هاتووە. بۆیشی هەیە مەبەستی ئەوە بێت زوڵفانی یار تەڕە و بە تەڕی بەستراوە هەر وەک دەستە گوڵەکە کە بە سەوزی و تەڕی بە باقەیی بەستراوە.

٤- ئاڵەم: عالەم، دنیا. دەستەی سونبوڵ: زوڵف. واتە: شەوقی ڕووی وەک گوڵی یار دنیای لەبەر گرتووە و ڕۆشنی کردوەتەوە و دەستە زوڵفە نمناکەکەی نمیان بە کەش و هەوا داوە و نمناکیان کردووە.

جــه عــەکس شــەوقش، جــه هــەوای نــەمین
دوو قــەوس و قــەزاش کەفتــەن نــە جــەمین[١]

گوڵدەســـتە دوو تـــەڵ نـــەرگس هـــا تێـــدا
قـــەوس و قەزاشـــان گێرتـــەن بـــە وێـــدا[٢]
یـــا شـــا! گوڵدەســـتەی بەهەشـــتی مایـــە
شـــاباڵ ئـــەخیش بـــۆ وە سەرســـایە[٣]

---

١- قەوس و قەزا: کۆڵەکە زێڕینە، مەبەست برۆی یارە. کەفتەن: کەوتووە. جەمین: ڕوخسار. واتە: هەر وەک نمی کەش هەوا لەبەر هەتاودا کۆڵەکەزێڕینە دروست دەکات هەر وەهایش شەوقی ڕووی یاریش بەو هەوا نمناکە کە زوڵفە تەڕەکانی نمناکیان کردووە کۆڵەکە زێڕینەیان بە سەر ڕوخساری یارەوە دروست کردووە (مەبەست ئەبرۆکانیەتی).

٢- تەڵ: چڵ، دانە. نەرگس: نەرگس، ناوی گوڵێکە، لێرەدا مەبەست پەلکەی یارە کە بەم لا و لای ڕوومەتی‌دا کەوتووە. گێرتەن: گرتووە. وێدا: خۆیدا. واتە: ئەو دەستە گوڵ دوو چڵە نەرگسی تێدایە (دوو پەلکە کە بەم لا و لای ڕوومەتی‌دا هاتوونەتە خوار) کە ئەو چڵە نەرگسانە گەیشتوونەتە لای کۆڵەکەزێڕینەکان. (برۆکانی تا لای زوڵفەکانی کێشراون).

٣- یا شا: ئەی خودا. مایە: هەوێن، ئامیان. ئەخی: حەزرەتی جوبرەئیل. بۆ: ببێت، بێ. سەرسایە: سێبەری سەر، هەر شتێ سێبەر بۆ سەر بکات. واتە: ئەی خودا بەڵکوو شاباڵی حەزرەتی جوبرەئیل ببێتە سێبەری سەری ئەو دەستە گوڵە کە لە بەهەشتەوە هاتووە و لە بەڵا و موسیبەت بیپارێزێت.